# له لینینەوە تا پوتین


نووسینی

مەحموود تلووعی

و: ڕەسووڵ سوڵتانی



هەولێر 2011

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **لە لینینەوە تا پوتین**

- نووسینی: مەحموود تلووعی
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: ڕەسووڵ سوڵتانی
- نەخشەسازی ناوەوە: وەرگێڕ
- بەرگ: هێمن خدر
- ژمارەی سپاردن: (996)
- نرخ: 6000
- چاپی یەکەم: دەزگای موکریانی 2012
- تیراژ: 750
- چاپخانەی خانی دهۆك

زنجیرەی کتێب (620)

**هەموو مافێکی بۆ دەزگای موکریانی پارێزراوە**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

## پێڕست

"ئەم وەرگێڕانە پێشکەش بە: هاوڕێ و ساباتی ژیانم (سابات حەمید)
که له سەرەتای ژیانی هاوبەشیماندا
تەحەمووڵی کارکردن و بێدەنگییەکانی منی کرد

# بەشی یەکەم

# بنەماکانی شۆڕش

بۆ تێگەیشتن لە بنەماکانی ئـەم شۆڕشـەی، کـە لـە سـاڵی 1917دا روسـیا و جیهـانی راتڵەکاند* سەرەتا دەبێ بەو رووداوانەدا بچینەوە، کە لـە سـەرەتای سـەدەی نۆزدەیەمـدا لـە روسیادا روویان دا.

گەورەترین رووداوی مێژووی روسیا لە نیوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەیەمـدا بریتییـە لـە هێرشی ناپلیۆن بۆ سەر ئەم وڵاتە لە ساڵی 1812داو پاشەکشەی ئەو لە روسـیا لـە زسـتانی ساڵی دواتردا، کە بە سەرەتای تێکشکانی ئەو دەژمێردرێ. ئەگەرچی ئەم شەڕە بە سەرکەوتنی روسیا و شکستی فەڕەنسا کۆتایی هات، بەڵام بووە هۆی ئەوەی کە ئەم بیر و باوەڕانەی، کە لە شۆڕشی مەزنی فەڕەنساوە سەرچاوەیان گرتبوو، تەشەنەیان کردە نێو ریزی ئەفسەرە گەنجەکانی روسیاوە و، سـاڵی دواتـر پـاش رووخـانی نـاپلیۆن شۆڕشـی بـە ناوبـانگی دیکابریسـتەکانی لێکەوتەوە. ئەفسەرە راپەڕیوەکان، کە خوازیاری دامەزراندنی حکوومەتێکی مەرجدار و دانانی یاسایەکی بنەڕەتی بۆ روسیا بوون پاش مەرگی تەزار ئالیکساندری یەکەم لە ساڵی 1825دا بە مەبەستی لایـەنگریکردن لـە کۆنسـتانتین پاڤلۆڤیچـی بـرای، راپـەڕین و بـە در وشمگـەلی "کۆنستانتین و کۆنستیتۆسیۆن "، داوای دامەزرانی حکوومەتێکی دیموکراتیکیان لـە روسـیادا کرد، بەڵام کۆنستانتین بە قازانجی برای گچکەتر لە خۆی نیکۆلا، کە لە مێـژووی روسـیادا بـە نیکۆلای یەکەم ناوی دەرکردووە دەستی لە پادشایەتی هەڵگرت و نیکۆلای یەکەم بێ بەزەییانە

---

*راتڵەکاندن: تەکان پێدان، واتە تەکانی بە جیهاندا .

راپەڕینی دیکابریستەکانی سەرکوت کرد و ڕێبەرەکانی ئیعدام کردن. ئەم ئەفسەر و سەربازانەش، کە نەکوژران، بۆ سیبری دوور خرانەوە نیکۆلای یەکەم بۆ ماوەی سی ساڵ بەو پەڕی دەسەڵاتەوە فەرمانڕەوایی بەسەر روسیادا کرد. لەگەڵ ئەوەشدا گەرای ئەو شۆڕشانە، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و لە سەردەمی تەزار نیکۆلای دووەمدا روسیای راتڵەکاند لە سەردەمی پادشایەتیی سی ساڵەی نیکۆلای یەکەمدا دانرا. لە ساڵی 1848دا، کە لووتکەی دەسەڵاتی نیکۆلای یەکەم بوو لە ئەوروپادا راپەڕینگەلێك بەرپا بوون و هەر لەو ساڵە مارکس و ئینگلس بە دەرکردنی مانیفێست، سەرهەڵدانی باوەڕگەلی نوێی کۆمونیستییان لە جیهاندا راگەیاند. بیر و بۆچوونەکانی دوو بیردۆزی مەزنی روس، ئەلیکساندەر هێرزەن و (باکۆنین)یش لە کۆتاییەکانی پادشایەتی ئالیکساندری یەکەم و لە سەرەتاکانی پادشایەتیی جێگرەکەی ئەو واتە ئالیکساندری دووەمدا کاریگەرییەکی قووڵیان لە سەر خەڵکی روسیا بەجێ هێشت. ئالیکساندر هێرزن، کە بیر و باوەڕێکی ئازادی خوازانە و مەیلە و سوسیالیزمی هەبوو لە بەریتانیا گۆڤارێکی بە ناوی کولوکول بە زمانی روسی دەردەکرد، کە بە نهێنی و لە ڕێگەی قاچاغەوە دەنێردرایەوە روسیا لە نێو رووناکبیراندا دەست بە دەست دەگەڕا. باکۆنین، کە یەکێك لە ئەفسەرانی پێشووی سوپای روسیا بوو بیر و باوەڕێکی ئانارشیستیانە و شۆڕشگێڕانەی تۆخی هەبوو، کە دەکرێ وەك نموونە ئاماژە بکەین بە هەڵوەشاندنەوەی خاوەندارێتی و میرات، ئەسپاردنی زەوی و زاری کشتوکاڵ بە کۆمۆنەکانی کشتوکاڵ و ئەسپاردنی کارخانەکان بە ئەنجوومەنە کرێکاریەکان و هەڵوەشاندنەوەی هاوسەرێتی و کۆت و بەندەکانی هاوسەرێتی و ئازادیی رەهای ژن و مێرد و لە هەمووان گرینگتر دژایەتیکردن لەگەڵ بیر و باوەڕی ئایینی.

نووسەران و شاعیرانی روسییش، کە لە سەدەی نۆزدەیەمدا سەریان هەڵدا زۆربەیان بیر و باوەڕی ئازادیخوازانە و سۆسیالیستی‌یان هەبوو و تەنانەت یەکێك لە هەرە بەناوبانگەکانیان واتە ئەلیکیساندر پوشکین، کە خۆی یەکێك بوو لە دەرەبەگەکانی روسیا و سەر بە دەربار بوو، لە کاتی سەرکوتی دیکابریستەکان و دوورخستنەوەیان بۆ سیبری کۆپلە شێعرێکی بە ناوبانگی بە ناوی (پەیام بۆ سیبری) بۆ راپەڕیوان هۆنییەوە، کە ئاوا تەواو دەبێ:

**زوڵم لە ئەستووریدا دەپسێ**

**شوورەی بەرزی بەندیخانەکان دەرووخێن**

**ئازادی و رووناکی دێتە پێشوازیتان و**

**براکانتان شمشێرەکانتان دەدەنەوە**

لە کۆتاییەکانی پادشایەتیی نیکۆلای یەکەمدا سانسۆر و ئـازاردانی نووسـەرانی نـارازی و شۆڕشڤان بە تەوژمتر بوو. یەکێك لە بەناوبانگترین نووسەرانی ئەم سـەردەمە، کـە لـە لایـەن پۆلیسەوە دەست بە سەر کراو خرایە بەندیخانـەوە ئیڤـان تۆرگنیـف بـوو، کـە سـاڵی 1852 دەسبەسەر کرا.

ئەندامانی کۆڕێکی ئـەدەبییش، کـە بـیر و بـاوەڕی سۆسیالیسـتی‌یـان هـەبوو، هـەمووان دەسبەسەر کران و سزای مەرگیان بـۆ دەرچـوو، کەچـی لـە دوایـین سـاتەکاندا کـەکار وبـاری بەڕێوەچوونی سزای مەرگەکەیان ڕێکخرابوون سزای ئیعدامەکەیان کرایە بەندی هەتاهـەتایی و بێگاری و سزای تاقەتپڕووکێن* و هەمووان بۆ سیبری دوور خرانەوە. داستایۆفسکی نووسـەری ناودار یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەم گرووپە.

تەزار نیکـۆلای یەکـەم سـاڵی 1855 مـرد و جێگرەوەکـەی، واتـە ئالیکسـاندری دووەم لـە سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی خۆیدا گۆڕانێکی ئەوتۆی لە شێوازی دەسەڵاتدارێتیی خۆیدا پێك نـەهێنا. کەچی پاش شکستی روسیا لە شەڕی کرێمەدا و بشێوی و ناڕەزایەتی لە نێو خەڵکیدا بۆ راکێشـانی سەرنجی خەڵك دەستی کرد بە هێندێك ریفۆرم و چاکسازی، بۆ وێنە بە دەرکردنی فـەرمانێك یاسـای " شێوە کۆیلایەتی" لە سەر وەرزێرانی روسیا هەڵگرت و بواری بۆ ئەوە رەخساند، کە وەرزێران ببنە خاوەنی ئەم زەوییەی، کە کاریان لەسەر دەکردن. گوشار بۆ سەر نووسـەران و بڵاوکراوەکـانیش کـەم بۆوە و لە لاپەڕەی رۆژنامەکاندا کەم و زۆر پرسە سیاسییەکان هاتنە گۆڕێ.

بەڵام فەرمانی ریفۆرمی زەوی و هەڵوەشاندنەوەی سیسـتەمی خـان و رەعییـەت، کـە ساڵی 1855 لە لایەن تەزار ئالیکساندری دووەم ەوە دەرچوو، ئاکـامێکی دڵخـوازی لێ نەکەوتەوە. وەرزێران، کە سەرەتا پێیان وابوو زەوی و زاریان بە خـۆڕایی پـێ دەدرێ، بـە هۆی هەبوونی مەرجی قورسی سپاردنی ئەم زەوییانـە و ئـەم قیسـت و ماڵیاتانـەی، کـە نەیاندەتوانی بیدەن ناڕازی و تووڕە بوون. ئـەم ناڕزایەتییانـە بوونـە هـۆی سـەرهەڵدان و تێکهەڵچوونی نێوان وەرزێران و مەئموورانی حکوومـەتی و لـە هێنـدێ شـوێندا تونـد و تیژییەکی بێوێنە بۆ سەرکوتکردنی راپەڕینی وەرزێرەکان هاتە ئاراوە. لە لایەکی دیکـەوە ئازادیی چاپەمەنییەکان و بیر و را دەربڕین بووە هـۆی دەرچـوون و بڵاوبوونـەوەی وتـار و کتێب و بڵاڤـۆکی شۆڕشـگێڕانە و وروژێنـەری دژە حکوومـەت. هێنـدێ لـە نووسـەران

- سزای تاقەتپڕووکێن: سزایەك، کە مرۆڤ لەکار دەخا و توانای تێدا ناهێڵێتەوە.

خوازیاری دامەزرانی حکوومەتێکی دیموکراتیك یا مەرجدار لە چوارچێوەی رژێمێکی پادشایەتیدا بوون، بەڵام هێندێکیان راشکاوانە خەڵکیان هان دەدا دژی سیستەمی دەسەڵات راپەڕن. ناودارترین و توندترین راگەیاندنی شۆڕشگێڕانەی ئەم سەردەمە لە زستانی ساڵی 1862دا لە لایەن زایچنۆسکییەوە دەرچوو، کە تێیدا هاتووە:

"ئەو رۆژە نزیکە، کە ئێمە ئاڵای سوورمان هەڵدەکەین و بەرەو کۆشکی زستانیی تەزار وەڕێدەکەوین. ئەگەر تەزار ژیر و ئاقڵ بێت پێش ئەوەی لە دەسەڵات بکەوێ و دوور بخرێتەوە، هەموو شتێك کۆتایی دێت، بەڵام ئەگەر ململانێ و بەربەرەکانێ بکات، ئێمە بێ بەزەییانە و بە توند و تیژییەوە وەڵامی ان دەدەینەوە... ئێمە هەر لە ئێستاوە وریایی دەدەین، کە هەرکەس لەگەڵ ئێمە نەبێ، دژی ئێمەیە و لە تۆڵەی ئێمە ناپارێزرێ... پاش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتیش هیچ کام لە لایەنگرانی رژێمی ئێستا، ئەگەر بە زیندوویی بمێننەوە، لە پێکهاتەی حکوومەتی داهاتوودا و لەو پەرلمانەدا، کە دەبێ لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێن، رێگە و جێگەیان پێ نادرێ.

ئالیکساندر هێرزن، کە خۆی یەکێك بوو لە پێشەنگەکانی بزاڤەگەلی ئازادیخوازیی روسیا راگەیەندراوی زایچنۆسکیی ئیدانە کرد، چەند نووسەرێکی روسیاییش بۆ پشتیوانیکردن لە بیر و راکانی هێرزن رایانگەیاند، کە ئەم زێدەڕۆیی و راگەیاندنە ورووژێنەرانە دەبێتە هۆی دژکردەوەی توندی حکوومەت و لەناوبردنی ئەو ئازادییانەی دەستەبەر کراون. ئەم پێشبینییە وەڕاست گەڕا و، ماوەیەك پاش بڵاوبوونەوەی راگەیەندراوەکەی زایچنۆسکی دەسبەسەرکردنی گشتی و بەرتەسککردنەوەی ئازادیی بیر و را و کۆڕ و کۆبوونەوەکان دەستیان پێکرد.

راوێژکارەکانی تەزار ئەویان لە پەرەگرتنی کردەوە و بزاڤگەلی شۆڕشگێڕانە ترساند و بڕیار و رێگەچارە کۆنەپەرستانە و دواکەوتوانەکانی خۆیانیان پەیتاپەیتا پێ واژۆ دەکرد. یەکێك لەو بڕیارانە، دانانی کۆمەڵێك یاسای نوێ بوو، بۆ رەوشی خوێندن و بە مەبەستی پێشگرتن لە وەرگیرانی خوێندکارە دژبەر و بەرهەڵستکارەکان و، پێکهێنانی سیستەمی سیخوڕی لە نێوان خوێندکاراندا بە مەبەستی ئاشکراکردنی دژبەرەکان. پاش کرانەوەی زانکۆکان و قوتابخانە نموونەییەکان**، خوێندکاران دەستیان کرد بە خۆپێشاندان دژی سەرەڕۆیی حکوومەت، کە بووە هۆی ئەوەی کە ژمارەیەك دەر بکرێن و کەسانێك دەستبەسەر بکرێن و بگیرێن و ژمارەیەکی دیکەش بۆ سیبری دوور بخرێنەوە.

---

** ئەو قوتابخانانەی، کە تایبەت بۆ قوتابیی زیرەك و خاوەن پلەی بەرز دادەنرێن

له ساڵەکانی دەیەی 1860دا میخاییل باکۆنین، کە له تاراوگەی سیبری رایکردبوو بۆ بەریتانیا، له لەندەن لەگەڵ مارکس و ئینگلس ئاشنا بوو و دەستی کرد بە چالاکییەکی چڕ و پڕی سیاسی و پڕۆپاگەندە دژی رژێمی تەزار. هاوکات لەگەڵ ئەم چالاکیانە سیمایەکی شۆڕشگێڕی تر له روسیا دەرکەوت و له ماوەیەکی کورتدا ناوبانگی دەرکرد. ئەو کابرایە "سەرگی نێچانۆف" کوڕی قەشەیەك بوو، کە ساڵی 1869 له روسیا کۆمەڵەیەکی شۆڕشگێڕیی دامەزراند و راپەڕینێکی خوێندکاریی وەڕێخست. شۆڕشی نێچانۆف سەرکوت کراو خۆی رای کرد بۆ سویسرا، لەوێ درێژەیدا بە دەرکردنی راگەیەندراو و ناردنی پەیامی شۆڕشگێڕانە بۆ نێو روسیا. باکۆنین له له سویسرا لەگەڵ نێچانۆف ئاشنا بوو و زۆر بە خێرایی کەوتە ژێر کاریگەریی بیرو باوەڕی توندی شۆڕشگێڕانەی ئەم کابرا گەنجە. باکۆنین و نێچانۆف پێکەوە گۆڤارێکیان بە ناوی "دادپەروەری" دەرکرد و نەك هەر دژی دەسەڵاتدارانی روسیا، بەڵکو هێرشێکی توندیان کردە سەر نووسەران و رووناکبیرانی لیبراڵ و میانڕەویش. باکۆنین و نێچانۆف له یەکێك له وتارەکانی خۆیان لەوگۆڤارەدا بەم شێوەیە باسی تایبەتمەندییەکانی کەسێکی شۆڕشگێڕیان کرد:

"تاکی شۆڕشگێڕ دەبێ له ئامانجە ئایدیالییەکانی خۆیدا بتوێتەوە... ئەو نابێ خاوەنی بەرژەوەندیی تاکەکەسی و هەست و سۆزی کەسێتی(شەخسی) وخۆشەویستیی بنەماڵەیی و سەروەت و سامان و تەنانەت ناوی تایبەتیی خۆیشی بێت... ئەو دەبێ پێوەندییەکانی خۆی بە تەواوی لەگەڵ ئەو سیستەمی کۆمەڵایەتی‌یەی له ئارادایە و لەگەڵ دیاردەکانی ئەم سیستەمەدا بپسێنی و وەکو دوژمنێکی سوێندخواردووی ئەم سیستەمە جگە له، لەناوبردنی تەواوی ئەو شتانەی پێوەندییان بەو سیستەمەوە هەیە ئامانجێکی دیکەی نەبێ. هەر شتێك له پێناوی وەدیهاتنی ئامانجەکانی شۆڕش و داڕمانی سیستەمی هەنووکەییدا بێ، شتێکی ئەخلاقییە و پێچەوانەی ئەوە دژە ئەخلاقی و ناپەسەندە... تاکێکی شۆڕشڤانی راستەقینە دەبێ هەر چەشنە سۆز و هەست و هەر جۆرە دڵنەرمی و بەزەیی و عیشق و خۆشەویستییەك وەلاوە بنێ، ئەگینا ناکرێ ناوی شۆڕشگێڕێکی پاك و راستەقینەی له سەر دابنێین."

باکۆنین و هاوبیرەکانی "رێکخراوێکی جیهانیی یەکێتیی شۆڕشگێڕانیان" دامەزراند و نێچانۆف بە پێی بڕیارێکی باکۆنین وەکو سەرۆکی بەشی رێکخراوی یەکێتیی شۆڕشگێڕیی جیهانی له روسیا بە نهێنی گەڕایەوە نێو روسیا و چالاکییەکی نوێی دەست پێ کرد. رێکخراوە نهێنییەکەی نێچانۆف له روسیا پەرەی دەستاند، بەڵام کردەوەیەکی توند و تیژ و سەرشێتانەی

نێچانۆف سەرەداوێکی وای دایە دەستی پۆلیسی تەزار، کە رێکخراوەکەیان ئاشکرا بکات و نزیکەی سێ سەد کەس لە ئەندامانی ئەم رێکخراوەیە بگیرێن. هۆکاری ئاشکرابوونی رێکراوەکەی نێچانۆف ئەوە بوو، کە فەرمانی کوشتنی خوێندکارێکی بە ناوی ئیڤانۆڤ دەرکردبوو. نێچانۆف لە چالاکییەکانی ئیڤانۆڤ کەوتبووە گومان و بۆی روون ببۆوە، کە سیخوڕی پۆلیسی تەزارە کەچی بەدواداچوونی ئەم بابەتە، خۆی سەرەداوێکی لە سەر چالاکییەکانی نێچانۆف دایە دەست پۆلیسی تەزار و بە شوێن ئاشکرابوونی رێکخراوەکەی و گیرانی سەدان کەس لە ئەندامانی رێکخراوەکەیدا نێچانۆف دیسان بەرەو سویسرا تێی تەقاند.

شێوازە توند و تیژ و دژە مرۆییەکانی نێچانۆف، کە لە کتێبی "دیل کراوانی"داستایۆفسکیدا هاتووە، کەوتە بەر رەخنەی خودی باکۆنینیش. باکۆنین دژی نێچانۆف، کە سەردەمانێك لە نزیکترین و متمانەپێکراوترین لایەنگرانی ئەو بوو نووسیی:"نێچانۆف چالاکترین و پڕ جموجۆڵترین کەسێکە، کە من لە ژیانی خۆمدا دیتوومە، بەڵام ئەو لە پێناو گەیشتن بە ئامانجی خۆیدا دۆست و دوژمن لێك هەڵنابوێری و دەبێتە بوونەوەرێکی ئێجگار پڕ مەترسی و دوور لە متمانە. ئەو لە سەر ئەو باوەڕەیە، کە ئەندامانی هەر رێکخراوێك دەبێ بێ ئەملاوئەولا پێملی رێبەرەکەیان بن و، ئەگەر نافەرمانی و سەرپێچییەکیان لێ ببیندرێ یا لە راپەڕاندنی ئیشەکانیاندا کەمتەرخەمی بکەن ئەو مافە بە خۆی دەدا، کە هەرچەشنە سزایەکی خۆی پێی باش بێ لە سەری بەڕێوەی بەرێ..."

نێچانۆف، کە بە بەڵگە و دیکۆمێنتی سەلمێنراو و حاشاهەڵنەگر لە لایەن حکوومەتی روسیاوە تاوانبار کرابوو بە کوشتنی ئیڤانۆڤ بە پێی پەیماننامەی گەڕاندنەوەی تاوانباران لە لایەن سویسراوە رادەستی روسیا کرایەوە و بیست ساڵ بەندیخانەی بە کاری تاقەت پرووکێنەوە بۆ بڕایەوە. ئەو، بەر لە تەواو بوونی بڕیارەکە، لە ساڵی 1883دا لە بەندیخانەدا مرد.

سیمایەکی شۆڕشگێڕی دیکەی روسیا، کە لە سویسرا چالاکیی دەنواند "پێتێرلاڤرۆف" pter levrovی مامۆستای پێشوی قوتابخانە نموونەییەکانی روسیا و ئەفسەرێکی پێشووی سوپای تەزاری بوو. ئەو بە پێچەوانەی شۆڕشگێڕگەلی توندڕەوی وەك نێچانۆف باوەڕی بە پەروەردەی جەماوەر و تیۆریی شۆڕشی هەنگاو بە هەنگاو بوو. لاڤرۆف لە یەکێك لە وتارەکانی خۆیدا نووسیی: "هێشتا جەماوەری روسیا ئامادەیی ئەوەیان نییە، کە شۆڕشێکی بنەڕەتی بکەن و بە بێ ئەو ئامادەبوونەش، شۆڕش ئاکامێکی لێ ناکەوێتەوە"... لاڤرۆف لە سەر ئەو باوەڕە بوو، کە لە بری کردەوەی تیرۆریستی دەبێ جەماوەری خەڵك لەگەڵ ئامانج و

ئایدیالەکانی سۆسیالیزم ئاشنا بکرێن و ئیمان و باوەڕیان تێدا دروست بکرێ. باکۆنینیش لە سەر ئەو باوەڕە بوو، کە دەبێ جەماوەری خەڵك بۆ بەشداربوون لە شۆڕشدا ئامادە بکرێن، بەڵام ئەو نەك لە ڕێگەی پەروەردەوە بەڵکو بە ڕێگەی دنەدان و هاندان و وروژاندن و بەهێزکردنی هەستی رق و توورەیی و نەفرەت و تۆڵەسەندنەوە تێیاندا بە شوێن ئەو ئامادەبوونەدا دەگەڕا. لە هەمانکاتدا باکۆنین و لاڤرۆف رێبازێکی هاوبەشیان هەیە و هەردووکیان داوایان لە گەنجەکانی روسیا دەکرد بچنە نێو خەڵکی و تۆوی شۆڕشیان لە نێودا بچێنن. لە ساڵی 1874دا شۆڕشگێڕێکی دیکەی روس بەناوی پێتێرتێکاچێفpeter tekachev، کە تازە لە بەندیخانە بەربوو لە سویسرا کەوتە گەڵ گرووپە شۆڕشگێڕە روسییەکان. ئەو هەر چەشنە فێل و تەڵەکە و کردەوەیەکی توند و تیژانەی لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانیدا بە رەوا دەزانی و لە وتارێکدا لە ژێر ناوی "وێنەی روسیای پاش شەڕ" بۆ راکێشانی وەرزێرە روسیاکان بۆ بەشداربوون لە چالاکیی شۆڕشگێڕیدا نووسیی:

وەرزێرانی روسیا پاش شۆڕش دەبنە خاوەنی باخ و زەویی خۆیان... دەنگی قاقای پێکەنین و خۆشیماڵی وەرزێران دێنێتە لەرزین. سندووقی وەرزێرە روسییەکان پڕ دەبن لە سکەی زێڕ... وەرزێری روسی چەندی کەیفی دێنێ دەخواو دەخواتەوە و باشترین جلوبەرگ دەپۆشی و بۆ وەدەستهێنانی تەواوی ئەو خۆشی و نیعمەتانە پێویستیی بە ئیش و زەحمەتێکی ئەوتۆ نابێ."

تێکاچێف لە وتارێکی دیکەدا، کە لە ساڵی 1875دا بڵاو بۆوە، نووسیی:" تاکە رێگەی سەرکەوتنی شۆڕش وەرێخستنی بزووتنەوەیەکی چەکدارییە لە پایتەخت و ناوەندە هەستیارەکانی وڵاتدا بە مەبەستی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات. ئەوە گرینگ نییە، کە دواتر زۆرینەی خەڵکمان لەگەڵ کەون یان نا، بەڵام ئێمە ئەگەر تەنانەت لە کەمایەتییشدا بین بە بەکارهێنانی هێز دەتوانین درێژە بە دەسەڵاتەکەمان بدەین... و ئەو کەسانەی کە لەم ناوەندگەلە نوێیانەدا خزمەت بە شۆڕش دەکەن، دەبێ هەڵوێستێکی وا بنوێنن، کە ژیانی خۆیان بە درێژەی شۆڕشەوە گرێ بدەنەوە و بە پاراستنی ئەو هێز و پوانگەلەی وەدەستیان هێناون لە گیانی خۆیان مایەدابنێن."

لاڤرۆف سەبارەت بە چۆنێتیی پاوانکردنی دەسەڵات بەبێ گرینگیدان بە ویستی زۆرینەی خەڵك دژی باوەڕەکانی تێکاچێف بوو و لە وتارێکدا دژی ئەو بۆچوونانە نووسیی:" مێژوو بۆی سەلماندووین، کە دەسەڵاتی رەها، بەبێ سەرنج و گرینگیدان بە ویست و بیر و باوەڕەکانی زۆرینەی خەڵك، گەندەڵیی لێ دەکەوێتەوە. ئەو دیکتاتۆرانەی بەبێ گرینگیدان بە

دژایەتیی زۆرینەی خەڵك درێژە بە دەسەڵاتەکەیان دەدەن بۆ بەردەوامیی حکوومەتەکەیان ناچارن رێکخراوێکی ئەمنییەتی(پاراستن) و سوپای بەهێز بۆ پاراستنی خۆیان پێك بێنن، کە ئەوە خۆی دەبێتە هۆی زیاتر دابڕانیان لە جەماوەری خەڵك و دروستبوونی ناڕەزایەتیی زیاتری خەڵك. دیکتاتۆرەکان لە سەرەتادا دژبەرانی سیاسیی خۆیان لەناو دەبەن و، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە بیر و باوەڕی دژیان پێ قەبووڵ ناکرێ، وردە وردە ئەو بەشە لە لایەنگر و هاوڕێکانیشیان، کە بیر و رایان جیاوازە وەلا دەنێن و دەیانڕەتێنن و دواجار جیا لە تاقمێکی گوێ لەمست و هیچ و پووچ و هەلپەرست و بێ حەقیقەت کەسیان بەدەورەوە نامێنێ، کە هەر ئەوەش دەبێتە هۆی لاوازبوون و رووخانی دیکتاتۆری... کەمایەسییەکی (کەموکورتی) دیکەی ئەو چەشنە حکوومەتانە ئەوەیە، کە بەشی هەرە زۆری کات و ساتەکانی رێبەر و ئەندامەکانی ئەو چەشنە رژێمانە بۆ شەڕ لەگەڵ دوژمنان و خەنیمان و ناڕازییەکان، تەرخان دەکرێ و دەرفەتێکیان بۆ چاکسازی و ئاوەدانکردنەوە، کە لە پێویستییەکانی مانەوە و بەردەوامبوونی دەسەڵاتن، نامێنێتەوە."

لە گەرمەی ئەو باس و خواسانەدا بوو، کە حکوومەتی روسیا بۆ کۆنترۆڵکردنی چالاکیی خوێندکارانی دەرەوەی روسیا فەرمانی دا هەموو خوێندکارانی روسی بگەڕێنەوە روسیا. زۆربەی خوێندکاران تەنانەت ئەوانەش، کە چالاکیی سیاسییان هەبوو، پێشوازییان لەم فەرمانە کرد و خوێندکارە سۆسیالیستەکان بۆ بانگەشەی بیرو باوەڕەکانی خۆیان ئەم هەلەیان بە دەرفەت زانی.

لە ساڵی 1876دا تاقمێك لە شۆڕشڤانان، کە لە ژێر کاریگەریی باوەڕەکانی باکۆنیندا بوون کۆمەڵەیەکیان بە ناوی "زەوی و ئازادی" پێك هێنا. پلانی ئەو کۆمەڵەیە وەڕێخستنی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە بوو لە نێو وەرزێران و سازکردنی مانگرتن لە نێو یەکە پیشەییە نوییەکاندا. ئەو کۆمەڵەیە لە نێو ئەندامانی گەنج و چالاکی خۆیدا چەند گرووپێکی خەباتگێڕی دامەزراند بۆ ئەوەی لە داهاتوودا رێبەرایەتیی شۆڕشە وەرزێری و کرێکارییەکان وەئەستۆ بگرن.

لە ساڵی 1879دا کۆمەڵەی"زەوی و ئازادی" چەند جارێك تووشی لێکترازان هات. هۆکاری ئەو لێکترازانانە بڕیاری کۆمیتەی بەڕێوەبردن بوو سەبارەت بە چالاکیی تیرۆریستی. چەند کەسێك لە ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەری، کە دژی کردەوەی تیرۆریستی بوون و کەوتبوونە کەمایەتییەوە لە کۆمەڵە جیا بوونەوە و بەرێبەرایەتیی"پۆلخانۆف" گرووپێکی

سەربەخۆیان پێك هێنا. زۆرینەی کۆمەڵەش ناوی خۆی گۆڕی و لەمەودوا بە حیزبی ویستی گەل ناودێر کرا.

ڕێبەرانی حیزبی ویستی گەل لە ڕاپەڕاندنی پلانە تیرۆریستییەکانیاندا پلانی کوشتنی تەزار ئالیکساندری دووەمیان لە ڕێکەوتی سێزدەی مارسی 1881دا بەڕێوە برد و چاوەڕوانییان دەکرد، بەو کارە کۆڵەکەکانی حکوومەتی تەزاری وەلەرزین بخەن و هەل و دەرفەت بۆ شۆڕشێکی گشتی یا لانیکەم پاشەکشەی حکوومەت و دامەزراندنی پارلەمانێکی یاسادانان بڕەخسێنن، بەڵام ئەو چاوەڕوانییە وەدی نەهات و تەزار ئالیکساندری سێیەم بە دەرکردنی ڕاگەیەندراوێك لە ڕێکەوتی 13ی مای 1881 ی خۆیدا واتە تەنیا دوو مانگ پاش کوژرانی تەزار ئالیکساندری دووەم دامەزرانی حکوومەتێکی ڕەها و دانانی یاسایەکی توندی دژی ئاژاوەگێڕەکان ڕاگەیاند.

پێنج کەس لە تاوانبارانی پیلانی کوشتنی تەزار ئالیکساندری دووەم ئیعدام کران و ئەوانی دیکە، کە زۆربەیان ڕێبەرانی حیزبی ویستی گەل بوون لە نێویاندا بەندیخانەی دووردرێژیان بۆ بڕایەوە و بڕیاری دوورخرانەوەیان بۆ سیبری لە سەر درا. تاقمێك لە ڕێبەران و چالاکانی حیزبیش، کە ژنە شۆڕشگێڕی ناودار"وێرا_فیگنەر"یش یەکێك بوو لەوان لە چاڵە ڕەشەکانی قەڵای "شکلۆسبۆرگ"دا بەند کران و زۆربەیان لە هەلومەرجی دژوار و تاقەت پرووکێنی ئەم گرتووخانەیەدا گیانیان لە دەست دا و هێندێکیشیان شێت بوون.

لەگەڵ سەرکوتی حیزبی ویستی گەلدا، ژمارەیەك لە ڕێبەرانی تاقمی جیابۆوەی ڕێکخراوی سەرەتایی حیزبی ویستی گەل، کە پۆلخانۆف و ئاکسلروود یەکێك بوون لەوان لە ڕوسیا ڕایان کرد و لە ساڵی 1883دا لە دەرەوەی ڕوسیا یەکەمین ڕێکخراوی "مارکسیستی"یان بە ناوی گرووپی ئازادیی‌کار پێك هێنا.

ئەم ڕێکخراوە، کە بە ڕێبەرایەتیی پۆلخانۆف دامەزرابوو هەر لە سەرەتاوە ئامانجی خۆی دامەزراندنی سۆسیالیزم لە ڕوسیادا ڕاگەیاند و دەستیان کرد بە پێك هێنانی ناوەندگەلی سۆسیال دیموکرات لە نێو ڕوسیادا. پۆلخانۆف و هاوکارەکانی هەروەها دەستیان کرد بە چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و بڵاڤۆك، بەمەبەستی بانگەشەی بیروبۆچوونەکانیان و لە ڕێگەی ئەو بڵاڤۆکانەوە ڕێبازی خۆیان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە ڕێگەی شۆڕشەوە یا لە ڕێگەی کودەتاوە ئاشکرا کرد. هاوکات لەگەڵ ئەم چالاکیانەدا باقیی ڕێکخستنی حیزبی ویستی گەل لە شارە گەورەکانی ڕوسیادا درێژەیان بە چالاکیی خۆیان دەدا، بەڵام زۆربەی چالاکییەکانی پاشماوەی ئەم حیزبە بە شێوەی کردەوەی تێرۆریستیی بوون و گرووپێکی چالاکی ئەو حیزبە لە سەن

پیترێزبۆرگ خەریکی داڕشتنی پیلانی کوشتنی تەزار ئالیکساندری سێیەم بوون. ڕۆژی یەکەمی مارسی ساڵی 1887، کە هاوکات بوو لەگەڵ شەشەمین ساڵوەگەڕی کوژرانی ئالیکساندری دووەمی باوکی تەزار بۆ ڕۆژی بەڕێوەبردنی پیلانی کوشتنی ئەو دیاری کرابوو، بەڵام جێبەجێکردنی ئەم پیلانە بە هۆی ئەوەی کە تەزار بڕیاری دابوو، کە زووتر کۆشکە زستانییەکەی بەجێ بێڵی و بگەڕێتەوە بۆ کۆشکە هاوینییەکەی، وەپێش خرا و گۆڕانی گەڵاڵەکەی پێشوو، کە بە وردبینییەوە داڕێژرابوو بووە هۆی ئەوەی کە پیلانەکەیان ئاشکرا بێت و بەڕێوەبەرەکانی بگیرێن.

بەڕێوەبەری پیلانەکە گەنجێکی بیست و یەك ساڵانە بوو بە ناوی ئالیکساندر ئۆلیانۆف، کە پاش دادگاییەکی خێرا لە هەشتەمی مانگی مای 1887دا لەگەڵ چوارکەس لە هاودەستەکانی لە سێدارە دران.

# 2

تەزار ئالیکساندری سێیەم حەوت ساڵ پاش پووچەڵبوونەوەی پیلانی کوشتنەکەی، لە ڕۆژی یەکەمی نۆڤەمبەری ساڵی 1894دا مرد. لەو ماوەیەدا ئەو بەو پەڕی هێز و توندو تیژییەوە هەر چەشنە بزاڤێکی دژبەرانەی سەرکوت کرد و چالاکیی دژبەرانی ڕژێمی تەزار لە ماوەی ئەو ساڵانەدا لە دەرەوەی ڕوسیادا کورت ببۆوە.

جێگرەوەی ئالیکساندری سێیەم کوڕە بیست و شەش ساڵانەکەی بە ناوی نیکۆلا بوو، کە کەمترین ئەزموونی پادشایەتی و دەسەڵاتدارێتیی نەبوو. نیکۆلا پاش مەرگی باوکی هێندەی پێنەچوو، کە لەگەڵ کچەزای ڤیکتۆریا شازادە خاتوون"ئالیکس ڤیکتۆریا هێلێنالۆییز بیاتریس" بوونە دەسگیران و ئەوی لەگەڵ خۆی لە ئەڵمانیاوە هێنابۆوە ڕوسیا. مەلیکە ڤیکتۆریا دەورێکی کاریگەری لەو زەماوەندەدا هەبوو و تەزار ئالیکساندری سێهەم بە پێچەوانەی ویستی دڵی خۆی و بە تێگەیشتن لەوەیکە دەوروبەرییەکانی و کۆمەڵگەی ڕوسیاش بە گشتی پێیان خۆش نابێ پرینسیسێکی ئەڵمانی ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە مەلیکەی ڕوسیا، ملی بۆ ئەو زەماوەندە ڕاکێشابوو. ئالیکساندری سێیەم بەو هیوایە بوو، کە هەتا ئەو کاتەی نیکۆلای کوڕی بێتە سەر تەختی پادشایەتی هاوسەرە ئەڵمانی_بریتانییەکەی لە ڕوسیادا جێی خۆی بکاتەوە، بەڵام ئاواتەی ئەو وەدی نەهات، چونکی تەزار چەند مانگێك پاش

دەسگیراندارێتیی کوڕەکەی نەخۆش کەوت و، کاتێك نیکۆلا پاش مانەوە و کـەیف و نەهـەنگ لە بەریتانیا گەڕایەوە روسیا باوکی بە جێوبان کەوتبوو.

بە راسپاردەی پزیشکەکان تەزار بۆ کۆشکی هاوینی" لیوادیا" راگوێزرا، چـونکی هـەوای گەرم و هەتاوی لێوار دەریا بۆ گەڕاندنەوەی تەندروستیی ئەو بە شـتێکی بـە کـەڵك زانرابـوو، بەڵام تەزار چاك نەبۆوە و لەبەر ئەوەی کە مەرگی خۆی بە نزیك دەزانی داوای لە نیکۆلا کـرد، کە دەسگیرانی و شابانووی داهاتووی روسـیای بێنێتـە ژوورسـەری. پرێنسـس ئـالیکس رۆژی بیستەمی ئۆکتۆبەری 1894 لە رێگەی سیمفێرۆپۆلەوەsimpferopol گەیشتە لیوادیاو لە مـاوەی دە رۆژی کۆتـایی ژیـانی تـەزار ئالیکسـاندری سـێیەمدا چـەندین جـاران لەگـەڵ دەسگیرانەکەی چوونە لای خەزووری داهاتووی.

مەرگی تەزار ئالیکساندری سێیەم بۆ کوڕ و جیگرەوەی داهاتووی خۆی رووداوێکی دڵتەزێن و راچڵەکێنەر بوو.

سـەرەڕای ئـەو هـەمووە هـەوڵ و خۆماندووکردنـەی تـەزار بـۆ پـەروەردەی سـوپایی و چاوەدێریکردنی لە پێناوی پەروەردە و راهێنانیدا، نیکۆلا لە هێـز و زیپکوزاکـوونی بـاوکی هیچی بە میرات پێنەگەیشتبوو و یۆنیفۆرمی سوپایی ئەو بە تەنیایی قەرەبووی ئەو هەمووە لاوازییە دەروونییەی ئەوی نەدەکردەوە. گراندۆك ئالیکساندری زاوای نیکۆلا، کە یەکێك بوو لە کەسانی نزیك و جیّ متمانـەی ئـەو لـە بیرەوەرییەکانیـدا سـەبارەت بـە مـەرگی تـەزار ئالیکساندری سێیەم و کاریگەریی ئەو لە سەر تەزاری داهاتوو دەنووسیّ:"کاتێك تەزار مرد، نیکۆلا وەك مندالان هۆڕ هۆڕ دەگریاو چاوە شینەکانی وەکو گـۆزەی سـەرەوبن فرمێسـکیان دەباراند.... ئەو بەدەم گریانەوە قۆڵی گرتم و بردمییە دیوەکـەی خـۆی و لـەوێش ماوەیـەك یەکترمان لە باوەش گرت و گریاین. ئەو نەیدەتوانی بە سەر خۆیدا زاڵ بیّ و لە ترسـی ئـەو ئەرکە قورسەی، کە وەکو ئیمپراتۆری داهاتووی روسیا دەکەوتە سەر شانی هەڵ دەلەرزی... پاش ئەوەی هێندیّ هێور بۆوە بە حاڵەتێکی وەك پاڕانەوە و لالانەوە گوتی:"سـاندرۆ"(منـی بەو ناوە بانگ دەکرد) دەبیّ چ بکەم؟ من و تۆو ئالیکس و خوشکم و دایکم و روسیا چـمان بەسەر دیّ؟ من قەت نەمدەویست ببمە تەزار. من چ سەرەدەر لە دەسـەڵاتداری دەرناکـەم و تەنانەت نازانم وەزیرەکانیش چۆن بدوێنم؟

یەکەمین بڕیاری گرینگی نیکۆلای دووەم لە پلەی تەزاریی روسدا ئەوە بوو، کـە رێکـەوتی زەماوەندەکەی وەپێش بخات چونکە پێی وابوو بە بیّ هاوسـەرەکەی، کـە بـە خەسـتی شـێت و

شەیدای ببوو باری قورسی ئەو ئەرکە نوییەی پێ هەڵناگیردرێ. نیکۆلا پێداگر بوو لە سەر ئەوەی کە ڕێوڕەسمی زەماوەندەکەیان هەر لەو حەوتووەی یەکەمی پاش مەرگی باوکیداو" هەتا باوکی لە ژێر میچی ئەو ماڵەدایە" بە شێوەی تایبەتی لە لیوایاد بەڕێوە بچێ، بەڵام مامەکانی نیکۆلا بە توندی دژی ئەوە بوون، کە بەر لەوەی براکەیان بنێژرێ ئەو ڕێوڕەسمە بەڕێوە بچی و دواجار هاتنە سەر ئەوەی کە ڕۆژی بیست و شەشەمی نۆڤەمبەر پاش ڕێوڕەسمی بەخاك ئەسپاردنەکە لە سەنپیێترزبۆرگزەماوەندەکە بکرێ. پادشاو شازادە و بەرپرسانی دەرەکی، کە بۆ بەشداربوون لە ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنەکەدا هاتبوونە روسیا لە ڕێوڕەسمی زەماوەندەکەشدا بەشدارییان کرد و ئەو بەریەککەوتنە بە لای زۆربەی خەڵکی روسیاوە شتێکی شووم بوو، بە جۆرێك، کە لەو کاتەدا زۆر کەس ئەمەیان لە بن لێوانەوە دەگوتەوە:" ئەم بووکە بە دوای تابووتێکدا هاتووەتە روسیا."

نیکۆلای دووەم لە تەنیشت هاوسەرێکەوە، کە ئەویندارانە خۆشی دەویست هەستی بە بەختەوەری و هێمنی دەکرد، بەڵام ئەو زەماوەندە بۆ ئەویش و بۆ روسیاش کۆتاییەکی خۆشی نەبوو و هۆکارگەلێکی جۆراوجۆر هەر لە دەسەڵاتی شاژنەوە بە سەر تەزاری نوێوە بگرە هەتا دەگاتە هەڵسوکەوتی ئەو لەگەڵ خەڵکی نێو دەربار و دەوروبەرییەکانی تەزار و بەگشتی گواستنەوەی نەخۆشیی خوێن بەربوون hemophili لە خۆیەوە بۆ تاقانە کوڕەکەی، کە بووە هۆی هاتنی کەسێکی جێی گومانی وەك راسپۆتین بۆ نێودەرباری روسیا، یارمەتیدەر بوون بۆ لەرزۆککردنی پێگەی نیکۆلای دووەم و بە هێزکردنی لایەنە شۆڕشگێڕەکان و رووخانی ئیمپراتۆری. شاژن، کە پاش زەماوەند بە"ئالیکساندەر فیۆدۆرۆنا" ناوی دەرکردبوو هەتا کۆتایی ژیانیشی نەیتوانی بە جوانی فێری زمانی روسی بێت و بە زمانی ئەڵمانی یا فەڕەنسی یا ئینگلیزی لەگەڵ مێردەکەی و دەوروبەرییەکانی قسەی دەکرد. ئەو هەر لە سەرەتاوە دانووی لەگەڵ شاژن "ماری" دایکی نیکۆلا نەدەکوڵی و هەڵسوکەوتی ساردوسڕی ئەو لەگەڵ ژنانی نێو دەربار بە تایبەتی چوار ئامۆژنەکەی تەزار، کە کاریگەریی زۆریان بە سەریەوە هەبوو مێردەکەی تووشی کۆڵێك گۆنگەل و گێچەڵ دەکرد، بەڵام گەورەترین گرفتی ئەو ئەوە بوو، کە منداڵێکی نێرینەی بۆ تەزار لێ نەدەکەوتەوە. مەلیکە ئالیکساندرا لە حەوت ساڵی یەکەمی زەماوەندکردنیدا چوار زگی کرد و هەر چوار جار کچی بوو، پاش ئەوەی کە مەلیکە بە نیازی کوڕ دەستەوداوێنی نزا و سیحر و جادوو بوو و بە لە دایکبوونی منداڵێکی نێرینە، کە ناویان نا ئالیکسیس باوەڕە خورافی و کۆنەپەرستییەکانی هێندەی‌تر خەست بوونەوە، بەڵام جێژنەکانی

له دایکبوونی ئەو منداڵە لە مانگی ئووتی ساڵی 1904دا کەوتنە ژێر سێبەری شکستی هێزەکانی روس، لە شەڕی گەڵ ژاپۆندا و تووشبوونی ئەو بە نەخۆشینی هێمۆفیلی، کە بووە هۆی هاتوچۆی راسپۆتین بۆ دەرباری روسیا سەرەتای کۆمەڵێك نەهامەتیی دیکە بوون.

ساڵی 1905 لە مێژووی روسیادا خاڵێکی وەرسووڕانی گرینگ بوو. لە مانگی ژانویەدا هەواڵی تێکشکانی سەرئەنجوومەنی هێزەکانی روسیا لە شەڕی گەڵ ژاپۆن دا و، دۆڕاندنی بەندەری"پێرت ئارتۆر" ئاگری ناڕەزایەتییەکانی نێو روسیای خۆش کرد و یەکەمین شەپۆلەکانی مانگرتنی کرێکاری لە پایتەختدا دەستیان پێ کرد. رێبەری مانگرتنەکان قەشەیەکی گەنج بوو بە ناوی گاپۆن، کە رێکخراوێکی کرێکاریی بە ناوی "کۆمەڵگەی کرێکارانی روس" دامەزراندبوو و لە هەوڵی ئەوەشدا بوو، کە پێش بە هاتنی کەسانی چەپ و هێژمووونی رێکخراوگەلی لادەر بۆ نێو بزاڤی کرێکاریی روسیا بگرێ، رۆژی یەکشەممە بیست و دووەمی ژانویە سەد هەزار کرێکاری مانگرتوو لە حاڵێکدا، کە گاپۆن لە پێشیانەوە دەڕۆیشت بەرەو کۆشکی زستانیی تەزار وەڕێکەوتن و خوازیاری ئەوە بوون، کە تەزار، نوێنەرەکانیان وەرگرێ . ئەوانەی رێپێوانیان دەکرد لە سەر رێگەیان هیچ تێکهەڵچوونێکیان لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشدا نەبوو کەچی لە نزیك کۆشکی زستانی، قەزاقەکان و هێزی سوارکاری گاردی ئیمپراتۆر رێگەیان پێ گرتن. جەماوەر بە بێ گوێ پێدان بەو هێزانە ملیان بە رێگەوە ناو لەو کاتەدا سەربازەکان تەقەیان لێکردن. لەو رووداوەدا، کە بە "یەکشەممەی خوێناوی بەناوبانگە" بە پێی سەرژمێریی فەرمی 92 کەس کوژراون و چەند سەد کەسێك بریندار بوون، بەڵام ئەو ئامارەی، کە لە لایەن رێکخراوەکانی کرێکاری و گرووپگەلی دژبەری رژێم بڵاو بوونەوە، ژمارەی کوژراوانیان چەندین هەزار کەس لە قەڵەم دا.

رووداوەکانی یەکشەممەی خوێناوی کاتێك هاتنە پێش، کە لە ماوەی یازدە ساڵ پادشایەتیی نیکۆلای دووەم دا روسیا بە پێشکەوتنی خێرای بەرەو بەپیشەییبوون، ببوو بە یەکێك لە وڵاتانی پیشەیی پێشکەوتووی جیهان و لە ماوەی دە ساڵاندا بەرهەمە پیشەییەکەی دوو بەرامبەر ببوو. روسیا، کە هەتا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە بە وڵاتێکی کشتوکاڵی دەناسرا و بەشی هەرە زۆری پێداویستییەکانی خۆی لە رێگەی کڕینی کاڵای پیشەیی لە وڵاتانی دەرەوە دابین دەکرد، ئێستا گەیشتبووە قۆناغی خۆبژیوی و تەنانەت هێندێك لە کاڵاکانی خۆیشی هەناردە دەکرد.

ژمارەی کرێکارانی نێو یەکە پیشەییەکان زیاتر لە چوار ملیۆن کەس دەبوون و پەرەپێدانی تۆڕی هێڵی شەمەندەفەر، کە لە ساڵی 1905دا دەگەیشتە حەفتاهەزار کیلۆمەتر، شوێنە

دوورەدەستەکانی ئەو وڵاتەی پێکەوە گرێ دەدا. هەر بۆیەش هەواڵی پێوەندیدار بە ڕووداوەکانی یەکشەممەی خوێناوی و دەنگۆی کوژرانی هەزاران کرێکاری مانگرتوو بەدەستی سەربازانی تەزار بە خێرایی لە سەرانسەری ڕوسیادا بڵاو بۆوە و ڕێگەی بۆ حیزبەکان و گرووپگەلی چەپی و شۆڕشگێڕ، کە لەگەڵ گەشەسەندنی پیشەیی وڵات بواری چالاکیی پتریان بۆ ڕەخسابوو، خۆش کرد، کە شەپۆلی ناڕەزایەتییەکان بە تەواوی ڕوسیادا بڵاو بکەنەوە. بە جۆرێک، کە لە فێبریوەری ساڵی 1905 ـەوە هەتا نۆڤەمبەری ئەو ساڵە نزیك بە سێ ملیۆن کرێکار لە پایتەخت و شارە گەورەکانی ڕوسیادا دەستیان کرد بە مانگرتن و پیشەی تازە پێ هەڵگرتووی وڵاتیان تەواو ئیفلیج کرد. لە مانگی فێبریەدا یەکێك لە مامەکانی تەزار بە ناوی گراندۆك سێرگی، بەدەستی یەکێك لە تیرۆریستەکانی حیزبی سۆسیالیست کوژرا و سێ مانگ دواتر بە هۆی چالاکیی گرووپگەلی شۆڕشگێڕ هێندێ جموجۆڵ لە نێو هێزە چەکدارەکان لە سوپادا دەستی پێکرد، کە گرینگترینیان شۆڕشی مەلەوانانی "پوتمکین" لە دەریای ڕەشدا بوو.

تەزار نیکۆلای دووەم کە لە بەرامبەر ئەم ڕووداوگەلەدا گێژ و وڕ ببوو، دواجار لە سەر پێشنیاری کۆمەڵێك لە ڕاوێژکارەکانی خۆی لە ڕۆژی 19ی ئوتدا بە دەرکردنی فەرمانێك پێك هێنانی پەرلمانێکی ڕاوێژکاریی بەناوی "دۆما" ڕاگەیاند. ئەو پەرلمانە، کە دەسەڵاتی یاسادانانی نەبوو لە هەمان کاتدا، کە بە پاشەکشەیەکی ئاشکرای تەزار لە بەرامبەر گوشاری بیر و ڕای گشتی دەژمێردرا بۆ دابینکردنیداخوازییەکانی خەڵك و گرووپە سیاسییەکان بەس و وەڵام دەر نەبوو و لە ئاکامدا نەك هیچ گرفتێکی چارەسەر نەکرد، بەڵکو خەڵکی چاوکراوەتر و ئازاتر کرد بۆ ئەوەی کە شێلگیرانەتر لە پێناوی وەدیهاتن و دابینبوونی ئازادییەکانیاندا خەبات بکەن.

شەپۆلی ڕاپەڕین و مانگرتنەکان لە مانگی ئووتدا بەربڵاوتر بوونەوە و لە مانگی سێپتەمبەردا کرێکارانی نانەواخانە و فەرمانبەرانی دایرەی پۆستە و تەلەگراف و کرێکارانی چاپخانەکان چوومە نێو ریزی مانگرتووانی کارخانەکانەوە.

لە مانگی ئۆکتۆبەردا مانگرتنی گشتیی کرێکارانی ڕێگەی شەمەندەفەر دەستی پێکرد و ڕۆژی 25ی ئۆکتۆبەری ساڵی 1905 بە ڕاگیرانی تەواوی شەمەندەفەرەکان وڵات بە تەواوی گەیشتە قۆناغی ئیفلیجبوون.

# 3

حیزبی سۆسیال دیموکراتی روسیا، کە کۆنترین و دەستڕۆیشتووترین رێکخراوی سیاسیی دژی رژێمی تەزاری بوو بەر لە رووداوەکانی سالی 1905 بەسەر دوو گرووپی "بۆلشەڤیك" و "مەنشەڤیك"دا بەش ببوو و رێبەرەکانیان، کە زیاتر یا لە سویسرا یا لە ولاتانی دیکەی ئەورووپای خۆرئاوا دەژیان بۆ بەدەستەوە گرتنی جلەوی رێبەرایەتیی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی نێو روسیا کەوتبوونە رکەبەریی یەکتری.

مەنشەڤیکەکان بەر لە بۆلشەڤیکەکان بۆ بەدەستەوە گرتنی رێبەرایتیی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی نێو روسیا، وەخۆ کەوتن و یەکێکیان بە ناوی لیۆن ترۆتسکی بە دامەزراندنی یەکەمین جڤین"سۆڤیت" یا جڤینی نوێنەرانی کرێکارانی روسیا لە پایتەخت ملی لەبەر ملی حکوومەتی روسیا نا.

جڤینی سەنپیێترێزبۆرگ، کە چل کەس لە نوێنەرانی کرێکارانی پایتەخت تێیدا ئەندام بوون، رۆژی بیست و هەشتەمی ئۆکتۆبەر داوای لەتەواوی کرێکاران و خاوەن کاران و دووکانداران کرد، کە هەتا بڕیاری داهاتوو دەست لە کار بکێشنەوە. تەنیا نانە واخانە و دووکانە خۆراك فرۆشییەکان ئیزنیان پێدرا، کە بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك لە رۆژدا کار بکەن. وریاییاندا بە خاوەن کاران و کارخانەداران و کارگە و ئەوکەسانەش، کە ئیشی ئازاد دەکەن، کە ئەگەر کار بکەن" لە رەخنەی جەماوەر پارێزراو نابن" خەلك بە تۆقیوی ئەو فەرمانەیان لە گوێ گرت و ژیان لە پایتەختی روسیا بە تەواوی ئیفلیج بوو.

یەکەم سەرکەوتنی یەکێتیی سۆڤیەتی یا جڤینی نوێنەرانی کرێکارانی روسیا، بووە هۆی دامەزرانی رێکخراوگەلێکی لەو چەشنە لە شارە گەورەکانی روسیادا. جلەوی کارەکان وردە وردە لە دەست حکوومەت هاتنە دەرێ و تەزاریش نەیدەتوانی لە سەر ئەو دۆخە مەترسێدارەی هاتبووە پێش بڕیارێك بدات. تەزار نیکۆلا لە نامەیەکی بە ناوبانگدا، کە ئەو کات بۆ دایکی نووسیوە بەو شێوەیە باسی گیروگرفتەکانی خۆی دەکا:

من لە دوو رێگەم پتر لە بەردەمدا نەماوە، یا دەبێ سیستەمێکی توند و تیژ و جیددی بۆ سەرکوتی ئەم سەرهەلدانەوەدۆزم، کە بۆ ماوەیەك هێمنی و دەرفەتی پشوودانێکمان دەداتێ، بەلام

گرفتەکە چارەسەر ناکاو پاش چەند مانگان دیسان ناچار دەبینەوە توند و تیژی بە کار بێنین و رووباری خوێن وەڕێبخەینەوە. ڕێگە چارەیەکی دیکەش ئەوەیە، کە مافی مەدەنی و ئەو ئازادییانەی، کە خەڵك داوایان دەکەن بیاندەینێ، ئازادیی بیر و ڕا دەربڕین دابین بکەین و مافی یاسادانان بدەینە پەرلمانێکی هەلبژێردراوی خەڵکی و یاسایەکی بنەڕەتی بۆ روسیادا برێژین. ڤیتێ لایەنگری ئەم ڕێگە چارەیەیە و وەرگرتنی پلەی سەرۆکی وەزیرانی بە قەبوولکردنی ئەو مەرجەوە گرێ داوەتەوە...

ئاخرییەکەی تەزار نیکۆلای دووەم ملی بۆ بۆچوونەکانی کۆنت ڤیتێ ڕاکێشا و ڕۆژی سیی 30ی ئۆکتۆبەر پلەی سەرۆکی وەزیرانی پێ سپارد. لە ڕاگەیەندراوێکدا، کە بە بۆنەی دانانی سەرۆکی وەزیرانەوە دەرکرا تەزار بەڵێنی بە خەڵكدا، کە پەرلمانێکی نوێ بە دەنگی خەڵك هەڵدەبژێردرێ، ئازادیی نووسین و بیر و را دەربڕین و کۆڕ و کۆبوونەوان دابین دەکرێن هەلومەرجی کارکردن باش دەبێت، مافی کرێکاران بۆ پێك هێنانی ڕێکخراو و یەکییەتی بە فەرمی دەناسرێ. تەزار لەو ڕاگەیەندراوەدا بۆ یەکەمین جار رایگەیاند، کە لەمەودوا هیچ یاساو ڕێسایەك بە بێ پەسندکرانی دۆما جێبەجێ ناکری و بەم شێوەیە پەرلمانی ڕاوێژکاریی دۆما بوو بە پەرلمانی یاسادانان.

بەڵام ئەو پوانە بەربلاوانەش ڕاپەڕیوان و سەرهەڵداوانی قایل نەکرد. ترۆتسکی لە یەکەمین ژمارەی ڕۆژنامەی "ئایزۆستینا"دا، کە لە سەنپێترێزبۆرگەوە دەرچووبوو نووسیی: بەڵێنەکانی تەزار دەردێك دەرمان ناکەن و دامەزرانی دۆما کۆتایی بە زوڵم و سەرەڕۆیی ناهێنێ. ئەنجوومەنی کرێکاری دەنگی دا بە درێژەدانی مانگرتن و ڕۆژی سی و یەکەمی ئۆکتۆبەر ڕێپێوانێکی مەزن لە سەنپێترێزبۆرگ وەڕێکەوت. ترۆتسکی لە پێشەوەی جەماوەرەکەوە دەڕۆیشت و کرێکاران، کە ئاڵای سووریان بەدەستەوە بوون و دەجمان، سروودی شۆڕشگێڕییان دەخوێندن. هەڵبەت هیچکام لە مەلەوان و سەربازان لە ڕێپێوانەکاندا بەشدارییان نەکردبوو و هێشتا بە سوپا وەفادار مابوونەوە.

ڕۆژی سێیەمی نۆڤەمبەر مانگرتن کۆتایی پێ هات، بەڵام ئایزۆستیا درێژەیدا بە وروژاندنی کرێکاران، ترۆتسکی لە وتارێکی توندا نووسی :" پرۆلتاریا ڕێگەی خۆی دۆزیوەتەوە و ئیتر فریوی کەسانێکی لیبراڵی وەك ڤیتێ ناخوات. ئەوانە گەرەکیانە ناوی یاسای بنەڕەتی لە سەر قەمچیی قەزاقەکان دابنێن، بەڵام چینی کرێکار ئیتر هەڵناخەڵەتێ..."

لاوازیی حکومەتی ڤیتێ و پاشەکشەی هەنگاو بە هەنگاوی لە بەرامبەر هێزە سەرهەڵداوەکاندا ڕۆژبەرۆژ ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکارانی چاوقایمتر و بوێرتر دەکرد،

که راشکاوانه بۆ دەسپێکردنی دوایین خەبات داوا لە کرێکاران بکات چەك هەڵگرن و لـە نێوهێزەکـانی سوپاشدا هێندێ جووڵەی وەرێخستن. ئەو چالاکییانە ڕۆژی هەشتەمی نۆڤەمبەر بە ئاکام گەیشـتن و یەکەمین سەرپێچی و سەرهەڵدانی چەکداری لە نێو مەلەوانـەکانی " کرۆشـتات"دا رووی دا. ڕاپـەڕین سەرکوت کراو ڕێبەرەکانی لە دادگایەکی سوپاییدا دادگایی کران. بەر لە کۆتـایی ئـەم دادگاییـە، کـە لەوانە بوو بڕیاری ئیعدامی تاوانبـارانی لـێ بکەوێتـەوە ئەنجوومـەنی کرێکـاران مـانگرتنی گشـتیی ڕاگەیاند و ئەم جارە جگە لە مەسەلەی پێوەندیدار بە ژیانی کرێکارانەوە، داوای زیادکردنی حەقدەسـتی کـاری ڕۆژانــە و بەرتەسـککردنەوەی ئیشـی ڕۆژانـە تـا هەشـت کاتـژمێر و هەڵوەشـاندنەوەی دادگـا سەربازییەکان و هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری ئیعدامیش لـە داواکـانی کرێکـاران زیـاد بـوون. مـانگرتنی گشتی بەربڵاو و ماڵوێرانکـەر بـوو و کۆنـت ڤـیتێ بـۆ کۆتاییهێنـان بـە مـانگرتن جـارێکی تـریش پاشەکشەی کرد و بە ڕاوێژێکی وەك پاڕانەوە، کە هەرگیز لە سەرۆك وەزیرێکی تەزار نەبیسرابوو لەگـەڵ کرێکاران قسەی کرد. ئەو لە پەیامێکدا بـە کرێکـارانی گـوت:" برایـانی کرێکـار، بگەڕێنـەوە سـەر ئیشەکانتان و کۆتایی بە خۆپێشاندان و بشێوی بێـنن. بـەزەییتان بـە مـاڵ و منداڵتانـدا بـێ... مـن دەمەوێ کێشەکانتان چارەسەر بکەم. متمانەم پێ بکەن... وڵات کەوتۆتە مەترسییەوە. لە من گـەڕێن باوردە وردە ئەو گرفتانە چارەسەر بکەم."

بەڵام وەڵامی نوێنەرانی کرێکاران بە پەیامی پاڕانەوەیی سـەرۆك وەزیـران تونـد و ناشـیرن بوو. ئەوە لە وەڵامەکەدا هاتبوو:"... سەرۆك وەزیرانی تەزار بۆی نییە بە کرێکاران بڵێ برا... ئێمە ئەو سووکایەتییە ڕەت دەکەینەوە. پرۆلتاریای ئێمە هیچ خزمایەتییەکی لەگـەڵ سـەرۆك وەزیری تەزاردا نییە."

لە وەها بارودۆخێکی ئاڵۆز و قەیراناویـدا بـوو، کـە لیـنین گەڕایـەوە ڕوسـیا. لـە یەکشـەممەی خوێناویی ژانوییەی 1905وە هـەتا مـانگی نۆڤەمبـەر، کـە لیـنین گەڕایـەوە ڕوسـیا بزووتنـەوە شۆڕشگێڕییەکان لە ڕوسیادا بە هەشتاوتر ببوون و لینین، کە نیگەرانی ئـەوە بـوو ڕێبـەریی شـۆڕش کەوتبووە دەستی خەنیمە مەنشەویکییەکانی پێی باش نەبوو لەوە زیاتر لـە گەڕانـەوەی بـۆ ڕوسـیا خۆی وەدرەنگی بخا. هەڵبەت لەو ماوەیەدا لینین دەستی لە سەر دەستدانەنابوو. ئەو هاوکات لەگـەڵ بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە ڕوسـیادا لـە 25ی ئاپریلـەوە هـەتا 10ی مـانگی مـای 1905 سێیەمین کۆنگرەی سۆسیال دیموکراتەکانی ڕوسـیای لـە لەنـدەن گـرت. تـەنیا بەلشـەڤیکییەکان و لایەنگرانی لینین لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون و وێڕای پشتگیری لە لیـنین، داڕشـتنی ڕاپـەڕینێکی چەکدارییان خستە سەرووی پلانە نوێیەکانی حیزبەوە.

لەگەڵ بەربەرین بوونەوەی کەوشەنی شۆڕش کەسانی زێدەڕۆ و دەمارگرژ، یا بە وتەی مێژوونووسانی کۆمۆنیست "کۆنەپەرستان"ی دەرباری تەزار نیکۆلای دووەم هەڕشەی ئەوەیان کرد، کە ئەگەر سیاسەتی هێمنانە و ئاشتیخوازانەی سەرۆکی وەزیران هەروا درێژەی هەبێ رووخانی رژێم مسۆگەرە. تەزار، کە کەوتبووە ژێر کاریگەریی راوێژکارە متمانە پێکراوەکانی بە بێ سەرنجدان بە سیاسەتی گشتیی دەوڵەتی "کۆنت ڤیتتێ" وەزیری نێو خۆ واتە "دورنۆڤ-"ی بانگ کرد و پێی گوت :"ئیتر دانبەخۆداگرتن بەسە ئەگەر لەوە زیاتر نەرمی بنوێنین سەرمان بە فەتەڕات دەچێ، من ئیزنت پێ دەدەم، کە هەرچی پێویستە بۆ سەرکوتی ئەو سەرهەڵدانە و سەقامگیری و هێمنی بیکەن. لەوکاتەدا کارخانەکان بە هۆی مانگرتن و کەم کاری و بێ سەرەوبەرەیی کرێکاران بە تەواوی لە کار کەوتبوون و پێوەندییەکانی وڵات بە هۆی مانگرتنی فەرمانبەرەکانی پۆستە و گەیاندن پچڕابوون. هێندێ جموجۆڵ لە نێو مەلەوان و سەربازەکانیشدا بەدی دەکرا و بواری سەرهەڵدان و سەرپێچیکردن لە نێو ریزەکانی هێزە چەکدارەکاندا وردە وردە دەرەخسا. رۆژی 15ی دیسێمبەری 1905 ئەنجوومەنی کرێکارانی سەنپێترێزبۆرگ لە راگەیەندراوێکداو راشکاوانە داوای لە خەڵك کرد مالیات بە حکومەت نەدەن و بۆ رووخاندنی رژێم راپەڕن. وەزیری نێوخۆ بۆ بەڕێوە بردنی فەرمانەکانی تەزار لە یەکەمین دژکردەوەی گرژ و شێلگیرانەی خۆی لە بەرامبەر کرێکاراندا خستە روو: رۆژی شازدەی دیسێمبەر تەواوی ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی کرێکاران دەسبەسەرکران و تەواوی ئەو رۆژنامانەش، کە راگەیەندراوەکەی ئەوانیان چاپ کردبوو، داخران.

بۆلشەڤیکەکان لە سەرەتای مانگی دیسێمبەرەوە چالاکییەکانیان بەربلاوتر کردبۆوە و دەستیان کردبوو بە کڕینی چەکوچۆڵ ی قاچاخ لە دەرەوە و پێك هێنانی دەستە و گرووپی چەکداریی بیست و پێنج کەسی. بە پێچەوانەی مەنشەڤیکەکان، کە بەشی هەرە زۆری چالاکییەکانیان لە سەنپێترێزبۆرگدا چڕ کردبۆوە لینین بۆ چالاکیی بەلشەڤیکییەکان مۆسکۆی هەڵبژارد و لەو بوارەدا ئەو هەڵبژاردنەکەی زۆر ورد و بەجێ بوو، چونکی پۆلیسی تەزاری لە سەنپێترێزبۆرگ بۆ بەرپەرچدانەوەی هێزە شۆڕشییەکان زۆر تەیار و پڕ چەك بوون لە حالێکدا مۆسکۆ زۆر هەستیارتر بوو و بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە شارەدا زیاتر شانسی سەرکەوتنیان هەبوو.

رۆژی بیستەمی دیسێمبەر بە دوای گیرانی ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی کرێکاران وداخرانی رۆژنامەکاندا فەرمانی مانگرتنی گشتی دەرکرا.

سەنپیێترێزبۆرگ پێشوازییەکی ئەوتۆی لەو فەرمانانە نەکرد، بەڵام لە مۆسکۆ بە هۆی ئامادەکاریی بۆلشەڤیکەکان مانگرتن، بوو بە سەرهەڵدان و بشێوییەکی مەزن. بریگاردە چەکدارەکان لە شەقامەکاندا دەستیان کرد بە گرتنی رێگەوبان و دروستکردنی سەنگەر لە شەقامەکاندا و بۆ یەکەمجار لە سەر شەقام تێکهەڵچوون لە نێوان خەڵك و هێزە چەکدارەکاندا هاتە پێش.

دوباسۆڤ فەرماندەری لیوای مۆسکۆ، کە لە خراپیی رەوشەکە تێگەیبوو داوای یارمەتیی لە پایتەخت کرد. سەنپیێترێزبۆرگ ناردنی هێزی پشتیوانی خستە پشت گوێ و لە ئاکامدا چالاکیی سەرهەڵداوان و بریگاردە چەکدارەکانی بۆلشەڤیکییەکان لە مۆسکۆ بەربلاوتر بۆوە و هێزەکانی حکوومەت و پۆلیس بە کردەوە جڵەوی کۆنترۆڵی شاریان لە دەست دەرچوو. سەنپیێترێزبۆرگ پاش حەوتوویەك هێزەکانی خۆی بە یەکەیەکی تۆپخانەوە ناردە یارمەتی و دوباسۆڤ رۆژی بیست و نۆیەمی دیسێمبەر شەقامەکانی مۆسکۆی لە سەر هەڵداوان پاك کردەوە. بەیانیی رۆژی سی و یەکەمی دیسێمبەر دوایین بنکەکانی بەرگری تێكشکێندران و بۆلشەڤیکییەکان گەلێك خەسار و زیانی قورسیان وێکەوت.

لینین لە حەوتووی قەیراناویی کۆتایی مانگی دیسێمبەردا و لە کاتێکدا، کە بۆلشەڤیکەکان لە شەقامەکانی مۆسکۆدا قەڵت و بڕ دەکران لە فەنلاند دەژیا. لینین بە رواڵەت لە ترسی پۆلیسی تەزاری و دەستبەسەرکران رایکردبوو بۆ فەنلاند، بەڵام ژمارەیەك لە بۆلشەڤیکەکان پاش شکستی نەخشەکانی لینین لە مۆسکۆ و کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە تێکۆشەرانی بۆلشەڤیکی لەم شارەدا لینینیان بە خۆپەرستی و ئاژاوەچی و "نێچیانۆڤیزم" تاوانبار کرد. هەرچەند لینین دەیگوت شۆڕشی مۆسکۆ ئاکام و بەرهەمی باشی بووە و رێگە و دەراوی بۆ شۆڕشێکی گەورەتر خۆش کردووە.

# 4

تــەزار نیکــۆلای دووەم بــە ســەرکوتکردنی ئــاژاوە لــە مۆســکۆ و ســەنپیتریزبۆرگ و ئــەو هێمنایەتییەی بە دوای دەستبەسەر کرانی سەرهەڵداوان و داخرانی رۆژنامەکاندا هاتبووە ئاراوە متمانە بەخۆییەکەی گەڕایەوە و ئەو پوانانەی لە بواری ئازادیی سیاسیدا بە خەڵکیدا بوون لێی سەندنەوە. بەو حاڵەشەوە گەڕانەوە بۆ پاوانخوازیی رابردوو مەحاڵ بوو و کەمترین پوانێکی، کــە دەبوایە بە خەڵك بدرێ ئەوە بوو، کە مافی هەڵبژاردنی نوێنەرانی پــەرلمانی دۆمــا بــەوان بــوو. ئەگەرچی لە سەر رادەی دەست ئاوەڵایی و دەستڕۆیشتوویی دۆما جیاوازیی بــیر و را لــە نێــوان دەوروبەرییەکانی تەزاردا هەبوو و گرووپە دەسەڵاتدارەکان لایەنگری تونــد و تیــژیی زیــاتر لــە بەرامبەر دژبەراندا بوون دەیانوویست دۆما زیاتر رۆڵێکی راوێژکارانە و کارتۆنیی هەبێ.

راگەیاندنی بڕیاری دەوڵەت سەبارەت بە هەڵبژاردنەکان بۆ دیارییکردنی نوێنــەرانی دۆمــا نــاکۆکیی خستە نێو هێــزە شۆڕشــگێڕەکان و سۆسیالیســتەکانەوە. مەنشــەڤکەکان لایــەنگری بەشــداربوون لــە هەڵبژاردنەکاندا بوون و لە سەر ئەوە باوەڕە بوون، کە بە ناردنی نوێنــەر بــۆ دۆمــا دەتــوانن لــە پشــتی تریبوونەکانەوە دەنگی ناڕەزایەتیی خۆیان بگەیەننە گوێی خەڵك و بەرپرسانی حکــوومی، لــە حاڵێکــدا لینین بە توندی دژی بەشداربوون لە هەڵبژاردنەکاندا بوو و داوای لە هەموو هێزە شۆڕشــگێڕەکان دەکــرد بایکۆتی بکەن. لینین مەنشــەڤیکەکان و لیبراڵــەکانی بــەوە تاوانبــار دەکــرد، کــە گەرەکیانــە لەگــەڵ حکوومەتدا سات و سەودا بە تەرمی کرێکارە شۆڕشگێڕەکانەوە بکەن و رەوایی بەو رژێمە زاڵمە بدەن.

هەڵبژاردنەکانی دۆما سەرەڕای دژایەتیی لینین و بایکۆتی هەڵبژاردن لــە لایــەن دەســتەیەك لــە حیزبە سۆسیالیستەکانەوە بەڕێوە چوو و لە ئاکامدا جگ لە نوێنەرانی رژێم نزیك بە سەد کــەس لــە نوێنەرانی وەرزێران و دوازدەکەسیش لە نوێنەرانی کرێکــاران چــوونە پــەرلمان. نوێنــەرانی وەرزێــران گرووپێکیــان بــە نــاوی "تروودۆڤیــك" یــا زەحمەتکێشــان پێــك هێنــان و نوێنــەرانی کرێکــارانیش فراکسیۆنێکیان پێك هێنا، کە بە گرووپی سۆسیال دیموکرات ناویان دەرکرد.

رۆژی دەی مانگی مای1905 پەرلمانی دۆمــا بڕیارگــەلێکی نــوێی ســەبارەت بــە دانــی ئازادیی سیاسی بە خەڵك و بەندکراوانی سیاسی و هەڵوەشاندنەوەی سزای ئیعدام دەرکرد. لــەو

بڕیارگەلەدا، کە وەکو بڕیارنامەیەك پەسند کران پێشبینیی درانی خودموختاری بە پۆلۆنیا و فەنلاند و لەبەر چاوگرتنی مافی یەکسانی و خودموختاری بۆ نەتەوە جۆاوجۆرەکان و دابەشینی زەوی و زار بەسەر وەرزێرانیشدا، کرابوو.

لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەو بڕیارگەلە لە لایەن دۆماوە ئەو پەرلمانە متمانە و قورساییەکی لە رادەبەدەری وەدەست هێنا. پۆلخانۆف و مەنشەڤیکەکانیش لەگەڵ پشتڕاستکردنەوەی ئەو بڕیارگەلە داوایان لە خەڵکی روسیا کرد ناکۆکییەکانیان وەلابنێن و پشتیوانی لە دۆما بکەن، بەلام بۆلشەڤیکەکان هەر وا دریژەیاندا بە دژایەتیی خۆیان لەگەڵ دۆماو رۆژنامەکەیان، کە دیسان دەستی کردبۆوە بە وەشاندن نووسیی: بڕیارەکانی دۆما لە هەڵخەڵەتاندن بەو لاوە شتێکی تر نین و لیبراڵەکان بەو کارەیان دەیانە وێ پێش بە شۆڕشێکی نوێ بگرن، کە تاقانە ڕێگەی رزگاریی روسیایە.

لەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەوە، کە لە کاتی شۆڕشی 1917دا لە ئەرشیڤی "ئۆخرنا"(پۆلیسی نهێنیی تەزاری روسیا) وەدەست کەوتوون و بڵاو بوونەتەوە دەردەکەوێ، کە پۆلیسی تەزارییش لە دنەدان و پرۆپاگەندە دژی دۆما هاوکاریی بۆلشەڤیگەکانی کردووە و دەستی ئەوانی بۆ ئەو کارە ئاوەڵا هێشتۆتەوە. بەپێی ئەم بەڵگانە "ئۆخرنا" لە پێك هێنانی کۆڕ و کۆبوونەوە و میتینگەکانی بۆلشەڤیکەکانیشدا یارمەتیی کردوون، چونکی پۆلیسی نهێنیی تەزار و دەست و پێوەندە کۆنەپەرستەکانی نێو حکوومەتی تەزاری لە بۆلشەڤیکەکان پتر لە بە دەسەڵات گەیشتنی دۆما دەترسان.

بەڵگەیەکی روون بۆ هاوئاهەنگیی پۆلیسی نهێنیی تەزار و بۆلشەڤیکەکان ئەوەیە، کە لە تەواوی ماوەی خەباتی بۆلشەڤیکەکاندا دژی دۆما هیچ کۆسپ و ئاستەنگییەکیان نەهاتە سەر ڕێگەی چالاکییەکانیان و خۆپێشاندان و کۆبوونەوەکانی بۆلشەڤیکەکان بە بێ هیچ رووداو و تێکهەڵچوونێك لەگەڵ پۆلیسدا بەڕێوە دەچوون. لینین لەو خەباتەدا لەوانەیە بە بێ ئەوەی خۆی هەست پێ بکات یا بیەوێ لەگەڵ کۆنەپەرستترین دەست و پێوەندەکانی دەرباری تەزاردا، هاوکاریی کرد و تەزار 72 رۆژ پاش پێك هێنانی دۆما لە ژێر کاریگەریی لە گوێ خوێندنەکانی ئەواندا فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دۆمای دەرکرد. بەو خەباتەی، کە بۆلشەڤیکەکان دژی دۆما وەڕێیان خستبوو مەنشەڤیکەکان و لایەنگرانی دۆما نەیانتوانی دژکردەوەیەك لە بەرامبەر ئەم بڕیارەی تەزاردا بنوێنن، هەر بۆیەش ئەو هەلە زێڕینەی، کە بۆ سەقامگیربوونی دیموکراسی لە روسیادا هەڵکەوتبوو لە کیس چوو.

لە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دۆمادا ڕێکەوتی هەڵبژاردنەکانی داهاتوو بۆ شەش مانگی دوایی دیاریی کرابوو. لەو ماوەیەدا دەست و پێوەندەکانی حکوومەتی تەزار و "ئۆخرنا"

بۆ سەرکەوتنی پاڵێوراوانی خۆیان لەو هەڵبژاردنەدا دەست بەکار بوون. لە لایەکی ترەوە مەنشەڤیکەکان بۆ پێشگرتن لە سەر کەوتنی دەست و پێوەندەکانی رژێم و کەسانی متمانە پێکراوی حکوومەت لە هەڵبژاردندا بڕیاریان دا، کە لەگەڵ هێزە چەپەکان و لیبڕاڵەکاندا بەرەیەك پێك بێنن. بۆ پێك هێنانی ئەو بەرەیە و داڕشتنی پلاتفۆرم و گەلاڵەیەکی هاوبەش لە نێوان هێزە چەپ و لیبڕاڵەکاندا کۆنفرانسێك لە ژانویەی 1907دا لە سەنپێترێزبۆرگ بەسترا. لینین وێڕای ئەوەی، کە پێشتر دژایتیی خۆی لەگەڵ بەشداربوون لە هەڵبژاردنەکانی دۆمادا راگەیاندبوو لە سەرووی وەفدی نوێنەرایەتیی 42 کەسیی بۆلشەڤیکییەکاندا بەشداری ئەو کۆنفرانسە بوو. لینین توانیی کۆنفرانسەکە لەو ئامانجەی، کە پێشتر بۆی دیاری کرابوو دوور بخاتەوە و بە لاڕێیدا بەرێ و هەر بۆیەش مەنشەڤیکەکان کۆنفرانسەکەیان بە جێهێشت و گۆڕەپانیان بۆ لینین چۆڵ کرد.

سەرەڕای دووبەرەکی و ناکۆکیی نێوان هێزە چەپەکان، لە دووەمین پەرلمانی دۆماشدا لیبڕاڵەکان و سۆسیالیستەکان زۆرینە بوون. ئەگەر دۆما لە کەش و هەوایەکی هێمندا دەستی بە کارەکانی کردباو بۆ دابینبوونی ئازادییە تاکە کەسی و کۆمەڵایەتییەکان و پێك هێنانی ریفۆرم هەنگاوی نابا دەوڵەت ناچار دەبوو مل بۆ بەڕێوەبردنی بڕیارگەلی پەرلمانی هەڵبژێردراوی خەڵك راکێشێ، بەڵام حکوومەتی تەزار، کە لەو کاتدا ستۆلیفین سەرۆك وەزیرەکەی بوو وای بە باش زانی بیانوویەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی سەر لەنوێی دۆما بدۆزێتەوە و خۆی لە ئاکامەکانی ئەو بڕیارگەلە دەرباز بکا، کە لەوانەبوو دەرێ بکات. بە هۆی زێدەڕۆیی هێندێ لە نوێنەرانی سۆسیال دیموکرات و داوای شۆڕشی چەکداری لە پشت تریبوونەکانی دۆماوە و پێوەندی گرتن بە رێکخراوی چەکداریی بۆلشەڤیکەکان و نوێنەرانی سۆسیال دیموکراتی دۆماوە، کە پۆلیسی نهێنیی تەزار ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانیان بوو ئەو بیانووە بۆ سەرۆکی وەزیران هەڵکەوت و لەگەڵ ئەوەدا، کە ستۆلیفین ئەو بەڵگانەی خستنە روو، رۆژی شازدەی مانگی ژووئەنی 1907تەزار فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دۆمای دەرکرد و زۆرینەی نوێنەرانی پەرلمانی دۆما، کە تسێرێتێللی tseretelliی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی سۆسیال دیموکرات لە سەرووی هەموانەوە بوو بە تاوانی خەیانەت بڕیاری بەندکران بە سزای تاقەت پڕووکێنەوە و دوورخرانەوەیان بۆ سیبریا بۆ دەرچوو. بە شوێن ئەو رووداوەدا رێکخستنەکانی حیزبی سۆسیال دیموکراتەکان لە سەرانسەری روسیادا کەوتنە بەر پەلامار و لینینیش، کە پۆلیس بە شوێنییەوە بوون دیسان بەرەو فەنلاند تێی تەقاندەوە و لەوێشەوە گەڕایەوە بۆ سویسرا.

سەردەمی دەسەڵاتدارییەتیی پیترا ستۆلیفین لە روسیا، کە لە ساڵی 1906 وە هەتا 1911ی خایاند بە باشترین قۆناغی پادشایەتیی بیست و سێ ساڵەی نیکۆلای دووەم دەژمێرێ، چونکی لە سەردەمی سەرۆکایەتیی وەزیرانی ئەو پیاوە بە هێزەدا روسیا دیسان هێمن بۆوە و هاوتەریب لەگەڵ سەرکوتی تاقمە توندڕەوەکاندا هێندێ ریفۆرم بە مەبەستی راکێشانی سەرنجی گشتی هاتنە ئاراوە. گرینگترین کاری ستۆلیفین ریفۆرمی زەوی وزار و دابەشینی زەوی بە سەر وەرزێراندا بوو بە جۆرێك، کە لە کۆتایی حکوومەتی پێنج ساڵەی ئەودا شەش ملیۆن بنەماڵەی وەرزێری روسی ببوونە خاوەنی زەوی و زاری خۆیان. لە ماوەی پێنج ساڵ حکوومەتی ستۆلیفیندا سر وشتیش یارمەتیدەری بوو، چونکی کەش و هەوای لەبار و خۆش و تەڕە ساڵی ببووە هۆی ئەوەی، کە دەغڵ و دان و بەرهەمە کشتوکاڵییەکان ئەوەندە چووبوونە سەرێ، کە روسیا بۆ یەکەمین جار توانیی بەرهەمی کشتوکاڵ بۆ دەرەوەی وڵات هەنارده بکات و بە مەبەستی پەرەپێدانی پیشەیی کەڵك لە داهاتەکەی وەرگرێ .

هێڵی ئاسنی شەمەندەفەری روسیا هەتا خۆرهەڵاتی سیبریا تەواو بوو و هەزاران کیلۆمەتر هێڵی شەمەندەفەری نوێ کێشران. لەگەڵ زیادبوونی داهاتی دەوڵەت مووچەی فەرمانبەران و کادیری هێزە چەکدارەکانیش زیادی کردو کرێکارانیش، کە زۆرینەی هێزی دژبەریان پێك دێنا کەوتنە بارودۆخێکی لەبارترەوە. بەو رادەیەش لە هێزە دژبەران کەم بۆوە و لە ماوەی حکوومەتی ستۆلیفیندا یەك مانگرتنی گەورە یا ئاژاوەی گشتگیر لە روسیادا نەهاتە ئاراوە.

ستۆلیفین چەند مانگێك پاش هەڵوەشانەوەی دۆمای دووەم، دۆمای سێیەمی دامەزراند، بەڵام بە هۆی سەرکوتی هێزە دژبەرەکان و دانانی یاسای نوێی هەڵبژاردن هیچکام لە دژبەران نەیانتوانی بچنە پەرلمان. چالاکیی دۆمای سێیەم زیاتر لە کۆمیسیۆنەکانیدا، کە لایەنی پسپۆڕیی هەبوو بەرتەسك کرابۆوە و باسێك لەو ئاخافتنە پڕ کەفوکوڵانەی، کە تایبەتمەندیی دۆمای یەکەم و دووەم بوو لە گۆڕێ نەبوو. ستۆلیفین لە بەرامبەر لایەنە کۆنەپەرستەکانی دەربار و دژبەرانی ریفۆرمدا زیاتر پشتی بە دۆما بەستبوو و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی، کە ئەوان دژی دۆما وەخۆ کەون، بەڵام ستۆلیفین بە دڵنیایی لە پشتیوانیی تەزار لە بەرامبەر ئەو دنەدانانەدا بەربەرەکانێی دەکرد هەتا ئەوەی، کە لە سەر مەسەلەی راسپۆتین لەگەڵ مەلیکە ئالیکساندرا تووشی کێشە بوو و شاژنیش پاڵی وە دژبەرانی ئەودا.

لە سەرەتاکانی ساڵی 1911دا ستۆلیفین، کە لە دەستڕۆیشتوویی راسپۆتین لە دەرباری روسیادا و لە دەستێوەردانەکانی ئەو لە کاروباری پێوەندیدار بە دەوڵەتەوە نیگەران ببوو

فەرمانی دا لە کردەوەکانی بکۆڵدرێتەوە. ڕاپۆرتەکەی پۆلیس، کە تیشکی دەخستە سەر پێشینەی ڕەش و کردەوە ناڕەواکانی ئەو خرایە بەردەستی تەزار، بەڵام تەزار، کە دەیزانی شاژن ئەو قەشە جێ گومانەی، خۆش دەوێ، بۆ بەرتەسککردنەوەی چالاکییەکانی ئەو هیچ هەنگاوێکی نەنا. ستۆلیفین خۆی دەست بەکار بوو و بە بێ ئەوەی ئیزن لە تەزار وەرگرێ فەرمانی دوورخستنەوەی ڕاسپۆتینی لە پایتەخت دەرکرد.

شاژن بە توندی دژی ئەو بڕیارە ناڕەزایەتیی دەربڕی، بەڵام تەزار، کە بە هۆی ڕاپۆرتەکەی پۆلیس لە سەر ڕابردووی ڕاسپۆتین و کردەوەکانی ئەو لە دەرباردا دڕدۆنگ ببوو هیچ هەوڵێکی جیددی بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی فەرمانەکەی سەرۆکی وەزیران نەداو ڕاسپۆتین بە نیشانەی ناڕەزایەتی بە فەرمانەکەی ستۆلیفین لە سەنپێتێرزبۆرگەوە یەکسەرە بەرەو بیت‌المقدس وەڕێکەوت.

ڕاسپۆتین لە بیت‌المقدس یشەوە پێوەندیی خۆی لەگەڵ مەلیکە ئالیکساندرا نەپساندەوە و وێڕای ئەو نامانەی، کە بۆی دەنارد ستۆلیفینی بە پیلان دژی بنەماڵەی پادشایەتی تۆمەتبار دەکرد. مەلیکە بێزاری و بەدگومانیی خۆی بەرامبەر بە ستۆلیفین دەگەیاندە تەزار و پێوەندیی تەزار و سەرۆك وەزیرەکەی وردە وردە بەرەو خراپی چوو هەتا ئەوەی کە لە سێپتەمبەری ساڵی 1911دا کاتێك تەزار لەگەڵ سەرۆك وەزیری خۆی بۆ پەردە لادان لە سەر پەیکەری تەزار ئالیکساندری سێیەم چووبووە (کیێڤ) ستۆلیفین لەوێ بەدەستی کابرایەك، کە دواتر دەرکەوت پۆلیسی نهێنیی تەزار بووە، کوژرا. سەیر لەوەدایە لە کاتی ئەو ڕووداوەدا ڕاسپۆتینیش، کە تازە لە بیت‌المقدس گەڕابۆوە لە کیێڤ بوو.

پاش کوژرانی ستۆلیفین، ڕاسپۆتین لە سەر داوای مەلیکە گەڕایەوە سەنپێتێرزبۆرگ و چووە ژوور سەری وەلیعەهدی حەوت ساڵەی ڕوسیا، کە نەخۆشییەکەی سەری هەڵدابۆوە و لە ئاویلکەداندا بوو.

ڕێکەوت بوو یا پەرجۆ کاری خۆی کرد و ولیعەهد لە مەترسی ڕزگاریی بوو و وردە وردە چاك بۆوە. سەبارەت بە ڕۆڵی ڕاسپۆتین لە چارەسەرکردنی وەلیعەهددا پزیشکانی ناودار و پسپۆڕی ڕوس، کە لە چارەسەرکردنی وەلیعەهدی منداڵدا مابوون ناتوانن ڕوونکردنەوەیەکی قایلکەر بخەنە ڕوو. تەنیا ڕوونکردنەوەیەکی، کە لەو بارەیەوە دراوە ئەوەیە، کە ڕاسپۆتین بە هێزی هیپنۆتیزم نەخۆشینی وەلیعەهدی دەخستە ژێر کۆنترۆڵەوە و لە کتێبی "نیکۆلا و ئالیکساندرا"دا، کە ڕابێرت ماسی نووسیوێتی و خۆیشی بە دەست نەخۆشیی هێموۆفیلییەوە

دەینالاند ئاماژە بە چەند دانە نەخۆشیی لەو جۆرە کراوە، کە بە هیپنۆتیزم کۆنترۆل کراون. رابێرت ماسی لە زمانی هێندێ لە پیاوانی دەربار و پیاوانی سیاسیی روسیای سەردەمی پادشایەتیی تەزار نیکۆلای دووەم و تەنانەت دژبەرانیشیەوە ئاماژە بە کاریگەریی چاوە تیژەکانی راسپۆتین لە سەر بینەران دەکات.

بە گشتی پێگەی راسپۆتین پاش کوژرانی ستۆلیفین جار لەگەڵ جار پتەوتر دەبوو و هەوڵی جێنشینەکەی ستۆلیفینی، ڤلادیمیر کۆکۆتسۆڤیش بۆ کۆتاییهێنان بە دەسرۆیشتوویی راسپۆتین لە دەرباری روسیادا ئاکامێکی لێ نەکەوتەوە، لەوکاتەدا بلاڤۆکەکانی روسیا، کە لە کۆتایی حکومەتی ستۆلیفینەوە برە ئازادییەکیان پێدرابوو هەواڵ و دەمگۆگەلێکیان لە سەر راسپۆتین و دەسرۆیشتوویی ئەو لە دەرباری روسیادا بلاو دەکردنەوە و بە ئاشکرا یا لە پەردەدا باسیان لەو گەندەڵیانە دەکرد، کە لەو دەسرۆیشتووییەوە سەرچاوەیان دەگرت و هەروەها باسی دەست- تێکەڵکردنی راسپۆتینیان لەگەڵ ژنانی دەرباردا دەکرد. لە نێو خەڵکدا وا بلاو ببۆوە، کە راسپۆتین تەنانەت بە مەلیکەش فێرە و پێوەندیی (سێکسی) لەگەڵیدا هەیە و ئەو حەقایەتە زار بە زار بلاو ببۆوە، کە راسپۆتین بە هێزی هیپنۆتیزم تەزار والێدەکا، کە پێلاوەکانی لە پێداکەنی و لاق و پەلی بۆ بشوات و ئەوجار لە پێش چاوی ئەو(تەزار) سواری شاژن دەبێ.

مەسەلەی راسپۆتین وردە وردە بوو بە گرینگترین پرسی رۆژ لە روسیا و ئەو باس و خواسە گەیشتە پەرلمانی دۆما. میخاییل رۆدزیانکۆ سەرۆکی دۆما، کە خۆی لە کۆنە ئەفسەرانی سوپای سوارکار بوو، داوای لە نوێنەران کرد خۆ ببوێرن لەو باس و خواسەو لە دووپاتکردنەوەی ئەو حەقایەتانەی، کە لە سەر زار و زمانی خەڵکین هەتا خۆی ئەو مەسەلەیە لەگەڵ تەزار دێنێتە بەر باس. تەزار لە چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرۆکی دۆمادا گوتی: خویشی لەو باس و خواسە و لەو قسە و قسەلۆکەی لە نێو خەڵکیدا بلاو بوونەتەوە وەگیان هاتووە، داوای لە رۆدزیانکۆ کرد بە نهێنی لە راسپۆتین بکۆڵێتەوە و دەرەنجامی لێکۆڵینەوەکەی پێ بداتەوە. راپۆرتەکەی رۆدزیانکۆ زۆربەی ئەو دەمگۆیانەی، کە پێوەندییان بە گەندەڵی و دەستێوەردانی نابەجێی راسپۆتین لە کار و باری وڵاتدا بوو پشتراست کردەوە، بەلام ئەو راپۆرتەش وەکو راپۆرتەکەی ستۆلیفین هیچی لێ هەڵنەوەری و تەزار تەنانەت داوای رۆدزیانکۆی بۆ چاوپێکەوتن و خستنە رووی راستییەکان، وەرنەگرت.

تەزار نیکۆلای دووەم لە فێبریوەری 1913دا بریاری دا، کە جێژنی سێسەد ساڵەی فەرمانرەوایی رۆمانۆفەکان بە سەر روسیادا، بگرێ، بەلام رێورەسمی بەرێوەچوونی ئەو جێژنانە

لە کلێسەی سەنپێترێزبۆرگدا بە هۆی تێکهەڵچوونی راسپۆتین و رۆدزیانکۆی سەرۆکی دۆما حەیاچوونی لێکەوتەوە. راسپۆتین لەو شوێنە دانیشتبوو، کە بۆ رۆدزیانکۆف دیاری کرابوو و بە قسەی چاودێران کورسیی سەرۆکی دۆمای چۆڵ نەدەکرد. رۆدزیانکۆف، کە خۆی کابرایەکی چوارشانە و بە خۆوە بوو ئەوەی وەئەستۆ گرت و راسپۆتینی هەڵگرت و بە عەرزیدا دا. ئەو رووداوە سەرۆکی دۆمای لەبەر چاوی تەزار خست و بۆ جێژنەکانی دیکە لە پایتەخت و مۆسکۆ بانگهێشتنیان نەکردەوە.

مەزنی و بەربلاویی جێژنەکانی سێسەد ساڵەی پادشایەتیی رۆمانۆفەکان و ئەو جەماوەرەی، کە بۆ پێشوازیی تەزار هاتبوونە مۆسکۆ ئەو باوەڕە هەڵەیەی لە مێشکی تەزار و مەلیکە ئالیکساندرادا بە هێز کرد، کە خەڵکی روسیا بەراستی و لە قووڵایی دڵەوە خۆشیان دەوێن و لایەنگریانن. راسپۆتین، کە دژایەتیی سەرۆکی وەزیران و سەرۆکی دۆمای بۆ دەرکەوتبوو بە تایبەتی پاش ئەو تێکگیرانەی لەگەڵ سەرۆکی دۆما لە سەرەتای جێژنەکاندا بووی دنەدان بە دژی ئەوانی چڕتر کردەوە و مەلیکە، کە لە ژێر کاریگەریی ئەودا بوو ئەو جار بە راشکاوی وەکو کەسانێکی ترسنۆك و گەمژە، کە تەزاری خۆشەویست لە خەڵك دادەبڕن و لە مەترسیی راپەڕین دەیترسێنن ناوی سەرۆکی وەزیران و سەرۆکی دۆما و وەزیران و نوێنەرانی دەهێنان. مەلیکەی ئالیکساندرا لەو رۆژانەدا باسی دەسەڵاتدارییەتیی حکوومەتی تەزاری بە سەر دڵی خەڵکدا بۆ دەوروبەرییەکانی دەکرد و دەوڵەتی دۆمای بە کۆسپی سەرەکیی سەر رێگەی پتەوترکردنی ئەو پێوەندییە دەزانی.

بەڵام هەر لەو رۆژانەدا، کە مەلیکە ئالیکساندرا باسی دەسەڵاتدارییەتیی حکوومەتی تەزاری بەسەر دڵی خەڵکدا و باسی پێوەندیی پتەو و نەپساوەی نێوان خەڵك و تەزاری دەکرد شەپۆلی نارەزایەتیی خەریك بوو هەموو روسیای دادەگرت و حەوتسەد هەزار کرێکار لە حاڵی مانگرتندا بوون. ژمارەی مانگرتووان لە ژانوییەی 1914 گەیشتە یەك ملیۆن کەس و لە ناوچەی باکۆ بە هۆی تەقەکردنی قەزاقەکانەوە لە کرێکارانی مانگرتووی نەوت بە سەدان کەس کوژران و بریندار بوون. ژمارەی کرێکارانی مانگرتوو لە ژووئیەی ساڵی 1914دا گەیشتە یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار کەس و لە شەقامەکانی پایتەختدا کرێکارانی مانگرتوو دەستیان کرد بە سەنگەر گرتن و تێکهەڵچوون لەگەڵ هێزە چەکدارەکان. لەو جەنگەیەدا تەزار لە ژێر کاریگەریی مەلیکە و راسپۆتیندا کۆکۆتسۆفی لە سەرۆك وەزیری خست و دیسان بە قسەی ئەوان پیرە پیاوێکی 76 ساڵەی بە ناوی ئیڤانگۆرێمیکینی لە جێگەی ئەو دانا.

گۆرێمیکین ساڵی 1906 یش سەرۆك وەزیر بوو و بە هۆی نەبوونی توانای لە چارەسەرکردنی کێشەکانی روسیادا پاش رووداوەکانی ساڵی 1905 لە سەر کار لابردرابوو.

لەگەڵ دانانی گورێمیکین بە سەرۆکی وەزیرانی روسیا جڵەوی کاروبارەکان بە کردەوە کەوتە دەستی راسپۆتین چونکی راسپۆتین، لە ئێستا بە دواوە راستەوخۆ و بە دەستی لە دانان و لەسەر کار لابردنی وەزیران و بەرپرسانی وڵات و سوپایی وەردەدا و مەلیکە، کە لە سەر هەر کام لەو بەرپرسانە قسەی دەکرد بە ئاشکرا دەیگوت:" لەبەر ئەوەی کە هاوڕێمان راسپۆتین فلانە کەسی پێ باشە پێشنیار دەکەین ئەو پۆستەی پێ بدرێ." یا لەبەر ئەوەی، کە فلانەکەس دوژمنی هاوڕێکەمانە بە باش نازانرێ ئەو پلەیەی پێ بدرێ. لە ئاکامی ئەو دەستێوەردانانەدا ئەو پیاوە لێهاتوو و شارەزایانەی، کە حازر نەبوون خۆیان سووك بکەن و دەستی راسپۆتین ماچ بکەن خۆیان لە کار کێشایەوە و تاقمێکی نەزان و ناشارەزا و سووك و چروك جێگەی ئەوانیان گرتەوە.

پێنج مانگ پاش ئەوەی گۆرێمیکین پۆستی سەرۆك وەزیرانی روسیای وەرگرت شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد و روسیا بە بێ ئەوەی کە بەڵگەیەکی بۆ وەجواب هاتن لە سەر سێربستان بەدەستەوە بێ لە بەرامبەر ئیمپراتۆریی نەمسادا پشتیوانیی لە سێربستان کرد. هێزەکانی روسیا نێردرانە سنوورەکانی نەمسا و ئەڵمانیا. و ئەڵمان و نەمسا رۆژی یەکەمی ساڵی 1914 شەڕیان دژی روسیا راگەیاند. هێزەکانی روسیا لە شەڕی گەڵ نەمساییەکاندا هێندێ سەرکەوتنیان وەدەست هێنا، بەڵام لە شەڕێك، کە لە بیست و شەشەمی ئوت لە تانێنبێرگ لە بەشی پرۆسی رۆژهەڵات هاتە ئاراوە و پێنج رۆژی خایاند بە توندی تێکشکان و زیانی قورسیان وێکەوت. تێکشکانی تانێنبێرگ هەستی دژە ئەڵمانیی لە روسیادا وروژاند و تەزاریش وەکو دژکردەوەیەك لە بەرامبەر بەو شکستەدا ناوی ئەڵمانیی پایتەختی لە سەنپێترێزبۆرگەوە بۆ ناوی روسیی پێترۆگراد گۆڕی.

# 5

شەڕی یەکەمی جیهانی بە مێژووی روسیا و جیهاندا خاڵێکی وەرسووڕان بوو. دەوڵەتی تەزاری، کە بە گوێرەی پێویست خۆی بۆ وەها شکستێك ئامادە نەکردبوو لە ماوەی سێ ساڵدا پازدە ملیۆن کەسی ناردە بەرەکانی شەڕ، کە زیاتر لە 9 ملیۆن کەس کوژراو و دیل و برینداری لێکەوتەوە. زیاتر لە یەك ملیۆن سەربازی روسی لەو شەڕەدا کوژران و ژمارەی بریندارەکان لە

چوار ملیۆن و نۆسەد هەزار کەس تێپەڕی. گەورەترین کێشەی روسیا لەو شـەڕەدا بێجگـە لـە ناشارەزایی فەرماندەری و دەستێوەردانی کەسـانی ناشـارەزای تـەکنیك و تـاکتیکی شـەڕ لـە هەڵمەتەکاندا، کەمبوونی کەرەسەی شەڕ و خواردەمەنی یا لۆجیستیکی بوو، چـونکی بـەرەی شەڕ هەزاران کیلۆمەتر لە سەر چاوەکانی تەیارکردنی هێزە سـوپاییەکانی روسـیا دوور بـوو و رێگەی شەمەندەفەری روسیا وەڵامدەری گەیاندنی پێداویستی و خواردەمەنیی ملیۆنان سەبازی روسیی نێو بەرەکانی شەڕ نەبوو.

کێشەی دیکەی تەزار لە کاتی شەڕدا کێشەی نێوان وەزیری شەڕ سۆخۆمیلانۆف و گراندۆك نیکۆلا نیکۆلایڤیچی فەرماندەی تەواوی هێزەکانی روسـیای بـەرەی شـەڕ بـوو. راسـپۆتینیش ئاورەکەی خۆشتر دەکرد دواجار توانیی تەزار لە گراندۆك نیکۆلا بخاتە گومانەوە و لە جەنگـەی شەڕدا کارێکی وەها بکات، کە لە سەر کاری لابەرن.

مۆریس پالیۆلۆك، کە لە یەکەمین ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا باڵوێزی فەڕەنسا بوو لە روسیا و پاش گەڕانەوە بۆ فەڕەنسـا بـە هـۆی نووسـینی چـەند کتـێبی متمانـە پێکـراو و بەڵگەمەند لە سەر شەڕی روسیا بوو بە ئەندامی ئەنیستیتۆی فەڕەنسا، لە کتێبێکدا بە نـاوی "مەلیکەی پڕ پێچ و پەنا"دا، کە تەرخانی کردووە بـە ژیـانی مەلیکـە ئالیکسـاندرا و رۆڵـی راسپۆتین لە ژیانی ئەودا، دیمەنێکی قسەکردنی راسپۆتین و تەزار نیکۆلای دووەمـی لـە بـارەی شەڕەوە خستۆتە روو و دەنووسێ:

راسپۆتین پاش ئەوەی، کە بە لە گوێ خوێندنی پەیتا پەیتا، زەیـنی دڕدۆنگـی تـەزاری لـە مەڕ گراندۆکەوە تێك دا، پەنای بردە بەر دوایین و کاریگەرترین چـەکی خـۆی و گـوتی" چـۆن گەرەکتانە کەسێك بخەنە بن باڵی خۆتانەوە، کە سووکایەتیی بە من بە پیاوی خودا کردووە؟ خو داوای پێ خۆشە، کە ئەم کۆشکە بەجێ بێڵن و خۆتان فەرماندەیی شەڕەکان بگرنە ئەستۆ. تاج و تەختت لە مەترسی دایە و تاقانـە رێگـەی نەهێشـتنی ئـەم مەترسـییە ئەوەیـە کـە خـۆت فەرماندەیی سوپا لە کاتی شەڕدا وەئەستۆ بگری..."

رۆژی چوارەمی سێپتەمبەری ساڵی 1915 چەند رۆژ پاش ئەوەی "برێست لیتۆسـك" کەوتـە دەستی ئەڵمانییەکان ئاخری تەزار نیکۆلای دووەم بڕیاری دا خۆی فەرماندەیی هێزەکانی روسـیا لـە شەڕدا وەئەستۆ بگرێ. بۆ سبەینێکەی بەرەو بنکەی فەرماندەیی گشتیی هێزەکانی روسیا، کـە لـە شەشسەد کیلۆمەتریی باشووری پێترۆگراد هەڵکەوتووە وەڕێکەوت. لەگەڵ وەدەرکـەوتنی تـەزار لـە پایتەخت، جڵەوی دەسەڵات بە کردەوە کەوتە دەستی مەلیکە ئالیکساندرا، کە ئـەویش بـە نـۆرەی

خۆی بەڕێوەبەری فەرمان و ڕاسپاردەکانی ڕاسپۆتین بوو. بوونی تەزار لـە بـەرەکانی شـەڕدا سـەرەتا ورەی ئەفسەران و سەربازەکانی بردە سەرو و لە کۆتایی ساڵی 1915 و سەرەتای ساڵدا هێزەکـانی ڕوسیا هێندێ سەرکەوتنیان بەسەر ئەڵمانییەکاندا وەدەست هێنا، بەڵام تەمەنی ئـەم سـەرکەوتنانە، کە بە خەساری زۆر قورس وەدەست دەهاتن لە کۆتایی سـاڵی 1916دا کۆتـایی هـات و هێرشـی ئەڵمانییەکان و پاشەکشەی هێزەکانی ڕوسیا دەستی پێکرد.

لە نەبوونی تەزاردا لە پایتەخت شیرازەی کاروبارەکانی وڵات لێك ترازان و لـە سـەرەتای فێبرییەی ساڵی 1916دا، کە جڵەوی کارەکان بە تەواوی لە دەست گۆرێمیکینی پیر هـاتبووە دەرێ و تەزار بە پەلە و هەڵەداوان گەڕایەوە پێترۆگراد بۆ ئەوەی سەرۆك وەزیرێکی نوێ لە سەر کار دابنێ. ئـەم جـارەش ڕاسـپۆتین پـالێوراوی دەستنیشـانکـراوی خـۆی بـە هـۆی مەلیکـە ئالیکساندرا بەسەر تەزاردا سەپاند.

سەرۆك وەزیری نوێ "بەریس ستورمەر" بوو، کە لەوە پێش سەرۆکایەتیی میوانداریێتیی و ڕێوڕەسمەکانی دەرباری لە ئەستۆ بوو و لە زمان چەوری و ماستاوچێتی زیاتر هـیچ هونـەرێکی دیکەی نەبوو. هەڵبژاردنی کابرایەکی بوودەڵە و ناوزڕاوی وەك ستورمەر بـۆ سـەرۆك وەزیریـی ڕوسیا لە نێو ئەندامانی پەرلمانی دۆمادا تۆفانێکی تووڕەیی وەڕێخست، بەڵام تـەزار لـە سـەر پێشنیاری مەلیکە بۆ پتەوکردنی پێگەی سەرۆك وەزیـری دەسنیشـانکراوی خـۆی ڕۆژی 22ی فێبریوەری1916 خۆی لە دانیشتنی گشتیی دۆمادا حازر بوو و وێڕای ئاخافتنێك لـە بـارەی شەڕەوە ستورمەری وەك سەرۆك وەزیری نوێ بە دۆما ناساند. نوێنەرانی دۆما لەو دانیشـتنەدا و لە هەنتەشی (لە حوزووری) تەزاردا نەیانتوانی دژکردەوەیەك بنوێنن، بەڵام هیچ لە تـووڕەیی ئەوان بە نیسبەت ستورمەرەوە کەم نەبۆوە. لە لایـەکی دیکـەوە دوای دانرانـی سـتورمەر بـە سەرۆکی وەزیرانی شیاوترین و لێهاتووترین وەزریرەکانی دەوڵەتەکانی پێشوو، واتە سـازۆنۆفـی وەزیری دەرەوە، کە لە ساڵی 1910 ـەوە ئەو پۆستەی پێ بوو و پۆلیڤانۆڤی وەزیری شەڕ، کە بە باوەڕی چاودێرانی دەرەکی لێهاتووترین کەسایەتیی سوپایی ڕوسیا بوو و لە ڕێکوپێککردنی ڕەوشی سەربازیی و قەرەبووکردنەوەی شکستەکانی سەرەتای شەڕدا ڕۆڵێکی کاریگەری گێڕابوو دەستیان لە کار کێشایەوە.

ستورمەر خۆی پۆستی وەزارەتـی دەرەوەی وە ئەسـتۆ گـرت، وەزارەتـی جـەنگیش درا بـە یەکێك لە پیرە ژەنەراڵەکان، کە پوانەکەی ئەوە بوو بە تەواوی گـوێ لـە مسـتی تـەزار بـوو و وەزارەتی نێو خۆش درایە پرۆتۆپۆف، کە خۆشەویستی ڕاسپۆتین بوو.

له نامەکانی مەلیکەی ئالیکساندرادا بـۆ تـەزار لـەو کاتـەدا، کـە فەرمانـدەیی گشـتیی هێزەکانی روسیای لەلایەن تەزارەوە پێ ئەسپێردرابوو وا دەردەکەوێ، کە مەلیکە لە هـەمووی ئەو ماوەیەدا لە نێو وردەکارییەکانی جەنگدا بووە و لە هەرکام لە نامە و تەلەگرافەکانیدا بـۆ تەزار بیر و بۆچوونەکانی راسپۆتین سەبارەت بە کاروباری سەربازییەوە بەو شێوەیە "هاوڕێمـان وای پێ باشە" یا"هاوڕێمان دوێ شەوێ خەونی دیتوە" و "هاوڕێمان تکات لێ دەکا" بە سـەر تەزاردا دەسەپاند.

بە پێی ئەو نامانە، کە لەبەر دەست دان، راسپۆتیتن لە کۆتایی سـاڵەکانی 1915 و سەرەتاکانی 1916 لە بەرەکانی شەڕدا زیاتر فـەرمانی هێرشـی دەردەکـرد، بـەڵام لـە نێوەڕاستەکانی 1916وە دوابەدوای هێرشی سەرکەوتوانەی هێزەکانی ژەنەراڵ بۆرسیلۆف لە بەرەی گالیسیادا، کە زیان و خەساری زۆری لێکەوتەوە پێشنیاری راگرتنی ئەو هێرشانە دەکات. ژەنەراڵ ئالیکسێڤ سەرۆکی ستادی سوپای روسیا تەزار قایل دەکا، کـە هێـرش بەردەوام بێت، بەڵام مەلیکە جارێکیتر جواب دەنێرێ کە"هاوڕێمان لەبـەر ئـەوەی، کـە برۆسیلۆف بایەخی بە راسپاردەکەی نەداوە دڵی ئێشاوە و پێدادەگرێتەوە بەسەر ئەوەی کە ئەو بڕیارە لە سەرەوە واتە لە لایەن خوداوە هاتووە". رۆژی 25ی سێپتەمبەری 1916 تەلـەگرافێکی دیکـە لـە لایـەن مەلیکـەوە دەگاتـە دەسـت تـەزار، کـە هـەڵگری ئـەو ناوەرۆکەیە"ئازیزەکەم دیسانیش فەرمان بدەن بەو برۆسیلۆفە، کە ئەو کوشتارە بێ مانایە راگـرێ... ئێـوە پێویسـتە بایـەخ و گرینگـی بـدەن بـە راسـپاردەکانی هاوڕێکـەمان... ژەنەراڵەکانی ئێمە زیان و خەسارە گیانییەکانیان بە لاوە گرینگ نییە. ئەوەش تـاوانێکی گەورەیە."رۆژی 27ی سـێپتەمبەر تـەزار ئاخرییەکـەی ملـی بـۆ بـیر و بووچـوونەکانی راسپۆتین راکێشاو لە وەڵامی مەلیکەدا دەنووسێ:"ئازیز گیان فەرمانم بە برۆسیلۆفدا، کە لە رێوە هێرشەکان راگرێ". برۆسیلۆف بە سەرسووڕماوییەوە لەو فەرمانە کتوپڕەی تەزار، هێرشەکان رادەگرێ و ئەوە دەسپێکی پاشەکشێ و شکستە گەورەکانی هێزەکانی روسیا لە کۆتاییەکانی ساڵی 1916و 1917دا بوو.

ژەنەراڵ ئالکسێڤیەرۆکی هێزی سوپای تەزار دواتر گوتی، کە خۆتێهەڵقورتاندنی مەلیکە لە کاروباری سەربازی و لە گوێ خوێندنەکانی راسـپوتین، کـە نـەك هـەر کاریگـەرییان لـە سـەر مەلیکە بەڵکو لە سەر تەزاریش هـەبوو یـەکێك بـوو لـە هۆکـارە گرینگـەکانی تێکشـکانی هێزەکانی روسیا لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا. لە ئالکسێف دەگێڕنەوە:"پاش دەسـت لـە کـار

کێشانەوەی تەزار نەخشە(خەریتە)یەکی تەواوی شەڕ لە نێو بەڵگە و دیکۆمێنتەکانی مەلیکەدا دۆزرانەوە لە حاڵێکدا تەنیا دوو نەسك لەونەخشەیە هەبوو ئەویش یەکێکیان بە من بوو ئەوی تریش بە تەزار و خودا دەزانێ، کە ئەو نەخشەیەیان بە چ مەبەستێك دابووە دەست مەلیکە و لە راستیدا بە راسپۆتین".

لە پاییزیساڵی 1916دا بشێوی و ناڕەزایەتی لە روسیادا گەیشتە تەشقی خۆی. دەوڵەتە لاواز و ناکارامەکەی ستۆرمەر بە هیچ شێوەیەك توانای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی رۆژانەی خەڵك بە تایبەتی کەمبوونی بژیو و خواردەمەنیی نەبوو. هەواڵی شکست و پاشەکشەکان و زیانە قورسە تازەکان لە بەرەکانی شەڕدا خەڵکی تەواو تووڕە کردبوو و، مانگرتن و کەمکاری لە کارخانەکان و ئیدارە حکومییەکاندا وڵاتی تەواو ئیفلیج کردبوو. لەو نێوەدا هەواڵی پێوەندیدار بە گەندەڵی و چەپەڵکارییەکانی راسپۆتین و دەست- تێکەڵکردنی لەگەڵ مەلیکەدا، کەوشەنی پایتەخت و گەورەکانی روسیای بەزاند و گەیشتە نێو ریزەکانی سوپا و لە رێگەی سەربازە زامارەکانەوە، کە دەگەڕانەوە زێدی خۆیان دێهاتەکانیشی تەنییەوە. وێڕای ئەوە و هاوکات لەگەڵ پاشەکشەی هێزەکانی روسیا لە بەرەکانی شەڕ، دەنگۆ بڵاو ببۆوە، کە راسپۆتین سیخوڕی ئەڵمانییەکانە و بە هاوکاریی مەلیکە و ستۆرمەر سەرۆك وەزیرێك، کە هەر دووکیان رەگەزی ئەڵمانییان هەبوو، زانیارییە نهێنییەکانی پێوەندیدار بە نەخشە جەنگییەکانی تەزار دەدەنە ئەڵمانییەکان. نوێنەرانی دۆماش بە توندی لە دەست تێوەردانەکانی راسپۆتین لە کاروباری سەربازی و حکومەتی ناڕازی بوون و لە دانیشتنەکانی مانگی سێپتەمبەر و ئۆکتۆبەری ساڵی 1916ی دۆمادا نوێنەرانی دۆما بە راست بە چەپ و لیبراڵەوە و تەنانەت هێندێ کەسیش، کە دەمارگرژانە لایەنگرییان لە تەزار دەکرد لە پشت تریبوونەکانی دۆماوە هێرشیان گردە سەر ستۆرمەر و راسپوتین و ناراستەوخۆ رەخنەیان لە هەڵسەوکەوتی مەلیکە دەگرت.

لە کۆتاییەکانی ئۆکتۆبەری 1916دا تەزار ئاخری هاتە سەر ئەوەی، کە ستۆرمەر، کە لە ماوەی هەشت مانگ دەسەڵاتدارییەتیدا ناکارامەیی و ناشارەزاییی خۆی سەلماندبوو، لە سەر کار لابەرێ. مەلیکە بەناردنی چەندین نامە بۆ تەزار، کە تێیدا جەخت لە سەر خۆشەویستیی ستۆرمەر بە لای راسپۆتینەوە کردبوو هەوڵی دەدا تەزار لەو کارە پەشیمان بکاتەوە، بەڵام تەزار ملی بۆ راسپاردەکانی مەلیکە و راسپۆتین رانەکێشا و رۆژی نۆیەمی مانگی نۆڤەمبەردا لە نامەیەکدا بۆ هاوسەرەکەی نووسیی:" بە داخەم، کە ئەمجارەیان ناتوانم راسپاردەکانی

هاورێمان(راسپۆتین) جێبەجێ بکەم. من پاش سەعاتێکی تر ستۆرمەر بانگ دەکەمە لای خۆم و داوای لێ دەکەم، کە دەست لە کار بکێشێتەوە. ئەگەر ئەم دەوڵەتە لەوە زیاتر لە سەر کار بمێنێتەوە تووشی ئاژاوە و هەڵلایەکی گشتی دەبێت."

بەڵام جێگرەوەکەی ستۆرمەر "ئالیکساندرترۆپۆف"یش نەیتوانی خۆی لە شەڕی راسپۆتین رزگار بکات و لە سەر پێداگریی مەلیکە "پرۆتۆف" وەزیری پێشووی نێو خۆ، کە دەستی لە کار کێشابۆوە و راسپۆتین پشتیوانیی لێ دەکرد لە دەوڵەتی نوێدا پێگەی خۆی پاراست. ترۆپۆف هەوڵی دا بە دانی بەرتیلێکی 95000 دۆلاریی ئەو کات و دانی پوانگەلێکی وەکدانی خانوویەك لە پێترۆگراد و خزمەتکار و پارێزەری حکوومی، راسپۆتین قایل بکات، کە دەست لە پشتگیریی پرۆتۆف و دەستێوەردان لە کاروباری دەوڵەتی هەڵگرێ، بەڵام راسپۆتین ئەو پێشنیارەی قەبووڵ نەکرد.

ئەو جار تۆپۆف پەنای بردە بەر گراندۆپۆلی مامی تەزار، کە هەر ئەو مامەی زیندوو مابۆوە و پۆل لەو چاوپێکەوتنەدا، کە لە رۆژی شازدەی دیسێمبەری ساڵی 1916دا لەگەڵ مەلیکە و تەزار هەیبوو لە بەرچاوی مەلیکە ئاماژەی بەو خەسار و زیانانە کرد، کە لە سۆنگەی راسپۆتینەوە لە دەربار وەئابڕووی تەزار و مەلیکە کەوتووە و گوتی: قازانجی تەزار لەوە دایە، کە کۆتایی بەو رەوشە بێنێ. تەزار بە بێدەنگییەوە گوێی دایە قسەکانی مامی و داوای لە هاوسەرەکەی کرد، کە رای خۆی لە بارەیەوە دەربڕێ. مەلیکە ئالیکساندرا بە قەڵسییەوە بەرپەرچی قسەکانی مامی تەزاری دایەوە و وێڕای وەجوابهاتن لە سەر راسپۆتین گوتی:" تەواوی پێغەمبەرەکان لە کاتی خۆیاندا کەوتوونەتە بەر تووك و لەعنەت و هەتا زیندوو بوون گەلێك تۆمەتیان داونەتە پاڵ."

هەر لەو رۆژانەدا لە یەکێك لە دانیشتنەکانی دۆمادا یەکێك لە بە ناوبانگترین نوێنەرانی لایەنگری تەزار بە ناوی "پورشکێڤیچ"، کە یەکێك بوو لە نووسەران و شاعیرانی ناوداری سەردەمی خۆی لە لێدوانێکی توندا، کە دوو سەعاتی خایاند و بە چەپڵەی بەردەوامی نوێنەرانی پەرلمان پێشوازیی لێکرا بەتوندی هێرشی کردە سەر راسپۆتین و روو بە ترۆپۆف و وەزیرەکانی گوتی :" ئەگەر کەمترین هەستی نیشتیمانپەروەریتان تێدایە، ئەگەر ناو و شانازیی روسیا و ئابڕووی تەزارتان خۆش دەوێ، هەستن و بچنە لای تەزار و خۆی بەسەر پێلاویدا بدەن و پێی بلێن روسیا لە مەترسی دایە و ئێمە لە بەردەم راپەڕین داین و نابێ کابرایەکی گەمژە و گەندەڵی دیکە بەسەر وڵاتەکەماندا فەرمانڕەوایی بکات."

لە دانیشتنە برِ کەفوکەڵەکەی دۆمادا، کە ئەو قسانە دژی راسپۆتین دەکـران روخسـارێکی نـاودار لــە نێــو بینەرانــدا بــەدی دەکــرا. ئــەو شــازادە فێلــیکس یۆســۆپۆڤ ی 29 ســاڵە و دەوڵەمەندترین پیاوی روسیای ئەو کات بوو. ئەو مڵك و ماڵەی لـە بـاوکی بـە مـیرات پێـی گەیشتبوو 37 پارچە مڵکی گەورە و حەوت کۆشك لە مۆسکۆ و پێترۆگراد و گەلێك کۆشـکی دیکەشی لە شێوەدوورگەی کریمە لە خۆدەگرت.

یۆسۆپۆف خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسیٚ، کە هــەر یــەکێك لــە مڵکــەکانی نزیــك بــە دووسەد کیلۆمەتر بە درێژایی کـەنارەکانی خۆرئـاوایی دەریـای خـەزەردا دەکشـا و سەرچـاوە نەوتییەکانی و کانگاکانی ئاسن و بەردەرِەژوو لە مڵکی ئەودا زۆر بوون.

بەهای مڵك و بەرهەم و کارخانەکانی ئەویان سێسەد و پەنجا هەتا پێنســەد ملیــۆن دۆلاری پارەی ئەو کات مەزەندە کردووە، کە تەنانەت لە سامانی تەزارەکانیش پتر بوو.

یۆسۆپۆف، کە لە دۆما گـوێی لــە قســەکانی پۆریشـکۆڤیچ بــوو بــۆ ســبەینێکەی چــووە چاوپێکەوتنی و گوتی بۆ رزگاریی روسیا هیچ رێگەیەکمان بێجگە لە کوشتنی راسپۆتین نییە و ئەو ئامادەیە، کە ئەو کارە وەئەستۆ بگریٚ، بەڵام بە تەنیایی ناتوانیٚ سەرکەویٚ. پۆریشـکۆڤیچ بەو پەرِی تاسەبارییەوە ئامادەبوونی خـۆی بـۆ هاوکـاریی یۆسـۆپۆف دەربـرِی و ئــەو جووتــە دواتریش هاوکارگەلێکی تریان بۆ بەرِێوەبردنی پلانەکەیان هەڵبژارد، کە بریتی بوون لە گراندۆك دیمیتری پاولۆڤیچ کورِی بیستوشەش ساڵەی گراندۆكپۆلی مامی تــەزار، پزیشـکێك بــە نــاوی لازۆڤێرت و ئەفسەرێکی سوپا بە ناوی سوخۆتین.

یۆسۆپۆف و هاوکارەکانی کۆتاییەکانی مانگی دیسێمبەریان بـۆ راپەرِانـدنی پلانەکـەیان دانـابوو و یەکێك لە سەر سوورِ هێنەرترین رووداوەکانی ژیانی راسپۆتین، کە گەلێك ئەفسانەی لیٚساز کردووە ئــەو نامەیەیە، کە لە حەوتووی کۆتایی مانگی دیسێمبەردا نووسیوێتی و تێیدا پێشـبینیی مـەرگی خـۆی پێش لە یەکەمی ژانوییەی 1917دا دەکات. لەو نامەیەدا، کە پاش مـەرگی راسـپۆتین دۆزرابـۆوە و بە ناوی یەکەمی خۆی"گریگۆری" واژۆی کردووە نووسراوە، کە ئەگەر بـە دەسـتی کەسـێکی ئاسـایی بکوژریٚ هیچ مەترسییەك هەرِەشە لە روسیا ناکات، بەڵام ئەگەر دەستی شازادە یـا نەجیمزادەیـەك بـە خوێنی وی سوور بێت بۆ مـاوەی بیسـت و پێـنج سـالٚ روسـیا خۆشـی بـەخۆوە نـابینی و شـازادە و نەجیمزادەیەك لەو وڵاتەدا زیندو نامێنیٚ. لە کۆتایی ئەو نامەیەدا هاتووە:

تەزاری وڵاتی روسیا، ئەگەر رۆژێك زەنگی کلێسـەکان هـەواڵی مـەرگی گریگۆرییـان بـۆ هێنای ئەوە بزانن، کە ئەگەر دەستی یەکێك لە شازادەکان یا خزمانی تۆ بە خوێنی من سـوور

بووبیّ، دوو ساڵ پاش مەرگی من قەڵا و قـەت کەسـت نـامێنیّ و جووقـەوارت لـیّ دەبـڕیّ و هەموویان بە دەستی خەڵکی روسیا دەکوژرێن...

یۆسۆپۆف بۆ راپەڕاندنی نەخشەی کوشتنی راسپۆتین کەڵکی لـە خـاڵی لاوازی ئـەو، واتـە حەزکردن لە ئافرەتی جوان و خاوەن کەسایەتی وەرگرت و بە ناوی ئەوەی، کە پرێنسس ئیرینای خێزانی گەرەکیەتی بە نهێنی ببینیّ بانگهێشـتنی کـردە کۆشـکەکەی خـۆی لـە پیترۆگـراد. راسپۆتین، کە لە هێندێ میوانیدا پرینسس ئیرینای دیتبوو و خولیای جوانییەکەی ببوو، بـەبیّ بیر لێکردنەوە ئەو بانگهێشتنەی قەبووڵ کرد و بەڵێنی دا وەك نهێنی رایگریّ، بەڵام پرێنسـس ئیرینا لەو دەمەیدا لە یەکێك لە کۆشکەکانی هاوسەرەکەیدا لە کرێمـە دەژیـا و لـە کۆشـکی شوێنی ژیانی یۆسۆپۆف لە پیترۆگراد تەنیا پێنج کەس، کـە بـۆ کوشـتنی راسـپۆتین دەسـتیان دابووە دەستی یەکتر، چاوەڕوانییان دەکرد.

پاش کوشتنی راسپۆتین بە مەبەستی شاردنەوەی کەلاکەکەی، سەهۆڵی چۆمی "نـوا" یـان شکاند، کە بە تەنیشت کۆشکی یۆسۆپۆفدا تێدەپەڕی و بەوێیاندا دا، بەڵام راسپۆتین لە دوایـین هەوڵی خۆیدا بۆ رزگـارکردنی گیـانی کـونێکی لـە سـەهۆڵەکە کردبـوو و، هـەر لەوێـدا رەق هەڵاتبوو. نێردراوە نهێنییەکانی تەزار پـاش دوو رۆژ گـەڕان، ئاخرییەکـەی دۆزییانـەوە و لـە جەنگەی ئەو گەڕانەدا، کە ماڵەکەیان سەنگ و سووژن دەدا ئەونامەیەیان وەدەست کەوت، کە راسپۆتین چەند رۆژ بەر لە مەرگی نووسیبووی و لە سەر مێزەکەی دابینابوو.

هەواڵی کوژرانی تەزار بە توندی مەلیکـە ئالیکسـاندرا و خـودی تەزاریشـی راچـڵەکاند. تەرمەکەیان لە پارکی پادشایەتیی "ستارکویە_سلۆ"دا ناشـت و لـە رێـوڕەسمی ناشـتنەکەیدا تەزار و مەلیکە و چەند کەسێك لە ئەندامانی بنەماڵەی پاشایەتی و پرۆتۆپۆۆف وەزیری نێوخۆ بەشدارییان کرد. تەزار، کە پیاوێکی خورافی بوو و بیّ ئەوەی خۆی بزانیّ لـە ژێـر کاریگـەریی راسپۆتیندا بوو پاش ئاگادار بوون لە نێوەرۆکی ئەو نامەیە زەندەقی چوو و خۆی دۆڕاند.

مۆریس پالیۆلۆگی باڵوێزی فەڕەنسا لە روسیا، کـە پێشـتر باسمـان کـرد رۆژی حەوتـەمی ژانوییە واتە هەشت رۆژ پاش کوژرانی راسپۆتین چاوی بە تەزار کەوت و ئاسەوار و شوێنی ترس و تۆقیویی و سەرلێشێواویی لە روخساریدا بەدی کرد ئەو لەو بارەیەوە دەنووسیّ:

ئەو واتە تەزار بۆ ماوەی کاتژمێرێك لای خۆی رایگرتم و لەو ماوەیـەدا مـن شـوێنە واری پەژارە و دڵەڕاوکێم لە روخساریدا خوێندەوە. قسە پچڕ پچڕەکانی و بێدەنگییە درێژخایەنەکانی روخساری تێکسمڕاو و روانینی بیّ ئامانج و دوور و درێژ و قسەبڕینی کتوپڕ لە جەنگەی بـاس

و خواس‌دا به جوانی دەریدەخست، کـە ئـەو تـەواو خـۆی دۆڕانـدووە و وا هەسـت دەکـا، کـە ڕووداوەکان وەپێش ئەو کەوتوون. من لە هەموو قسەکانی ئەوڕا وام بۆ دەرکـەوت، کـە خـۆی داوەتە دەست قەزا و قەدەر(چارەنووس) و بە لەوەی دەست لە کار بکێشـێتەوە بەرپرسـیارەتیی خۆی بە تەواوبوو دەزانێ.

باڵوێزی فەڕەنسا لەو چاوپێکەوتنەدا هەوڵی دا تەزار قایـل بکـا بـەوەی، کـە هاوکـاریی دۆمـا بکات و دەوڵەتێکی بەهێز پێك بێنێ، کە لە بەرامبەر دۆمادا هەست بە بەرپرسیارەتی بکات، بەڵام تەزار لە بەرامبەر پێشنیارەکانی ئەودا زیاتر بێـدەنگ دەبـوو یـا ئـەوەی کـە وەڵامـی وا نـاڕوونی دەدایەوە، کە باڵوێزی فەڕەنسا لێیان تێنەدەگەیشت. پالیۆلۆگ پـاش ئـەو چـاوپێکەوتنە چـووە لای هاوکارە بریتانییەکەی خۆی وات سێر جۆرج بوکانان بە دەربڕینی نیگەرانی لەبامبەر بـاری دەروونـی تەزار، داوای لە باڵوێزی بەریتانیا کرد، کە خێرا چاوی بە تەزار بکەوی و باسی بـارودۆخی نالـەبار و مەترسییەکانی داهاتووی بۆ بکا. باڵوێزی بەریتانیا، کە بە حەوت ساڵ پێشینەی کارییەوە لە روسیا بە ئەزموونترین دیپلۆماتی دەرەکیی تەزار بوو رۆژی دوازدەی ژانوییە لە تسارۆکۆیەسـلۆ چـاوی بـە تەزار کەوت. سێرجۆرج بوکانان سەرەتا ئیزنی لە تەزار وەرگرت، کە راشکاوانە قسە بکات و دواتـر گوتی:"گەورەم ئیزن بدەن پێتان بڵێم، کە بۆ رزگاری لەو بارودۆخە نالەبارە لـە تاقـە رێگەیـەك پـتر نییە و ئەویش ئەوەیە، کە ئێوە ئەو دیوارە بـڕووخێنن، کـە کەوتووەتـە نێـوان ئێـوە و خەڵکـەوە و دیسان متمانەی خەڵك بۆلای خۆتان راکێشنەوە".

تەزار لە وەڵامدا گوتی:" مەبەستی ئێوە ئەوەیە، کە من دیسان متمانـەی خـەڵك بـۆ لای خۆم راکێشمەوە یا ئەوەی کە دەبێ من متمانەیان بێ بکەمەوە؟"

باڵوێزی بەریتانیا بە ئەدەب و حورمەتەوە گوتی بـۆ دەربـازبوون لـەو بـن بەسـتە متمانـە پێویستە و ئەو جار کەوتە رەخنەگرتن لە کردەوەی دەوڵـەت بـە تایبـەتی وەزیـری نێـو خـۆی دەوڵەتی پرۆتۆپۆپۆف و وەکو بـاڵوێزی فەڕەنسـا پێویسـتیی دامـەزرانی دەوڵـەتێکی بـەهێز و وەڵامدەر لە بەرامبەر دۆمایدا دووپاتە کردەوە.

وەڵامەکانی تەزار دیسانیش لێڵ و بێ سەروبەر بوون و نیشاندەری ئەوە بوون، کە توانای بڕیـاردانی نییە هەتا ئەوەی کە باڵوێزی بەریتانیا بە راشکاویی زیاترەوە پێـی گـوت :" گـەورەم مـن دەزانم، کـە وەکو باڵوێزێك بۆم نییە بەو زمانە بتاندوێنم، بەڵام کاتێ دەبینم، کـە هـاوڕێی خۆشەویسـتی خـۆم بـە شەوێکی ئەنگوستەچاودا بە نێودارستانێکدا دەڕوات، کە لێم سوورە دەگاتە هەڵدێر ئـاخۆ ئـەرکی مـن نییە لەو مەترسییەی تێگەیەنم، وا لە سەر رێگەیەتی؟.. گـەورەم هـەتا ئـەرکی سەرشـانمە ئاگادارتـان دەکەوە، کە لە سەر لێواری هەڵدێرێکی سامناك وێستاوی."

پاش باڵوێزەکانی فەرەنسا و بەریتانیا رۆدزیانکۆی سەرۆکی دۆما رۆژی بیستەمی ژانوییە چاوی بە تەزار کەوت و راشکاوانە پێی گوت:" گەورەم بارودۆخی وڵات لە هەموو کاتێك خراترە... تووڕەیی و ناڕەزایەتیی خەڵك گەیشتووەتە ئاستێك، کە ئەگەری هەر چەشنە بشێوی و سەرهەڵدانێك هەیە ... تەواوی روسیا خوازیاری گۆڕینی دەوڵەت و دەسنیشانکردنی سەرۆك وەزیرێکن، کە خەڵك جێی متمانەی خەڵك بێت و لە بەرامبەر کێشە و گرفتەکانی خەڵکدا هەست بە بەرپرسیارەتی بکات.. گەورەم بێ ئەدەبیشە، کە دەبێ بڵێم تەنانەت تاقە کەسێکی گەورە و کارامەش لە نێو دەوروبەرییەکانتاندا بەدی ناکرێ و تەواوی گەورە پیاوان و کەسانی لێهاتوو لە دەورت بوونەتەوە و پەرش و بڵاون... ئیتر ئەوە راز و نهێنییەکی شاراوە نییە، کە مەلیکە خاتوون خۆ لە هەموو کاروبارێك هەڵدەقوتێنی و وەزیرانی دەوڵەت راپۆرتەکانیان دەدەنەوە بەو و فەرمانیش لەو وەردەگرنەوە.

راشکاوانە پێت بڵێم، کە کردەوەکانی ئەو بوونەتە هۆی بێزاریی گشتی و خەڵك مەلیکە بە سیخوڕێکی ئەڵمانی دەزانن..."

تەزار بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە :"ئێوە بەڵگەیەکتان بۆ سەلماندنی ئەو قسانە هەیە؟" رۆدزیانکۆ وەڵامی داوە "گەورەم ئەوە بەڵگەی ناوێ. ئەوەی مەلیکە دەیکات و ئاکامی دەستێوەردانەکانی ئەو لە کاروباری وڵاتدا ئەو گومانەی دروست کردووە. گەورەم لەبەر خاتری روسیا و بۆ پاراستنی تەخت و بەختی پادشایەتیی خۆتان دەبێ ئیتر نەهێڵن مەلیکە ئەو دەست تێوەردانانە بکات... راشکاوانە پێتان بڵێم کارێکی وا مەکەن، کە خەڵك ناچار بن لە نێوان ئێوە و بەرژەوەندی وڵاتدا یەکێکتان هەڵبژێرن."

ژەنەراڵ ئالکسێڤی سەرۆکی سوپاش هەر قسەیەکی لەو چەشنەی پێ گوتبوو کە:" ئەگەر وابێ لە نێوان روسیا و تەزاردا یەکێکیان هەڵبژێرم بە دڵنیاییەوە روسیا هەڵدەبژێرم". تەزار ئاخرییەکەی لە کۆتایی ژانوییەدا سەرۆك وەزیرێکی نوێی بۆ خۆی دیاری کرد و بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتەکانی روسیا ئەوە خراپترین هەڵبژاردنێك بوو ئەویش لە قەیراناویترین قۆناغەکانی مێژووی ئەو وڵاتەدا. سەرۆك وەزیری تازە پرێنسس نیکۆلاگولیتسین پیرە پیاوێك بوو، کە هیچ جۆرە ئەزموونێکی لە کاری دەوڵەتداریدا نەبوو و بەر لە وەرگرتنی پلەی سەرۆکی وەزیران جێگری سەرۆکی یەکێك لە دامەزراوە خێر خوازییەکان بوو. گۆڕینی سەرۆکی وەزیران بارودۆخەکەی خراپتر کرد، چونکی ئەو ئێجگار لە پێشینیانی خۆی بێ هێزتر بوو و بە مانەوەی پرۆتۆپۆپۆف لە پلەی وەزارەتی نێو خۆدا دەستڕۆیشتوویی مەلیکە هەر وەك خۆی مایەوە.

# 6

به درێژایی فێبریوەری 1917 بارودۆخی روسیا جاربەجار بەرەو خراپتر بوون چوو. ژمارەیـەكی زۆر لە كارخانەكان بە هۆی نەگەیشتنی سووتەمەنی و كەرەسەی خاو داخـران. سـەرمای تونـدی ژێـر سـی هەتا پلەی سی و پێنجی ژێر سفر و بارینی بەفری قورس بووە هۆی گیرانی رێگەكان و قـاتی و قـوڕی و نەبوونی بژیوو و خواردەمەنی لە شارەكاندا. حیزب و گرووپە چەپییەكان بە بۆلشەڤیك و مۆنشـەڤیك و سۆسیالیستی شۆڕشگێڕەوە لە نێو كرێكاران و گەنجان و تەنانەت هێزە چەكدارەكانیشدا دەسـتیان كـرد بە چالاكی. لە سەر داوای وەزیری نێوخۆ، كە خـۆی هەسـتی بـە بـاری نالـەباری وڵات كردبـوو یەكـە سوپاییەكان لە شەقامەكان و شـوێنە هەسـتیارەكاندا دامـەزران بـۆ ئـەوەی لـە بەرامبـەر بزووتنـەوە شۆڕشگێڕییەكاندا دژ كردەوە بنوێنن، بەڵام هاتنی هێزە چەكدارەكان بـۆ نێـو شـەقامەكان زیـاتر بـووە هۆی لاوازیی سوپا و تەشەنەكردنی بیری شۆڕشڤانی لە نێو ئەواندا.

رۆژی بیست و حەوتەمی فێبریوەر بۆ یەكەمجار لە پشت تریبوونەكانی دۆماوە زۆر بە تونـدی دژی بنەماڵەی پادشایەتی و خودی تەزار قسە كرا. ئاخێڤەر (وتاردەر) ئالیكساندركێرێنسـكی یەكێك لە رێبەرانی میانەڕەو و لیبراڵی دۆما بوو و ئـەو قسـانە، كـە لـە زاری ئـەوەوە كـران نیشانیان دەدا، كە هـەموان وەگیـان هـاتوون و گەیشـتووەتە ئێسـقانیان. كێرێنسـكی لـەو ئاخافتنەدا، كە بە دەربڕینی هەسـت و كـەفوكوڵی زۆرینـەی نوێنـەران پشتڕاسـت دەكرایـەوە گوتی:" هێندێ هەن، كە تاوانی بێ سەرەوبەرەیی ئێستا دەخەنە ئەستۆی دەوڵـەت و وەزیـران، بەڵام ئێمە دەزانین، كە ئەو وەزیرانـە لـە سـێبەر و دارەدەسـتێك بـەو لاوە شـتێكی تـر نـین. چارەڕەشی و نەهامەتییەكانی ئێمە لە بن سەری كەسانێك دایە، كە ئەوان(وەزیرەكان) دەنێرنـە ئێرە. بۆ ئەوەی پێش بە رووخان و هەرەسی یەك جێی وڵات بگیردرێ دەبێ تەزار خۆی لە سـەر كار لابرێ تەنانەت ئەگەر پێویست بێ بە زۆرەملیش."

ئاخافتنەكەی كێرێنسكی دەنگدانەوەیەكی بەربڵاوی بوو. كاتێك مەلیكە بە نێوەرۆكی ئـەو لێدوانەی زانی بە تووڕەییەوە هاواری كرد، كە ئەو پیـاوە دەبـێ لـە سـێدارە بـدرێ. مەلیكـە تەنانەت بە بێ ئاگاداریی تەزار فەرمانی دا بە وەزیری نێوخۆ پرۆتۆپۆپۆف، كـە لـە تـەدارەكی

شکاندنی پارێزراوی و لە دەسبەسەرکردنی کێرێنسکیدا بێ، بەڵام رۆدزیانکۆی سەرۆکی دۆما پشتی گرت و گوتی کەس بۆی نییە کێرێنسکی دەسبەسەر بکا.

لە حەوتووی یەکەمی مانگی مارسدا خۆپیشاندان و تێکهەڵچوون لە شەقامەکانی پێترۆگراددا دەستی پێکرد، بەڵام تەزار لە تەشقی قەیرانەکەدا واتە لە رۆژی حەوتەمی مارسدا بڕیاری دا دیسان پایتەخت بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە بارەگای فەرماندەیی هێزەکانی روسیا. تەزار پێی وابوو، کە بە گەیشتنی چەکوچۆڵ ی نوێ لە بەریتانیا و فەڕەنساوە دەتوانێ رێگە بۆ هێرشی گەورەی بەهارە خۆش بکات و بە سەرکەوتن لە شەڕدا بەسەر هەموو گرفتەکاندا زاڵ بێ لە حاڵێکدا ئاوری شۆڕش لە پایتەختدا بڵێسەی دەستاند و دەرفەتێکی بۆ بەرێوە بردنی ئەو نەخشە دوورودرێژانە نەدەهێشتەوە.

رۆژی هەشتەمی مارس واتە ئەو رۆژەی، کە بۆ سبەینێ تەزار لە پایتەخت وەدەرکەوت کرێکارانی پێترۆگراد مانیان گرت. کرێکارە مانگرتووەکان بە شەقامەکانی شار وەربوون و لە چەند شوێنی شاردا لەگەڵ هێزە چەکدارەکان تێکهەڵچوون. رۆژی هەشتەمی مارس بشێوییەکان بەربڵاوتر بوونەوە و لە چەند شوێنی شاردا خەڵك هێرشیان کردە سەر نانە وایی و فرۆشگاکانی خواردەمەنی و تاڵانیان کردن.

رۆژی دەیەمی مارس، کە رووداوی توند و تیژی زیاتر هاتنە پێش، ژەنەراڵ خابالۆف فەرماندەی بنکەی سوپایی پێترۆگراد لە تەلەگرافێکدا تەزاری لە مەترسیی ئاگادار کردەوە، کە مانگرتنەکان وردە وردە دەبنە راپەڕین و جڵەوی بارودۆخەکەمان لە دەست دەردەچێ. تەزار وەڵامی دایەوە :"بە هەر شێوەیەك بووە کۆتایی بەو ئاژاوەیە بێنن". خابالۆف بۆ بەرێوەبردنی فەرمانی تەزار تەقەی لە کرێکاران کرد و بەو کارەی خۆی ئاگری راپەڕینەکانی خۆشتر کرد.

مەلیکە، کە لەو رۆژە قەیراناوییانەدا لە "تسارکۆیە_سلۆ" لە نزیکیی پایتەخت بوو هەموو رۆژێ راپۆرتی بارودۆخەکەی دەگەیاندە تەزار بە پێی ئەو زانیارییە هەڵە و درۆیینانەی، کە دەوروبەرییەکانی و ماستاوچییەکانی دەربار پێیان دەدا نالەباریی رەوشەکەی زۆر لەوە، کە هەبوو کەمتر وێنا دەکرد. لە پەیامی رۆژی نۆیەمی دیسێمبەری مەلیکەدا هاتووە:"سەرەڕای ئەو بشێوییانەی، کە لە هێندێ شوێندا هاتووەتە ئاراوە ژەنەراڵ خابالۆف بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵە". لە پەیامی رۆژی دەی مارسی ئەودا دەخوێنینەوە "ئاژاوەگێڕان و مانگرتووان ئەمڕۆ لە چاو دوێنێ چاوقایمتر و نەترستر بوون. ئاژاوە گێڕان زیاتریان هەرچی و پەرچی و بەرەڵڵاکانن. ئەو گەنج و خوێندکارانەی، کە هەتا ئەمڕۆ تاقە یەك رۆژیشیان برسێتی نەچەشتووە کەوتوونەتە

گەڵ هەژاران و کرێکاران و هاواری برسێتی دەکەن و خەڵك هـان دەدەن بـۆ ئـاژاوەگێڕی. مـن دڵنیام، کە ئەگەر هەوا سارد بوایە ئەوانە لە ماڵێ دەخزان و ئاژاوەیان نەدەگێڕا".

مەلیکە ئالیکساندرا لەو نامەیەدا هاوسەرەکەی دڵنیا دەکاتەوە، کە ئەگەر دەسەڵاتی تەواو بدرێتە خابالۆف ئەو ئاژاوانە سەرکوت دەکرێن. رێکەوتی ئەو پەیامە لەگەڵ تەلەگرافی خابالۆف بۆ تەزار یەك دەگرێتەوە و تەزار بە رواڵەت لـە ژێـر کاریگـەریی ئـەو لـە گـوێ خوێندنانـەی هاوسەرەکەیدا دەسەڵاتی تەواو دەداتە خابالۆف بۆ سەرکوتی بشێوییەکان.

خاڵێکی گرینگی دیکە کەلە پەیامی رۆژی دەی مارسی مەلیکە ئالیکسـاندرادا بـۆ تـەزار بەدی دەکرێ هێرشی توندی ئەوە بۆ سـەر دۆمـا. مەلیکـە دەنووسـێ:" لـە دۆمـادا هێرشـی چاوقایمانە دەکرێتە سەر پادشایەتی و حکوومەت. دیارە ئەو لێدوانە ناحەزانە لە رۆژنامەکانـدا بڵاو ناکەنەوە، بەڵام بۆ پێشگرتن لەو رەوشە خراپە دەبێ ئەوانـەی دژی بنەماڵـەی پادشـایەتی قسە دەکەن سزای توندیان بۆ لەبەر چاو بگیردرێ."

لە پەیامی رۆژی یازدەی مارسدا هاتووە" زۆربەی ئاژاوەکان لە گۆڕی کەسانێکی بەرەڵڵا و ئەو کچ و کوڕە خوێندکارانە و هێندێ لەو خەڵکە تێروپڕ و رێکپۆشەوە هەڵدایبسێن، کە هـیچ خاڵێکی هاوبەشیان لەگەڵ کرێکارانی مانگرتوو نییە. ئەو رۆژانە هێندێ سەربازی بریـنداریش لە ریزی خۆپێشـاندەرەکاندا دەبینـرێن، کـە بـۆ هانـدانی ئـەوانیتر بـە تایبـەتی ئەفسـەران و سەربازەکان هێناویاننەتە مەیدان..."

مەلیکە لە سەروبەندی شۆڕشدا پەیامێکی بۆ تەزار نارد، کە شیاوی خوێندنەوەیە.

ئەو لەو پەیامەدا دەنووسێ:"من پێم وایە بەم زووانە هەموو شتێك جێبەجێ دەبی و هیچ بۆ نیگەرانی نابێت. ئەمڕۆ خۆر دەدرەوشێتەوە و من وا هەست دەکەم، کە هاوڕێی کۆچ کردوومان لە گۆڕی خۆیدا بە ئارامی لێی خەوتووە. ئەو لە بەر خاتری ئێمە گیانی خۆی لـە دەسـت دا." مەبەستی مەلیکە لە "ئەو" راسپۆتینە، کە رۆحی شەیتانیی ئەو چەند مانگ پاش مەرگیشی گیان و دڵی مەلیکەی داگیر کردبوو.

بەڵام هـەر لـەو رۆژانـەدا، کـە مەلیکـە ئـەو پەیامـە هیـوادەر و ئۆخـژن بەخشـانەی بـۆ هاوسەرەکەی دەناردن رۆدزیانکۆ سەرۆکی دۆمـا تەلەگرافگـەلێکی وریـاییدەرەوەی بـۆ تـەزار دەنارد. لە تەلەگرافی رۆژی یازدەی مارسی ئەودا بۆ تەزار نووسراوە:

"بارودۆخەکە زۆر جیددی و مەترسیدارە. پایتەخت لەو پەڕی بێ سەرەرو بەرەیی دایە. دام و دەزگـای دەوڵـەت تـەواو لـە کـار کـەوتوون و سـووتەمەنی و خواردەمـەنی دەسـت ناکـەون. ئامرازەکانی راگواستن لە کار کەوتوون... ناڕەزایەتی جاربەجار پـەرە دەسـتێنێ... هێزەکـانی

سوپا له بەرامبەر مانگرتنەکان و خۆپێشاندانەکاندا دەستەوەستان تێدا ماون و هێندێکیان تەقە لە لایەنی خۆیان دەکەن... ئەگەر ئیمپراتۆر خێرا بڕیار نەدا و دەوڵەتێکی بەرپرسیار و بە هیز نەهێنێتە سەر کار کارەساتێك دەقەومێ، کە پێشی پێ ناگیردرێ."

ڕۆژی دوایی، واتە دوازدەهەمی مارس ڕۆدزیانکۆ پەیامێکی تالّی بۆ تەزار نارد و باسی تووڕەیی لە رادەبەدەری نوێنەرانی دۆمای بۆ کرد. تەزار، کە پێشتر پەیامێکی لە لایەن مەلیکەوە لە سەر دنەدانەکانی دۆما لە دژی پادشایەتی و حکوومەت پێگەیشتبوو لە کورتە پەیامێکدا بۆ ڕۆدزیانکۆ فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دۆمای دەرکرد.

ڕۆدزیانکۆ لە وەڵامی تەلەگرافەکەی تەزار لە تەلەگرافێکی خێرادا نووسیی:" بۆ بەڕێوەبردنی فەرمانی بەڕیزتان دانیشتنەکانی دۆمامان هەتا مانگی ئاپریل وەدوا خست. بە داخستنی دۆما دوایین سەنگەری پاراستنی تەکووزی و یاسا هەرەس دێنێ و دەوڵەتیش تەکووزی و هێمنایەتیی پێ سەقامگیر نابێ. بۆ پاراستنی هێمنی و تەکووزی و پێشگرتن لە سەر هەڵدانی دیکە ئیتر بۆوە نابێ پشت بە سوپا و تەنانەت بە گاردی ئیمپراتۆرییش ببەستین، لە بەر ئەوەی، کە کێشە و ناکۆکی و چەندبەرەکییان کەوتووەتە نێوان دسیپلینی سەربازیی وتای خۆی لە دەست داوە و تەنانەت هێندێ لە ئەفسەرەکان بە دەستی سەربازەکانی خۆیان کوژراون. شەڕی نێو خۆ بە کردەوە دەستی پێ کردووە و ئاژاوەگێڕ و گێچەڵ خولقێن هەموو جییەکیان تەنیوەتەوە. لە وەها هەلومەرجێكدا من بە شێوەی کاتی فەرمانی داخستنی دۆمام دەرکرد بۆ ئەوەی ئێوە لە بڕیارەکەتاندا، کە بۆ هەڵوەشاندنەوەی دۆما دەرتان کردبوو بچنەوە. من تکات لێ دەکەم وێڕای دەرکردنی فەرمانی دەست بەکارکردنەوەی سەر لە نوێی دۆما دەوڵەتێکی نوێ و بەرپرسیار دامەزرێنن... ئەگەر ئەو کارە وەدرەنگی بکەوێ سوپا پەرش و بڵاو دەبی و بە پێشڕەوی و سەرکەوتنی سوپای ئەڵمان، هەرەسهێنانی روسیا و پادشایەتیی ئێوە مسۆگەر دەبێت... کاتی بڕیاردان لە سەر چارەنووسی خۆتان و چارەنووسی روسیا گەیشتووە. سبەینێ زۆر درەنگ دەبێ."

وێڕای فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دۆما لە لایەن تەزارەوە و داخستنی کاتیی لە لایەن ڕۆدزیانکۆوە نوێنەرانی دۆما بڕیاریان دا لە بینای دۆما نەچنە دەرێ دانیشتنێکی نائاسایی پێك بێنن. ڕۆژە چارەنووسسازەکەی دوازدەی مارس بە گەلێك ڕووداوی دیکەوە دەستی پێکرد: ئەندامانی لەشکرێکی هێزە سوپاییەکان لە ولینسکی ڕاپەڕین وفەرماندەکەی خۆیان کوشت.

تاقمێك لە قەزاقەكان رەگەڵ خەڵك كەوتن و جەماوەرێكی زیاتر لە سی هەزاركەس لە چینە جۆراوجۆرەكانی كرێكاران و خوێندكاران و سەربازان و ژنان بەرەو دۆما وەڕێكەوتن.

لە حاڵێكدا، كە جەماوەر بەرەو دۆما دەبزووتن سەرۆكی گرووپە جیاوازەكان لە نووسینگەی دۆمادا كۆبوونەوە و داوای كۆبوونەوەیان كرد. پێك هێنانی كۆبوونەوەی دۆما پاش فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی لە لایەن تەزارەوە بە واتای شۆڕش و جوابەجەنگێی تەزار بوو و رۆدزیانكۆ پێداگر بوو لە سەر ئەوەی، كە كۆبوونەوە هەروا بە شێوەی نائاسایی درێژە بدرێ. لەو كۆبوونەوەیەدا زۆر بە توندی هێرش كرایە سەر تەزار و ژمارەیەك لە نوێنەران پێشنیاریان كرد دۆما جوابی تەزار نەداتەوە و ناوی خۆی بنێ جێنشینی دەوڵەت یا پەرلمانی دامەزرێنەران. نوێنەرێكی تر پێشنیاری كرد، كە دۆما راگەیەندراوێك دەربكا و رابگەیەنێ، كە دۆما لە نێوان تەزار و میللەتدا میللەت هەڵدەبژێرێ.

لە جەنگەی ئەو قسانەدا لە پڕ دەرگای هۆڵەكە كرایەوە و سەرۆكی گاردی پاراستنی دۆما بە پەشۆكاوی وەژوور كەوت و هاواری كرد:" هاوڕێیان جەماوەرێكی زۆر، كە زۆربەیان سەرباز و چەكدارن دۆمایان گەمارۆ داوە و ژمارەیەكیش دەیانە وێ بێنە ژوورێ. من ناتوانم پێشیان بگرم یارمەتیم بدەن."

لەو كاتەدا دەنگی تەقە لە دەرەوە هات. كێرێنسكی لە نێو سەرسووڕماوی و واق وڕماویی نوێنەراندا چووە پشت تریبوون و گوتی:"ئەوەی پێش هاتووە جێگەی هیچ شك و گومانێك ناهێڵێتەوە، كە ئیتر بۆ بیركردنەوە و لێرامان نابێ.... من دەمەوێ بچمە نێو سەربازەكان و لە لایەن ئێوەوە پێیان بڵێم، كە دۆما لەگەڵتانە.

ئێمە خۆمان بەرپرسیارەتی وەئەستۆ دەگرین و دەوڵەت دادەمەزرێنین." لە نێو ئەو ئاڵۆزییەی بەسەر دۆمادا زاڵ بوو هیچ كەس قسەكانی كێرێنسكیی نە پشتڕاست كردەوە و نە رەتیشی كردنەوە، بەڵام ئەو چاوەڕ وانی پشتڕاستكردنەوەی دۆمای نەمایەوە و بۆ ئاخافتن لە نێو جەماوەردا كۆبوونەوەی بەجێهێشت.

كاتێ كێرێنسكی گەیشتە نێو جەماوەرەكە سەربازە یاخییەكان لە ریزی پێشەوەی خەڵكەكەوە بوون. كێرێنسكی بە یەكەمین گاردی شۆڕشگێڕی روسیا ناوی هێنان و لە لایەن خۆیەوە رایگەیاند، كە دۆما رەگەڵ شۆڕش كەوتووە. جەماوەر بینای دۆمایان گرت و لە راستیدا دۆما لە شۆڕشدا توایەوە.

هەر ئەو رۆژە_دوازدەهەمی مارس _ كرێكارانی پێترۆگراد ئەنجومەنێكی نوێیان پێك هێنا، كە لە نموونەی ئەنجومەنی نوێنەرانی كرێكارانی 1905وە دروست كرابوو ئەو

ئەنجوومەنە، کە خۆی بە قایمەقامی دەوڵەت دەزانی یەکێك لە نوێنەرانی سۆسیالیستەکانی دۆمای بە ناوی چخیدزێ کردە سەرۆك و کێرێنسکیشی بە جێگری هەڵبژارد. لە لایەکی د-یکەوە سەربازە راپەڕیوەکان هێرشیان کردە سەر بەندیخانەی پێترۆگراد و تەواوی بەندییە سیاسییەکانیان بە بێ ئەوەی، کە گاردی بەندیخانە تۆسقاڵێکیش پێشگری بکات ئازاد کرد.

دوای بڵاوبوونەوەی راگەیەندراوەکان لە شار و هەموو یەکە کرێکارییەکاندا هەر ئەو شەوە نوێنەرانی کرێکاران بۆ کۆبوونەوەی گشتی لە دەوری یەك کۆ بوونەوە.

خرۆستالۆف سەرۆکی یەکەمین ئەنجوومەنی کرێکاریی سەنپێترێزبۆرگ 1905دا بەڕێوەبەری کۆبوونەوەکەی وەئەستۆ گرت و دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەمەن لەو کۆبوونەوەیەدا هەڵبژێردرا. چخیدزێ و کێرێنسکی لە سەرووی هەڵبژێردراوانەوە بوون و سکۆبۆلۆڤ نوێنەرێکی دیکەی دۆما و چەند کەس لە رێبەرانی یەکێتییەکانی کرێکاریشیان پێوە زیاد بوون.

لە جەنگەی ئەو کۆبوونەوە پڕ کەفوکوڵەدا بەردەوام ژمارەی نوێنەرانی بەشدار زیادی دەکرد و هاتنی نوێنەرانی یەکە سەربازییەکان بۆ ئەو کۆبوونەوەیە، کە لە سەرەتادا لە نوێنەرانی کرێکاران پێکهاتبوو وردە وردە رەنگی کۆبوونەوەکەی گۆڕی. ئەفسەران و سەربازان بە یۆنیفۆرمی سەربازییەوە یەك بە یەك دەچوونە پشت تریبوون و بە نوێنەرایەتیی لەشکر یا یەکەی خۆیان یەکگرتویی خۆیانیان لەگەڵ میللەتدا رادەگەیاند و راگەیاندنی یەکگرتوویی هەرکام لەو یەکە و لەشکرانە لە پشت تریبوونەوە بە پێشوازیی چەپڵەی وەك هەورەتریشقەی بەشداران پێشوازیی لێ دەکرا.

زۆربوونی رێژەی سەربازانی بەشدار لەو کۆبوونەوەیەدا و راگەیاندنی هاتنی یەکە سەربازیەکان بۆ ریزی شۆڕشڤانان بووە هۆی ئەوەی، کە ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سوپای راپەڕیو تێکەڵ بە یەکتر بن و ئەنجوومەنی یەکەی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان پێك بێت. لە کۆتایی ئەو کۆبوونەوەیەدا راگەیەندراوێك دەرکرا، کە تێیدا داوا لە خەڵك کرابوو هێمن و لە سەر ە خۆ بن و دان بەخۆدا بگرن.

راگەیەندراوەکە هەروەها رەوایی حکوومەتی تەزاری رەت کردبۆوە و خوازیاری پێکهاتنی پەرلمانێکی دامەزرێنەران ببوو.

لەو نێوەدا رۆڵی دۆما نادیار بوو. ئەندامەتیی چەند کەس لە نوێنەرانی دۆما لە کۆنسەی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازاندا بووە هۆی ئەوەی، کە جۆرە هاوکاری و پێوەندییەك لە نێوان ئەو ئەنجوومەنە و دۆمادا پێك بێ.

لە سەر پێشنیاری کێرێنسکی و چخیدزێ دۆما رۆژی سێزدەی مارس کۆمیتەیەکی بۆ بەڕێوەبەریی کاروباری حکومەت پێك هێناو کێرێنسکی و چخیدزێ هەردووکیان بۆ ئەندامیەتیی ئەو کۆمیتەیە هەڵبژێردران، کە لە راستیدا دەبوایە بەرعۆدەی ئەو ئەرك و بەرپرسیارەتیانە بێ.

# 7

گراندۆك میخاییل جارێکی دیکەش بۆ رزگاریی رژێم کەوتەوە هەوڵ و داوای لە سەرۆکی بنکەی سوپا ئالیکسێڤ کرد، کە بچێتە لای ئیمپراتۆر و داوای لێ بکات سەرۆك وەزیرێکی نوێ هەڵبژێرێ، کە بە دڵی خەڵك بی و بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دۆما وەلا بنی و لە رێگەیەکی ماقووڵانەوە لەگەڵ ئەو قەیرانە بەربەرەکانی بکات، بەڵام تەزار، کە ناوەندی بنکەی فەرماندەیی لە شەمەندەفەری تایبەتیی خۆیدا پاڵی لێ دابۆوە ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو پەیامەکەی براکەی بە هێند وەرنەگرت. ئەو ئێستاش پێی وابوو، کە بە کەڵك وەرگرتن لە هێزی سەربازی دەتوانێ بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ بێ و هەر بۆیەش بەبێ ئەوەی بیر لە رێگە چارەیەك بکاتەوە ژەنەراڵ ئیڤانۆڤی کردە مەئمووری سەرکوتی راپەڕینی پێترۆگراد. ئیڤانۆڤ بە سەربازەکانییەوە بەرەو پێترۆگۆاد وەڕێکەوت و تەزاریش بۆ ئەوەی پاش سەرکوتی راپەڕین سەرکەوتوانە بێتەوە نێو پێترۆگراد فەرمانی دا شەمەندەفەری پادشا بەرەو "تسارکویە_سلۆ" ی نزیکی پایتەخت وەڕێکەوێ.

لە یەکێك لە وێستگەکاندا هەواڵی نالەباریی رەوشی پێترۆگراد و دەسبەسەر داگیرانی پایتەختیان لە لایەن راپەڕیوانەوەدا بە تەزار. شەمەندەفەری پادشایەتی گەڕایەوە پسکۆڤ، کە یەکێك بوو لە بارەگا سوپاییەکان بۆ ئەوەی پاش هاتنی هێزەکانی ئیڤانۆڤ دیسان بەرەو پێترۆگراد وەڕێ کەوێتەوە.

تەزار هێشتا هیوادار بوو، کە ژەنەراڵ ئیڤانۆڤ بە خۆڕاگریی راپەڕیوان بە سانایی تێکیان بشکێنێ. مەلیکە، کە هێشتاش لە تسارکویە_سلۆ لە نزیکیی پایتەخت بوو ئەو بۆ چوونەی تێدا بەهێز دەکرد، کە تەنیا ژمارەیەکی کەم لە سەر بازەکان سەرپێچییان کردووە و زۆرینەی هێزی سوپا بە ئیمپراتۆر وەفادارن.

مەلیکە لە پەیامێکدا و هەر لەو رێکەوتەدا بۆ تـەزار دەنووسـێ:"من ئـەمڕۆ نـەمتوانی پێوەندیتان پێوە بکەم ... وادیارە کەسانێك دەیانە وێ نەهێڵن پێوەندیم بە تۆوە هەبی و ئـەتۆ ناچار بکەن، کە بەڵگەنامەگەلێکی وەك یاسای بنەڕەتی یا شتی سامناکتری لـەو چەشـنە واژۆ بکەن. من لێتان دووپاتە دەکەمەوە، کە مل بـۆ واژۆی ئـەو شـتانە رانەکێشـن، بارودۆخەکـە ئەوەنـدەش، کـە هێنـدێ کـەس گـەورەی دەکەنـەوە نالـەبار و خـراپ نییـە... ئەفسـەران و سەربازەکانی سوپا جگە لە هێندێ کەسی خەیانەتکار هێشـتا پێـت وەفـادارن. هـەر ئەوەنـدە بەسە، کە لە پسکۆڤ و ناوەندە سەربازییەکانی دیکەدا خۆیان نیشان بدەی دەبینی، کە چۆن لـە پشتت دەبن و بۆ هەموو فیداکاری و گیان بەختکردنێك ئامادە دەبن."

بەڵام ژەنەراڵ رۆزسکی فەرماندەی بنکەی پسکۆڤ رایەکی‌تری هـەبوو و پێـی وابـوو سـوپا ناتوانێ لە دوو بەرەی ناوخۆ و دەرەوەدا بەربـەرەکانی بکـات. ژەنـەراڵ رۆزسـکی پـاش چـەنە لیدانێکی زۆر توانیی تەزار قایل بکا بەوەی، کە مل بۆ رێگە چارەی پێشنیاروکراوی گرانـدۆك میخاییلی برای راکێشی و سەرۆك وەزیرێکی بە بڕشت و جێی متمانـەی خـەڵك هەڵبـژێرێ و دەسەڵاتی دۆما بە مەبەستی بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران زینـدوو بکاتەوە. تەزار بڕیاری دا رۆدزیانکۆ بکاتە سەرۆکی وەزیران و رۆزسکیشی بۆ راگەیاندنی ئـەم بڕیارە راسپارد. رۆزسکی داوای لە تەزار کرد مەئمووریەتی ئیڤانۆڤیش بە مەبەستی سەرکوتی شۆڕش هەڵوەشێنێتەوە. تەزار ئەوەشی قەبووڵ کرد.

تەزار نیکۆلا کاتژمێر سی و نیـوی شـەوی چـواردەی مـارس ئـەو بڕیـارەی دا و ژەنـەراڵ رۆزسکی لەرێوە ئەو شتانەی بە رۆدزیانکۆ راگەیانـد. رۆدزیـانکۆ گـوتی ئەگـەر تـەزار چـەند حەوتوو لەمەوبەر ئەو بڕیارەی دابا رێگەیەك بۆ رزگاریی دەبوو، بەڵام ئێستا ئیتر خـەڵك داوای کشانەوەی تەزار لە دەسەڵات دەکەن.

کاتژمێر دەی بەیانیی چواردەی مارس ژەنەراڵ رۆزسکی لە شەمەندەفەری پادشایەتیدا چاوی بە تەزار کەوت و دەقی وتووێژەکانی خۆی و رۆدزیانکۆی لە پێش تـەزار دانـا، کـە تێیدا رۆدزیانکۆ پلەی سەرۆکی وەزیرانی قەبووڵ نەکردبوو. تەزار داوای لە ژەنەراڵ کـرد، کە خۆی بۆی بخوێنێتەوە و پاش بیستنی ئەو دەقە چووە بەر پەنجەرە و لە بێدەنگی دا لـە فکرەوە رۆچوو.

ژەنەراڵ رۆزسکی دەگێڕێتەوە کە:" تەزار پاش چەند دەقیقـە بێـدەنگی لـە حاڵێـکدا، کـە هەوڵی دەدا پەرۆشی و هەژاویی خۆی بشارێتەوە دەستی بە قسە کرد، بەڵام قسە پچڕپچڕەکانی ئەو نیشاندەری شڵەژاوی و پەشۆکاویی ئەو بوون. یەکەمین رستەی تەزار ئەوە بوو، کـە ئەگـەر

بەرژەوەندییەکانی روسیا وا دەخوازی و بە دەست لە کار کێشانەوەی مـن کێشـەکان چارەسـەر دەبن ئامادەم دەست لەکار بکێشمەوە...

دواتر گوتی، بەڵام خەڵك چۆنی لێکدەدەنەوە؟ ئاخۆ ئەفسەران و سەربازە روسییەکان بـەوەم تاوانبار ناکەن، کە لە گەرمەی شەڕیدا پشتم تێکردوون و لە بەرەی شـەڕ هـەڵاتووم... ئـەدی سوێندەکەی من، کە لە سەرەتای پادشایەتیمدا خواردوومە دەبێتە چی؟... من بە چارەڕەشـی لە دایك بووم و روسیاشم تووشی چارەڕەشی کرد."

ئەو دەمەی، کە ژەنەراڵ لەگەڵ رۆزسکی قسەی دەکرد و هێشتا لە بڕیارەکەی دڕدۆنگ بوو تەلەگرافێکی لە لای ژەنەراڵ ئالیکسیفی سەرۆکی سوپاوە پێ گەیشت.

ئالیکسیف لەو تەلەگرافەدا نووسیبووی، کە ورەی سوپا تەواو دابەزیوە و تەنیا دەسـت لـە کارکێشانەوەی تەزار بە قازانجی وەلیعەهد و دانانی گراندۆك میخاییل بـە جێگریـی لەوانەیـە یارمەتیدەرووره بەخشی هێزە سەربازییەکان و درێژەدانی شەڕ بێت. ژەنەراڵ ئەوەشی لـێ زیـاد کردبوو، کە هەرچەندە ئەو بڕیارە وەدرەنگی بخرێ مەترسییەکە پتر دەبێ و لەوانەیـە راپـەڕیوان ئیتر بە مانەوەی پادشایەتی قایل نەبن.

تەزار تەلەگرافی ئالیکسیفی دایە دەستی رۆزسکی و گوتی ژەنەراڵ رای ئێوە چییە؟

رۆزسکی لە وەڵامدا گوتی:" شتەکە ئەوەندە گرینگە، کە من ناتوانم وەڵامی خێرا بدەمەوە بە جەنابی پادشا. دەرفەتێکم بدەنێ هەتا بیر و ڕای فەرماندەکانی دیکەش بپرسم".

کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆ رۆزسکی دیسان چۆوە لای تەزار و ئەو جارەیان دوو ژەنەراڵی دیکەشـی لەگەڵ بوون. رۆزسکی دوایین هەواڵەکانی گەیاندە تەزار: ئەنـدامانی گـاردی ئیمپراتـۆری کۆشـکیان جێ هێشتووە و لە دەوری دۆما کۆبوونەتەوە و ئامادەبوونی خۆیان بۆ خزمەت بـە دۆمـا دەربڕیـوە. گراندۆك سیریل ڤلادیمیریڤیچ لە سەرووی هێزەکانییەوە خۆیەوە وەفادارییی خۆی بۆ دۆما راگەیانـدووە قایمەقامی سەربازیی مۆسکۆ وەفادارییی خۆی بۆ کۆمیتەی دەوڵـەتیی دۆمـا راگەیانـدوە. وەزیرانـی تەزار دەستبەسەر کراون و بە کورتی مەلیکە قایل بووە بەوەی کە بە مەبەستی دانوستان چـاوی بـە رۆدزیانکۆی سەرۆکی دۆما بکەوێ.

بە شوێن ئەو هەواڵە راچڵەکێنەرانەدا تەلەگرافێك لە ژەنەراڵ ئالیکسێفەوە گەیشت. ژەنەراڵ ئالیکسێف لە وەڵامی داواکەی رۆزسکیدا بیروبۆچوونی فەرماندەرانی سوپای لە سەر دەست لە کارکێشانەوەی تەزار وەرگرتبوو. تەواوی ژەنەراڵەکان یەکدەنگ پێشـوازییان لـەو هەڵوێسـتەی تەزار کردبوو.

کاتێك ئەو تەلەگرافە گەیشتە دەست تەزار کاتژمێر دوازدەونیوی نیوەڕۆ بوو. تەزار پاش چەند چرکە بیّدەنگی رایگەیاند:"من بڕیاری خۆم دا. دەست لە کار دەکێشمەوە:"

کاتژمێرێك دواتر تەلەگرافێك بە ناوی رۆدزیانکۆی سەرۆکی دۆماو یەکی‌تر بە ناوی ژەنەراڵ ئالیکسیفی سەرۆکی سوپاوە ئامادە کرابوو.

دەقی ئەو تەلەگرافەی بە ناوی رۆدزیانکۆوە ناردرابوو بەو شێوەیە بوو:

بۆ رزگاریی روسیا و لە شوێنێك، کە بەرژەوەندییەکانی نیشتیمان دەخوازێ، من خۆ لە هیچ گیان بەختکردنێك نابوێرم. هەر بۆیەش ئامادەم بە قازانجی کوڕەکەم و بە دانانی میخاییل ئالیکساندرڤیچی برام بە جێگری، دەست لە پادشایەتی هەڵدەگرم، بەو مەرجەی کوڕەکەم هەتا دەگاتە تەمەنی یاسایی خۆی لە لای خۆم بمێنێتەوە."

لە تەلەگرافی ژەنەراڵ ئالیکسیفی سەرۆکی سوپاس روسیاشدا هاتووە:" لە بەر خاتری بەختەوەری و رزگاریی روسیای خۆشەویستم بڕیارم داوە دەست لە پادشایەتی هەڵگرم. کوڕەکەم جێگرمە و داواش لە تەواوی ئەفسەران و سەربازانی سوپا دەکەم پێی وەفادار بن".

کاتژمێر پێنجی بەیانیی رۆژی پازدەی مارسی 1917 کوچکۆڤ و شولگین نوێنەرانی دۆما بە نووسراوی ئامادەکراوی دەست لە کارکێشانەوەی تەزارەوە لە پێترۆگرادەوە بەرەو پسکۆڤ وەڕێکەوتن بۆ ئەوەی ئەو بەڵگەیەی پیّ واژۆ بکەن.

شولگین لە بیرەوەریەکانی خۆیدا ئاوا باسی ئەو سەفەرە دەکا:

ئێمە کاتژمێر 9ی شەو گەیشتینە پسکۆڤ... نوێنەرێکی تەزار لە وێستگە چاوەڕێمان بوو و خێرا بەرەو شەمەندەفەری پادشایەتی وەپێشمان کەوت. چەند خولەك دواتر ئیمپراتۆر وەژوور کەوت.... ئێمە رێزمان دانا و ئەو دەستمانی گوشی. گوچکۆف راپۆرتێکی لە سەر پایتەختدا بە تەزار و دواتر دەقی دست لەکار کێشانەوەکەی بۆ واژۆکردن پێشکەش کرد... تەزار گوتی پاش ناردنی تەلەگرافەکە بڕیارەکەی گۆڕیوە و پەژیوان بۆتەوە، کە تەختی پادشایەتی بە ئالیکسی کوڕی بسپێریّ.... ئێمە بە بیستنی ئەو قسەیە راچڵکیین، بەڵام تەزار ئەوەی لیّ زیاد کرد:، کە هەر لە سەر بڕیاری دەست لە کارکێشانەوەکەی خۆی ماوە، بەڵام دەیەویّ تەختی پادشایەتییەکەی پێشکەش بە میخایلی برای بکات... ئێمە نەماندەزانی چ کاردانەوەیەکمان هەبیّ، بەڵام کاتیّ تەزار جەختی لە سەر ئەوە کردەوە، کە بڕیاری خۆی داوە، پێمان دانەگرتەوە... ئیمپراتۆر بیست خولەکی مابوو بۆ نیوە شەو، کە دەقی دەست لە کار کێشانەوەی پیّ داین.... نزیك بە نیوە شەو بوو، کە شەمەندەفەرەکەی ئێمە وەڕێکەوت و بەیانی گەیشتینە پێترۆگراد..."

لە پێترۆگراد کۆمیتەی دۆماو دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی کرێکاران و سەربازان ئەندامانی دەوڵەتی کاتییان دەسنیشان کردبوو. پرینس لەوڤprince lvovبۆ سەرۆکایەتیی دەوڵەت پرۆفیسۆر میلیکۆف بۆ وەزارەتی دەرەوە ئالیکساندرگۆچکۆڤ بۆ وەزارەتی جەنگ و کێرێنسکی بۆ وەزارەتی داد دیاری کرابوون. دەست لە کارکێشانەوەی تەزار نیکۆلا وەدرەنگی کەوتبوو و ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان ئامادە نەبوون ئەوە قەبووڵ بکەن و پادشایەتیی رۆمانۆفەکان درێژە بکێشێ.

کاتژمێر شەشی بەیانیی رۆژی شازدەی مارس کێرێنسکی تەلەفۆنی بۆ گراندۆك کرد و ئاگاداری کردەوە، کە ئەندامانی کۆمیتەی دۆما بە سەرۆکایەتیی رۆدزیانکۆ دەیانە وێ چاویان پێی بکەوێ. لەو چاوپێکەوتنەدا جگە لە میلیکۆڤ تەواوی ئەندامانی کۆمیتە خوازیاری دەستهەڵگرتنی میخاییلن لە وەرگرتنی پۆستی پادشایەتی. پاش چەند سەعات وتووێژ ئاخری میخاییل ملی راکێشا و چاوپۆشیی لە پادشایەتی کرد.

مەلیکە ئالیکساندرا هێشتا هیوادار بوو، کە رووداوەکانی 1905 دووپاتە ببنەوە و رێگە بۆ گەڕانەوەی هاوسەرەکەی بۆ سەر تەختی پادشایەتی خۆش بێت. ئەو لە نامەیەکی رێکەوتی شازدەی مارسدا بۆ هاوسەرەکەی ئاوا دەنووسێ :

هاوسەرە خۆشەویست و قارەمانەکەم... من بە تەواوەتی لەو هەلومەرجەدا دەزانم بۆچی ئەو بڕیارەت داوە و ئەو کارەت کردووە... ئەتۆ بەو فیداکارییەت ئیمپراتۆریی روسیا و تاج و تەختی خۆتت پاراست. من سوێند دەخۆم، کە جارێکی تر بە شانازیی زیاترەوە لە سەر تەختی پادشایەتی دەتبینمەوە و ئەو جار نەك میللەت و سوپا بەڵکو هێز و دەسەڵاتی خودا و بەزەیی خودایی تاج و تەختی پادشایەتیی ئەو وڵاتەت لە سەر دەنێ".

ئەنجوومەنی نوێنەران و سەربازان بە کردەوە لە پایتەخت دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرتبوو. ئەنجوومەن حکوومەتی کاتیشی پاش ئەوەی، کە مەرجە پێشنیارکراوەکانی قەبووڵ کرد بە فەرمی ناسیی. یەکێك لەو مەرجانە لێبووردنی گشتی بۆ بەندییە سیاسییەکان و دوورخراوەکان و ئازادیەکانی چاپەمەنی و کۆڕ و کۆبوونەوە و بیر و را دەربڕین و هەڵوەشاندنەوەی تەواوی پوانگەلی چینایەتی لابردنی ئاستەنگییەکان و هەڵاواردنی نەتەوەیی و ئایینی و هەڵبژاردنی پەرلمانی دامەزرێنەران بۆ دیاریکردنی حکوومەتی داهاتوو و دانانی هێزێکی چەکداری میلیشیا بەجێگەی پۆلیس بوو، کە لە گەڵاڵەی کاری دەوڵەتی کاتیدا بوون و یەکەم هەنگاویشی ئازادیی تەواوی بەندییە سیاسییەکان و دوورخراوەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ پایتەخت بوو.

کەسایەتیی ناسراوی دەوڵەتی کاتی کێرێنسکی بوو، کە لە پلـەی وەزیـری "داد" دا و بـە لێپێچینەوە و سزادانی تۆمەتباران بـە گەنـدەڵی و جەنایـەت لـە رابـردوودا نـاو و ناوبـانگی دەرکرد. دیارە ئەو پێشتریش وەکو نوێنەری سۆسیالیستی دۆما و وتەبێژ و پارێزەرێکی بە توانا ناوبانگی هەبوو و لە لایکی ترەوە بە هۆی ئەندامەتی لە سەرۆکایەتیی نوێنەرانی ئەنجوومـەنی کرێکاران و سەربازان بەهێزترین کەسایەتیی دەوڵەتی کاتی بوو.

لەگەڵ ئەوەی، کە دەوڵەتی کاتی زیاتر لە کەسانی بۆرژۆواو لیبراڵ پێك هاتبوو ناچـار بـوو مل بۆ بڕیارەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان راکێشێ.

یەکێك لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان، کە زیانێکی قورسی لە دسیپلینی سەربازیی سوپادا فەرمانی پێك هێنانی ئەنجوومەنگـەلی نیزامـی بـوو لـە هـەموو یەکەکانی سوپادا، کە بووە هۆی کەم بوونەوەی هێز و دەسەڵاتی فەرماندەکانی سوپا. فـەرمان درا بە هێزە سەربازییەکان، کە بە بێ پشتڕاستکردنەوەی ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی کرێکـاران و سەربازان هیچ فەرمانێکی سـوپایی جێبـەجێ نەکـەن و بـەو شـێوەیە بـە کـردەوە دەسـەڵاتی فەرماندەیی و دەست بردن بۆ هەر کارێکی پێچەوانەی ویستی ئەنجوومەنیان لێ زەوت کرا.

لە نیـوەی مـانگی مارسـی 1917دا دوورخراوەکـان و راکردووانـی روسـی لـە چـوارقوڕنەی جیهانەوە، لە ئەورووپا و ئەمریکاوە بگرە هەتا سیبریا روویان کردەوە پێترۆگراد. لە نێو ئەو هەزاران کەسەدا، کە لە بەهاری ئەو ساڵەدا گەڕانەوە روسیا کۆچکردووان و راکردووان دوورخراوانی ژن و پیاو لە هەر گرووپ و چینێکی شۆڕشڤانانی کۆن و سۆسیالیست و لیبراڵەوە بگرە هەتا دەگاتە رۆشنبیران و خوێندکاران، کە لە ترسی راوەدوونان و بەندکران بەرەو دەرەوەی روسیا رایانکردبوو، بەدی دەکـران. لەگەڵ راگەیاندنی لێبـوردنی گشـتی لـە لایـەن دەوڵـەتی کاتییـەوە تـەواوی بەنـدی و دوورخـراوە سیاسییەکان، کە لەچالاکترین شۆڕشگێڕەکان بوون بەرەو پێترۆگراد گەڕانەوە و لـە کۆتـایی مـانگی مارس و ئاپریلدا ناسراوترین کەسایەتییە شۆڕشگێڕەکانی روسیا لەو شارەدا دەرکەوتن، بـەڵام هـەتا لینین لە رێکەوتی شازدەی ئاپریلی 1917دا نەگەڕایەوە پێترۆگـراد، هـیچ مەترسـییەکی جیـددی هەڕەشەی لە دەوڵەتی کاتی و دێموکراسیی نوێی روسیا نەدەکرد. لەمەودوا دەبێ لە ژیـانی لینینـدا بە دووی مێژووی شۆڕشی روسیادا بڕۆین.

# بەشی دووەم

# لینین و شۆڕشی دووەمی روسیا

ڤلادیمیرئیلیچئۆلیانۆف، کە لە مێژووی روسیا و جیهاندا بە لینین ناوی دەرکردووە کاتێك لە رۆژی شازدەی ئاپریلی 1917دا لە فەنلاندەوە بە شەمەندەفەر گەڕایەوە پێترۆگراد، چل وحەوت سالّی تەمەن بوو. ئەو نزیك بە سی سالّ لە تەمەنی خۆی لە رێگەی خەباتی سیاسیدا تێپەڕ کردبوو و لە درێژەی ئەو خەباتەدا زیاتر لە تەمەنی خۆی ئەزموون کۆکردبوونەوە. ئەو هەر بەو ئەزموون و شێوازە تایبەتییەی، کە لە خەباتدا هەیبوو توانیی لە ماوەیەکی کەمتر لە حەوت مانگدا رەوگەی شۆڕشی روسیا بگۆڕی و بە وەڕێخستنی شۆڕشێکی دووەم لە روسیادا، کە بە شۆڕشی بۆلشەڤیکی ناوی دەرکردووە رەوگەی مێژووی روسیا بگۆڕێ.

ڤلادیمیرئیلیچئۆلیانۆف رۆژی 22 ی ئاپریلی سالّی 1870 لە بنەمالّەیەکی مام ناوەندی لە شاریی سیمبیرسكی هەلّکەوتوو لە لێواری چەمی ڤۆلگا لە دایك بوو. ئیلیائۆلیانۆڤی باوکی مامۆستا بوو و لە کاتی لە دایکبوونی ڤلادیمیردا پلەی چاوەدێری گشتیی پەروەردەی ئەیالەتیی سیمبیرسكی پێدرابوو.

ئالیکساندری براگەورەی لە سالّی 1866دا لە دایك ببوو. سێ کور و کچێك دوای ڤلادیمیر لەو بنەمالّەیەدا لە دایك بوون و کاتێك، کە لە سالّی 1886دا باوکیان مرد، کوڕە گەورەی مالّێیان ئالیکساندرا تەمەنی بیست سال و ڤلادیمیر شازدە سالّ بوو.

هەر وەکو لە بەشی پێشوودا باسمان کرد ئالیکساندر ئۆلیانۆف سالّی 1887 بە تۆمەتی بەشداربوون لە پیلانی کوشتنی ئەلیکساندری سێیەم تەزاری روسیادا لە سێدارە درا. هەوالّی لەداردرانی براکەی، ڤلادیمیری لەو کاتدا، کە حەڤدەسالّی تەمەن بوو راچلّکاند و ئەو رووداوە لەوانەیە یەکەم پالّنەر و هانەی سەرەکیی ئەو بووبێ بۆ بەشداربوون لە چالاکییە سیاسییەکانداو گرتنە بەری ئەو رێبازەی، کە سی سالّ دواتر ئەوی گەیاندە سەر تەختی پادشایەتیی تەزارەکان.

ڤلادیمیر، کە قوتابییەکی ئێجگار شێلگیر و زیرەك بوو مانگێك پاش لەداردرانی براکەی بە وەرگرتنی نیشانی زێڕینی باشترین قوتابی لە قوتابخانەی دواناوەندی سیمبیرسك دەرچوو و بۆ ناونووسی چووە زانکۆی کازان، بەڵام زانکۆی کازان لە ناونووسکردنی برای تیرۆریستێك خۆی بوارد. ئەو گرفتە دواجار بە دەستی فیدۆرکێرێنسکیی سەرۆکی قوتابخانەی دواناوەندیی سیمبیرسك، کە ڤلادیمیر خوێندنی لەوێ تەواو کردبوو چارەسەر کرا. ئەو لە نامەیەکدا بە ناوی زانکۆی کازان ڤلادیمیری وەکو قوتابییەکی زۆر شێلگیر و ڕێکوپێك و پابەند بە بنەما ئەخلاقیەکان و باوەڕە ئایینییەکان، ناساند و گەرەنتیی ڕەوشت پاکیی ئەوی کرد.

ئەوەش یەکێکە لە یارییە سەیرەکانی ڕۆژگار، کە ئەو پیاوە هەر باوکی ئەو ئالیکساندر کێرێنسکییەی سەرۆکی دەوڵەتی کاتییەی پاش لە سەر کارلابردنی تەزارە، کە حکوومەتەکەی بە دەستی هەر ئەو گەنجە " ڕێکوپێك و پابەند بە بنەما ئەخلاقیەکان و باوەڕە ئایینییەکان" ـە وەرگەڕا.

سەردەمی خوێندنی ڤلادیمیر لە زانکۆی کازان زیاتر لە شەش مانگی نەخایاند، چونکی ئەو هەر لە یەکەمین مانگەکانی سەرەتای خوێندنەوە ڕەگەڵ گرووپە خوێندکارییە شۆڕشگێڕییەکان کەوت و لە دیسێمبەری 1887دا پاش بەشداربوون لە خۆپێشاندانێکی توند و تیژی خوێندکاریدا، گیراو لە زانکۆ دەرکرا. ساڵێکی خایاند هەتا ڤلادیمیر بە هەوڵی بەردەوامی دایکی توانیی لە کۆلێژی ماف لە سەنپیێترێزبۆرگ ناونووسی بکات و هەر لەو سەردەمە بێکارییەشدا بوو، کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ بەرهەمەکانی مارکس ئاشنا بوو و کەوتە ژێر کاریگەرییانەوە.

ڤلادیمیر لە ساڵی 1891دا کۆلێژی مافی سەنپیێترێزبۆرگی تەواو کرد و بەڵگەنامەی پارێزەریی وەرگرت، بەڵام پاش دوو ساڵ کارکردن لە شاری بچووکی سامێرا لە پاییزی ساڵی 1893دا سەر لەنوێ چۆوە سەنپیێترێزبۆرگ و لەوێ ڕەگەڵ ڕێکخراوی نهێنیی سۆسیالدیموکراتەکانی ڕوسیا، کە ناوی "گەورەترەکان" بوو کەوت. لەو کاتدا ڕوسیا لە تەشقی پیشەییبوونی خۆیدا بوو و دەستەدەستە لادێیەکات بۆ کارکردن لە ناوەندە پیشەییەکاندا ڕوویان دەکردە شارەکان. سۆسیال دیموکراتەکان چالاکییەکانی خۆیان لە گرووپی بچووك بچووکی کرێکاریدا چڕ کردبۆوە و ئەوانیان فێری بنەماکانی مارکسیزم و کۆمۆنیزم دەکرد. ئەو کرێکارانەی بەو شێوەیە پەروەردە دەکران و لە پۆلە پەروەردەییەکان دەهاتنە دەر، نەدەبوایە بەشداری لە خۆپێشاندان و مانگرتنەکان و هەر چەشنە چالاکییەکی ئەوتۆدا بکەن، کە تووشی کێشە و مەترسیی جیددی دەکردن و چالاکیی سیاسیی ئەوان تەنیا تەرخان بوو بۆ پڕوپاگەندە بۆ گرووپگەلی کرێکاریی دیکە .

ئۆلیانۆف دژی ئەو میتۆدە کۆنەپارێزانەیە بوو و دەیگوت لە بری پەروەردەی کادرەکان و بردنەسەری ئاستی زانیاریی کرێکاران دەبێ بە کردەوە تێبکوشین و پەرە بە بشێوی و ئالۆزی و مانگرتنەکان بدەین. لە ساڵی 1895دا زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی سۆسیالیست دیموکراتەکان هاتنە سەر باوەڕی وی و ئۆلیانۆف، کە بە کردەوە ڕێبەرایەتیی ڕێکخراوەکەی بەدەستەوە گرتبوو یەکەمین ڕاگەیەندراوی ورووژێنەری خۆی لە نێوکرێکارانی سەنپێترێزبۆرگدا بڵاو کردەوە. پۆلیسی سەنپێترێزبۆرگ ئەو ڕاگەیەندراوەی، کە بڕێك ئاڵۆز و پڕ بوو لە دەستەواژەی فەلسەفی بە هێند وەرنەگرت و سەرۆکی پۆلیسی سەنپێترێزبۆرگ گوتی ئەودارودەستە بچووکانە چیان لە دەست نایە.

ڤلادیمیرئۆلیانۆف لە سەرەتاکانی ساڵدا تووشی ڕیخۆڵە کوێرە بوو و بۆ چارەسەرکردنەکەی و بۆ پشوودان چووە سویسراو فەڕەنسا. لەو سەفەرەدا، کە یەکەمین سەفەری ئۆلیانۆف بوو بۆ دەرەوەی روسیا ئەو توانیی چاوی بە باوکەکانی مارکسیزمی روسی واتە " پۆلخانۆف و ئاکسلرۆد" بکەوێ. کاتێك پۆلخانۆف و ئۆلیانۆف لە هاوینی 1895دا چاویان بە یەکتری کەوت پۆلخانۆف وەك مامۆستاو ئۆلیانۆف وەك قوتابی وابوو.

پۆلخانۆف پیاوێکی مرۆڤدۆست و فەیلەسەفێکی مرۆڤگەرا بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە پێی وابوو تەنیا نووسین بەس نییە بۆ گەیشتن بە ئامانجە مرۆییەکان، دەستی بە کاری سیاسی کردبوو. ئەو لە ناخی ڤلادیمیر ئۆلیانۆفدا ئەو پیاوە چالاك و نەسرەوتووەی، کە بۆ خەباتی سیاسی لە نێو خۆی روسیادا پێویست بوو، دۆزییەوە.

ئۆلیانۆف بیرەوەریی ئالیکساندر میخائیلۆف ڕێبەری شێلگیر و پڕ کەفوکوڵی" حیزبی ویستی گەل" ی هێناوە پێش چاوی پۆلخانۆف: ئۆلیانۆفیش وەك میخائیلۆف مامۆستای ڕێکخستنی سیاسی بوو و لەو کاتدا لە هەموو کەس باشتر دەیتوانی ئەندامانی حیزبێکی سیاسی لە نێو روسیادا ڕێك بخا.

ڤلادیمیرئۆلیانۆف لە سێپتەمبەری 1895دا گەڕایەوە روسیا. ئۆلیانۆف لە سەر پێشنیاری پۆلخانۆف لە سەنپێترێزبۆرگ لەگەڵ گەنجێك بە ناوی مارتۆڤ ئاشنا بوو. مارتۆڤ، کە پێشتر خوێندکاری زانکۆی سەنپێترێزبۆرگ بووە و بە هۆی تێکۆشانی سیاسییەوە لەو زانکۆیە دەرکرابوو پاش دەرکران لە زانکۆ و دوورخرانەوەشی لە پایتەخت دیسان دەستی لە خەبات و تێکۆشان هەڵنەگرتبوو و بزووتنەوەیەکی کرێکاریی لە ڤیلنا وەڕێ خستبوو. مارتۆڤ پاش گەڕانەوەی بۆ سەنپێترێزبۆرگ دیسان درێژەی دا بە چالاکیی نهێنیی خۆی و

پێوەندیی بە کۆمەل و رێکخراوگەلی نهێنییەوە هەبوو و لەو چاوپێککەوتنانەدا گەلالـەی رێکخراوی سیاسیی نوێ دادەرێژران.

چالاکییەکانی ئۆلیانۆف و مارتۆڤ گەیشتە ئەوەی، کە رۆژنامەیەکیش بـە نهـێنی چـاپ و بلاو بکەنەوە، بەلام پۆلیسی تەزاری، کە چاوی بەسەریانەوە بوو بەر لە دەرچـوونی رۆژنامەکـە دەستبەسەری کردن. ئۆلیانۆف چواردە مانگ لە سـەنپێتریزبۆرگ لـە بەندیخانـەدا بـوو و پـاش تەواوکردنی دەورەی زیندانیش بەرەو خۆرهەلاتی سیبریا دوورخرایەوە.

ماوەی دوورخراوەیی ئۆلیانۆف سێ سالی خایاند و ئەو لەو ماوەیـەدا کتێبـە گرینگـەکانی خۆی بە ناوەکـانی "رەوتـی گـۆڕانی سـەرمایەداری لـە روسـیادا" و ئامانجـەکانی سۆسـیال-دیموکراتەکانی روسیا" ی نووسین. کتێبی رەوتی گۆڕانی سەرمایەداری لە روسیا سالی 1899 بە ناوی خوازراوی "ڤلادیمیرئیلین" لە سەنپێتریزبۆرگ بلاو بـۆوە و پۆلیسـی تـەزار پێشـی بـە بلاوبوونەوەی ئەو کتێبە نەگرت کە هێرشی دەکردە سەر بنەماکانی سیستەمی ئـابووریی ئـەو کاتی روسیا. کتێبەکەی تری ڤلادیمیرئۆلیانۆف لەمەڕ سۆسیالدیموکراتەکانی روسیاوە بـە نـاوی خوازراوی لینین لە سویسرا چاپ کرا و ئەوە یەکەم جاری بوو، کە ئەو کەلکی لـە نـاوی لیـنین وەردەگرت. لینین ئەو ناوەی، کە دواتر هەر وا لە سەر ی مایەوە لە چەمی "لینا"ی وەرگـرت، کە بە تەنیشت تاراوگەکەیدا تێدەپەڕی.

ڤلادیمیرئۆلیانۆف، کە لەمەودوا بە لینین ناوی دێنین لـە سـەردەمی دوورخراوەییـدا لەگـەل کچێك بە ناوی "نادژدا_کروپسکایا"، کە پێشتریش لە سەنپێتریزبۆرگ ناسیبووی زەماوەنـدی کرد. کرۆپسکایا، کە هەر وەکو لینین لـە سـەر چـالاکیی سیاسـیی نهـێنی گیرابـوو و بـەرەو شوێنێکی دیکەی سیبریا دوورخرابۆوە بۆ ئەوەی خۆی بگەیەنێتە لینین خۆی بە دەسگیرانی ئەو لەقەلەم دا و لە تاراوگەی لینین گەیشـتنە یـەك. کرۆپسـکایا کچـێکی ژیکەلـە بـوو و لیـنین دەسگیرانیێتیی دلخوازانەی ئەوی بە گیان ودل قەبوول کرد و هەر لـەو تاراوگـە دوورەدەسـتەدا زەماوەندەکەیان ساز کرد.

# 2

لینین لە دوایین ساڵی دوورخراوەیی خۆیدا لە سیبریا گەڵاڵەی کۆمەڵێك چالاکیی نوێ و بەردەوامی بۆ داهاتوو دارشتن. یەکێك لەو بەرنامانە گەڵاڵەی دەرکردنی رۆژنامەیەك لە دەروەی روسیا و بڵاوکردنەوەی لە نێو روسیادا بە هۆی دەست و پێوەندە نهێنییەکانییەوە بوو. لینین بڕیاری دا بوو چالاکییەکانی خۆی پاش سەردەمی دوورخراوەیی لە دەرەوەی روسیا چڕ بکاتەوە و بە دەرکردنی رۆژنامە و بڵاڤۆکی سیاسی و پرۆپاگەندە و ناردنەوەیان بۆ نێو روسیا لە رێگەی ئەو تۆڕەوە، کە لەوەپێش گەڵاڵەکەی دارشتبوو بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەی نوێ لە روسیا وەڕێبخات. مارتۆڤ هاوڕێ و هاوسەنگەری وی لە سەنپیێتریزبۆرگ، کە پێکەوە گیرابوون و دوورخرابوونەوە ئەو بۆچونەی بەدڵ بوو و لە چاوپێکەوتنێکدا، کە لە مانگی مای 1900دا پاش تەواوبوونی سەردەمی دوورخراوەییان لە پسکۆڤ پێکەوە بوویان رێککەوتن، کە لینین بۆ پێك هێنانی ناوەندێك بۆ چالاکیی سیاسی لە دەرەوەی روسیا بچێتە ئەڵمانیاو مارتۆڤیش بۆ رێکخستنی نهێنیی شۆڕشگێڕانە و نوێ لە روسیا بمێنێتەوە.

لینین پاش وەرگرتنی رەزامەندیی پۆلخانۆف بۆ بڵاوکردنەوەی رۆژنامەیەك لە نێو روسیادا لەگەڵ رێبەرانی حیزبی سۆسیالدیموکراتی ئەڵمان کەوتە دانوستان، کە لە ئەڵمانیا بۆی چاپ بکەن. یەکەمین ژمارەی ئەم رۆژنامەیە، کە ناوی ئیسکرا یا بریسکە بوو رۆژی بیست و یەکەمی مانگی دیسێمبەری 1900 لە لایپزیك دەرچوو. رۆژنامەکە لە قەوارەیەکی بچووك و لە سەر کاغەزێکی ناسك چاپ ببوو وبۆ ئەوەی هەڵگرتن و راگواستنەکەی و بڵاوکردنەوەکەی لە نێو روسیادا، هاسانتر بێ.

رۆژنامەکان پاش چاپ دەنێردرانە بەرلین و لەوێ لە عەمباری رۆژنامەی ئۆرگانی حیزبی سۆسیالدیموکراتەکاندا دەپارێزران. چەند کەس لە ئەندامانی حیزبی سۆسیالدیموکراتی ئەڵمان، کە بۆ هاوکاریی لەگەڵ بەڕێوەبەرانی رۆژنامەی ئیسکرا راسپێردرابوون ئەو رۆژنامانەیان قەد دەکرد و لە نێو بەستەی رۆژنامە و بڵاڤۆکی تردا تاقەتیان دەکردن و دەیانناردنەوە بۆ روسیا.

هێندێ لە بەستەرۆژنامەکانی ئیسکرا هەر لە سەر سنوور راستەوخۆ دەدران بەو کەسانەی پێیان سپێردرابوو بە نهێنی لە روسیادا بڵاویان بکەنەوە و بەرێی شارە گەورەکانیان دەکردن.

دیاره ئەم کاره بێ مەترسیی نەبوو و گەلێ جاران ئەو کەسانەی بە نهێنی ئیسکرایان بڵاو دەکردەوه لە لایەن پۆلیسی نهێنیی تەزارەوه دەگیران و رەوانەی سیبریا دەکران.

هەر وەك لینین پێشبینیی کردبوو دەرچوونی رۆژنامەی ئیسکرا قورسایی و بایەخێکی تایبەتیی بە چالاکیی ئەو گرووپەدا و ئەو رۆژنامەیە ورده ورده نەك وەکو ئۆرگانێکی شۆڕشگێر و بانگەشەکاری بەڵکو وەك فاکتەرێکی رێکخەری چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی نێو روسیای چاو لێدەکرا. ئیسکرا لە ماوەیەکی کورتدا پاش دەرچوونی دەگەیشتە سەدان ناوەندی حیزبی لە تەواوی روسیادا و، وتار و رێنوێنییەکانی ئەو چالاکیی کادرەکانی حیزبی دەخستە ئاقارێکەوە.

لینین لە یەکەمین ژمارەی ئیسکرادا نووسیی:"ئەگەر ئێمە رێکخراوێکی پتەو و یەکگرتووی حیزبیمان هەبێ دەتوانین هەر چەشنە مانگرتن و بزووتنەوەیەکی گچکەش بکەینە سەرکەوتنێکی سیاسی بە سەر رژێمدا. رێکخستنێکی رێکوپێکی حیزبی دەتوانێ بە کەڵك وەرگرتن لە هەر دەرفەتێکی لەبار حەرەکەتێکی نوێ وەڕێبخاو هەر چەشنە سەرهەڵدانێکی بچووکی ناوچەییش بکاتە بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە."

چاپخانەی رۆژنامەی ئیسکرا یە رێکەوتی 1901دا لە لایپزیکەوە بۆ مۆنیخ راگوێزرا، بەڵام چاپخانەی مۆنیخ بە هۆی ئەو گرفت و مەترسیانەی کەبۆ ئەم کاره لە سەر رێی بوون نەیتوانی درێژە بەو کاره بدات. پۆلخانۆف پێشنیاری کرد، کە رۆژنامەکە لە سویسرا چاپ بکرێ، بەڵام ئەوانیتر سویسراشیان بۆ ئەو کاره پێ باش نەبوو، و ئاخرییەکەی هەموان لە سەر ئەوه ساخ بوونەوه، کە رۆژنامەکە لە لەندەن چاپ بکرێ.

لینین و کرۆپسکایای ژنی، کە لە ئەڵمانیا خۆی گەیاندبوویە لە ئاپریلی 1902دا لە رۆژێکی تەماویدا هاتنە لەندەن. لینین لە لەندەن تێگەیشت، کە ئەو ئینگلیزییەی ئەو دەیزانێ وەڵامدەری ئەو ئیشە نییە، کە ئەو دەیەوێ بیکا. هەر بۆیەش یەکەمین کارێکی، کە کردی ئەوه بوو، کە دوو مامۆستای بۆ رێزمان و قسەکردن گرت و بەو بەردەوامیەی، کە لە سەر کار هەیبوو زۆر زوو توانیی زمانی ئینگلیزییەکەی تەواو باش بکات. لینین لە بری ئەوەی مامۆستاکان ئەویان فێری ئینگلیزی دەکرد ئەویش ئەوانی فێری زمانی روسی دەکرد.

کتێبخانەی مووزەی بەریتانیا گەنجینەیەکی پڕبایەخ بوو، کە لینین بۆ موتالاو توێژینەوه دەستی پێی راگەیشت. پێشتریش کارلمارکس بۆ موتالاّ و لێکۆڵینەوەکانی خۆی کەڵکی باشی لێ وەرگرتبوو.

لینین بۆ یەکەمین جار لە کاتی نیشتەجێبوونیدا لە لەندەن لەگەڵ ترۆتسکی ئاشنا بوو. هاوڕێکانی لینین پێشتر لە "ساراما"وه بۆیان نووسیبوو، کە یەکێك لە خەباتکاره گەنجەکان

لەو رۆژانەدا لە سیبریا بۆی دەرچووە و بەرەو ئەورووپا تێی تەقاندووە. هاورێکانی لینین زۆریان تاریفی ئەو کابرایە کردبوو و بە "گەنجە هەڵۆ" ناویان هێنابوو. ترۆتسکی بە نـاوی خـوازراوی "قەڵەم" هێندێ شتیشی بڵاو کردبوونەوە.

ترۆتسکی بەو ناوونیشانەی لە لینینی بیستبوون بۆ چاوپێکەوتنی چووە لەندەن و ئەو جووتە زۆر بە خێرایی هۆگری یەکتری بوون. ترۆتسکی دەیویست بە زووترین کات بگەڕێتەوە روسیا، بەڵام لینین پێداگر بوو لە سەر ئەوەی، کە ماوەیەك لە لەندەن بمێنێتەوە و بۆ کاری رۆژنامەی ئیکسرا یارمەتیی بدات. پۆلخانۆف کەیفی بە نووسینەکانی ترۆتسکی نەدەهات، بەڵام لە سەر پێداگریی لیـنین درێـژەی دا بە هاوکاریی ئیکسراو بوو بە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەو رۆژنامەیە.

لەو قۆناغـەدا یەکێك لـە ئامانجـە سـەرەکییەکانی لیـنین، کـە لـە وتارەکـانی ئیکسـرادا مەبەستی بوو پێك هێنانی گرووپێکی"شۆڕشگێڕی کارامە" بوو، کە تەواوی کاتی خۆیـان بـۆ شۆڕش تەرخان بکەن.

کتێبی بە ناوبانگی "دەبێ چ بکەین" ی لینین، کە لەو سەردەمەدا بڵاو بۆوە زیاتر ئـەو ئامانجـەی دەپێکا و داوای لە رۆشنبیرانی حیزبی دەکرد، کە کاتی خۆیان بۆ شۆڕش تـەرخان بکـەن. تیۆرییەکـەی لینین لە مەڕ پەروەردەی شۆڕشگێڕانی کارامە بۆ یەکەمین جار لەو کتێبەدا بە راشکاوی هاتە گـۆڕێ و لینین لە رێنوێنیکردنی کرێکاراندا بەرەو ئامانجەکانی شۆڕشڤانی و بە ئاکام گەیشتنی شـۆڕش بایـەخ و گرینگییەکی زۆری دا بە رۆشنبیرانی سۆسیالیست، کـە دەبوایـە بـە دڵـی وی کـادری شۆڕشـڤانی بـۆ پەروەردە بکەن. ناکۆکیی نێوان لینین و نزیکترین هاوکار و هاوبیرەکانی ئەو واتـە مـارتۆڤ و پۆترسـۆف هەر لەو کاتەوە دەستی پێکرد. هەڵبەت مارتۆڤ و پۆترسۆڤ پـاش ماوەیـەك مشـتومڕ بلێـی و نـەلێی ملیان بۆ بۆچوونەکانی وی رادەکێشا، بەڵام لینین وردە وردە لەو بەربەرەکانێیانـەی، کـە لـە بەرامبـەر بیروبۆچوونەکانیدا دەکران یا خۆی گوتەنی: لە کەللـەرەقی و دەمـارگرژیی شۆڕشـگێڕانەی هاورێکـانی خۆی زویر دەبوو. لەو نێوە دا لە سەر هێندێ لە وتارەکانی ئیکسرا ناکۆکی کەوتـە نێـوان پۆلخـانۆف و لینینەوە و پۆلخانۆف بە راشکاوی رەخنەی لە نووسینەکانی لینین گرت.

لەساڵی 1903دا ناتەبایی بە روونی لە وتارەکانی ئیکسرادا بەدی دەکرا. بابەتگـەلێك، کە پۆلخانۆف و سۆسیالدیموکراتـەکانی پێشـوو دەیاننووسـین لـە هەڵبـژاردنی وشـە و رسـتەدا وردبینتر بوون و نەرمی نواندن و کۆنسێرڤاتیزمی پێوە دیاربوو. لە حاڵێکدا وتارەکانی لیـنین و هاوبیرەکانی توند و وروروژێنەر بوون. لە راستیدا پۆلخانۆف و هاوبیرەکانی زیاتر روویان لە چینی بژاردە و رۆشنبیری کۆمەڵگە بوو و لایەنگری شۆڕشی لە سەر ەخۆ و وردە وردە بوون.

ناکۆیی رۆژنامەی ئیکسرا هەر هات و گەورە بۆوە و ناکۆکییە جیدییەکانی کۆنگرەی سۆسیال-دیمۆکراتەکانی روسیای لە ساڵی 1903دا لێکەوتەوە. لەو کۆنگرەیەدا، کە رۆژی 30ی ژووییەی 1903 لە بروکسێل بەڕێوە چوو و چەند رۆژ دواتر بە هۆی وریاییدانی پۆلیس بردیانە لەندەن دەراو بۆ دابەشبوونی حیزبی سۆسیالدیموکراتی روسیا بەسەر دوو باڵی بۆلشەڤیکی (زۆرینە) و مەنشەڤیکی(کەمینە) خۆش بوو. لەو کۆنگرەیەدا لینین و مارتۆڤ رووبەڕووی یەکتر بوونەوە و پاش تەواوبوونی کۆنگرە بە هۆی ئەوەی، کە لایەنگرانی مارتۆڤ لە دەستەی نووسەرانی ئیکسرادا زۆرینە بوون جڵەوی ئەو رۆژنامەیە بە کردەوە لە دەستی لینین هاتە دەرێ. ترۆتسکیش پاش تەواوبوونی کۆنگرە رەگەڵ دژبەرانی لینین کەوت و ساڵی 1905 گەڕایەوە روسیا. ترۆتسکی لە کاتی شۆڕشی 1905ی روسیادا رۆڵێکی باشی گێڕا، کە لە بەشی پێشوودا ئاماژەی پێکراوە.

لینین، کە نیگەرانی ئەوە بوو لە شۆڕشی 1905دا لە خەنیمەکانی دواکەوتووە لە نۆڤەمبەری 1905دا بە پەساپۆرتێکی بریتانی و بە ناوی(ڤیلیام_فێری) گەڕایەوە سەنپێترێزبۆرگ لەڵام هیچی بۆ نەچووە سەر و لە کۆتایی مانگی دیسێمبەردا، کە پۆلیسی تەزار شوێن پێیان هەڵگرتبوو و دەیانویست دەستبەسەری بکەن، بەرەو فەنلاند رای کرد. لینین لەوێوە چووە سوید و لەوێشەوە بەرەو لەندەن ملی پێوەنا بۆ ئەوەی جارێکی تر لەگەڵ خەنیمەکانی خۆی لە کۆنگرەی سۆسیالدیموکراتەکانی روسیادا بکەوێتە ململانێ. لەو کۆنگرەیەدا، کە لە ئاپریلی 1907دا لە لەندەن گیرا زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی نوێی حیزب لە نێو لایەنگرانی لینین هەڵبژێردران.

لەو کۆنگرەیەدا جگە لە رێبەرە کۆنەکانی حیزب کۆمەڵێك کەسایەتیی نوێش دەبینران، کە لە روسیاوە هاتبوون، کە لە نێوانیاندا دەتوانین ناوی زینۆڤیف و کامێنۆڤ و ژۆزێف جوگاشڤیلی، کە دواتر بە ستالین ناوی دەرکرد، بێنین. ستالین، کە ئەو کات ناوی خوازراوی "هاوڕێ کۆبا"ی لە سەر بوو پاش بەشداربوون لە کۆنگرەی لەندەندا گەڕایەوە روسیا و لە مانگی ژووئەنی ساڵی 1907دا رێبەرایەتیی گەورەترین دزیی چەکداریی مێژووی روسیای وەئەستۆ گرت. لەو دزییەدا 341000رۆبڵ لە کاتێکدا دەبردرا بۆ بانکی تفلیسی روسیا لە لایەن بۆلشەڤیکە چەکدارەکانەوە تاڵان کراو خەرجی چالاکییەکانی دواتری بۆلشەڤیکییەکان لە روسیا و دەرەوەی روسیادا لەوە دەدرا.

وێڕای سەرکەوتنی لینین لە کۆنگرەی ساڵی 1907ی لەندەندا بە هۆی سەقامگیریی رەوشی نێوخۆیی روسیا لە ساڵەکانی فەرمانڕەوایی ستۆلیپیندا بۆلشەڤیکەکانیش و هیچکام لە

گرووپە شۆڕشـڤانەکانی روسـیا لـە مـەودای نێـوان سـاڵەکانی 1907 هـەتا 1911دا سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان وەدەست نەهێنا و زۆربەی ئەندامـە چـالاکەکانیان لـەو ماوەیـەدا یـا گیرابوون یان لە تاراوگە دەژیان.

لینین پاش کۆنگرەی لەندەن ماوەیەك لە ژێنێڤ و دوو ساڵیش لە پاریس دەژیـاو بـە هـۆی پووچەڵبوونەوەی پلانەکانی بۆ وەڕێخستنی بزووتنەوەیـەکی شۆڕشـگێڕانە لـە روسـیادا تـەواو خەمۆك و هیوابڕاو ببوو. لەو ماوەیەدا لینین جارلەجار پتر لە خەنیمەکانی خۆی لە نێو حیزبـی سۆسیالدیموکراتی روسـیا دوورکەوتـەوە و دواجـار لـە ژانویـەی 1912دا بـە پێـك هێنـانی کۆنفرانسێك بۆ لایەنگرەکانی خۆی لە پراگ رێکخراوێکی سەربەخۆی دامەزراند و بە تەواوی لە حیزبی سۆسیال دیموکراتی روسیادابڕا. ئەو رێکخراوە نوییە، کە بـە حیزبـی بۆلشـەڤیك نـاوی دەرکرد کۆمیتەیەکی بەڕێوەبەریی بۆ چالاکیی شۆڕشگێڕانە لـە نێـو روسـیادا هەڵبـژارد و بـە قۆستنەوەی ئەو دەرفەتەی، کە پاش کوژرانی ستۆلیپینی سـەرۆك وەزیـری خـاوەن ئۆتوریتـەی رۆسیا رەخسابوو رێکخراوە نهێنییەکانی خۆی لە نێو روسیادا پەرە پێدا.

بۆلشەڤیکەکان بە کەڵك وەرگرتن لەو برە ئازادییەی، کە لەو کاتدا لـە روسـیا پێکهـاتبوو سـەرەتا دەسـتیان کـرد بـە دەرکردنـی رۆژنامـەی زڤێـزداzvezda یـا ئەسـتێرەیەك لـە سەنپێترێزبۆرگ و پاش داخرانی، رۆژنامەی پراڤیدا، یان حەقیقەتیان دەرکرد. لیـنین، کـە بـەو هەل و دەرفەتە لەبارانەی بۆ چالاکی لە نێو روسیادا رەخسابوو شاگەشکە ببوو شـوێنی ژیـانی خۆی لە پاریسەوە گواستەوە بۆ کراکۆڤ cracowی پۆلۆنیاو بۆ ئەوەی لە نـزیکترین شـوێنەوە چاوەدێری چالاکییە شۆڕشڤانییەکانی خۆی بـێ. زینـۆوێڤ و کـامێنۆڤ هـاوڕێ وەفادارەکـانی لینینیش لەوشارەدا خۆیان گەیاندە لای و لەو شارەوە بە نامەبەری تایبەتی وتارەکـانی خۆیـان بۆ رۆژنامەی پڕاڤیدا بەرێ دەکرد. شاری کراکۆڤ لەو کـاتدا لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئیمپراتـۆری نەمسادا بوو و دەوڵەتی نەمساش، کە لەگەڵ روسیای تەزار پێوەندییـەکی دۆسـتانەیان نـەبوو هەم لە پێوەندی لەگەڵ چوونی لینین و هاوڕێکانی بـۆ ئـەو شـارە و هـەمیش بـۆ دابینکردنـی پێداویستییەکانی نیشتەجێبوونیان دەورێکی کاریگەری گێڕا.

لیـنین لـەو قۆناغـە لـە چـالاکییەکانیدا شـێوازی خەباتیشـی گـۆڕی و فـەرمانی دا بـە بۆلشەڤیکەکانی نێو روسیا، کە لە هەڵبژاردنەکانی دۆمـای چـوارەمدا بەشـداری بکـەن. لـەو هەڵبژاردنەدا چوار نوێنەری بۆلشەڤیکەکان رێیان کەوتە دۆما و لە سەر پێشنیاری لینین لەگەڵ گرووپـی نوێنـەرانی سۆسـیال دیمـوکرات بەرەیـەکیان پێـك هێنـا. مالینۆفسـکی سـەرۆکی

فەراکسیۆنی پێنج کەسیی بۆلشەڤیکەکانی دۆما بە نوێنەرایەتیی سەرۆکی بەرەی هێزە چەپەکان هەڵبژێردرا، بەڵام ئەو بەرەیە زۆری نەخایاند و لە کۆتایی ساڵی 1913دا نوێنەرانی بۆلشەڤیکی لە سۆسیالدیموکراتەکان جوێ بوونەوە.

لە نێوەڕاستی ساڵی 1914دا ناکۆکی و ناتەبایی نێوان لینین و بۆلشەڤیکەکانی ژێر فەرمانی لە لایەك و مەنشەڤیکەکان و گرووپە چەپەکانی دیکە گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. ترۆتسکی لە نامەیەکدا لە ژێر ناوی "چخیدزری" ڕێبەری مەنشەڤیکەکانی دۆما لینینی بە پەتایەك بۆ روسیا ناوبرد و وێڕای بە کارهێنانی دەستەواژەی"لینینیزم" بۆ یەکەمجار ئەو زاراوەیەی بە هاوواتای درۆ و گزە و چەواشەی راستییەکان بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکان لە قەڵەمدا. پۆلخانۆفی مامۆستای لینینیش لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیی دەفتەری نێونەتەوەیی سۆسیالیستەکاندا، کە لە رۆژەکانی شازدەیەم و حەڤدەی ژووئیەی ساڵی 1914دا لە برۆکسێل گیرا بۆ یەکەم جار راستەوخۆ هێرشی کردە سەر لینین و گوتی یەکێتیی سۆسیالیستەکان و هێزە شۆڕشڤانەکانی رۆسیا بە بێ پەراوێز خستنی لینین یا دەستهەڵگرتنی دڵخوازانەی وی، تەنانەت بە شێوەی کاتییش بێ، مەحاڵە.

لەگەڵ دەستپێکی شەڕی یەکەمی جیهانی ناکۆکیی لینین و رێبەرەکانی دیکەی سۆسیالیستە روسییەکان خەستتر بۆوە. لە نێو روسیادا رێبەرانی سۆسیالیستەکان و گرووپە چەپەکان بێجگە لە بۆلشەڤیکەکان دەنگی خۆیان خستبووە پاڵ دەنگی لیبراڵەکان و لە هەلومەجی سەردەمی شەڕدا دەستیان لە دژایەتی و خەباتی توند و تیژانە لەگەڵ رژێم هەڵگرتبوو و لە دەرەوەی روسیاش رێبەرانی ناسراوی سۆسیالیستەکان وەکو پۆلخانۆف لە بەرامبەر ئەڵماندا لایەنگرییان لە روسیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی دیکە دەکرد. پۆلخانۆف لە سەر ئەو باوەڕە بوو، کە ئەگەر ئەڵمانییەکان لەو شەڕەدا بە ئاواتی دڵیان بگەن و وڵاتانی بەستێنیی روسیا داگیر بکەن زیانێکی قورس وە پیشەسازیی روو لە گەشەی ر وشیا دەکەوی و کرێکارانی روسیا تووشی بێکاری و هەژاری دەبن. پۆلخانۆف پێی وابوو سەرکەوتنی ئەڵمانیا لەو شەڕەدا نابێتە هۆی رووخانی تەزار بەڵکو بە راوەستانی پێشکەوتنی پیشەیی وڵات و بە هێزبوونەوەی فیۆداڵ و خاوەن زەویەکان، رژێمی تەزاری لەو قەیرانە دەرباز دەبێ، کە تێیدا گیری خواردوە و سەرکەوتنی سۆسیالیزم لە روسیادا دەیان ساڵ وەدوا دەکەوێ.

پۆلخانۆف و لینین لە کۆبوونەوەیەکی وتاربێژیدا، کە لە سەرەتای شەڕدا لە لۆزانی سویسرا پێك هاتبوو لە رووی یەکتردا راوەستان. وتاربێژی سەرەکیی ئەو کۆبوونەوەیە پۆلخانۆف بوو، کە لە

قسەکانیدا بەرگریی لە تیۆرییەکەی لەمەڕ شەر و پێویستیی پشتیوانیکردن لە روسیا و هاوپەیمانانی کرد. لینین، کە لەو کۆبوونەوەیەدا بوو بەو بیانووە، کە دەیەوێ لە پێوەندی لەگەڵ قسەکانی پۆلخانۆفدا باس لە هێندێ شت بکا چووە پشت تریبوون و وێڕای بەرپەرچدانەوەی بۆچوونەکانی مامۆستاو رێپێشاندەری پێشووی خۆی گوتی ئەو شەڕەی دەستی پێکردووە، شتێکی بە رێکەوت و هەروەها ئاکامی زێدەخوازیی چەند ئیمپراتۆر و فەرمانڕەوایەك نییە بەڵکو ئاکامی سروشتیی گەشەی کۆمەڵگەی بۆرژۆوازییە و دەبێ بۆ وەڕێخستنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان ئەو دەرفەتە زێڕینە بقۆزینەوە. لینین ئەوەشی لێ زیاد کرد، کە ناسیۆنالیزم و سۆڤینیزم و هەژاندنی هەستی نیشتیمانپەروەریی جەماوەر دەبێتە هۆی چەواشەبوونی پرۆلتاریا لە رێبازی راستەقینەی خۆی و دەرفەتێکی بێوێنە بۆ شۆڕشێکی سۆسیالیستی لە دەست ئێمە دەردێنێ. دەبێ ئەو شەڕە بکەینە دژبەرییەکی چینایەتی و ململانێی نێوان پرۆلتاریاو چینە باڵادەستەکاندا.

لینین هەر بەوەندە رانەوەستا، کە لەدەرەوەی وڵات دژی دەوڵەتی روسیا خەبات بکاو داوای لە لایەنگرەکانی خۆی لە نێو خۆی وڵاتیش کرد، کە لە جەنگەی شەڕدا خەباتی خۆیان دژی رژێم توندوتۆڵتر بکەن. لە سەرەتاکانی ساڵی 1915دا لینین پەیامی دا بە کامێنۆڤ، کە لەو کاتدا رێبەریی بۆلشەڤیکییەکانی لەئەستۆ بوو، کە فەرمان بدا بە نوێنەرانی بۆلشەڤیکیی نێو دۆما راشکاوانە لە پشت تریبوونەکانی دۆماوە هێرش بکەنە سەر دەوڵەت و پێداگر بن لە سەر ئەوەی، کە چینی کرێکاری روسیا خوازیاری تێکشکانی ئەو رژێمەیە لە شەڕدا.

دەربڕینی وەها باسێك لە پشت تریبوونەکانی دۆماوە واتە پشتیوانیی راشکاوانە لە دوژمن کارێکی سووك و سانا نەبوو، هەر بۆیەش کامێنۆڤ داوای لە نوێنەرانی بۆلشەڤیکی دۆما کرد بە مەبەستی پێڕاگەیاندنی بڕیارەکانی لینین و پەسندکردنی بەرنووسی راگەیەندراوە ئامادەکراوەکە، کۆبوونەوەیەکی نهێنی پێك بێنن. پۆلیس، کە بە هۆی سیخوڕەکانی خۆی لە نێو رێکخراوی حیزبی بۆلشوڤیكدا ئاگاداری مەسەلەکە بوو هێشتا چەند ساتێك لە کۆبوونەوەکە تێنپەڕی، کە هەڵیکوتایە سەریان و تەواوی بەشدارانی کۆبوونەوە و خۆی کامێنۆڤ و نوێنەرانی دۆماشی دەسبەسەر کرد. تاوانی گیراوان بە پێی ئەو بەڵگانەی لێیان ئاشکرابوو خەیانەت بوو بە وڵات و هاوکاریی دوژمن لە کاتی شەڕدا و، تەواوی دەستبەسەرکراوەکان بۆ سیبریا دوور خرانەوە.

سەرەڕۆیی لینین لە سەردەمی شەڕداوردە وردە بووە هۆی پەراوێزکەوتنەوەی سیاسیی ئەو. لە کۆتاییەکانی ساڵی 1916داواتە نزیك بە ساڵێك بەر لەو شۆڕشەی ئەوی بە دەسەڵات گەیاند لینین لە

هەمیشە هیوابڕاوتر و دوورەپەرێزتر بوو. لـە کۆڕوکۆبوونـەوەی سۆسیالیسـتەکانی جیهانـدا زیـاتر بـە پیلانگێڕێکی گێچەڵخولقێنیان دەناسی و هێندێ کەس بە کابرایـەکی شـێواوی خـەیاڵاتییان دەزانـی. لینین لەو کاتەدا زۆریشی ئاگا لە نێوخۆی روسیا نەبوو زۆربەی دەسـت وپێوەنـد و لایـەنگرەکانی ئـەو، یان لە بەندیخانەدا بوون یان بۆ سیبریا دوورخراتوونەوە و ئەوانـەش، کـە هێشـتا نـەگیرابوون بـە هـۆی فشاری بە تەوژمی پۆلیسی تەزاری و گرفتی ئابوورییەوە هیچیان لە دەست نەدەهات.

# 3

خێرایی ئەو ئاڵوگۆڕانەی، کە لە ماوەی سێ مانگی سەرەتای ساڵی 1917دا لـە روسـیا هاتنە ئاراوە و دەست لە پادشایەتی هەڵگرتنی تەزار نیکۆلای دووەم ی لێکەوتـەوە بـۆ لیـنین کتوپڕ بوون و تووشی سەرسووڕمانیان کرد. بۆلشـەڤیکەکان رۆلێکـی ئـەوتۆیان لـەو رووداو و بزووتنەوە شۆڕشگێڕییانەدا نەبوو، کە لە سـەرەتای مـانگی مارسـی 1917دا بـە لوتکـەی خۆیان گەیشتن و هەربۆیەش لە پێکهاتەی ئەو حکوومەتەدا، کە جێگەی رژێمی تەزاری گرتەوە هیچ پشکێکیان پێ نەبڕا، بەڵام لینین کەسێك نەبوو، کە هەروا مەیدان بۆ خەنیمـەکانی خـۆی چۆڵ بکات و واز لەو دەرفەتە زێڕینە بێنێ، کە بە هەرەسهێنانی رژێمی تەزار رەخسابوو.

یەکێك لە یەکەمین دەستکەوتەکانی ئەو شۆڕشەی، کە لە رۆژی پازدەی مارسـی1917دا دەست لە پادشایەتی هەڵگرتنی تەزار نیکۆلای دووەم و هەرەسی رژێمی پادشایەتیی لێکەوتەوە ئازادیی بەندییە سیاسییەکان و دوورخراوە سیاسییەکان بوو. لە کۆتاییەکانی مـانگی مارسـدا یەکەمین دەستەی بەندییە سیاسییەکان و بۆلشەڤیکییە دوورخراوەکان، کە کامێنۆڤ و ستالین و مورانۆف و سڤێردلۆفیشیان لەگەڵ بوون گەڕانەوە پێترۆگراد، بەڵام بەر لە گەیشتنەوەی ئـەوان دوو کەس لە سەر کردەکانی دیکەی بۆلشەڤیکەکان واتە مۆلۆتۆڤ شلیاپنکۆڤ دەستیان کردبـوو بە بڵاوکردنەوەی دووبارەی پراڤیدا و بە پێچەوانەی رۆژنامەکانیتر شێوازێکی رەخنەگرانەیان لە بەرامبـەر حکوومـەتی کاتیـدا گرتبـووە پـێش. سـەرکردە دوورخراوەکـانی بۆلشـەڤیك، کـە گەڕابوونەوە پێترۆگراد پشتگیریی ئەو میتۆدەیـان نـەکرد و لـە یەکـەمین ژمـارەی رۆژنامـەی پراڤیدا، دا، کە رۆژی بیست و هەشـتەمی مـارس لـە ژێـر چـاوەدێریی کـامێنۆڤ و سـتالین و

مۆرانۆفدا دەرچوو رۆژنامە هەڵوێستێکی نەرم ونیانتری بە نیسبەت دەوڵەتی کـاتی و حیزبـە سۆسیالیستەکانی دیکە گرتەبەر.

بەڵام هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی ستالین و کامێنۆڤ تـەواو دژی هەڵوێسـتی لیـنین بـوو لـە بەرامبەر دەوڵەتی کاتیدا. لە یەکەمین وتاری لینیندا، کە لە زووریخەوە گەیشتەوە پێترۆگـراد و لە ژمارەی سێی ئاپریلی پراڤیدا، دا بڵاو بۆوە لینین لێبڕاوانـە لـە بەرامبـەر دەوڵـەتی کاتیـدا هەڵوێستی گرت و(ئەو) بنەمای ئەو ئاڵوگۆڕەی بووە هۆی دەسـت لـە پادشـایەتی هـەڵگرتنی تەزار و هاتنەسەرکاری دەوڵەتی کاتی بـە پیلانێکـی ئیمپریالیسـتیی لـە لایـەن بـەریتانیا و فەرەنسـاوە لەقەڵـەم دا، بـە مەبەسـتی چەواشـەکردنی رەوگـەی شـۆڕش و بـەردەوامبوونی سیاسەتەکانی پێشووی دەسەڵاتی تەزار بە هۆی فـەرمانڕەوا نوییـەکانی روسـیاوە. لیـنین لـەو وتارەدا دەوڵەتی کاتیی بەوە تاوانبار کرد، کـە لـە پێنـاو بـەرێوەبردنی نەخشـە و پلانـەکانی بەریتانیا و فەرەنسادا گەرەکیانە سوپای تێکشکاوی تەزار سـەر لـە نـوێ رێـکبخەنـەوە و بـە ملیۆنان کرێکاروەرزێری روسییتر لەو شەڕە ئیمپریالیستییەدا بە کوشت بدەن.

لە کاتەدا بیروبۆچوونەکانی ترۆتسکییش تەواو لـە بـیر و ڕای لیـنین نزیـك بـوون و هاوکات لەگەڵ بڵاوبوونەوەی پراڤیدا، ترۆتسکییش لە رۆژنامەیەكدا بە نـاوی "نـۆڤی-میر"، کە لە نیۆیۆرك دەریدەکرد نووسـیی: گۆچـکوفەکان و میلیکۆفەکان(ئەنـدامانی دەوڵەتی کاتی ) بە خەڵکی روسیا دەڵێن جا ئێستا، کە حکوومەتی تەزاری رووخاوە لە بەرەکانی شەڕدا، خۆتـان لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدیی روسـیادا بەکوشـت بـدەن.، بـەڵام بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی روسیا هیچ پێوەندییەکیان بـەو شـەڕە ئیمپریالیسـتییەوە نییـــە. دەوڵـــەتی کـــاتیییش وەکـــو حکوومـــەتی تـــەزاری لـــە پێنـــاوی ئامانجـــە ئیمپریالیســـتییەکاندا هـــەوڵ دەداو بـــە هـــەوای داگیرکردنـــی پۆلۆنیـــا و مالیســـیا و قوستەنتەنییە و ئەرمەنستان و ئێرانی تێناوە و بە درێژەدانی شەڕ پێ بـەپێی ئامانجـە ئیمپریالیستییەکانی بەریتانیا و فەرەنسا دەچێتە پێشێ.

لینین لە وتارێکی دیکەدا، کە لە رێگەی وڵاتی بێ لایەنی سویدەوە بـۆ ماریـای خوشـکی ناردییـــەوە پێترۆگـــراد، هـــەر لـــەو شـــێوە قســـانەی ترۆتســـکیی کـــردن و ئـــەو وێکچـــوویییە سەیروسەمەرەیەی بیر و را و بۆچـوونەی ئـەوان بـە بـێ ئـەوەی، کـە ئاگایـان لـە نێـوەرۆکی نووسینەکانی یەکتر بێ لە قۆناغەکانی دواییدا بوو بە هۆی هاریکاریی چڕ وپـڕی ئـەو جووتـە پێکەوە. لەو وتارەدا، کە ئاماژەی پێکرا لیـنین وێـڕای هێـرش بـۆ سـەر سیاسـەتی جـەنگیی

دەوڵەتی کاتی داوای لە پرۆلتاریای روسیا کرد، کە هێزێکی میلیشیای 750000 کەسیی پێك بێنن و دژی باگۆچکۆفەکان و میلیکۆفەکان و مڵکداران و سەرمایەدارەکان راپەڕن...

لینین وێڕای ئەو هەمووە هەوڵەی، کە بۆ گەڕانەوە بۆ روسیا دەیدا هەتا چەند حەوتووش پاش سەرکەوتنی شۆڕش هەر لە زووریخ مایەوە و نەیتوانی خۆی بگەیەنێتەوە پێترۆگراد. دەوڵەتی کاتی هیچ دژایەتیی لەگەڵ گەڕانەوەی ئەو دوژمنە سوێندخواردوەی خۆی نەکرد بەڵکو بەریتانیاو فەڕەنسا نەیاندەویست ویزای سەفەر و ئیزن بدەن بە لینین، کە بەو وڵاتانەدا تێپەڕێ، کە لە بەردەستی ئەواندا بوون.

جگە لە لینین چەند کەس لە سەر کردەکانی سۆسیالیستەکانی روسیاش، کە زیاتر سەر بە بۆلشەڤیکەکان بوون لە سویسرا مابوونەوە و رێگەی گەڕانەوەیان بۆ روسیا نەبوو. نزیکترین رێکەی گەڕانەوەیان بۆ روسیا ئەو بەشانە لە خاکی داگیرکراوی ئەڵمانیا بوو، کە بە هۆی شەڕی نێوان ئەڵمان و روسیا، رابردن بەوێدا مەحاڵ بوو. مارتۆف، کە یەکێك بوو لە مەنشەڤیکە دوورخراوەکانی نیشتەجێی سویسرا پێشنیاری کرد، کە ئەڵمانیا لە بریدانی ئیزن بە گەڕانەوەی شۆڕشڤانە دوورخراوەکانی روسیا بە وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا پوانێك لە حکوومەتی نوێی روسیا وەرگرێ . ئەو پوانەی مارتۆف باسی کرد ئازادکرانی دیلە شەڕییەکانی ئەڵمانیا لە روسیا بوو و یەکێك لە سەر کردەکانی سۆسیالدیموکراتی سویسراش بە ناوی "رۆبێرتگریم " ئاماژە بوو بەو مەبەستە لەگەڵ لایەنی ئەڵمانی دانوستان بکا، بەڵام رێبەرانی دیکەی مەنشەڤیك دژایەتیی هەرچەشنە دانوستانێکیان کرد پێش ئەوەی رەزامەندیی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازانی لە سەر وەرگیرابێ.

لینین، کە دەیویست بەهەر جۆرێك بێ بگەڕێتەوە بۆ پێترۆگراد لەگەڵ رۆبێرتگریم کەوتە دانوستان و گوتی ئەوو باقی رێبەرانی بۆلشەڤیك ئامادەن لە پێناو ئیزنی تێپەڕین بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیاداویستەکانی ئەڵمانییەکان دابین بکەن و چاوەڕێی رەزامەندیی ئەنجوومەنی پێترۆگراد نابن، بەڵام بەو مەرجانەوە تەنیا دە کەس ئامادە بوون، کە بە یارمەتیی ئەڵمانییەکان بگەڕێنەوە روسیا.

رۆبێرتگریم لەوەها هەلومەرجێكدا ئامادە نەبوو دانوستان بکات و لینین یەکێکی دیکە لە سۆسیالیستەکانی ئەنتەرناسیۆنالیستەی سویسرا، بە ناوی فریزقلاتتێن ی قایل کرد، کە ئیزنی گەڕانەوەی ئەوان بۆ روسیا لە بەرپرسانی ئەڵمانیا وەرگرێ . پلاتتێن لەگەڵ باڵوێزی ئەڵمانیا لە سویسرا کەوتە دانوستان و دواجار رەزامەندیی ئەوانی وەرگرت، کە رەوەندە روسییەکان بەوێدا

بگەڕێنەوە. بە پێی ئەو شتەی دواتر مێژوونووسانی بۆلشەڤیکی نووسییان مەرجەکانی ئەڵمانییەکان بۆ ئیزنی سەفەری ئەوان زۆر سادەو سووك بوون و بەبێ گرینگیدان بە شێوازی ئەوان لە پرسی جەنگدا ئیزنیان پێ دابوون بە ناوچەکانی بندەستی ئەڵمانیادا بپەڕنەوە، لە حاڵێکدا ژەنەراڵ هۆفمانی سەرۆکی بنکەی سوپای ئەڵمانیا لە بەرەی خۆرئاوادا، دواتر نهێنییەکانی ئەو رووداوەی ئاشکرا کردن و گوتی:

"ئامانجی ئێمە لە ئیزندانی ئەو تاقمە بۆ تێپەڕین بە ناوچە داگیرکراوەکانی ژێر دەسەڵاتماندا ئەوە بوو، کە ئاگری ناکۆکییە نێوخۆییەکانی روسیا بڵێسەدارتر بکەین و ورەی روسییەکان لە بەرەی شەڕدا، دابەزێنین. لە رێگەی ئەو نێوبژیوانە جۆراوجۆرانەوە، کە لەگەڵ ئەو کۆچەرییانەدا پێوەندییان هەبوو دلنیا کراینەوە، کە ئەوان لەگەڵ گەیشتنەوەیان بۆ روسیا دژی درێژەدانی شەڕ دەبن."

جگە لە پلاتێن ئەو نێوبژیوانانەی، کە لەو ساتوسەودایەدا بەشدار بوون بریتی بوون لە پارڤوس parvus رێبەری سۆسیالیستدیموکراتەکانی پێشووی ئەڵمان، کە هاوکاریی دەوڵەتی ئەڵمانی دەکرد و پاول‌لێڤی سۆسیالیستی دژە شەڕی ئەڵمانی، کە لە دوایین قۆناغدا بوو بە نێوبژیوانی نێوان لینین و باڵوێزی ئەڵمانیا لە سویسرا. وردەکارییەکانی ئاد و بەڵێنی نێوان لینین و باڵوێزی ئەڵمانیا هەرگیز ئاشکرا نەبوون، بەڵام لەقاودانی ئەو هەواڵە، کە لینین بە بێ وەرگرتنی رەزامەندیی دەوڵەتی کاتیی روسیا و ئەنجوومەنی پێترۆگراد لەگەڵ ئەڵمانییەکان رێککەوتووە دڕدۆنگی و بەدگومانییەکی توندی خستە نێو ئەو روسییانەی نیشتەجێی سویسراو فەڕەنسا بوون.

ئەو رۆژەی، کە لینین و هاورێکانی لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە وەڕێدەکەوتن خەڵکێکی زۆر بۆ بەرێکردنیان کۆببوونەوە و دروشمی شۆڕشگێڕانەیان دەدا و سروودی ئەنتەرناسیۆنالیان دەچڕی. ژمارەیەکی کەمیش لە گۆشەیەکی دیکەی وێستگەوە کۆزیلکەیان بەستبوو و دروشمیان دەدا و دەیانگوت:" سیخوڕینە... سیخوڕەکانی ئەڵمانیا... قەیسەر لەبەرچی خەرجی سەفەری ئێوەی دابین کردووە؟.."

سەبارەت بە چۆنێتی پێوەندیی نێوان لینین لەگەڵ ئەڵمانییەکان لەو رێکەوتەدا ئالیکساندرسولژنیتسین نووسەری ناوداری روسی، کە پاش دوورخرانەوەی لە روسیا لە ساڵی 1974دا ماوەیەك لە زوریخ ژیا و، کۆمەڵێك بەڵگە و دیکۆمێنتی سەرنجڕاکێشی وەدەست کەوتن و ساڵی 1975 زانیارییەکانی خۆی لە مەڕ ئەو رووداوە وە لە کتێبێکدا بە ناوی "لینین لە زوریخ" بڵاو کردەوە. نووسەرێکی کۆمۆنیستی فەڕەنسی گومانی خستە سەر راستی و دروستیی ئەو بەڵگانە و سولێژنیتسین لە وتارێکدا، کە لە وەڵامی ئەو نووسەرەدا لە ژمارەی

ئاپریلی 1980دا لە گۆڤاری فەرەنسیی"مێژوو"دا بڵاوی کردەوە گەلێك وردەکاریی زیاتری لە سەر پێوەندیی لینین و ئەڵمانییەکان لە سەردەمی یەکەمی شەڕی جیهانیدا بڵاو کردەوە. بە پێی نووسراوەکەی سولێژنیتسین ئەڵمانییەکان بۆ هەڵاییساندنی کێشە و ناتەباییەکانی نێو بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانی روسیا پارەیەکی زۆریان بە لینیندا بوو و لینینیش بەو پارەیە توانیی لە ماوەیەکی کەمدا پشتی دوڵەتی کاتی بشکێنی و بوار بۆ سەرکەوتنی شۆڕشێکی بۆلشەڤیکی روسیا بڕەخسێنێ. یەکێك لەو بەڵگانەی، کە سولێژنیتسین لە کتێبی"لینین لە زوریخ" پشتی پێ بەستووە بە نامەی وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیایە لە مەڕ دابینکردنی گوژمەی بڵاوکردنەوەی پراڤیدا و بڵاڤۆکەپڕوپاگەندەکانی دیکەی بۆلشەڤیکەکان لە 1917دا. لە وتارەکەی سولێژنیتسیندا، کە لە گۆڤاری مێژووی فەرەنسادا بڵاو بۆوە بەڵگەیەکی دیکەش خراوەتە روو، کە باس لەوە دەکا، کە رۆژانە پێنج هەتا دە رۆبڵ دراوە بەو کەسانەی، کە لە ماوەی مانگەکانی ئاپریل هەتا نۆڤەمبەری1917دا بەشداریی خۆپێشاندانەکانی بۆلشەڤیکەکانیان دەکرد. سولێژنیتسین پێی وایە، کە تەنیا پارە و زێڕی ئەڵمانییەکان دەیتوانی وەڵامدەری خەرجی چەند ملیۆنیی پراڤیدا و ئەوو کاغەز و بڵاڤۆکانە بێ، کە بۆلشەڤیکەکان بۆ بانگەشە و پڕوپاگەندەو وەڕێخستنی خۆپێشاندانی رۆژانەیان لە مانگی ئاپریلەوە هەتا نۆڤەمبەری 1917 بێ.

لینین لە دوایین ئاخافتنی خۆی لە کۆڕی بۆلشەڤیکەکاندا پاش گەڕانەوەی بۆ روسیا راشکاوانە و لێبڕاوانە دەوڵەتی وەك رێچکەیەکی چەواشەکارانە و فاکتەرێکی بۆرژۆوازی ناوبرد و پشتی تێکرد و هێرشی کردە سەر زۆرینەی ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان، کە بۆلشەڤیك نەبوون. لینین لە پەردەدا هێندێ لە ئەندامانی ئەو ئەنجوومەنەی بە "ئۆپۆرتۆنیستگەلێك، کە قسەی فریودەرانە دەکەن، بەڵام لە راستیدا خەیانەت بە ئارمانجی سۆسیالیزم و چینی کرێکار دەکەن" ناو برد و هاوکاریکردن لەگەڵ ئەوانی بە مەحاڵ زانی.

قسەکانی لینین لە یەکەمین رۆژی گەڕانەوەیدا بۆ روسیا و ئەو شێوازە دوژمنکارانەیەی، کە لە بەرامبەر دەوڵەتی کاتی و نوێنەرانی کرێکاران و سەربازاندا گرتبوویە پێش شەپۆلی نارەزایەتییەکی توندی لە نێو سەربازان و مەلەوانان و کرێکاران و خوێندکاراندا وەڕێخست. رۆژی حەڤدەی ئاپریل مەلەوانانی پاپۆڕی دووەم ی بالتیك بڕیارنامەیەکیان دەرکرد، کە تێیدا هاوکاریی لینین لەگەڵ ئەڵمانییەکانیان ئیدانە کرد. لە هێندێ نارەزایەتیی کرێکاری و خوێندکاریی و سەربازییەکاندا داوا لە دە وڵەتی کاتی کرا، کە لێکۆڵینەوە لە سەر شێوەی

گەڕانەوەی لینین بۆ روسیا و هاوکاریی ئەڵمانییەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەو سەفەرە بکات و تەنانەت لە بنکەی سەربازیی ولینسکی باسی دەستبەسەرکرانی لینین بە تاوانی خەیانەتیش هاتە گۆڕێ. دەستەیەك لە سەرباز و مەلەوانە بریندارەکانیش بە درووشمگەلێکی، کە لە سەریان نووسرابوو: "دەبێ لینین و هاوڕێکانی بگەڕێنەوە ئەڵمانیا" دەستیان کرد بە خۆپێشاندان.

رەوشی سیاسیی روسیا لە کاتی گەڕانەوەی لینیندا زۆر ئاڵۆز و قەیراناوی بوو. رووخانی کتوپڕی رژێمی پادشایەتی راچڵەکانێکی دەروونیی لە روسیادا پێك هێنابوو و خەڵکی ور و کاس کردبوو. ئەو ئازادییە بێ سنوورەی، کە خەڵك کتوپڕ وەدەستیان هێنابوو بە تەواوی ئیشەکانی لە کارخستبوو و یەکسەرە ئۆرگانیزم و تەکووزیی کاروباری وڵاتی لێکترازاندبوو.

کاری کارخانەکان راوەستابوون و سەربازان خۆیان لە شەڕ بواردبوو. پرەنسیپی فەرمانبردن و بە گوێی بەرپرسی باڵاکردن لە هەموو شوێنێك واتای خۆی لەدەست دابوو و سەربازان و کرێکاران و فەرمانبەران بە پێك هێنانی ئەنجوومەن و کۆمیتەکان لە سەر بازخانە و کارخانەکاندا جڵەوی کاروبارەکانیان بەدەستەوە گرتبوو و ئەفسەر و بەڕێوەبەرەکانی پێشووی خۆیان دەگرتن و دەیانکوشتن. لە بەرەکانیشدا کاتی سەربازان زیاتر بە پێك هێنانی کۆڕوکۆبوونەوە و بیستنی وتار و درووشمدان تێدەپەڕی و رۆژبەرۆژ ژمارەیەکی پتر رایان دەکرد.

لەو نێوەدا چەتەیی و تاڵان و بڕۆ و جەنایەت و هەرچی کاری دژ بە یاسایە لە شارەکاندا بە شێوەیەکی سامناك پەرەی گرتبوو و لە گوندەکانیشدا وەرزێرەکان دەستیان کردبوو بە داگیرکردنی مڵك و ماڵی ئاغاوەت و دەرەبەگان و ئاغاوەت و دەرەبەگیان راونابوون. دەوڵەتی کاتی نەك هەر لە ئاستی وڵاتدا بەڵکو لە پایتەختیش بە تەواوی بەسەر رەوشەکەدا زاڵ نەبوو.

بۆ سبەینێکەی، کە لینین گەڕایەوە پێترۆگراد حیزبە سۆسیالیستەکان لە کۆشکی تۆرید کۆنفرانسێکی گشتییان پێك هێنا. ئامانجی ئەو کۆنفرانسە پێك هێنانی یەکێتییەك بوو لە نێوان حیزبە سۆسیالیستەکان و هەموو هێزە شۆڕشگێڕەکانی دیکەدا بەمەبەستی سەقامگیری و رێکوپێككردنی باری نالەبار و شێواوی وڵات. ئاخافتنەکانی تەواوی رێبەرانی گرووپگەلی بەشداربووی ئەو کۆنفرانسە لە ئاقاری وەدیهاتنی ئەو ئامانجەدا بوون جگە لە لینین، کە پاش بیستنی قسەی هەمووان دەستی بە قسان کرد و بە رەخنەی توند لە گرووپەکانی دیکە و هێرشی توند بۆ سەر رێبەرەکانیان هێوای هەرچەشنە پێکەوە سازان و یەکگرتوویییەکی لە بار برد.

لینین بۆ ئەوەی، کە بەتەواوی حیزبەکان لە رابردوویان دابڕێ بڕیاری دا ناوی حیزبی بۆلشەڤیك، کە لەراستیدا بە مانای زۆرینەی حیزبی سۆسیال دیموکراتی روسیا بوو بکاتە حیزبی

کۆمۆنیستی روسیا. لینین بۆ پاساوی ئەو بڕیارەی گوتی:" زۆرینەی ڕێبەرانی سۆسیال-دیموکراتەکان و ڕۆژنامەکانی سۆسیالدیموکراتەکان و نوێنەرانی سۆسیالدیموکرات لە پارلەمانەکانی ئەورووپادا خەیانەتیان بە ڕێبازی سۆسیالیزم کردووە و خزیونەتە قالبی بەرژەوەندیی بۆرژۆوازیی خۆیانەوە. ئێمە ئیتر دەبێ ڕێگەی خۆمان لە ڕێگەی ئەوان جیا کەینەوە و بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕە ئیمپریالیستییەکان و سەقامگیرکردنی ئاشتییەکی راستەقینە لە ڕێگەی شۆڕشێکی کرێکاریی جیهانییەوە هەوڵ و تێکۆشانێکی نوێ دەست پێبەکەین." دۆکترینە نوێیەکەی لینن لە راستیدا شۆڕشی روسیاشی وەکو شۆڕشێکی بۆرژۆوازی خستە ژێر پرسیارەوە و کاملکردنی ئەو شۆڕشەی لە ڕێگەی شۆڕشێکی سۆسیالیستییەوە بە پێویست دەزانی.

لە ڕۆژی چل و حەتەمەوە هەتا دوازدەی مای 1917 ڕێبەارن و چالاکانی بۆلشەڤیك لە سەرانسەری روسیادا کۆنفرانسێکیان پێك هێنا، بۆ ئەوەی ڕێبازی نوێی حیزب لە پاش شۆڕش تاوتوێ بکەنەوە و بەرنامە و پلانی داهاتوویان دیاری بکەن.

لەو کۆنفرانسەدا هێندێ لە ڕێبەرانی ناسراوی بۆلشەڤیکەکان وەکو کامێنۆڤ و کالینین رەخنەیان لەدژایەتی و دوژمنایەتیی حیزب بە نیسبەت مەنشەڤیکەکان و گرووپە چەپەکانی دیکە گرت و خوازیاری ئەوە بوون، کە لە پێناو بەرەو پێش بردنی ئامانجەکانی شۆڕشدا تەواوی هێزەکان یەك بگرن. ستالین، کە پێش گەڕانەوەی لینین لایەنگری تۆخی یەکگرتن لەگەڵ هێزە چەپەکانی دیکە بوو وتەنانەت لایەنگری هاوکاری لەگەڵ دەوڵەتی کاتییش بوو لەو کۆنفرانسەدا هیچ متەقی لێوە نەهات، وێدەچوو ئەو راستییەی بۆ دەرکەوتبێ، کە بەربەرەکانێ لەگەڵ لینین بێهوودەیە یان ئەویکە بۆ پاراستنی جێگە وپێگەی خۆی وای بە باش زانی دژایەتیی لینین نەکات.

هەروەکی ستالین پێشبینیی کردبوو کۆنفرانسەکە بە زاڵبوونی بە تەواو مانای لینین بەسەر حیزبدا و جێگرتنی بۆچوونەکانی ئەو کۆتایی هات. بیر وبۆچوونەکانە لایەنگرانی میانەڕەوی و یەکگرتوویی لەگەڵ هێزە چەپەکان بایەخی پێنەدراو لە بڕیارنامەی کۆنفرانسدا بۆلشەڤیکەکان هەرچەشنە هاوکارییەکیان لەگەڵ دەوڵەتی کاتییش رەت کردەوە و بە دەوڵەتی" ئاغاوەت و دەوڵەمەندان ناویان برد". پاش تەواوبوونی کۆنفرانسەکە چەند کەسێك لە بۆلشەڤیکە کۆنەکان حیزبیان بەجێهێشت و بەڵام کامێنۆڤ وێڕای رەخنەی راشکاوانە لە سیاسەتەکانی لینین لە کۆنفرانسی حیزبدا مایەوە و خۆی دایە دەست لینین.

بۆلشەڤیکەکان پاش ئەو کۆنفرانسە لە سەرانسەری روسیادا دەستیان کرد بە چالاکیی بەربلاو. ئامانجی سەرەکیش لەو چالاکییە نوێیانە ئەوە بوو، کە تەشەنە بکەنە نێو رێکخراوە کرێکارییەکان و ریزەکانی سوپاوە و لینین خۆی ئەو چالاکییانەی هەڵدەسووڕاند. دوا ئامانجی ئەو چالاکیانە بەدەستەوە گرتنی ئەنجوومەنی کرێکاران و سەربازان بوو. لەگەڵ ئەوەدا لینین دروشمێکی نوێی خستە سەر زار و زمانان و ئەویش ئەوەی کە:"دەبێ تەواوی هێز و دەسەڵاتەکان لە ئەنجوومەندا کۆ بکرێنەوە". در وشمی تەواوی دەسەڵاتەکان بۆ ئەنجوومەنەکان، کە دواتر بوو بە بنەمای گۆڕینی ناوی روسیا بۆ وڵاتی ئەنجوومەنەکان یا یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ ئەوە هاتە گۆڕێ، کە دەسەڵاتی حکوومەت لەدەستی دەوڵەت بێتە دەرێ و دیکتاتۆریی پرۆلتاریا لە رێگەی ئەنجوومەن(ئەنجوومەنەکان)ە و وەدی بێت.

هەڵەی وەزیری دەرەوەی دەوڵەتی کاتیی "میلیکۆف" و ناردنی یادداشتێك بۆ دەوڵەتە دەرەکییەکان لە لایەن ئەوەوە، کە لەگەڵ بۆچوونی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان دژایەتیی هەبوو یارمەتیدەری پلانەکانی لینین بوو، بۆ لاوازکردنی دەوڵەت. میلیکۆف لە یاداشتەکەیدا بۆ دەوڵەتە دەرەکییەکان جەختی لە سەر یەکێتیی روسیا و وڵاتانی هاوپەیمان و درێژەدانی شەڕ هەتا سەرکەوتن بەسەر ئەڵمانیادا کردبۆوە. ناردنی ئەو یادداشتە، کە لەگەڵ راوبۆچوونی زۆرینەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان دژایەتیی هەبوو کەوتە بەر رەخنەی زۆرینەی ئەنجوومەن و رۆژی هەشتەمی مای کۆنسەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەن بڕیارێکی پەسند کرد، کە بە پێی ئەو بڕیارە داوا لە تەواوی نەتەوەکانی وڵاتانی نێو شەڕ کردبوو، کە بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕ و دەسپێکی دانوستانەکانی ئاشتی بە پێدانی خەسارەت یا دانەوەی خاك" بخەنە ژێر گوشارەوە. لە بڕیارنامەیەدا داوا لە حیزبە سۆسیالیستەکانی جیهانیش کرابوو، کە کۆنفرانسێکی نێو نەتەوەیی بۆ وەدیهاتنی ئەو ئامانجە پێك بێنن.

دژایەتیی روون وئاشکرای بڕیارەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان لەگەڵ یادداشتەکانی میلیکۆف نیشانی دا، کە لە پێترۆگرادا دوو دەوڵەت هەیە. بە د وای دەرکەوتنی ئەو ناکۆکیانە کۆمەڵە خۆپێشاندانێکیش دژی دەوڵەتی کاتی وەرێکەوتن و ئەنجوومەنی کرێکاران و سەربازان لە شوێنە جیاجیاکانی روسیادا، کە جاربەجار رێژەیان دەچووە سەرووردە وردە دەکەوتنە ژێر کاریگەریی بۆلشەڤیکەکانەوە بە ناردنی لافاوی تەلەگراف بۆ پێترۆگراد خوازیاری دەست لە کار کێشانەوەی میلیکۆف و دەست و پێوەندەکانی تری بۆرژ وا_لیبراڵی دەوڵەتی کاتی بوون.

رۆژی دوازدەی مانگی مای گۆچکۆفی وەزیری شەڕی دەوڵەتی کاتی، کە دژبەری سەرەکیی سیاسەتی ئەنجوومەنەکان لەمەڕ شەڕەوە بوو دەستی لە کار کێشایەوە و چەند رۆژ دواتر میلیکۆف وازی لە وەزارەتی دەرەوە هێنا و رۆژی حەڤدەی مای "لیۆرۆڤ" سەرۆکی وەزیران داوای لە ئەنجوومەنی کرێکاران و سەربازان کرد، کە بۆ دروستکردنی هاوئاهەنگیی لە نێوان ئەنجوومەن و دەوڵەتی کاتیدا ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەن رەگەڵ ستافی دەوڵەت بکەون. لە ستافی نوێدا، کە هەر وەك پێشوو بە سەرۆکایەتیی لیۆرۆڤ پێك هات کێرێنسکی وەزارەتی دەرەوە و هێزیی دەریایی وەئەستۆ گرت و پێنج کەسی سۆسیالیست یەك لەوان ڤیکتۆر چێرنۆف رێبەری حیزبی سۆسیالیستی شۆڕشگێر و "تسێرتلی" رێبەری بۆلشوڤیکەکان پۆستە گرینگەکانی دیکەیان داگیرکردن.

ستافی نوێ لە دەست و پێوەندی بۆرژوا و لیبرالی دەوڵەتی کاتی پاکسازی کراو پێکهاتەیەکی سۆسیالیستی و شۆڕشگێڕانەی هەبوو.

بەو حاڵەشەوە دەوڵەتە نوێیەکە نە دەیتوانی رێگە چارەیەك بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێوخۆییەکان بدۆزێتەوە و نە توانایی بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئاشتیخوازانەی خۆیشی هەبوو. ئەو درووشمگەلەی، کە بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕ و دەستپێکردنی دانوستانەکانی ئاشتی بە پێی نەدانەوەی خاك و خەسارەت دەدران نەگونجاو دەهاتنە پێش چاو و، بە هاتنی ئەمریکاش بۆ نێو شەڕ هاوپەیمانان، کە سەرکەوتنی خۆیان مسۆگەر دەبینی ئیتر ئامادە نەبوون، کە هیچ پوانێك بە دەوڵەتانی دوژمنیان بدەن.

رەوشی ئابووری بە هۆی پشێوی و کارنەکردن و ئەو کۆمەڵە گرفتەی، کە بەرهەمی شەڕ بوون رۆژبەرۆژ خراپتر دەبوو و دەستەوستانیی دەوڵەت لە چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەدا بوارێکی لەباری بۆ بەرەو پێشچوونی بەرنامەکانی لینین رەخساند. وتە و دروشمە توند و شۆڕشگێڕییەکانی لینین زۆر لە قەول و بەڵێنەکانی رێبەرانی ئەنجوومەن و دەوڵەت و داواکانیان بۆ دان بە جەرگداگرتن و سەبرگرتن، کاریگەریی لە سەر خەڵك بەتایبەتی لە سەر کرێکاران هەبوو. بوونی نزیك بە سەد و پەنجاهەزار سەرباز و مەلەوان لە پێترۆگراد و دەوروبەری ئەوێ خۆی گوشارێك بوو بۆ سەر دەوڵەت و لینین بە کەڵکوەرگرتن لە نارەزایەتی و ناڕوونیی چارەنوسی ئەو خەڵکە، ئەوانیشی بەلای خۆیدا رادەکێشا.

# 4

پێکهێنانی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانی روسیا لە شازدەی مانگی ژووئەنی 1917دا بـەخاڵێکی وەرسووڕانی ئەو قۆناغەی خەباتی سیاسی دەژمێردرێ. لەو کۆنگرەیەدا، کـە لـە پێترۆگـراد بـەڕێوە چوو و نوێنەرانی سەرانسەری روسیای تێدا بەشدار بوون، لینین و کێرێنسکی دژ بەیـەك راوەسـتان و ناتەبایی و ناکۆکییەکانی نێوان هێزە شۆڕشگێڕەکانی روسیا جاربەجار پتر دەرکەوتن.

لینین رۆژی حەڤدەی ژووئەن لەو کۆنگرەیەدا وتارێکی پێشکەش کرد و لە بەراوردکردنی شۆڕشی روسیا و فەڕەنسادا کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانی بە هاوکێشـەی کۆنوانسـیۆنەکانی شۆڕشـی فەڕەنسـا دانا. درووشمی سەرەکیی لینین لەو وتارەدا هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی کاتی و، دانی هەموو دەسەڵات و هێزەکانی حکوومەت بە ئەنجوومەنەکان بوو. کێرێنسکی، کـە خـۆی یـەکێك بـوو لـە رێبـەرانی ئەنجومونی نوێنەرانی کرێکاران و سـەربازانی پێترۆگـراد و ئەنـدامی دەوڵـەتی کـاتییش بـوو پـاش قسەکانی لینین چووە پشت تریبوون و گوتی ئەو رێگەیەی لینین نیشـانمان دەدا شۆڕشـی روسـیا بـە لاڕێدا دەبا، تەواوی ئازادیەکانی خەڵکی روسیا لە بار دەبا و وڵات لێك دەترازێنێ.

بەڵام راستییەکەی ئەوەیە، کە قسەکانی لینین زۆر لـە قسـەکانی کێرێنسـکی پـتر پێشـوازییان لێکرا و سەربازان و مەلەوانان، کە بەشی هەرە زۆری ئەندامانی کۆنگرەیان پێـك دێنـا پـتر لـەوانی دیکە هەستی خۆیان بۆ لینین دەربڕی، کە ئەوەش وەك زەنگی مەترسییەك چاوی لێدەکرا.

لە کاتێکدا، کە کۆنگرە هێشتا درێژەی بە کاری خۆی دەدا، دیواری پێترۆگراد بە تایبـەتی کارخانە و سەربازخانەکانی شار بە مەبەستی بانگهێشت بۆ دیمونستراسیۆن و رێپێوان لـە رۆژی بیست و سێیەمی ژوئەندا بە پۆستەری گەورەگەورەی بۆلشەڤیکەکان داپۆشران. بیـانووی ئـەو رێپێوانە، کە دەبوو بـە کۆبوونەوەیـەك لەبـەردەم شـوێنی بەسـتنی کـۆنگرەدا، نـاوی نرابـوو "بەربەرەکانێ لەگەڵ دژبەرانی شۆڕش".

بەیانیی رۆژی بیست و دووەمی ژووئەن رۆژێك بەر لەو رێکەوتەی، کە بۆ خۆپیێشاندانیان دیاریی کردبوو چخیدزێ سەرۆکی ئەنجوومەنی پێترۆگراد لـە کـۆنگرەی ئەنجوومەنەکانـدا رایگەیانـد، کـە بۆلشەڤیکەکان گەرەکیانە هێندێ لە یەکە سوپاییەکان لەو خۆپیێشاندانەدا بەشدار بکەن و لەوانەشـە تێکهەڵچوونی خوێناوی بێتە پێشـێ. کـۆنگرە بـە زۆرینـەی دەنـگ بڕیـاری دا ئـەو خۆپیێشـاندانە

هەڵوەشێنێتەوە و نوێنەرانی کۆنگرە پاش نیوەڕۆی ئەو رۆژە ناردرانە کارخانە و سەربازخانە و ناوەندە جەماوەرییەکان بۆ ئەوەی بڕیاری کۆنگرە بە هەمووان رابگەیەنن.

بەیانیی رۆژی بیست و سێیەمی ژووئەن رۆژنامەی پراڤیدا لە حاڵێکدا، کە بەشێکی زۆری سەرەوەی سپی بوو بڵاو بۆوە. کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك بە درێژایی شەو کۆبوونەوەی هەبوو و لەبەر ئەوەی، کە لە کاتژمێرەکانی سەر لە بەیانیدا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی رێپێوانەکە درا، راگەیەندراوی پێوەندیدار بە بانگهێشت بۆ رێپێوان لە دوایین کاتەکاندا لە لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامە لابردرا.

کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان ئەو شەوە بوو بە هەواری مشتومڕێکی توند، نوێنەرانی بۆلشەڤیکەکان لە بەرامبەر ئەو بڕیارەی کۆنگرەدا نارەزایەتییان دەربڕی و ئەو تۆمەتانەیان رەت دەکردنەوە، کە دەگوترا بۆلشەڤیکەکان بۆ ئاژاوە نانەوە پیلانیان بەدەستەوەیە، بەڵام چەند ئەندامێکی کۆنگرە بە توندی هێرشیان کردە سەر شێوازی ئاژاوەگێڕییانەی بۆلشەڤیکەکان و تێسێرێللی رێبەری مەنشەڤیکەکان بۆ یەکەم جار بۆلشەڤیکەکانی بە پیلانگێڕی دژی شۆڕش تاوانبار کرد. ترۆتسکییش لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوو، بەڵام بەو بەرنامانەی، کە بۆ هاریکاریی لینین هەیبوون بێدەنگەی لێکرد.

نهێنیی "پیلانەکەی ژوئەن" دواتر دەرکەوت و روون بۆوە، کە ئامانجی سەرەکیی بۆلشەڤیکەکان لەو رێپێوانەدا ئەوە بووە، کە هێرش بکەنە سەر بارەگای دەوڵەتی کاتی لە مەیدانی مارینسکی و ئەندامانی دەوڵەتی کاتی دەسبەسەر بکەن و دەسەڵات و جڵەوی حکوومەت بدەنە دەستی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك و دواجار کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان ناچار بکەن، کە مل بۆ ئەو حکوومەتە نوێیە راکێشێ.

خۆڕاگریی کۆنگرە و پوچەڵبوونەوەی پیلانەکە بووە هۆی ئەوەی، کە لینین شەرمەزار بێت و بۆلشەڤیکەکان سەریان شۆڕ بکەنەوە، بەڵام لینین دارێك نەبوو بەو بایانە بلەرزێ و هەر وا سووك و سانا مەیدان چۆڵ بکات.

پاش ئەو رووداوە لینین بڕیاری دا بۆ ماوەیەك پشوودان و خۆ داڕشتنەوە و داڕشتنی نەخشە و گەڵاڵەی نوێ پێترۆگراد بەجێ بێڵێ و بەو مەبەستە لە کۆتایی ژووئەندا بەرەو هەواری کوێستانیی یەکێك لە کۆنە دۆستەکانی خۆی لە "نێڤۆلا"لە دراوسییەتیی فەنلاند، وەڕێکەوت.

بەر لەوەڕێکەوتن بەرەو نێڤۆلا لینین فەرمانی بە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و چالاکانی بۆلشەڤیکدا بوو، کە لە دوای ئەو چالاکییەکانیان بە مەبەستی تەشەنەکردنە نێو ریزەکانی سوپاو

کرێکارانەوە توندوتۆڵتر بکەن و بوار بۆ بزاوتێکی نوێ لە هەلێکی لەباردا بڕەخسێنن. لینین بە تایبەتی جەختی لە سەر تەشەنەکردنە نێو ریزەکانی چەکداران دەکردەوە و تاقمێکی راسپاردن، کە تەشەنە بکەنە نێو ئەو هێزانەوە کە لە پێترۆگراد و پاپۆڕی بالتیکدا سەقامگیر کراون و دامەزراون. رۆژنامەی پراڤیدا ژمارەگەلێکی تابەتیی بە ناوی "سۆلاتسکایا پراڤیدا" و "ئۆکۆپنایاپراڤیدا" بۆ سەربازان و مەلەوانەکان چاپ دەکرد. ئەو رۆژنامەیە، کە پڕ بوو لە بابەتی ووژێنەر دژی دەوڵەتی کاتی بە ئاشکرایی لە نێو ئەندامانی هێزە چەکدارەکاندا بڵاو دەکرانەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەو چالاکیانەدا کێرێنسکی، کە پاش ساخکردنەوەی دەوڵەتی کاتی ببووە وەزیری جەنگ گەڵاڵەی هێرشێکی بەربڵاوی لە باشووری خۆرئاوادا ئامادە کرد بە پەسندکرانی ئەو گەڵاڵەیە لە لایەن دەستەی بەڕێوەبەریی ناوەندیی ئەنجوومەنەکانەوە فەرمانی هێرشەکە بە ژەنەراڵ برۆسیلۆف راگەیەندرا. رۆژی یەکەمی ژووئیەی ساڵی 1917 هێرشەکە دەستی پێکرد و هێزەکانی روسیا لە حەوتووی یەکەمی شەڕدا هێندێ سەرکەوتنیان دەستەبەرکردن. پێشڕەویی ئەو هێزانە لە حەوتووی دووەمدا راگیران و لە حەوتووی سێیەمەوە هێرشی بەرامبەری ئەڵمانییەکان دستی پێکرد.

شکستی گەڵاڵەکەی کرێنسکی شەپۆلێکی نارەزامەندیی لە نێو هێزە چەکدارەکاندا پێک هێنا و بۆلشەڤیکەکان بەو پێگەیەی، کە لە نێو سەربازانی پێترۆگراد و مەلەوانانی"کرۆنستاد"kronstadtداوەدەستیان هێنابوو بڕیاریان دا ئەو هەلە بقۆزنەوە. کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك دوانیوەڕۆی رۆژی پازدەی ژووئیە بە بێ لینین کۆبوونەوەی پێك هێنا و لە کۆتایی ئەو کۆبوونەوە دوورودرێژەدا بڕیاردرا خۆپێشاندان و رێپێوانی نوێ وەڕێبخرێتەوە و حیزبی بۆلشەڤیك خۆی بە فەرمی رێبەرایەتیی ئەو خۆپێشاندانانە وەئەستۆ بگرێ. راگەیاندنی پێوەندیدار بە وەڕێخستنی خۆپێشاندان ئامادە کراو بۆ چاپ ناردرایە رۆژنامەی پراڤیدا، بەڵام لە کات و ساتەکانی کۆتایی شەودا هەواڵیان دا، کە دەوڵەتی کاتی بە وەڕێخستنی خۆپێشاندان و بەشداریی سەربازان و مەلەوانانی زانیوە و بۆ بەرپەرچدانەوە و رووبەڕووبوونەوە لە بەرامبەریدا خۆی رێکخستووە.

کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە نیوەی شەوێڕا کۆبوونەوەیەکی دیکەی پێك هێناو لەبەر ئەوەی پێشبینی دەکرا دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنەکانیش پێش بە خۆپێشاندان بگرێ دواجار هاتنە سەر ئەوەی، کە خۆپێشاندان هەڵوەشێننەوە. راگەیەندراوی وەڕێخستنی خۆپێشاندانەکەیان لە دوایین ساتەکاندا لە ژێر چاپ هێنایە دەرێ و لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەی پراڤیدا جارێکی دیکەش بەشێکی بە بۆشی(سپی) بڵاو بۆوە.

بـەڵام بـەر لـە ڕاگەیانـدنی هەڵوەشـانەوەی خۆپێشـاندان و بڵاوبوونـەوەی ڕۆژنامـەی پراڤیـدا مەلەوانانی کرۆنسـتاد بـە پێـی بەرنامـەی پێشـوویان سـەرلەبەیانیی ڕۆژی حەڤـدەی ژووئیـە لـە ئیسکیلەکانی پیتڕۆگراد دابەزین و بەڕیزی ڕێکوپێك بەرەو ناوەندی حیزبی بۆلشەڤیك وەڕێکەوتن.

وەڕێکەوتنی هەزاران مەلەوان لە شەقامەکانی پیتڕۆگراد، دا و کۆبوونـەوەیان لـە بـەردەم بارەگـای حیزبی بۆلشەڤیکدا دیمەنی شاری گۆڕی. ئەگـەری دەسـتپێکردنی ڕاپـەڕینێکی چـەکداری و ڕووخـانی دەوڵەت ترس و دڵەخورپەیەکی خستە نێو پایتەختەوە. دەوڵەتی کاتی هێشتا هـیچ دژکردەوەیـەکی لـە خۆی نەنواندبوو ڕێبەرانی حیزبی بۆلشەڤیکیش پاش هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری خۆپێشـاندان نەیانـدەزانی لە بەرامبەر ئەو هەلومەرجەدا چ بکەن؟ چەند کەسێك لە ڕێبەرانی حیزب پێشـنیاریان کـرد، کـە ڕای لینین بپرسن و یەکێك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بە پەلـە بـەرەو نێڤـۆلاوە ڕێکـەوت بـۆ ئەوەی ڕێنوێنیی لەو وەرگرن. لینین، کە بەوەی زانی خۆ خافڵانـدنی بـە ڕەوا نـەزانی و پـاش نیـوەڕۆی ڕۆژی حەڤدەی ژووئیە گەڕایەوە پیتڕۆگراد .کاتێك لینین گەیشتەوە بەردەم بارەگـای حیزبـی بۆلشـەڤیك نزیك بە بیستهەزارکەس، کە زۆربەیان مەلەوان بوون لە گۆڕەپانەکەی بەردەم حیزب کۆ ببوونەوە.

لینین، کە هێشتا بە جـوانی لـە مەسـەلەکە ئاگـادار نـەکرابۆوە و نەیـدەتوانی بڕیـارێکی لێبڕاوانە بدات لە ئاخافتنێکدا، کە ڕووی قسەی لە مەلەوانەکان بوو جگە لە هێرشی ڕاستەوخۆ بۆ سەر دەوڵەتی کاتی و ڕەخنەگرتنی ناڕاستەوخۆ لە ڕێبەرانی ئەنجوومەنەکان، شـتێکی نـوێی نەهێنایە گۆڕێ. ئەو نە داوای لە مەلەوانەکان کرد، کە درێژە بە خۆپێشاندانەکانیان بدەن و نە داوای لێکردن ڕاپەڕن، چونکی دڵنیا نەبوو لەو هەلومەرجـەدا شـۆڕش سـەر دەکـەوێ. لەگـەڵ ئەوەشدا لینین، کـە ئامـادە نـەبوو وەهـا دەرفـەتێك لـە دەسـت بـدا، یـەکێك لـە ڕێبـەرانی بۆلشەڤیکیی بە ناوی "لوناچارسکی"، کە لە نێو مەلەوانەکاندا زۆر خۆشەویسـت بـوو کـردە بەرپرسی بەڕێوەبردنی خۆپێشاندانەکان. لۆناچارسکی پاش وتەیەکی کورت لە پێشـەوەی ڕیـزی مەلەوانەکانەوە بەرەو کۆشکی "توریدا" واتە بارەگـای ئەنجوومەنـەکان وەڕێکـەوت. لـە سـەر ڕێگـەی ئـەو ڕێپێوانـە بـە هـەزاران کرێکـار، کـە زۆربـەیان چـەکدار بـوون کەوتنـە گـەڵ خۆپێشاندەرەکانەوە، بەڵام خۆپێشاندانەکە لە بەر دەم کۆشـکی تەڤریـدا لەبـەر ئـەوەی، کـە لەوەپێش بەرنامەی بۆ دانەڕێژرابوو بێ ئاکام مایەوە.

پاش لێك بڵاوبوونی مەلەوانەکان ژمارەیەکی ئەندامانی هێـزۆ پشـتیوانی پیتڕۆگـراد، کـە لایەنگری بۆلشەڤیکەکان بوون گەیشتنە گۆڕەپانی بەردەم کۆشکی تەڤرید، بەڵام لەبەر ئەوەی، کە هیچ کەس لە ڕێبەرانی بۆلشەڤیکی لەوێ نەمابوون، کە ڕێبەرایەتی‌یان بکەن پاش هێندێك هات و هاوار و چەند درووشمێکی شۆڕشگێڕانە گۆڕەپانەکەیان بەجێ هێشت.

کاتژمێر حەوتی پاش نیوەڕۆ سێیەمین شەپۆلی خۆپێشاندانەکان، کە کرێکارانی کارخانەی گەورەی پۆتیلۆف بوون گەیشتنە مەیدان و نوێنەرەکانیان بە زۆرەملی چوونە نێو هۆڵی کۆنگرەوە. یەکێکیان، کە تفەنگێکی پێ بوو چووە پشت تریبوون و پاش تەقاندنی چەند فیشەکی هەوایی بۆ دامرکاندنەوەی قریوەقریوو و ئالۆزییەی، کە لە نێو نوێنەرانی سەرسووڕماودا هەبوو، دەستی کرد بە قسەکردن. چخیدزرێ، کە سەرۆکایەتیی کۆبوونەوەکەی لە ئەستۆ بوو بە لە سەر ە خۆییەوە گوێی بۆ قسەکانی راگرت و لە کۆتاییدا فەرمانی نووسراوی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی دایە دەستی، کە داوای لە کرێکاران دەکرد بە هێمنی بڵاوەی بکەن و بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان. چەکدارە قسەکەرەکە نەیدەزانی لە بەرانبەر ئەو فەرمانەدا چ دژکردەوەیەك بنوێنێ، کە هاوڕێکانی لە پشت تریبوونەکەوە کێشایانە خواری و لەکۆبوونەوەکە بردیانە دەرێ.

ئەوە دوایین قۆناغی سەرهەڵدانی مانگی ژووئیە بوو، کە بە بێ ئاکام کۆتایی پێهات، هۆکاری شکست و بێئاکام مانەوەشی ناشێلگیریی رێبەرانی بۆلشەڤیکی و یەك لەوان خودی لینین بوو لەو قۆناغەدا و هەروەها نەبوونی هاوئاهەنگی لە نێوان هێزگەلی بەشدار لەو بزاوتەدا، کە ئەویش لە بێبڕیاری و نەبوونی بەرنامەیەکی دارێژراو لە لایەن رێبەرایەتیی حیزبی بۆلشەڤیکەوە سەرچاوەی دەگرت. هەرچەند دواتر بۆ پاساوی ئەو گومان و بێبڕیارییە دەیانگوت، کە لەو کاتدا هەلومەرجەکان بۆ سەرکەوتنی شۆڕش لەبار نەبوون و هێزەکانی ژێر فەرمانی قەزاقەکان، کە لە بەرامبەر بۆلشەڤیکەکاندا راوەستابوون لەو کاتدا توانای سەرکوتی ئەو سەرهەڵدانەیان هەبوو. سەرهەڵدانی بێئاکامی ژووئیە دوو دەرەنجامی لێکەوتەوە: فەرمانی دەسبەسەرکرانی لینین و رێبەرانی حیزبی بۆلشەڤیك و گۆڕینی سەرۆك وەزیری دەوڵەتی کاتی.

لە رێکەوتی نۆزدەی ژووئیەدا دەوڵەتی کاتی فەرمانی دەستبەسەرکردنی لینین و زینۆوێڤ و کامێنۆڤ و لۆناچارسکی و راسکۆڵنیکۆفی رێبەری مەلەوانانی سووری دەرکرد. تۆمەتەکەیان شێواندنی ریزەکانی سوپا و دنەدان بۆ راپەڕینی چەکداریی و وەرگرتنی یارمەتیی ماڵی لە دوژمن بوو. لینین، کە ئەو تۆمەتانەی خوێندنەوە بە ترۆتسکیی، کە ئەو کات پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ بۆلشەڤیکەکان ساز کردبوو گوت:"بەو تۆمەتانەوە تیرەبارانمان دەکەن"، بەڵام ترۆتسکی لە وەڵامی لینیندا گوتی:"من هیچ نیگەران نیم. دوژمنەکانمان ورە و هێزی پێویستیان بۆ وەها کارێك نییە."

ترۆتسکی حەقی بوو. دەوڵەتی کاتی تەنانەت لە سەر راوەدوونان و دەستبەسەرکردنی لینین و هاوڕێکانیشیدا لێبڕاو و سوور نەبوو. رۆژی بیست و یەکەمی ژووئیە پرێنس "لێورۆف" دەستی لە سەرۆکایەتیی دەوڵەتی کاتی کێشایەوە و کێرێنسکی لە جێگەی وی دانرا. بە دانانی

کێرێنسکی بۆ سەرۆکایەتیی دەوڵەتی کاتی، لینین، کە پاش دەرچوونی فەرمانی دەستبەسەرکرانەکەی لە لایەن دەوڵەتی کاتییەوە، لە ماڵی کرێکارێك بە ناوی "ئالیلیۆف"(خەزووری دوایی لینین) خۆی شاردبۆوە بڕیاری دا بە شێوەی کاتی لە روسیا بچێتە دەرێ. زینۆویێڤیش لە ماڵەدا لەگەڵ لینین بوو و ئەندامانی حیزبی بۆلشەڤیك، کە هێشتا بە ئازادی چالاکییان دەنواند بڕیاریان دا لە رێگەی کەسێکەوە بە ناوی "شۆتمان"shotmsnلە سنووری روسیا و فەنلاند بپەڕێننەوە. لینین و زینۆویێڤ بۆ پەڕینەوە لە سنوور قەڵافەتی خۆیان گۆڕی و جلوبەرگی کرێکارانیان پۆشی.

لینین ردێن و سمێڵی خۆی تاشین و کڵاوگیسێکی نایە سەرە بێ تووکەکەی و زینۆویێڤ بە پێچەوانەی ئەو ردێنی هێشتەوە و پرچە درێژەکەی کورت کردەوە. هەردووکیان بە بەڵگە و ناسنامەی تەزویر، بەبێ ئەوەی تووشی هیچ گرفت و کێشەیەك بن لە سنوور پەڕینەوە. لینین لەگەڵ شۆتمان بەرەو هێلنیسکی وەڕێکەوت و زینۆویێڤ لە نزیکیی سنووری روسیا و فەنلاند لە ماڵی کرێکارێکدا مایەوە بۆ ئەوەی لە یەکەم دەرفەتدا بگەڕێتەوە روسیا.

لە هێلسینکی شۆتمان بە یارمەتیی یەکێك لە ئەندام پەرلمانەکانی فەنلاند رێکیخست، کە لینین لە ماڵی سەرۆکی پۆلیسی هێلسینکی بمێنێتەوە. ئەوە متمانەپێکراوترین شوێن بوو بۆ خۆحەشاردانی راکردوویەك.

دوابەدوای راکردنی لینین و زینۆویێڤ و هەڵاتنی رێبەرانی چالاك و هەڵسووڕی حیزبی بۆلشەڤیك چالاکییەکانیان کەم بوونەوە و متمانە و پێگەی حیزبیش لەرزۆك بوو. لەوەها هەلومەرجێکی قەیراناوی و سەردەمی داکشانی بۆلشەڤیکەکاندا بوو، کە ترۆتسکی بە فەرمی کەوتەگەڵ حیزبی بۆلشەڤیك و لەو بۆشاییەدا پێگەیەکی تایبەت بە خۆی لە حیزبدا وەدەست هێنا.

# 5

لە نێوەڕاستەکانی ژووئیەوە، کـە گەڵاڵـەی بۆلشـەڤیکەکان بـۆ بەدەسـتەوەگرتنی جڵـەوی دەسەڵات مایەپووچ دەرچوو و شکستی هێنـا، هـەتا سـێپتەمبەری 1917 پێگـەی حیزبـی بۆلشەڤیك رۆژبە رۆژ لاوازتر دەبوو و لینینیش، کە هەروا لە فەنلاند مابۆوە لە گەڕانەوەی بـۆ روسیا بێهیوا دەبوو، بـەڵام چـەند کردەوەیـەکی هەڵـەی کێرێنسـکی بـواری بـۆ گەڕانـەوەی دەسەڵاتی بۆلشەڤیکەکان خۆش کرد.

رۆژی سیهـەمی30 ژووئیـە کێرێنسـکی، ژەنـەراڵ "کۆرنیلـۆف"ی کـردە فەرمانـدەی تـەواوی هێزەکانی روسـیا. ژەنـەراڵ کۆرنیلـۆف پـاش تێکشـکانی مـەزنی بـەرەی باشـووری خۆرئـاوا کرایـە فەرماندەی هێزەکانی روسیا لەو بەرەیەدا و بە رەچاوکردنی دسیپلینی سەربازیی تونـدو ئیعـدامی ئـەو کەسانەی لە بەرەی شەڕ هەڵدەهاتن رەوشی شێواو و نالەباری ئەو بەرەیەی رێکوپێکتر کردبوو.

سەرەڕای ئەوەش باشترین تاریفێك، کە لێی کـراوە ئـەو رسـتەیەی ژەنـەراڵ برۆسـیلۆفـی سەرۆکی ستادی سوپای روسیایە، کە گوتبووی:"کۆرنیلۆف دڵی شێر و مێشکی مەڕی هەیە."

گرینگترین تایبەتمەندیی کۆرنیلۆف، کە وای لە کێرێنسکی کرد بیکاتە فەرماندەی هـەموو هێزەکانی روسیا باوەڕی تۆخی ئەو بە دسیپلینی سەربازی بوو، کە لەو ماوە کورتەیدا، کە لـە بەرەی باشووری خۆرئاوا بوو ئاکامی باشی لێکەوتبۆوە.

کێرێنسکی و کۆرنیلۆف هەردووکیان لە سـەر ئـەو بـاوەڕە بـوون، کـە تێکچـوونی دسـیپلینی سەربازی لە ریزی پشتەوەی بەرە (جبهە)کە، و چـالاکیی سیاسـی لـە ریزەکـانی پێشـەوەی بـەرەدا توانای سەربازیی هێزەکانی روسیای دابەزاندووە و دەبێ ئەو رەوشە کۆتایی پێ بێ.

کۆرنیلۆف هاوکات لەگەڵ دانانی یاساو رێسای توندی سەربازی لـە بەرەکانـدا هاتـە سـەر ئەوەی، کە کۆتایی بەبوونی بۆلشەڤیکەکان لە نێو یەکە سـەربازییەکانی پێترۆگـرادا بـێنی و هەر بەو مەبەستەش رۆژی نـۆزدەی ئـووت چـەند لەشـکری سـوارکار و قـەزاقی لـە نزیکیـی پێترۆگراد دامەزراند بۆ ئەوەی، کە لە دەرفەتێکی لـەباردا بۆلشـەڤیکەکان سـەرکوت بکـات. لەوهێنان و راگواستنانەدا کۆرنیلۆف بە سەرۆکی بنکەکەی خۆی گوتبوو:

"...ئیتر کاتی ئەوە هاتووە، کە مشووری ئەو سیخوڕە ئەڵمانییانە بخۆین. دەبێ تەواوی ئەو سیخوڕانە و لە سەرووی هەمووانەوە لینین ئیعدام بکرێ... ئەنجوومەنی کرێکاران و سەربازانیش دەبێ هەڵوەشێتەوە. سەربازان بۆیان نییە، کە جگە لە بڕیاری فەرماندەی خۆیان بە قسەی هیچ ڕێکخراوێکی تر بجووڵێنەوە... من ژەنەراڵ کریمۆف krimov دەکەمە فەرماندەی هێزەکانی پێترۆگراد و دڵنیاشم، کە ئەگەر پێویست بێ تەواوی ئەندامانی ئەنجوومەنی پێترۆگراد لەدار دەدەم."

کێرێنسکی بۆ ئەوەی، کە ڕەواییەکی پتر بداتە دەوڵەتی کاتی و دەسەڵاتی ئەنجوومەنەکان، کە زیاتر لە ژێر کاریگەریی بۆلشەڤیکەکاندا بوو کەم بکاتەوە کۆنفرانسێکی لە نوێنەرانی تەواوی گرووپ و حیزب و چین و ناوەندە جۆراوجۆرەکان پێك هێنا. لەو کۆنفرانسەدا، کە لە ڕۆژی بیست و هەشتەمی ئوتدا لە مۆسکۆ پێك هات 2400 کەس بەشدارییان تێدا کرد، کە نوێنەرانی هەر چوار خولی دۆماو کۆنگرەی نوێنەرانی ئەنجوومەنەکان و نوێنەرگەلێکی سوپا بوون. لە دەستەی بەڕێوەبەریی ناوەندیی ئەنجوومەنەکاندا نوێنەرانی بۆلشەڤیکی و دەستەیەك لە مەنشەڤیکەکان بە ڕێبەرایەتیی مارتۆف دژایەتیی پێکهاتنی ئەو کۆنفرانسەیان کرد، بەڵام زۆرینەیان پێشنیاری کێرێنسکییان قەبووڵ کرد.

ڕۆژی پێکهاتنی کۆنفرانسەکە لە مۆسکۆ بۆلشەڤیکەکان بە نیشانەی ناڕەزامەندی بە پێکهاتنی ئەو کۆنفرانسە مانیان گرت. ئەو مانگرتنە بە تەواوی سەرکەوتوو نەبوو، سەرەڕای ئەوەش زۆرینەی کرێکارانیش بەشدارییان تێدا کرد و بۆلشەڤیکەکان بۆ جارێکی دیکەش هێز و توانای خۆیانیان نواندەوە.

لە کۆنفرانسی مۆسکۆدا کێرێنسکی لە لێدوانێکدا باسی لە سەر کەوتنەکانی دەوڵەت لە سەقامگیرکردنی تەکووزی و لێبڕاوی بە مەبەستی پێشگرتن لە هەر چەشنە پیلانێکی"دەست وپێوەندەکانی دوژمن" کرد و ژەنەراڵ کۆرنیلۆف وێڕای باسکردن لە گرفتەکانی هێزە چەکدارەکان داوای کۆتاییهاتن بە چالاکیی سیاسی و گرووپ و دەستەبازی و هەڵوەشاندنەوەی کۆمیتەکانی سەربازان و سەقامگیرکردنی دسیپلینی سەربازی لە سوپادا کرد. کۆنفرانس پاش بیستنی چەند ئاخافتن و ڕاپۆرتی دیکە و پشتڕاستکردنەوەیان درێژەی بە کارەکانی خۆیدا، بەڵام وشیاربوونەوە و لە خەو ڕابوونی بۆلشەڤیکەکان لە بەرامبەر ئەگەری مەترسییەکان و وەئاگاهاتنەوەی لایەنگرانی دەوڵەت و کەسانی میانڕەو، کە بە خەیاڵی خاو و لە سەر قەول و بەڵێنەکانی کێرێنسکی لەمەڕ، سەرکەوتنەکانی دەوڵەت پاڵیان لێ دابۆوە تەنیا ئاکامێك بوو، کە لەو کۆنفرانسە وەرگیرا.

ڕۆژی سێیەمی سێپتەمبەر هێزەکانی ئەڵمانیا بەندەری "ڕەیگا"یان گرت و پایتەختیان خستە مەترسییەوە. کۆرنیلۆف خوازیاری بەڕێکردنی هێزەکانی خۆی بۆ پێترۆگراد و بەدەستەوە گرتنی کۆنترۆڵی هەموو هێزە یەربازییەکان بو و. کێرێنسکی، کە لە بەرزەفڕییەکانی کۆرنیلۆف دەترساو ترسی لە ژەنەراڵ کریمۆڤی فەرماندەی ناردراو بۆ پێترۆگرادیش بوو، ناردنی ئەو هێزانەی بۆ پایتەخت قەبووڵ نەکرد. کۆرنیلۆف، کە لە دژایەتیی کێرێنسکی لە سەر هاتنی هێزەکانی بۆ نێو پایتەخت تووڕە ببوو بە بێ گرینگیدان بە دەرەنجامی ئەو کارەی، کە دەیکا داوای دەست لە کار کێشانەوەی دەوڵەت و دامەزراندنی حکوومەتێکی سەربازیی کرد.

دژکردەوەی کێرێنسکی لە بەرامبەر ئەو داوایەدا چاوەڕواننەکراو بوو. ڕۆژی نۆیەمی سێپتەمبەر سەرۆکی دەوڵەتی کاتی کۆرنیلۆڤی لە فەرماندەریتیی گشتیی هێزەکانی روسیا خست و فەرمانی دا دەستبەجێ بگەڕێتەوە پێترۆگراد. کۆرنیلۆف ئەو فەرمانەی لە گوێ نەگرت و بە سەرۆکایەتیی هێزە سوارییەکانی خۆی بەرەو پێترۆگراد وەڕێ کەوت.

لێرەدا دەگەڕێینەوە سەر تاریفی ژەنەراڵ برۆسیلۆف لە کۆرنیلۆف، کە گوتبووی:" ئەو دڵی شێر و مێشکی مەڕی هەیە." ئەگەر کۆرنیلۆف بە جێگەی " داوای دەست لەکار کێشانە وی دەوڵەت"، کە خۆی بە واتای ئامادەبوونی دەوڵەت و هەموو هێزە شۆڕشگێڕەکان لە بەرامبەر پلانەکەی ئەودا بوو بە بێ ڕاگەیاندنی پێش وەخت و کتوپڕ پایتەختی گرتبا، تووشی خۆڕاگریی و بەربەرەکانیی زۆر نەدەبوو و لەوانەش بوو دامەزرانی حکوومەتێکی سەربازی لەو کاتدا ڕەوگە و ئاراستەی مێژووی گۆڕیبا و پێشی بەو گۆڕانانەی دوایی گرتبا، کە دامەزرانی یەکەمین حکوومەتی کۆمۆنیستیی لە جیهاندا لێ کەوتەوە.

نەك هەر بۆلشەڤیکەکان بەڵکو تەواوی ئەو هێزە چەپیانەی، کە دامەزرانی حکوومەتێکی سەربازییان بە مەترسییەك بۆ سەرخۆیان دادەنا، لەو ڕۆژەوە، کە کۆرینلۆف داوای دەست لە کار کێشانەوەی دەوڵەت و دامەزرانی حکوومەتی سەربازیی کرد خۆیان بۆ بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕووداوگەلێك، کە لەوانە بوو بێنەپێش، ئامادە دەکرد. هەواڵی وەڕێکەوتنی هێزەکانی کۆرنیلۆف دەمودەست بە دەوڵەت و ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازانی پێترۆگراد گەیشت و بەو ئامادەکارییانەی، کە لەمەوبەر بۆی کرابوو، تەواوی هێزەکان بۆ بەرەوڕوو بوونەوەی ئەو مەترسی‌یە دەست بەکار بوون: بە دابەشینی چەك بەسەر کرێکاراندا یەکەمین یەکەکانی میلیشیا یان گاردی سوور پێکهاتن و سەربازانی سەر بە هێزە شۆڕشگێڕەکان لە شوێنە هەستیارەکان دامەزران. کرێکاران

هێڵی شەمەندەفەریان لە کار خست بۆ ئەوەی پێش بـە راگواسـتن و گەیانـدنی هێزەکـانی کۆنیلۆف بۆ پێترۆگراد بگیردری و بەڕێوەبەرانی تەلەفۆنخانەکانیش لە گەیاندنی فـەرمان و تەلەگرافەکانی کۆرنیلۆف بە دەستی یەکە سەربازییەکانی‌تر خۆیان بوارد. کۆرنیلۆف، کـە لەوەها هەلومەرجێکدا هیچ هیوایەکی بە سەرکەوتنی خۆی نـەبوو لـە هێرشـکردنە سـەر پێترۆگراد پەشیمان بۆوە و هێزەکانی ژێر دەستیشی پەرش و بڵاو بوون.

رۆژی دوازدەی سێپتەمبەر کێرێنسکی خۆی فەرماندەیی گشتیی هێزەکانی وەئەستۆ گـرت و کۆرنیلۆف دەسبەسەر کرا. رۆژی چواردەی سێپتەمبەر بە فەرمی دامەزرانی رژێمی کۆمـاری لە روسیا راگەیەندرا، بەڵام پێگەی کێرێنسکی لە بەرامبەر بۆلشەڤیکەکان و هێزە چەپیەکانی دیکەدا تـەواو لاواز و لـەرزۆك ببـوو، چـونکی رووداوی کۆرنیلـۆف ئالۆزییـەکانی نێـو هێـزە چەکدارەکانی پتر کرد و کێرێنسکی وەکو فەرماندەی گشتیی هێزەکان بە کردەوە هێزێکی جـێ متمانەی لەبەر دەستدا نەبوو. لە لایەکی دیکەوە بۆلشەڤیکەکان دیسان بووژانەوە و رۆژێك بەر لە راگەیاندنی کۆماری لە روسیا بۆ یەکەمین جار زۆرینەی ئەنجوومەنی کرێکـاران و سـەربازان دەنگیان دا بە بڕیارنامەی پێشنیار کراوی بۆلشەڤیکەکان.

لینین لە نامەیەکدا لە فەنلاندەوە، کە لە رێکەوتی 12ی سـێپتەمبەر بـۆ کۆمیتـەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیکی نووسیوە رووداوەکەی کۆرنیلۆفی بە خاڵێکی وەرچـەرخان لـە مێژووی روسیادا لە قەڵەم داوە و پێشنیاری بە هاوڕێکانی خۆی داوە، کـە بـە تـاکتیکی خەباتیاندا دژی کێرێنسکی، بچنەوە و لە رواڵەتدا تەوژمی بەربەرەکانیٰ لەگەڵ ئـەو کـەم کەنەوە. لینین لەو نامەیەدا جەخت دەکاتەوە لە سەر ئەوەی، کە هیچ گۆڕانێك بەسەر دوا ئامانجدا، کە رووخاندنی رژێمی کێرێنسکییە، نایە، بەڵام لە هەلومەرجی ئێستادا تەنیا بە لاوازکردن و رەخنەگرتن لە کەموکورتییەکانی دەوڵەت قایل دەبین هەتا هەلێکی لەبار بـۆ وەشاندنی دوایین زەبر، دەرەخسیٰ.

شکستی هەوڵەکانی کۆرنیلـۆف بـۆ بەدەسـتەوە گـرتنی دەسـەڵات، تۆڵـە ئەسـتاندنەوە و کوشتاری سامناکی ئەفسەرانی سوپای روسیای لە هێندیٰ شاراندا لیٰ کەوتەوە و هۆکاری ئـەو کوشتارانەش زیاتر بۆلشەڤیکەکان بوون. چۆنێتیی رووداني یەکێك لـەو کوشـتارە سـامناکانە لە"ڤیبۆرگ" وێڕای راپۆرتێك بۆ بەشی سەربازیی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنـەکان بـەو جۆرە شی‌کراوەتەوە:"دیمەنی کوشتاری ئەفسەرانی ناوەندی سەربازیی ڤیبۆرگ زۆر سامناك بوو. سەرەتا سیٰ ژەنەراڵ و سەرهەنگێکیان، کە لە لایەن کۆمیتەی سەربازییەوە دەسبەسەر کرابوون،

بــه راكــێش راكــێش لــه گرتووخانه‌كــه‌یان هێنانــه ده‌رێ و بردیاننــه ســه‌ر پرده‌كــه و پــاش تیره‌بارانكردنیان فرێیان دانه نێو چۆمه‌كه‌وه‌. یــازده ئه‌فســه‌ره‌كه‌ی دیكــه‌یان فــڕێ دانــه نێــو چۆمه‌كه و دواتر تیره‌بارانیان كردن..."

به گشتی به رووداوی كۆرنیلۆف زه‌برێكی كوشنده‌ی له سوپای روسیادا و ئه‌وه‌نده هێزه‌شــی له نێو برد، كه بۆ به‌ربه‌ره‌كانێ له‌گه‌ڵ مه‌ترسییه نێوخــۆیی و ده‌ره‌كییــه‌كان له‌به‌ریــدا مــابوو. مۆركی دژه شۆڕش درایه پاڵ ته‌واوی ئه‌فسه‌رانی پایه‌به‌رز و فه‌رمانده‌كانی سوپا. سه‌ربازان لــه ئه‌فسه‌رانی خۆیان وه‌رسووڕانه‌وه و كۆمیته سه‌ربازییه‌كانیش، كه ویستیان سه‌ربازه‌كان كۆنترۆڵ بكه‌ن نه‌یانتوانی دسیپلینی سه‌ربازی بچه‌سپێنن. ده‌وڵه‌ت بۆ ئه‌وه‌ی بتوانێ هێــزه چــه‌كداره‌كان بگرێته ژێر كۆنترۆڵی خۆی چه‌ند "كۆمیسێرێكی سه‌ربازیی" بۆ به‌شه جیا جیاكانی سوپا دیاری كرد، به‌ڵام شیرازه‌ی كاره‌كان وه‌ها لێك ترازابوو، كه ئــه‌وانیش هیچــیان لــه ده‌ســت نــه‌هات و ئه‌وه‌ش ئه‌و شته بوو، كه بۆلشه‌ڤیكه‌كان ده‌یانویست.

هاوكات له‌گه‌ڵ بشێوی و ئاڵۆزی له نێو هێزه چه‌كداره‌كاندا، ده‌وڵه‌ت رۆژی بیست و پێنجی نۆڤه‌مبه‌ری بۆ به‌ڕێوه‌بردنی هه‌ڵبژاردنه‌كانی په‌رلمانی دامه‌زرێنه‌ران دیاریی كرد، به‌ڵام بــه‌ر لــه پێكهاتنی ئه‌و په‌رلمانه، كێرێنسكی بڕیاری دا، كــه كۆنفراســێكی ئاماده‌كــاری پێكهــاتوو لــه نوێنه‌رانی حیزب و گرووپ و چینه جیاجیاكان بگرێ بــۆ ئــه‌وه‌ی پێشــه‌كیی یاســای بنــه‌ڕه‌تیی كۆماری روسیا بنووسنه‌وه. بۆلشه‌ڤیكه‌كان به پیر داواكه‌ی كێرینسكییه‌وه بۆ به‌شداربوون لــه‌و په‌رلمانه‌دا چوون، به‌ڵام كاتێك هه‌واڵی دۆڕاندنی بۆلشه‌ڤیكه‌كان له‌و په‌رلمانه‌دا گه‌یشته لینین له‌و په‌ڕی تووڕه‌ییدا نامه‌یه‌كی توندی بــۆ كۆمیتــه‌ی ناوه‌نــدیی حیــزب نووســی و به‌شــداربوون لــه په‌رلمانی كێرێنسكییدا به خه‌یانه‌ت ناو برد.

لینین بۆ كۆمیته‌ی ناوه‌ندیی حیزبی نووسی:" ئێوه نه‌ك هه‌ر نابێ لــه‌و شــانۆیه‌دا به‌شــداری بكه‌ن به‌ڵكو ده‌بێ بزاوتێكی گشتیی له دژی وه‌ڕێ بخه‌ن، و ئه‌گه‌ر پێویست بوو ئه‌و كۆنفرانســه دیموكراتیكه گه‌مارۆ بده‌ن و ئه‌ندامه‌كانی ده‌ستبه‌سه‌ر بكه‌ن..."

بۆخارین، كه له‌و كاتدا یه‌كێك بوو له ئه‌ندامانی كۆمیته‌ی ناوه‌ندیی حیزبــی بۆلشــه‌ڤیك ده‌ڵێ:"راوێژی زۆر توندی نامه‌كه‌ی لینین هــه‌مووانی راچــڵه‌كاند... لیــنین لــه‌و نامه‌یــه‌دا بــۆ یه‌كه‌مجار به بێ سه‌رنجدان به فه‌رمانه‌كانی ئه‌و، هه‌ڕه‌شه‌ی سزادانی له ئێمــه كردبــوو. تــه‌واوی ئه‌ندامانی كۆمیته‌ی ناوه‌ندی ته‌نانه‌ت ئه‌وانه‌ش، كه چاوبه‌ستراوانه وه‌شوێن لینین كه‌وتبوون، به راوێژی توندی نامه‌كه‌ی تووڕه بوون و بۆ یه‌كه‌مین جــار (و دوایــین جــار) كۆمیتــه‌ی ناوه‌نــدیی

حیزب یەکدەنگ بیر و رای لیـنینی رەت کـردەوە و نامەکـەی ئـەوی بـە ئارشـیڤ ئەسـپارد. هەروەها ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بڕیاریان دا، نێوەڕۆکی نامەکەی لینین ئاشکرا نـەکرێ و ئیتر ئەو رووداوە بۆ ماوەیەکی زۆر بە نهێنی مایەوە.

لینین دیسانیش زۆری نامە بۆ رێبەرانی حیزب لە پێترۆگراد و مۆسکۆ ناردن و ئەو جارەیان وردەکارییەکانی گەڵاڵەی راپەڕینێکی گشتیی بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسـەڵات هێنایـە گـۆڕێ. لەو نامانەدا نووسرابوون:

" جا ئێستا، کە زۆرینەی ئەنجوومـەنی نوێنـەرانی کرێکـاران و سـەربازان لـە مۆسـکۆ و پێترۆگراد کەوتووەتە دەستی بۆلشەڤیکەکان شك و گومـان لـە بەدەسـتەوە گـرتنی دەسـەڵاتی حکوومەتدا، پاساو هەڵناگرێ .

بۆ دەبێ هەر ئێستا هەنگاو بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات هەڵنەگرین؟

لەبەر ئەوەی کە ئەگەر زەمان تێپەڕی و کێرێنسـکی هێزەکـانی سـوپا رێـكبخاتـەوە ئـیتر شانسی سەرکەوتنی ئێمە سەد ئەوەندە کەمتر دەبێتەوە...

ئێمە ناتوانین هەتا دامەزرانی پەرلمانی دامەزرێنەران راوەستین بە هیوای ئەوە بین، کە لـەو پەرلمانەدا ببین بە زۆرینە و لە رێگەی یاساوە بە دەسەڵات بگەین.

هیچ شۆڕشێك لەو جۆرە رێگەیانەوە بە ئاکام نەگەیشتووە. ئێمە دەبێ ئەوپەڕی کەڵك لـەو بارودۆخە شێواوەی ئێستاو نەبوونی رەزامەندیی گشتی بـۆ پـاوانکردنی دەسـەڵات وەرگـرین و ئەگەر ئەو هەلە لە دەست بدەین مێژوو لێمـان خـۆش نـابێ... رەوشـی نێودەوڵـەتی و واژۆی پەیمانی نێوان بەریتانیا و ئەڵمانیاش بە قازانجی ئێمەیە، لەوەها هەلومەرجێکدا ئێمەش دەبـێ بە پێداگری و سووربوون لە سەری، دروشمی ئاشتی بدەین و خەڵکی لەشەڕ ماندووی هیوابڕاو لە سەرکەوتن وەدووی خۆمان بدەین...

بەڵام بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لە رێگەی شۆڕشەوە خۆی هونەرێکە، کـە دەبـێ بـە لێزانـی و وردبینییەوە گەڵاڵەکەی داڕێژرێ، مەرجی یەکەم ئەوەیە، کە حەرەکەتەکە، کتوپڕ و لە نەکاودا بکرێ و هاوکات لە مۆسکۆ و پێترۆگراددا دەست پێبکرێ. دووەم ئەوەی کە سات بە ساتی ئەو بەرنامەیـە گرینگیی خۆی هەیە و یەك جووڵەی هەڵە و کەمتەرخەمییەك لەوانەیە هـەموو ریسـەکان بکاتـەوە خوری... دەبێ ناوەندێکی کار راپەڕاندن بـۆ هاوئاهـەنگکردنی بەرنامـەکانی خۆتـان پێـك بێـنن و هێزەکانی خۆتان بۆ مەئموورییەتی دەسنیشانکراو و گرتنی شـوێنە هەسـتیارەکان دابـەش بەکـەن. دەبێ دەستبەسەرکردنی ئەندامانی دەوڵەت و فەرمانـدەرانی سـوپا و گـرتنی قـەڵاکانی سـەنپێتر و

سەنپۆل و گەمارۆی ئامفیتئاتری(هۆڵی شانۆ) ی ئالیکساندریسکی و دەسبەسەرداگرتنی ناوەندی تەلەفۆن، وەپێش هەموو کارەکان بخرێن. ناوەندی فەرماندەیی دەبێ لە سانترال تەلەفۆن دامەزرێن و لەو شوێنەوە لەگەڵ تەواوی کارخانە و ناوەندگەلی سەربازی و ئەو شوێنانەی، کە هێزەکانی ئێمەی تێدا دامەزراون لە پێوەندیی بەردەوامدا بن...

لەو رۆژانەدا، کە لینین بەو متمانەبەخۆییەوە بەمەبەستی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، خەریکی دارشتنی گەڵاڵەی راپەرینێکی چەکدارانە بوو، دەوڵەتی کاتی ئامادەکاریی بۆ پێك هێنانی پەرلمانی دامەزراوانی دەکرد. رۆژی هەشتەمی ئۆکتۆبەر دەوڵەتی کاتی بۆ دوایین جار رێکخرایەوە و وەزیرگەلی سەر بە تەواوی حیزبە سۆسیالیست و لیبرالەکان تێیدا بەشدار بوون، تەنیا بۆلشەڤیکەکان لە دەرەوەی کابینە و وەکو تاقانە هێزی رێکخراوی ئۆپۆزیسیۆنی دەوڵەت مابوونەوە.

ئەو رۆژەی کێرێنسکی دوایین گۆرانکارییەکانی لە کابینەکەی خۆیدا پێك هێنا بۆلشەڤیکەکان بە هەڵبژاردنی ترۆتسکی بۆ سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی کرێکاران و سەربازانی پێترۆگراد ملهوورییەکیان لە بەرامبەریدا نواند. کاتێك هەواڵی ئەو سەرکەوتنە بە لینین گەیشت بریاری دا خێرا بگەرێتەوە بۆ پێترۆگراد و داوای لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزب کرد، کە بۆ گەرانەوەی بۆ روسیا، کاردروستایی پێویستی بۆ بکات.

بەڵام کۆمیتەی ناوەندی لەوەها هەلومەرجێکدا گەرانەوەی ئەوی بە قازانج نەزانی.

کێرێنسکی بریاری دا سەر لە نوێ کۆنگرەی نوێنەرانی ئەنجوومەنەکانی سەرانسەری روسیا بگرێتەوە و رۆڵی پەرلمانی کاتییان پێ بدات. لینین لە نامەیەکدا، لە رێکەوتی 12ی ئۆکتۆبەری1917 بۆ کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیکی نووسی، کە چیتر چاوەرێی گیرانی ئەم کۆنگرەیە نەبن و هەتا زووە راپەرینێکی چەکداری وەرێبخەن. لینین لەو نامەیەدا پێی لە سەر ئەوە داگرتەوە، کە دەبێ لە پێشدا کێرێنسکی لە سەر کار لابەرین ئەوجار کۆنگرە بگرین.

لینین هەر لەو نامەیەدا دەنووسێ:" چەند حەوتوویەك سەبرگرتن بۆ پێکهاتنی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان بەو هیوایەی کەببینە زۆرینە شتێکی مەسخەرە و گاڵتەجارە. ئێمە بۆمان نییە حەوتوویەك و تەنانەت تاقە ساتێکیش لە دەست بدەین." لینین ئەوجار هۆکار و لایەنەکانی سەرکەوتنی راپەرینی چەکدارانە شی دەکاتەوە و ئاوا لە سەر ی دەروا:

"بەو هۆیانەی خوارەوە سەرکەوتنی راپەڕینی چەکدارانە لە هەلومەرجی ئێستادا گـەرەنتی دەکریٚ: 1ـ ئێمە بەو هێزانەی لەبەردەستمان دان هاوکات دەتوانین لـە سـێ شـوێنەوە هێـرش بەرین و پێترۆگراد و مۆسکۆ و دەریای بالتیك ئەوا هێزەکانیان لەبەر دەستی ئێمە دان و لەگەڵ ئێمەن.2ـ دەتوانین در وشمگەلێکی وا هەڵگرین، کە خەڵك بەرەو لای ئێمە راکێشـن بـۆ وێنـە دروشمی ئاشتیخوازانە یا دروشمگەلێکی لە گوێن: مەرگ و نەمان بۆ دەوڵەتێك، کـە راپـەڕینی وەرزێران لە دژی ئاغاوەتان سەرکوت دەکات.3ـ زۆرینەی خەڵك نـاڕازین کـەوابوو پشـتیوانی ئێمەن.

4ـ رێکخراوی مەنشەڤیك و سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان سەریان لێشێواوە و ناتوانن شـان لە شانی ئێمە بدەن. 5ـ ئێمە توانای پێویستمان هەیە بۆ ئەوەی دەسبەسەر مۆسکۆدا بگرین و هەرەسی مۆسکۆ ورەی دەوڵەتی کاتی وا دەشکێنیٚ نەتوانیٚ بەرگری لە پێترۆگراد بکـات. 6ـ لە پێترۆگراد ئێمە دەتوانین هەزاران کرێکـار و سـەرباز تـەیار بکـەین و دەسبەسـەر کۆشـکی زستانی و ناوەندی سوپا و تەلەگراف و تەلەفۆنخانە و چاپخانەکاندا بگرین. پـاپۆڕی بـالتیکیش بۆ گرتنی پێترۆگراد یارمەتیدەرمان دەبیٚ..."

لینین لە مانگی ئۆکتۆبەردا نامەکەی خۆی لە ژێر نـاوی" ئـاخۆ بۆلشـەڤیکەکان دەتـوانن حکوومەت بۆ خۆیان بپارێزن؟ " تەواو کرد. ئیتر بەدەستەوەگرتنی حکوومەت بە لای لینینەوە گرینگ نەبوو بەڵکو پاراستنەکەی گرینگ بوو.

بۆلشەڤیکەکان سەرەڕای گوشار و پێـداگریی لیـنین نـەیانتوانی بـەر لـە پێکهـاتنی کـۆنگرەی سەرانسەریی ئەنجوومەنەکانی روسیا، راپەڕینێکی چەکداری وەڕیٚ بخەن. کۆنگرە، کـە ئـەم جارەیـان ناوی پەرلمانێکی بەرایی هەبوو رۆژی بیست و یەکەمی ئۆکتۆبەر کرایەوە. لە سـەر پێـداگریی لیـنین نوێنەرانی بۆلشەڤیکی پاش بەشداربوون لە رێوڕەسمی کردنەوەیدا بایکۆتیان کرد و پـاش راگەیانـدنی ئەو بابەتە لە لایەن ترۆتسکییەوە کۆبوونەوەکەیان بەجیٚ هێشت: ترۆتسکی لە قسەکانیدا لە زمـانی نوێنەرانی بۆلشەڤیکەکانەوە گوتی:" گرتنی ئەو کۆبوونەوەیە پیلانێکە لە لایـەن بۆرژۆوازییـەوە بـۆ لەباربردنی پـەرلمانی دامەزرێنـەران... ئێمـەی بۆلشـەڤیك ئامـادە نـیین هاوکـاریی ئـەو دەوڵەتـە خەیانەتکارە بکەین..." قسەکانی ترۆتسکی هات و هەرایەکی سەیری خستە نێو کۆبوونەوەکـەوە و ترۆتسکی بە درووشمی "بژی پەرلمانی دامەزرێنەران، کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێنا.

لینین لە لایەکی دیکەشەوە راسـتەوخۆ پێوەنـدیی بـە کۆمیتـەکانی حیزبیـی نێـو هێـزە چەکدارییەکانەوە(سەربازان) گرتبوو و بۆ وەڕێخستنی راپەڕینێکی چەکدارانە هـانی دەدان. لـە

نامەیەکــدا بــۆ سمیلگــاsmilgaی ســەرۆکی کۆمیتــەی ناوچــەیی ســەربازان، لیــنین پێدادەگرێتەوە:"ئەگەر بمانە وێ پشت بەو ئەنجوومەنە بێ هێز و دەسەڵات و بەو بڕیارنامــە بــێ گەرەنتییانە ببەستین دەیــدۆڕێنین." و ئــەوجار دەچــێتە ســەر روونکردنــەوەی وردەکارییــەکانی رێکخراوەیی یەکە سەربازییەکان و بزاوتی ئەو هێزانــەی لــە فەنلانــد دەمــەزرابوون و هێرشــی پاپۆڕیی شەڕیی نێو بالتیك و وەکو فەرماندەیەکی سەربازی گەڵاڵەیەکی گشتی گەمارۆدانەکــە و گرتنی پێترۆگراد دەخاتە روو.

لینین بە یارمەتیی کەسانی سمیلگا لە نێو سوپاو لە سەر شوێنی پاسەوانیی سنووری، رۆژی بیست و دووەم ی ئۆکتۆبەر لە سنوور پەڕییەوە و گەیشتەوە پێترۆگراد. رێبەرانی بۆلشەڤیك بە بیستنی هەواڵێبوونی لینین لە پێترۆگراد سەریان سووڕماو تەنیا پێشنیارێکی، کــە دەیــانتوانی لەو هەلومەرجەدا بە لینینی بکەن ئەوە بوو، کە جارێ خۆی دەرنەخاو بێجگــە لــە ئەنــدامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و بنەماڵەکەی با کەس نەزانێ لە پایتەختە.

# 6

لینین لەگەڵ گەیشتنەوەی بۆ پێترۆگراد کەوتە تەدارەکی وەڕێخســتنی راپــەڕینێکی چــەکدارانە. رۆژی بیست و سێیەمی ئۆکتۆبەری 1917 کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك بە سەرۆکایەتیی لینین کۆبوونەوەیەکی گرت. لینین لەو کۆبوونەوەیەدا پێی لە سەر ئەوەداگرتەوە، کــە نــابێ چــاوەڕێی پێکهاتنی پەرلمانی دامەزرێنەران بن، چونکی ئەو پێی وابــوو لــەبارترین هەلومــەرج و دەرفــەت لــە رووی نێونەتەوەیی و نێوخۆییەوە بۆ راپەڕینێکی چەکدارانە رەخسابوو و هەرچەشنە خۆ خافڵانــدنێك شانسی سەرکەوتن لە داهاتوودا کەم دەکاتەوە. هێندێك لــە ئەنــدامانی کۆمیتــەی ناوەنــدی پێیــان وابوو هێشتا توانای پێویستیان بۆ وەڕێخستنی راپەڕینێکی چەکدارانە نییە، بەڵام لینین لــە وەڵامــی ئەواندا بەڵگــەی دێنایــەوە، کــە ئەگــەر بۆلشــەڤیکەکان لــەو ئــاڵۆزی و پشــێوییەی ئێســتاو لــەو ئامادەییەی کرێکاران و سەربازان بۆ وەڕێخســتنی راپــەڕینێکی چــەکدارانە کــەڵك وەرنــەگرن ئــەوا حکوومەتی کێرێنســکی وردە وردە هێزەکــانی و پێگــە و کۆڵەکــەکانی خــۆی پتــەوو و بــە هێزتــر دەکاتەوە و ئەگەری سەرکەوتنی شۆڕش بە تەواوی لە نێو دەچێ.

کۆبوونەوەکە هەتا بەیانیی خایاند و سەرەنجام زۆرینەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب ملیان بۆ بۆچوونەکانی لینین ڕاکێشا. ترۆتسکی لە بیرەوەرییەکانیدا ئاوا لە سەر ئەو کۆبوونەوەیە دەنووسیٚ:"کاتێك لینین دڵنیا بوو لەوەیکە زۆرینە لەگەڵی هاوڕایە لاپەڕەیەکی لە دەفتەری نووسینەوەی منداڵەکان لێکردەوە و لە سەر ی نووسیی(حیزب تەواوی هێزەکانی ژێر فەرمانی خۆی بانگهێشت دەکا بۆ وەڕێخستنی ڕاپەڕینێکی چەکدارانە) و دەنگی بۆ وەرگرت. پێشنیارەکە بە زۆرینەی دەنگ، واتە بە دە دەنگ زیاترەوە لە بەرامبەر دوو دەنگی نارازیدا پەسند کراو لینین لەرێوە دەستی کرد بە دابەشینی ئەرك و بەرپرسیارەتییەکان و ڕێکخستنی ڕاپەڕینێکی چەکدارانە."

چەند ڕۆژ دواتر لینین لە بڕیارنامەیەکدا بۆ کۆمیتەکانی حیزبی لە سەرانسەری روسیایدا نووسی:" خۆ خافڵاندن و وەدرەنگی خستنی دەستپێکردنی ڕاپەڕینێکی چەکداری لەو هەلومەرجەدا جەنایەتە... زۆرینەی کرێکاران و هێزە چەکدارەکان لەگەڵ ئێمەن...هەلومەرجی تالەباری ژیان لە ئاواییەکاندا و گوشاری زۆر بۆ سەر وەرزێران ڕەوشێکی وای خوڵقاندووە، کە خەریکە دەتەقێتەوە... هەلومەرجی نێونەتەوەییش لە هەموو بارێکەوە لەبارە و ئەڵمانیاش لەبەردەم سەرهەڵدان و شۆڕش دایە.... ئەگەر ئێمە هەل و دەرفەت لە دەست نەدین و لە روسیادا دەسەڵات بەدەستەوە بگرین بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە سەرانسەری جیهاندا سەردەکەون، ئەگینا هێزە ئیمپریالیستەکان لە سەرانسەری جیهاندا یە دژی ئێمە یەك دەگرن..."

لە لایەکی دیکەوە لینین دروشمگەلێکی بۆ هەڵفریواندنی کرێکاران و وەرزێران و چینی نێونجی و ڕۆشنبیران هێنایە گۆڕیٚ. درووشمەکانی بۆلشەڤیکەکان لە سەر وبەندی ڕاپەڕیندا بە کورتی بریتی بوون لە: ئەگەر کێرێنسکی لیٚ بکەوی و بۆلشەڤیکەکان بێنە سەرکار، کارخانەکان دەدرێنە دەستی کرێکاران و زەوی و زار بەسەر وەرزێراندا دابەش دەکرێن و ئازادییە دیموکراتییەکان سەقامگیر دەبن و شەڕ کۆتایی پیٚ دێت و کەموکووڕییەکان تەواو دەبن.

لە بەڕێوەبردنی ڕاپەڕینە چەکدارییەکەدا ترۆتسکی ڕۆڵی یەکەمی لە سەر شان بوو. ئەو وەکو سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازانی پێترۆگراد "کۆمیتەیەکی شۆڕشڤانی"ی لە بۆلشەڤیکەکانی ئەندامی ئەنجوومەن پێك هێنا و بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات گەڵاڵەی کودەتایەکی لە پێترۆگراد داڕشت. ڕۆژی پێنجەمی نۆڤەمبەر کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك یەکەمین مەکتەبی سیاسیی خۆی، کە حەوت کەسی ئەندام بوون هەڵبژارد. ئەرکی گشتیی ئەو دەفتەری سیاسییە چاوەڕەوانیکردن بوو، بەسەر بەڕێوەچوونی پلانی ڕاپەڕینە چەکدارییەکەدا، بەڵام

ڕێبەرایەتیی ڕاستەقینەی سەرهەڵدانەکە لە ئەستۆی کۆمیتەی سەربازیی شۆڕشگێڕیی بوو و بەر لە پێکهاتنی دەفتەری سیاسیی حیزب ئامادەکاریی بۆ ئیشەکە کردبوو.

ڕۆژی سێیەمی نۆڤەمبەر کۆمیتەی سەربازیی شۆڕشگێڕی، وردەکاریی گەڵاڵەی ڕاپەڕینە چەکدارییەکەی داڕشت و لە هەرکام لە نێو یەکە سەربازییەکانی پێترۆگرادا نوێنەر یان کۆمیسێرێکی دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی فەرمانی کۆمیتە بە یەکەی پێوەندیدار ڕابگەیەنێ و ڕاپەڕینەکی ڕێکوپێك و هاوئاهەنگ ڕێك بخەن. بە هەموو یەکە سەربازییەکان ڕاگەیەندرا، کە لەمەو دوا تەنیا بە فەرمانی کۆمیتەی سەربازیی شۆڕشگێڕی بجوولێنەوە و هەر فەرمانێکی تر دژە شۆڕش و بێ بنەمایە. لەگەڵ بەڕێوەچوونی ئەو فەرمانە و سەرپێچیی هێندێ یەکەی سەربازیی پێترۆگراد لە بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی دەوڵەتی کاتی، تێکهەڵچوونی بۆلشەڤیکەکان و دەوڵەت بوو بە شتێکی ئاشکرا و جیددی.

ڕۆژی شەشەمی نۆڤەمبەر لینین لە نامەیەکدا بۆ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیکی نووسی:"گەڵاڵەی ڕاپەڕینی چەکداریی دەبێ بەبێ ئەملاوئەولا هەر ئەمڕۆ یان ئەمشەو بەڕێوە بچێ. ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ دەست بەکار بین سەرکەوتنمان مسۆگەرە، بەڵام ئەگەر بیخەینە سبەی لەوانەیە هەمووشتێك بدۆڕێنین، و مێژوو قەت لەو هەڵە و خەمساردییەمان خۆش نابێ.

پێکهاتنی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنەکان لە ڕۆژی حەوتەمی نۆڤەمبەردا لەوانەیە کۆسپێکی تازە بخاتە سەر ڕێگەی سەرکەوتنی ڕاپەڕینە چەکدارییەکە. ئێمە نابێ چاوەڕوانی پێکهاتنی ئەو کۆبوونەوەیە و ڕای نوێنەرەکانی بین، ئێمە دەبێ بە تۆبزی قسەی خۆمان بەرینە سەر، نوێنەرانی کۆنگرەش پاش سەرکەوتنی ڕاپەڕینەکە خۆیان وەدوومان دەکەون...

لینین لە هەڵسەنگاندنی هێزەکان و سەرکوتنی بۆلشەڤیکەکاندا حەقی بەدەست بوو، تاقیکردنەوەی دەسەڵات لە مەودای نێوان سێیەم هەتا پێنجەمی نۆڤەمبەردا دەریخست، کە دەوڵەتی کاتی لە پایتەخت هێزێکی کەمی لەبەر دەست دایە و ئەگەر بەسەریدا بدەن ناتوانێ لە شوێنەکانی دیکەوە داوای هێزی یارمەتیدەر بکا. کۆمیتەی سەربازیی شۆڕشگێڕی، لە سەر پێداگری و پێ چەقاندنی لینین ڕێکەوتی شەوی شەشەمی نۆڤەمبەر و سەر لە بەیانیی ڕۆژی حەوتەمی نۆڤەمبەری بۆ بەڕێوەچوونی کۆدەتا و ڕاپەڕینە چەکدارییەکە دەستنیشان کرد. یەکەم قۆناغ، گرتنی کۆشکی زستانی و دەسبەسەرکردنی ئەندامانی دەوڵەتی کاتی بوو، ئەگەر هێزەکانی کۆشك بەربەرەکانێیان کردبا هێزی دەریایی "ئاورۆرا" کۆشکی وەبەر تۆپ دەدا و ئەو هێزانەی لە شوێنە سەربازییە قایمەکانی سەنپیتێر و سەنپۆل دامەزرابوون ئەوا هێرشیان دێنایە سەر کۆشك.

لە کۆبوونەوەی ڕۆژی شەشەمی نۆڤەمبەری کۆمیتەی سەربازیی شۆڕشگێڕیدا بڕیار درا، کە بەر لە هێرش بۆ سەر کۆشکی زستانی چەند نوێنەرێك لە لایەن کۆمیتەوە بنێردرێنە کۆشك و داوا لە ئەندامانی دەوڵەتی کاتی بکەن، کە خۆ بەدەستەوە بدەن و فەرمان بدەن هێزەکانی نێو کۆشك چەکەکانیان دانێن و بۆ ئەو فەرمانەش بیست دەقیقە کات دیاری بکەن. پاش تەواوبوونی کاتی دیاریکراو ئەگەر بەربەرەکانییەك کرابا ئەوا هێزی دەریایی ئاورۆوا کۆشکی تۆپباران دەکرد و مەلەوانەکان لە لێواری کۆشکەکە دادەبەزین و گاردی سوور هێرشی دەرکردە سەر کۆشك.

بەیانێی ڕۆژی شەشەم کێرێنسکی ڕایگەیاند، کە زانیاریی باوەڕپێکراوی لە سەر پلانی وەڕێخستنی ڕاپەڕینێکی چەکداری لە لایەن لینین و بۆلشەڤیکەکانەوە، وەدەست هێناوە. ئەو بە نوێنەرانی حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی گوت، کە دەوڵەت خۆی بۆ بەرەوڕوو بوونەوە لەکەڵ ئەو پیلانە ریکخستووە، بەڵام بۆ نەهێشتنی ئەو مەترسییەی لە پێشمانە دەبێ تەواوی ئەو حیزب و لایەنە سیاسیانەی بۆلشەڤیك نین هاوکاریی دەوڵەت بکەن. کێرێنسکی داوای لە پەرلمانی کاتی، کە لە سەر وبەندی پێکهاتنی دووەمین کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا خەریك بوو کۆتایی پێ بێ، کرد، کە لەو هەلومەرجە نالەبار و قەیراناوییەدا پشتیوانی لە دەوڵەت بکا.

بەڵام کێرێنسکی زۆر درەنگ وەخۆ کەوتبوو و سەرلە بەیانیی ڕۆژی حەوتەمی نۆڤەمبەر بەر لەوەی دەوڵەت بتوانێ خۆی بۆ بەرپەرچدانەوەی پیلانەکانی لینین ئامادە بکا شۆڕشی بۆلشەڤیکی لە پێترۆگراد دەستی پێکرد. لە یەکەمین قۆناغی هەڵمەتدا هێزەکانی گاردی سوور، ناوەندی تەلەفۆنخانە و و تەلەگراف و بینای پۆستە و دایرەکانی تری دەوڵەتیان گرت. چەکدارانی بۆلشەڤیکی هاوکات لەگەڵ ئەو هەڵمەتەدا، کۆشکی زستانی(بارەگای دەوڵەتی کاتی) و ناوەندی ناوچەیی سەربازیی پێترۆگرادیان گەمارۆدا و، ئاڵقەی گەمارۆ بە پێی بەرنامەی پێشبینی کراو هەر دەهات و بەرتەسکتر دەبۆوە. کێرێنسکی لەگەڵ دەستپێکردنی هەڵمەتی گاردی سوور و بەر لە گەمارۆدرانی کۆشکی زستانی خۆی گەیاندە ناوەندی ناوچەیی سەربازیی بۆ بەپەرچدانەوە و سەرکوتی ڕاپەڕین بە دەستی هێزە وەفادارەکانی دەوڵەت، تەگبیر و ڕای بە ئەفسەرەکان دەکرد، بەڵام ئەفسەرەکان وریایان کردەوە لەوەی، کە هێزەکانی قەزاق خۆیان لەو کێشەیە بواردووە و باقی هێزە وەفادارەکانی دەوڵەتیش توانای سەرکوتکردنیان نییە. تەنیا هیوایەك، کە مابوو هێزەکانی دەرەوەی پێترۆگراد و یارمەتی وەرگرتن لەو هێزانە

بووو، کە بەڕێی بەرەکانی شەڕ کرابوون. کێرێنسکی بڕیاری دا، خۆی بازنەی گەمارۆ بشـکێنی و بە مەبەستی چاوپێکەوتن لەگەڵ فەرماندەرانی هێزەکان لە پێترۆگراد وەدەرکـەوێ. هەڵبـەت ئەو کارە مەترسیی کوژران یا دەستبەسەرکرانی لە لایەن هێزە بۆلشەڤیکەکانەوە هەبوو، بـەڵام کێرێنسکی هیچ رۆچـنەی هیوایـەکی بـۆ نـەمابۆوە. کێرێنسـکی بـە ماشـێنێکی سـەربازیی سەرئاوڵا بە نێو هێزە چەکدارەکانی بۆلشەڤیکیدا تێپەڕی. بۆلشـەڤیکەکان وێـڕای ئـەوەی کـە ناسیبووشیانەوە، بەڵام پێشیان نەگرت، چونکی پێیان وابوو هەڵاتنی کێرێنسکی دەبێتـە هـۆی ئەوەی کە دەوڵەت خێراتر هەرەس بێنێ و بڕووخێ.

لینین لە بەیانیی رۆژی حەوتەمی نۆڤەمبـەرەوە لـە حەشـارگە هاتـە دەرێ و لـە سمـۆلنی smolnyرێبەریی هەڵمەتی وەئەستۆ گرتبوو. مەبەستی لینین ئەوە بوو، کە هەتا دوانیـوەڕۆی رۆژی حەوتەمی نۆڤەمبەر، کە قـەرار بـوو کۆبوونـەوەکانی دووەمـین کـۆنگرەی سەرانسـەریی ئەنجوومەنەکانی روسیا دەست بەکار بکا، کارەکان راپەڕیبێتن ونوێنەرانی کۆنگرە بەسەر "کاری لەکارترازاو"دا بکەون و هیچ چارەیەکیان جگە لە پشتڕاستکردنەوەی حکوومەتی نـوێ نـەبێ، بەڵام هەتا دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە کۆشکی زستانی هێشتا نەگیرابوو و خۆی بەدەستەوە نەدابوو و وەزیرەکانی کێرێنسکی دەستبەسەر نەکرابوون. هێزەکانی پارێزەری کۆشـکی زسـتانی هێشـتا ئامادە بوون، کە بەرپەرچی هێرشەکانی بۆلشەڤیکەکان بدەنەوە، چونکی هێشتا هیوادار بـوون بەوەی، کە هێزی یارمەتیدەر و پشتیوانیان دەگاتێ و دەتوانن شۆڕش تێكبشكێنن.

کاتژمێر حەوتی ئێوارێ لینین بڕیاری دا بەهـەر نرخێکـی بـووە کارەکـە تـەواو بکـاو داوای لـە ترۆتسکی کرد، کە هێرش بۆ سەر کۆشکی زستانی رێكبخا. کۆمیتەی سەربازیی شۆڕشگێری، هـەتا کاتژمێر هەشت، مۆڵەتی بە هێزە پارێزەرەکان دا، خۆیـان بەدەسـتەوە بـدەن. هێزەکـانی پاراسـتنی کۆشك گوێیان بەو ئولتیماتۆمە نەدا و کاتژمێر هەشت هێرشی بۆلشەڤیکەکان لـە هێـزی دەریـایی "ئاورۆرا"و لە شوێنە قایمەکانی سەنپۆل و سەنپیتێرەوە کۆشکیان دایە بەر رەهێڵەی تۆپ.

هێزەکانی پارێزەری کۆشك لە کاتژمێرێك زیاتر خۆیان رانەگرت و لەگەڵ خۆ بەدەستەوەدانی ئەوان، تەواوی وەزیرەکانی دەوڵەتی کاتی دەستبەسەر کران و لە دوو دەستەی لێك جـوێدا لـە دوو قەڵای سەربازیی سەنپۆل و سەنپیتێردا بەند کران.

کاتێك هەواڵی هەرەسی کۆشکی زستانی و دەستبەسەرکرانی ئەندامانی دەوڵـەت گەیشـتە سمۆلنی، لینین گوتی ئێستا کاتی ئەوە گەیشتووە، کە لە کۆبوونەوەی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا بەشداری بکەین. نوێنـەرانی کـۆنگرە لـە چـەند کاتـژمێر لـەوە پێشـەوە لـە هـۆڵی کـۆنگرە

کۆببوونەوە و بە دڵەڕاوکێوە چاوەڕێی یەکلابوونەوەی رەوشەکە بوون. بەو رەوشەی هاتبووە پێشێ هیچ گومانێك لەوەدا نەبوو، کە زۆرینە دەکەوێتە دەستی بۆلشەڤیکەکان، چونکی هەمیشە ژمارەیەکی زۆر هەن، کە لەگەڵ دەسەلأت و هەلومەرجی رۆژ دەکەون و لەگەڵ سەرکەوتنی بۆلشەڤیکەکان و رووخانی حکوومەتی کێرێنسکی زۆربەی ئەوانەی، کە لە کاتی ئاساییدا لایەنگری دەولەتی کاتی بوون ئەو جارەیان ملیان بۆ دەسەلأتی زاڵی رۆژ، واتە بۆلشەڤیکەکان رادەکێشا. کاتێك لینین هاتە نێو تەلاری کۆنگرەوە، دەنگی چەپڵە تەلاری وەلەرزین خست. نەك هەر بۆلشەڤیکەکان بەڵکو زۆربەی نوێنەرانی حیزب و لایەنە سیاسییەکانی دیکەش لەو هەست و کەفوکوڵ دەربڕینەدا بەشدار بوون و بگرە لە بۆلشەڤیکەکانیش توندتریان چەپڵە لێدەدا بۆ ئەوەی لە کاروانێ بەجێ نەمێنن و لە دلۆڤانیی دەسەلأتدارە نوێیەکان بێبەش نەبن.

کاتێك لینین چووە پشت تریبوون دەربڕینی هەستی سرووشتی یان بەرژەوەندخوازانەی نوێنەران بە تەوژمتر بوو. لینین لە تەواوی ئەو ماوەیەدا دەستی لە گیرفانی نابوو و سەری بەردابۆوە و چاوەڕێی کۆتایی چەپڵەڕێزان بوو. بە ئاماژەی ژمارەیەك لە رێبەرانی بۆلشەڤیك، کە لە پشتەسەرییەوە راوەستابوون چەپڵەڕێزان راوەستاو لینین سەری هەڵێنا و بەو شێوەیە دەستی بە قسان کرد:

"هاوڕێیان، ئەمڕۆ شۆڕشی روسیا بە ئاکام گەیشت و شۆڕشی کرێکاران و وەرزێران، کە زۆر جار بۆلشەڤیکەکان باسیان کردووە سەرکەوتووە.

مانای ئەو شۆڕشە چییە؟... ماناکەی ئەوەیە، کە لەمەو دوا حکوومەتێکمان دەبێ، کە لە نوێنەرانی تەواوی زەحمەتکێشان پێك هاتووە، دەوڵەتێکی شۆراییمان دەبێ، بە بێ ئەوەی کە بۆرژۆوایی بچووکترین رۆڵێکی تێیدا هەبێ. جەماوەری بێ بەش خۆیان دەوڵەتێکیان بۆ خۆیان دەبێ. مەکینەی حکوومەتیی پێشوو لە نێو دەچی و بە جێگەی ئەو مەکینەیەکی نوێ لە سەر بنەمای ئەنجوومەنەکان (ئەنجوومەنەکان) پێك دێ. لەو رۆوە لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی روسیا هەڵدەدرێتەوە و شۆڕشی سێیەمی ئێمە پێشەکییەکە بۆ شۆڕشێکی جیهانی و سەرکەوتنی سۆسیالیزم.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، کە ئێمە بە هۆگری و ماندوویی نەناسانە بینای یەکەمین حکوومەتی پرۆلتاریایی جیهان دابڕێژین و نموونەیەك بۆ شۆڕشی پرۆلتاریایی لە جیهاندا دروست بکەین..."

بەو شێوەیە لینین بەوپەڕی لێزانییەوە حکوومەتی بۆلشەڤیکیی خۆی ناونا حکوومەتی ئەنجوومەنەکان و لە کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان داوای نواند، کە مەبەستی ئەوان لە ڕاپەڕینی چەکدارانە ئەوە بووە، کە دەسەڵاتی حکوومەت بدەنە دەستی ئەنجوومەنەکان. بەو قسەیە ئەو بەشەش لە نوێنەرانی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان، کە دوودڵ و دڕدۆنگ بوون لەوەیکە پشتیوانی لە حکوومەتی نوێ بکەن یان نەیکەن کەوتنە گەڵ لایەنگرانی دەسەڵاتدارە نوێ و کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان بە کردەوە کەوتە دەستی لینین. لە کۆی نوێنەرانی کۆنگرە نزیکەی سەد کەسێك، کە لە دژبەرانی کۆن و ناسراوی بۆلشەڤیکەکان بوون پێکهاتنی کۆنگرەیان لە هەلومەرجی نائاسایی و لە ژێر گوشاری بۆلشەڤیکەکاندا بە شتێکی نایاسایی و بێ بایەخ دانا و کۆبوونەوەیان بە جێ هێشت، بەڵام بە هۆیبوونی زۆرینەی لایەنگران یا خوازیارانی بۆلشەڤیکەکان هەڵوێستەکەی ئەوان بێ ئاکام بوو و بە پێچەوانەوە شانسی هەرچەشنە بەربەرەکانێیەکی لەگەڵ بۆلشەڤیکەکان لەبار برد و کۆنگرەی بە تەواوی دایە دەستی ئەوان.

کۆبوونەوەی کۆنگرە هەتا کاتژمێر شەشی بەیانیی ڕۆژی هەشتەمی نۆڤەمبەر درێژەی کێشا قسەکەران یەك لە دوای یەك چوونە پشت تریبوون و هەرکام لەوی پێش خۆی خەستتر بە بەژن و باڵای شۆڕشی نوێ و ڕێبەرەکانی هەڵدەگوت. نوێنەرانی کۆنگرە لەوەیکە دەسەڵاتی حکوومەت دراوەتە دەست ئەنجوومەنمان واتە دەست خۆیان، شاد و بە کەیف بوون و لە بڕیارنامەیەكدا، کە هەر لەو کۆبوونەوەیەدا لە لایەن کۆنگرەوە پەسند کرا جەخت لە سەر ئەوە کرایەوەکە :" حکوومەتی ئەنجوومەنەکان ئاشتی بۆ وڵات بە دیاری دێنێ، زەوییەکان دەبەردەستی وەرزێران دەنێ و کارخانەکان دەداتە دەستی کرێکاران و سەربازخانەش بە سەربازان دەسپێرێ، کەموکووڕییەکان چارەسەر دەکا و بە خێرایی پەرلمانی دامەزرێنەران پێك دێنی و لە یاسای بنەڕەتیی نوێی وڵاتدا ڕێز لە مافی نەتەوەکان دەگرێ".

# بەشی سێیەم

# حکوومەتی لینین

رۆژی هەشـــتەمی نۆڤەمبـــەری ســـاڵی 1917 رۆژی دەســـتپێکی حکوومـــەتی بۆلشەڤیکییە لە روسیا. لینین پاش کۆتایی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان سەر لـە بـەیانیی رۆژی هەشتەمی مارس چووە ماڵی یەکێك لە لایەنگرەکانی بۆ ئـەوەی پشـوویەك بـدا، بەڵام لە خۆشیی سەرکەوتن خەوی لێنەکەوت و لە سەر قەرەوێڵەکەی خۆی دەستی کـرد بە رێکـوپێککردنی یادداشـتگەلێك، کـە یەکـەمین بەرنامـەی بنـەڕەتیی حکوومـەتی کۆمۆنیستیی جیهانی لە خۆ دەگرت.

یەکەم کەسێك، کە بەیانیی ئەو رۆژە چاوی بە لینین کـەوت ترۆتسـکی بـوو. لیـنین باسـی بەرنامە و یادداشتەکانی خۆی بۆ کردەوە، کە بەر لە هەر شتێك دەبێ شێوەی حکوومەتی نوێ دیاری بکرێ و دەوڵەتێکی نوێ دەسەڵات بەدەستەوە بگرێ. لینین بە پێی قسـەکانی خـۆی لـە کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا خوازیاری گۆڕانێکی بنەڕەتیی لە دەوڵەتـدا بـوو، بـەڵام ترۆتسـکی بەڵگەیهێنانەوە، کە گۆڕینی فۆرمی بنەڕەتیی دەوڵەت پێویستیی بە کـات و دەرفـەتی زۆرە و جارێ دەبێ بەرپرسی نوێ بۆ سەرۆکایەتیی وەزارەتخانە و رێکخراوە دەوڵەتییەکان دیاری بکرێن بۆ ئەوەی کاروبارەکان لێك نەترازێن. لیـنین گـوتی ئەنـدامانی دەوڵـەتی لانیکـەم نـابێ ئـەو ناووناوبانگانەی پێشوویان بەسەرەوە بێ، من لە ناوی وەزیـر بێـزارم. ترۆتسـکی گـوتی چـۆنە ناویان بنێین کۆمیسێر؟، بەڵام کۆمیسێرمان زۆرن. چۆنە پێیان بڵێین کۆمیسـێری بـاڵا؟ لیـنین گوتی خۆشیم لە نازناوی باڵاش نایە. ترۆتسکی گوتی کۆمیسـێری گـەل چـۆنە؟ لیـنین گـوتی خراپ نییە زۆریش باشە، ئەدی دەوڵەتەکەمان ناوبنێین چی؟"

ترۆتسکی پێشنیاری کرد، کە بە جێگەی دەوڵەت ناوی بنێن شورا(ئەنجوومەن).

لینین وشەکانی ریزکردن" ئەنجوومەنی کۆمیسێری گەل".. و گوتی زۆر باشە. هەر ئەو ناوە هەڵدەبژێرین، کە رەنگ و بۆنی شۆڕشگێڕیشی لێوە دێ.

ئەندامانی یەکەمین حکوومەتی بۆلشەڤیکی یا "ئەنجوومەنی کۆمیسێرەکانی گەل" هەتا رۆژی هەشتەمی نۆڤەمبەر دیاری کران و ئەرك و بەرپرسیارەتییەکانی ئەو حکوومەتە لە کۆبوونەوەی هەشتەمی نۆڤەمبەری کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا بەو شێوەیە پەسند کران:

کۆنگرەی سەرانسەریی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان و وەرزێران رایدەگەیەنێ کە: هەتا پەرلمانی دامەزرێنەران پێك دێ و ئەو رێوشوێنانەی یاسای بنەڕەتی دیارییان دەکا دەوڵەتێکی کاتیی کرێکاران و وەرزێران بە ناوی "ئەنجوومەنی کۆمیسێرەکانی گەل" بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات دادەمەزرێ. بەڕێوەبەریی بەشە جۆراوجۆرەکانی نێوخۆی وڵات لە ئەستۆی کۆمیسێرە پێوەندیدارەکان دەبێ ئەندامانی ئەو کۆمیسێرانەش، کە بە یارمەتیی کۆمیتە و رێکخراوە کرێکاری و وەرزێری و سەربازییەکان هەڵدەبژێردرێن لە سەریانە لە ژێر چاوەدێریی بەرپرسانی پێوەندیداردا ئەو بەرنامانە بەڕێوەبەرن، کە کۆنگرە دایڕشتوون.

سەرۆکی گشتیی کۆمیسارییای گەل، کە لە لایەن کۆنگرەوە دیاری دەکرێ لە رێکخستنی کاروبارەکاندا تەواو سەربەست و دەست ئاوەڵایە. کۆنگرەی نوێنەرانی ئەنجوومەنەکانی کرێکاران و سەربازان و وەرزێران و دەستەی بەڕێوەبەرییەکەی مافی چاوەدێریی بەسەر کاروباری ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەل و گۆڕینی ئەندامەکانی هەیە.

سەرۆك و ئەندامانی یەکەمین ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەل بەو شێوەیەی خوارەوە دیاری دەکرێن:

**سەرۆکی ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەل_ڤیلادیمیر ئۆلیانۆف(لینین)**
**کۆمیسێری کاروباری نێوخۆ_ریکۆڤ**
**کۆمیسێری کاروباری دەرەوە_رۆنشتاین(ترۆتسکی)**
**کۆمیسێری کاروباری کشتوکاڵ_میلیوتین**
**کۆمیسێری کاروباری کرێکاری_شلیپانیکۆڤ**
**کۆمیسێری بازرگانی و پیشەسازی_نۆگین**
**کۆمیسێری پەروەردە_لۆناچارسکی**
**کۆمیسێری کاروباری ئابووری و دارایی_ سێتپانۆڤ**

**کۆمیسێری دادوەری_ ئۆپۆگۆڤ**
**کۆمیسێری خزمەتگوزاری_تیۆدۆرۆڤیچ**
**کۆمیسێری پۆستە و پێوەندییەکان_ئادیلۆڤ**
**کۆمیسێری کاروباری نەتەوەکان_جۆگاشڤیللی(ستالین)**

جارێ بۆ بەڕێوەبەریی کاوباری سوپاو هێزی دەریایی کۆمیتەیەکی سێ کەسی لە(ئانتۆنۆڤ - ئۆسنکۆ_ کریلنکۆ و دیبنکۆ) پێکدێ، کە بەشێوەی هاوبەش ئەرکەکانی کۆمیسارییای شەڕ بەڕێوە دەبەن.

لینین پاش بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات و پێك هێنانی دەوڵەت زۆری گرینگی بە کرنگرەی ئەنجوومەنەکان نەدەداو تەنانەت لە سەر گرنگترین پرسی رۆژی روسیاش، واتە مەسەلەی شەڕ بە بێ راوێژکردن لەگەڵ کۆنگرە خۆی هاتە مەیدان.

راوێژکارانی نزیکی لینین لە کاروباری سەربازی و مەسەلەی شەڕدا، بێجگە لە کریلێنکۆ، کە سەرۆکایەتیی کۆمیتەی کۆمیسارییای شەڕی لە ئەستۆ بوو ستالین و ترۆتسکیش بوون. یەکەمین هەنگاو سەبارەت بە شەڕ دەرکردنی فەرمانێك بوو بۆ هێزەکانی روسیا لە بەرەکاندا، کە هەوڵ بدەن پێوەندییەکی دۆستانە لەگەڵ هێزە ئەڵمانییەکاندا بگرن و بە ناردنی نوێنەرگەلێك بۆ دانوستان لەگەڵیان، حاڵەتێکی تەواوکردنی دوژمنایەتی دروست بکەن، بەڵام گرفتی کار لەوەدا بوو، کە هێشتا هێندێك لە ئەفسەران و ژەنەراڵە روسییەکان لە بەرەکانی شەڕدا لە بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی حکوومەتی نوێ، دڕدۆنگ بوون و لە دەربڕینی وەفاداری بۆ دەوڵەتی نوێ خۆیان دەبوارد. ترۆتسکی وێڕای ئەوەی کە لە پلەی کۆمیسێریی کار وباری دەرەوەدا بەرپرسیارەتییەکی راستەخۆی لە کاروباری سەربازییدا لە ئەستۆ نەبوو لە فەرمانێکدا داوای لە سەر بازە روسییەکان کرد، کە ژەنەراڵە دژە ئاشتییەکان و " دژە شۆڕشەکان" قۆڵبەست بکەن و خۆیان بە پێك هێنانی کۆمیتەی فەرماندەیی لە سەر بازان و ئەفسەرە وەفادارەکانی شۆڕش جڵەوی کارەکان بەدەستەوە بگرن.

شەوی بیست و دووەم ی نۆڤەمبەر لینین و ستالین بە هێڵی راستەوخۆی تەلەفۆنی بێ تەل لەگەڵ ژەنەراڵ دووخۆنینDukhoninی سەرۆکی بنکەی سوپای روسیا پێوەندییان گرت و فەرمانیان پێدا بە خێرایی کۆتایی بە هەڵمەتی سەربازی بێنی و لەگەڵ ئەڵمانییەکان دەست

بکا به دانوستانی کۆتاییهێنان به دوژمنایەتی. ستالین لە یادداشتەکانیدا ئاوا باسی ئەو رووداوە دەکا:"ئێمە زۆر بە توندی لەگەڵ ژەنەراڵ دووخۆنین قسەمان کرد. دووخۆنین جوابی فەرمانەکانی سەرۆکی ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەلی نەدایەوە و بەڕێوەی نەبردن و لینین بە تووڕەییەوە، کە بەدەگمەن لە روخساریدا بەدیم کردبوو گوتی ئیتر بە بێ ئەملاوئەولا دەبێ مشووری ئەو ژەنەراڵە بخۆین..."

رۆژی دواتر کریلێنکۆ بە سەرۆکایەتیی هێزێکی سەربازیی پێکهاتوو لە گاردی سوور و مەلەوانانی بۆلشەڤیکی، بەرەو "مۆگلیڤ" ی ناوەندی بنکەی سوپایی دووخۆنین وەڕێکەوتن و فەرمانەکانی ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەلیان بە نووسراو پێڕاگەیاند. دووخۆنین دیسانیش ملی رانەکێشا. کریلێنکۆ لە نووسینگەی ژەنەراڵ هاتە دەرێ و پاش سەعاتێك دووخۆنین و ئەفسەرەکانی بنکەکەی لە لایەن گاردەسوورەکان و سەربازە دنەدراوەکانەوە درانە بەر فیشەك و سەرنێزە و بە شێوەیەکی سامناك کوژران.

پاش کوژرانی دووخۆنین و ئەفسەرانی بنکەکەی، کریلێنکۆ خۆی فەرماندەیی هێزەکانی وەئەستۆ گرت و نوێنەرگەلێکی بە مەبەستی دانوستانی بەرایی و کۆتاییهێنان بە دوژمنایەتی ناردە ناوەندی هێزەکانی ئەڵمانیا. رۆژی بیست و حەوتەمی نۆڤەمبەر فەرماندەیی گشتیی هێزەکانی ئەڵمانیا لە"برێست_لتۆسك" رەزامەندیی خۆی بۆ دەستپێکردنی دانوستانەکان دەربڕی. ئەو وەڤدی نوێنەرایەتییەی، کە بۆ دانوستانی ئاشتی چوونە برێست لێتۆسك، پێك هاتبوو لە کارناسی سەربازی و ژمارەیەك کرێکار و مەلەوان و سەربازی سادە و وەرزێر و ژنێکیش، کە زیاتر بە مەبەستی کەڵکوەرگرتنی هەڵبژێردرابوون. سەرۆکایەتیی یەکەمین وەڤدی نوێنەرایەتیی دانوستانەکانی ئاشتی لە ئەستۆی "جۆفێ" بوو و لینن بەر لە وەڕێکەوتنی وەڤدەکە بۆ برێست لێتۆسك فەرمانی پێدا، کە بەهەر نرخێك بووە لەگەڵ ئەڵمانییەکان رێك بکەوێ.

ناساندنی حکوومەتی نوێی روسیا، کە تەنیا بۆلشەڤیکەکان تێیدا بەشدار بوون بۆ لایەنەکانی دیکە چاوەڕواننەکراو بوو، چونکی لە دوایین رۆژەکانی حکوومەتی کێرێنسکیدا هێندی دانوستان و رێککەوتن لە نێوان بۆلشەڤیکەکان و مەنشەڤیکەکان و سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکاندا بە مەبەستی پێك هێنانی حکوومەتێکی یەکگرتوو لە ئارادا بوو. کامێنۆڤ، کە لەو دانوستانانەدا رۆڵی یەکەمی دەگێڕاو خۆیشی باوەڕی بە پێکهاتنی حکوومەتێکی یەکگرتوو بە بەشداریی تەواوی هێزە چەپ و شۆڕشگێڕەکان بوو، بەر لە ناساندنی دەوڵەتی نوێ یا ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەل وەکو سەرۆکی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان هەڵبژێردرابوو و

فاکتەرێکی هیوادەر بوو بۆ نوێنەرانی لایەنە غەیرە بۆلشەڤیکەکان، بەڵام لینین ئامادەی بەجێهێنانی بەڵێنەکانی رابردوو نەبوو و رێگەی بە هیچکام لە رێبەرانی حیزب و لایەنە سیاسییەکانی دیکە نەدا بێنە نێو دەوڵەتەکەیەوە.

تاکڕەویی لینین و گرینگی نەدانی بە باوەڕ وبیر وبۆچوونەکانی رێبەرانی دیکەی بۆلشەڤیك هەر لە یەکەمین حەوتووەکانی حکوومەتەکەی ئەودا کۆمەڵێك ناکۆکیی خستە نێو بۆلشەڤیکەکانەوە و نزیکترین دۆست و هاوکارانی لینین لە سەر ئەوەی، کە ئەو لە حکوومەتدا هیچ بەشێکی بە حیزب و لایەنە سیاسییەکانی دیکە نەدەدا راشکاوانە دەستیان کرد بە رەخنەگرتن.

یەکێك لەو رەخنەگرانە ماکسیمگۆرکیی نووسەری ناودار بوو، کە لە رۆژنامەکەی خۆیدا بە ناوی نۆڤایا ژیزین نووسیی:

هێندێ کەسی نابەرپرسیاری ئاژاەگێڕ و دڵکوێری دەمارگرژ بە ناوی "شۆڕشی کۆمەڵایەتی"یەوە ئێمە بەرەو رێگەیەك دەبەن، کە جگە لە پشێوی و کاولکردن و لەناوبردنی پرۆلتاریا و شۆڕش هیچی دیکەی لێناکەوێتەوە.

چینی کرێکار ناتوانێ ئیزن بە لینین و دەست وپێوەندەکانی بدەن، کە بە خوێنی ئەوان و بە نرخی تەواوی ئەو شتانەی، کە بە خەباتی رابردوو بەدەستیان هێناوە شێوەی حکوومەتێك ئەزموون بکەن، کە سەرەنجام و داهاتووەکەی لەکەس دیار و روون نییە.چینی کرێکار نابێ ئیزن بدات بە کۆمەڵێك کەسی شێت و کێشەخوڵقێن، کە بە ناوی ئەوان و بە ناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەوان جەنایەتگەلێك بخوڵقێنن، کە نەك هەر لینین و لایەنگرەکانی بەڵکو تەواوی کرێکارانی روسیا دەبێ رۆژێك تاوانەکەی بدەنەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەو وتارە توندەی ماکسیمگۆرکی، کە بەرایی تۆران و دابڕانی ئەو بوو لە لینین، چەند کەس لە رێبەرانی بۆلشەڤیکیش بە نیشانەی نارەزایەتی دەربڕین بە سیاسەتی توند و سەرەڕۆیانەی لینین دەستیان لەو پۆستانە کێشایەوە، کە وەئەستۆیان گرتبوون، کە ناودارترینیان کامێنۆڤ و رێکۆف بوون، کە یەکەمیان دەستی لە سەرۆکایەتیی وەڤدی بەرێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان و دووەم یان دەستی لە کۆمیسێریی کاروباری نێوخۆیی هەڵگرت، کە گرینگترین پۆستی کابینەی لینین بوون.

بەڵام هیچکام لەو دەست لەکار کێشانەوە و نارەزایەتی دەربڕینانە نەبوونە هۆی گەڕانەوەی لینین لەو رێگەیەی گرتبوویە بەر. ئەو بەوپەڕی لە سەرەخۆییەوە دەست لەکار کێشانەوەی کامێنۆڤی وەرگرت، کە لە تەواوی سەردەمی تاراوگەدا و دواتریش یەکێك بوو

له نزیکترین دۆست و هاوکارەکانی، و سوردۆلۆفی لەجێگەی ئـەو کـردە سـەرۆکی وەفـدی بەڕێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان و پێشنیاری پێکرد کە وەکو کامێنۆڤ مەیدان نـەدا بە نوێنەرانی حیزب و لایەنە نابۆلشەڤیکەکان.

یەکێك لە گرفتە گەورەکانی لینین لە سەرەتای حکوومەتەوە مەسەلەی ئـابووری و دابینکردنـی گوژمەی دەوڵەت بوو. دەسبەسەرداگرتن و زەوتکردنی مال و سامانی خەڵك تەواو وەبرەو کـەوتبوو، بەڵام ئەوانە خەرج و موخـاریجی دەوڵـەتیان پـی دابـین نـەدەبوو. دەبوایـە دەسـتیان بـە بانکـەکان ڕاگەیشتبا و خەرج و موخاریجی دەوڵەتیان لە خەزێنە و پاشەکەوتی بانکەکان دابین کردبا.

ئەو ڕۆژەی لینین دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت پێترۆگراد بیست و هەشت بانکی تێدا بوو. ئەو بانکانە لە باری یاساییەوە سـەر بـە بـانکی ناوەنـدی و خەزێنـەداریی گشـتی بـوون و دانـی هەرچەشنە دراوێك بە دەوڵەت و دامەزراوە دەوڵەتییەکان پێویسـتیی بـە ڕەزامەنـدیی بـانکی دەوڵەتی و خەزێنەداریی گشتی بوو.

فەرمانبەرانی بانکی دەوڵـەتی و خەزێنـەداریی گشـتی لـە جەنگـەی ئـاڵوگۆڕی کتـوپڕی حکوومەتدا دەستیان لە کار کێشایەوە بۆ ئەوەی ناچار نـەبن دارایـی دەوڵـەت بدەنـە دەسـتی دەسەڵاتدارانی نوێ، چونکی لە یاساییبوونی ئەو گۆڕانکارییانە و بەردەوامیی تازە بەدەسەڵات گەیشتووان دڵنیا نەبوون. لینین خوازیاری ئەوە بوو، کە ئەو کارە خێـرا ڕاپـەڕێنن و بانکـەکان بگرن و هەرچی تێیان دایە زەوتی بکەن، بەڵام سپانۆف یەکەمین کۆمیسێری دارایی لینین ملـی بۆ ئەو کارە ڕانەکێشاو کاتێك لینین، مێنژینسکیmenzhinski ی، کە هیچ پسپۆڕییەکی لە بواری ئابووریدا نەبوو کردە کۆمیسێری دارایی و کاتێك مێنژینسکی خۆی باسی لەوە کرد، کە توانایی بەڕێوەبردنی ئەو کارەی نییە لینین لە وەڵامدا گوتی ئەو کارە پسـپۆڕیی نـاوێ، تـەنیا ئازایەتی و ورەی پێویستە.

لینین (بۆنچ_برونیڤیچ)ی ڕاسپارد، کە لە کاروباری ماڵی و داراییدا یارمەتیدەر و ڕێ-پێشاندەری مێنژێنسکی بی و بۆنچ برونیڤیچ گەڵاڵەی بە دەوڵەتیکردن یا نیشتیمانیکردنی تەواوی بانکەکانی داڕشت و وایان دانا، کە لە ڕۆژی ڕاگەیاندنی ئەو گەڵاڵەیەدا دەسبەسەر بانکەکاندا بگرن و بەڕێوەبەرەکانیان دەستبەسەر بکەن و بەڕێوەبەری نوێیـان بـۆ دانـێن. ژمارەی ئەو کەسانەی، کە کورتە زانیارییەکیان لە سەر کاروباری ئابووری و بانکی هەبێ زۆر کەم بوون و هەر بۆیەش لە بەڕێوەبەرە دەستبەسەرکراوەکان ئەو کەسانەی ئامادە بوون،

که هاوکاریی حکوومەتی نویٚ بکەن و بیٚ ئەملاوئەولا فەرمانەکانی دەوڵەت جیٚبەجیٚ بکەن دیسان کاریان پیٚ ئەسپاردنەوە.

لەگەڵ کۆنترۆڵی بانکەکان لە لایەن دەوڵەتەوە، دراو هەڵگرتن لە حسیٚبە بانکییەکان پەیڕەویی لە یاسا و ریٚسایەکی نویٚ کرد و بۆ پیٚشگرتن لە هیٚرشی خەڵك بۆ وەرگرتنەوەی ئەسپاردە بانکییەکانیان، هەڵگرتنی دراو لە حسیٚبە تایبەتییەکان بەرتەسك کرایەوە لە مانگیٚ هەزار و پیٚنجسەد رۆبڵ. هەڵبەت ئەو پوانە تەنیا بۆ کەسانی ئاسایی و ئەویش بۆ ماوەیەکی کورت بوو. بۆ ئەو کەسانەی، کە بە دژە شۆڕش ناسرابوون (و دیارە ئەو نیٚوە تەنیا دەوڵەمەندەکانی دەگرتەوە) حسیٚبەکانیان دەبەستران و دراوەکانیان دەدرایە دەوڵەت.

## 2

یەکیٚك لە سەرەتاییترین هەنگاوەکانی حکوومەتی بۆلشەڤیکی بەرتەسككردنەوەی ئازادییەکانی چاپەمەنی بوو. رۆژی دەی نۆڤەمبەری 1917 واتە دوو رۆژ پاش دامەزرانی حکوومەتی نویٚ ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەل بەدەرکردنی فەرمانیٚك کۆمەڵە یاسایەکی بۆ بەرتەسككردنەوەی چاپەمەنییەکان پەسند کرد، بەڵام ویٚڕای راگەیاندنی ئەو یاساگەلە جەخت کرایەوە، کە ئەو بەرتەسككردنەوانە کاتین و دوابەدوای سەقامگیربوونی حکوومەتی نویٚ و ئاسایی بوونەوەی رەوشەکە ئازادیی چاپەمەنی و بلاڤۆك دابین دەکریٚ.

بەڵام ئەو بەرتەسك کرانەوەیە نەك کاتی نەبوون بەڵکو رۆژ لەگەڵ رۆژ بەرتەسکتر کرانەوە و زیاتر بەرەو گرژی چوون و پانتایی چالاکیی چاپەمەنیی نابۆلشەڤیکی (و دواتریش بۆ هیٚندیٚ چاپەمەنیی سەر بە بۆلشەڤیکەکانیش، کە دەیانویٚرا چووکە رەخنەیەك لە بارودۆخی نالەبار بگرن) وردە وردە بەرتەسکتر بۆوە هەتا ئەو جیٚگەیەی، کە یەك لە دوای یەکتر ناچار کران دابخریٚن.

یەکەمینی ئەو رۆژنامانەی، کە پیٚش بە بڵاوبوونەوەیان گیرا بلاڤۆکە سەربەخۆ و لیبراڵەکان بوون. دوایی نۆرەی رۆژنامەکانی سەر بە مەنشەڤیکەکان و سۆسیالیستە شۆڕشگیٚڕەکان و

لایەنە چەپیەکانی‌تر گەیشت. لە کۆبوونەوەی ڕۆژی حەڤدەی نۆڤەمبەری دەستەی بەڕێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا نوێنەرانی ئەو گرووپ و لایەنانە سەبارەت بەو گوشار و سانسۆرەی دەخرێتە سەر ڕۆژنامەکانیان دەستیان کرد بە دەربڕینی سکالاّ و گوتیان، کە ئەو گوشار و زەختە لە حکوومەتی تەزارییش‌دا نموونەی نەبووە. لینین، کە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوو لە وەلاّمدا گوتی: شتی وانییە، بەلاّم زەخت و گوشار لە حکوومەتی تەزاردا بەمەبەستی پێشگرتن لە پەرەگرتن و بلاّوبوونەوەی ویست و بیر و باوەڕی خەڵکی بوو کەچی ئەگەر ئەمڕۆ گوشارێکیش هەبێ بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خەڵکە.

پاش بلاّوبوونەوەی چەند وتارێکی ڕەخنەگرانە لە ڕۆژنامەی(نۆڤایاژیزن)ی ماکسیم گۆرکیدا لینین فەرمانی دا، کە یاسای سانسۆر دەبێ ڕۆژنامەکانی سەر بە بۆلشەڤیکەکانیش بگرێتەوە. لە بەڕێوەبردنی ئەو فەرمانەدا بۆ بلاّوکردنەوەی بابەتگەلێکی، کە چەواشەکارانە بێ یان وروژێنەر بن سزا دیاری کرا. ماکسیم گۆرکی یەکەمین کەس بوو، کە وەبەر ئەو بڕیارە کەوت و بڕی 35000 ڕۆبلیان غەرامە کرد.

سێ مانگ پاش دامەزرانی حکوومەتی بۆلشەڤیکەکان زۆربەی ڕۆژنامەکان داخرابوون، یەکێك لە نوێنەرانی سۆسیالیستەکانی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان (شینی بیرور) ناڕەزایەتیی دەربڕی و و گوتی: تەواوی ڕۆژنامەکانمان داخراون و ڕێگەی دەربڕینی بیر و ڕامان بە تەواوی لێ گیراوە." لینین بە تووڕەییەوە وەلاّمی دایەوە، کە "بەداخەوە هێشتا هەموو ڕۆژنامەکانی ئێوەدانەخراون، بەلاّم ئێمە بە زووترین کات ئەو کارە دەکەین. تەواوی ئەو ڕۆژنامانەی، کە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی گەل دەجووڵێنەوەدادەخرێن. دیکتاتۆریی پرۆلتاریا ئیتر بۆگەنی بێزارکەری تلیاکی بۆرژۆوازی قەبووڵ ناکا."

لینین قسەکەی خۆی بردەسەر و لە سەرەتاکانی مانگی مای 1918دا سێ ڕۆژنامەو مانگی دواتریش هەموو ئەو ڕۆژنامانەی، کە لەدەستی دەوڵەتدا نەبوون داخران. تەنانەت ڕۆژنامەی نۆڤایاژیزن ی ماکسیم گۆرکیش سەرەڕای ئەوەی کە بڕێك بە پارێز ببوو داخراو هەتا ئەو ڕۆژەی لینین لەگەڵ گۆرکی ئاشت نەبۆوە ئیزنی بلاّوبوونەوەی پێنەدرا.

بەو شێوەیە تەمەنی ئازادیی بیر و ڕا و قەڵەم لە ولاّتێکدا، کە چەند نەوەی خەڵکەکەی خەباتیان بۆ کردبوو بە کۆتایی گەیشت. لینین خۆیشی بانگەشەکاری ئەوە نەبوو، کە ئازادی بۆ خەڵك دەستەبەر دەکا. ئەو هەر لە هەمان ساڵەکانی تاراوگەییدا سروودی دیکتاتۆریی پرۆلتاریای گوتبۆوە و ئەو کەسانەش، کە وەشوێنی کەوتبوون ئەگەر پەیڤ و نووسینەکانیان دەخوێندەوە دەیانتوانی لێی تێبگەن، کە لینین ئازادییان بە دیاری بۆ ناهێنێ.

یەکێك لە دروشمە بەردەوامەکانی لینین و بۆلشەڤیکەکان لە ئاپریلەوە هەتا نۆڤەمبەری 1917 دامەزراندنی پەرلمانی دامەزرێنەران بۆ دیارییکردنی شێوەی حکوومەت و نووسینی یاسای بنەڕەتیی نوێی روسیا بوو. لینین بە دەیان جار دەوڵەتی کاتیی خستە بەر شك و گومانەوە و تاوانباری دەکرد بەوەی کە لە پێك هێنانی پەرلمانی دامەزرێنەراندا کەمتەرخەمە و بەڵێنی دابوو، کە لەگەڵ ئەوەی کە بۆلشەڤیکەکان دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت پەرلمانی دامەزرێنەران پێك دێنن.

بەر لەوەی بۆلشەڤیکەکان بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات راپەڕینی چەکداری وەڕێخەن دەوڵەتی کاتی رۆژی بیست و پێنجەمی نۆڤەمبەری بۆ بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکان دیاری کردبوو. ئەو رۆژەی بۆلشەڤیکەکان جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت تەنیا هەژدە رۆژی مابوو بۆ رێکەوتی دیاری کراو و لینین دەیزانی، کە لە هەڵبژاردنێکی ئازاد و بێ فرتوفێڵدا بۆلشەڤیکەکان نابنە زۆرینە.

ترۆتسکی دەڵێ : یەکێك لە نیگەرانییەکانی لینین لە یەکەمین رۆژی بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتەوە، مەسەلەی هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی دامەزرێنەران بوو. ئەو بەردەوام باسی پێویستبوونی وەدرەنگی خستنی هەڵبژاردنەکان و هێنانەخوارێی تەمەنی دەنگدەرانی هەتا ئاستی هەژدەسال و بێبەرییکردنی مۆرە دژە شۆڕشەکان لە بەشداربوونیان لە هەڵبژاردندا دەکرد و دەیویست بەهەر شێوەیەك بووە لەو هەڵبژاردنەدا شانسی سەرکەوتنی حیزب و لایەنە نابۆلشەڤیکییەکان کەم بکاتەوە.

لەگەڵ هەمووی ئەو تەگبیر و ڕا و بەرتەسككردنەوانەی، کە بۆ دەنگدەرانی نابۆلشەڤیکی لە هەڵبژاردنەکاندا هاتە ئاراوە ئاکامی هەڵبژاردنەکان بۆ بۆلشەڤیکەکان کارەسات بوو، چونکی لە 36 ملیۆن کەسی روسی، کە لە هەڵبژاردنەکاندا بەشدارییان کرد تەنیا 9 ملیۆن کەس واتە بیست و پێنج لەسەدی دەنگدەران دەنگیان دا بە پاڵێوراوەکانی بۆلشەڤیکەکان. بیست و یەك ملیۆن کەس واتە نزیکەی 58 لەسەدی دەنگدەران دەنگیان دا بە سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان و ئەو حیزبە بە 707نوێنەرەوە لە پەرلمانی دامەزرێنەراندا زۆرینەی تەواوی پەرلمانی پێ بوو. نوێنەرانی هەڵبژێردراوی حیزب و لایەنەکانی دیکەش لە پەرلمانی دامەزرێنەراندا بە ریزەوە بریتی بوون لە: بۆلشەڤیکەکان 175 نوێنەر، سۆسیالیستە شۆڕشگێڕە چەپیەکان(لایەنگرانی لینین) 40 نوێنەر، کادێتەکان(لیبڕاڵەکان)17 نوێنەر، دوو نوێنەریش لە حیزبی

سۆسیالیستەکانی گەل. یازدەنوێنەری ناحیزبی و هەشتاوشەش نوێنەری نەتەوە جۆراوجۆرەکانیش هاتنە پەرلمانی دامەزرێنەرانەوە.

بەو شێوەیە نەتەوەی روسیا لە یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادی سەردەمی حکومەتی بۆلشەڤیکەکاندا، کە دەبوایە دوایین هەڵبژاردنیشی بێ بە زۆرینەی دەنگ، دەنگیان دا بە سۆسیالیستە میانڕەوەکان و دژبەرانی لینین و بۆلشەڤیکەکان، بەڵام لینین، کە بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوو لە تەختی دەسەڵات بێتە خوارێ لە بەیانیی ئەو رۆژەی، کە ئاکامی هەڵبژاردنەکان راگەیەندرا لە مێشکی خۆیدا نەخشەی پووچەڵکردنەوەکەی کێشا.

یەکەمین تەگبیر بۆ پووچەڵکردنەوەی پەرلمانی دامەزرێنەران، وەدواخستنی کردنەوەی بوو بە مەبەستی پتەوکردنی کۆڵەکەکانی دەسەڵاتی حیزبی بۆلشەڤیك بەر لەوەی ئەو پەرلمانە دەست بە کارەکانی بکا. کرانەوەی پەرلمان پاش چەندجار وەدواخستن خرایە رۆژی 18ی ژانویەی 1918.

لینین پاش ئەوەی کە زانیی زۆرینەی خەڵك دژی بۆلشەڤیکەکانن، بۆ قایمکردنی دەسەڵاتی خۆی و ناچارکردنی پەرلمانی دامەزرێنەران بۆ مل راکێشان لە بەرامبەر هەلومەرج و ویستەکانی خۆیدا، لە ماوەی نێوان راگەیاندنی ئاکامی هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی دامەزرێنەراندا، لە دوو لاوە دەست بەکار بوو.

لە لایەکەوە چالاکیی رێکخراو و بەربەرین بۆ کۆنترۆڵکردنی سوپاو هێزەکانی دەریایی و پۆلیس و پاکسازی و دەستبەسەرکردن و تەنانەت کوشتنی ئەفسەرە دژبەرەکان دەستی پێکرد و ئەو بەرنامەیە بە تایبەتی لە ناوچەی پێترۆگراد بە وردبینی و شێلگیرییەکی چڕ وپڕەوە بەرێوە چوو. لە لایەکی دیکەوە پڕوپاگەندە لە نێو کرێکاراندا بۆ راکێشانی سەرنجی مۆرەکانی سەر بە گرووپ و لایەنەکانی دیکە بەرەو بۆلشەڤیکەکان بە کەڵك وەرگرتن لە ئیمکانات و کەرەسە دەوڵەتییەکان، کە کەوتبوونە دەستی بۆلشەڤیکەکان هەراوتر و بە تەوژمتر ببوو.

بۆ ئەو مەبەستەش لنین لەهەموو شوێنێ پتر گرینگیی بە پێترۆگراد دەدا لەبەر ئەوەی کە زیاتر لە پازدە لەسەدی کرێکارانی پێترۆگراد لە هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی دامەزرێنەراندا دەنگیان بە بۆلشەڤیکەکان نەدابوو. رێژەی دەنگدەران بە حیزبی سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان و مەنشەڤیکەکان و گرووپە چەپەکانی دیکە نزیك بە پەنجا لەسەدی کرێکارانی لەخۆ دەگرتن، بەڵام ژمارەیەکی زۆریش مابوونەوە لە نێوان ئەو لایەنانەدا دەنگ بە کامیان بدەن بۆیەش لە هەڵبژاردنەکاندا بەشدارییان نەکردبوو. پرۆپاگەندەی بۆلشەڤیکەکان زیاتر رووی لەو گرووپە بوو.

بۆلشەڤیکەکان لە درێژەی چالاکییەکانیاندا لەگەڵ هێزە چەکدارەکانیش تووشی کێشە بوون و هەر بۆیەش بۆ پێشگرتن لە هەرچەشنە بزووتنەوەیەکی دژ بەخۆیان لە کاتی کرانەوەی پەرلمانی دامەزرێنەراندا لینین فەرمانی دا، کە هەر لە بەیانییەی رۆژی کرانەوەی پەرلماندا تەواوی دەوروبەری کۆشکی تەڤرید، کە بۆ کۆبوونەوەکانی پەرلمان دیاری کرابوو، لە لایەن بۆلشەڤیکەکانەوە گەمارۆ بدرێ. هێزی دەریایی ئاورۆرا و چەند پاپۆڕی جەنگیی دیکە، کە ئەندامەکانیان سەر بە بۆلشەڤیکەکان بوون لە رووباری "نۆڤا" دامەزران. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر هێزی چەکداری بۆلشەڤیك بەر لە دەستپێکی کۆبوونەوەکە، نێو کۆشکی تەڤرید و بانیژەکانی تایبەت بە سەیرکەرەکانیان گرتبوو. دەروازەکانی وەژوورکەوتن بۆ کۆشك لە لایەن سەرباز و مەلەوانە چەکدارەکانی بۆلشەڤیکەوە دەپارێزران و هەرکام لە نوێنەرانی خەڵك، کە دەیانویست بێنە نێو کۆشکەوە لە وەژوورکەوتنەوە هەتا دانیشتنیان لە سەر کورسییەکانیان بە تەواوی هەستیان بە کەشی پڕ لە ترس و تۆقاندنی دەوروبەریان دەکرد.

سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان، کە زۆرینەی پەرلمانی دامەزرێنەرانیان لەخۆ دەگرت بۆ رۆژی دەسپێکی کۆبوونەوەکە لە هەژدەی مانگی ژانویەدا خۆپێشاندانێکی مەزنیان رێك خستبوو. لە کاتژمێر حەوتی بەیانییەوە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی شارەوە بە هەزاران کرێکار و خوێندکار و خەڵکی ئاسایی، بە درووشمگەلێکی وەك "بژی پەرلمانی دامەزرێنەران" و"زەوی و ئازادی" و "کرێکاران و وەرزێران یەكگرن" بەرەو کۆشکی تەڤرید وەڕێکەوتن. رێپێوانەکە هەتا گەیشتە ئەو شەقامە سەرەکییەی، کە دەچۆوە سەر کۆشکی تەڤرید بەبێ رووداو چووە پێش، بەڵام کاتێك ریزی پێشەوەی خۆپێشاندەران گەیشتنە نێوەڕاستی شەقامەکە کتوپڕ رێژنەی گوللە لە سەر بان و نێو بیناکانی روو بە شەقامەکەوە بەسەر خۆپێشاندەراندا باری. لە ماوەی چەند ساتێکدا بە سەدان کەس لە خوێن گەوزین و ئەوانیتر رایانکرد و دەرباز بوون. لانیکەم سەد ژن و پیاو لەو گوللەبارانەدا کوژران و دەنگدانەوەی تەقە لە کۆشکی تەڤریدا ئەوەندەی دیکە کەشی نێو کۆشکەکەی سامناکتر کرد. وا دانرابوو، کە کۆبوونەوەی کرانەوەی پەرلمان سەر لە بەیانی پێك بێ، بەڵام بە ئانقەست خستیانە کاتژمێر چواری دوانیوەڕۆ بۆ ئەوەی هەم ئەو کەش و هەوای ترس و سامە تەواو خەست بێتەوە هەم ئەوەی کە دانوستانەکان و دەرکردنی بڕیارەکان بخرێنە شەواو دەستی بۆلشەڤیکەکان بۆ تێهەڵپێچان و گوشارخستنە سەر نوێنەران واوەلاتر بێ. بۆلشەڤیکەکان و لایەنگرەکانیان لە لای چەپی تالارەکەوە دانیشتبوون و نوێنەراتی سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان لە نێوەراستەوە و مەنشەڤیکەکانیش لە لای راستەوە دانیشتبوون. لای راستی تالارەکە دەکرێ

بڵێن بەتاڵ بوو چونکی هێندێ لە نوێنەرانی کادێت یا لیبراڵیان بە بروبیانووی جۆراوجۆر دەستبەسەر کردبوون و ئەوانی تریش لە ترسی دەستبەسەرکرانیان، خۆیان حەشاردا بوو.

لینین لەگەڵ خوشکی و هاوسەرەکەی برێك پێش دەستپێکی کۆبوونەوەکە لە دەرگایەکی دیکەوە هاتنە نێو کۆشکی تەڤرید و بەر لەوەی بچنە نێو کۆبوونەوەکە لە یەکێك لە دیوەکانی کۆشکدا لەگەڵ هاورێکانی خۆی کەوتە راوێژ و خەریکی خواردنەوەی چای عەسرانە بوون. سۆردۆلۆڤ لەو دیوەدا چاوی بە لینین کەوت و سەبارەت بە شێوەی کاری پەرلمان بیر و رای ئەوی پرسی. لینین سەبارەت بە تاکتیکی نوێنەرانی بۆلشەڤیکی کۆمەڵێك فەرمان و رێوشوێنی دا بە سۆردۆلۆڤ و ئەجار لەدالانێکەوە، کە دەچۆوە سەر تالار بەرەو بەشداربوون لە کۆبوونەوەکەدا وەرێ کەوت.

کاتێك لینین گەیشتە نێو کۆبوونەوەکە کار وبارەکان بە پێچەوانەی بۆچوونی لینین دەست پێکرابوون. بە پێی رێورەسمی کۆبوونەوە فەرمییەکان سەرۆکی کۆبوونەوە دەبوایە بەتەمەنترین کەسی کۆبووونەوە بێ. بەتەمەنترین نوێنەر "شڤێتزۆف" لە سۆسالیستە شۆرشگێرەکان بوو، بەڵام کاتێك چووە پشت مێزی سەرۆکایەتی، نوێنەرانی بۆلشەڤیکی کتوپر دەستیان کرد بە کوتانی تەختەکانیان و ئەو سەرباز و مەلەوانە چەکدارانەی، کە لە جێگەی سەیرکەران دانیشتبوون چەند فیشەکی هەواییان بە میچی تالارەوە نا.

شڤێتزۆڤ لە نێو قریوە و زەنازەناکەدا تەنیا بۆی کرا بڵێ" لە لایەن کۆمیتەی بەرێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان و وەرزێرانەوە پێم ئەسپێردراوە، کە کۆبوونەوەی دامەزرێنەران بکەمەوە." بە دوای ئەوەدا سۆردۆلۆڤ راگەیەندراوێکی، کە لە لایەن لینین و ستالینەوە ئامادە کرابوو لە ژێر ناوی "راگەیەندراوی مافی گەلانی زەحمەتکێش و چەوساوە" خوێندەوە. لەو راگەیەندراوەدا، کە لەلایەن زۆرینەی بۆلشەڤیکەکان یا لایەنگرانی کۆمیتەی بەرێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانەوە پەسند کرابوو پێشنیار کرابوو، کە دەسەڵاتی حکوومەت و بریاردان بدرێ بە ئەنجوومەنەکان و پەسندکرانی ئەو راگەیەندراوە لە لایەن پەرلمانی دامەزرێنەرانەوە بە مانای ئەسپاردنی ئەو پەرلمانە بوو بە کۆمیتەی بەرێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان. ئەوە بوو ئەو پیلانەی لینین بۆ پەرلمانی دامەزرێنەران و بێدەسەڵاتکردنی کێشابووی.

سۆردۆلۆڤ لە کۆتایی قسەکانیدا، کە وەك سەرۆکی کۆمیتەی بەرێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان قسەی دەکرد داوای کرد، کە ئەو راگەیەندراوە خێرا لە لایەن پەرلمانی دامەزرێنەرانەوە پەسند بکرێ، بەڵام زۆرینەی ئەندامانی پەرلمانی دامەزرێنەران گوێیان نەدایە

قسەکانی و بەر لە هەر شتێك سەرۆکی پەرلمانیان هەڵبژارد. ڤیکتۆر چێرنۆڤ ڕێبەری سۆسیالیستی شۆڕشگێڕ بە زۆرینەی دەنگ بۆ سەرۆکایەتیی پەرلمان هەڵبژێردرا.

چێرنۆڤ لە وتەیەکدا، کە بەردەوام بە هاتوهاواری نوێنەرانی بۆلشەڤیکەکان دەپچڕایەوە پێی داگرتەوە لە سەر ئەرکەکانی پەرلمانی دامەزرێنەران وەکو ناوەندێکی یاسادانەری و ئەرکێك، کە لە لایەن گەلی روسەوە بۆ دیاریکردنی سیستەمی حکوومەتیی داهاتووی وڵات خرابووە ئەستۆی نوێنەرانی ئەو پەرلمانەوە. قسەکانی چێرنۆڤ لە بواری سیاسەتی دەرەکی و مەسەلەی جەنگیشدا دژی بۆچون و بەرنامە راگەیەندراوەکانی بۆلشەڤیکەکان بوون. چونکە چێرنۆڤ وێڕای هەوڵدان بۆ سەقامگیریی ئاشتییەکی شەرافەتمەندانە "بە بێ تێکشکاوو سەرکەوتوو " پێی لە سەر ئەوە داگرتەوە، کە روسیا نابێ مل بۆ پەیمانی یەکلایەنە و نوێی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیا راکێشێ.

لە وەڵامی سۆردلۆڤ و ئەو راگەیەندراوەی، کە خوێندییەوە چێرنۆف هەر ئەوەندەی لە سەر گوت، کە پەرلمانی دامەزرێنەران خوازیاری هاوکاریی دۆستانەیە لەگەڵ ئەنجوومەنەکان و پێیداگرتەوە لە سەر ئەوەی کە ئەو هاوکاری و ئاشتی و هێمنییە پێشکەوتن بۆ روسیا بە دیاری دێنێ بەبێ هاوکاریکردن ناکرێ خۆ لە شەڕی نێوخۆیی بپارێزێ. چێرنۆف ئەوەشی گوت، کە پەرلمانی دامەزرێنەران لە سەر بابەت و مەسەلە بنەمایی و گرینگەکان دەگەڕێتەوە بۆ دەنگی گشتی.

لینین لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لە گۆشەیەکەوە دانیشتبوو وای دەنواند، کە کاری بەسەر باس و خواسی پەرلمانەوە نییە. ئەو هێندێ جار خۆی بە یادداشت نووسین یا قسەکردن لەگەڵ دەوروبەرییەکانی دەخافڵاند و ئاخرییەکەی وای دەنواند، کە لە نێو ئەو هاتوهاوارەدا خەوی لێکەوتووە. خۆبواردنی ئەو لە قسەکردن لەو کۆبوونەوەیەدا جۆرێك سووکایەتی و بەکەمگرتنی پەرلمان بوو، چونکی ئەو دەبوایە وەکو سەرۆکی دەوڵەتی دەسەڵاتدار لەو پەرلمانەدا قسەیەك هەر بکا و لەوانەشە بۆ ئەو کاتەی هەڵگرتبێ، کە راگەیەندراوی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان پەسند بکرێ، بەڵام کاتێك پەرلمان نەیویست ئەو راگەیەندراوە پەسند بکا ئەویش لەبری ئاخافتن لەو پەرلمانەدا، قۆناغی دوایی گەڵاڵەکەی خۆی خستە روو. سەرەڕای کەشی هەڕەشە و تۆقاندنی زاڵ بەسەر کۆبوونەوەکەدا، پەرلمانی دامەزرێنەران لە کات و ساتەکانی کۆتایی خۆیدا باس و لێدوان لە سەر راگەیەندراوی "مافی گەلانی زەحمەتکێش و چەوساوە"، یان دانی دەسەڵاتی پەرلمانی دامەزرێنەران بە کۆمیتەی بەڕێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانی وەلا نا و خەریکی تاوتوێکردنی ئەو پێشنیارانە بوون، کە پێوەندییان بە

سیستەمی حکوومــەتی و ریفــۆرمی زەوی و مەســەلەی شــەڕەوە هــەبوو. لیــنین لــەو کاتــەدا کۆبوونەوەی بە جێ هێشت و بە هاتوهەللاّیەکی زۆر لە کۆبوونەوەکە چووە دەرێ.

چێرنۆڤ دەیزانی کۆتاییهێنان بە کۆبوونەوەکـە و هـەڵگرتنی دانوسـتانەکان بـۆ کۆبوونەوەیـەکی دیکە چ مەترسیگەلێك لە سەر رێگەیانە، هەر بۆیەش وێڕای ئەوەی کە کات لە نیـوەی شـەو تـێ-پەڕیبوو داوای لە نوێنەران کرد، کە کۆبوونەوەیکە جێ نەهێڵن و، بنەما سـەرەکییەکانی پێوەندیـدار بەسیستەمی حکوومەتی داهاتووی روسیا بـە خێرایـی و بـە دەنگـی زۆرینـەی نزیـك بـە تـەواوی نوێنەرانی بەشدار لە کۆبوونەوەدا پەسند کـرا. بـە پێـی ئـەو بنەمایانـە حکوومـەتێکی کۆمـاریی فیدراڵی راگەیەندراو خودموختاریی گەلان لە چوارچێوەی ئەو کۆمارییەدا بە فەرمی ناسرا. هەروەها پەرلمانی دامەزرێنەران دەنگی دا بە بنەمای دابەشینی زەوی و زار بەسەر وەرزێرانـدا و مەرجـەکانی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیا بە پێی ئەو شتەی چێرنۆف لە ئاخافتنەکەیدا گوتبووی.

کۆبوونەوەی پەرلمان هەتا بەیانێی خایاند، و و چونکی نوێنــەران لــە رادەبــەدەر ماندووشــەکەت ببوون درێژی دانوستانەکان خرایە سبەینێ ، بەڵام هیچ کۆبوونەوەیەکی تر نەگیرا، چـونکی دەوڵـەت یا ئەنجوومەنی کۆمیسارایای گـەل هـەر ئـەو رۆژە واتـە سـەر لـە بـەیانیی رۆژی 19ی ژانوییـەی 1918 پەرلمانی دامەزرێنەرانی هەڵوەشاندەوە و ر ۆژنامەکانی بەیانێی ئەو رۆژە، کـە هەواڵـەکانی پێوەندیدار بە بڕیارەکانی کۆبوونەوەی شەوی پێشوی پەرلمانیان بڵاو کردبۆوە داخران و لـە نێـو بـران. بەو جۆرە یەکەمین پەرلمانی دامەزرێنەررانی روسیا، کە بەرهەمی نزیك بە سەدەیەك خەباتی خەڵکی روسیا لە پێناوی دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراتیك لەو وڵاتەدا بوو تەمەنی لە رۆژێك پـتر نـەبوو و لە مێژووی پەرلمانەکانی جیهاندا کورتترین تەمەنی بە یادگار بە جێهێشت.

دوانیوەڕۆی رۆژی بیست و یەکەمی ژانویە لینین لــە کۆبوونــەوەی کۆمیتــەی بەڕێوەبــەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا کە لە بەر دەستی بۆلشەڤیکەکاندا، بـوو بەشـداریی کـرد و وێـڕای ئاخافتنێك سەبارەت بە هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلمانی دامەزرێنەران گوتی:

"... خەڵك دەیانویست پەرلمانی دامەزرێنەران پێـك بـی و ئێمـە پێکمـان هێنـا، بـەڵام پـەرلمای دامەزرێنەران دەریخست، کە ویستی زۆرینەی راستەقینەی خەڵکی روسیای هیچ بەلاوە گـرینگ نییـە. ئێمە بە هەڵوەشـاندنەوەی ئـەم پەرلمانـە رێزمـان لـە ویسـتی زۆرینـەی خـەڵك گرتـووە و دەسـەڵاتی حکوومەت و بڕیاردان بە مـافی ئەنجوومەنـەکان دەزانـین... ئـەوە ویسـتی گەلـە و ئێمـە هەرچەشـنە بزووتنەوەیەکی دژ بە ویستی گەل و هەر جۆرە تیکدەرییەك بە توندی سەرکوت دەکەین."

رۆژی بیست و یەکەمی ژانویەی 1918 واتـە دوو رۆژ پـاش هەڵوەشـاندنەوەی پـەرلمانی دامەزرێنەران کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبـی بۆلشـەڤیك و نوێنـەرانی بۆلشـەڤیکیی سـێیەمین کۆنگرەی شۆراکان کۆبوونەوەیکی هاوبەشیان پێك هێنا.

بۆ ئەوەی هەلومەرجی دانوستان و ئاشتی لەگـەڵ ئـەڵمانیا بخەنـە بـەر بـاس. لیـنین لـەو کۆبوونەوەیەدا رێککەوتن لەگەڵ ئەڵمانیای بە هەر نرخێك تەنانەت بـە نرخیـدانی بەشـێك لـە خاکی روسیا بە ئەڵمانییەکانیش بە شتێکی پێویست زانی.

ترۆتسکی، کە لە دانوستانی بەرایی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیادا بەشدار بوو گوتی، کە مەرجە پێشنیارکراوەکانی ئەڵمانییەکان سووکایییەتیان تێدایە و بۆ قەبووڵکردن نابن و لە هەمانکاتـدا بۆ ئەوەی دژایەتیی بیروبۆچوونەکانی لینینی سـەبارەت بـە کۆتاییهێنـان بـە شـەڕ نـەکردبێ، پێشنیاری کرد کە بەبێ واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی وەلانانی دوژمنایەتی رابگەیەندرێ و ئەگـەر ئەڵمانییەکانیش هێرشیان هێنا، هێزەکانی روسیا تەنیا بەرگریکەر بـن. دەسـتەیەکی دیکـەش پێشنیاریان کرد، کە شەڕ لەگەڵ ئەڵمانیا ببێتە شـەڕێکی شۆڕشـگێڕانە و هێـزە شۆڕشـگێر و پارتیزانەکان بنێردرێنە بەرەی شـەڕ. تـەنیا پـازدە کـەس لەگـەڵ لیـنین بـۆ ئاشـتیی خێـرا و سەردانواندن و قەبووڵکردنی مەرجەکانی ئەڵمانییەکان هاودەنگ بوون. پێشنیاری ترۆتسـکی، کە ماناکەی "نەشەڕ نە ئاشتی" بوو 16 دەنگی هێنایـەوە، بـەڵام زۆرینـە واتـە 32 کـەس دەنگیان بە پێشنیاری سێیەم واتە "جەنگی شۆڕشگێڕانە"دا.

لینین دەسـتپێکردنی شـەڕی شۆڕشـگێڕانەی لەگـەڵ ئەڵمانییـەکان بـە شـتێکی گوونجـاو نەدەزانی و هەروا لە سەر پێشنیارەکەی خۆی بۆ ئاشتی بەهەر نرخێك بێ سوور بوو. مەسەلەی شەڕ دیسان لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك هاتەوە بەر باس و ترۆتسکی و لیۆمـۆڤ و ئۆتریسکی و دێرژینیسکی دژی مـەرجەکانی رێککەوتن لەگـەڵ ئەڵمانییـەکان قسـەیان کـرد و گوتیان، کە ملڕاکێشان بۆ ئەو هەلومەرجانە زیان لە پێگەی حکوومـەتی بۆلشـەڤیکی دەدا. لینین، کە ئاگاداری دەنگۆ و دڕدۆنگیی خەڵك سەبارەت بە پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەڵمانییەکان بوو نەیدەتوانی زۆر لە سەر ئەوە سووربی و هەربۆیەش کاتێك مەسەلەکەیان خستە دەنگدانەوە تـەنیا هەشـت کـەس دەنگیـان بـە پێشـنیارەکەی لیـنین و زۆرینـە (9کـەس) دەنگیـان بـە پێشنیارەکەی ترۆتسکی سەبارەت بە وەلانانی دوژمنایەتی بەبێ واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی، دا.

ئەڵمانییەکان، کە چاوەڕوانی قەبووڵکرانی مەرجەکانیان لە لایـەن روسـیاکانەوە بـوون بـۆ ئەوەی بەشێك لە هێزەکانیان لە بەرەی روسیاوە بـۆ خۆرئـاوا بـەرێ بکـەن لـە بەرامبـەر خـۆ

خافلاندن و درِدۆنگیی روسـییەکاندا دژکردەوەیـان نوانـد و، رۆژی شـازدەی فێبریـوەر ژەنـەراڵ هۆفمانی فەرماندەی هێزەکانی ئەڵمانیا ئۆلتیماتۆمێکی بە دەوڵەتی روسیادا، کە ئەگەر بێتوو روسەکان خۆ لە واژۆکردنی ئەو پەیمانە ببوێرن ئەوا سوپای ئەڵمانیا هێرشێکی بـەربلاو دەکاتـە سەر روسیا. کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك رۆژی 17 ی فێبریوەر بۆ بڕیاردان لـە سـەر ئەو ئۆلتیماتۆمە کۆ بۆوە. پێنج کەس لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیك واتە (لینین، ستالین، سۆلینکۆف، سۆردلۆف و سمیلگـا) لەگـەڵ قـەبوولی مەرجـەکانی ئـەڵمانیا و واژۆکردنی خێرای پـەیمانی ئاشـتی بـوون. شـەش کـەس (بۆخـارین و ترۆتسـکی، لیۆمـۆف، ئۆریتسکی و جۆفی و کریستینسکی) دژی قەبوولکردنی مەرجەکانی ئەڵمانییەکان دەنگیان دا و هاتنە سەر ئەوەی کە چاوەڕوانی ئاکامی هێرشی ئەڵمانییەکان بن.

هێندێکەس پێیان وابـوو، کـە ئۆلتیمـاتۆمی ژەنـەراڵ هۆفمـان شـتێکی جیـددی نییـە و کەسانێکیش پێیان وابوو، کە خۆبواردنی سەربازە روسییەکان لە هێرش لەوانەیە، کە سـەربازە ئەڵمانییەکانیش لە هێرشکردن بگێڕێتـەوە و سـەربازانی ئـەڵمانی لـە بـەڕێوەبردنی فـەرمانی هێرشی فەرماندەکانیان خۆ بگنخێنن.

بەڵام ئەو هیوادارییانە بێ سەمەر بوون. سـوپای ئـەڵمانیا سـەر لـە بـەیانیی رۆژی 18ی فێبریوەر هێرشی کـرد و لیـنین داوای لـە ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیـزب کـرد، کـە کۆبوونەوەیکی نائاسایی بگرن و پێشـنیارەکانی خـۆی لـە سـەر قـەبوولکردنی واژۆی پـەیمانی خێرای ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانییەکان دووپاتـە کـردەوە. دیسـانیش زۆرینـە دژی ئـەو پێشـنیارە دەنگیان دا و لینین بەسەر تووڕیی خۆیدا زاڵ بوو هیچی نەگوت. دوانیوەڕۆی ئەو رۆژە هـەواڵی نوێ سەبارەت بە پێشڕەویی ئەڵمانییەکان گەیشتن و لینین دیسانیش داوای لە کۆمیتەی ناوەندی کردەوە، کە کۆبوونەوە بگرنەوە. ئەمجارەیان لینین بە تورەییەوە قسەی کرد و گوتی: لـەوە زیـاتر خۆم پێڕاناگیرێ. من سەرم لەوە سووڕماوە، کە ئێوە نیگەرانی ئەوەن، کە بەشـێك لـە خـاکی روسیا بدرێ بە ئەڵمانییەکان، ئەگەر قەرار بێ لە نێـوان پاراسـتنی پەڵەیـەك خـاکی روسـیا و حکوومەتی بۆلشەڤیکیدا یەکێکیان هەڵبژێرین بێگومان دەبێ حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی هەڵبژێرین. ئەگەر مەرجی ئەڵمانییەکان بۆئاشتی گۆڕینی حکوومەتی سـۆڤیتی بوایـە حـەقی خۆمـان بـوو دژی بووەسـتین، بـەڵام ئێسـتا، کـە بـە لـە دەسـتدانی پەڵەیـەکی خاکەکـەمان حکوومەتەکەمان دەپارێزین و نابێ لەوە پتر مانەوەی خۆمان بخەینە بەردەم مەترسییەوە."

پاش باسێکی دوورودرێژ لە بەرەبەری بەیانیدا دەنـگ بـۆ پێشـنیارەکەی لیـنین وەرگـیرا و ئـەمجارەیان حـەوت کـەس لـە سێزدەکەسـی بەشـدار لـە کۆمیتـەی ناوەندیـدا دەنگیـان بـە

پێشنیارەکەی لینین دا. لینین لەڕێوە بە تەلەگرافێك دەوڵەتی ئەڵمانیای ئاگادار کردەوە، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی ئامادەیە پەیمانی ئاشتی واژۆ بکا بە پێی ئەو مەرجانەی، کە لە بریست-لیتۆفسێك پێشنیار کرابوون.

بەڵام ئەڵمانییەکان ئیتر بە مەرجەکانی پێشوویان قایل نەبوون و رۆژی بیست و دووەم ی فێبریوەر کۆمەڵە مەرجێکی نوێیان هێنایە گۆڕێ، کە نەك هەر بەدەستەوەدانی زەوییەکانی لێواری بالتیك و فەنلاندی بە ئەڵمانیای لەخۆ دەگرت بەڵکو دامەزراندنی حکوومەتێکی بە رواڵەت سەربەخۆ و لە راستیدا دەستنیشانکراوی ئەڵمانیشی بەدواوە بوو. مەرجە نوییەکانی ئەڵمانیا کۆمەڵێك دژایەتیی نوێی لێکەوتەوە.

سۆسیالیستە شۆڕشگێڕە چەپەکان، کە لەو کاتدا لە دەوڵەتا بەشدار بوون پێشنیاریان کرد، کە یەکێتی لە گەڵ هاوپەیمانان(متفقین) نوێ بکرێتەوە و پێشوازی لە یارمەتیی هاوپەیمانەکان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەڵمانییەکاندا بکرێ. ترۆتسکی و سۆکۆلینکۆف کەوتنە گەڵ لایەنگرانی شەڕی شۆڕشگێڕانە و ناردنی کەسانی خۆبەخشی غەیرە سەرباز بۆ بەرەی شەڕ. لینین، کە لە کۆبوونەوەی سەرۆکایەتیی دەوڵەتدا بەشدار بوو، یادداشتێکی تەوساویی بۆ کۆبوونەوەکە نارد و تێیدا نووسیی:"تکایە دەنگی منیش بخەنە پاڵ دەنگی لایەنگرانی چەك و سێوك وەرگرتن لە چەتە ئیمپریالیستەکانی بەریتانیا و فەرەنسا." لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی بۆلشەڤیکدا لینین بە تووڕەییەوە گوتی:" ئەوەندە گەمە بە وشە و رستەی شۆڕشگێڕی مەکەن. ئەو شەڕە شۆڕشگێڕانەیەی ئەوەندەی باس دەکەن مەحاڵە و ناردنی کەسانی بێ ئەزموونی غەیرە سەربازیش بۆ بەرەی شەڕ هیچی لێ شین نابێتەوە.

ئێمە دەبێ زۆر بە خێرایی پەیمانی ئاشتی واژۆ بکەین و ئەگەر لەوەی زیاتر بگنخێنین مـن هەم لە سەرۆکایەتیی دەوڵەت و هەمیش لە کۆمیتەیی ناوەندی حیزب دەست دەکێشمەوە..."

پەیمانی بریستلیتۆفسێك ئاخرییەکەی لە رۆژی سێیەمی مارسی 1918دا واژۆ کرا. بە پێی ئەو پەیمانە زەوییەکاتی لێواری بالتیك خرایە سەر ئەڵمانیاو ئۆکراینیش کەوتە بندەستی ئەڵمانییەکان. هێزەکانی ئەڵمانیا لەو بەرەیەدا ئازاد بوون و بۆ بە هێزکردنی بەرەی خۆرئاوا بەرێ کران، بەڵام شەش مانگ دواتر بە هۆی هێرشی هێزەکانی ئەمریکی و بریتانی و فەرەنسی لە بەرەی خۆرئاواوە سەربازانی ئەڵمانی ناچار بوون پاشەکشە بکەن. هێڵی بەرگریی هێندێنبۆرگ تێکشکاو ئەڵمانیا خۆی بەدەستەوەدا. شکستی ئەڵمانیا لەو شەڕەدا لینینی لەو پەیمانە پڕ لە شوورەییە رزگار کرد، کە بە پێی پەیمانی بریستلیتۆفێسك بەسەر روسیادا داسەپێندرابوو.

# 3

یەکێك لەو یەکەمین ڕێکخراوانەی، کە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکی لە روسیادا دامەزرا و بە خێرایی پەرەی گرت ڕێکخراوی پۆلیسی نهێنیی یەکێتیی سۆڤیەتیی بوو، کە جێی "ئۆخرانا" یا پۆلیسی نهێنیی روسیای گرتەوە. سەرۆکایەتیی ئەو ڕێکخراوە بە کابرایەك بوو بە ناوی "فلیکس دێرژینسکی"، کە لە ماوەیەکی کورتدا بوو بە یەکێك لە دەستڕۆیشتووترین پیاوانی ڕژێمی تازە. دێرژینسکی کوڕی یەکێك لە دەرەبەگەکانی پۆلۆنیا بوو، کە لە کاتی خوێندنیدا ببووە ئەندامی حیزبی سۆسیال دیموکراتی لیتوانی و لە خەبات دژی پۆلیسی تەزتریدا دەستبەسەر کرابوو و دوورخرابۆوە بۆ سیبریا. دێرژینسکی زۆرینەی تەمەنی گەنجیی خۆی لە بەندیخانەدا بەسەر بردبوو و لە جەنگەی شۆڕشی روسیاشدا هەر لە بەندیخانەی مۆسکۆ بوو. دێرژینسکی پاش ئازادبوونی لە بەندیخانە ڕەگەڵ بۆلشەڤیکەکان کەوت و لە جەنگەی چالاکییەکانی خۆیدا لە نێو بۆلشەڤیکەکاندا سەرنجی لینینی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و بە خێرایی لە پەیژەی سەرکەوتن وەسەر کەوت. یەکەمین پلەی دێرژینسکی، کە ببووە هۆی سەرنجی لینین بەرەو تواناییەکانی ئەو ڕاکێشرێ، سەرۆکایەتیی گاردی بنکەی حکوومەتی نوێی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە سمۆلنی بوو. دێرژینسکی لە نێو بیینایەدا بە داهێنانی خۆی کۆمەڵە یاسایەکی توندوتۆڵی بۆ ناسین و کۆنترۆڵ دانابوو و تەنانەت کارتی پێناس و پرسیارنامەی بۆ ئەندامانی دەوڵەت و کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و بۆلشەڤیکە ناسراوەکانیش دەرهێنابوون، کە زانیارییەکانی نێو ئەو کارت و پرسیارنامانە بۆ لینینیش شتێکی نوێ بوون. دواتر لینین بە نهێنی داوای لە دێرژینسکی کرد، کە چالاکیی هێندێ لە ڕێبەرانی بۆلشەڤیکی و نابۆلشەڤیکی بخاتە ژێر چاوەدێرییەوە و لەمەودوا هەموو ڕۆژێ ڕاپۆرتێکی نهێنی لە ڕووداوەکانی ڕۆژ و چاوپێکەوتنەکان و هاموشۆکانی کەسایەتیگەلی سیاسی، بە واژۆی دێرژینسکی لە سەر مێزی کاری لینین بوو.

ڕۆژی بیستەمی دیسێمبەری 1917 لینین دێرژینسکیی بانگ کردە دیوی کارەکەی خۆی و فەرمانی پێدا، کە کۆمیتەیەك بۆ بەربەرەکانێ دژی مۆرەگەلی دژە شۆڕش پێکبێنا و چالاکییەکانی خۆی پەرە پێبدا. ئەو کۆمیتەیە گەرای ڕێکخراوی سامناکی پۆلیسی نهێنیی

روسیا بوو، کە نموونەی لەو جۆرە لە باری توند و تیژی و خێراییــەوە لــە مێــژووی هاوچــەرخی جیهاندا نــەبینراوە. ڕێکخــراوی پۆلیســی نهێنیــی یــەکێتیی ســۆڤیەتیی، کــە ســەرەتا نــاوی چێکاcheka بوو دواتر چەندین جار ناوەکەی گۆڕی و وردە وردە چالاکییەکانی لە نێــو روســیاوە بۆ سەرانســەری جیهــان تەشــەنەی کــرد. دامــەزرانی ڕێکخــراوی چــێکا و دەســتئاوڵاییــە بــێ سنوورەکەی لە ژێر ناوی خەبات دژی دوژمنان و نەیارانی شۆڕش بە سەرەتای حکوومەتی ترس و تۆقاندن لــە روســیادا لەقەڵــەم دەدرێ، کــە حــەفتا ســاڵی خایانــد. نێردراوانــی چــێکا، کــە بــە "چکیست" بە ناوبانگ بوون لە ماوەیەکی کەمداوەها ترس و سامێکیان لە پێترۆگراد ومۆســکۆ و شارەکانی دیکەدا پێك هێنا، کە ئیتر هــیچ کــەس نەیــدەوێرادژی ڕێــژیم قســە بکــاو تەنانــەت رەخنەشی لێبگرێ. چونکی چیکستەکان، کە بە وردبینییەوە لە نێوان کەسانی بێ بەزەیی و قــین لە رقەوە هەڵدەبــژێردران بــە چــووکترین بیــانوو ئــەو کەســانەی، کــە پێیــان وابــوو دژی رژێمــن قۆڵبەستیان دەکردن و شــوێنبزریــان دەکــردن. دێرژینســکی هــەر رۆژەی پیلانێکــی تــازەی دژی حکوومەتی بۆلشەڤیکی با ڕێبەرەکانی ئاشکرا دەکرد و ئاشکراکردنی ئەو پیلانانە، کە راســتی و درۆبوونیان بۆ کەس روون نەبوون بایەخ و متمانەی دێرژینسکیی لە لای لینین دەبردە سەر.

نێردراوانی چێکا رۆژهەتا ئێوارێ ئەو ماڵ نەیان هەڵدەنا و دەیانخستنە ژێر چاوەدێرییەوە، کە هاتوچۆوی جێی گومانیان دەکرا. هێرشکردنە سەر ئەو ماڵ نە و ناوەندگەلی پیلان زیاتر لە شــەودا دەبــوو و دەستبەســەرکراوانیش بــە شــەو لێیــان دەپێچــینەوە. لــە پێترۆرگــراد دەستبەسەرکراوانیان دەبردە ناوەندی پێشووی پۆلیس، کــە زۆر لــە کۆشــکی زســتانییەوە دوور نەبوو و جاری وابوو دێرژینسکی خۆی لە لێپێچینەوەی دەستبەسەرکراوەکاندا بەشــدار دەبــوو. هەموو شەوێك کۆمەڵێك خەڵك بە دیواری حەوشەی ئەو کۆنە بینایەوە تیرەباران دەکرانکە پاش لێپرسینەوەیەکی کورت و بەبێ دادگاییکردن بە جوخــەی ئیعــدام دەســپێردران. لــە جەنگــەی تیرەبارانەکانی شەوانەدا چەند لۆری بە هاڕەهاڕ بە پشــت دیوارەکــەدا دەهــاتن و دەچــوون بــۆ ئەوەی کەس گوێی لە تەقەی تفەنگ و هاوار و ناڵینی تیرەباران کراوەکان نەبێ.

بــە بــاوەڕی دێرژینســکی تــەواوی ئــەو تونــد و تیــژی و جەنایەتانــە بــۆ پتــەوکردنی کۆڵەکەکانی حکوومەتێکی تازە دامــەزراوی بۆلشــەڤیکی لــە روســیادا پێویســت بــوون. فەرمانی رون و راشکاوانەی لینین بۆ دێرژینسکی ئەوە بوو، کە دوژمنانی چینی کرێکار لە نێو بەراو لە روانگەی ئەوەوە تەواوی دژبەرانی دیکتاتۆریی بۆلشەڤیکەکان بە دوژمنــانی چینی کرێکار لەقەڵەم دەدران.

دێرژینسکی وەکو بەرپرسی کاروباری ئاسایشی لە کۆبوونەوەکانی سەرۆکایەتیی دەوڵەتیشدا بەشداریی دەرکرد. لە یەکێك لەو کۆبوونە وانەدا لینین یادداشتێکی بۆ دێرژینسکی نارد، کە تێیدا نووسرابوو:" هاوڕێ دێرژینسکی چەند کەسی دژە شۆڕش لە بەندیخانەکاندان؟" دێرژینسکی لە ژێر یادداشتەکەوە نووسیی:نزیکەی هەزارو پێنج سەد کەس"و یادداشتەکەی بۆ لینین ناردەوە. لینین پاش دیتنی یادداشتەکە لە بنییەوە هێمایەکی + (لێزیادکردنی)دانا و ئەسڵی یادداشت و وەڵامەکە دیسان گەڕایەوە لای دێرژینسکی.

دێرژینسکی پاش دیتنەوەی یادداشتەکە و ئەو هێمایەی، کە لینین لە ژێرییەوە دایتابوو لە جێگەی خۆی هەستاو بێدەنگ چووە دەرێ. یادداشت گۆڕینەوەی نێوان لینین و دێرژینسکی و چوونەدەرەوەی دێرژینسکی سەرنجی کەسی رانەکێشابوو، بەڵام بۆ سبەینێ هەواڵی سامناکی ئیعدامی بە کۆمەڵی هەزار و پێنج سەد کەسەکە، هەمووانی راچڵەکاند. دێرژینسکی هێمای+ ی لینین لە بن یادداشتەکەی خۆیەوە بە هێمای خاچ و فەرمانی ئیعدامی بە کۆمەڵ لێك دابۆوە و بۆ شەوێ ئەو فەرمانەی بەڕێوە بردبوو.

تەنیا رونکردنەوەیەك، کە لە بارەی ئەو رووداوە مەزنەوە درا لە لایەن سکرتێرەکەی لینینەوە بوو، کە گوتی:" لینین فەرمانی ئیعدامی بەندییەکانی دەرنەکردبوو و دێرژینسکی خۆی ئەو هێمایەی بە هەڵە لێك دابۆوە. هاوڕێ لینین لە بن ئەو بابەتانەی، کە دەیانخوێنێتەوە و لەبەریان دەکا ئەو هێمایە دادەنی و مەبەستی ئەو لەو هێمایە بە هیچ جۆرێك خاچ و فەرمانی ئیعدام نەبووە.!"

دیارە هەڤاڵ دێرژینسکی لە سەر ئەو هەڵەیە نەك هەر سەرکۆنەش نەکرا و سزاش نەدرا و لە سەر کاریش لانەبرا، بەڵکو پتر کەوتە بەر دڵی لینینن و لای ئەو خۆشەویستتریش بوو. پاش راگواستنی بارەگای حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە پێترۆگرادەوە بۆ مۆسکۆ، بینای گەورەی کۆمپانیای بیمەی روسیا لە شەقامی لویدبیانکا درا بە رێکخراوی چێکاو لەمەودوا ژمارەی22 ی شەقامی لوبیانکا" بەناوبانگترین شەقامی مۆسکۆ بوو.

لینین لە سەرەتای ساڵی 1918دا پایتەختی لە پێترۆگرادەوە "لینین گرادی دوایی" یەوە بردە مۆسکۆی پایتەختی کۆنی روسیا و رێوڕەسمی جێژنی کرێکاریی یەکەمی مانگی مای لەو شارەدا بەڕێوە برد.

لەو رێوڕەسمەدا لینین لە سەر دیواری کۆشکی کرملین راوەستا و هەر لەو شوێنەوە، کە ناپلیۆن سەیری گڕگرتن و سوتمانی مۆسکۆی کردبوو، سەیری ئەو جەماوەری خۆپێشاندەران و کرێکارانەی دەکرد، کە لە گۆڕەپانی کرملیندا (گۆڕەپانی سووری ئێستا) بە رێژە دەڕۆیشتن.

ئاغا تازەکەی کرملین، لەو بینا مەزنە مێژووییەدا، کە پادشا و فەرمانڕەواکانی رابردووی روسیا ژیانێکی ئەفسانەییان تێدا رابواردووە، ژیانێکی سادەی هەبوو. لینین و کرۆپسکایای ژنی و ماریای خوشکی چەند دیوێکی کۆشکیان بۆ خۆیان تەرخان کردبوو، بەڵام کۆشک رەنگ وبۆنی رابردووی نەمابوو و ئەو کەسانەی، کە لە شوێنی ژیانی لینین چاویان پێی دەکەوت لەبەر بۆنی پشیلە (کە لینین زۆری کەیف بەو ئاژەڵە دەهات) و خواردنی کۆن و بەرماو، بێزار دەبوون.

لینین و هاوبیرەکانی، کە لە تەواوی ژیانیاندا تەنیا بیریان لە شۆڕش و تێکدان دەکردەوە، ئەزموونی گیروگرفتەکانی حکوومەت و ئاوەدانی‌یان نەبوو و نەشیاندەزانی چییە، هەر بۆیەش لە یەکەمین مانگەکانی دەسەڵاتداریێتی‌یانەوە تووشی کۆمەڵە گرفتێکی وا هاتن، کە بۆ زاڵ بوون بەسەریاندا و بۆ پێشگیری لە سەر هەڵدانی خەڵك جگە لە پەنا بردنە بەر توند و تیژی و سەرکوت چارەیەکی دیکەیان نەبوو. کارخانەکان بە هۆی ناپسپۆڕیی و ناشارەزایی بەڕێوەبەرە تازەکان و نارەزایەتی و کەمکاری و کەمبوونی کەرەسەی خاو، لە کار کەوتن یا ئەوەی کە بەرهەمەکانیان نیوە بوون. وەرزێران، کە جێگەی دەرەبەگەکانیان گرتبوونەوە و زەخت و گوشاری ئاغاوەتیان بەسەرەوە نەبوو تەمبەل و تەوەزەل ببوون و مەیلێکیان بە کاروباری کشتوکاڵ نەمابوو. لە لایەکی دیکەشەوە لەبەر ئەوەی کە کارخانەکان لە کار کەوتبوون و هیچ بەرهەمێکیان بۆ گۆڕینەوە لەگەڵ بەرهەمگەلی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بەرهەم نەدێنا، وەرزێران بەرهەمەکانی خۆیان بە خۆڕایی نەدەدا بە نێردراوانی دەوڵەت. کەمبوونی خۆراك و خواردەمەنی لە شارەکاندا دەوڵەتی هێنایە سەر ئەوەی کە لە رێکەوتی دەی مانگی مای 1918دا فەرمانێك دەربکا، کە بە پێی ئەو فەرمانە نێردراوانی دەوڵەت دەستیان ئاوەڵابوو لە دەستەبەسەرداگرتنی گەنمی پاشەکەوت کراو و ئاژەڵی زیادیی "وەرزێرە دەوڵەمەندەکان". بە هۆی ئەوەی کە تەواوی وەرزێرەکان پاش دامەزرانی حکومەتی بۆلشەڤیکی ژیانێکی وەك یەکیان هەبوو دەستەواژەی "وەرزێرە دەوڵەمەندەکان" بەو کەسانە دەگوترا کەزیاتریان زەحمەت کێشابوو و بە ماندووبوونی خۆیان بەرهەمێکی پتریان وەدەست هێنابوو.

ئەو گرفتانەی لە بەڕێوەبردنی ئەو فەرمانە کەوتنەوە بوونە هۆی ئەوەی کە رۆژی یازدەی ژووئەن فەرمانێکی دیکە دەرکری و کۆمیتەیەك بە ناوی "کۆمیتەی هەژاران" بە دەست-ئاوەڵایی تەواوەوە پێی ئەسپێردرا، کە فەرمانەکەی پێشوو بەڕێوە بەرێ. ئەو کۆمیتەیە، کە نوێنەرگەلێکی چێکا"ی پۆلیسی نهێنیی روسیاشی تێدا بوو لە هەر ناوچەیەکی کشتوکاڵی کۆمیتەیەکی ناوچەیی پێك هێناو تەواوی گوندو ناوچە کشتوکاڵییەکانی لە خۆ گرت. چالاکیی

ئەو کۆمیتانە لە گوندەکاندا کەش و حاڵەتێکی پڕ لە ترس و خۆف و لێك دڕدۆنگی و ناتەباییەکی باوێنەی خستە نێو وەرزێرانەوە. هەرکەسەی لە حەولی ئەوەدا بوو بەرهەمەکەی خۆی بشارێتەوە، دراوسێ لە سەر دراوسێکەی ببووە سیخوڕ. زۆربەی وەرزێران وایان پێ باشتر بوو، کە مەڕ و ماڵ تەکانیان بکوژنەوە و واز لە کشتوکاڵ بێنن، بەڵام ئاژەڵ و بەرهەمەکانیان نەدەنە دەست لێپرسراوان و نێردراوانی دەوڵەت. ئەو ناهەقی و گوشارە لە زۆربەی ناوچە کشتوکاڵییەکان بوونە هۆی سەرهەڵدانی وەرزێران، کە لە لایەن گاردە بێ بەزە و سەرکوتکەرەکانی چێکاوە سەرکوت کران.

سڕینەوەی بە تەواوەتیی ئازادییەکان لە روسیادا بە سەرکوتی حیزب و لایەنە سیاسییەکان و داخستنی رۆژنامە و بڵاڤۆکەکان و هەڵوەشاندنەوەی پەرلمانی دامەزرێنەران و تیرۆرەکانی رێکخراوی چێکاوە دەستی پێکردبوو و بە سەرکوتی بێ بەزەییانەی سەرهەڵدانی وەرزێران بە لوتکەی خۆی گەیشت. پەیمانی پڕ لە شوورەیی برێستلیتۆفێسك، کە روسیای لە پڕپیت و بەرەکەتترین ناوچەکانی خۆی واتە دەشتی ئۆکراین بێبەریی کردبوو سەرەڕای کاردانەوە دروونییەکانی، ببووە هۆی ئەوەی کە خەڵك نەتوانن کەمترین بژیو و پێداویستییەکانی ژیانیان پەیدا بکەن، و ئەوەش بوار و دەراوی بۆ سەرهەڵدان و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی نوێ خۆش کرد.

تەواوی حیزب و لایەنە سیاسییەکان بێجگە لە سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان، کە هاوکاریی لینینیان دەکرد، لە رووی حکوومەتی بۆلشەڤیکیدا راوەستابوون تەنانەت ئەو سەرباز و مەلەوانانەش، کە لە رووخاندنی حکوومەتی کێرێنسکی و بە دەسەڵات گەیاندنی لینیندا رۆڵی بەرچاویان ببوو لەوەیکە دەیانبینی ئەوە، کە ئەو شۆڕشەی لە زەینی خۆیاندا سازیان کردبوو لە تراویلکەیەك بەو لاوەتر نەبووە، ئێجگار ناڕازی بوون. بە جۆرێك، کە لینین ناچار بوو دێرژینسکی راسپێرێ، کە لە نێو هێزی چەکدارەکاندا کۆمیتەیەکی خەبات دژی مۆرە"دژە شۆڕشەکان "دامەزرینی و پاکسازییەکی خوێناوییان لە نێودا وەڕێبخا.

# 4

لـه بـەهاری سـاڵی 1918 وە دوو گرووپـی سیاسـی لـە روسـیادا بەمەبەسـتی رووخانـدنی حکوومـەتی لینین هەوڵیان دا یارمەتی لە لایەنە دەرەکییەکان وەرگرن. یەکێك لەو دوو لایەن هـەوڵی دەدا بـە مەبەسـتی رووخانـدنی ئـەو رژێمـە و دامەزراندنـەوەی رژێمـی پادشـایەتی یارمـەتی لـە ئەڵمانییەکان وەرگرێ و ئەویتر، کە بە "یەکێتی ژیانەوەی روسیا" ناوی دەرکردبوو هەوڵی دەدا، کـە بۆ خەبات دژی سەرەڕۆیی بۆلشەڤیکی یارمەتی لە بـەریتانیاو فەڕەنسـا و ئـەمریکا وەرگـرێ و بـە شێوەی فەرمی داوای لە هاوپەیمانەکان کردبوو، کە بەرەیەکی نوێ لە روسیا بکەنەوە.

هاوپەیمانەکان لە رێکەوتی واژۆی پەیمانی"برێستلیتۆفسێك" ــەوە دەیانویست لە بەرامبەر حکوومـەتی نوێی روسیادا راوەستن. داوای رێکخراوی "یەکێتیی ژیانەوەی روسیا"، کـە لەگـەڵ پێشنیارێکی هاوشێوە لە لایەن گرووپێکی سیاسیی نوێوە بـە نـاوی "ناوەنـدی نەتەوەییـەوە" خرایە بەر باس لە ئەمریکا و فەڕەنسا و بەریتانیاوە پێشوازیی لێکراو بوار بۆ ناردنی هێـز لـە لایەن ئەو سێ وڵاتەوە بەمەبەستی یارمـەتیی خـەباتکارانی روسـی بـۆ شـەڕ دژی ئـەڵمانیا و رژێمی بۆلشەڤیکی ئامادە و خۆش کرا.

فاکتەرێکی دیکەی، کە بووە هۆی ئەوەی کە ئەو بڕیارە خێرا بەڕێوە بچێ، دابەزینی هێزە ژاپۆنییەکان لە خۆرهەڵاتی سیبریا بوو. هێزە ئەمریکی و بریتانی و فەڕەنسییەکان لە ژووئیەی ساڵی1918دا لە بەندەرەکانی ڤیلادیۆستك و مۆرمانسـك و ئارخانگیـل دابـەزین. بیـانووی دابەزینی ئەو هێزانە لە خۆرهەڵاتی سیبریا بەرپەرچدانەوەی کردەوە سەربازییەکانی ژاپۆنییەکان بوو، بەڵام هاوپەیمانەکان لە راستیدا لاوازکردنی حکوومـەتی نـوێی یـەکێتیی سـۆڤیەتیشـیان مەبەست بوو.

رووداوێکی گرینگی دیکـەی، کـە لـەو ماوەیـەدا هاتـەپێش وەرێکـەوتنی گروپـی هێـزە خۆبەخشەکانی چێك و سلۆڤاکیا لە روسیا بوو بۆ ئەوەی رەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانەکان بکەون.

ئەڵمانییەکان هەڕەشەی ئەوەیان کرد، کە وەدەرکـەوتنی ئـەو هێزانـە و چـوونیان بـۆ نێـو هێزەکانی هاوپەیمانەکان پێشێکردنی پەیمانی برێست لیتۆفێسکە. ترۆتسـکی، کـە لـەو کاتـدا وەزیری شەڕ بوو فەرمانی چەککردنی هێزە خۆبەخشەکانی چیکیی دەرکرد. هێـزە چـیکییەکان

سەرپێچییان لەو فەرمانە کرد و ڕۆژی شەشەمی مـای لـە ناوچـەی ویلگـا لەگـەڵ هێزەکـانی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی تێکهەڵچوون و هەمووانیان چەککردن و قۆڵبەست کران.

هەواڵی ئەو ڕووداوە لینـینی زۆر تـووڕە کـرد فـەرمانی دا، هێـزی تـەواو بـۆ سـەرکوتی فەرماندەرانی چیکی بەڕێ بکرێ. بەر لەوەی ئەو هێزانە بگەنـە ناوچـەی ویلگـا، کرێکـاران و سەربازانی دژ بە بۆلشەڤیکەکان کەوتنە گەڵ هێزە خۆبەخشە چیکییەکان و کۆمیتەیەکیان بـە ناوی "کۆمیتەی لایەنگریکردن لە پەرلمانی دامەزرێنەران" دامەزراند. ئەو کۆمیتەیە بۆ پێـك هێنانی سوپایەکی خۆبەخشی نەتەوەیی دەست بەکار بوو و یەکەمین یەکەکانی سوپای خۆبەخش بە خێرایی ڕێکخران. هێزەکانی ناوچەی ئۆرالیش ڕەگەڵ ئەو هێزانە کـەوتن و زۆری نەخایانـد، کە ناوچەیەکی بەرین لە "سامارا " لە قەراخی ویلگاوە هەتا ڤیلادیۆستك کەوتە دەستی هێزە دژبـەرەکانی بۆلشـەڤیکەکان. لـە ناوچـەی "دۆن" ژەنـەراڵ ئالکسـێڤ و ژەنـەراڵ کۆرنیلـۆف فەرمانەرانی پێشووی سوپا هێزێکیان بە ناوی" سوپای سپی" دامەزراند. لە سەرەتاکانی ساڵی 1918دا ڕێژەی سەربازانی ئەو سوپایە لە 3000 کەس پتر بوون. بۆلشەڤیکەکان هێزێکـی 10000کەسییان بۆ بەرپەرچدانەوەی سوپای سپی نارد و بەرەو ئیستێپەکان ڕاویان نـان. لـە شەڕێکدا، کە ڕووی دا ژەنەراڵ کۆرنیلۆف کوژرا.

دوو مانگ دوواتر پاشماوەی سوپای خۆبەخش، کە ژمارەیان لە هـەزار کـەس تێنەدەپـەڕی هێرشێکی کتوپڕیان کرد و تا ڕادەیەك سەرکەوتنیان دەستەبەر کرد. ئەو سەرکەوتنە بووە هۆی ئەوەی کە کەسانێکی تازەیان ڕەگەڵ بکەون. ژمارەی ئەندامـەکانی ئـەو سـوپایە لـە مـانگی ژوئەنی 1918دا گەیشتە دوازدەهەزار کەس و لە مانگی ژوئیەدا بوونە 30000 کـەس و لە ئۆکتۆبەری ئەو ساڵەدا نزیکەی 100000کەس بـوون. فەرمانـدەریی ئـەو هێزانـە، کـە ناوچەیەکی بەرینیان لەبەردەستدا بوو لە ئەستۆی ژەنەراڵ دێنیکینdenikin بوو.

لە هاوینی 1918دا سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان، کە هەتا ئەو کات لە بەرامبەر لینیندا دانیان بە جەرگیان داگرتبوو دژایەتیی میتۆدە توند و تیژەکانی لینینیـان کـرد و گەڵاڵەیـەکی پێـنج مادەییـان دا بـە کـۆنگرەی ئەنجوومەنـەکان. بنـەمای ئـەو گەڵاڵەیـە ئـەوە بوو:1_هەڵوەشاندنەوەی پۆلیسی نهێنیی چێکا 2ـکۆکردنەوەی گرووپە پەلاماردەرییەکان لـە گوندەکان 3ـ هەڵوەشاندنەوەی لەشکری سوور(سوپای نافـەرمی، کـە پێکهـاتبوو لـە مـۆرەی وەفادار بە بۆلشەڤیکەکان و هاوتەریب بوو لەگەڵ سوپای فەرمی) 4ـ هەوڵدان بـۆ پێکهـاتن و ئاشتەوایی لەگەڵ هێزە سەربزێوەکان 5ـ دەسپێکی شەڕی پارتیزانی دژی ئەڵمانییەکان.

لینین دەمودەست ئـەو پێشـنیارانەی ڕەت کـردەوە و فـەرمانی قۆڵبەسـتکردنی ڕێبـەرانی سۆسیالیستە شۆڕشگێڕە چەپەکانی دەرکرد. ڕێبەرانی شۆڕشگێڕی خۆیان شـاردەوە و دەسـتیان کرد بە خەباتی نهێنی. ڕۆژی شەشەمی ژوئیەی 1918 یەکێك لە ئەنـدامانی سۆسیالیسـتە چەپەکان، کە ئەندامی پۆلیسی نهێنیی چێکا بوو بە کەڵك وەرگرتن لە پێگەکەی خـۆی خـۆی گەیاندە باڵوێزخانەی ئەڵمانیا لە مۆسکۆ و کۆنت میرباخی باڵوێزی ئەڵمانیای کوشت.

سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکان لە نێو سوپاو چێکاشـدا لایـەنگریان هـەبوون. بـە دوای ئـەو ڕووداوەدا شۆڕشێکی چەکدارییان وەڕێ خست و هێندێك لە دامەزراوە دەوڵەتییەکانیان و یـەك لەوان ڕێکخراوی چێکا و بینای تەلەگرافی ڕوسیایان گرت.

دێرژینسکی گیرا و لە تەلەگرافخانەی مۆسکۆوە کۆمەڵە پەیامێك لە دژی بۆلشـەڤیکەکان بۆ سەرانسەری ڕوسیا بەڕێ کران، بەڵام تەلەفۆنخانە و ناوەندەکانی پێوەنـدیی گـرتن بـە بێتـەل بەدەست دەوڵەتەوە بوون و لینین بە کەڵك وەرگرتن لەو ڕێگەیە لەڕێوە هێزی بۆ سـەرکوتکردنی شۆڕشەکە کۆ کردنەوە. شـۆڕ لـە مۆسـکۆ بـەر لـەوەی، کـە پـەرە بسـتێنێ سـەرکوت کـراو دێرژینسکی ئازاد کرا. لینین بە نیسبەت پـەرەگرتنی سـەرهەڵدانەکان لـە شـار و ناوچـەکانی دیکەدا هێندەی ڕە وشی مۆسکۆ و پێترۆگراد پەرۆش بوو. لینین لە نامەیەکیدا بۆ ستالین، کـە لەو کاتەدا بەرپرسی سەرکوتی سەرهەڵداوان بوو لە تەزاریتسین (کە دواتر بوو بە سـتالینگراد) نووسیی" ئەو سەرهەڵدانە دەبێ بێبەزەییانە و بە بێ کات بە فیڕۆدان سـەرکوت بکـرێ... لـە چووکترین گنخاندن و خاوەخاو، نابوورین." و ستالین وەڵامی دایـەوە"دڵنیابن، کـە تۆسـقاڵێك بەسەر دوژمنەوە ناچین".

کوژرانی کۆنت میربـاخ بـووە هـۆی تارەزایـەتیی تونـدی دەوڵـەتی ئـەڵمانیا و لیـنین بـۆ قایلکردنەوەی ئەڵمانییەکان و پێشگیری لە ئەگەری دژکردەوەی ئەوان گفت و بەڵێنی دانێ، کە بەهەر نرخێك بووە بکوژەکەی دەگرن و سزای دەدەن، بـەڵام بکـووژ بـۆی دەرچـوو و لیـنین بـۆ دامرکاندنەوەی ئەڵمانییەکان فەرمانی دا، کـە بیسـت کـەس لـەو سۆسیالیسـتە شۆڕشـگێڕە چەپیانەی وا لە بەندیخانەدا بوون، لە تۆڵەی باڵوێزی ئەڵمانیا تیرەباران بکرێن!

لە نێوەڕاستەکانی مانگی ژووئیەی 1918دا حکوومەتی بۆلشەڤیکی جگە لە مۆسکۆ و پێترۆگراد و چەند گەورەشاری دیکە بە گوێرەی پێویسـت بەسـەر ڕوسـیادا زاڵ نـەبوو و هێـزە دژبەرەکان، کە هەر کام سەر بە لایەن و گرووپێك بوون لـە هـەر چـوار قوڕنـەی وڵاتـەوە دژی بۆلشەڤیکەکان شەڕیان دەکرد.

پێوەندیی روسیا لەگەڵ زۆربەی بەشەکانی ناوەندیی روسیا و سیبریا و ئـۆکراین و کرێمـە و قەفقازدا پچڕابوو. لینین لەوەها هەلومەرجێکدا کەوتە بیری ئەوەی کە بـوونی تـەزار نیکـۆلای ئیمپراتۆری دوورخراوە لەوانەیە ئەوو حکوومەتەکەی تووشی مەترسی بکا، لەبـەر ئـەوەی کـە لێرە و لەوێ دەنگۆی گەڕانەوە بۆ رژێمـی پادشـایەتی دەبیسـرا و بـە زیـادبوونی لایـەنگرانی پادشایەتی مەترسیی ئەوە هەبوو، کە لایەنە دژبەرەکان دواجار لە بوونی تەزار و گەڕانـەوە بـۆ رێژمی پادشایەتیدا خاڵێکی هاوبەش بەدی بکەن.

تـەزار نیکـۆلاو بنەماڵەکـەی پـاش شۆڕشـی روسـیا لـە مـانگی مارسـی 1917دا لـە "تسارسکۆیە سلۆ" لە نیزکیی پێترۆگراد لە ژێر چاوەدێریدا بوون. لە ژوئیەی ئەو ساڵەدا دەوڵەتی کاتی هاتە سەر ئەوەی کە بنەماڵەی پادشایەتی بۆ تۆبۆلسك tobolsk ی سیبریا دوور بخەنـەوە. لە مانگی مارسی 1918دا بەرپرسانی بۆلشەڤیکیی ناوچەی ئۆرال پێشنیاریان کـرد بنەماڵـەی پادشایەتی بۆ ئێکاترینبۆرگ ekaterinburg راگـوێزن بـۆ ئـەوەی رێگـە بگـرن لـە ئەگـەری دزینەوە و رزگارکردنیان لـە لایـەن سـەرهەڵداوان و هێـزە دژەشۆڕشـەکانەوە. پـاش راگواسـتنی بنەماڵەی پادشایەتی بۆ ئێکاترینبۆرگ ئەنجوومەنی ناوچەیی کەبۆلشەڤیکەکان تێیدا زۆرینە بوون پێشنیاری ئیعدامی تەزارەکانیان، کە لە لایەن چـەند ئەنـدامێکی ئەنجوومـەنی بۆلشـەڤیکییەوە پێشنیار کرابوو، تاوتوێ کرد، بەڵام زۆرینەی ئەندامانی ئەنجوومەن دژی ئەوە بوون، کـە بـەر لـە وەرگرتنی رەزامەندیی مۆسکۆ ئیعدامیان بکەن. ئەنجوومەنی ئێکاتینبۆرگ ئاخرییەکەی بڕیـاری دا رێبەری بۆلشەڤیکەکان بۆ روونکردنەوەی چارەنووسی تەزار و بنەماڵەکەی بنێرێتە مۆسکۆ.

کۆمیتەی ناوەندیی بۆلشـەڤیکی سـەرەتا مەسـەلەی دادگـاییکردنی بـە ئاشـکرای تـەزار نیکۆلای لە ئێکاتینبۆرگ تاوتوێ کرد و زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەش لە سەر ئەو بڕیارە کۆك بوون، بەڵام لینین پێك هێنانی دانیشتن و کۆبوونەوەی دادگـاییکردنی بـۆ تـەزار، بـە کـارێکی زیادی و تەنانەت مەترسیداریش دەزانی.

لینین دەیگوت بە پێك هێنانی وەها دادگایەك ئێمە جارێکی دیکە تەزار دەخەینـەوە سـەر زار و زمانان و گێچەڵێکی تازە بۆخۆمان ساز دەکەین.

پەرەگرتنی چالاکیی سەرهەڵداوان و نزیکبوونەوەی لێژیۆنێرە چیکییەکان بە ئێکـاتینبۆرگ هەر چەشنە گومانێکی سەبارەت بە چارەنووسی بنەماڵەی پادشایەتی رەواندەوە و لینین وێـڕای دەرکردنی فەرمانی کوشتنی تەزار نیکۆلا و بنەماڵەکەی پێی لە سـەر ئەوەداگرتـەوە، کـە بـە شێوەیەك تەزار و بنەماڵەی رۆمانۆفەکان لە نێو بەرن کە:" دژە شۆڕشەکان تەنانـەت ئیسـك و

پروسکەکانیشیان دەست نەکەوێ، کە بۆ کەڵکی خراپ وەرگرتن لە نەزانینی ئەو کەسانەی خەون بە گەڕانەوەی پادشایەتییەوە دەبینن، دەکاریان بێنن."!

ئەو وەفدەی بۆ بەڕێوەبردنی ئەم فەرمانە راسپێردرابوو شەوی 16ی ژوئیە گەیشتە ئێکاتینبۆرگ و ئەندامەکانی دەمودەست لەگەڵ بەرپرسانی ناوچەکە لە شوێنی نیشتەجێبوونی بنەماڵەی پادشایەتی کۆبوونەوە. بە جۆرێك، کە بایکۆف Bykov یەکێك لە کۆمیسێرەکانی ناوچە دەگێڕێتەوە: ئەو کەسانەی کوشتنی بنەماڵەی پادشایەتییان پێ ئەسپێردرابوو لە جەنگەی نیوەشەوێدا گەیشتنە شوێنی ژیانی ئەوان و فەرمانیاندا، کە بنەماڵەی تەزار و هاوڕێکانیان، کە لە نهۆمی سەرەوە خەوتبوون بێننە خوارێ. بەر لە هەمووان تەزار و مەلیکە ئالیکساندرایان، کە نەخۆش بوو لە خەو هەستاند و دواتر نۆرە گەیشتە ئالێکسیی کوڕی تەزار و چوار کچەکانیان. جگە لە ئەندامانی بنەماڵەی پادشایەتی، دۆکتۆر بۆتکین، کە پزیشکی بنەماڵەی تەزار بوو لەگەڵ سێ کارەکەری بنەماڵەی پادشایەتی، کە هەموانیان لە خەو هەستاندبوون بردیاننە ژێرزەمینەکەوە.

تەزار و ئەندامانی بنەماڵەکەی هەتا نەگەیشتنە ژێرزەمینەکە نەیانزانی چیان بەسەر دێ، چونکی پێیان گوترابوو، کە لەبەر ئەوەی هێزە دژە شۆڕشەکان گەرەکیانە هێرش بکەنە سەر ئێکاتینبۆرگ دەیانە وێ لە نیوەی شەویدا بیانبەنە شوێنێکیدیکە، بەڵام هێشتا چەند ساتێك بەسەر کۆکردنەوەیاندا لەوێ تێنەپەڕیبوو، کە دەنگی قورسی تریەی پێیەك لە پێپلیکانەکانەوە بیسرا و چەند ساتێك دواتر چەند کەس لەگەڵ کۆمەڵێك چەکدار وەژوور کەوتن. حوکمی ئیعدامەکە، کە لە چەند دێڕێك پتر نەبوو خوێندرایەوە و بە ئاماژەی کۆمیسێر لەڕێوە رێژنەی گوللەیان بەسەر تەزار و ئەندامانی بنەماڵەکەی و هاوڕێکانیدا باراند. ئەو رێوڕەسمە بە هەموویەوە لە دوو خولەکی پتر نەخایاند و هەر یازدە کەسیان دەمودەست کوژران".

بە فەرمانی یورۆڤێسکی Yurovsky ی کۆمیسێری راسپێردراوی بەڕێوەبردنی بڕیارەکە، تەرمەکانیان، کە هێشتا خوێنیان لێ دەچۆڕانەوە لەو بەتانییانەوە پێچان، کە لە جێوبانەکەیان کۆیان کردبوونەوە و لە لۆرییەکدا لە سەر یەك کەڵەکەیان کردن. تەرمەکانیان لە نیوەشەوێکدا بردە کانگایەکی چۆڵی دەرەوەی شار و کاروبارەکەی تر خرایە سبەینێ. یورۆسکی دەیویست فەرمانەکەی لینین بێ ئەملاوئەولا جێبەجێ بکا و جووقەواری بنەماڵەی پادشایەتی وا لە نێو بەرێ، کە تەنانەت ئێسك و پروسکیشیان نەمێنێتەوە بۆ ئەوەی، کە دژە شۆڕشەکان کەڵکی لێ وەرگرن.

به پێی ئەو فەرمانە تەرمەکانیان پارچەپارچەکردن و لە ئەسیدسـوڵفۆریکیـانکردن و پـاش ئەوەی کە دڵنیابوون لەوەیکە تەواو تواونەتەوە رشتیاننە نێو چاڵێکەوە، کە پێشـتر ئامادەیـان کردبوو و سەریان پڕ کردەوە. فەرمانی لینین بۆ ئیعدام لـە نێـوبردنی رۆمانۆفـەکان تـەنیا بـۆ بنەماڵەی پادشایتی بوو، بەڵام راسپێردراوانی لینین پزیشـك و کارەکەرەکانیشـیان وەبـەردان و تەرمی ئەوانیشیان بە مەرەدی تەرمی بنەماڵەی پادشایەتی برد.

هەواڵی فەرمیی ئیعدامی تەزار نیکۆلا رۆژی 18ی ژوئیـە لـە کۆبوونـەوەی ئەنجوومـەنی کۆمیسیۆنەکانی گەل (سەرۆکایەتیی دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی)دا راگەیەندرا.

ئەنجوومەن خەریك بوو لە سەر گەڵاڵەی پاکوخاوێنیی گشتی دەدوا، کە سۆردۆلۆف سەرۆکی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی کۆنگرەی ئەنجوومەنەکان وەژوور کەوت و سرتەیەکی لەگەڵ لینین کـرد. لینین قسەکانی بە کۆمیسێری تەندروستی بڕی و گوتی هاوڕێ سۆردۆلۆف دەیـەوێ شـتێك بـە ئەنجوومەن بڵێ و ئەمجار سۆردۆلۆف گوتی:

" دەمــەوێ ئەنـدامانی ئەنجوومــەن ئاگـادار کەمــەوە، کـە ئـەمڕۆ هـەر ئـەمڕۆ، لــە ئێکاترینبۆرگەوە هەواڵی ئیعدامی نیکۆلای دووەممان پـێ گەیشـت. نیکـۆلا هاوکـات لەگـەڵ نزیکبوونەوەی لیژیۆنێرەکانی چیك لە ئێکاتینبۆرگ ویستوویەتی رابکا. کۆمیتەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنەکان ئەم کردەوەیە پشتڕاست دەکاتەوە."

لە راپۆرتەکەی سۆردۆلۆفدا ئاماژە بە ئیعدامی ئەندامانی دیکـەی بنەماڵـەی پادشـایەتی نەکرابوو. رۆژنامەی "ئیزۆسینا"ش رۆژی 19ی ژوئیــەی 1918 هــەواڵێکی بــە درۆی لــەو پێوەندییەدا بڵاو کردەوە و نووسیی:" هاوسەر و منداڵەکانی نیکۆلا رۆمـانۆف بـۆ شـوێنێکی قایم راگوێزران." و بەو شێوەیە وایان نواند، کە تەنیا تەزار ئیعدام کـراوە. لیـنین سـەرەتا لـە کاردانەوەی خراپی بڵاو بوونەوەی هەواڵی هاوسەر و منداڵەکانی نیگەران بـوو و هـەر بۆیـەش هیچ کات هەواڵی ئیعدامەکەیان بە فەرمی بڵاو نەبۆوە.

پاش ئیعدامی تەزار نیکۆلاو هاوسەر و منداڵەکانی، حەوت کەسی دیکـە لـە ئەنـدامانی بنەماڵەی رۆمانۆفەکان، کە لە ئۆرال بەند کرابوون ئیعدام کران. گرانۆك میخاییل‌ی برای تەزار پێشتر لە شاری "پرێم" تیرەباران کرابوو.

پێ‌بەپێی زیادبوون و پەرەگرتنی چالاکیی دژبەران و بڵێسەدارتربوونی شۆڕشە چـەکدارییەکان لـە شوێنە جیاجیاکانی وڵاتدا، توندو تیژی و تونـدوتۆڵیی حکوومـەتیش دژی بەرهەڵسـتکارەکانی، بـە تەوژمتر دەبوو. لینین لە رێکەوتی 9ی ئوتدا تەلەگرافێکی بۆ بەرپرسانی بۆلشەڤیکیی سەرانســەری

روسـیا نـارد، کـە نیشـاندەر و روونکـەرەوەی بـیر و بـاوەڕە کـانی ئـەو سـەبارەت بـە چـۆنییەتی بەرپەرچدانەوەی دژبەرانە. دەقی فەرمانی تەلەگرافەکە بەو شێوەیەیە:

"پێویستە خێرا گاردی نموونە لە کەسانی باوەڕپێکراو و هەڵبژاردە پێکبێـنن. ئـەرکی ئـەو گاردانـە سـەرکوتی بـێبەزەییانـەی مـۆرە دژە شۆڕشـەکان و قەشـە و گـاردە سـپییەکانە. گومانلێکراوانیش دەسگیر بکەن و لـە ئۆردووگاکـانی دەرەوەی شـاردا دەستبەسـەریان بکـەن. چۆنییەتی بەڕێوەچوونی ئەو فەرمانەش رابگەیەندرێتەوە

**سەرۆکی ئەنجوومەنی کۆمیسارپای گەل، لینین**

هەر لە سەرەتای دامەزرانی حکوومەتی سـۆڤیەتییەوە هێنـدێ دەنگـۆ لـە سـەر لیـنین و رێبەرانی رژێم هەبوون. لەگەڵ پەرەگرتنی ئەو دەنگۆیانە لەبەرچاوگرتنی رێوشوێنی تەناهی بـۆ پاراستنی گیانی لینین توندتر دەبوو. لە ژانوییەی ساڵی 1918دا تەقە لەو ماشێنە کرا، کـە لینینی تێدا بوو و لەمەودوا کارەبەدەستەکانی چێکا تەواو چاویان بەسەر لینینەوە بوو.

رۆژی 30ی ئوتی 1918 لینین لە کۆبوونەوەیەکی کرێکاریـدا قسـەی دەکـرد. لـە نێـو خەڵکەکەدا ژنێك دەبینرا، کە لە ریزی پێشەوە لـە نزیـك یـەکێك لـە دەرگـەکانی هۆڵەکـەوە دانیشتبوو بەردەوام جگەرەی دەکێشـا. کاتێـك لیـنین قسـەی تـەواو بـوون و بـەرەو دەرگـەی وەدەرکەوتنەکە وەڕێ کەوت ئەو ژنەش لە جێگەی خۆی هەستا و بەدەم رێگـەوە پرسـیاری لـە لینین دەکردن و ئەویش وەڵامی دەدانەوە. کاتێك لینین دەیویست سواری ماشێنەکەی بێت ئـەو ژنە بە خێرایی لە بن چارشێوەکەیەوە دەمانچەکەی دەرێنا و سێ فیشەکی داڵبەداڵ بە لینینەوە نا. فیشەکەکان لە یەك مەترییەوە هاویژرابوون و کاتێك لینین وەعەرز کەوت هـەمووان پێیـان وابوو، کوژراوە، بـەڵام لیـنین پـاش چـەند چـرکەیەك هەسـتایەوە سـەر پـێ و بـە یارمـەتیی دەوروبەرییەکانی سواری ماشێنەکەی بوو و ماشێنەکە بە خێرایی بەرەو کرێملین وەڕێ کەوت و پشکنینە سەرتاییەکانی پزیشکان دەریانخسـت، کـە سـەرەڕای ئـەوەی فیشـەکێك ئیسـقانی نێوشانی پێکاوە فیشەکێکی دیکە لا ملی رووشاندووە هیچ مەترسییەکی لە سەر نییە.

ئەو ژنە نەیدەزانی تەقە بکـا ئـەگینا لـە مەودایـەکی ئـاوا کەمـەوە تەنانـەت فیشـەکی کەسێکی تازەکاریش خەتا ناکا. ئەویان لە کاتێکدا، کە دەیویست رابکا گرت و هەر ئەو شەوە لە ناوەندی چێکا لە شەقامی لۆبیانکا لێپێچینەوەیان لێکرد.

ئەو ژنە خۆی بە ناوی فانیا کاپلان ناساند و گوتی لەبەر ئەوەی، کە لینینی بە خەیانەتکار بە شۆڕشی روسیا زانیوە بڕیاری داوە بیکوژێ. کاپلان گـوتی بـەهۆی چـالاکیی شۆڕشـگێڕانە

ماوەی یازدەساڵ لە بەندیخانە و تاراوگەدا بووە، بەڵام دەبینێ ئەمرۆکە لینین تەواوی ئاواتەکانی شۆڕشگێڕانی بە فیڕۆ داوە و رژێمێکی لە تەزارەکان دیکتاتۆرتری دامەزراندووە.

ئیعدامی بەبی دادگاییکردنی کاپلان یەکێك بوو لە نموونەکانی دادپەروەریی شۆڕشگێڕانە" ی سەردەمی دەسەڵاتدارییەتیی لینین، کە لە بیرەوەرییەکانی "پـاول مـالکۆف"ی فەرمانـدەی گاردی کرێملین لە ساڵەکانی 1918 هـەتا 1920دا بـە وردی باسـی کـراوە. بەشـێك لـەو بیرەوەرییانـــە لـــە ژمـــارەی رێکـــەوتی نۆڤەمبـــەری 1985ی گۆڤـــاری روســـیی سپۆتنیكSputnik.Nov 1985ی چـاپی مۆسـکۆدا هـاتووە و مـالکۆف دەنووسـێ:" بـۆ سبەینێ، کە هەوڵدرا لینین بکوژرێ راسپێردرام، کە کاپلان لە رێکخراوی چێکا وەرگرم و ئەوم لە یەکێك لە ژێرزەمینەکانی کرێملیندا بەند کرد. دوو رۆژ دواتر فـەرمانێکم لـە کرێملینـەوە پێگەیشت، کە کاپلان دەبێ دەمودەست تیرەباران بکرێ. کاتژمێر چواری دوانیوەرۆی هەر ئـەو رۆژە"رۆژی 3ی سێپتەمبەری1918 لە حەوشەی کۆشکی کرێملین ئیعدامم کرد..."

ئەو رۆژەی فانیا کاپلان ویستی لە مۆسکۆ لینین بکوژێ خوێندکارێکی گەنجی جوولەکە لـە پێترۆگراد یۆریتسكUritskyی سەرۆکی چێکای پێترۆگـرادی کوشـت. هاوکـاتبوونی ئـەو دوو رووداوە بووە هۆی تونـد و تیژبیـەکی بـێ وێنـە لـە لایـەن پـۆلیس و گاردەکـانی سـوورەوە. لێپرسراوانی چێکا لە پێترۆرگراد لـە مـاوەی چـەند رۆژدا پـاش کـوژرانی ئۆریتسـکی 512 کەسیان لەو شارەدا تیرەباران کرد.

رۆژنامەی ئیزۆستیا لە ژمارەی 19ی ئۆکتۆبـەری 1918دا وێـڕای راپۆرتێـك لـە سـەر رەوشی بەندکراوان و تاوانبارانی سیاسی لە پێترۆگراد نووسیی، کـە لـە رێکـەوتی راگواسـتنی پایتەخت بۆ مۆسکۆ 6220 کـەس گـیراون و 800کـەس ئیعـدام کـراون. هەڵبـەت ئـەوە راپۆرتێکی فەرمی و لە ماوەیەکی کورت و بەرتەسکدا و تەنیا لە ناوچەی پێترۆگراد دایە.

" سڕینەوەی بۆرژۆوازی وەکـو چـینێك" ئـەرکی دیـاریکراوی پۆلیسـی نهێنیـی و گـاردە سوورەکان بوو، بەڵام بۆرژۆوازی وشەیەکی گشتگیر بوو و لێپرسـراوانی چـێکا هەرکەسـیان بـە نابۆلشەڤیك و بە دژبەری رژێمیـان زانیبـا بـە نـاوی دژە شـۆڕش یـان بـۆرژۆوا دەیـانگرتن و شوێنبزریان دەکردن. یەکێك لە سەرۆکەکانی چـێکا بـە نـاوی لاتسـیس لـە فەرمانێکـدا بـۆ لێپرسراوانی پۆلیسی نهێنیی یەکێتیی سۆڤیەتیی دەنووسێ:" ئامانج لە نێوبردنی بۆرژۆوازییـە وەکو چینێك: بۆ دەستبەسەرکردنی کەسەکان پێویست ناکا بەڵگەیەکتان لە سەریان هەبێ، کـە دژی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی چالاکییان بووە یا شتێکیان دژی حکوومـەت نووسـیوە.

دەبێ یەکەمین پرسیارتان لە دەستبەسەر کراوان ئەوە بێ، کە سەر بە کام چینە و کوڕی کێیە و لە کوێی دەرس خوێندووە و کار و پیشەی چ بووە. وەڵامی ئەو پرسیارانە بەسن بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ئەو کەسانە."

لینین بەو رەخنانەی، کە لە توند و تیژییەکانی چێکا دەگیردران زوو تێك دەچوو. ئەو لە یەکێك لە ئاخافتنەکانیدا لە کۆتایی 1918دا گوتی:"... بەراستی من سەرم لەو هەمووە گلەیی و گازندە و رەخنەیەی لە چێکا دەکرێ، سوورِ ماوە و نازانم بۆچی هێندێ کەس بێ ئەوەی خۆیان بیانەوێ دەکەونە ژێر کاریگەریی پروپاگەندەی بۆرژۆوازییەوە و لە پێویستبوونی ئەو توند و تیژییانە لە کۆمەڵگەیەکی شۆڕشاندا تێناگەن.... لەوانەیە چێکا هێندێ هەڵەشی کردبێن، بەڵام ئەو خەتا و هەڵانە لە بەراورد لەگەڵ خزمەتەکانی چێکادا لە پێناوی سەقامگیریی دیکتاتۆریی پرۆلتاریادا، کە ئامانجی سەرەکیی ئێمەیە شتێکی ئەوتۆ نین..."

لەگەڵ ئەوەشدا لینین رەخنە دەرەکییەکانی لە توند و تیژی و تیرۆر لە روسیای یەکێتیی سۆڤیەتییدا رەت دەکردەوە و بە پروپاگەندەی درۆی سەرمایەداریی جیهانیی دژی یەکەمین حکومەتی سۆسیالیستیی لە جیهاندا دەزانی. ئەو لە یەکێك لە ئاخافتنەکانی خۆیدا لە ئۆکتۆبەری 1918دا هەروەها لە ئاخافتنێکدا لە حەوتەمین کۆنگرەی ئەنجوومەنەکاندا گوتی:"تیرۆریسم و توند و تیژی بەسەر ئێمەدا سەپاون و توندوتۆڵییەکەی ئێمە دژکردەوەیە لەبەرامبەر هاندانەکان و هێرشەکانی سەرمایەداریی جیهانیدا بۆ رووخاندنی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی..."

## 2

تەواوی گفت و بەڵێنەکانی بۆلشەڤیکەکان بۆ دابینکردنی ژیانێکی باشتر بۆ خەڵك، بە تایبەتی کرێکاران و وەرزێران و سەربازان لە ماوەی سێ ساڵ پاش بەدەسەڵات گەیشتنیان بوو بە بلقی سەر ئاو، بە زیادبوونی نارِەزایەتی و سەرهەڵدان و مانگرتنەکان گوشارەکانی حکوومەت و توند و تیژیی پۆلیسیش رووی لە زیادبوون دەکرد، بە جۆرێك، کە لە کۆتاییەکانی ساڵی 1920دا رێکخراوی سامناکی چێکا باڵی بەسەر تەواوی ژیانی خەڵکدا کێشا و تۆڕێکی بەربڵاوی ئەو رێکخراوە سنووری شارەکانی بەزاند و ئاواییەکانیشی تەنییەوە.

چێکا لە ڕێکخراوێکی پۆلیسییەوە وردە وردە ببووە ڕێکخراوێکـی سـەربازی و گاردەکـانی ئـەو ڕێکخراوە جگە لە بەشداربوون لە هەڵمەتی پۆلیسی و سەرکوتی خۆپێشـاندان و مانگرتنـەکان، لـە هەڵمەتی سەربازییشدا بەشدار دەبوون و بێبەزەیی و دڵڕەقییەکی سەیریان لە خۆیان دەنوانـد. چـێکا لە ڕاوەدوونان و پشـکنین و سـزادانی ئـەو مۆرانـەی، کـە نـاوی "دژە شۆڕشـیان" بەسـەردا دەبـڕا دەسەڵاتێکی بێ کەوشەنی بوو و زۆربەی دەستبەسەرکراوانی پاش لێپرسـینەوەیەکی خێـراو بـە بـێ دادگاییکردن ئیعدام دەکردن، ژمارەی ئەو کەسانەی، کە لە مـاوەی سـێ سـاڵی یەکـەمی تەمـەنی چێکادا بەدەستی لێپرسراوانی ئەو ڕێکخـراوە کـوژران لـە نێـوان 200000 هـەتا 500000 کەسدا مەزەندە دەکرێن، کە ژمارەی دووهەزار کەس لانیکەمەکەیەتی.

گوشار و سەرکوت و نەبوونی ئاسایش و کـەمبوونی بـژیوو خواردەمـەنی و پێداویسـتییە گشتییەکان لە سەرەتاکانی ساڵی 1921دا گەیشتنە ئەوپەڕی خۆیان و گەورەترین ڕاپەڕینیش دژی حکوومەتی بۆلشەڤیکی لەو سەردەمەدا سەری هەڵدا.

ڕۆژی یەکەمی مـانگی مارسـی 1921 مەلـەوانانی بنکـەی هێـزی دەریـایی یـەکێتیی سۆڤیەتیی لە کرۆنشتاد ڕاپەڕین. کرۆنشتاد هـەر ئـەو بنکەیـە بـوو، کـە مەلەوانـەکانی بـە پشتیوانیکردن لە بۆلشەڤیکەکان لە شۆڕشی ئۆکتۆبەردا بوونە هۆی بەدەسەڵات گەیشتنی لینین و بەبێ ئەوان ئەستەم بوو لینین و بۆلشەڤیکەکان بتوانن دەسەڵات بەدەستەوە بگرن.

ڕاپــەڕینی کرۆنشــتاد درێــژەی زنجیرەیــەك مانگرتنــە کرێکارییــەکانی پێترۆگــراد و سەرهەڵدانەوەی ڕزێرییەکان لە شوێنە جیاجیاکانی ڕوسیادا بوو. ئابووریی ڕوسیا لەو قۆناغەدا ئیفلیج ببوو کارخانەکان لە کار کەوتبوون و بە هۆی گوشاری لەرادەبـەدەر بـۆ سـەر وەرزێـران بەرهەمە کشتوکاڵییەکان تەواو لە کەمییان دابوو. نرخـەکان بـە شـێوەیەکی سەرسـووڕهێنەر هەڵدەکشان و ڕۆبڵ بە خێرایی دادەبەزی. لـە ژانوییـەی 1921دا نرخـی ڕۆبڵێکـی ئـاڵتوون گەیشتبووە 26529 ڕۆبڵی کاغەزی.

یەکەمین قۆناغی ڕاپەڕینی کرۆنشتاد کۆبوونەوەی زیاتر لە 15000کەس لە مەلەوانان و فەرمانبەرانی کەشتییەکانی شـەڕ بنەماڵـەکانیان دەرکردنـی بڕیارنامەیـەك ڕوو بـە دەوڵـەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی بوو.

لەپێشەکیی ئەو بڕیارەدا وێڕای ئاماژە بە گوشار و زەبـروزەنگ و گرفـت و نەبوونییـەکان، نووسرابوو، کە حکوومەتی شۆڕشـڤان لـە بـری ئـەوەی کـە بەڵێنـەکانی خـۆی سـەبارەت بـە دابینکردنی ماف و ئازادییەکانی گەل وەدی بێنێ، ئەوانی لە ژێر چنگی دەزگایەکی پۆلیسـیی

زۆر لە پۆلیسی تەزار توند و تیژتر و بێبەزەییتردا دیل کردووە و کرێکاران و وەرزێران و سەربازانی لە ماف و پوانەکانی سەردەمی تەزارییش بێبەریی کردووە.

لەو بڕیارنامەیەدا مەلەوانانی کرۆنشتاد داوای بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنێکی ئازاد "بە دەنگی نهێنی" بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکان و دابینکردنی ئازادیی چاپەمەنی و کۆڕ و کۆبوونەوەی سیاسی و هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوگەلی کۆنترۆڵی حیزبی لە نێو سوپاو هێزی دەریاییدا و ئازادیی پێك هێنانی ڕێکخراوگەلی کرێکاری و وەرزێری و هەڵوەشاندنەوەی کۆکردنەوە و دەستبەسەرداگرتنی بەرهەمی کشتوکاڵی و دابینکردنی ئازادیی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیان بۆ وەرزێران کردبوو. دژکردەوەی خێرای دەوڵەت لە بەرامبەر مەلەوانانی کرۆنشتاددا نەبووە هۆی ئەوەی کە ئەوان دەست لە خەبات و بەربەرەکانێ هەڵگرن. ڕۆژی پێنجەمی مارسی 1921 مەلەوانانی کرۆنشتاد کۆبوونەوەیکی بەشکۆی دیکەیان گرت و کۆمیتەیەکی شۆڕشگێڕانەی پازدە کەسییان پێك هێنا. ڕۆژی شەشەمی مارس لینین ژەنەراڵ توخاچێڤسکیی Tukha chevskuy ی کردە بەرپرسی سەرکوتی ڕاپەڕینی کرۆنشتاد. کۆمیتەی شۆڕشگێڕیی کرۆنشتاد، کە لە 9 مەلەوان و چواردە کرێکار و پەرستارێك و ڕاگری قوتابخانەیەك پێکهاتبوو بڕیاریان دا بەربەرەکانێ بکەن و سەرۆکی کۆمیتەکە فەرمانی ئامادەباشیی شەڕی دەرکرد.

ڕاپەڕیوانی کرۆنشتاد بەوە هیواداربوون، کە کرێکاران و سەربازانی پێترۆگرادیش ڕەگەڵ شۆڕش بکەون، بەڵام زینۆویڤی سەرۆکی کۆمیتەی حیزبی بۆلشەڤیك لە پێترۆگراد دەستی لە سەر دەست دانەنابوو، ئەو هەر لەگەڵ ئەوەی کە شۆڕشی کرۆنشتاد دەستی پێکرد لە پێترۆگراد ڕێوشوێنی منی و تەناهیی پتەوی ڕەچاو کرد و بە یارمەتیی گرووپە زەربەتییە بێبەزەییەکانی چێکا، هەرچەشنە بزووتنەوەیەکی هەر بە کۆرپەیی لەبار برد. ئەو خۆپێشاندانە پەرش و بڵاوانەی لە ماوەی یەکەم هەتا شەشەمی مارسی 1921دا لە پێترۆگراد وەڕێ کەوتن بە ڕەهێڵەی بیکەیسی و کوشتاری هەزاران کەس دامرکانەوە و ڕێگەکانی هاتنە نێو شاریش بە توندی کۆنترۆل کران. ڕۆژی شەشەمی مارس چەند کەس لە ئەفسەرانی بنکەی سەربازیی کرۆنشتاد پێشنیاریان بە مەلەوانانی ئەندامی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی کرد، کە پێش ئەوەی سەربازانی توخاچێڤسکی هێرش بێنن ئەوان دەست ڕەپێش بخەن و هێرش بکەنە سەر پێترۆگراد. ژمارەی سەربازان و گاردە زەربەتییەکانی چێکا لە پیترۆگراد هێشتا ئەوەندە نەبوون، کە بتوانن لە بەرامبەر هێرشی ئەندامانی کرۆنشتادادا خۆڕاگرن و ئەگەر پێترۆگراد گیرابایە زۆربەی کرێکاران و سەربازانی شاریش ڕەگەڵ سەرهەڵداوان دەکەوتن و هێزێکی مەزنیان لە بەرامبەر

دەوڵەتدا پێکدێنا، بەڵام زۆرینــەی ئەنــدامانی کۆمیتــەی شۆڕشــگێڕی بــە نــاوی ئــەوەی کــە سەرهەڵداوان نایانەوێ خوێن بڕژێ دژی ئەو پێشنیارە راوەستان.

تۆخاچێفسکی هێزێکی شێســتهــەزار کەســیی، کــە پێکهــاتبوو لــە ســەرباز و کەســانی خۆبەخش و گاردی سوور و ئەندامانی چێکا بۆ سەرکوتی راپەڕنی کرۆنشتاد کــۆکردەوە. پــێش دەستپێکی هێرشی ئەو هێزانە بەرەو کرۆنشتاد ترۆتسکی پەیامێکی بــۆ ســەرهەڵداوان نــارد و هەڕەشەی ئەوەی لێکردن، کە ئەگەر خۆبەدەستەوە نەدەن هەمووان وەکــو مــراوی ســەردەبڕێ، بەڵام کۆمیتەی شۆڕشگێڕانی کرۆنشتاد وەڵامی دایەوە، کە ئــەوان لــەو هەڕەشــانە ناترســێن و هەتا وەدیهاتنی ویستەکانیان درێژە بە بەربەرەکانێ دەدەن.

هێرش بۆ سەر کرۆنشتاد بە هەڵفڕینی چەند فڕۆکە و بۆمبارانی خانووبەرە و بەنــدەرگاکانی کرۆنشتاد دەستی پێکرد و بە دوای ئەوەدا هێرشی سەربازانی لەشکری سوورو گاردەکانی چێکا لە بەرەبەیانیی رۆژی حەوتەمی مارسدا، بۆ سەر شوێنە سەختەکانی کرۆنشتاد دەستی پێکرد، بەڵام مەلەوانانی کرۆنشتاد وەڵامی ئەو هێرشــەیان دایــەوە و هێزەکــانی تۆخاچێفســکی پــاش هاویشتنی تۆپی سەر پاپۆڕە جەنگییەکان ناچار بوون پاشەکشێ بکەن.

رۆژی هەشتەمی مارسی 1921 لینین لە دەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییدا لێدوانێکیداو تێیدا سەرهەڵدانی کرۆنشتادی بە بەرهــەمی هانــدانی دژەشــۆڕش و بۆرژۆوازی ناوبرد و گوتی: لە پشتەوەی ئەو ســەرهەڵدانەوە روخســاری ئاشــنای ژەنەراڵــەکانی گاردی سپی بەدی دەکرێ. لینین گوتی ئەو سەرهەڵدانە بــە هــەر نرخێــك بــێ لــە چــەند رۆژی داهاتوودا سەرکوت دەکرێ.

رۆژی شازدەی مارس ژەنەراڵ تۆخاچێفسکی بە ئامادەکاریی سەربازیی تەواوەوە دوایین هێرشی بۆ سەر کوتی سەرهەڵداوانی کرۆنشتاد دەست پێکــرد. لــەو هێرشــەدا کــەڵك لــە تەواوی فڕۆکەکانی لەشکری سوور وەرگیرا و رەهێڵەی بارانی تۆپیــان بەســەر کرۆنشــتاددا باراند. کرۆنشتاد هەر بیست و چوار کاتژمێری خۆڕاگرت و تۆخاچێفسکی رۆژی حەڤــدەی مارس هەواڵی دامرکانەوەی کرۆنشتادی بۆ مۆسکۆ بەرێ کرد. بەڵێنی لینین و ترۆتســکی وەدیهاتبوو و لە کۆتایی رۆژی حەڤدەی مارسدا تەرمی هەزاران مەلەوان و سەرباز لە سەر شەقام و لێوار بەندەرگاکان و لە سەر سەکۆی کەشــتییەکان بــەگۆڕێ وەربــوون یــا وەکــو مراوی وەسەر ئاو کەوتبوون. زۆربەی ئــەو مەلــەوان و ئەفســەرانەی کرۆنشــتاد، کــە بــە زیندوویی گیرابوون لە لایەن گاردەکانی چێکاوە گوللــەباران کــران، ژمارەیــەکی کــەمیان

توانیان بەرەو فەنلاند رابکەن و بنەماڵەی مەلەوانانی کوژراو یان نادیاریش بەرەو ئۆردوگاکانی کارکردن یا بۆ شوێنە دوورەکان دوورخرانەوە.

کارەساتی کرۆنشتاد و راپەڕینەکان و ئەو مانگرتنانەی، کە بەر لەو هاتبوونەپێش لینینی برێك پرینگاندەوە و ناچاریان کرد بە سیاسەتە وشك و دەمارگرژییە ئابوورییەکانی سەرەتای حکوومەتەکەیدا بچێتەوە. لینین لە کۆبوونەوەی رۆژی پازدەی مارسی 1921ی کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستدا، وێڕای دان پێدانان بە کەمبوونەوەی بەرهەمگەلی پیشەیی و کشتوکاڵی و نارەزامەندیی کرێکاران و وەرزێران، باسی لە پێویستیی خۆ رێکخستن لەگەڵ سیاسەتە ئابوورییەکان و قەبووڵکردنی خاوەندارێتیی سنووردار کرد. لە حاڵێکدا، کە لە ساڵەکانی 1017 وە هەتا 1920 بە هیچ جۆرێك حازر نەبوو مل بۆ خاوەندارێتیی تایبەت تەنانەت بە شێوەی بەرتەسکیش لە کۆمەڵگەیەکی کۆمۆنیستیدا رابکێشێ.

لە بەهاری ساڵی 1921دا لینین سەرەڕای دژایەتیی باڵی چەپی رێبەرایەتیی حیزب، بنەمای سیاسەتگەلێکی ئابووریی نوێی هێنایە گۆڕێ. بە پێی ئەو سیاسەتانە دیسان سیستەمی مووچە و حەقدەست دانرانەوە و مافی خاوەندارێتیی تایبەتی زەوی بە شێوەی سنووردار و ئازادیی بەرهەمهێنان و فرۆشتنەوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان رێوشوێن و پرەنسیپیان بۆ دانران و شەڕی نێو خۆیی لە گوندەکاندا کۆتایی پێ هات. ئەسڵی کارامەیی و بەرهەمهێنانی زیاتر کەوتنە پێشەوەی تیۆرییە ویشك و برینگە مارکسییەکان و بەهای کار و خزمەتگوزارییەکانی کرێکاران بوو بە بنەمای مووچە و حەقدەستەکانیان.

لینین لە ئاخافتنێکدا لە کۆنفرانسی حیزبی کۆمۆنیستی مۆسکۆ لە ئۆکتۆبەری 1921دا دانی بەوەدا هێنا، کە لە هەلومەرجی ئێستادا ناکرێ پرەنسیپەکانی کۆمۆنیزم بە پراکتیك بکرێن و جێبەجێ نابن. ئەو لە وەڵامی نارەزایەتیی ئەو کەسانەی، کە باسیان لە مەترسیی سەرهەڵدانی مەودای چینایەتی و گەڕانەوەی سەرمایەداری دەکرد گوتی: خاوەندارییەتییە تایبەتییەکان تەنیا بە شێوەی سنووردار و بۆ زەوییە کشتوکاڵی و کارگە بچووکەکان قەبووڵ کراوە و پیشە بنەماییەکان و سیستەمی هێنان و راگواستن و بازرگانیی دەرەوە بە تەواوی لە دەستی دەوڵەتدا دەمێننەوە. لینین ئەو سیستەمەی ناو نا "سەرمایەداریی دەوڵەتی".

پاش ساڵێك لینین، کە لە برە سەرکەوتنێکی بەرنامە تازە ئابوورییەکانی خۆی قایل بوو لە ئاخافتنێکدا وێنایەکی گەشبینانەی لە رەوشەکە خستە روو و گوتی:"ئیتر سۆسیالیزم بۆ ئێمە دوورە دیمەن نییە، ئێمە وردە وردە سۆسیالیزم دێنینە نێو ژیانی رۆژانەمانەوە و هەنگاو

به هەنگاو دەچینە پێش. هەڵبەت کۆمەڵێك کێشە و کۆسپمان لە سەر ڕێگە هەن کۆمەڵگەی سۆسیالیستیی دڵخوازی ئێمە وەدی نایە، بەڵام شك لەوەدا نییە، کە لە چەند ساڵی داهاتوودا ئێمە بە هەموو ویست و داخوازییەکانمان دەگەین و بەسەر تەواوی ئەو کەند و کۆسپانەدا زاڵ دەبین..."

بەڵام دیسان پاش ئەو ئاخافتنە، لە کۆتاییەکانی ساڵی 1922دا هاتنە ئارای کۆمەڵێك گرفتی نوێ و قەیرانی ئابووریی نوێ گەشبینییەکەی لینینی کاڵ کردەوە و لە ئاخافتنێکدا هەموو شکست و گرفتەکانی خستە ئەستۆی (سەرمایەداریی دەمەو ئاویلکە و دەستوپێوەندە چەپەڵەکانی) و هەڕەشەی توند و تیژیی زیاتری لە دوژمنانی سۆسیالیزم کرد. لە ماوەی ساڵەکانی 1921 هەتا 1922 سەرەڕای کۆمەڵێك پێشکەوتنی ڕێژەیی لە بەڕێوەیردنی بەرنامە ئابوورییە نوییەکاندا کەمبوون و گرانیی پێداویستییەکان هەروا رووی لە زیادبوون کرد و بە هۆی کەمبوونەوەی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، کە لە هێندێ شوێن قاتی وقڕیی لێکەوتەوە زیاتر لە پێنج ملیۆن کەس بە پێی ئاماری فەرمی گیانیان لە دەست دا.

لە کۆتاییەکانی ساڵی 1922دا هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی گرفت و کێشەی ئابووریی نوێ سیاسەتی گوشار و زەبر و زەنگیش بە تەوژمتر بۆوە. ڕێکخراوی پۆلیسی نهێنیی روسیا، کە نزیك پێنج ساڵ بەسەر دامەزرانیدا تێدەپەڕی لەو ڕێکەوتەدا ببووە ڕێکخراوێکی گەورە و بە ئەزموون و کارامە و تۆڕێکی بەربڵاوی سیخوڕی و هەواڵدەریی لە سەرانسەری وڵاتدا پێك هێنابوو. ئەو سانسۆرە توند و پۆڵایینەی، کە چێکا دەیسەپاند هەرچەشنە دەنگێکی ڕەخنە و ناڕەزایەتیی خنکاندبوو و چاپەمەنی و رادیۆ و سینەماو شانۆ ببوونە ئامرازێك لە دەستی دەوڵەتدا. مافی مانگرتن لە کرێکاران ئەستێندرابۆوە و یەکێتییە کرێکارییەکان ئیتر دەسەڵاتێکیان نەبوو، کە بۆ دابینبوونی ماف و حەقدەستی پتر یان هەلومەرجی کارکردنی باشتر بۆ کرێکاران دەکاری بێنن.

# 6

لە کۆتاییەکانی ساڵی 1921بەملاوە لینین تەندروستیی باش نەبوو. بێ خەوی وەڕەزی کردبوو و بە درێژایی ڕۆژ ماندوو و شەکەتی و بێ خەوی و کاری زۆر ئەوی تەواو تووڕە دەکرد. جاری وابوو ژانەسەرێکی دەگرت، کە بۆ ماوەیەك سەری لە نێوان هەردوودەستی دەگرت و لە جووڵە دەکەوت. لە سەرەتاکانی 1922دا ئەو سەرە گێژە و نارەحەتییانەی لێ توند کرد و لینین، کە جاروبار ئەو حاڵەتەی بەسەردا دەهات لەڕێوە پاڵی وە نزیکترین شتێك دەدا بۆوەی وەعەرز نەکەوێ.

لە دیسێمبەری 1922دا لینین، کە ئیتر نەیدەتوانی کار بکا، بڕیاری دا بۆ پشوودان بچێتە گوندی گۆرکی و لە کاتی ڕۆیشتنیدا لە یادداشتێكدا بۆ دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیست نووسیی:"لەگەڵ ئەوەدا، کە لە ماوەی چەند مانگی رابردوودا رێژەی کارکردنم کەم کردبۆوە و زیاتر پشووم دەدا بە هۆی بێ خەوی و ئازاری دیکە توانایی کارکردنم نەماوە و پێموانییە بتوانم لە کۆبوونەوەکانی داهاتووی کۆنگرەدا بەشدار بم." بەو حاڵەشەوە لینین لە گۆرکیش لە بڕیارە گرینگەکاندا راوێژی پێدەکرا و جارێکی کاتێك هەواڵیان پێدا، کە چیچرین (وەزیری دەرەوەی ئەو کاتی روسیا ) پێشنیار دەکا، کە لە بری وەرگرتنی یارمەتی لە ئەورووپاو ئەمریکا هێندێ گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەرەوەی ڕۆسیادا پێکبێنن و جارێ لە مەبەستی شۆڕشی جیهانی گەڕێن لینین نووسیی:"

من پێشنیار دەکەم چیچرین بەرنە شێتخانەیەك، و بە گوێرەی پێویست بیخەنە ژێر چاوەدێرییەوە."

یازدەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە مارسی 1922دا گیرا و دوایین کۆنگرەیەکی حیزبی بوو، کە لینین تێیدا بەشدار بوو، پاش ئەو کۆنگرەیە بوو، کە کۆمیتەی ناوەندیی نوێی حیزب ستالینی بە سکرتێریی حیزب هەڵبژارد.

لە مانگی مای 1922دا لینین جەڵتەیەکی سووك لێی دا و بۆ ماوەیەك نە قسەی بۆ دەکراو نە دەیتوانی دەست و لاقی بجووڵێنێ. بە دوای ئەوەدا لینین تووشی جەڵتەی دڵیش هات و گرووپێك

پزیشکی پسپۆڕی ئەڵمانی و روسی هاتنە ژوورسەری. لینین بە پزیشکەکانی گوت، کە ئەگەر پێی لە سەر لێوی گۆڕە پێی بڵێن لەبەر ئەوەی کە دەبێ کۆمەڵە رێوشوێنێك بۆ جێگرەکانی خۆی بکێشێ، بەڵام پزیشکان وەڵامیان دایەوە، کە جارێ مەترسییەك هەڕەشەی لێناکا.

هاوسەری لینین کرۆپسکایاو ماریای خوشکی ئەرکی خزمەت بەویان وەئەستۆ گرت و ئەو ماوەیەی، کە دەستی راستی لینین لە کار کەوتبوو هاوسەرەکەی فێری کرد، کە چۆن بە دەستی چەپی بنووسی و لینین لە بوارەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بەدەست هێنا. لە شەوە درێژەکانی زستاندا پیاتاکۆف ی پیانیست و هونەرمەند دەچووە ئاپارتمانەکەی ئەوو چەند کۆپلەیەکی شۆپەن و برامز و باخی بۆ لینین دەژەنی و لینین بە بیستنی ئەو ئاوازانە چێژی وەردەگرت و هەستی بە هێمنییەکی قووڵ دەکرد و ئۆخژنی دەهاتێ.

لە مانگی ژوئیەدا لینین دیسان هەستایەوە سەر پی و دەستی کردەوە بە کاروباری ئاسایی خۆی. لەو کاتەدا دادگاییکردنی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی سۆسیالیستی شۆڕشگێڕ، کە لە ساڵی 1918ـەوە لە بەندیخانە بوون دەستی پێکردبوو. رێبەرانی سۆسیالیستی شۆڕشگێڕ، کە بە راپەڕین و پیلان دژی ویستی گەل و حکومەتی بۆلشەڤیکی تاوانبار کرابوون دادگایی دەکران و دواجار بڕیاری ئیعدامیان بۆ دەرچو و، بەڵام بڕیارەکە بە هۆی نارەزایەتیی توندی حیزبە سۆسیالیستەکانی ئەورووپا راگیرا. رێبەرانی سۆسیالیستی شۆڕشگێڕ بەو شێوەیە چەندین ساڵان لە بەندیخاندا مانەوە هەتا ئەویکە لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتی ستالیندا ئیعدام کران.

دەستوخەتێکی(رەشنووس) سەرنجراکێش، کە لەو سەردەمە لە پاش لینین بەجێ ماوە و دەقەکەی لە ساڵی 1937دا لە کاتی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالیندا بڵاو بۆوە دەریدەخا، کە لینین تا چەندە لە سزادانی دژبەرەکانیدا بە زەبرو زەنگ بووە. لەو یادداشتەدا، کە لینین لە پەراوێزی بەرایی یاسای سزادان لە روسیادا، نووسیوێتی بە ئاماژە بە بڕگەی پێوەندیدار بە سزای ئیعدامی مۆرەگەلی دژە شۆڕش دەنووسێ:"بەڕای من ئەو مادەیە دەبێ جۆرێك بنووسرێ، کە هەر چەشنە دنەدانێکی دژە شۆڕش و گرووپگەلی لەو چەشنە لەخۆ بگرێ. ئەو چەشنە چالاکیانە دەبێ لە پێوەندی لەگەڵ پیلانەکانی بۆرژۆوازیی نێودەوڵەتی و دوژمنانی دەرەکیی حکومەتی یەکێتیی سۆڤیەتییدا تاوتوێ بکرێن، و لە دەرکردنی بڕیاری ئیعدامی ئەو مۆرەگەلەی، کە بەجۆرێك لە جۆرەکان لەو جۆرە چالاکیانەدا بەشدار دەبن نابێ بەسەریانەوە بچن.

دەستنووسەکەی لینین، کە لە 15ی ژوئیەی 1937دا لە گۆڤاری بۆلشەڤیکی مۆسکۆدا بلاّو بۆوە لێکدانەوەیەکیشی لەگەڵ بوو، کە لە ژێر تیشکی بۆچوون و ڕێنوێنییەکانی لینیندا پاکانەی بۆ پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالین دەکرد و پاساوی دەدان. لە جەنگەی ئەو پاکسازییانەدا بوو، کە ژمارەیەك لە نزیکترین هاوڕێیانی سەردەمی تاراوگەی لینین و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە ساڵەکانی 117 هەتا 1924دا ئیعدام کران.

لینین بە سەری نەخۆشیش لە چوارەمین کۆنگرەی کۆمینترێنیشدا بەشدار بوو و لە ئاخافتنێکدا روو بە نوێنەرانی بەشداری ئەو کۆنگرەیە، ئەوانی لە پشتیوانیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە خەبات دژی سیستەمی بۆرژۆوازی لە ئاستی جیهانیدا ئاگادار کردەوە. ئەوە دوایین ئاخافتنی لینین لە کۆبوونەوەیەکی حیزبی و سیاسیدا بوو، چونکی ئەو نەیتوانی قسەکانی خۆی تەواو بکات و لە حاڵێکدا، کە بەتوندی بێهێز ببوو بە یارمەتییی کلارازتکین ی نوێنەری حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیاو سکرتێر و پەرستارەکەی خۆی فۆتیوا لە پشت تریبوونی ئاخافتن هاتە خوارێ. فۆتیوا لە یادداشتەکانی خۆی لەو ڕێکەوتەدا نوسیوێتی:" پزیشکەکان پشکنینی پزیشکیان لە سەر لینین کرد و رایانسپارد تەواو پشووو بدا."

لەو ڕێکەوتە بەدوا ئیتر لینین بە بەردەوامی نەدەچۆوە نووسینگەی کارەکەی و بێجگە لە چەند کەسێکی تایبەت ئیزنی نەدەدا کەی چاوی پێی بکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو کاتێك پتر موتالاّی دەکرد و بۆ بوارگەلی جۆراوجۆر ڕێوشوێنی جۆراوجۆری دیاری دەکردن.

لەو سەردەمەدا لینین لە خستنەڕووی ڕێگەچارەی ئەو کێشەو گرفتانەی پێشهاتبوون لە هەموو کاتێك پتر نەرم ونیانتر ببوو. ئەو، کە لە رابردوودا بە نیسبەت چەسپاندنی بیروباوەر و بۆچوونەکانی خۆیەوە دەمارگرژ و کەللەڕەق بوو، ئێستا ئەو کەسانەی، کە لە بەڕێوەبردنی بنەماو پرنسیپە مارکسیستییەکاندا دەمارگرژییان دەنواند بە نەخۆشیی چەپڕەوی تاوانبار دەکردن و دژایەتیی ئەوانیشی لەگەڵ بازرگانی(، کە برە بوارێك بۆ چالاکیی تایبەتی و ناحکوومی رەخسابوو) بە گەمژەیی دادەنا. لینین لەو قۆناغەدا لە فکری پتەوکردنی سیستەمی دراوی و بەهێزکردنی پشتیوانەی ڕۆبڵدا بوو و لە یادداشتێکدا بۆ کۆمیسێری دارایی نووسی:"ئەگەر ئێمە بتوانین ڕۆبڵ سەقامگرتوو بکەین زۆربەی کێشەکانی خەڵك چارەسەر دەکەین."

لینین لەو سەردەمەدا زۆر لە جاران پتر ببووە لایەنگری دانی ئازادیی پتر بە وەرزێران بەمەبەستی هاندانی زیاتریان بۆ بەرهەمهێنانی بەرهەمی زیاتر و لە لێکدانەوەیەکدا لە سەر ئەو بابەتەی نووسی:"" ئێمە هەتا ئێستا گەلێك کاری گەمژانەمان بە مەبەستی پێك هێنانی

کێڵگەی هاوبەش کردووە. بەرنامەی دروستکردنی کێڵگەی هاوبەش شکستی هێناوە و ئێمە دەبێ گرینگی بە تاکی وەرزێر بدەین. بنەمای سۆسیالیزم لە نێو وەرزێراندا وەکو ئەوە وایە، کە خانووەك لە سەر خۆڵەپۆتینە ساز بکەین..."

ورە و ئەخلاقی وەرزێران لە سەر کاری تاکەکەسی و بەرژەوەندی تاکەکەسی راوەستاوە و چەندین نەوەی پێدەچێ بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ئەخلاقەیان بگۆڕین. لێرە زۆرەملی ناچاو ئێمە دەبێ بە بەرنامەیەکی درێژخایەن هەوڵبدەین لە نێو وەرزێراندا جێی خۆمان بکەینەوە."

یەکێك لە دوایین نووسراوەکانی لینین، کە لە دیسێمبەری 1922 نووسراوە و باس لە گۆڕانەکانی کۆتاییەکانی تەمەنی ئەو دەکا، باس لە پێویستیی شۆڕشێکی کولتوورییە لە روسیا. لینین لەو وتارەدا دەنووسێ:" شۆڕشی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە روسیادا بەر لە شۆڕشی کولتووری هاتە ئاراوە و زۆرربەی ئەو کێشە و گرفتانەی، کە ئێمە لە بنەمای سۆسیالیزمدا لەگەڵیدا رووبەڕووین لەو راستییەوە سەرچاوە دەگرن. گۆڕان لە بۆرژۆوازییەوە بەرەو سۆسیالیزم پێویستیی بە تێپەڕینی زەمەن و گۆڕانی عەقڵییەت و شێوەی روانینی خەڵکەکەیە و بۆ پێك هێنانی گۆڕانکاریی لەوچەشنە دەبێ بیر لە شۆڕشێکی کولتووری بکەینەوە...". لینین ئەوەشی لێ زیاد دەکا، کە مەبەستی ئەو لە شۆڕشی کولتووری ئەوە نییە، کە کولتووری بۆرژۆوازی بەتەواوەتی بگۆڕدرێ "بەڵکو دەکرێ بە پاکسازی و سڕینەوەی کولتووری بۆرژۆوازی و کەڵك وەرگرتن لە لایەنە بێ خەوش و باشەکانی ئەو دەست پێ بکەین."

رۆژی دوازدەی دیسێمبەری 1922دا لینین بۆ دوایین جار چۆوە پشت مێزی کارەکەی و لەوەدوا ئیتر نەیتوانی بچێتەوە ژووری کارەکەی. رۆژی شازدەیەمی دیسێمبەر کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی ئاگادار کردەوە لەوەیکە ناتوانێ بەشداری لە کۆبوونەوەی کۆنگرەی حیزبیدا بکا. چەند رۆژ دواتر پاش دووەمین جەڵتە بۆ پشوودان و چاکبوونەوە، ناردیانە شارۆچکەی گۆرکی، بەڵام پزیشکەکانی ئەو بە رێبەرانی حیزبی‌یان راگەیاند، کە هیوایەکیان بە چارەسەریی ئەو نییەو ئەگەر چاکیش بێتەوە ناتوانێ وەك جاران دەست بکاتەوە بە کارکردن.

لە نێوەڕاستەکانی ساڵی 1922دا و پاش یەکەمین جەڵتە و نەخۆشکەوتنی لینین ململانێی بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات لە نێو کادیری رێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییدا دەستی پێکردبوو. هەڵبژاردنی ستالین بە سکرتێریی ئەو حیزبە سەرەتاو دەستپێکی ئەو ململانێیە بوو. رۆژی چواردەی ژوئەنی 1922 هەواڵی نەخۆشینی لینین بۆ یەکەمجار لە رۆژنامەی پراڤیدادا بڵاو بۆوە و بە شوێن ئەوەدا دەستەیەکی سێ کەسی لە ئەندامانی دەفتەری

سیاسیی حیزب ئەرکەکانی لینینیان لە ڕێبەرایەتیدا وەئەستۆ گرت. ئەندامانی ئەو دەستەیە زینۆویێڤ و کامێنۆڤ و ستالین بوون و، کە لە نێوان ئەوانیشدا ململانێ و بیر و رای جیاواز هەبوو.

لە سەرەتاکانی ساڵی 1923دا، کە لینین لە جێدا کەوتبوو، ململانێیەکی سێ قۆڵی لە دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستدا دەستی پێ کرد:

ستالین، کە وەك سکرتێری حیزب پێگەی خۆی قایم کردبوو لە قوچکەی ئەو سێ گۆشەیەوە بوو. زینۆویێڤ، کە سەرۆکی کۆمینترێن و سەرۆکی ئەنجوومەنی پێترۆگراد بوو و لە لایەن زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی و بە تایبەتیی کامێنۆڤ و بۆخارینەوە پشتیوانیی لێدەکراو ترۆتسکی وەك سەرۆکی سەربازیی شۆڕش و کۆمیسێری جەنگ بە سێیەمین کەسی خوازیاری دەسەڵات و ڕێبەرایەتی دەژمێردرا. پێگەی ترۆتسکی لە حیزبدا لە پێگەی ستالین و زینۆویێڤ لاوازتر بوو و لەو ململانێیەدا تەنیا پشتی بە هێزە سەربازییەکانەوە بەستبوو.

لینین، کە لە یازدەهەمین کۆنگرەی حیزبەوە نیگەرانی ئەو ململانێ نێوخۆییە بوو رۆژی بیستوپێنجەمی دیسێمبەر کۆمەڵێك پێشنیاری بۆ چارەسەریی ئەو کێشانە و پێك هێنانی یەکێتی لە حیزبدا خستنەڕوو و رۆژی چواردەی ژانویەی 1923 لە سەر جێوبانی نەخۆشی هێندێ شتی لێ زیاد کرد، بەشێك لەو نووسراوە، کە بە "وەسییەتنامەی سیاسیی لینین" ناوبانگی دەرکردووە بەو جۆرەیە:

"هاوڕێ ستالین لەو رۆژەوە، کە بووەتە سکرتێری حیزب وردە وردە دەسەڵات لە دەستی خۆیدا پاوان دەکات و دڵنیا نیم لەوەیکە ئەو بتوانێ بە شێوەیەکی دروست کەڵك لەو دەسەڵاتە وەرگرێ . لە لایەکی دیکەوە هاوڕێ ترۆتسکی، کە لە بوارگەلی جۆراوجۆردا توانایی و متمانەبەخۆیی خۆی سەلماندووە لەگەڵ دەسەڵاتخوازیی ستالین کەوتووەتە ململانێیەکی ئاشکراو درێژەدانی ئەو کێشە و ناکۆکییە حیزب بەرەو لێکترازان و لەتوپەتبوون دەبا..."

لینین لە درێژەی وەسییەتنامەکەیدا، کە واژۆی رێکەوتی 25ی دیسێمبەری 1922 ی پێوەیە وێڕای داواکردن لە ستالین و ترۆتسکی و ڕێبەرانیتری حیزب بە مەبەستی چارەسەرکردن و نەهێشتنی ئەو ناکۆکییانە و پتەوکردنەوەی ریزەکانی حیزب، رای خۆی لە سەر زینۆیێڤ و کامێنۆڤ و پیتاکۆف و بۆخارین دەردەبڕی و خاڵە لاواز و بەهێزەکانیان شی دەکاتەوە. لەو نووسراوەیە وا دەردەکەوێ، کە لینین زینۆویێڤ بە خەنیمی سەرسەختی ستالین نازانی و زیاتر فکری بە لای هەڤرکێی نێوان ستالین و ترۆتسکی دایە.

رۆژی چوارەمی ژانویە لینین یادداشتێك لە وەسییەتنامەکەی خۆی زیاد دەکا، کە نیشان دەدا جاریەجار زیاتر لە ستالین نیگەرانە. ئەوە دەقی یادداشتەکەیە:

ستالین زۆر توندە و ئەو ئیرادە، کە لە پێوەندیی نێوان ئێمە کۆمۆنیستەکاندا قەبووڵ دەکرێ وەك سکرتێری حیزب لێی قەبوڵ ناکرێ. هەربۆیەش من پێشنیار دەکەم بە هاوڕێیان، کە ڕێگەیەك بۆ لە سەر کار لابردنی ستالین بدۆزنەوە و جێگرەوەیەکی شیاو و گونجاوی لەجێ دابنێن. سکرتێری حیزب لە هەمانکاتدا، کە دەبێ باوەر و ئیمانی بە بنەما باوەڕییەکانی ئێمە هەبێ دەبێ لە زێدەخوازی و پاوانخوازی خۆ ببوێری و لەگەڵ هاوڕێی حیزبی بەئەدەبتر و نەرم و نیانتر بێ. من بە پێی ئەو شتانەی، کە لە پێوەندیی لەگەڵ ناکۆکیی نێوان ستالین و ترۆتسکیدا ئاماژەم پێکردن مانەوەی ستالین لە پێگەی سکرتێریدا بە مەترسییەك بۆ داهاتووی حیزب دەزانم.

**4ی ژانویە1923_ لینین**

بەڵام ستالین بەو گۆڕانکارییانەی، کە لە ڕێکخستنی حیزبی کۆمۆنیست و دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتییدا پێکی هێنابوو و بە دانانی مۆرە و دەستو پێوەندی گوێ لەمست و وەفاداری خۆی لە شوێنە هەستیارە حیزبی و دەوڵەتییەکان داوای جێگە و پێگەی خۆی قایم کردبوو، کە جگە لە چەند کەسێك، کەس پێشنیارەکەی لینینی نەبیست. ستالین، کە بۆی دەرکەوتبوو لینین لێی بەگومان و دڕدۆنگە پەرژینێکی وای بەدەوری لینیندا کێشا، کە ئیتر کەس نەتوانێ پێوەندیی پێوە بگرێ. ستالین سووکایەتیی بە کرۆپسکایاش کرد، کە بەمەبەستی ناڕەزایەتی و سکاڵاکردن سەبارەت بەو ئاستەنگی و لەمپەرانەی لەبەردەم پێوەندی گرتن بە لینین دانرابوون هاتبووە لای ستالین و ئەو هەلسوکەوتە توند و پڕلە سووکایەتییە ئەوەندەی لینین ئەزییەت کرد، کە ڕۆژی پێنجەمی مارسی 1923 لە یادداشتێکدا، کە بۆ سکرتێرەکەی خۆی خوێندەوە و پێی نووسی لە ستالینی راسپارد، کە :" پێوەندییە تایبەتی و دۆستایەتییەکانی بەتەواوی لەگەڵ ئەودا دەپسێنێ." ستالین هیچ وەڵامی کی ئەو پەیامەی نەدایەوە و لینین لە کۆتایی مانگی مارسدا جەڵتە لێیدا.

لەو ڕێکەوتە بەدواوە ئیتر هیچ نووسراوە یا پەیامێك لە لینین نەبینراوە و نەبیسراوە. دوایین جارێك، کە خەڵك دیتیان ڕۆژی بیست و چوارەمی دیسێمبەری 1923 بوو، کە هاوسەرەکەی دارێکی کریسمەسی ڕازاندبۆوە و کۆمەڵێك لە وەرزێرانی گۆرکیی بۆ جێژنی کریسمەس بانگهێشت کردبوو. وەرزێران گۆرانییان دەچڕی و سەمایان دەکرد و لینین لە تەماشای ئەو دیمەنە کەیف خۆش دیار بوو.

کاتژمێر شەش وپەنجا دەقیقەی ڕۆژی بیست و یەکەمی ژانویەی 1924 لینین بـۆ دواجـار جەڵتەی مێشك لێی دا و لە هۆش چوو. بـە دوای ئـەوەدا نۆبەتییـەکی بـە تـەوژمی گـرت و کاتژمێر حەوتی دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە گیانی دەرچوو.

هەواڵی مەرگی لینین لە شاری بە بەفر داپۆشراوی گۆرکییەوە بە سەرانسەری روسیادا بـڵاو بۆوە و سێڵاوی جەماوەر بۆ دوا دیدار و ڕێز لێنان لە و بەرەو گۆرکی خرۆشـان. ڕۆژی بیسـت و سێیەمی ژانویە تابووتی تەرمی لینین بەسەر شانی هاوڕێیانییەوە بردرایە وێستگەی گـۆرکی و لە مەودای پەنجا کیلۆمەتریی نێوان گۆرکی هەتا مۆسکۆ سەدان هەزار کەس بۆ ڕێزگرتن ریزیان گرتبوو. تابووتی لینین لە یانەی کرێکاران(ناوەنـدی یەکێتییـە کرێکارییـەکان) دانـراو سـەدان هەزار کەس بە نیشانەی ڕێز لێنان بە لایدا تێپەڕین.

سەر لە بەیانیی سـبەینێ ڕێـوڕەسمی بـە خـاك ئەسـپاردنی لیـنین لـە هەوایـەکی سـارد و زەمهەریردا بەڕێوە چوو. سەرەڕای سەرماو سۆل و بەستەڵەك دیسانیش خـەڵکێکی زۆر تێیـدا بەشدار بوون. تەرمەکە لە سەر شانی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب بوو و بۆ ماوەیـەکی کورت لە ساردخانەیەك دانرا. تەواوی کارخانەکانی مۆسکۆ، کە لە یەك کـاتدا دەنگیـان لـێ بەرز بۆوە کۆتایی ئەو ڕێوڕەسمەیان ڕاگەیاند. وێڕای دژایـەتیی لیـنین لەگـەڵ ئـایین، ڕێـوڕسمی ئایینی(تەڵقین)یان بۆ بەڕێوە برد. لەبەر ئەوەی کە زۆرینـەی زۆری خـەڵك و تەنانـەت زۆربـەی کۆمۆنیستەکانیش هێشتا لە سەر باوەڕە ئایینەییەکانی خۆیان سوور بوون.

تەرمی لینینیان مۆمیایی کرد و لە تابووتێکی شووشەییدا لەو گـۆڕەدا ناشـتیان، کـە لـە گۆڕپانی سو ور بۆیان ساز کردبوو. ئەو پێنج پیتە روسییەی، کە وشەی لینین پێك دێنن لە سەر گۆڕەکەی هەڵکۆڵدراو دیتنی ئەو گۆڕە یەکێك لە بەرنامەکانی ئـەو کەسـانەیە، کـە سـەردانی مۆسکۆ دەکەن.

# 7

ئەو بەشە بە پوختەیەك لە سەردەمی حکوومەتی لینین بەسەر روسیادا کۆتایی پیٚ دیٚنین. لینین بە روالەت زیاتر لە شەش سالٚ ریٚبەایەتیی روسیای لە ئەستۆ بووە، بەلاّم بە کردەوە لە پیٚنج سالٚ پتر حکوومەتی نەکرد. چونکی بە هۆی نەخۆشینەوە لە سالٚی 1922 ـەوە دەستی لە کار هەلگرتبوو و ستالینیش بەو شیٚوەیەی، کە لە بەشەکانی داهاتوودا دەیخەینەبەر باس بە کردەوە ئەوی پەراویٚز خستبوو و جلەوی دەسەلاتی بەدەستەوە گرتبوو.

بیلانی حکوومەتی لینین لە باری ئابوورییەوە کارەساتبارە، لەبەر ئەوەی کە بەرهەمە پیشەیی و کشتوکالٚییەکانی روسیا لەو ماوەیەدا بە خیٚرایی دابەزیوە و تەنانەت پاش راگەیاندنی سیاسەتی ئابووریی نویٚ و رەچاوکردنی ئازادییەکی ریٚژەیی بۆ خەلك لە کاروباری کشتوکالٚی و پیشەییدا، ئاستی بەرهەمە کشتوکالٚی و پیشەییەکان لە روسیا گەیشتە رادەی پیٚش لە شەڕی یەکەمی جیهانی. لە سالٚەکانی 1921 و 1922دا ملیۆنان کەس بە هۆی قات وقڕی و نەبوونی خواردەمەنی و نەخۆشینی پەرەئەستیٚن تیٚدا چوون. لە شەڕە نیٚوخۆییەکانیشدا نزیك بە یەك ملیۆن کەس تیٚدا چوون، بەلاّم لە دوو سالٚی کۆتایی ژیانی لینیندا بە هۆی سیاسەتی نوێی ئابووری و کۆتایی شەڕە نیٚوخۆییەکان رەوشەکە وردە وردە بەرەو باشتر چوو و دەسەلاتی بۆلشەڤیکەکان بە کردەوە بەسەر روسیادا زالٚ بوو.

بە زالٚبوون و جیٚگیر بوونی دەسەلاتی بۆلشەڤیکی پیٚگەی نیٚودەولەتیی یەکیٚتیی سۆڤیەتییش پتەو بوو و ئەو ولاتە وردە وردە لە گۆشەنشینیی سیاسیی سالەکانی سەرەتای شۆڕش دەرباز بوو. لە سالٚەکانی 1920 و 1921دا دەولەتی تازەی سۆڤیەتی توانیی ناکۆکییەکانی خۆی لەگەلٚ دراوسیٚ باشووری و خۆرئاواییەکانی خۆی چارەسەر بکات و سنوورە ناسکەکانی نیٚوان خۆی و ئیٚران و پۆلەندا پتەو بکا. لە هاوینی سالٚی 192دا سوپای روسیا، کە ناوی خۆی بۆ لەشکری سوور گۆڕیبوو یەکەمین سەرکەوتنی سەربازییی خۆی لەپاش شەڕی یەکەمی جیهانی وەدەست هیٚنا و هیٚزەکانی پولەندایان، کە هەتا ناخی ئۆکراین هاتبوونە پیٚشەوە، هەتا نیٚو خاکی پۆلەندا و نزیکیی وەرشەو رەپالٚ نا و دەولەتی پۆلەندایان ناچار کرد، کە دەست لە شەڕ هەلگریٚ و پەیمانی ئاشتی واژۆ بکا، کە بە بەپیٚی ئەو پەیمانە سنوورەکانی بەر لە شەڕی هەردوولا بەفەرمی ناسران. ناکۆکییەکانی ئیٚران و حکوومەتی بۆلشەڤیکیش بە

پێی واژۆی پەیمانی 1921 چارەسەر کران، کە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا بە تێرو تەسەلی وێڕای کورتەمێژوویەکی پێوەندییەکانی نێوان ئێران و روسیا باسی دەکەین.

لە سەرەتاکانی هاتنە سەرکاری حکوومەتی لینیندا دوژمنانی دەرەکیی حکوومەتی نوێی بۆلشەڤیکی دەیانویست بە یارمەتیی نەیارانی نێوخۆیی ئەو رژێمە و پاشماوەکانی سوپای تەزاری، ئەو حکوومەتە بڕووخێنن یا لانیکەم چەند پارچەیەکی خاکی ئیمپراتۆریی کۆنی روسیا دابڕن و رژێمی بۆلشەڤیکی لاواز بکەن. یەکێك لەو ناوچانەی، کە بریتانییەکان هەوڵیان دەدا بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانیان لە خۆرهەڵاتی ناڤیندا و دابینکردنی تەناهیی هیندوستان لە چنگ حکوومەتی بۆلشەڤیکیی دەربێنن ناوچە هەستیارە ستراتیژییەکانی قەفقاز و سەرچاوە نەوتییەکانی بوو. هێزە دژە بۆلشەڤیکەکانی ژەنەراڵ دنیکینی تەزاری هەتا سەرەتاکانی ساڵی 1920 ئەو ناوچانەیان بەدەستەوە بوو و هێزەکانی بەریتانیا بە فەرماندەرێتیی ژەنەراڵ دنیستروڤیل بۆ یارمەتیدانی ئەوان لە باکووری ئێران و بەشێك لە خاکی ئێستای ئازەربایجانی یەکێتیی سۆڤیەتیی دامەزرابوون. لەشکری سوور لە سەرەتاکانی ساڵی 1920دا دوایین هێرشی خۆی بەمەبەستی وەدەرنانی هێزەکانی ژەنەراڵ دنیکین لە قەفقاز دەست پێکرد و لە مانگی مای هەمان ساڵدا کاتێك هێزەکانی دنیکین بە تەواوی لە ناوبرابوون چەند پاپۆڕی شەڕیی یەکێتیی سۆڤیەتیی بە فەرماندەرێتیی راسکۆلینکۆف پەلاماری بەندەری ئەنزەلی‌یان دا و هێزە بریتانییەکانیان ناچار کرد، کە ئەو بەندەرە بەجێ بێڵن و لە شوێنەکانی خۆیان لە باکووری ئێران پاشەکشە بکەن.

لینین تەنیا لە بیری سەقامگیرکردنی حکوومەتی بۆلشەڤیکی لە روسیا و وەرگرتنەوەی قەلەمڕەوی ئیمپراتۆریی تەزارەکاندا نەبوو بەڵکو هەر لە سەرەتاوە بیری لە شۆڕشێکی جیهانی و دامەزراندنی سیستەمی کۆمۆنیستی لە سەرانسەری جیهاندا دەکردەوە. پشێوی و تێکەولێکەی پاش شەڕ لە وڵاتانی ئەورووپیدا بە تایبەتی لە وڵاتە تێکشکاوەکاندا، رووخانی رژێمە پادشایەتییەکان لە ئەڵمانیاو نەمسا، لێکترازان و پارچەپارچەبوونی ئیمپراتۆریی نەمسا_هەنگاریا، ئاڵۆزی و قەیرانە نێوخۆییەکانی پۆلەندا و وڵاتانی باڵکان بە گشتی لەو فاکتەرانەن، کە هیوای سەرکەوتنی شۆڕشێکی کۆمۆنیستییان لەو وڵاتانەدا بە لینین دەبەخشی.

لینین لە کۆتاییەکانی ساڵی 1918دا، کە روسیا خۆی لە ئاگری شەڕی نێوخۆییدا دەگڕا چەند کەس لە رێبەرانی بۆلشەڤیکی بۆ وێنە بۆخارین و رادك‌ی راسپارد، کە بەمەبەستی وەڕێخستنی شۆڕشێکی کۆمۆنیستی لە ئەڵمانیا پێوەندی بە حیزبی سۆسیالدیموکراتی ئەو وڵاتەوە بگرن.

بەڵام لەو نێردراوانە تەنیا رادك توانیی بە پسوولەی تەزویر بچێتە نێو ئەڵمانیا. رادك لە ژانوییەی 1919دا توانیی شۆڕشێك لە بەرلین وەڕێبخا، بەڵام ئەو شۆڕە زۆر خێرا سەركوتكراو رێبەرەكانی كوژران. بە دوای سەركوتی ئەو شۆڕشەدا رادكیش لە ناوەندی پروپاگەندەی كۆمۆنیستی لە بەرلین گیراو ئەو بەڵگەو دیكۆمێنتانەی، كە لەو ناوەندە وەدەست كەوتن پێشاندەری پلانی وەڕێخستنی شۆڕشێكی كۆمۆنیستی لە بەهاری ئەو ساڵەدا لە ئەورووپای ناوەندی بوو. لەشكری سوور هاوكات لەگەڵ وەڕێكەوتنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەكان لە رێگەی پۆڵەنداوە دەچووە نێو ئەڵمانیا و كۆمۆنیستەكانی ئەڵمانیا بە یارمەتیی ئەوان بە دەسەڵات دەگەیشتن.

شكستی پلان و گەڵاڵەكانی لینین لە ئەڵمانیاو گیرانی رادك نەبووە هۆی ئەوەی كە لینین لە وڵاتانی دیكەی ئەورو پێدا دەست لەو گەڵاڵانەی هەڵگرێ. لەمانگی مارسی ساڵی 1919دا شۆڕشێكی كۆمۆنیستی بە سەركردایەتی بلا_كونbcla kun لە هەنگاریاوەڕێخراو دەوڵەتی یەكێتیی سۆڤیەتیی دەمودەست حكوومەتەكەی ئەوی بە فەرمی ناسی و پەیمانێكی هاریكاری و دۆستایەتی لەگەڵ واژۆ كرد، بەڵام حكوومەتی بلاكون زیاتر لە 33 رۆژی خۆڕانەگرت و رژێمێكی توند و تیژ و دەستەراستی جێگەی گرتەوە.

لە ژانوییەی 1919دا لینین نامەیەكی سەرئاوەڵای بۆ حیزبە كرێكارییەكانی ئەورووپاو ئەمریكا نووسی و بڵاوی كردەوە و بانگهێشتنیكردن بۆ پێك هێنانی ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم. بەدوای بانگەشەكەی لینیندا چیچێرین وەزیری دەرەوەی یەكێتیی سۆڤیەتیی نامەی بۆ سەرۆكایەتی حیزبە سۆسیالیست و كرێكارییەكانی جیهان نارد و بانگهێشتی كرد بۆ بەشداری لە كۆبوونەوەكانی ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم، كە بۆ مانگی مارس پێشبینی كرابوو. یەكەمین كۆنگرەی ئەنتەرناسیۆنال، كە بە (كۆمینترێن) یا كۆمۆنیستی نێودەوڵەتی ناوبانگی دەركرد رۆژی دووەمی مارسی 1919 بە بەشداریی 35 نوێنەر لە سی وپێنج وڵات، لە مۆسكۆ گیرا. مەبەست لە پێك هێنانی ئەو رێكخراوەیە، كە لەناوبردنی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم بوو ئامانجەكانی لینینی وەدی هێنا. هەرچەندە ئەو ئامانجە وردە وردە و لە كۆنگرەكانی دیكەی ئەنتەرناسیۆنالدا وەدی هاتن. لینین خۆی لە سەر ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم و جیاوازییەكانی لەگەڵ ئەنتەرناسیۆنالی یەكەم و دووەم دا دەڵێ:

"ئەنتەرناسیۆنالی یەكەم (1864_72) یەكەمین رێكخراوی كرێكاریی بۆ خەبات دژی سەرمایەداری دامەزراند.

ئەنتەرناسیۆنالی دووەم (1914_1889) بۆ وەدەستهاتنی ئامانجەکانی ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی پرۆلتێریی پێك هێنا، بەڵام بە هۆی دزەکردنی مۆرە و دەستوپێوەندی کۆنەپارێز و هەلپەرست لە ڕێبازی ئەسڵیی خۆی لایدا و لەگەڵ دەستپێکردنی شەری یەکەمی جیهانی لەنێو چوو.

ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەنتەرناسیۆنالی دووەم لە دایك بووە و بە کورتکردنەوەی دەسەڵاتی ئۆپۆرتۆنیستەکان (هەلپەرستان) و سۆسیال شۆڤینیستەکان ( نیشتیمانپەرستە دەمارگرژەگان و نەتەوەگەراپانی خۆ بە سۆسیالیستزان) و بۆرژۆواو دەرەبەگان، بە مەبەستی دابینکردنی بەرژەوەندیی کرێکاران و دامەزراندنی دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دەگەڕێتەوە سەر ڕێبازی سەرەکیی خۆی.

لینین لە سەر ئەو باوەڕە بوو، کە حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی بە بێ هەڵایساندنی ئاگری شۆڕش لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپیدا خۆ ڕاناگرێ و ڕاوەستاو نابێ هەربۆیەش سەرەڕای ڕەوشی کارەساتباری ئابووری و پشێوی و شەڕی نێوخۆیی، گوژمەیەکی جێگەی سەرنجی بۆ هەناردەکردنی شۆڕش بۆ وڵاتانی دیکەی ئەورووپا تەرخان کردبوو و نووسینگەی ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم یا کۆمینترێن، زیاتر خەریکی پیلان داڕشتن بوون بۆ ئاڵۆزی سازکردن و هەڵگیرساندنی شۆڕش لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا.

دووەمین کۆنگرەی کۆمینترێن لە ژووئەنی 1920دا لە پیترۆگراد پێك هات و کۆبوونەوەکانیان لە مۆسکۆ هەتا مانگی ئووتی خایاند. نوێنەرانی حیزبی کرێکاری و سۆسیالیستی 37 وڵات لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون.

کۆنگرەی دووەمی کۆمینترێن گەڵاڵەکەی لینینی لەمەڕ چۆنێتیی چالاکیی حیزبە کۆمۆنیستییەکانی وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا پەسند کرد.

بە پێی ئەو گەڵاڵەیە حیزبە کۆمۆنیستەکان دەبوایە لە هەمانکاتدا، کە دەبێ لە چوارچێوەی یاسای بنەڕەتیی ئەو وڵاتەدا بمێننەوە ڕێکخراوێکی نهێنییش پێکبێنن و چالاکییە نهێنی و نایاساییەکانیان لەو ڕێکخراوەدا کۆ بکەنەوە. لەو گەڵاڵەیەدا ئاماژەیەکی جێگەی سەرنج بە مەسەلەی بەشداریی کۆمۆنیستەکان لە کێبڕکێی پەرلمانیشدا کردووە و تێیدا هاتووە کە:"هیچ پەرلمانێك لە وڵاتانی سەرمایەداریدا ناتوانێ ببێتە گۆڕەپانێك بۆ خەباتێکی شێلگیر و خاوەن دەستکەوت بۆ دابینبوونی بەرژەوەندیی چینی کرێکار و چاکسازیی بنەمایی بە قازانجی

پرۆلتاریا، بەڵام کۆمۆنیستەکان دەبێ بۆ کەڵکوەرگرتن لە ناوەند و دامودەزگـا بۆرژۆواییـەکان بەمەبەستی لەنێوبردنی ئەو دامودەزگایە بەشداری ئەو جۆرە پەرلمانانەش بن..."

دووەمین کۆمینترێن کۆمەڵێك هەلومەرجی بۆ حیزبە بەشدارەکانی ئەو رێکخراوە دانا، کـە بە کردەوە ئەوانی لە چوارچێوەی رێبازی حیزبی بۆلشەڤیکدا قەتیس دەکرد. بـەپێی بڕیارێـك، کە کۆمیتەی بەڕێوەبەریی کۆنگرەی سێیەم لـە ژووئیـەی 1921دا، حیزبـە کۆمۆنیسـتەکان دەبوایە پاش هـەر کۆبوونەوەیـەکی کـۆمینترێن رێبـاز و پرۆگرامـەکانیان لەگـەڵ بڕیارەکـانی کۆمینترێن بگونجێنن و بە گشتی کۆنگرەی چوارەم کۆمەڵێك یاسای پەسندکردن، کە بـە پێـی ئەو یاساگەلە نوێنەرانی (حیزبی برا) دەبوایە بـەبێ بڕیـار و رێبـازی دیـاریکراوی پێشـوو لـە کۆنگرەدا بەشدار بن و بەواتایەکی دیکە پێملی ئەو رێباز و هێڵەگشتی‌یانـە بـن، کـە حیزبـی بۆلشەڤیك دیاریی کردوون و متەقیشیان لێوە نەیە.

بەو شێوەیە لینین وردە وردە تەواوی ئەو حیزبە کرێکاری و سۆسیالیستانەی، کـە بـەر لـە پێکهاتنی کۆمینترێن سەربەخۆیی دەنگدانیان هەبوو، لە رێکخراوێکـی سـانترالدا بـە شـێوەی مۆرە و پاشکۆی حیزبی بۆلشەڤیك کۆکردنەوە و ناوی حێزبی کۆمۆنیستی لە سەر هـەمووان و یەك لەوان حیزبی بۆلشەڤیکیش دانا. رێبەرایەتیی ئەو حیزبانـەش درایـە دەسـتی ژمارەیـەك شۆڕشگێڕی کارامە، کە پێشتریش لە لایەن کۆمیتەی بەڕێوەبەریی کۆمینترێنەوە واتە رێبەرانی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییەوە پشتیوانی‌یان لێ کرا.

کۆمینترێن پاش مەرگی لینین چالاکییەکانی خۆی بەربڵاوتر کردەوە و حیزبـە کۆمۆنیسـتەکانی تەواوی وڵاتانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی هەتا ئەو کاتەی لەجەنگـەی شـەڕی یەکـەمی جیهـانیی دووەم ەوە، وەکو پوانێك لە لایەن ستالینەوە بۆ هاوپـەیمانان، هەڵوەشـێندراوە و بـەبێ ئـەوەی کـە بەکردەوە هیچ گۆڕانێك لە شێوازی پێوەنـدیی مۆسـکۆ لەگـەڵ حیزبـەکانی وڵاتـانی کۆمۆنیسـتیی وڵاتانی دیکە یان ئامانجی شۆڕشی جیهانیی یەکێتیی سۆڤیەتییدا پێك هاتبێ.

# بەشی چوارەم

## ستالین چۆن بە دەسەڵات گەیشت؟

ژۆزیف ڤیساریۆنۆڤیچ جوگاشڤیلی، کە هەموو جیهان بە ستالینی دەناسن نزیك بە سی ساڵ فەرمانرەوایی بەسەر یەکێتیی سۆڤیەتیدا کرد و لە هەشت ساڵی کۆتایی ژیانیدا کەوشەنی حکومەتەکەی خۆی هەتا ناخی ئەورووپا بردە پێش. ئەو لە نێو هاوکارەکانی لینینی دامەزرێنەری حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتییدا لە باری پێگە و ئاستی نزیکایەتی لە ڕێبەری یەکێتیی سۆڤیەتیی لە پاش زینۆویێف و کامێنۆڤ و ترۆتسکی و بۆخارینەوە بوو و هەتا ساڵی 1922، کە لە ئاکامی ململانێی نێوان ئەواندا بوو بە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی، هیچ کەس پێی وانەبوو ڕۆژێك دابێ هەمووان وەلا بنێ و ببێتە ڕێبەری بێ لەمپەری یەکێتیی سۆڤیەتی.

ستالین ڕۆژی بیست و یەکەمی دیسێمبەری 1879 لە گوندێکی بچووکی لێوار شاری گۆریgory گورجستان لە دایك بوو. یەکاترینای دایکی بەر لەو سێ زگی دیکەی کردبوو هەر سێجاران لە کاتی منداڵبوون یا پاش چەند مانگێك منداڵەکانی مردبوون. ڤیساریۆن ئیڤانۆڤیچی باوکی ستالین پینەدۆز بوو و لەبەر ئەوەی کە تەواوی داهاتەکەی خۆی دەدا بە خواردنەوە دایکی ستالین بە ناچاری بۆ دابینکردنی بژیوی ژیان کارەکەری و جلشۆریی ماڵ نی دەکرد. خرۆشۆف، کە پاش ستالین بوو بە ڕێبەری یەکێتیی سۆڤیەتیی لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ:

"... ستالین جار وبار باسی باوکی و سەردەمی منداڵیی خۆی بۆ دەکردین. ئەو گەلێ جاران باسی خواردنەوەکانی باوکی بۆ دەگێڕاینەوە بۆ وێنە دەیگوت: جاری وابوو باوکی بۆ چەند قوم شەڕاب قەیشی شەلوارەکەی خۆی دەفرۆشت و نەزیلەیەکی گورجیی بۆ دەهێنایەوە، کە پیاوێك دەبێ بگاتە ئەو پەڕی چارەرەشیی خۆی بۆ ئەی قەیشی شەلوارەکەی بفرۆشێ...

ستالین هەروەها دەیگوت باوکم بە شیرەخۆرەیی منی فێری مەی خواردنەوە کردووە و لە دایکی دەگێڕاوە، کە کاتێك لە بێشکەدا بووە باوکی قامکی خۆی لە شەراب هەڵکێشاوە و لە زاری ئەوی ناوە بۆ ئەوەی لەبری مەمکەمژە بیمژێ..."

باوکی ستالین پیاوێکی رەشۆك و زۆر تووڕە و تۆسن بوو و بە هەر بڕوبیانوویەك ژن و منداڵەکەی دارکاری دەرکرد. ستالین لە تەمەنی سێچوار ساڵیدا لەبەر شکاندنی ئیستیکانێك لێدانێکی بەدەستی باوکی خوارد، کە دەستی چەپی شکا هەربۆیەش هەتا مرد دەستێکی نقوستان بوو. تووڕەیی و بێبەزەیی باوکی کاریگەرییەکی قووڵی لە سەر رۆحی ئەو منداڵە دانا و ئەوی کردە بوونەوەرێکی توند و تیژ و بێبەزەیی.

دایکی ستالین بە پێچەوانەی باوکی ژنێکی ئیماندار بووە و کاتێك لە کلێسەی بچووکی شاری گۆری کوڕەکەی دەشوشت ئارەزووی دەکرد، کە رۆژێك ببێتە پیاوی ئایینی و ببێتە قەشەی کلێسەی ئۆرتۆدۆکسی گۆری. هەر لە سەر ئەو ئاوات و ئارەزووە بوو، کە دایکی ستالین بە پێچەوانەی مەیلی باوکی لە ساڵی1888دا ناردییە قوتابخانەی ئایینی شاری گۆری.

ستالین ئەو قوتابخانەیەی لە ساڵی 1894دا سەرکەوتوانە تەواو کرد و بۆ درێژەدانی خوێنی ئایینی لە دواناوەندیی زانستە ئایینییەکانی تفلیسدا ناونووسیی کرد. ستالین لە تەواوی ئەو ماوەیەی لە قوتابخانەی ئایینی دەیخوێند، کە لەو کاتدا بە "سوسو" بانگیان دەکرد یەکێك بوو لە باشترین قوتابییەکانی قوتابخانەکە و لەبەر ئەوەی کە دەنگێکی خۆشی هەبوو لە رێوڕەسمە ئایینییەکاندا رۆڵی گۆرانیبێژی سۆلۆی گێڕاوە.

باوکی ستالین لە تفلیس لە کارخانەی پێڵاوچنیی "عادڵ خان ئۆف"دا دامەزرا و چونکی پیر و کەنفت ببوو سەری خۆی بەرداوە. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا لە بارەی ستالینەوە دەنووسێ، کە باوکی ستالین لە تفلیس کارگەیەکی پێڵاوچنیی بە دە دوازدە کرێکارەوە هەبووە، کە لەو کاتدا نیشانەی دەوڵەمەندی و تێر و پڕیی بنەماڵەی ستالین بووە، بەڵام ستالین خۆی هەمیشە دەیگوت، کە باوکی تەنیا پینەدۆزێکی هەژار بووە و ئەو شتەی دەکردە پاڵپشتی شۆڕشڤانبوونی خۆی. خرۆشۆڤ لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ، کە لە ساڵەکانی بەر لە شۆڕشدا لە کۆڕ و کۆبوونەوە شۆڕشگێڕییەکان و رێکخراوە کرێکارییەکاندا بە چاوی گومانەوە لەو کەسانەیان دەڕوانی، کە لە بنەماڵەی دەوڵەمەندا لە دایك ببوون و تامی تاڵی هەژاری و نەدارییان نەچێشتبوو هەر بۆیەش ستالین هەقی بوو خۆی بە کوڕی بنەماڵەیەکی هەژار و خوارتر لەوە بناسێنێ، کە هەبوون.

ستالین لەیەکەمین ساڵی خوێندنییەوە لە دواناوەندیی زانستە ئایینییەکانی ئۆرتۆدۆکس لە تفلیس لەگەڵ دەستە و گروپگەلە شۆڕشگێڕەکان، کە هەموو ولاتیان تەنانەت قوتابخانە ئایینییەکانیشیان داگرتبوو ئاشنا بوو. خۆی لە وتوویژێك لە گەڵ ئەمیل لۆدڤیك ی ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانیاییدا دەڵێ: لە تەمەنی پازدە ساڵییەوە واتە هەر لەو کاتەوە، کە پێوندیم لەگەڵ گرووپە نهێنییە مارکسیستەکانی روس، کە ئەوکات لەو بەری قەفقاز دژیان، گرت چوومە نێو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕییەوە. ئەو گرووپانە کاریگەریی قووڵیان بەسەرمەوە بوو و چێژی ئەدەبیاتی نهێنیی مارکسیستییان پێ چێشتم". ستالین هەر لەو وتوویژەدا دەڵێ، کە هەلومەرجی نالەبار و دژوار و ئاستەنگییەکانی قوتابخانەی ئایینیی تفلیس یەکێکی دیکە لەو فاکتەرە کاریگەرانە بوو، کە گیانی خۆڕاگری وداکشان بەرەو مارکسیزمی لەودا گووراندووە.

ستالین لە قوتابخانە ئایینییەکانی گۆری و تفلیسدا فێری زمانی روسی بوو و لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا دەستی کرد بە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی مارکس و ئێنگلس و بیرمەندانی سۆسیال دیموکرات بۆ سەر زمانی روسی. لە بیۆگرافیی ستالیندا، کە لە سەردەمی ژیانی خۆیدا چاپ بووە و کراوەتە فارسیش ئاوا باس لە ژیانی ئەو سەردەمەی ستالین دەکرێ:

لە ساڵەکانی 1896 و 1897دا ستالین لە کۆڕوکۆبوونەوە نهێنییە مارکسیستییەکانی قوتابخانەی دواناوەندیی زانستەئایینییەکانی تفلیسدا جێی لە لای سەروانە و لە مانگی ئوتی ساڵی 1898دا بە فەرمی دەبێتە ئەندامی ڕێکخراوی کرێکاریی حیزبی سۆسیال دیموکرانی روسیا لە تفلیس... ستالین ماندویی نەناسانە دەست دەکا بە خۆ پێگەیاندن و بردنەسەری زانیارییەکانی خۆی. کتێبی "کاپیتاڵ"ی مارکس و "مانیفێستی کۆمۆنیست" و بەرهەمەکانی دیکەی مارکس و ئینگلس دەخوێنێتەوە و لەگەڵ نووسینەکانی لینین ئاشنا دەبێ... ستالین لەو قۆناغەدا شێلگیرانە لە نێو کۆڕوکۆبوونەوەکانی کرێکاراندا خەریکی بانگەشە و پروپاگەندەیە. بەشداری کۆبوونەوە نهێنییەکانیان دەبێ. کاغەزی نهێنی دەنووسی و مانگرتنەکرێکارییەکان ڕێكدەخا. ستالین سەبارەت بەو سەردەمە دەڵێ:"من ساڵی 1898 م دێتەوە بیر. ئەوکاتەی، کە بۆ یەکەم جار کۆڕێکی کرێکارانی نۆژەنکردنەوەی ڕێگەی شەمەندەفەریان پێ ئەسپاردم ... لێرە لە کۆڕی هەڤالاندا من بۆ یەکەمجار فێری هونەری شەڕکردن بووم... کرێکارانی تفلیس یەکەم مامۆستای من بوون..."

لە بیۆگرافییە نافەرمییەکانی ستالینیشدا ئاماژە بەموتالاو چالاکییەکانی سەردەمی لاوەتیی ستالین کراوە و، بەلاّم وەك دەڵێن یەکەمین بەرهەمگەلێك، کە ستالین خوێندوویەتەوە و

کاری تێ کردووە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ڤیکتۆهۆگۆی نووسەری ناوداری فەرەنسی و هێندێ چیرۆکی نووسەرگەلێکی روسیی وەك داستایۆڤسکی و کرۆپوتکین بوونە. لەوانەیە ستالین لەو تەمەنەدا بەرهەمەکانی مارکس و ئینگلسیشی خوێندبێتەوە، بەلام ئەستەمە لەو کاتەدا توانیبێتی لە کتێبێکی وەکو کاپیتالی مارکس تێگەیشتبێ.

لە قوتابخانەی ئایینیی تفلیسدا وردە وردە چالاکییەکانی دەرەوەی قوتابخانەی لینین سەرنج-رادەکێشن و ئاخرییەکەی بەدوای دۆزینەوەی چەند کتێبی قاچاخ لە شوێنی جلوبەرگەکانیدا بڕیاری دەرکردنی دەدرێ. لە بیۆگرافیی فەرمیی ستالیندا بەسەرهاتی وەدەرنانی لە قوتابخانە بە شێوەیەکی دیکە گێڕدراوەتەوە و تێیدا هاتووە:

"لە دواناوەندیی زانستە ئایینییەکان، کە بە توندی کەسانی گومانلێکراویان دەخستە ژێرچاوەدێرییەوە وردە وردە بە چالاکییە نهێنییەکانی ستالین دەزانن و سالی 1899 بە تۆمەتی بانگەشەی مارکسیستی لە دواناوەندی وەدەردەنرێ. ستالین ماوەیەك لە رێگەی وانەگوتنەوەوە دەژی و دواتر (لە دیسێمبەری سالی 1899)دا لە (رصدخانە)ی فیزیای شاری تفلیس دەبێتە زێرەڤانە ژمێریاری، بەلام بۆ چرکەیەکیش چالاکییەکانی خۆی وەلا نانێ. ستالین لەو کاتەدا یەکێکە لە شێلگیرترین ئەندامانی رێکخراوی سۆسیال دیموکراتی تفلیس...

ڤیکتۆر کورناتۆسکی، کە یەکێك بوو لە نزیکترین هاوڕێیانی لینین و بلاوکەرەوەی بیر و باوەڕەکانی ئەو لەو دیوی قەفقاز، لە هاوینی 1900دا دەگاتە تفلیس و پێوەندییەکی زۆر نزیك لەگەل ستالین پێك دێنێ... لە مانگی دیسێمبەری 1900دا ئەو کاتەی رۆژنامەی ئیسکرای لینین بلاو دەبێتەوە ستالین بە تەواوی پەیرەوی لە رێبازەکەی دەکا. ستالین خۆی لە بیرەوەرییەکانی ئەو سەردەمەیدا دەلێ:"ئاشنایەتی لەگەل چالاکییە شۆڕشگێڕییەکانی لینین لە کۆتاییەکانی1900_1890و بە تایبەتی پاش 1901 واتە پاش ئیسکراورە و باوەڕی منی پتەو کرد بەوەی کە لینین کابرایەکی مەزنە... ئەو لەو کاتەدا لەپێش چاوی من سەرکردەیەکی ئاسایی حیزب نەبوو بەلکو بەدیهێنەری راستەقینەی بوو. ئەو هەلۆیەکی بەرزەفڕ بوو، کە لە خەبات و تێکۆشاندا چاوی نەترسابوو و ئازایانە حیزبی بە رێگە ئەزموون-نەکراوەکانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕیی روسیادا بەرەو پێش دەبرد..."

سالی 1901 ستالین تەمەنی لە بیست و و سال تێنەدەپەڕی، بەلام بەو کەفوکولەی، کە لە خەباتی سیاسیدا دەینواند سەرۆکایەتیی بزووتنەوە کرێکارییەکانی تفلیسی وەئەستۆ گرت و پاش وەرێ خستنی یەکەمین مانگرتنە مەزنە کرێکارییەکەی ئەو شارە یەکەمین خۆپێشاندانی

کرێکاریی بە بۆنەی یەکی مانگی مای لە تفلیس وەڕێخست. هەر لە سێپتەمبەری ئەوساڵەدا ستالین یەکەمین رۆژنامەی شۆڕشگێریی گورجستانی بە ناوی "بردزولا"(خەبات) بڵاو کردەوە و یەکەمین وتارەکەکانی بە ناوی خوازراوی "کوبا" بڵاو بوونەوە. کوبا ناوی یەکێك لە قارەمانە ئەفسانەییەکانی قەفقازە، کە لەمەودوا هەتا هەڵبژاردنی ناوی شۆڕشڤانییەکەی دواتری ئەو، واتە ستالین، بەو ناوە بانگ دەکرێ.

لە کۆتایی ساڵی 1901دا پۆلیسی تەزاری راوەدووی ستالین دەنێن و ئەو بە ناچاری لە تفلیس رادەکا. رێکخراوی سۆسیال دیموکراتی قەفقاز چالاکیی لە باتوم(سێیەمین ناوەندی مەزنی کرێکاریی قەفقاز لە پاش باکۆو تفلیس)ـەوە پێ دەسپێرا و ستالین ماندوویی نەناسانە پاش سێ مانگ چالاکی لەو شارەدا سەرکردایەتیی یەکەمین خۆپێشاندانە کرێکارییەکان لە باتوم وەعۆدە دەگرێ. پۆلیسی تەزاری لە لێکۆڵینەوەکانیدا لە سەر ئاڵوزی و پشێوییەکانی کرێکاری لە باتوم، رۆڵی گەنجێکی بۆ دەردەکەوێ، کە لە تفلیسەوە هاتووە و رۆژی پێنجەمی ئاپریلی ساڵی 1902 دەیگرن.

# 2

یەکەمین گیرانی ستالین لە تەمەنی سی ساڵیدا سەرەتای زنجیرەیەك گیران و دوورخرانەوە و راکردنەکانی ئەوە لە تاراوگەکان، کە پازدە ساڵان دەخایەنێ. دوای ئەوەدا ساڵی 1904 بۆ ماوەی سی ساڵ بۆ سیبریای دوور دەخەنەوە، بەڵام ستالین لە مانگێك پتر لە تاراوگە نەمایەوە و بە پسوولەی پێناسی بازرگانێکی فەرش فرۆشی گورجی لە تاراوگە رایکرد. ستالین لە گەڕانەوەی خۆی لە تاراوگەوە، کە بەشێکی زۆری بە پێیان بڕیبوو چەندین جار بە هۆی سەرمای بە تەوژم و بەستەڵەك و بڕینی رێگەی پڕمەترسی و رژد و لێڕەواران هاتە سەرەمەرگ، بەڵام ئاخرییەکەی توانیی بە سلامەتی خۆی بگەیەنێتە تفلیس و ژیانێکی نوێ بە نهێنی دەست پێ بکا.

لە یەکەمین قوناغی گیرانی ستالیندا حیزبی سۆسیال دیموکراتی روسیا بوو بە دوو لقی بۆلشەڤیکی و مەنشەڤیکی و ستالین لە گەڕانەوەیدا بۆ گورجستان کەوتە گەڵ لقی بۆلشەڤیکییەکەی. ستالین لە ساڵی 1905 وەك نوێنەری بۆلشەڤیکەکانی قەفقاز لە کۆنفرانسێك-

دا، کە لە فەنلاند پێکهاتبوو بەشدار بوو بۆ یەکەمین جار چاوی بە لینین کەوت. ستالین لە ساڵی 1906 یشدا بۆ دووەمین جار بە مەبەستی بەشداری لە کۆنفرانسێکی حیزبیدا لە روسیا چووە دەراو ئەمجارەیان لە سوید لەگەڵ سەرکردەکانی تری بۆلشەڤیکی ئاشنا بوو. لەو ساڵانەدا ستالین لەگەڵ کچێك بە ناوی یەکاترینا سڤانیدزێ ژیانی هاوبەشی پێك هێنا، بەڵام قۆناغی هاوسەرێتییەکەیان پتر لە دوو ساڵی نەخایاند و یەکاترینا پاش ئەوەی کوڕێکی بوو، مرد.

ستالین لە 1907دا بۆ بەشداری لە کۆنگرەی سۆسیال دیموکراتەکانی روسیادا چووە لەندەن و لەو کۆنگرەیەدا بۆ یەکەمین جار لەگەڵ خەنیمی داهاتووی خۆی واتە ترۆتسکی ئاشنا بوو. هەر لەو کۆنگرەیەدا بوو، کە ستالین سەرنجی لینین بۆ لای خۆی رادەکێشی و دەکەوێتە بەردڵی و وەك دەڵێن هەر لەو کۆنگرەیەشدا بوو، کە لینین پاش بیستنی بەسەرهاتی خەبات و تێکۆشان و هەڵاتنی ستالین لە سیبریا نازناوی ستالین واتە پۆڵای پێ دەدا. لە کۆنگرەی لەندەندا لینین کۆمەڵێك کۆبوونەوەی نهێنی لەگەڵ لایەنگرە بۆلشەڤیکییەکانی خۆی پێك دێنێ، بەڵام گەورەترین گرفتی بۆلشەڤیکەکان لە بەڕێوەبردنی بەرنامەکانیاندا کێشەی ئابووری بوو. لیڤید کراسین یەکێك لە هاوکارانی لینین لە یەکێك لەو کۆبوونە وانەدا بڕینی بانکەکان بە مەبەستی دابینکردنی سەرچاوە ماڵییە پێویستەکان دێنێتە بەرباس و لینین بە حەز و تاسەوە پێشوازیی لێ دەکا. ستالین ئامادەبوونی خۆی بۆ بەشداری لە بەڕێوەبردنی ئەو پلانەدا دەربڕی و بەڵێنیدا، کە ئەگەر بگاتەوە روسیا پارەی پێویست بۆ دابینکردنی خەرج و موخاریجی حیزب جێبەجێ دەکا.

گەورەترین دزییەکی چەکدارانە، کە لە مێژووی حیزبی بۆلشەڤیکدا بۆ ماوەیەکی زۆر خەرج و موخاریجی حیزبی دەرهێنا دزینی ئەو دزییە بوو، کە لە کۆتایی ژوئەنی 1907دا لە بانکی تفلیس کرا. ئەو بارە بانکییە، کە 250000 رۆبڵی تێدا بوو رۆژی بیست و شەشەمی ژوئەن بە رواڵەت بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانە هێزەکانی سوپا و ئیدارە دەوڵەتییەکانی قەفقاز بەڕێکرابوو گەیشتە پۆستەی تفلیس و بە گالیسکەیەك، کە ژمارەیەك چەکدار دەیانپاراست بەرەو بانك بردرا. لە سەر رێگەی گالیسکەکە و لە ناوەندی شار چەند هەنگاو ئەولاتری گالیسکەکەوە بۆمبێك لە نێوەڕاستی شەقام تەقییەوە. ئەو بۆمبە، کە لە سەر بانی یەکێك لە ماڵ نی دەوری شەقامەکەوە فڕێدرابووە سەر شەقام، ئەوەندە بە هێز بوو، کە کیلۆمەترێك ئەولاتریش شووشەی ماڵ و دووکانەکانی هێنا خوارێ. ئەوەندەی یەکدابەدوو ئەوانەی، کە لە دەوروبەر بۆسەیان دانابوو پەلاماری گالیسکەکەیان دا و توورەکە پڕ لە دراوەکانیان هەڵگرت و ئەو چەند قەزاقەش، کە زیندوو مابوونەوە و دەیانویست دەست بکەنەوە درانە بەر فیشەك و کوژران.

لینین و سەرکردەکانی بۆلشەڤیکی هەتا چەندمانگ دواتریش ئەو رووداوەیان وەئەستۆ نەگرتبوو هەتا ئەوەی کە دۆزینەوەی دراوی پێنسەد رۆبلیی دزراو پەتەی ئەوانی لە لای کۆمەڵێك لە بۆلشەڤیکە ناسراوەکان خستە سەر ئاو. یەکێك لە سەر کردەکانی بۆلشەڤیکی، کە لەو پێوەندییەدا گیران ماکسیم لیتڤینۆفmaxim litvinov ی بەرپرسی چەك کڕینی بۆلشەڤیکییەکان بوو، کە لە کاتی وردکردنەوەی دوازدە دراوی پێنسەد رۆبلیدا لە پاریس بە دندووك پێوە بوو. روسیا پێشتر ژمارەی ئەو دراوانەیدا بوو بە بانکەکانی ئەورووپا. چەند کەسی تریش یەك لەوان ژنێکیش لە کاتی وردکردنەوەی ئەو دراوانەدا لە ئەڵمانیاو سوویسرا گیران، بەڵام دەوڵەتە ئەوروووپییەکان لە رادەستکردنەوەی دەستبەسەرکراوان بە دەوڵەتی روسیا خۆی بوارد.

ستالین پاش رێبەریکردنی دزییەچەکدارییەکە لە تفلیس، لەو شارە هەڵات و لە مانگی ژوئیەی ساڵی 1907دا لە باکۆ بە ناوێکی خوازراوەوە دەستی کرد بە رێکخستنی بۆلشەڤیکەکان. چالاکییەکانی ستالین لە باکۆ لە سەرەتاکانی ساڵی 1908دا بە ئاکام گەیشتن و یەکەمین مانگرتنەکانی کرێکاری لە مانگی مارسی هەر ئەو ساڵەدا لە پیشەسازیی نەوتی باکۆ وەرێکەوتن. رۆژی بیست و پێنجەمی مارسی 1908 ستالین، کە وەشوێن ئەوە کەوتبوو بزانێ هاندەر و پاڵنەرانی ئەو مانگرتنانە کێن، قۆڵبەست کرا پاش هەشت مانگ بەندکران بە دووساڵ دوورخرانەوە بۆ باکووری روسیا حوکمدرا.

ستالین لە کۆتاییەکانی 1908دا بەڕێی تاراوگەی لۆگدا کرا، بەڵام دووساڵ دوورخرانەوەکەی لە شەش مانگی پتر نەخایاند و ستالین رۆژی بیست و چوارەمی ژووئەنی1909 لە تاراوگەی باکووری روسیا رایکرد و لە کۆتاییەکانی ژووئیەدا بوو، کە گەڕایەوە باکۆ.

ستالین لە باکۆ بە گۆڕینی قەڵافەتی و بە ناوێکی خوازراوی تازەوە چالاکییەکانی خۆی دست پێکردەوە، بەڵام پاش هەشت مانگ دیسان بە تەڵەوە بووو و رۆژی بیست و سێیەمی مارسی 1910 قۆڵبەست کرایەوە و لە بەندیخانە توند کرا.

ستالین پاش شەش مانگ لە بەندیخانە دیسانیش نێردرایەوە بۆ هەمان تاراوگەی پێشوو لە باکووری روسیا، بەڵام ئەومجارەیان ماوەی دوورخستنەوەکەی کرایە سێ ساڵ. ستالین هەروەك جاران تاقەتی تێپەڕاندنی قۆناغی تاراوگەی نەبوو و هەربۆیەش لە سێپتەمبەری 1911دا لە تاراوگەکەی خۆی رایکردەوە و ئەمجارەیان رێگەی سەنپێترێزبۆرگی گرتە بەر. لە بیۆگرافییە فەرمییەکەی ستالیندا، کە لە سەردەمی زیندووبوونیدا نووسراوە، ئاوا هاتووە:

.... قۆناغی نوێی چالاکییەکانی هاوڕێ ستالین لە نیـوەی دووەمـی سـاڵی 1911 ـەوە دەست پێدەکا. هاوڕێ ستالین لە شەشەمی 1911دا بە نهێنی لە لۆگداوە بەرەو پێترێزبۆرگ وەڕێ دەکەوێ. هاوڕێ ستالین لە پیترێزبۆرگ پێوەنـدی بەرێکخسـتنی پیترێزبۆرگـەوە دەگـرێ. خەباتی دژی مەنشەڤیکەکان و ترۆتسکیسـتەکان رێکـدەخاو رێبەرایـەتیی دەکـا. رێکخـراوە بۆلشەڤیکییەکانی پیترێزبۆرگ پتەوو و یەکگرتوو دەکا. لە رێکـەوتی نۆیـەمی سـێپتەمبەری ساڵی 1911دا هاوڕێ ستالینیان سەرلەنوێ قۆڵبەست کردەوە و بـۆ شـاری لـۆگدایـان دوور خسـتەووە. لـەو تاراوگەیەشـەوە لـە مـانگی فێبریـیـەی 1912دا هـاوڕی سـتالین دیسـان رادەکاتەوە...

لـەو بەشـە لـە بیۆگرافیـە فەرمییەکـەی سـتالیندا تـەنیا رێکەوتنـەکانی هـەڵاتن و دوورخرانەوەکانی راستن و ئەویتری لـەو پروپاگەنـدە درۆیینیانـەی پێوەندیـدار بـە گـەورەیی و کەسایەتیی ستالینە لە کاتی ژیانیدا، چونکی لە مـاوەی هـاتنی سـتالیندا بـۆ پیترێزبـۆرگ و گیرانی ئەو واتە تەنیا لە سێ رۆژی نێوان شەشەم هـەتا نۆیـەمی سـێپتەمبەردا سـتالین قـەت نەیدەتوانی وەها چالاکییەك بکاو وەك شەش کەس لە بیۆگرافی نووسەکانی ئەو دەیانگوت لـەو ماوەیەدا" خەباتی دژی مەنشەڤیکەکان و ترۆتسکیسـتەکان رێکبخـات و رێبەرایـەتیی بکـاو رێکخراوە بۆلشەڤیکییەکانی پیترێزبـۆرگیش یـەکگرتوو بکـا". جگـە لـەوەش، لـەو کاتـەدا گرووپێك بەناوی ترۆتسکیست لە گۆڕێ نەبوون و ئەم دەستەواژەیە، لەداهێنانەکانی سـەردەمی حکوومەتەکەی ستالینن.

ساڵی 1912، خاڵێکی وەرسووڕانی گرینگە لە مێژووی حیزبی بۆلشەڤیکیی روسـیادا، و لە راستیدا رێکەوتی دامەزرانی ئەو حیزبەیە. چونکی بۆلشەڤیکەکان پـاش گرتنـی کـۆنگرەی سۆسیال دیموکراتەکانی روسیا لە پراگ، لە ژانوییەی ساڵی 1912دا بە فەرمی لەو حیزبە جیا بوونەوە و رێکخراوێکی سەربەخۆیان بەناوی حیزبی بولشەڤیك دامەزراند.

ستالین، کە بۆ جاری چوارەم لە تاراوگەکـەی رایکردبـوو و گـەڕابۆوە سـەنپێترێزبۆرگ، بـە پێشنیاری لینن. کرایە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی نوێ و بەرپرسی چاپ و پەخشی رۆژنامەیەك لە پایتەختی روسیا. ستالین لـە سـەرەتادا رۆژنامەیـەکی رۆژانـەی بـەناوی پراڤیـدا دەرکـرد. یەکەمین ژمارەی رۆژنامەی پراڤیدا لە رۆژی بیست و دووەمی ئاپریلی 1912دا (پێنجـەمی مانگی مای بە پێی رۆژ ئەژمێری نوێی یەکێتیی سۆڤیەتیی بلاو بۆوە و بە بلاو بوونەوەی ئەو، بۆلشەڤیکەکان پێگەیەکی بە هێزتریان لە نێو جەماوەری کرێکاریی روسیا و بـە تایبـەتی لـە

ناوەندەكرێكارییەكانی سەن پیترێـز بۆرگـدا وەدەسـت هێنـا. بۆلشـەڤیكی‌یـەكان لـە رێگـەی نایاساییەوە داهاتی پێویستیان بۆ دەركردنی ئەو رۆژنامەیە دابین دەكرد، بەڵام خەنیمـەكانیان، كە لە خەباتی سیاسیدا تا رادەیەك پێ‌بەنـدی بنـەما ئەخلاقیـەكان بـوون، نەیانـدەتوانی لـەو رێگەیەدا شان لە شانی ئەوان بدەن. مەنشەڤیكەكان رۆژنامەیەكی حەوتوانەیان لە پیترێزبـۆرگ هەبوو، كە زۆرجاران بە هۆی كێشەی ئابووری نەیاندەتوانی دەریكەن.

رۆژنامەی پراڤیدا بە كەڵك وەرگرتن لەو برە ئازادییەی، كە پاش كـوژرانی سـتۆلیپینی سـەرۆك وەزیری بە زیپكۆزاكونی روسیا، لەو وڵاتـەدا رەخسـابوو، زۆر بـەخێرایی جێگـەی خـۆی كـردەوە و ژمارەی گەیشتە بیست هەزار دانە لە رۆژدا، كە بەپێی پێوەرەكانی ئەوكات ئێجگار زۆر بوو.

ستالین لەو رۆژنامەیەدا بەناوی خوازراوی نوێ (ستالین) وتاری بڵاو دەكردنەوە و بۆ جارێكی دیكەش لە كۆڕ و كۆبوونەوەكانـدا بـەو نـاوە دەناسـرا پـاش بڵاوبوونـەوەی پراڤیـدا هێنـدەی نەخایاند، كە ستالین بۆ جارێكی دیكەش دەست بە سەركرایەوە و بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵان بـۆ سـیبری دوورخرایـەوە، بـەڵام لـە سـەرەتای سـێپتەمبەری1912دا بـۆ پێنجـەمین جـار لـە تاراوگەكەی رایكردەوە و بەنهێنی بۆوە بە سەرنووسەری پراڤیدا. لە خولی نـوێی پراڤیـدا، دا. لینین و هاوكارە نزیكەكانی واتە زینۆوێڤ و كامێنوڤیش، كە بۆ ئەوەی لە روسیا نزیك بـن لـە شاری كراكۆی پولەندا گیرسابوونەوە، هاوكارییان دەركـرد و وتارەكـانی خۆیـان بـە نامەبـەری تایبەتیدا بۆ ستالین دەنارد. لینین هەر لە رێگەی ئەو نامەبەرانەوە بەردەوام رۆژنامەی پراڤێدی پێ‌دەگەیشت و بیر و بۆچوونەكانی خۆی سەبارەت بە مێتۆدی رۆژنامە بۆ ستالین دەنارد. ستالین خۆشیی دووجاران لە مانگەكانی نۆڤەمبەر و دیسێمبەری سـاڵی 1912دا بـۆ چـاوپێكەوتن لەگەڵ لینین و بەشداری لە پەرلمانی راوێژكارانی رێبەرانیدا چووە كراكۆی. هەر لەو سەردانانەدا بوو، كـە سـتالین یەكـەمین بەرهـەمی گرینگـی خـۆی لـە ژێـر نـاوی "ماركسـیزم و پرسـی نەتەوەیی"دا بە لینین.

لینین ئەو نووسینەی ستالینی زۆر بە دڵ بوو و لە یەكێك لە وتارەكانیـدا ئـەو بەرهەمـەی وەك "گەورەترین هەنگاویك، كە بۆلشەڤیزم بەر لە شەڕ لە بـواری پرسـی نەتەوەییـدا هـەڵی-گرتووە" تاریفی كرد.

سـتالین لـە سـەرەتای سـاڵی 1913دا گەڕایـەوە سـەن پیترێزبـۆرگ و لـە بـەڕێوەبردنی بڕیارەكانی كۆنفرانسی كراكۆیدا، سنووری چالاكییەكانی خۆی بەرین كردەوە. مێتۆدی وشـك و جیددی ستالین لە رێبەرایەتی و بەڕێوەبەریدا، لە نێو رێكخستنەكانیدا كۆمەڵێك نەیاریشی بـۆ

ساز کرد و بەروالەت بە ڕێنوێنی و دەسکیسی یەکێك لەوان، شەوی 23ی فێورییەی ساڵی 1913لە میوانییەکدا ستالین یان قۆڵبەست کرد و بۆ ماوەی چوار ساڵ بۆ ناوچە دووردەستەکانی "توروخانسگ"ی سیبری دووریان خستەوە. هەوڵی ستالین بۆ راکردن لە تاراوگەی نوێ، هیچی لیٚشین نەبۆوە و ژاندارمەکانی تەزاری لە ترسی ئەوەی کە نەکا دیسان رابکاتەوە، لە سەرەتای ساڵی 1914دا ناردییانە باکووریترین شوێن واتە گوندی بچووکی "کوریکا" لە دەوروبەری هێڵی جەمسەری.

ستالین ئیتر هەوڵ نادا لە تاراوگە نوییەکەی خۆی هەڵاو سێ ساڵان لەو شوێنە، کە دە مانگی رەبەق بەستەڵەکە، خۆڕادەگرێ، تا ئەوەی کە لە کۆتایی ساڵی 1916دا و لە گەرمەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بە روالەت بۆ قەرەبووکردنەوەی هەڵەکانی رابردوو و لە راستیدا بە مەبەستی دۆزینەوەی رێگەیەکی نوێ بۆ هەڵاتن، رادەگەیەنێ، کە خوازیاری خزمەتکردنە لە سوپادا. لە دیسێمبەری 1916دا لە ژێر چاوەدێریدا ستالین دەبەنە شاری "کراسنۆیارسك"، بەڵام لە پشکنینە پزشکییەکاندا بەهۆی حاڵەتی نیوە نقوستانی دەستی چەپی، لە خزمەتی سەربازییەکەی خوش دەبن.

ژاندارمەکانی تەزاری، ئیتر دەرفەتێکیان بۆ گەڕاندنەوەی ستالین بۆ تاراوگەکەی بە دەستەوە نامێنێ، چونکی شەپۆلی شۆڕش لە سەرەتاکانی ساڵی 1917ی روسیادا دەگراو لەگەڵ رووخانی رژێمی تەزاری لە نیوەی مارسی 1917دا بەندکراون و دوورخراوە سیاسییەکانی سەرانسەری روسیا ئازاد دەکرێن.

ستالین و کامینۆف و سۆردلۆف و مۆرانۆف یەکەمین دوورخراوەکانن، کە دەچنە نێو سەن پیترێز بۆرگەوە و بە مەبەستی رێکخستنەوەی بۆلشەڤیکەکان دەست دەکەنەوە بە چالاکی.

# 3

ئەو کاتەی ستالین گەڕایەوە پیترۆگراد، پراڤیدا دەستی بە بڵاو بوونەوە کردبۆوە و دوو لاو بەناوەکانی (مۆلۆتۆف و شلیاپنیکۆف) بەڕێوەبەری و سەرنووسەرییەکەیان وەئەستۆ گرتبوو.

ستالین و دوو سەرکردەی دیکەی، کە پاش ئەو گەڕابوونەوە پیترۆگراد، دژایەتیی شێوازی رەخنەگرانەی پراڤیدایان بە نیسبەت دەوڵەتی کاتییەوە کرد، کە پاش رووخانی رژێمی تەزاری دەسەڵاتی بە دەستەوە گرتبوو و ستالین بە یارمەتیی ئەو دووانە، (مۆلۆتۆف و شلیاپنیکۆف لە بەڕێوەبەرێتی و سەرنووسەریی پراڤیدا خست و لایبردن. لە یەکەمین ژمارەی پراڤیدادا، کە

ڕۆژی بیست و هەشتەمی مارس لە ژێر چاوەدێریی کامێنۆڤ و ستالین و مۆرانۆفدا دەرچوو، ڕۆژنامەکە شێوازێکی نەرم و نیانتری لە بەرامبەر دەوڵەتی کاتی و حیزبە سۆسیالیستەکانی دیکەدا گرتە پێش. دەستەی نوێی پراڤیدا، کە هێشتا نەیتوانیبوو پێوەندی بە لینینەوە بگرێ ، نەیانزانی، کە لینین شێوازێکی تەواو پێچەوانەی ئەوانی ڕەچاو کردووە و ئەو جووتە پتر لە هەمو کاتێك لێك نزیك ببوونەوە. لایەنێکی وەك یەکی دیکەی بیر و راکانی لینین و ترۆتسکی، کە زۆر گرینگ بوو دژایەتیی هەرکیان لەگەڵ درێژەی شەڕی روسیا و ئەڵمانیا بوو. لە حاڵێکدا ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازانی پێتروگراد لە ڕۆژی بیست و حەوتەمی مارسدا بە هاودەنگی بڕیاری دا درێژە بە شەڕی دژی ئیمپریالیزمی ئەڵمانیا بدات و ستالین لە ڕۆژنامەی ژمارەی ڕۆژی 28ی مارسی پراڤیدادا، بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو بڕیارە نووسیی:".... دروشمی "مەرگ و نەمان بۆ شەڕ"، کە ئەم ڕۆژانە بەرز کراوەتەوە، لە بنەڕەتەوە هەڵە و مەحاڵە.... ئێمە هەتا ئەو ڕۆژەی سوپای ئەڵمانیا مل بۆ دەستوور و بڕیارەکانی قەیسەر دادەنوێنێ و لە سەر داگیرکردنی خاك و نیشتیمانی ئێمە سوورە، بڕیاری ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازان سەبارەت بە درێژەدانی شەڕ، پشتڕاست دەکەینەوە.... گۆڕانی میتۆد و ستراتیژیی پراڤیدا لە بەرامبەر دەوڵەتی کاتی و حیزبە سۆسیالیستەکانی دیکەی روسیادا، بوشەڤیکەکانی زۆر هەژاند و هێندێ مۆرە و دەستوپێوەندی توندڕەو لە یەکە کرێکارییەکانی حیزبی بوشەڤیك ئەم گۆڕانە بە "سەرکەوتنی باڵی میانەڕەوی حیزبی بوشەڤیکی بەسەر باڵی هەرە توندڕەودا" لە قەڵەم دا.

ڕۆژی بیست و نۆی مارس، ستالین لە کۆنفرانسی حیزبی لە پیترۆگراد، لە ئاخافتنێکدا گوتی:" ئەگەرچی دەوڵەتی کاتی بە دڕدۆنگی و گومانەوە، بۆ دابینکردنی داخوازییەکانی کۆمەڵانی خەڵك هەنگاو دەنێ. ئەم ڕەوشە هەم لایەنی خراپی هەیە و هەم لایەنی باش. لە هەمانکاتدا پێویست نییە ئێمە گوشار بخەینە سەر دەوڵەتی کاتی، کە ویست و داخوازییەکانمان وەدی بێنێ. چونکی دەست و پێوەند و مۆرەی بۆرژۆوایی لەو دەوڵەتەدا هەن و ئاخری دەبێ جێگەی خۆیان بدەن بەهێزە ڕەسەنە شۆڕشگێڕەکان و پلانەکانی ئێمە لە کاتی خۆیدا جێبەجێ دەکرێن. لە هەلومەرجی ئێستادا ئێمە دەبێ پشتگیری لەو کارانەی دەوڵەتی کاتی بکەین، کە لە پێناوی شۆڕشدا دەیانکاو لە بەرامبەر کردەوەی سازشکارانە و دژە شۆڕشییەکانیدا ڕاوەستین... ستالین لەم ئاخەفتنەدا هەروەها پێی لە سەر پێویست بوونی یەکگرتوویی و هاودەنگیی هێزە شۆڕشگێڕەکانی دیکە داگرتەوە.

مۆلۆتۆف، کە لەلایەن ستالین و کامێنۆڤەوە لە سەر نووسەریی پراڤیـدا لابـردا بـوو، لـەم کۆبوونەوەیەدا بەرپەرچی ستالینی دایەوە، بەڵام ستالین بە رەتکردنەوەی بەڵگاندنـەکانی ئـەو، پێی لە سەر هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی خۆی لەگەڵ دەوڵەتی کاتی و هێزە چـەپیەکانی دیکـە، کە لە ئەنجوومەنی نوێنەرانی کرێکاران و سەربازاندا زۆرینە بـوون، داگرتـەوە. رۆژی یەکـەمی ئاپریل یەکەمین وتاری زنجیرە وتارەکانی "کۆمەڵێك نامە لە رێی دوورەوە"ی لیـنین گەیشـتەوە پیترۆگراد و ستالین بە دیتنی ئەو وتارە تێگەیشت، کە میتۆدی ئاشتیخوازانەی وی لە بەرامبەر دەوڵەتی کاتیدا بە تەواوەتی دژی رێبازی لینین بووە. لەو وتارەدا، کە لینین رێکەوتی بیستەمی مارسی 1917ی زوریخی لە سەر دا بوو بە توندی رەخنە لە دەوڵەتی کاتی گیراوە و شەڕ (کە ستالین لە وتار و ئاخافتنەکانیدا بە توندی پێی لە سەر درێژەدانی دادەگرتەوە) وەکو شـەڕێکی ئیمپریالیستی ئیدانە کرابوو.

ستالین هەتا چەند رۆژێك وتارەکەی لینینی بڵاو نەکردەوە بۆ ئەوەی بتوانێ بەبڵاوکردنەوەی وتارێك و لێدوانێك هەڵوێستی خۆی لە بەرامبەر دەوڵەتی کاتیدا، بگۆڕێ، بەڵام بـەکردەوە لـە بەرامبەر خەنیمەکانیدا بەتایبەتی ترۆتسکی، کە میتۆدێکی تەواو لە گوێن لینینـی گرتبـووە پێش، لاواز بوو. لینین لە یەکەم ئاخافتنی خۆیدا، کـە پـاش گەڕانـەوەی بـۆ روسـیا لـە رۆژی شازدەی ئاپریلی 1917دا، بەتوندی رەخنەی لە ژمارەیەك سەرکردەی گرت، کە لـە نـەبوونی ئەودا پشتیوانی و لایەنگرییان لە دەوڵەتی کاتی کردبوو. نووکی تیـژی ئـەو هێرشـە لـە سـەر ستالین و کامینۆف بوو، بەڵام لینین ناوی نەهێنان چونکی لـەو هەلەومەرجـەدا دەیویسـت بـۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی کەڵك لە تەواوی ئەو هێزانە وەرگرێ ، کە لە بەر دەستیدا بوون.

لە ماوەی شەش مانگ پاش گەڕانەوەی لینین بۆ روسیا، هەتا شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 ستالین وردە وردە توانیی دڵی لینین، کە بەهۆی ئەو میتۆدەی ستالین بـۆ لایـەنگریی دەوڵـەتی کاتی و درێژەدانی شەڕ گرتبوویە بەر، چاك بکاتەوە و بە پشتڕاستکردنەوەی بێ ئەملاو ئەولای بیر و راکانی لینین، سەرنج و متمانـەی ئـەو بـۆلای خـۆی راکێشـێ. لـە نیـوەی ئۆکتۆبـەری 1917دا، کە لینین لە بیری رێکخستنی شۆڕشێکی چەکداری بـوو بـۆ رووخانـدنی دەوڵـەتی کاتی، دوو کەس لە هاوڕێکانی ئەو واتە کامینۆف و زینۆوێڤ دژایەتیی ئەو بۆچوونەیان کـرد، بەڵام ستالین لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا بە توندی لای لینینی گرت. هـەر لـەو کۆبوونەوەیەدا، ترۆتسکیش، بیروبۆچوونی لینینی سەبارەت بە پەلەکردن لە شۆڕشیدا پشتڕاست کردەوە و هەربۆیەش بەرپرسیارەتیی رێکخستنی شۆڕشی چەکداری خرایە ئەستۆی ئـەوان، لـە

مێژووی فەرمیی روسیادا لە رێخکستنی شۆڕشی بۆلشەڤیکیدا رۆڵی زیاتر دراوەتـە سـتالین و رۆڵی ترۆرتسکی کەم و کـاڵ کراوەتـەوە و بـە هێنـد نـەگیراوە، لـە حاڵێکـدا ترۆرتسـکی لـە رێخکستنی ئەم شۆڕشەدا لە سەر ووی کۆمیتـەی سـەربازیی شۆڕشـگێڕییەوە زیـاترین دەور و رۆڵی گێڕاوە و پاش سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکیش، دامەزراندن و پێك هێنـانی لەشـکری سوور بەو ئەسپێردرابوو.

لە یەکەمین دەوڵەتی پاش سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکیشدا، کە لەژێر ناوی ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەلاندا پێك هات ترۆرتسکی پۆستی گرینگی کۆمیسێری کاروباری دەرەوە، یـان وەزیری کاروباری دەرەوەی پێدرا. لە حاڵێکـدا، کـە سـتالین پۆسـتی پلـە دووی کۆمسـیارییای کاروباری گەلانی وەئەستۆ گرت. کۆمیسێریی کاروباری گەلان رێکخراوێکی نوێ بوو، کە دایرە و شوێنێکی نەبوو و ستالین کاروباری خۆی لەم پلەیەدا بە خۆی و تایپیستێکەوە دەست پێکرد. ئەم تایپیستە کچۆڵەیەکی 17 ساڵە بوو بە ناوی "نادێژدا ئالیلوێڤا"، کـە سـتالین پـا چـەند مانگان، سەرەڕای ئەوەی کە 21 ساڵ لەو بە تەمەنتر بـوو، زەماوەنـدی لەگـەڵ کـرد. لیـنین یـەکێگ لـەو ئاپارتمانانـەی بـۆ تـەرخانکردن، کـە نزیکیـی دەروازەی کۆشـکی کرملینـەوە هەڵکەوتبوو و لە سەردەمی پادشایەتیی تەزارەکاندا، تایبەت بوو بە کارەکـەرەکانی کۆشـك و ستالین و هاوسەرەکەی هەتا کاتی لە دایکبوونی یەکـەمین منداڵەکـەیان واتـە ڤاسـیلی، لـەو بەشەی کۆشکدا مانەوە.

لە یەکەمین ساڵەکانی دامەزرانی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتییدا، ستالین بێجگە لە پۆستی کۆمیسێری کاروباری گەلان ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی بۆلشەڤیکی و لەنێو حکوومەتی ناوەندیشدا کاربەدەست بوو و لـەو رێگەیـەوە پێوەنـدیی بـەردەوامی لەگـەڵ لینیندا هەبوو.

ئەو لە جەنگەی شەڕە نێوخۆییەکانیشـدا گـەلێك بەرپرسـیارەتیی سـەربازیی گرینگیشـی وەئەستۆ گرتن، کە گرینگترینیان فەرماندەرێتیی هێزە سوورەکان بـوو بـۆ بـەرگری لـە شـاری تەزارتیسین (سـتالینگرادی دوایـی) لـە بەرامبـەر پاشماوەکـانی سـوپای تـەزاری و هێـزە دژە بۆلشەڤیکییەکاندا. لە جەنگەی ئەو شـەڕەدا بـوو، کـە سـتالین و ترۆتسـکی بەتونـدی لێـك هەڵبەزینەوە و قسەیان تێك گیرا. لەبەر ئەوەی کە ستالین ملی بۆ فەرمانەکانی ترۆتسکی، کە لەو کاتدا ببووە کۆمیسێری شەڕ، رانەدەکێشا، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئاخری توانیی تەزارتیسین رزگار بکا لە بەرامبەر ترۆتسکیدا پێگەکەی بەهێزتر بوو.

پاش گرتنی کۆنگرەی حیزبی بۆلشەڤیك لە مانگی مارسی 1917دا، کە بە حەوتەمین کۆنگرەی حیزب ناوی دەرکردووە، لینین کۆمەڵێك گۆرانی لە پێکهاتەی ڕێبەریی حیزبدا پێك هێناو جڵەوی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە نێوان دەفتەری سیاسی و دەفتەری ڕێکخستن و سکرتاریای حیزبدا. بەش کرا. ستالین وەکو ئەندامی پێوەندییەکانی دەفتەری سیاسی و دەفتەری ڕێکخستن لەگەڵ سکرتاریا دیاری کرا و ئەوە یەکەمین هەنگاوی ئەو بوو بۆ ئەوەی ڕێگەی بۆ بەرزترین ئاستی ڕێبەرایەتیی حیزب بکرێتەوە. لە ساڵی 1919دا لینین ڕێکخراوێکی چاوەدێر یا کۆمیسیۆنی پشکنینی لە حیزبدا پێك هێنا ستالینی کردە سەرۆکی. ئەو ڕێکخراوە، کە ئەرکی چاوەدێریی بەسەر ڕێکخراوە ئیدارییەکاندا، لە سەر شان بوو، دووەمین هەنگاوی ستالین بوو بۆ گەیشتن بە لووتکەی دەسەڵات.

سکرتاریای حیزب لە سەرەتادا سێ سکرتێری هەبوو، بەڵام بەهۆی دروست بوونی ناکۆکی و چەند بەرەکی لە نێو حیزبدا و مەترسیی لێکترازانی حیزب لینین هاتە سەر ئەوەی کە، کەسێك بکاتە سکرتێری گشتیی سکرتاریاو بەشی ڕێکخستن و بۆ ئەم پۆستەش، توند و تیژترین ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی واتە ستالینی دیاری کرد.دانانی ستالین وەك سکرتێری گشتی لە کۆنگرەی یازدەی حیزبدا، کە لە مانگەکانی مارس و ئاپریلی 1922دا لە مۆسکۆ پێك هاتبوو، پەسندکراو ستالین بە کردەوە حیزبی پاوان کرد.

لینین لەوەیکە ستالینی کردە سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی، دوو مەبەستی دەپێکا،

یەکەم ئەوەی کە دەیویست دەنگی نەیار و بەرهەڵستکاران و ئەو ڕەخنانەی لە شێوازی دەسەڵاتەکەی ئەو دەگیران، بە دەستی لینین، بخنکێنێ ودووەم ، دەیوست پێگەی ترۆتسکی، کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە نێو حیزب و دامودەزگاکانی حکوومەتدا بەهێزتر دەبوو، لاواز بکا. لەبەر ئەوەی کە لینین هەمیشە وەکو خەنیمێك و کەسێکی، کە دەتوانێ جێگەی بگرێتەوە لە ترۆتسکیی دەڕوانی و لە بەهێزبوونی تۆقیبوو. لە حاڵێکدا ستالین زۆر بە لاوە بۆ گرینگ نەبوو و قەت پێی وانەبوو، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر لەوە بکاتەوە جێگەکەی بگرێتەوە.

بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی لینین، ستالین هەر لەو ڕۆژەوە، کە بوو بە سکرتێری گشتی، خەیاڵی جێگرتنەوەی لینینی کەوتە سەر و بۆ گەیشتن بەو شوێنەش، گەڵاڵەیەکی ورد و لێکدراوەی داڕشتبوو. ئەو بە کەڵك وەرگرتن لە هەستی زێدەخوازانەی دوو ڕێبەرە خاوەن پێگەو دەسەڵاتەکەی دیکەی حیزب، واتە زینوویێف و کامێنۆڤ، کە زۆر لەوانیتر خۆیان بۆ جێگرتنەوەی

لینین بە شیاوتر دەزانی، ئەوانی خستە گەڵ خۆی و یەکێتییەکی سێ کوچکەی لە بەرامبەر ترۆتسکیدا پێك هێنا. بۆخارین تیۆرداڕێژی بەناوبانگی حیزبیش، کە لە ئاستی سەرەوەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیدا خاوەنی ڕێز و متمانە و دەستڕۆیشتوو بوو، لە خەباتی دژی ترۆتسکیدا کەوتە گەڵ یەکێتیی سێ کوچکەی ستالین ـ زینۆویێف و کامێنۆڤ، و ترۆتسکی لە کۆمیتەی ناوەندیی و دەفتەری سیاسیی حیزبدا کەوتە کەمینە. دیارە زینۆویێف و کامێنۆڤ و بوخارینیش وەکو لینین، کە پێیان وا نەبوو ستالین مەترسییەکە بۆ سەر خۆشیان، قەبووڵیان کردبوو کە بۆ لادانی خوازیاری سەرەکیی جێنشینی لینین واتە ترۆتسکی، هاوکاریی ستالین بکەن.

ڕۆژی بیست و پێنجەمی "مای" ساڵی 1922 واتە کەمتر لە دوو مانگ پاش هەڵبژێرانی ستالین بە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی، لینین بۆ یەکەم جار تووشی جەڵتەی دڵ هات و لە سەر پێشنیاری پزشیکان چووە پشوودان. چاوەدێری و دەست تێوەردانی لینین لە کاروباری حیزبی و دەوڵەتی لەوە و دوا کەم بۆوە و ستالین لە بەڕێوەبەریی وڵاتدا دەستی ئاوەڵاتر بۆوە. ستالین هەلی بە دەرفەت زانی و مۆرە و دەست و پێوەندی گوێ لە مست و وەفاداری خۆی لە سەر پۆستە هەستیارەکان و سەرۆکایەتیی حیزب دانا و تەنانەت هێندێ لە دۆستانی کامێنۆڤ و زینۆویێڤیشی بەدانی پۆستی فریودەری باڵوێزی، لە پلەی حیزبی و حکوومی نێوخۆ لابرد بۆ ئەوەی لە ململانێکانی داهاتوودا، بۆ گەیشتن بە پۆستی ڕێبەریی وڵات تاقانە بێ.

یەکێك لەو کەسانەی، کە بەو شێوەیە لە گۆڕەپان وەدەرنرا، راکۆڤسکیی سەرکردەی حیزب لە ئۆکراین و کرێستنیسکی یەکێك لە سێ سکرتێرەکەی پێشووی حیزب بوو، کە یەکەمینیان نێردرایە لەندەن و دووەم یان نێردرایە ئەڵمانیا.

دوایین کارێکی مەزن، کە لینین تێیدا بەشدار بوو، دەستنیشانکردنی فۆرمی حکوومەتی داهاتووی یەکێتیی سۆڤیەتیی واتە پێك هێنانی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە کۆمارە خودموختارەکان بوو. ئەم بڕیارە لەگەڵ پێشنارەکەی ستالین بۆ پێك هێنانی حکوومەتێکی یەکپارچەی سۆسیالیستی لە پێگەڕ*ی ئیمپراتۆریی تەزارەکاندا ناتەبایی هەبوو. لینین رای وابوو، کە پێکهاتەی حکوومەتی داهاتووی یەکێتیی سۆڤیەتیی بە جۆرێك بێت، کە لە داهاتوودا بکرێ وڵاتگەلێکی دیکەشی وەکو کۆماری نوێ پێوە بلکێندرێ. ڕۆژی 30ی دیسێمبەری 1922 یەکەمین کۆنگرەی ئەنجوومەنەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیی بۆ

---

* پێگەڕ: قەڵەمڕەو

پەسند کرانی ئەم بڕیارانە لە مۆسکۆ گیرا، بەڵام لینین بــەهۆی نەخۆشــییەوە نــەیتوانی تێیــدا بەشدار بێت و ستالین بۆ یەکەمین جار وەکو جێگری لینین لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوو.

هەر وەکی لە بەشی پێشوودا بە تێروتەسەلی باسی لێوەکراوە، لینین لە کۆتاییەکانی ســاڵی 1922دا، زۆر لە ستالین تووڕە بوو لەبەر ئەوەی کە کاروباری حیزبیی پاوان کردبوو و لەگــەڵ دەوروبەری و هاوڕێیانی خۆی بە توند و تیژی دەجووڵایەوە هەربۆیەش ڕۆژی بیست و پێنجەمی دیسێمبەری 1922 نامەیەکی بە سکرتێرەکەی خۆی نووسی، کە بە "وەســییەتنامەی لیــنین "نێوبانگی دەرکردووە. لەو نامە یاوەســییەتنامەیەدا لیــنین وێــڕای دەربڕینــی ناڕەزایــەتیی و پەرۆشیی خۆی لە میتۆدی ســتالین وەك ســکرتێری گشــتیی حیــزب، گومــانی خســتۆتە ســەر توانایی سەرکردەکانی دیکەی حیزبیش و وادەنوێنــێ، کــە هیچــیان بــە شــیاوی ئــەوە نازانــێ جێگەی ئەو بگرنەوە. لینین قامکی لە سەر هێندێ تایبەتمەندی و خەسڵەتی باشی هــەرکام لــە ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبیش داناوە و زیاتر لە هەمووان ( وەکو شــیاوترین ئەنــدامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب) تاریفی ترۆتسکی دەکا، بەڵام مەبەستی لەو وەســییەتنامەیە ئــەوە نییە، کە ترۆتسکی وەك جێگرەوەی خۆی دیــاری بکــا بــەڵکو گەرەکییــەتی ڕێبەرایەتییــەکی گرووپی بۆ دوای خۆی پێشنیار بکا.

ڕۆژی چوارەمی ژانویەی 1923 لینین یادداشتێکی دیکە لەو نامە یاوەسییەتنامەیە زیاتر دەکاو راشکاوانە پێشنیار دەکا، کە ستالین لە سکرتێری لابردرێ، بەڵام ئەم وەســییەتنامەیە و یادداشــتە لێ زیــاد کراوەکــەی لــە کــۆنگرەی دوازەیــەمی حیزبــی کۆمۆنیســتی یــەکێتیی سۆڤیەتییدا، کە لە مانگی ئاپریلی ساڵی 1923 گیرا، باسی لێنەکرا و ستالین بە پشتگیریی کامێنۆڤ و زینۆوێف دیسان بۆوە بە سکرتێری گشتیی حیــزب کــۆنگرەی دوازدەیــەم یەکــەمین کۆنگرەیەکی حیزب بوو، کە لینین نەیتوانی تێیدا بەشدار بێت و بــێگومــان ئەگــەر توانیبــای بەشدار باو قسەیەکی تێدا بکردایە، ســتالین لــە ســکرتێریی دەکــەوت و یــەکێتیی ســۆڤیەتی چارەنووسێکی دیکەی دەبوو.

پاش کۆنگرەی دوازدەیەم ستالین کەوتــە پتــەوکردنی کۆڵەکــەکانی دەســەڵاتەکەی و وێــڕای بێهێز و لاوازکردنی دەسەڵاتی خەنیمەکانی خــۆی، لــە رواڵەتــدا شــێوازێکی نــەرم و نیــانتر و تەنانەت، دۆستانەی لە بەرامبەریانــدا گرتەبــەر. ســتالین هێشــتاش ترۆتســکیی بــە خــەنیمی سەرەکیی خۆی دەزانی، بەڵام پاش ئەوەی کــە بــە یارمــەتیی زینــۆوێف و کــامێنۆڤ، پۆســتی گرینگی وەزارەتی شەڕی لێئەستاندەوە شێوازێکی دۆستانەتری بە نیسبەت ئەو گرتــە پــێش و تەنانەت چەند جارێکیش لە بەرامبەر زینۆوێڤدا لە دەفتەری سیاسیی حیــزب، پشــتیوانیی لــە

گەلاڵە ئابوورییەکانی ئەو کرد. چونکی دوای ترۆتسکی زینۆوێڤی بە رەقیبی خۆی دەزانی و لە بەهێزتر بوونی پێگەکەی ئەو تۆقیبوو.

لینین لە سەرەتای ساڵی 1923 نەوە لە ئاپارتمانەکەی خۆیدا لە کۆشکی کریملیندا، بەجاو بان کەوتبوو و هیچ زانیارییەك لە سەر چۆنێتی پێوەندی و چاوپێکەوتنەکانی ئەو لەگەڵ ستالین لەو ماوەیەدا، لە دەست دانییە. ئەوەی روون و ئاشکرایە ئەوەیە، کە ستالین دەیزانی لینین لێی بە گومانە و بۆ ئەوەی کە لینین نەتوانێ کەسانیتر لەگەڵ خۆی هاوڕا بکا بە بیانووی راسپاردە و پێشنیاری پزیشکان چاوپێکەوتن و سەردانی لینینی تەواو بەرتەسك کردبۆوە. کرۆپسکایای خێزانی لینین لە سەر ئەو ئاستەنگییانە، ناڕەزایەتیی دەربڕی و ستالین وای بەگژ داهات، کە خێزانی لینین بە گریانەوە گەڕایەوە لای مێردەکەی و لەو سووکایەتییەی پێی کراوە کەوتە گازندە و سکالایە. لینین رۆژی پێنجەمی 1923 یادداشتێکی توندی بۆ ستالین ناردو تێیدا نووسی، کە سووکایەتیکردن بە خێزانەکەی سووکایەتیکردن بەخۆی دەزانی و لەوە و دوا هەر چەشنە پێوەندییەك لەگەڵ ستالیندا دەپسێنێ. ستالین ئەو یادداشتەی بە هێند وەرنەگرت و پاش سێیەمین جەڵتەی لینین لە کۆتایی مارسدا، کاروباری گەڕاندنەوەی ئەویان لە مۆسکۆوە بۆ شارۆچکەی گۆرکی رێکخست. لینین لە مانگی مای 1923دا، بۆ دواین جار بردرایە گۆرکی و ئەمجارەیان ستالین وەها شوورەیەکی بەدەورەیدا هەڵ چنی، کە هەتا کۆتایی ژیانی لە ژانویەی 1924دا هیچ کام لە رێبەرانی حیزبی و هاوڕێ نزیکەکانی نەیانتوانی ببینن. لینین لە سەر جێگەوبان وتارێکی لە سێ بەشدا لە سەر مەسەلەی نەتەوەکان لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا نووسی و لە رێگەی سکرتێرەکەیەوە واتە "فۆتیوا" ناردی بۆ ترۆتسکی و کامێنۆوێف، بەلام بەهۆی ئەوەی کە بەتوندی ستالین لە سەر شێوازی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەسەلەی نەتەوەکان و بەتایبەتی کردەوەی توند و تیژانەی ئەو لە گورجستاندا بووە بەر رەخنە، نەیهێشت بلاو بێتەوە و پاش ئەوەی کە ترۆتسکی لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیدا ئەو بابەتەی هێنایە بەرباس، (ستالین) گوتی، کە ئەم وتارە بەپێی زانیاریی هەڵەو بێبنەما نووسراوە و هاوڕێ لینین نەپەرژاوە پێیدا بچێتەوە و راستی بکاتەوە.

لینین رۆژی 24ی ژانویەی 1924 مرد و بەر لە گیان دەرچوونەکەی داوای لە خێزانی کرد، کە تەواوی نامە و یادداشتەکانی سەردەمی نەخۆشیی ئەو بداتە دەفتەری سیاسیی حیزب. هاوسەری لینین تەواوی ئەو نامە و یادداشتانەیدا بە کامێنۆڤ، کە ئەوکات سەرۆکی دەفتەری حیزب بوو و لە یادداشتێکدا، کە خستییە گەڵ نامەکان نووسیی، کە لینین وەسییەتی

کردووه ئەو نامە و یادداشتانە لە کۆنگرەی داهاتووی حیزبدا بخرێتە روو. رۆژی هەژدەهەمی مای 1924 واتە چوار رۆژ پێش گیرانی کۆنگرەی سێزدەی حیزب، هاوسەرەکەی لینین وەسییەتنامە و یادداشتەکانی لینینی دا بە کامێنۆڤ و کامێنۆڤیش دای بە دەفتەری سیاسی.
بۆریس باژانۆفی بەرپرسی سکرتاریای دەفتەری سیاسی و هاوکاری ستالین لە بیرەوەرییەکانیدا سەبارەت بەو کات دەنووسێ، کاتێك ستالین تێگەیشت لەوەیکە وەسییەتنامە و یادداشتەکانی لینین چیان تێدایە، زۆر قەڵس بوو و "زۆری جنێوی ناشیرن بە خاتوو کرۆپسکایای خێزانی لینیندا". ئەو رقی ئەوەشی لە کامێنۆڤ هەڵگرت، کە لە بڕی دیزەبەدەرخۆنەکردن و شاردنەوەی وەسییەتنامە و یادداشتەکانی لینین، داونێتە دەست دەفتەری سیاسیی حیزب، بەڵام خۆی خواردەوە و کەوتە بیری رێگەچارە. ستالین و زینۆوێڤ و کامێنۆڤ لە دانیشتنێکی دوورو درێژدا، کە هەتا بەرەبەیانیی رۆژی نۆزدەی مانگی مای خایاند، بڕیاریان دا، لە بڕی ئەوەی لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەدا دەقی یادداشت و وەسییەتنامەکەی لینین بخەنە بەرباس لە کۆبوونەوە گشتی‌یەکانی ناوەندیی حیزبدا بیهێننە گۆڕاو بڕیاری لە سەر بدەن. لایەنگرانی ستالین و زینۆوێڤ و کامێنۆڤ لە کۆمیتەی ناوەندیدا زۆرینە بوون و دڵنیا بوون لەوەیکە بە زۆرینەی دەنگی کۆمیتەی ناوەندی دەتوانن نەهێڵن وەسییەتنامەکەی لینین لە کۆنگرەدا بخرێنە بەرباس.
کۆبوونەوەی گشتی یا پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی رۆژی 21ی دیسێمبەری ساڵی 1924 واتە تەنیا رۆژێك بەر لە کرانەوەی کۆنگرەی سێزدەیەمی حیزب بە سەرۆکایەتیی کامێنۆڤ گیرا. زینۆوێڤ ئەرکی قورسی خستنە بەرباسی وەسییەتنامە و یادداشتەکانی لینینی وەئەستۆ گرت و لە ئاخافتنێکی چەواشەکارانەدا گوتی، کە لینین بەهۆی نەخۆشین و هێندێ بە هەڵە تێگەیشتن پەرۆش و نیگەران بووە، کە پێچەوانەکەی سەلمێندراوە و کار و چالاکیی هاوبەشی ئێمە لەو ماوەیەدا دەری دەخا، کە هیچ مەترسییەکی لێکترازان و کەلێن تێکەوتن لە حیزبدا لە گۆڕێ نییە. کامێنۆڤیش بۆچوونەکەی زینۆوێڤی پشتڕاست کردەوە و گوتی، کە باش نییە، کە وەسییەتنامەکە لە کۆنگرەدا بێتە گۆڕێ. پێشنیارەکەی کامێنۆڤ بە زۆرینەی دەنگ پەسند کراو بە شوێن ئەودا هەروەها پێشنیاری پاڵاوتنی ستالین بۆ سکرتێری گشتیی حیزب (سەرەڕای پێشنیاری راشکاوانەی لینین بە لە سەر کار لابردنی ئەو) پەسند کرا.

# بەشی پێنجەم

## حکوومەتی ترس‌وەبەرنان و ڕەشەکوژی

دەکرێ حکوومەتی سی ساڵەی ستالین بەسەر یەکێتیی سۆڤیەتیدا بکەینە سێ قۆناغ:

قۆناغی یەکەم، کە بە ڕێبەرایەتیی گرووپی یا حکوومەتی سێ کەسی (ترویکا) دەستی پێکرد، تەنیا چوار ساڵی خایاند و بە، لە سەر کار لابردن و دوور خستنەوەی خەنیمی سەرەکی واتە ترۆتسکی و هاوڕێیانی پێشوو واتە زینۆویێف و کامێنۆڤ کۆتایی پێهات. قۆناغی سێیەم، کە لە ساڵی 1928ـەوە دەست پێدەکاو هەتا ساڵی 1939 دەخایەنێ قۆناغی تیرۆر و پاکسازیی خوێناوی و سەقامگیرکردنی دەسەڵاتی ستالینە و بە کورتی قۆناغی سێیەم، کە بە شەڕی جیهانیی دووەم دەست پێدەکات و بە مەرگی ستالین لە ساڵی 1953دا کۆتایی پێ دێ لووتکەی دەسەڵاتی ستالین و هەراوکردنەوەی کەوشەنی ئیمپراتۆریا هەتا ناخی ئەورووپا لە خۆ دەگرێ.

حکوومەتی ستالین لە روسیا لە راستیدا لە سەردەمی زیندوویی لینینەوە و لە ساڵێك بەر لە مەرگی لینینەوە دەست پێدەکا. لە ساڵی 1923ـەوە لینین بە کردەوە هیچ رۆڵێکی لە بەڕێوەبەریی وڵاتدا نەبووە و ستالین وەك سکرتێری گشتی و بە هاوکاریی دوو سەرکردەی خاوەن دەسەڵاتی دیکەی حیزب واتە زینۆویێف و کامێنۆڤ کارەکانی پاوان کردبوو. پاش مەرگی لینین لە ژانوییەی 1924دا و مەسەلەی وەسییەتنامەکەی ئەو، کە بەر لە گیرانی کۆنگرەی سێزدەی حیزب ئاشکرا بوو ستالین پێویستییەکی لەرادەبەدەری بە پشتیوانیی زینۆویێف و کامێنۆڤ هەبوو و دەسەڵاتی ڕێبەریی لەگەڵ دابەش کردبوون، بەڵام کاتی گیرانی کونگرەی چواردەی حیزب لە دیسێمبەری 1925دا ستالین، کە کۆڵەکەکانی دەسەڵاتی خۆی پتەو کردبوون و پێویستیی بە پشتیوانیی هاوڕێیانی پێشووی خۆی نەمابوو ڕێگەی خۆی لێ جوێکردنەوە و ئیتر ئامادە نەبوو لە سەر مەسەلە گرینگە حکوومەتی و حیزبییەکان راوێژیان پێ بکات. لە کۆنگرەی چواردەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیدا، کە لە رۆژی 18ی دیسێمبەری ساڵی 1925ـەوە هەتا ژانوییەی ساڵی 1926ی خایاند ستالین بۆ یەکەمین جار وەك سکرتێری گشتی و نوێنەری کۆمیتەی ناوەندیی حیزب راپۆرتی چالاکی

و کاروباریساڵی پێشووی و بەرنامەکانی داهاتووی پێشکەش کرد و ئاخافتنەکەی، کە زیاتر لە پێنج کاتژمێری خایاند بەردەوام بە چەپڵەی زۆرینەی نوێنەرانی کۆنگرە، کە بە فیتی دەست وپێوەندەکانی خۆی هەڵبژێردرابوون دەپچڕا. زینۆویێڤ و کامێنۆڤ لەو کۆنگرەیەدا (هاوڕێیانی پێشووی ستالین لە دژی ترۆتسکی)، کە لە ئامادەکردنی راپۆرت و نووسینی بەرنامەکانی داهاتووی حیزبدا پرس وڕایان پێنەکرابوو لە تەنیشت ترۆتسکییەوە کەوتنە رەخنە گرتن لە ستالین و بە پشتبەستن بە پێگەی رابردووی خۆیان پێیان وابوو، کە دەتوانن پێگەی ستالین لەرزۆك بکەن، بەڵام خەیاڵیان خاو بوو چونکی زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی نوێی حیزب لە نێو هاوڕێیانی ستالین هەڵبژێردراون و ستالین بە زۆرینەی دەنگی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی تازە لە سکرتێریی گشتیی حیزبدا مایەوە. ستالین ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبیشی، کە بەرزترین ئۆرگانی بڕیاردەری حیزب بوو لە شەش کەسەوە کردە نۆ کەس و کەسانی گوێ لەمست و متمانە پێکراوی خۆی بۆ وێنە ڤێرۆشیلۆف و مۆلۆتۆف و کالینینی بۆ دەفتەری سیاسیی حیزب هەڵبژارد. لە حاڵێکدا کامێنۆڤی سەرۆکی پێشوی دەفتەری سیاسیی حیزب بە هۆی رەخنەگرتن لە ستالین لە کۆنگرەی چواردەی ئەو رێکخراوەدا ئیتر رێگەی پێنەدرا بچێتەوە دەفتەری سیاسیی حیزب و لە ماوەی ساڵی 1926دا پۆستە حیزبی و دەوڵەتییەکانی دیکەشی لێ ئەستێندرایەوە.

ستالین لە ململانێی گەڵ خەنیمەکانیدا شێوازێکی پڕ فرت وفێڵی هەبوو. ئەو پێش تەواوی رێکخراوە حیزبی و دەوڵەتییەکانی دیکە دەزگای ئاسایشی یەکێتیی سۆڤیەتیی (چێکا)ی خستەبەر دەستی خۆی و دێرژێنیسکیی سەرۆکی ئەو رێکخراوەی رەگەڵ خۆی خست. ستالین لە رێگەی چێکاوە لە نهێنییەکانی ژیان و خاڵە لاوازەکانی ئەو کەسانەی، کە لە پۆستەکانی سەرووی حیزبی و دەوڵەتیدا بوون ئاگادار دەکرایەوە و لەو خاڵە لاوازانە بۆ سەرکزکردن و پێمل کردنیان لە بەرامبەر خۆیدا کەڵکی وەردەگرت. ئەو لە کۆشکی کرێملیندا تۆڕێکی سیخوڕیی تایبەتیشی دامەزراندبوو و خۆی دیالۆگی بەرپرسە بالاکانی حیزبی و دەوڵەتیی کۆنترۆل دەرکرد. باژانۆڤی سەرۆکی سکرتاریای دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە سەرەتای حکوومەتی ستالیندا لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ:، کە خۆی چاوی لە گوێ هەڵخستنەکانی ستالین لە دیالۆگەکانی نێو کرێملین بووە و دەڵێ، کە ئەندازیارێکی کۆمۆنیستیی چیکی وێڕای دامەزراندنی دەزگاکانی گوێهەڵخستن لە دیوی

ستالیندا پاش ئەوەی کە دەزگاکانی دامەزراندن و تاقیکردنەوە، بە دەستی راسپێردراوانی چێکا گیراو تیرەباران کرا.

یەکێك لە شێوازە باوەکانی ستالین لە تەواوی ماوەی دەسەڵاتدارییەتییەکەیدا ئەوە بوو، کە ناکۆکی و ململانێی دەخستە نێوان کاربەدەستە جیاجیاکانی حکوومەتی و حیزبی و سەربازییەوە و بەو شێوەیە دەیتوانی هەر تاقمێك بەسەر ئەوی دیکەدا بکاتە سیخوڕ. ستالین لە یەکەمین قۆناغەکانی ململانێدا کەڵکی لە ناکۆکی و دوژمنایەتیی نێوان زینۆوێڤ و کامێنۆڤ لەگەڵ ترۆتسکی وەرگرت و بە یارمەتیی ئەو جووتە ترۆتسکیی لە مەیدان وەدەرنا. دوای ترۆتسکی نۆرە گەیشتە زینۆوێڤ و کامێنۆڤ و ئەمجارەیان ستالین یارمەتیی لە بۆخارین وەرگرت، کە لە نێو رێبەرانی کۆنی حیزبدا پێگەی تایبەتیی خۆی هەبوو و کاتێك، کە خەنیمە سەرەکییەکان لە گۆڕەپان وەدەرنران بۆخارین خۆی وەك لادەر بۆ لای راست و بڵاوکەرەوەی بۆچوونەکانی بۆرژۆوازی کەوتە بەر رەخنە و لە دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی ناوەندیی حیزب دەریان پەڕاند.

ستالین تۆسقاڵێکی بەزەیی بە خەنیمەکانی خۆیدا نەدەهاتەوە و لە بەرامبەر ئەو کەسانەدا، کە پێی وابوو زیانیان بۆ پەز هەیە بەهیچ شێوەیەك پێوەندیی دۆستایەتی یا رابردوویانی بەلاوە گرینگ نەبوو. باژانۆف سەرۆکی سکرتاریای دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتی لە سەرەتاکانی حکوومەتی ستالیندا لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ، کە هیچ کەس هێندەی زینۆوێڤ لە بە دەسەڵاتگەیاندنی ستالیندا کاریگەریی نەبوو، بەڵام کاتێك بڕیاری دا لە سەر کاری لابەرێ ( و چەند ساڵ دواتر فەرمانی ئیعدامی بۆ دەرکرد) رابردووی بە تەواوەتی لەبیر کرد. باژانۆف، کە خۆی لە کاتی وتووێژی ستالین و زینۆوێڤدا لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانی حیزبدا بەشدار بووە دەنووسێ: کاتێك زینۆوێڤ خزمەتەکانی خۆی وەبیر ستالین هێنایەوە و پرسیی "ئاخۆ هاوڕێ ستالین لە مانای وەفا و ئەمەگداری تێدەگا؟" ستالین بە راوێژێکی ناخۆش وەڵامی دایەوە "بەڵێ باش تێدەگەم ... ئەوە جۆرێك نەخۆشییە، کە زیاتر سەگەل تووشی دەبن."

پاش مەرگی ستالین لە ژانوییەی 1924دا پۆستی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی کۆمیساریای گەلان یا سەرۆکایەتیی وەزیرانی یەکێتیی سۆڤیەتیی درا بە نیکۆلای ریکۆف، کە کۆمیسێری کاروباری نێوخۆیی یاوەزارەتی نێوخۆی بەدەست بوو و ستالین لە ساڵەکانی سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی خۆیدا هیچ هەوڵێکی بۆ بەدەستهێنانی ئەو پۆستە نەدا. چونکی وای

پیٚ باشتر بوو، کە وەك سکرتێری گشتیی حیزب بەسەر سەرۆکی کۆمیسارییای گەلدا فەرمانرەوایی بکا. ریکۆف لەو کەسانە بوو، کە هەر لە سەرەتاوە بەڵێی بۆ ستالین گوت و بۆ دەستخۆشانەی خۆش خزمەتییەکانی گەیشتە پلەی ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیی حیزب یان بەرزترین ئۆرگانی بڕیاردەر لە حیزبدا. لەگەڵ ئەوەشدا ستالین وەفای بۆ ئەو خزمەتکارە گوێ لەمستەی خۆیشی نەبوو و لە ساڵی 1930دا لە سەر کاری لابرد و تیرەبارانی کرد.

## 2

لە ساڵەکانی 1927 هەتا 1930دا، کە بە سەرەتای دەورەی دەسەڵاتدارێتیی ستالین زانراوە و هیچ کام لە دۆستان و لایەنگرانی لینین لە پۆستە باڵاکانی حیزبی کۆمۆنیست و دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتییدا نەمابوون: ترۆتسکی لە حیزب وەدەرنراو سەرەتا بۆ "ئەلما _ئاتا" پایتەختی کۆماری قەزاقستان و دواتر بۆ دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی دوور خرایەوە. زینۆوێڤ کامێنۆڤ لە ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیی حیزب وەلانران و پۆستەی پلە دوویان پێدرا. بۆخارین لە ساڵی 1929دا سەرۆکایەتیی نێودەوڵەتیی کۆمۆنیستی(کۆمینترێن) ی لیٚ ئەستێندرایەوە و لە ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیی حیزب وەلانرا و ریکۆف لە ساڵی 1930دا پۆستی سەرۆکی وەزیران یان سەرۆکایەتی کۆمیسارییای گەلی لە دەست دا.

لە کۆنگرەی پازدەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییدا، کە مانگی دیسێمبەری 1927 گیرا ستالین حەوت سەعاتی قسە کرد و تێیدا پێشنیاری کرد، کە بزووتنەوەی کۆمەڵگای یەکێتیی سۆڤیەتیی بەرەو کۆمۆنیزم بە تەوژمتر و خێراتر بێت، سیاسەتی پیشەییکردنی وڵات خێراتر بچێتە پێش و بۆ هاوبەشکردنی کشتوکاڵ پلان و بەرنامەداڕێژرێ. پێشنیارەکانی ستالین بە پاشگەزبوونەوە لەو پوانانە بوون، کە ساڵی 1921 بە پێی پلانی نوێی ئابووریی لینین بە خەڵك درابوون و بە پێی ئەو پوانانە رێگا بۆ خەڵك خۆش کرابوو، کە لە بازنەیەکی بەرتەسکدا کاروچالاکی و بازرگانی و چالاکیی بەرهەمهێنانیان هەباو بەشێکی تایبەتیی بچووك لە شارەکاندا پێکهاتبوو. بە پێی ئەو سیاسەتە چەندین ملیۆن وەرزێر ببوونە خاوەنی زەوی و زار و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی خۆیان بە دەوڵەت یا لە بازارە ئازادەکاندا دەفرۆشتەوە. ستالین گوتی ئەو پوانانە لە هەلومەرجی

قەیراناوی و بۆ ماوەی کاتی دراون بە خەڵك و ئێستا، کە لەمپەرەکانی بەردەم سەقامگیریی سۆسیالیزم لە ناو چوونە، دەبێ پێیاندا بچینەوە.

ستالین بەشێك لە ئاخافتنە دوورودرێژەکەی بۆ هێرشکردنە سەر نەیار و بەرهەڵستکارەکانی تەرخان کرد و ئەوانی بە دوژمنایەتی لە گەڵ لینینیزم و دۆستایەتی لەگەڵ ئیمپریالیزم تاوانبار کرد. نوێنەرانی کۆنگرەش لە پشتڕاستکردنەوەی قسەکانی ئەودا هەرکام وەپێش ئەویتر دەکەوتن و هەبۆیەش هەر وەکی ستالین چاوەڕوانیی دەکرد نەك هیچکام لەوانەی، کە وێدەچوو دژی سیاسەتە پێشنیارییەکانی ستالین بن بۆ کۆمیتەی ناوەنی دەنگیان پێنەدرا بەڵکو لە بڕیارنامەیەکدا دەرکردنی حەفتاوپێنج کەس لەوان پەسند کرا. لە نێو ئەوانەیدا، کە لە حیزب وەدەرنران بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بە ناوی: ترۆتسکی، زینۆوێڤ، کامێنۆڤ، رادك، پیاتاکۆف و ئەسمیرۆف بکەین. تەواوی وەدەرنراوان پاش تەواو بوونی کۆنگرەی پازدە قۆڵبەست کران و دوور خرانەوە، بەڵام هەلومەرجەکانی تاراوگە گەلێك لە سەردەمی تەزاری دژوارتر بوو و دوورخراوەکانیان لە تاراوگەکانیاندا بەند دەکرد و ناچاریان دەکردن کاری تاقەت پرووکێن بکەن. لە حاڵێکدا لە سەردەمی تەزاریدا دوورخراوەکان لە تاراوگەکانیاندا ئازاد بوون و لینین و ستالین و سەرکردەکانی تری بۆلشەڤیکی بە کەڵك وەرگرتن لەو هەلومەرجانە بوو، کە توانیان لە کاتی دوورخراوەییشدا درێژە بە چالاکی و کاروباری سیاسیی خۆیان بدن و خۆی ستالین پێنج جاران لە تاراوگە هەڵات.

ستالین لە وەلاّنانی خەنیمەکانی خۆیدا لە کۆمینترێن(کۆمۆنیستی نێودەوڵەتی) تووشی گەلێك گرفتی تازە بوو. چونکە هێندێك لە نوێنەرانی حیزبە کۆمۆنیستەکان روونکردنەوەی قایلکەریان لە سەر هۆکارەکانی لە سەر کار لابردن و وەلانانی کاربەدەستە بالاّکانی پێشووی کۆمینترێن لە رێکخراوە دەویست. یەکێك لە رێبەرانی کۆمۆنیستی ئیتالیا "ئیگنازیۆسیلۆنێ"، کە ساڵی 1927 لەگەڵ پالمیرۆ تۆلیاتی رێبەری بە ناوبانگی کۆمۆنیستی ئیتالیا لە کۆبوونەوەی نائاسایی دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمینترێندا بەشدار ببوو لە مەڕ ئەو کۆبوونەیەوە، کە بە مەبەستی وەلانانی ترۆتسکی و زینۆوێڤ لە کۆمینترێن پێکهاتبوو دەنووسێ:

لە مانگی ساڵی 1927 لەگەڵ تۆلیاتی لە کۆبوونەوەی نائاسایی دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمۆنیستی نێودەوڵەتیدا بەشدار بووم. لەو کاتدا من رێبەرایەتیی رێکخستنی نهێنیی حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیام لە ئەستۆ بوو و تۆلیاتی سەرۆکی سکرتاریای حیزب بوو لە پاریس. ئێمە

به پێی بەڵێنی پێشوو لە بەرلین یەکترمان بینی و پێکەوە چووینە مۆسکۆ. هۆکاری پێکهاتنی ئەو کۆبوونەوە نائاساییە بە رواڵەت" مەترسیی قەومانی شەڕێکی ئیمپریالیستی" و رەچاوکردنی رێوشوێنی پێویست بوو بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەو شەڕەدا، بەڵام لە راستیدا ستالین دەیویست دەراو بۆ وەلانانی ترۆتسکی و زینۆوێڤ، کە هەردووکیان ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمینترێن بوون خۆش بکا. بەر لە کۆبوونەوەی گشتیی دەستەی بەڕێوەبەری، سەرۆکایەتی شاندە گرینگەکان بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەیەکی داخراودا بانگ کران بۆ ئەوەی رێوشوێنی کۆبوونەوەکە بە بەشداریی ئەوان بخرێتە بەرباس و پەسند بکرێ پێش بە دژکردەوەی نادڵخوازی ئەو شاندو گرووپانە بگیردرێ, وەك باوە تەنیا سەرۆکی شاندەکان لەو جۆرە کۆبوونەوانەدا بەشدار دەبوون لە لایەن شاندی نوێنەرایەتیی ئیتالیاشەوە دەبوایە تۆلیاتی، کە سکرتێریی یەکەمی حیزب بوو بەتەنیایی بچێتە ئەو کۆبوونەوەیە، بەڵام ئەو پێداگربوو لە سەر ئەوەی کە منیش بە پێی بەرپرسیارەتییەکی، کە لە رێبەرایەتیی رێکخستنی نهێنیی حیزب لە ئیتالیادا هەمە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بم.

برێك درەنگ گەیشتینە یەکەمین کۆبوونەوە و تالمان رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا، کە سەرۆکایەتیی کۆبوونەوەکەی لە ئەستۆ بوو لەگەڵ وەژور کەوتنی ئێمە دەستی کرد بە خوێندنەوەی دەقی ئەو بڕیارنامەیەی، کە پێشنیار کرابوو لە کۆبوونەوەی گشتیی دەستەی بەڕێوەبەریدا بخرێتە روو.

ئەو بڕیارنامەیە بە راوێژێکی زۆر توند راگەیەندراوەکەی ترۆتسکیی بۆ دەفتەری سیاسیی حیزب مەحکووم دەکرد و بە گشتی هێرشی دەکردە سەری و رەخنە توندی لە شێوازەکانی ئەو دەگرت. دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی یەکێتیی سۆڤیەتیی لەو کۆبوونەوە داخراوەدا حاڵەتێکی ناوازەی هەبوو، و ستالین خۆی لەگەڵ بۆخارین و ریکۆف و مانۆیلسکی بەشداری کۆبوونەوەکە بوون. پاش خوێندنەوەی بڕیارنامەکە تالمان لێی پرسین ئاخۆ هەمووان لەگەڵ ئەو بڕیارنامەیە هەن؟ "ئۆتومارکۆسین" نوێنەری فەنلاند ئیزنی وەرگرت قسان بکاو گوتی، کە راوێژی بڕیارنامەکە بە گوێرەی پێویست توند و روون نییە و گوتیشی:" دەبێ بە روونی رابگەیەنین، کە راگەیەندراوی ترۆتسکی وەك دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی جەوهەر و هەوێنێکی دژە شۆڕشی هەیە و هۆکارێکی بەڵگە نە ویستە بۆ ئەوەی کە یەکێك، کە وەها شتێکی نووسیوە ناتوانێ بچووکترین پێوەندیی بە چینی کرێکارەوە هەبێ." لەبەر ئەوەی کە کەسی تر ئیزنی قسەکردنی نەبوو من راوێژم لەگەڵ تۆلیاتی کرد و ئیزنم وەرگرت، کە

قسان بکەم و وێڕای داوای لێبوردن لەوەیکە درەنگ گەیشتووینی و دەقی ڕاگەیەندراوەکەی ترۆتسکیم نەدیتووە داوام کرد، کە نووسخەیەکی ئەو ڕاگەیەندراوەمان بدەنێ. تالمان زۆر بە سادەییەوە گوتی:" ئەگەر ڕاستیتان دەوێ ئێمە خۆیشمان ئەو ڕاگەیەندراوەمان نەدیتووە."

من باوەڕم بە قسەکەی تالمان نەکرد. پێموابوو خراپ تێگەیوم، هەر بۆیەش بە جۆرێکی دیکە مەسەلەکەم هینایە بەر باس و گوتم:" لەوانەیە بەراستی پێویست بێ، کە ئێمە ئەو ڕاگەیەندراوە مەحکووم بکەین، بەڵام چۆن دەکرێ بە بێ خوێندنەوەی وەها شتێك و بە بێ ئەوەی بزای چی نووسیوە مەحکوومی بکەی؟"

تالمان دیسان گوتی:" لەو ئەندامانەی لەو کۆبوونەوەیەدا دانیشتوون هیچکامیان ئەو ڕاگەیەندراوەیان نەدیتووە و تەنیا دەستەی نوێنەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە نێوەڕۆکەکەی ئاگادارە." تالمان بە ئەڵمانی قسەی دەکردن و دیلماجێك وەری-دەگێڕایە سەر زمانی فەڕەنسی و یەکی تر دەیکردەوە ڕوسی. ئەو شتانە، کە من لە فەڕەنسییەکەی تێی گەیشتم ئەوەندە بە لامەوە سەرسووڕهێنەر و دوور لە باوەڕ بوون، کە داوم لە وەرگێڕەکە کرد، کە وشەبە وشە دیسان بۆم تەرجەمە بکاتەوە. شێوەی پرسیارەکەی من بە تەواوی سەرسووڕماوی دوورەباوەڕبوونی منی دەردەخست، بەڵام بەر لەوەی شتێکی دیکە بڵێم ستالین ئاماژەیەکی بە سەرۆکی کۆبوونەوەکە کرد و لە جێی خۆی هەستاو بە لە سەر ەخۆییەوە دەستی بە قسە کرد.

ستالین گوتی "دەفتەری سیاسیی حیزب بە باشی نەزانی ڕاگەیەندراوەکەی ترۆتسکی وەرگێڕێتە سەر زمانی دیکە و بڵاوی بکاتەوە لەبەر ئەوەی کە لەو بەڵگەیەدا هێندێ ئاماژەی بە سیاسەتەکانی ڕوسیا تێدایە، کە دەچنە خانەی نهێنییە دەوڵەتییەکانەوە"(ئەسڵی ئەو ڕاگەیەندراوە دواتر لە ژێرناوی "پرسەکانی شۆڕشی چین"دا لەلایەن خودی ترۆتسکییەوە بڵاو بۆوە ڕاگەیەنداوەکە هێرشی کردۆتە سەر سیاسەتی ستالین بە نیسبەت چین و ئاخافتنەکەی ستالینی لە ڕێکەوتی پازدەی ئاپریلی 1927دا، کە تێیدا بەسەر چیانکایچك و حیزبی کۆمین تانکی هەڵگوتبوو بە سیاسەتێکی بەرتەسکی ناوبردبوو. لە ڕاستیدا حەوتووەك پاش ئەو ئاخافتنە چیانکاچیك کۆمۆنیستەکانی لە حکوومەت وەدەرنان و لە شانگهای و ڤۆهان بە دەیان هەزار کۆمۆنیست قەڵتوبڕ کران. بەو شێوەیە دەردەکەوێ، کە هیچ نهێنییەکی دەوڵەتی لە گۆڕێ نەبووە و ستالین ویستوویەتی بە خۆبواردن لە بڵاوکردنەوەی ڕاگەیەندراوەکەی ترۆتسکی سیاسەتە چەوتەکانی خۆی

دیزەبەدەرخۆنە بکا. پاش روونکردنەوە کورتەکەی ستالین ئێرنێست تالمان لە منی پرسی، کە ئاخۆ رونکردنەوەکەی هاورێ ستالین منی قایل کردووە؟ من لە وەڵامدا گوتم:"دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیست مافی ئەوەی هەیە، کە خۆ لە بڵاوکردنەوەی بەڵگەیەك ببوێرێ، بەڵام ئەگەر ئێمە ئەوەندە جێی باوەڕ نیین، کە بزانین ئەو بەڵگەیە چی تێدایە بۆچی داوامان لێ دەکەن شتێك مەحکوم بکەین، کە نازانین چییە؟" ئەو قسەیەی من، کە پێموانییە هیچ کەسێکی بە ئینساف لاریی لێ بکا شەپۆلێکی تووڕیی و بێزاریی لە دژی من و تۆلیاتی(، کە بە بێدەنگییەکەی خۆی قسەکانی دەسەلماندم) وەڕێخست و نوێنەرانی فەنلاند و بۆلغارستان و هەنگاریا بە ریز ئیزنی قسەکردنیان خواست و بە توندی دژی ئێمە قسەیان کرد. کۆسینین، کە لە تووڕەییان وەك بیبار سوور ببۆوە گوتی:" سەیرە، کە لەو ناوەندە قایمەی شۆڕشی جیهانیدا هێشتاش وردەبۆرژۆواکان قسە هەر دەکەن." ئەو وشەی وردە بۆرژۆوای بە گەپجاڕی و بێزارییەوە دەربڕی. پاش قسەکانی نوێنەرانی بۆلغارستان و هەنگاریا ستالین، کە هێور و بە لە سەر ەخۆییەوە لە جێگەی خۆی دانیشتبوو هاتە نێو قسەکان و گوتی:" بەڕای من ئەگەر شاندێکی نوێنەرایەتییش دژی ئەو بڕیارنامەیە بێ، واباشترە لە خستنە بەرباسی خۆ ببوێرین." ستالین ئەوجار بە پێداگرتنەوە لە سەر یەکدەنگیی نوێنەرانی حیزبیە کۆمۆنیستەکان گوتی:" لەوانەیە هاوڕێیانی ئیتالی بە باشی ئاگاداری گرفت و کێشەکانی ئێمە نەبن. من پێشنیار دەکەم، کە درێژەی ئەو کۆبوونەوەیە بخەینە سبەینێ و لەو ماوەیەدا نوێنەرانی یەك دوو حیزبی کۆمۆنیست، کە لێرەن لەگەڵ هاوڕێیانی ئیتالی قسە بکەن." ئەو پێشنیارە پەسند کراو ئەرکی دانوستان لەگەڵ ئێمە کەوتە ئەستۆی ڤاسیلی کۆلارۆڤی نوێنەری بولغارستان.

کۆلارۆڤ بە لێزانی و بە ئەدەبەوە ئەو ئەرکەی بەڕێوە برد. ئەو پاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکە بانگهێشتی کردین بۆ چا خواردنەوە لە دیوەکەی خۆی لە هوتێلی لۆکس و پاش هێندێ فشە و رابواردن بێ پێشەکی گوتی:" هاوڕێیان وەرن بەبێ پێچ و پەنا و رووبینی پێکەوە قسان بکەین ئێوە پێتان وایە من راگەیەندراوەکەی ترۆتسکیم خوێندۆتەوە یا لێی ئاگادارم؟ راشکاوانە با پێتان بڵێم نەخێر. منیش وەك ئێوە نازانم ترۆتسکی لەو راگەیەندراوەدا چیی نووسیوە و چیی گوتووە و حەزیشم لێ نییە بزانم چی تێدایە. راستیتان پێ بڵێم ئەگەر ترۆتسکییش بە نهێنی ئەو بەڵگەیەی بۆ ناردبایەم هێشتا نەمدەخوێندەوە.دەزانن بۆچی؟ لەبەر ئەوەی کە لێرە مەسەلەی راگەیەندراو و نێوەڕۆکەکەی لە گۆڕێ نییە."

کۆلارۆف، کە تێگەیشتبوو سەرمان لە قسەکانی سوورِ ماوە بە بزەیەکەوە لێی زیاد کرد و گوتی:" هاورِێیانی ئیتالیایی من، دەزانم ئێوە لە ولاَتێکی خاوەن کولتوورێکی دەولَەمەندەوە هاتوونەتە ئێرە و لە روانگەی ئاکادیمیکی و بەو دیدەوە لە شتەکان دەروانن، بەلاَم خۆ ئێرە ئەنیستیتۆ نییە. ئێمە کەوتووینەتە نێو شەرِی دەسەلاَتی دوو لایەنی رێبەرانی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییەوە و ناچارین دەبێ یەکێکیان هەلَبژێرین. راستییەکەی مەسەلەکە ئەوەیە و ئەوەی کە لە راگەیەندراوەکەی ترۆتسکیدا چ نووسراوە و چ نەنووسراوە زۆر گرینگ نییە. من بابەتی خۆم هەلَبژاردووە و دەستم لە سەر لایەنی بەهێزتریان داناوە. ئێستا ئێوەش دەبێ لە نێوان ستالین، کە لایەنە بەهێزەکەیە و ترۆتسکی لە کەمینەیە یەکێکیان هەلَبژێرن، ئەوەی کە لە راگەیەندراوەکەیدا چ نووسراوە گرینگ نییە."

کۆلارۆف پاش درکاندنی ئەو قسانە لە حالَێکدا، کە دیسان ئیستیکانەکانی بۆ ئێمە پرِ دەکردەوە لە چا بە قەلاَفەتی مامۆستایەك، کە لە قوتابییەکەی دەپرسێتەوە کەئاخۆ لەو وانەیەی پێ گوتووە باش تێگەیوە یان نا پرسی؟" ئاخۆ ئەوەی پیتانم گوت بە گوێرەی پێویست روون بوو؟" لە وەلاَمی دا گوتم :" بەلَێ. زۆر روون بوو." کۆلارۆف دیسان پرسییەوە:" دەی باشە قایل بوون؟" گوتم نەخێر.

کۆلارۆف، کە چاوەروانیی وەهاوەلاَمی کی راشکاوانەی نەدەکرد گوتی:"بۆ قایل نەبوون. شتەکە زۆر روونە...". من گوتم ئەگەر بمەواوەلاَمی کی تەواو بەو پرسیارەی تۆ بدەمەوە دەبێ روونی کەمەوە، کە بۆچی دژی فاشیزمم و لە خەبات دژی فاشیزمدا گیانی خۆمم خستۆتە مەترسییەوە. بەو وەلاَمەی من شوێنە واری توورِەیی و تێکچوون لە روخساری کۆلارۆفدا وەدەر کەوت و تۆلیاتی، کە هەتا ئەو کاتە گوێی بۆ قسەکانی ئێمە راگرتبوو هاتە نێو قسەکانمانەوە و گوتی ئێوە گەرەکتانە ئێمە بە قەبوولَکردنی ئەو بنەمایە "ماف بەو کەسەیە بەهێزترە" کوێرانە لای بەهێزترەکە بگرین، بەلاَم ئێمە ناتوانین هەروا بە سانایی ئەو کارە بکەین. ئێمە دەبێ لە بنچ وبناوانی ئەو ناکۆکییە تێبگەین و ئەوجار داوەریی لە سەر بکەین.

کۆلارۆف بە بزەیەکی گەپجارِانەوە، کە زیاتر نیشانەی بەزەیی یا گالَتەی پێوە دیار بوو گوێی لە قسەکانی تۆلیاتی راگرت و گوتی:" واباشترە بەر لە کۆبوونەوەی دوایی زیاتری بیر لێ بکەینەوە. ئەو وێرای مالَئاوایی و لە حالَێکدا، کە ئێمەی بەرِێ دەکرد گوتی: "ئێوە هێشتا زۆر گەنجن و هیچ لە سیاسەت نازانن."

لە کۆبوونەوەی ڕۆژی دواییدا یەکەم کۆبوونەوە بە ئالۆزی دەستی پێکرد چونکی من و تۆلیاتی پاش را گۆڕینەوەیەکی زۆر بەو ئاکامە گەیشتین، کە ناتوانین دەست لەو پرەنسیپانە هەڵگرین، کە باوەڕمان پێیانە. ستالینیش بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە بوو و پێش هەر قسەیەك بە کۆلارۆڤی گوت:" ئاخۆ راستییەکەت بۆ هاوڕێیانی ئیتالیمان روون کردەوە؟" کۆلارۆف گوتی:"بە تەواوی". ستالین لە سەر ی رۆیشت:"هەر وەکی لە کۆبوونەوەی پێشووشدا گوتم تەنانەت ئەگەر دەستەیەکی نوێنەرایەتیش لەگەڵ ئەو بڕیارە پێشنیار کراوە نەبن هێشتا لە کۆبوونەوەی گشتیی دەستەی بەڕێوەبەریدا نایهێنینە گۆڕێ. ئەو بڕیارنامەیە دەبێ بە دەنگی زۆرینە پەسند بکرێ." ستالین برێك راوەستا و ئەمجارە رووی لە ئێمە کرد و گوتی:" ئاخۆ هاوڕێیانی ئیتالیمان لەگەڵ ئەو بڕیارنامەیە هەن؟" من پاش راوێژ لەگەڵ تۆلیاتی گوتم:" ئێمە بەر لە دەرکردنی هەر بڕیارێك لە سەر بڕیارە پێشنیارییەکە دەبێ دەقی راگەیەندراوەکەی ترۆتسکی ببینین." ئالبێرت ترێنتی نوێنەری حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنساو ژول هۆمبردۆز نوێنەری سویسرا پشتی بۆچوونەکەی ئێمەیان گرت و داوای دەقی راگەیەندراوەکەیان کرد، کە بهێنرێتە کۆبوونەوە.(ئەو دوو کەسە چەند ساڵ دواتر لە کۆمینترێن وەدەرنران.)

ستالین گوتی:" بڕیارنامەکە وەردەگرینەوە." و بە دوای ئەوەدا کۆبوونەوەکە شێوا. چەند کەسێك لە سەر کردەکانی حیزبە کۆمۆنیستەکان و یەك لەوان کوسینن، راکۆشی و پییەر بە توندی هێرشیان کردە سەرمان و تالمانی رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا، کە بەڕێوەبەری کۆبوونەوەکە بوو لە دەرەنجامگیریی بابەتەکاندا گوتی، کە شێوازی ئابڕووبەرانەی ئێمە لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا دەریدەخا، کە لەوانەیە سەرکەوتنی فاشیزم لە ئیتالیا بەرهەمی سەپاندنی سیاسەتی هەڵە و دوور لە واقیعبینی لەم شێوەیە بوویێت و پێشنیاری کرد، کە حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا لە لایەن کۆمینترێنەوە لێکۆڵینەوەی لە سەر بکرێ. ئەو پێشنیارە بەڕێوەچوو و دەستەیەك، کە لە لایەن کۆمینترێنەوە راسپێردرابوون وای لێك دایەوە، کە لە حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیادا ویست و رۆحی پەتیی بۆرژۆوایی زاڵە. هەڵبەت ئەو سزادرانەی ئێمە لە سەر ئەوە بوو، کە کوێرانە بڕیارنامە پێشنیارکراوەکەی ستالینمان بۆ مەحکوومکردنی ترۆتسکی، پەسند نەکرد و هەمووان دەیانزانی، کە ئەگەر ئەو شتە پێش-نەهاتبایە شێوازی حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا هیچکات نەدەچوە ژێر پرسیار.

# 3

بڕیارەکانی کۆنگرەی پازدەهەمی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتی لە بـواری ئابووریـدا. گەلاڵەی یەکەمین بەرنامەی پێنج ساڵەی ئابووریی یـەکێتیی سـۆڤیەتی لـە سـاڵی 1928دا لێ-کەوتەوە. بە درێژایی بەڕێوەبردنی ئەو بەرنامەیە، کە هەتا سـاڵی 1933ی خایانـد، تـەواوی ئـەو پوانانەی، کە لە ساڵی 1921 بەدواوە بەناوی سیاسەتی ئابووریی نوێی لینین درابوون بە خـەڵکی، لێیان وەرگیرایەوە. کەرتی تایبەتیی بچووکی شاری لە بەرامبەر ئەو بڕیارگەلە ئابوورییـە نوێیانـەدا، کە بە هێزی توند وتیژییەوە جێبەجێ دەکران، هیچ بەربەرەکانێ و بەرگرییان نەکرد.

بـەڵام وەرزێـران بەتایبـەتی کولاکسـەکان بەتونـدی لـە بەرامبـەر بەرنامـە نوییـەکانی هاوبەشکردنی کشتووکاڵدا راوەستان. کولاکسەکان وەرزێرگەلێکی تا رادەیەك دەوڵەمەند بوون، کە لە سەردەمی دەسەلاتداریێتیی "ستۆلیپین"ی وەزیری بـەناوبانگی تـەزار نیکـۆلای دووەم دا ببوونە خاوەنی زەوی و زار و لە نێو وەرزێرو جوتیاری روسیدا چـینێکی جیـاواز بـوون. سـاڵی 1917، کە رژێمی تەزاری هەرەسی هێنا پازدە لە سەدی وەرزێرە روسییەکان کۆلاکس بوون و ئەویتر خاوەنی زەوی و زاری کشتووکاڵیی بچووك یان کرێکاری وەرزێـران بـوون، بـەڵام نیـوەی بەرهەمی کشتوکاڵیی روسیا بەدەستی کولاکسەکان بەرهەم دەهات. پاش سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکی و لە یەکەمین ساڵەکانی حکوومەتی لینیندا کولاکسەکان گوشاریان خرایە سـەر و بەرهەمە زیادییەکانیان لێ ّزەوتکردن و دەستیان بەسەر داگیرا هەربۆیەش کولاکسەکان هەوڵ و چالاکییەکانی خۆیانیان کەمتر کردەوە و بەربەرەکانیی ئەوان لە بەرامبەر بۆلشەڤیکییەکانـدا، قاتی و قڕی لێکەوتەوە و بووە هۆی گۆڕانی سیاسـەتی لیـنین و راگەیانـدنی سیاسـەتی نـوێی ئابووری. سیاسەتی نوێی ئـابووری، کـە لـە بـری زەوتکـردن و دەسـتگرتن بەسـەر بەرهەمـە زیادییەکانی کولاکسەکاندا،ماڵیاتیان لێ وەرگرتن یا بەرهەمەکانیان لێ کڕینەوە، بووە هـۆی ئەوەی کە کولاکسەکان ببووژێنەوە و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیان زیاتر بکەنەوە. بەجۆرێك، کە ساڵی 1927واتە دوایین ساڵی بەڕێوەچوونی سیاسەتی نوێی ئابووری، بەرهـەمی دانەوێڵـەیی لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا گەیشتە بەرزترین ئاستی خۆی. بەڵام، کە هاوبەشـیکردنی کشـتوکاڵی کەوتە سەر زار و زمانـان و قسـەی ئـەوەدا کـەوت، کـە زەوی و زاری وەرزێـران دەسـتی بـە

سەردادەگیرێ، بەرهەمە کشتوکاڵییەکان تەنانەت بەر لە جێبەجێ کرانی بەرنامەی یەکەمی پێنج ساڵەی ئابووری لە کەمیی دا و کولاکسەکان بەرهەمەکانیان لە عەمبارێ کرد و لە فرۆشتنی خۆیان بوارد. بەربەرکانێی کولاکسەکان ستالینی تووڕە کرد و بووە هۆی خێراتر بەڕێوەبردنی گەلاڵە و بەرنامەی هاوبەشکردنی کشتوکاڵ و ئەو بەرنامەیە، کە قەول وابوو بەدرێژایی پێنج ساڵ و وردە وردە جێبەجێ بکرێ. بە زۆرەملێ و لە دوو ساڵاندا جێبەجێ کرا. ستالین بڕیاری دا، کە نەهێڵێ کولاکسەکان وەکو چینێك بمێننەوە و بەربەرەکانێی ئەوان لە بەرامبەر دەوڵەتدا بووە هۆی کوشتاری بێ بەزەییانەی ملیۆنان کەس یا دوورخرانەوەی ئەوان بۆ سیبری، بەڵام ئەوە بە تەنیا کولاکسەکان نەبوون، کە لە بەرامبەر سیاسەتی نوێی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵدا، راوەستابوون. بەڵکو زۆربەی ئەو وەرزێر و جوتیارە نێونج و هەژارانەش، کە وایان پێ باشتر بوو، خۆیان خاوەنی پەڵە زەوییەکی خۆیان بن و نەبنە نۆکەر و رەعییەتی دەوڵەت، لە بەرامبەر گەلاڵەی هاوبەشکردنی کشتوکاڵدا راوەستابوون و بەربەرەکانێیان دەکرد. ئەو دەستەیەی وەرزێرە نێونجی و هەژارەشیان بە مۆرکی پادکۆلاچنیکی، واتە لایەنگرانی کولاکس، قەڵتوبڕکردن، بە چەشنێك، کە ستالین خۆی لە وتووێژ لەگەڵ چرچیلدا، لە جەنگەی ساڵەکانی شەڕدا دانی بەوەدا نا و (چرچیل لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئاماژەی پێکردووە). لە رەوتی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ لە روسیادا، دە میلۆن کەس تێداچوون. وەرزێران و جوتیارانی روسی و بنەماڵەکانیان، بە زۆرییەوە، لە رێگەی تاراوگەی سیبریدا، لە سەر مان رەق هەڵاتن یا لە برسان مردن و بەهۆی رۆیشتن یا دەرکرانیان لە ئاواییەکان، بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە ساڵەکانی لە 1929هەتا 1933ی روسیادا، هەتا سەدا چل دابەزی چونکی وەرزێران و ئاژەڵدارەکان وایان پێ باشتر بوو، کە مەڕ و ماڵ تەکانیان بکووژنەوە نەك ئەوەی کە بیاندەنە کاربەدەستانی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ.

لە جەنگەی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵدا بیست و پێنج میلۆن بنەماڵەی گوندنشین بەسەر دووسەد و پەنجاهەزار "یەکە"ی کشتوکاڵیدا، دابەش کران. ستالین فەرمانی دا سەرەڕای کەمیی داهاتی بەرهەمی کشتوکاڵی، رادەی هەناردەکردنی گەنم بۆ دەرەوە زیاد بکرێ و هەر بۆیەش هەناردەکردنی گەنم لە سێزدە (کۆنتال)1300 کیلۆوە لە ساڵی 1929دا گەیشتە 48/3 کۆنتال و لە ساڵی 1930دا گەیشتە 51/8 کۆنتال و لە ساڵی 1931دا زیاتری کرد، بەڵام زیاتر داکشانی ئاستی بەرهەم لە ساڵی 1932 و 1933دا ستالینی ناچار کرد، رادەی هەناردەکردنەکان دابەزێنێ.

گوشاری ستالین بۆ هەناردەکردنی گەنم بۆ دەرەوە، سەرەڕای وشکەسالّی لە نێوخۆدا، بۆ وەدەستهێنانی دراو و کڕینی ماشێن بۆ بەڕێوەبردنی بەرنامەکانی بە پیشەییکردنی ولاّت بوو. دەبێ بگوترێ، کە بەرنامەی یەکەمی پێنج ساڵەی ستالین لەم رووەوە، سەرکەوتوو بوو. و پیشە قورسەکان و بەرهەمەکانی ئاسن و پۆلاّو مەوادی کیمیایی و بەرهەمهێنانی وزەی کارەباو دەرهێنانی بەردە رەژوو بەشێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەند.

گرینگترین رووداوی نێوخۆی یەکێتیی سۆڤیەتیی لە ماوەی جێبەجێکرانی بەرنامەی پێنج ساڵەی یەکەمی ستالیندا رەتاندن و وەدەرنانی دوایین هاوکارانی لینین لە دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیست بوو. سێ کەس لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی واتە بۆخارین، وریکۆف و تۆمسکی، کە لە جەنگەی ململانێکانی پێشووی ستالیندا بە دژی ترۆتسکی و زینوویێف و کامێنۆڤ، پشتیوانیان لێکردبوو، بەتوندی دژایەتیی بەرنامەی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵیان دەکرد، بەڵام ستالین، کە ئیتر هیچ دەنگێکی جیاوازە و بەرهەڵستکاری پێ قەبووڵ نەدەکرا، ئەو سێ کەسەی، سەرەڕای تەواوی ئەو زەحمەتانەی لە رابردوودا کێشابوویان، بە لادەری دەستەراستی و مۆرەی ئیمپریالیستە دەرەکییەکان تۆمەتبار کرد و لەپێشدا لە دەفتەری سیاسیی لابردن و دوایی پۆستە حکوومەتییەکانی دیکەی لێ- ئەستاندنەوە و ئاخری لە جەنگەی پاکسازییە خوێناوییەکەی ساڵەکانی 1934هەتا 1938دا هەرسێکیانی لەنێو برد. گێڕانەوەی بەشێك لە بیۆگرافیی و فەرمیی ستالین بۆ دەرخستنی شێوازی ئەو لە کاتی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵدا و لەو هەڵسووکەوتانەی، کە لەگەڵ بۆخارین و هاوبیرەکانی ئەو هەیبووە، بێجێ نییە. لەم بەشە لە بیۆگرافیی فەرمیی ستالیندا، کە لە کاتی ژیانی ئەودا بلاّو بۆتەوە نووسراوە.

پاش ئەوەی کە حیزب دەستی کرد بە هێرش و پەلامار بۆ سەر کولاکسەکان، لە ساڵەکانی 1928 و 1929دا بە جێگەی ترۆتسکیستەکان و زینۆویستە بەزیوەکان، ئەوجار بۆخارین، ریکۆف، تۆمسکی و هەموو گرووپە دژە حیزبییەکان واتە ئەو کەسانەی خوازیاری گوێ لە مست بوونی راستەکان و لایەنگرانی گەڕانەوەی سەرمایەداری بوون، هاتنە مەیدان. لە هەمان کاتدا ئیمپریالیستەکان بە پشت ئەستووریی خوازیارانی گوێ لە مست بوونی راستەکان، هەوڵیان دا. یەکێتیی سۆڤیەتییی سۆسیالیستی لە شەڕ وەردەن. لە ناوەندەکانی گشتیی سوپای بەریتانیاو فەرانسادا، پلان و گەلاّڵەیەکی نوێ بۆ دەست درێژیکردنە سەر یەکێتیی سۆڤیەتی لە ساڵەکانی 1929ـ1930دا، دادەڕێژێ.

هەروەکی شۆڕشی مەزنی سۆسیالیستیی لە مـانگی ئۆکتۆبـەری سـاڵی 1917دا بـەبێ تێکشاندنی خوازیارانی خۆبەدەستەوەدان و هەڵوەشاندنەوەی مانگرتنەکان و مەنشـەڤیکەکان و R-Sـەکان، سەرنەکەوت، هەروەکی لە ساڵەکانی 1928ــ 1929دا بـەبێ تێکشـکاندنی خوازیارانی گوێ لە مستبوونی راستەکان، سەرکەوتنی سوسیالیزم مەحاڵ بوو... ئاخافتنەکانی ستالین لەو قۆناغەدا بۆ سەرکەوتن بەسەر تاقمی دژە حیزبیی بۆخارین ـ ریکۆفدا، گرینگییەکی تایبەتی بوو. لەم ئاخافتنانەی ستالیندا روخساری لایەنە راستەکان لـەقاو داران و دەرکـەوت، کـە ئـەوان دوژمنـی لینینیـزم و مـۆرەی کۆلاکسـەکانن لـە نێـو حیزبـدا. لـە خـەبات دژی دەستوپێوەندەکانی لایەنی (راست) ستالین هەموو حیزبی یەکگرتوو کرد و بە هاوکاریی حیزب، پەلاماری بردە سەر دوایین هێلانەی چەوساندنەوە و سەرمایەداری لە وڵاتەکەماندا. لێوەشاوەیی ستالین و پێدرانی نازناوی بژاردە و بەخشندەی مەزن هەر لـە سـاڵی 1929 و جێـژنی پـەنجا ساڵەی لە دایك بوونی ئـەودا، دەسـت پێـدەکا. رۆژنامـەکان بـەو بۆنەیـەوە کۆمـەڵێك وتـار بڵاودەکەنەوە و شاعیرانی روس و کۆمارییەکانی دیکە روسـیا قەسـیدەی بـۆ دەهۆننـەوە، کـە ژمارەیان لە زمانە جیاجیاکاندا لە سەد کەس تێدەپەڕێ. رۆژنامەی کۆمۆنیسـتەکانی وڵاتـانی دیکەش دەست دەکەن بە پێداهەڵدان و ستالین نەك هەر بـە جێگـرەوەی لێوەشـاوەی لیـنین لـە قەڵەم دەدەن بەڵکو بە رێبەری بێوێنەی یەکێتیی سۆڤیەتیی و تەنانەت بە رێبـەر و پێشـەوای تەواوی کۆمۆنیستەکانی جیهان ناو دەبەن. چەندین شاری بەناو دەکەن، کە بۆ وێنە دەکرێ ناوی تسارتسین و ستالینگراد و شاری دووشەنبەی پایتەختی تاجیکستان بێنین، کە بە سـتالین ئـاوا ناوی دەرکردووە. ئەندامێکی دەفتەری سیاسی حیزبیش بـەناوی پیاتـاکۆف لـە وتارێکـدا لـە رۆژنامەی پراڤیدادا، بەبۆنەی پەنجاساڵەی لەدایکبوونی ستالین وێڕای ئامـاژە بـە لافـاوی ئـەو هەمووە نامـە و تەلەگرافانـەی، کـە بـەو بۆنـەوە گەیشـتوونەتە کـرێملین، نووسـینی: "ئـیتر مەسەلەی رێبەری لە وڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتیدا چارەسەر کراوە و ئەوەش رووداوێکی مەزنـە. دەربڕینی هەست و کەفوکوڵی گشتی بە بۆنەی پـەنجا سـاڵەی لـە دایکبـوونی سـتالین، تـەنیا بەڕێوەچوونی جێژنی لە دایکبوونی نەبوو، بەڵکو واتا و مانایەکی قووڵی سیاسـیی تێـدا بـوو. رێبەری مەزن و بیرمەند و بژاردەمان ستالین، پاش ئەو رۆڵەی، کـە شـان بـە شـانی لیـنین بـۆ سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکی داگیرای ئێستا سەرکەوتوانە بەرپرسیارەتی و ئەرکی قورسـی دامەزراندنی یەکەمین حکومەتی سۆسیالیستیی جیهـان و سـەرکوتی دوژمنـانی نێوخـۆیی و دەرەکیی راپەڕاندووە و داهاتووی وڵاتەکەمانی بەناو خۆی کردووە....."

# 4

لە شازدەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیدا، کـە رۆژی 26ی ژووئـەن هەتا 13ی ساڵی 1930 ی کێشاو لە مۆسکۆ گیرا ستالین لـە هـەموو لایەکـەوە دەسـەڵات و هێژمونیی تاکەکەسیی خۆی سەپاند و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسیی تەنیا لە کەسانی گوێ لە مست و دەست پەروەردەی خۆی هەڵبژارد. هەر ئەو ساڵە پۆستی سـەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی کۆمیسارپای گەل یا سەرۆکایەتیی وەزیرانی لە ریکۆف ئەستاندەوە و مۆلۆتۆف لەوێ دانرا. ریکۆف لە ساڵی 1929 وە بە هۆی رەخنــە گـرتن لــە خێرایـی بـەڕێوەبردنی سیاسـەتی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ لەبەر چاوی ستالین کەوتبوو و وێڕای ئەوەی کە دواتر بـۆ راکێشـانەوەی سەرنج و متمانەی ستالین لە کۆبوونەوە حیزبییەکاندا پێی لە هەڵە کانی خۆی نا، بەڵام نـەیتوانی متمانەی ستالین بەرەو خۆی راکێشاو پاش لابرانی لە پۆستی سەرۆکی وەزیـران هـەروا کـەوتبووە بەر رق و قین، هەتا ئەوەی کە لە پاکسازییە گەورە ستالینییەکەدا گیرا و ئیعدام کرا.

سەرەڕای ئەو گرفت و کێشانەی، کە لە کاروباری پێوەندیدار بە هاوبەشیکردنی کشـتوکاڵدا هاتبوونە پێش ستالین لە راپۆرتەکەیدا بۆ کۆنگرەی چواردەیەمدا باسی لە سەر کەوتنی مەزن لـە بوارەکانی پێشەسازی و هاوبەشیکردنی کشتوکاڵدا کرد و پێشنیاری کـرد، کـە بەرنامــەی پێـنج ساڵە لە چوار ساڵدا جێبەجێ بکرێ. ئەو پێشنیارە هەروەکی چاوەڕوان دەکرا " بە کەفوکوڵ و لــە یەکدەنگ" لە لایەن کۆنگرەوە پەسند کرا و بە دوای ئەوەدا گوشـار بـۆ پیشـەییکردنی وڵات دوو ئەوەندەی جاران بوو، بەڵام پێشکەوتنی پیشەیی پێویستی بە گوشاری زیاتر بۆ سـەر وەرزێـران و زیاترکردنی هەناردەکانی بەرهەمی کشتوکاڵی بوو بۆ دەرەوەی وڵات، کە بووە هۆی ئەوەی کە لـە ساڵی 1932_33دا قاتی و قڕیی لێبکەوێتەوە. باشترین نموونە بۆ تێگەیشتن لـە رەوشـی ئـەو ساڵانەی روسیا نووسینەکەی "ئـارتۆر کۆسـتلێر"ی نووسـەری نـاودارە، کـە لـەو سـاڵانەدا وەك نووسەرێکی کۆمۆنیست بانگهێشت کرابووە روسیا و بۆ نووسـینی کتێبێـك لـە سـەر یـەکێتیی سۆڤیەتی بەو وڵاتەدا دەگەڕا. کتێبەکەی کۆستلێر لە ساڵی 1934دا بە ناوی "شەوانی سـپی و رۆژە سورەکان"وەرگێڕدرایە سەر زمانـەکانی روسـی و ئـەڵمانی و ئینگلیـزی و فەڕەنسـی و لــە مۆسکۆ چاپ کرا، بەڵام کۆستلێر دواتـر رایگەیانـد، کـە لـە کتێبەکـەی ئـەودا تەنانـەت نـاوی

کتێبەکەشی گۆڕدراوە. کۆستلێر پاش گەڕانەوەی لە یەکێتیی سۆڤیەتی و بەشداری لە شەڕە نێوخۆییەکانی سپانیادا لە کۆمۆنیزم هەڵگەڕایەوە و ئەو کاریگەرییانەی لە ژیانی گەڵ کۆمۆنیستانداوەریگرتبوون رشتنییە نێو فۆرمی چەند رۆمانێکی سیاسییەوە، بەڵام یەکێك لە بەناوبانگترین نووسینەکانی ئەو، کە لە کۆمەڵە (چیرۆکی) خودای شکست خواردوودا" چاپ بوو بیرەوەرییەکانی خۆیەتی، کە بۆ وێنە سەبارەت بە سەفەرەکەی بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی لە ساڵەکانی 1923و1933دا دەنووسێ: من بە چاوی خۆم قاتی وقڕیی سامناکی ساڵەکانی 1923_33 ی ئۆکراینم لە ساڵانی بەر لە شۆڕشدا بینی، شوێنێك، کە عەمباری دانەوێڵە بوو. ژن و منداڵ و پیاوی بۆر و چڵکی و رەش وروت لە وێستگەکانی شەمەندەفەڕدا سواڵیان دەکرد. ژنان منداڵەکانی خۆیان، کە لاقیان وەك رانە مریشك لەر و لاواز بوون و بە کەللەی سەری زل و زەدەڵە و زگی باکردووەوە زیاتر لە کۆرپەڵەی نێو شووشەی ئەلکۆل(دیتۆڵ) دەچوون بە جامی پەنجەرەی شەمەندەفەرەکانەوە دەنووساندن بۆ ئەوەی موسافیرەکان بەزەییان پێیان دابێ و شتێکیان بدەنێ. پیاوانیش لە بەر لاوازی توانای داواکردنیان نەبوو و لاقە قەڵشیوەکانیان، کە لە پێڵاوی دڕاو و سۆڵی داتلێشاوەوە هاتبوونە دەرێ دڵی بەردیان دەتاواندەوە. لە وەڵامی پرسیاری مندا سەبارەت بەو دیمەنە کارەساتبارانە و هۆکاری گوێ پێنەدانی حکوومەت بە بارودۆخی نالەباری ئەو خەڵکەی خەریکە دەمرێ لێپرسراوانی حکوومەتی پێیان گوتم ئەوان ئەو کۆلاکسانەن، کە ملیان بۆ بەرنامەی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ رانەکێشاو بە مەبەستی تێکدەری و لە جێبەجێکرانی بەرنامەکەدا ئاواییەکانیان چۆڵ کرد و سواڵکردنیان بە لاوە باشترە لەوەیکە مل بۆ کاری هاوبەش لە کێڵگەکاندا راکێشن، بەڵام من گەلێك برسیی دیکەشم بینی، کە برسییەتییەکەیان هیچ پێوەندییەکی بە بەربەرەکانێکردنی بەرنامەی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵەوە نەبوو. رۆژێك کارەکەری هۆتێلی رگینا لە خارکێف وێڕای رێکوپێککردنی دیوەکەی من لە برسێتیان بوورایەوە و کاتێك لە هوتێلدارەکەم پرسی ئەوە بۆچی وایە؟ گوتی تازە هاتۆتە خارکێف و بە هۆی هێندێك گرفتی تەکنیکی کارتی خواردەمەنییەکەی وەدوا کەوتووە. دیارە منیش ئەوەم قەبووڵ نەکرد.

بارودۆخی کۆمارییەکانی ئەودیوی قەفقازو ئاسیای ناڤین زۆر لەوە خراتر بوو لە کۆمارییەکانی ئەورووپی. هەموو شتێك کۆن و تۆزلێنیشتوو و شمەك چڵکن و شڕ و روخسارەکان خەمناك و پڕ لە بێزاری بوون. شارە پیشەییەکان زیاتر لە ئۆردووگای دیل و یەخسیران دەچوون و هەر دیوێك بە هەڵواسینی پەردەیەك کرابوو بە دوو بەش یا سێ بەش.

روونکردنەوەی لایەنە پێوەندیدارەکان، کە ئەو کات بۆمن قایلکەر بوون ئەوە بوو کەتەواوی کێشە و گرفتەکان لە بن سەری رژێمەکەی پێشوو دایە و بە جێبەجێبوونی بەرنامەکانی پێنج ساڵەی ئابووری ئەو گرفتانە یەك لە دوای یەك چارەسەر دەکرێن. ئەو بەڵگاندنە، کە لەو کاتدا پازدەساڵ بەسەر سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکیدا تێپەڕیبوو تاڕادەیەك قایلی دەکردم، بەڵام هەمووومان دەزانین، کە حکوومەتی روسیا ئێستاش نەیتوانیوە کێشەی نیشتەجێکردن و خانووبەرەی خەڵك چارەسەر بکاو تەنانەت لە مۆسکۆ هەر ئاپارتومانێکی چەند دیوی، بۆ چەند بنەماڵە تەرخان کراوە، کە هەمووان دەبێ لە سرویسێك و چێشتخانەیەك کەڵك وەرگرن. دابەشینی خواردەمەنی و کەلوپەل و پێداویستییەکان گەمترین نیاز و پێداویستییەکانی خەڵکیان دابین نەدەکرد هەر بۆیەش ئەو شتانە لە بازاڕی رەش، کە هیچ کەس نەیدەزانی چۆن دەگەنە دەست فرۆشیارەکانی ئەوێ سامناك بوو بۆ وێنە نرخی کیلۆیەك رۆنی کەرە بەرامبەر بوو لەگەڵ مووچەی یەك مانگی کرێکارێك و نرخی جووتێك پێڵاو بەرامبەر بوو لەگەڵ مووچەی دوومانگی ئەو. لەو بارەیەشەوە بیانوویەکی قایلکەریان بۆ ئێمە دێنایەوە، کە باوەڕمان پێ دەکرد ئەویش ئەوە بوو، کە دەیانگوت بە پێی سەرژمێری، ئاستی ژیانی چینی کرێکار لە چاو ئاستی ژیانیان لە سەردەمی رژێمی پێشوودا (کە هیچ جێی گومان نییە) زۆر چۆتە سەرێ ئاستی ژیانیان لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشەوە زۆر لە سەرترە لە چاو سەردەمی تەزاری. ئەو راستییە روون و ئاشکرا بوو، کە ئاستی ژیانی کرێکاران لە زۆربەی وڵاتانی سەرمایەداریدا هێشتا باشتر بوو لە ژیانیان لە یەکەمین وڵاتی سەرمایەداریی جیهاندا، بەڵام ئەوە تەنیا بەراوردکردنێکی سەقەت و بێ جێ نەبوو، چونکی بە پێی قسەی کاربەدەستانی حیزبی و دەوڵەتیی وڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتی ئاستی ژیانی کرێکاران لە وڵاتانی سەرمایەداریدا بەردەوام لە دابەزیندا بوو و لە وڵاتانی سۆسیالیستییشدا بەردەوام لە هەڵکشاندا بوو. دیسان بە پێی پێش بینیی سەرژمێرییەکان دەگوترا، کە لە کۆتایی بەرنامەی پێنج ساڵەی دووەمدا ئاستی ژیانی کرێکاران لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا دەگاتە ئاستی لاتە گەورەکانی سەرمایەداری و ئەوجار لەوێشی تێدەپەڕێنێ (دیارە ئەو پێشبینیانە قەت وەدی نەهاتن).

بە کورتی وردە وردە سەرەڕای ئەوەی کە دەمانزانی ئەو هەڕوگێڤانە هەموو درۆن هێشتا قەبووڵمان دەرکردن و من خۆم، کە سەرەتا گلەییم لە سنووردار بوونی سەفەر و پێشگرتن لە بڵاوبوونەوەی بڵاڤۆك و رۆژنامەی دەرەکی لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا هەبوو وردە وردە قایل بووم، کە نابێ لە نیشاندانی خۆشگوزەرانی لە وڵاتانی سەرمایەداریدا و بە بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی سەماویی وڵاتانی ئیپریالیستی ورەو باوەڕی خەڵکی یەکێتیی سۆڤیەتی سەبارەت

بەو پێشکەوتنانەی بە نەسیبیان بوون لەرزۆك بکەین. لە پێناوی ئەو ئامانجەدا، کە گرتبوومانە پێش، درۆکردن و دەمتەڕی و بوختان هەڵبەستن و ترس وەبەرنان بە لامانەوە چەوتی و لایەنە ناشیرنەکەیان لە دەست دابوو و کاتێك گرفتە تاقەت پڕووکێنەکانی خەڵکمان بە چاو دەدیتن زۆر بە ئاسایی پاکانە و پاساومان بۆ دێنایەوە و، کە بۆ ئەوە دەبێ ژیانی نەوەیەك بکرێ بە قوربانیی نەوەیەکانی تر. ئەو شێوە بیرکردنەوە و پاساوهێنانەوەیە لەوانەیە بە لای زۆر کەسەوە سەیر و سەمەرە و دوور لە چاوەڕوانی بێ. راست وەکو حاڵەتی تووشبوویەك بە مەوادی سڕکەر، کە باس لە جیهانی خۆی دەکا بۆ کابرایەکی ساخ و دوور لە مەوادی سڕکەر و ئەویش هیچ لە قسەکانی سەرەدەر دەرناکا.

لە ساڵی 1932 ـەوە کارەساتێکی گەورە لە ژیانی ستالینیشدا رووی دا، کە هەر چەندە دیزەبەدەرخۆنەیان کرد، بەڵام کاریگەریی لە سەر ئەخلاق و هەڵسووکەوتی ستالین لەگەڵ دەوروبەرییەکانی دانا. ئەو رووداوە کوژران یا خۆکوشتنی "نادژدا- ئالیۆڤێرا"ی هاوسەری سی ودوو ساڵەی ستالین بوو، کە بە دوای دەمبەدەمەیەك لە کۆڕی جێژنی پازدەهەمین ساڵوەگەڕی سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکی روسیادا هاتە پێش. لەو کتێبانەدا، کە لە سەر ژیانی تایبەتیی ستالین نووسراون ئاماژە بەوە کراوە، کە ستالین پیاوێکی ژنانی و عەیاش بوو و جاری وابوو لەبەر چاوی هاوسەرەکەی لەگەڵ ژنانی دیکەدا رایدەبوارد. نادژدا، کە ژنێکی هەستیار و خوێندەوار بوو زۆر بەوە تێك دەچوو و لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا لەگەڵ ستالین بۆ ئەوەی لەو شوێنە ئازاردەرە دوورکەوێتەوە ناوی خۆی لە زانکۆی مۆسکۆ نووسی و زۆربەی کاتەکانی لە دەرەوەی کۆشکی کرێملیندا بەسەر دەبرد، بەڵام ئاشنایەتیی نادژدا لەگەڵ واقیعی ژیانی خەڵکی یەکێتیی سۆڤیەتی بووە هۆی ئەوەی کە لە ستالین بێزار با و بەردەوام لە سەر پرسی ئابووری و سیاسی لەگەڵی بکەوێتە دەمەقاڵە و کێشە و لەیەکێك لەو کێشە و مشتومڕانەدا بوو، کە لە حاڵێکدا، کە حەوت تیرێکی بەدەستەوە بوو بە مردوویی لە ئاپارتمانەکەیدا دۆزییانەوە. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا سەبارەت بە رووداوی کوژران یا خۆکوشتنی نادژدا دەنووسێ:

... گوتیان نادیا(نادژدا خۆی کوشتووە، بەڵان مەرگی ئەو زۆر مەتەڵ و جێیگەی پرسیار بوو. بەهەر حاڵ ئەوەی بووە هۆی تێداچوونی نادیا پێوەندیی بەو هەڵسوکەوتەوە هەیە، کە ستالین لەگەڵی هەیبوو و سۆتلانای کچی ستالین دەبێ ئاگاداری رووداوەکە بێ. تەنانەت دەنگۆی ئەوە هەبوو، کە ستالین بە دەستی خۆی کوشتوویەتی و وای نواندووە، کە خۆی کوشتووە، بەڵام لە هەمووی ئاساییتر ئەوەیە، کە لە بەر ئەو هەڵسوکەوتە پڕ لە

سووکایەتییەی، ستالین لەگەڵی هەیبوو خۆی کوشتبێ (بەڵام لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش، کە ئەو لە کوێی ئەو چەکە هێناوە). هەر نەبێ سۆتلانای، کە ئێجگار ئازاری لەو رووداوە چێشتووە دەبێ بزانێ ئەو شتە چۆن بەسەر دایکی هاتووە...

بەڵام سۆتلانا شتێکی ئەوتۆی لە سەر کوژران یا خۆکوشتنی دایکی نەنووسیوە و لە کتێبێکدا بە ناوی "بیست نامە بۆ هاورێیەك"، کە پاش هەڵاتنی لە روسیا نووسیویێتی و پێشکەشی کردووە بە دایکی زیاتر باس لە پەشێوبوونی باوکی لە هۆی ئەو رووداوە دەکا و بۆ وێنە دەنووسێ:

" باوکم زۆر بەو رووداوە تێکچوو بوو. ئەو بۆیە پێی تێکچوو بوو، چونکی نەیدەزانی بۆچی؟ بۆچی وەها زەبرێکیان لە پشتەوە لێداوە...

باوکم جاروبار توورە دەبوو و هەڵدەچوو. دەیانگوت دایکم لە شەوی مردنەکەیدا نامەیەکی بۆی نووسیبوو. بە دڵنیاییەوە نامەکەیان هەر لەوێ لە نێو بردبوو، بەڵام ئەو نامەیە هەبوو. هەبوون کەسانێك، کە دیتبوویان و خوێندبوویانەوە. نامەیەکی توند بوو. پڕ لە تۆمەت و توورەیی. نێوەرۆکی نامەکە کەموزۆر سیاسی بوو کاتێك باوکم خوێندییەوە تێگەیشت، کە دایکم تەنیا بە رواڵەت لەگەڵی بووە، بەڵام لە راستیدا لە دژی ئاراستەی سیاسەتەکانی رۆژدا هەنگاوی دەنا، ئەو راستییە ئەویشی تووشی سەر سوورمان و توورەیی کردبوو. لە کاتی بە خاك ئەسپاردنەکەیدا کتوپڕ لە تابووتەکەی دایکم نزیك بۆوە و ئەوجار بە دەستەکانی وەلای ناو لە تابووتەکە دوورکەوتەوە و لە رێورەسمی ناشتنەکەشیدا بەشداریی نەکرد...

من زۆربەی جاران بیر دەکەمەوە، کە ئەگەر دایکەم نەمردبایە چ چارەنووسێکی دەبوو؟.. ئەو درەنگ یا زوو دەبوو بە یەکێك لە دژبەرانی باوکم... باوەڕ ناکری دایکم لە نێوچوونی باشترین هاورێیانی خۆی واتە بۆخارین و نیۆکیدزاو ئەوانی تری دیتبایە و بێ دەنگ دانیشتبا. ئەو بە هیچ شێوەیەك لە بەرامبەر ئەو جەنایەتانەدا نەیدەتوانی بێ دەنگ بێ.

# 5

ستالین لە حەڤدەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیدا، کە لە سەرەتای ساڵی 1934 داگیرا، بوار و دەراوی بۆ ئەو پاکسازییە خوێناوییە خۆش کرد، کە هەتا ساڵی 1938ی خایاند. ستالین لە ئاخافتنە پوختەکەی خۆیدا لەو کۆنگرەیەدا، پاش باسکردن لەو سەرکەوتنانەی، کە لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی پیشەییکردنی وڵات و هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ بە تەواوی و "لە نێوبردنی کولاکسەکان وەك چینێکی تایبەت" مەترسیی ئەوەی راگەیاند کە: "هێشتا زۆری ماوە بۆ ئەوەی خەبات کۆتایی پێبێ.... وەك بلێی دوژمنان بەزیون، بەڵام پاشماوەی ئایدۆلۆژیاکانیان هەر ماوە زۆر جاران سەرهەڵ دەدەنەوە. لە زەینی خەڵکدا هێژموونیی سەرمایەداری دەبووژێننەوە و کەڵکی لێوەردەگرن.

دەبێ بەردەوام لە پێناوی زاڵبوون بەسەر پاشماوەکانی سەرمایەداری لە مێشکی خەڵکدا تێبکۆشین ....

دەبێ بەردەوام بین لە وەبەر رەخنەدانی ئایدۆلۆژیای تەواوی رەوتەکانی دژی لینینیزم. نابێ لایی لایە بۆ حیزب بچڕین، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدەین هۆشیارتری بکەینەوە. نابێ حیزب تێك دەین بەڵکو دەبێ هەمیشە وای راگرین، کە ئامادەی جەنگ بێ".

لەگەڵ گیرانی کۆنگرەی حەڤدەهەمی حیزبدا، پێداهەڵدان بە ستالین خەست تر بۆوە و تەنانەت دژبەرانی بەناوبانگی ستالینیش وەکو ، زینۆویێڤ و کامێنۆڤ و بۆخارین و رادك، کە هەستیان بە مەترسی دەکرد ناچار بوون چەند وتارێك لە پەسنی رێبەری مەزندا بنووسن. وتارەکەی رادك، کە دوولاپەڕەی پراڤیدای بەتەواوی گرتووە و دواتر وەك نامیلکەیەك هەزاران دانەی لێ چاپ و بڵاو کرایەوە، هەڵگری زیاترین پەسند و پێداهەڵگوتنەکانە بە ستالیندا، ئەو کۆنە ترۆتسکیستە، کە چەند ساڵ دژایەتیی ستالینی کردبوو هەنووکە ئەوی بە باشترین قوتابیی لینین، مۆدێلی حیزبی لینین، گۆشت و خوێنی پاك و بێخەوشی ئەو "ناو دەبرد و توند و تیژیی ستالینی لە بەرامبەر دوژمنان و نەیارانیدا، بە "هوشیاریی لە رادەبەدەر لە بەرامبەر هەلپەرستاندا" ناودێنا و پاکانەی بۆ دەکرد.

یەکێك لەو ڕێبەرە گەنجانەی، کە لەو سەردەمەدا بە دڵی ستالین بوو کیرۆڤ بوو، کە لە کۆنگرەی حەڤدەهەمدا کرایە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی و ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب. کیرۆڤ لە ئاخافتنێکدا لە کۆنگرەی حەڤدەهەمدا وێڕای پێداهەڵدان و پەسنی ستالین گوتی:

"دژوارە کەسایەتیی مەزنی ستالین بەو جۆرەی هەیە وێنا بکرێ. لەو ساڵانەی دواییدا واتە لەو ڕۆژەوە، کە ئێمە بەبێ لینین کار دەکەین، هیچ گۆڕانێك لە کاری ئێمەدا، هیچ داهێنانێك کەموزۆر، هیچ دروشم یا هیچ ڕێبازێك لە سیاسەتی ئێمەدا نییە، کە بێجگە لە بیر و هزری ستالین لە جێگەیەکی دیکەوە سەرچاوەی گرتبێ" حیزب دەبێ ئەوە بزانێ، کە هەموو کارە بنەڕەتییەکان بەپێی فەرمان و داهێنانەکان و لە ژێر چاوەدێریی هاوڕێ ستالیندا جێبەجێ دەکرێن و گەورەترین مەسەلەی سیاسەتی نێونەتەوەیی ئێمە لە سەر بنەماو بە فەرمانی ئەو چارەسەر دەکرێ...

کیرۆڤ هەر وەها وێڕای پێداهەڵدانێکی زۆر بە ڕاپۆرتەکەی ستالین بۆ کۆنگرەی حەڤدەهەم پێشنیاری کرد هەر ئەم ڕاپۆرت و پێشنیارانەی ستالین بۆ کۆنگرە دەقاو دەق وەکو بڕیاری کۆنگرە و "وەك یاسای حیزب و بەرنامەی کاری حیزب لە داهاتوودا" پەسند بکرێن. ئەم پێشنیارە پەسند کراو لە ڕاستیدا کۆنگرەی حەڤدەهەمی حیزبی کۆمۆنیست بێجگەلە پشتڕاستکردنەوەی تەواوی وتە و بۆچوونەکانی ستالین و تاریف و پەسنی ئەو و هەڵبژاردنی پاڵێوراوانی دڵخوازی وی بۆ بۆستە حیزبییەکان کارێکی دیکەی نەکرد. لەو کەسانەی، کە لە کۆنگرەی حەڤدەهەمدا بوونە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، یاگودا yagooda و یەژۆڤyezhov ئەندامانی ڕێکخراوی پۆلیسی نهێنی یەکێتیی سۆڤیەتی بوون، کە لە پاکسازیە خوێناوییەکانی ساڵەکانی دواییدا دەوری بەرچاویان هەبوو. ڕۆژی یەکەمی ساڵی 1934 کیرۆڤ لە سمۆلنی بە دەستی گەنجێك لە ئەندامانی حیزب بە ناوی نیکولایۆف کوژراو بەدوای ئەودا یەکەمین شەپۆلی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالین دەستی پێکرد. بیست و چوار کاتژمێر پاش کوژرانی کیرۆڤ، ستالین لە فەرمانێکدا، کە هیچ یاساو ڕێسایەکی ڕەچاو نەکردبوو، فەرمانی دا بەخێرایی بە دۆسییەی ئەو کەسانەدا بچنەوە، کە تۆمەتی تیرۆریان لە سەرە و فەرمانی ئیعدامی جەنایەتکارانی دەرکرد. لە کۆتایی ئەو فەرمانەدا هاتووەکە، " فەرمان بە کۆمیساریای کاروباری نێوخۆ دەدرێ، کە بەبێ ماتڵکردن، بڕیاری ئیعدامی حوکمدراوان بەڕێوە بەرێ".

خرۆشۆف، کە پاش ستالین بوو بە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیست و سەرۆکی وەزیرانی یەکێتیی سۆڤیەتی. لە راپۆرتە نهێنییەکەیدا بۆ کۆنگرەی بیستەمی حیزب، ئاماژەی بەو خراپ کەڵك وەرگرتنانە لەو فەرمانە کرد و هەروەها پەردەی لە سەر راز و نهێنییەکەی کوژرانی کیرۆڤ هەڵدایەوە بۆ وێنە دەڵێ: ئەو فەرمانە بواری بۆ کەڵك لێوەرگرتنی چەوت خۆش کرد. لە زۆربەی دادگاییە رواڵەتییەکاندا خەڵکیان بە هەوڵدان بۆ تیرۆر و کردەوەی تیرۆرسیتی تاوانبارکرد و حوکمیان دان. داخوازییەکەیان لەبەرچاو نەدەگیرا. هەرکات تۆمەتباران بە بەڵگەوە سەلماندبایان، کە تۆمەتەکەیان بێبنەمایە هیچ بایەخ بە داوایان نەدەدرا و هەرکات لە دادگادا گوتبایان، کە لە ژێر گوشار و زەحمەتدا دانیان بە تاواندا هێناوە، دەستەی دادوەری گوێی پێنەدەدان. ئەوەش پێویستە باس بکرێ، کە هێشتا لایەنە جۆراوجۆەکانی رووداوی کوژرانی کیرۆڤ لێڵ و نادیارە و روون نەبۆتەوە.... زۆر جێگەی گومانە، کە نیکۆلایۆف، لەگەڵ پارێزەرانی تایبەتیی کیرۆڤ، رێکەوتنی بووبێ. مانگ و نیوێك پێش کوژرانی کیرۆڤ نیکۆلایۆف بەهۆی کردەوەی گوماناوی دەسبەسەر کرا، بەڵام بەبێ لێپرسینەوە و لێپێچینەوە بەردرا. خاڵێکی گومان خولقێنی دیکە ئەوەیە کە، یەکێك لە پارێزەرەکانی کیرۆڤ، کە ئەندامی دەزگای ئاسایشی "چێکا" بوو. کاتێك لە رێکەوتی دووی دسامبری 1934دا دەیانبرد لێپرسینەوەی لێبکەن، لە رووداوێکی هاتوچۆدا کوژرا. لە حاڵێکدا ئەوانەی لە ماشێنەکەدا بوون تەنانەت یەك کەسیشیان هیچی لێنەهات. پاش کوژرانی کیرۆڤ بەرپرسانی کۆمیساریای کاروباری نێوخۆیی لینین گراد سەرکۆنەیەکی سووك کران، بەڵام لە ساڵی 1937دا، هەر ئەوانە تیرەباران کران. پێدەچێ ئیعدامی ناوبراوان بەو مەبەستە بووبێ، کە رووداوی کوژرانی کیرۆڤ دیزە بە دەرخۆنە بکرێ.

پاش کوژرانی کیرۆڤ ستالین لەگەڵ چەند ئەندامێکی دەفتەری سیاسیی حیزب و کابرایەکی گەنج بەناوی ژدانۆڤ zhdanovکە تازە ببووە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و سکرتێری سکرتاریای حیزب، چووە لینیگراد و خۆی بکووژەکەی کیرۆڤی خستە بەر لێپرسینەوە. مۆلۆتۆڤ و ڤێرۆشیلوڤیش لەو لێپرسینەوە و لێپێچینەوەیەدا بەشدار بوون.

رۆی مێدڤێدۆڤRoy medvedov نووسەری ناوداری روسی لە کتێبی "لە دادگای مێژوودا" باس لەو لێپێچینەوەیە دەکا و دەنووسێ کاتێك ستالین لە نیکۆلایۆڤی پرسی، کە لەبەرچی کیرۆڤی کوشت، نیکۆلایۆڤ چۆکی نوشتانەوە و لە حالێکدا، کە ئاماژەی بە دەستەی مەئموورەکانی چێکا دەکرد، کە لە پشتەوەی ستالین راوەستابوون، هاواری کرد "چونکی

ناچاریان کردم ئەو کارە بکەم". لەوکاتەدا، لێپرسراوانی چێکا بە ئاماژەی ستالین پەلاماریان دا و دایانە بەر قۆنداغە تفەنگ. نیکۆلایۆڤیان بەبێ هۆشی و شەڵتانی خوێن لە دیوەکە بردە دەرێ و وەك ئەوانەی لەوێ بوون دەڵێن نیکۆلایۆڤ لەژێر ئەشکەنجەدا مرد.

مێدڤێدێڤ هەر لەو کتێبەدا دەنووسێ، کە چەند مانگێك پاش کۆنگرەی حەڤدەهەمی حیزب پێوەندییەکانی نێوان ستالین و کیرۆڤ کاڵ بوونەوە و ستالین، کە پیاوێکی بەدگومان بوو پاش ئەوەی کە چەند راپۆرتێکی لە رێگەی لێپرسراوانی چێکاوە لە سەر کیرۆڤ پێگەیشت، لێی دڕدۆنگ بوو. ستالین تەنانەت پێش کوشتنی کیرۆڤ دابنابوو کێی لە جێگەی دابنێ و رۆژێك دوای کوژرانی کیرۆڤ، ژدانۆڤ، کە لەگەڵ ستالین چووە لینینگراد، پاش ناشتنی کیرۆڤ لە جێگەی دانیشت.

پاش کوژرانی کیرۆڤ، بێجگە لە بکووژەکەی واتە نیکولایۆڤ و پارێزەرە تایبەتەکەی ئەو واتە بۆریسۆڤ، کە بەر لە دادگاییکردنی کوژران، 49 کەسی دیکەشی بە تۆمەتی بەشداری لە پیلانی کوشتندا، تیرەباران کران، لە کاتێکدا، کە بینەرانی سەرەکی لەنێو چووبوون و پاساو و بیانوویەکی پتەو لە سەر تۆمەتبار کراوانی دیکە لە گۆڕێ نەبوو، بەڵام رووداوی کوژرانی کیرۆڤ بەو ئیعدامانە کۆتایی نەهات بەڵکو بە درێژایی ساڵی 1935، لە پاکسازییەکی بەبڵاوی حیزبیدا، کە لەژێر چاوەدێریی یەژۆڤدا بەڕێوەچوو کۆمۆنیستی روسیایان لەو کاتدا پێك دێنا، لە حیزب وەدەرنران و دەراو بۆ پاکسازیی بەرین و خوێناویی دیکە بۆ ساڵەکانی 1936هەتا 1938 خوش کرا.

ساڵی 1936، کە لە ساڵی دەستپێکی بەرینترین و خوێناویترین پاکسازییە سیاسییەکانی مێژووی جیهان لە و بە ساڵی یاسای بنەڕەتی ستالینیش لە قەڵەم دەدرێ، چونکی یاسای بنەڕەتی نوێی یەکێتیی سۆڤیەتی، کە جێگەی یاساو رێساکانی پاش شۆڕشی گرتەوە، لە کۆتاییەکانی هەر ئەو ساڵەدا لەلایەن کۆنگرەی هەشتەمی سەرانسەریی ئەنجوومەنەکاندا پەسند کرا. چاوخشاندنێك بە هێندێ بنەما و بڕگەی ئەو یاسایەدا و شێوەی بەڕێوەچوونەکەی، پێویستە. لە ژیاننامەی ستالیندا، کە لە سەردەمی ژیانیدا بڵاو بۆتەوە، بەو شێوەیە باسی یاسای بنەڕەتی ستالین کراوە:

لە یاسای بنەڕەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی سۆسیالیستیدا، بەردی بناغەی تەواوی سەرکەوتنە مەزنەکانی سوسیالیزم دانراوە. بەپێی ئەو یاسا بنەڕەتییە کۆمەڵگای یەکێتیی سۆڤیەتیی بریتییە لە دوو چینی دۆست واتە وەرزێران و کرێکاران. ئەنجوومەنی نوێنەرانی زەحمەتکێشان بنەمای ئابووریی یەکێتیی سۆڤیەتین. مافی کارکردن، پشوودان، خوێندن، دابینبوونی ئابووری لە تەمەنی پیریدا یا لە نەخۆشی و لەکاتی نەمانی توانایی کارکردندا بۆ تەواوی

هاوولاتیانی یەکێتیی سۆڤیەتی دابین دەکرێ. یەکسانیی هاوولاتیان یەکێتیی سۆڤیەتیی بەبێ لەبەرچاو گرتنی نەژاد و نەتەوە، بەگشتی بۆ ژن و پیاو، یاسایەکە، کە نابێ پێشێل بکرێ.

یاسای بنەڕەتی، بە مەبەستی پتەوکردنی کۆمەڵگەی سۆسیالیستی، ئازادیی رادەربڕین و چاپەمەنی و کۆڕ و کۆبوونەوە گرتن و مافی یەکگرتن لە رێکخراوێکی کۆمەڵایەتیداو پارێزراو بوونی تایبەتی و پارێزراویی ماڵ و نهێنییەکانی نامەگۆڕینەوە و مافی پەنابەرێتی بۆ ئەو بیانییانەی، کە بەتاوانی داکۆکی لە ماف و بەرژەوەندیی کرێکاران و یا لە خەبات لە پێناوی ئازادیی نەتەوە ژێردەستەکاندا راونرابێ، دەستەبەر دەکا....

هەر لەو ساڵە 1936دا، کە یاسای بنەڕەتیی نوێی روسیا بە پڕ وپاگەندە و هات و هوریایەکی زۆرەوە پەسند کرا، یەکەمین خولی داداگاییکردنەکان لە زنجیرەی دادگاییە مەزنەکان لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا دەستی پێکرد. لەم دادگاییکردنانەدا، کە لە مێژووە فەرمییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بە " دادگایی بنکەی ترۆتسکی ـ زینۆویڤ) بەناوبانگە، دوو کەس لە نزیکترین هاوڕێیانی واتە کامێنۆڤ و زینۆویڤ، کە لەهێنانە سەرکاری ستالین و سەرکەوتنی بەسەر ترۆتسکیدا رۆڵێکی بەرچاویان گێڕا، لەگەڵ چواردە کەسی دیکە لە بەرپرسانی پایەبەرزی حیزبی کۆمۆنیستی ترۆتسکی لە دەرەوەی وڵات دادگایی کران و هەمووان حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچوو.

پاش ئیعدامی ئەو چواردە کەسە، یاگۆدا کۆمیسێری کاروباری نێوخۆیی یەکێتیی سۆڤیەتی، کە رێکخراوی پۆلیسی نهێنیی یەکێتیی سۆڤیەتییشی لەژێر چاوەدێریدا بوو لە سەر کار لابردرا و دەسبەسەر کرا. یەژۆڤ، کە چاوەدێریی بەسەرکاری پاکسازیی حیزب لە مۆرە گومانلێکراوەکاندا دەکرد، لە جێگەی ئەو دانرا و رەوتی پاکسازی و دەسبەسەرکردن و دادگاییکردنەکەی ئەوی خێراتر کرد ، کە بە رای ستالین بە مۆرەیەکی مەترسیدار و بێکەڵك ناسرابوون. دووەمین دادگاییکردنی مەزن، کە بە " دادگایی بنکەی ترۆتسکیستە دژە یەکێتیی سۆڤیەتییەکان "ناوی دەرکردووە. لە ژانویەی 1937دا بەڕێوەچوو و لەودا حەڤدە کەس لە کەسایەتییە پایەبەرزەکانی حیزبی کۆمۆنیست، کە دووانیان لە هاوکارانی لینین بوون بەناوەکانی پیاتاکۆف و سوکۆلینکۆف، لەگەڵیاندا بوون و بڕیاری ئیعدامیان لە سەر درا و تیرەباران کران. یەکێك لەو تیرەباران کراوانە "رادك" ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بوو، کە سەرەڕای نووسینی ئەو هەموو وتارە لە پەسنی ستالیندا نەیتوانی گیان دەربەرێ.

سێیەمین دادگایکردنی مەزن، کە پتر لەوانی پێشوو هەڵلای لێساز بوون، لە مانگی مارسی ساڵی 1938دا بەڕێوەچوو لەو دادگاییەدا، کە بە " دادگاییکردنی تاقمی دژە یەکێتیی سۆڤیەتی و مۆرە راستگەراو ترۆتسکیستەکان " ناوی دەرکردووە بیست و یەك کەس لەبەردەم دادگادا راگیران، کە بەناوبانگترینیان بوخارین هاوکاری لینین و تیۆرداڕێژیی ناوداری حیزب بوو، کە هەتا ساڵی 1929 و ریکۆفی جێگری لینین، کە پلەی کۆمیسێری ئەنجوومەنی کۆمیسێرەکانی گەل یا سەرۆکی وەزیران بوو. یاگودا کۆمیسێری پێشووی کاروباری نێوخۆی یەکێتیی سۆڤیەتییش کەخۆی لە ساڵی 1936دا زنجیرەی یەکەمی دادگاییکردنەکانی رێك خستبوو، یەکێك بوو لە تۆمەتبارانی ئەو دادگایە، کە وەکو ئەوانیتر حوکمی ئیعدامی لە سەر بەڕێوەچوو و تیرەباران کرد.

تۆمەتی هاوبەشی تەواوی حوکمدراوانی ئەو دادگایە، داڕشتنی پیلان بۆ کوشتنی ستالین و رووخاندنی حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتی و پێوەندی گرتن بە رێکخراوە سیخوڕییە دەرەکییەکانەوە بوو. زۆربەی هەرە زۆری تۆمەتبارانیش لە ژێر ئەشکەنجەدا یا بە گفتی سووککردنی سزا بە مەرجی دانپێدانان بە تاوانەوە، دانیان بەو تاوانانەدا نا، کە کردوویانن و نەشیانکردبوون، بەڵام هیچکام لەوان لەبەر ئەو دانپیانان و پەژیوانی دەربڕینانەیان، سزایان لە سەر سووك نەکراو لێیان خۆش نەبوون.

لە نێوان دادگاییەکانی ساڵانی 1937 و 1938دا دادگایی ریزێکی دیکە لە فەرماندەران و سەرۆکانی لەشکری سوور بە تاوانی خەیانەت و پیلان دژی ستالین حوکمی ئیعدامیان بۆ دەرچوو و تیرەباران کران. لە بەناوبانگترینی ئەو ئەفسەرانە، مارشال تۆخاچێڤسکی بوو، کە لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکیییەوە رۆڵێکی گرینگی لە رێکخستنی لەشکری سووردا گێڕابوو. لە نێو ئەفسەرانی ناوداری دیکە، کە لەو دادگاییەدا تیرەباران کران، دەکرێ ناوی، " یاکیر" و ژەنەراڵ ئیدێمان بێنین. مارشال گامارنیکی سەرۆکی ئیدارەی سیاسیی لەشکری سووریش بەر لە دەسبەسەر کران خۆی کوشت.

پاکسازیی ئەفسەرانی لەشکری سوور هەتا ئاستی هەرە خوارەوە هەتا ساڵی 1939 هەروا درێژەی هەبوو و تێیدا، نیوەی ئەفسەرانی ئەرتەش وەبەر ئەو پاکسازییە کەوتن. لەوانەی، کە لە خولەکانی دواییدا کەوتنەبەر پاکسازی، مارشال یەگۆرۆڤی جێگری وەزارەتی بەرگریی یەکێتیی سۆڤیەتیی و مارشال بلوخێری فەرماندەی لەشکری سوور بوو لە رۆژهەڵاتی دوور، کە هەرکیان لە شیاوترین ئەفسەرانی لەشکری سوور بوون. ئەو پاکسازییانە، لە

بەرەبەری شەڕی دووەمی جیهانیدا، بڕستیان لە لەشکری سوور بڕی و هەروەکی لە بەشی داهاتوودا دەیبینین، زۆر لە سەر یەکێتیی سۆڤیەتیی گران وەستا.

ئەو دادگاییە مەزنانەی ئاماژەی پێکرا، تەنیا بەشێك لە پەلاماری پاکسازیی خوێناویی ساڵانی 1936هەتا1938 لەخۆ دەگرێ. جگە لەو دادگاییانە، بە سەدان کۆڕی دادگایی دیکەش لە شوێنە جیاجیاکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بەڕێوەچوون و هەزاران کەس بەبێ دادگایی و لێپرسینەوە ئیعدام کران. ئەو ڕێژەیەی، کە خرۆشۆف لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیدا لە سەر پاکسازی کراوانی ئاستی سەرەوەدا داوێتی، راچڵەکێنەرە. بەپێی ئەو راپۆرتە لە 1956 نوێنەری کۆنگرەی حەڤدەهەمی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتییدا، کە دەسەڵات و ئاستی دەستڕۆیشتوویی دیکتاتۆرییەتی ستالینیان سەقامگیر و دەستەبەر کرد، 1108 کەسیان واتە نزیك بە دوو لە سێی کۆی نوێنەران کەوتنە بەر پاکسازی و ژمارەیەکی زۆریان تیرەباران کران. هەر بەپێی ئەو راپۆرتە، لە کۆی 139ئەندام و پاڵێوراوانی ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیش، کە لە کۆنگرەی حەڤدەهەمدا هەڵبژێرابوون، 98کەسیان و بە واتایەکی دیکە حەفتا لە سەدیان لە پاکسازییە خوێناوییەکانی ساڵانی 1936هەتا 1938دا دەسبەسەر و تیرەباران کران.

# 6

پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالین لەساڵەکانی1936 هەتا 1938بەشێکی هەرەزۆری ئەو بیۆگرافی و لێکۆڵینە وانەی، کە لە سەر وی کراون لەخۆ گرتووە. ئاماژە بەتەواوی ئەو لێکۆڵینە وانە و هاتەی راستەقینەی ستالین بۆ لەنێوبردنی ئەوکەسانەی، کە بەراستی هیچ مەترسییەکیان بۆ ئەو نەبوو لەو کتێبەدا جێی نابێتەوە لێرەدا تەنیا ئاماژەیەکی کورت بە دووشت دەکەین، کە بۆ ئەوە نابن باسیان نەکەین.

رۆی مێدڤێدێڤ نووسەر و لێکۆڵەری روسی لە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆیدا بە ناوی لە دادگای مێژوودا بە تێر وتەسەلی باسی لە جەنایەتەکانی ستالین کردووە و ئاماژەبە گەلێك شت دەکا، کە ستالین خۆی راستەوخۆ فەرمانی دەستبەسەرکردن و ئەشکەنجە و ئیعدامکردنی داون و تەنانەت جار هەبووە خۆی لێپرسینەوەی لە هێندێ لە دەستبەسەر کراوان و هەڤاڵانی پێشووی خۆی کردووە. سەبارەت بەهانەی ستالین بۆ ئەم جەنایەتانە مێدڤێدێڤ ئاماژە بە گەلێك فاکتۆر دەکا بۆ وێنە دەڵێ:

یەکەمین و گرینگترین هانەی ستالین بۆ ئەوجەنایەتانە بێ گومان زێدەخوازیی لەرادەبەدەری ئەو بوو. ئەو تاسەبارییە بۆ گەیشتن بە دەسەڵاتی رەها سەرەڕای ئەوەی کە بە وریاییەوە هەوڵ دەدرا شاراوە راگیرێ زۆر پێشتر لە ساڵی 1937 لە ستالیندا دەرکەوت.

ئەو دەسەڵاتە بەرینەی، کە لە بەر دەستی ئەودا بوو، بە هیچ شێوەیەك تینوێتییەکەی نەدەشکاند و کوڵی دڵی دانەدەمرکاندەوە. ئەو خوازیاری دەسەڵاتی رەهاو سەربەردانەوەی هەمووان بوو لە بەرامبەر خۆیدا... ئەو بەردەوام بەوە تووڕە بوو، کە دەبێ گوێ بداتە داوەریکرن و رەخنەی بەرپرسانی تر. ئەگەرچی ستالین بەر لە ساڵی1937 ژمارەیەکی زۆری رێبەرانی کۆنی حیزبی گەندەڵ کردبوو، بەڵام بە تەواوی لەوە ئاگادار بوو، کە ئەو کەسانە بە ویستی خۆیان ئامادە نابن لەو ماشێنە دەوڵەتییەی، کە ئەو دەیویست وەڕێی بخا کۆمەڵێك پێچ و مۆرەی (ئامرازی) سادەبن.

ئەو سەرکردانە لە سەر ئەو باوەڕە بوون، کە ئەوانیش لە دامەزراندنی حیزب و دەوڵەتدا بەشداری و کاریگەرییان هەبووە و بەشی خۆیان لە بەڕێوەبەریی کاروباری وڵاتدا دەویست، بەڵام ستالین نەیدەوبیست هیچکام لە هاوەڵانی بکاتە شەریك و هاوبەشی دەسەڵاتی خۆی... ستالین لەبەر ئەوەی دەسەڵات پاوان نەکرد، کە ئیتر باوەر و متمانەی بە هەڤاڵانی نەبوو. ئەو دەسەڵات پاوانکردنە لەبەر ئەوەش نەبوو، کە ستالین تووشی شێتیی ئازاردان و ئەشکەنجەکردنی خەڵك هاتباو لە دەوروبەری خۆی بێجگە لە خەیانەتکار کەسی بەدی نەکردبێ. بەڵکو بە هوشیاریی تەواوەوە بوو، کە ئەو دەسەڵاتی رەهای بۆ خودی خۆی دەویست...

ستالین هەر لە سەردەمی منداڵییەوە گرێ کوێرەیەکی خۆ بەکەمزانینی هەبوو، کە بە تێکەڵبوونی لەگەڵ زێدەخوازی و خۆپەرستی ببووە ئێرەیی و رق و قین. ئەو، کە هیچ چەشنە پەروەردەیەکی جیدیی نەدیتبوو و هیچ زمانێکی دەرەکیشی نەدەزانی لە ساڵی 1917دا بوو بە ئەندامی حکوومەتێك، کە تەنانەت نەیارەکانیشی بە خاوەن کولتوورترین حکوومەتەکانی ئەورووپیان لەقەڵەم دەدا. ستالین، کە کەوتبووە نێو گەلێك کەسایەتیی بەناوبانگ بە جوانی هەستی بە کەمایەسیی خۆی وەك رێبەرێکی سیاسی و تیۆریسییەنێك و وەك ئاخێوەرێك هەست پێدەکرد. ئێرەیی ئەو بە رۆشنبیرە راستەقینەکانی حیزب لێرەوەی سەرچاوە دەگرت. ئەو تەنیا بە شوێن دەسەڵاتی بێ کەوشەنەوە نەبوو، بەڵکو شانازیشیی دەویستن. نەدەبوایە لە گۆڕەپانی مێژوودا لەوی بەرزتر تێدابێ. هەربۆیەش لەگەڵ زۆرکەسان کەوتە دوژمنایەتی. نەك

لەبەر ئەوەی کە ئەوان نەیاری رژێم بوون، بە پێچەوانەوە لەبەر ئەوەی کە ئەوان خزمەتی باوێنەیان بە رژێم کردبوو...

مێدڤێدۆڤ لە بەشێکی دیکەی هەر ئەو کتێبەیدا باسی بیر ورای پزیشکان و دەروونزانانی لەمەڕ ستالینەوە کردووە، کە تووشی نەخۆشییەکی دەروونی بووە بەناوی پارانۆیاو نیشانەکانی ئەو نەخۆشینە، کە زیاتر لەگەڵ شێت و شەیدای زێدەڕۆیی و هەستی خۆ بە هەمووشت زانین و قین لە دڵی و ناکۆمەڵایەتیی بوون و لاساری و کەللەڕەقی و پێویستییەکی شێتانە بە زاڵبوون بەسەر خەڵکدا بەشێکن لە تایبەتمەندییەکانی ئەو نەخۆشینە و لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی ستالین یەك دەگرنەوە. هەر لەو کتێبەدا لە زمانی کوالێڤسکیی دەروونزانەوە باس کراوە، کە "ئەوانەی تووشی پارانۆیا دەبن دۆست و هەڤاڵیان نییە... دڕدۆنگی، بەگومانی، پارێز، وبێ بەزەیی لە هەموو کردەوەیاندا خۆ دەنوێنێ... بێ بەزەیی زیاتر تینوێتی بە خوێن و خووگرتن بە خەڵەتاندن و هەڵفریواندنی لەگەڵە."و نووسەر بە پێکگرتنی ئەو نیشانانە لەگەڵ هەڵسوکەوتی ستالین بەو دەرەنجامە دەگا، کە "ئەو گومان و دڕدۆنگییە نەخۆشانەیەی ستالین لەتەواوی ژیانیدا بە نیسبەتی خەڵکەوە هەیبوو، خۆی پێنەگیرانی لەبەرامبەر رەخنەدا و قین لەدڵییەکەی و ئەو بایەخە لە رادەبەدەرەی، کە بۆخۆی دادەنا، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ شێتیی زێدەخوازانە نەبوو. بێ بەزەییەکەی، کە هیچ لە سادیسم دوورنەبوو و بە کورتی تەواوی ئەو تایبەتمەندی و نیشانانە بۆ ئەوەن، کە ستالین وەك نموونەیەکی تووشبوو بە نەخۆشیی پارانۆیا بناسێنن."

بەڵام "زبیگنیۆ- بێرژینسکی" نووسەر و سیاسەتڤانی ناوداری پۆلەندی، کە هەتا ئێستاش هاووڵاتیی ئەمریکایە پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالینی کردە هەوێنی کتێبێك بە ناوی " پاکسازیی هەمیشەیی" the permanent purge_z Brzezinski و تێیدا ئەو شێوەیە لە دەسەڵاتی تاکەکەسی و تۆتالیتاری لە سەر کوتی بەرهەڵستکاران و نەیاراندا شی دەکاتەوە. بەشی هەرە زۆری ئەو کتێبە بۆ مەسەلەی پاکسازییە سیاسییەکان لە یەکێتی سۆڤیەتیی سەردەمی ستالیندا دوای ئەو تەرخان کراوە و پووختەی ئەو شتەی بێرچێنسکی لە سەر هانە و ئەنگیزەکانی ستالین باسی دەکا بەو جۆرەیە:

1- رژێمە تۆتالیتارەکان پاش گەیشتن بە دەسەڵاتی رەها بەرەو دووورەپەرێزی دادەکشێن و لە دووره پەرێزی دا هەست بە ئاسایش و تەناهی دەکەن. هەستکردن بە نەبوونی تەناهی و ئاسایش ئەوان بەرەو ترس و دڕدۆنگی دەبا و ترس و دڕدۆنگی دەراو بۆ توند و تیژی خۆش دەکا.

2ـ لە رژێمە دیموکراتیکەکاندا بەرپرسیارەتییەکان بەسەر ناوەند و دامودەزگاکاندا دابەش دەکرێن ئەو کەسەی لە سەرووی هەمووانەوەیە بەرپرسی راستەوخۆی ئەو شکست و هەڵە و خەتایانە نییە، کە دێنە پێشی و ئەو بەرپرسانەی پێگە و پلەی خۆیان لە دەست دەدەن مەترسییەك بۆ سەر ماڵ و گیانی خۆیان هەست پێناکەن، بەڵام لە رژێمە دیکتاتۆرییەکاندا هەروەکی چۆن شانازییەکان تەواوی بۆ ئەو کەسەد، کە لە سەرووی هەمووانەوەیە و سەرکەوتنەکان بە ناوی ئەو تۆمار دەکرێن بەرپرسیارەتیی تەواوی شکست و ناکامییەکانیش دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کەوابوو دیکتاتۆر هەرچەشنە شکست و خەتایەك بە پیلان وەسەرخۆی لێك دەداتەوە و هەڵە و کەم کاری و داهێزراویی نێو هەر سیستەمێکی ئیداریی بە مانای دژایەتیکرن یا خەیانەت لێك دەداتەوە و توندترین سزا بۆ هەر خەتایەکی بچووك لەبەر چاو دەگرێ.

3ـ رژێمە توتالیتارەکان وەکو حکوومەتەکانی هیتلەر و ستالین، کە لە سەر تادا زۆرینەی خەڵکیان بەدەورەوە بوون و پشتیوانییان لێدەکردن تەنانەت ئەو کاتەش، کە سواری ئەسپی دەسەڵاتیش دەبن خۆیان لە پشتیوانیی خەڵك بێ نیاز نابینن. بێ دەنگی و هێمنیی کۆمەڵگا لە روانگەی ئەوانەوە جۆرێکە لە دژایەتیکردن و بۆ وەرێخستنی بزاڤ و کەفوکوڵێکی هەمیشەیی، بەردەوام بە شوێن بیانوویەکدا دەگەڕێن. ئاشکراکردنی پیلانە نێو خۆیی و دەرەکییەکان و ناچارکردنی خەڵك بە پشتیوانیکردن لە رژێم لە بەرامبەر ئەو پیلانانەدا وێڕای ئەوەی کە بەرهەڵستکارانی گریمانەیی رژێم لەنێو دەبا، بزاوت و کەفوکوڵێکی دڵخوازیش لە کۆمەڵگەدا وەڕێدەخا و بیانوویەك بۆ سەلماندنی پشتیوانیی بیر و رای گشیتی دەخولقێنێ.

4ـ پەرەپێدانی رێکخراوی ئاسایش و پاراستن لە رژێمە دیکتاتۆرەکاندا خۆی یەکێکە لە هۆکارەکانی دروستبوونی دڕدۆنگی و دۆزینەوە و تەنانەت هەڵبەستنی پیلانی بەدرۆش بە دژی رژێم، چونکی دامودەزگا پۆلیسیی و نهێنییەکان بۆ خۆش خزمەتی بە رژێم و سەلماندنی گرینگیی خۆی دەبێ ماوە بە ماوە بڵێ، کە ئەوە پیلانێکی ئاشکرا کردووە و پووچەڵی کردۆتەوە ئەگینا لە کۆمەڵگەیەکی هێمن و بێ قڕەدا بوونی ئەوان هیچ مانایەکی نامێنێ. سیخور و راسپێراوانی ئەو دامودەزگایانەش بۆ سەقامگیرکردنی رەوشی خۆی و بەردامبوونی ئەو پوانانەی، کە هەیانە بە دڕدۆنگییەوە لە هەر چەشنە بزووتنەوەیەکی دەڕوانن و بەو راپۆرتانەی، کە لە سەر بنەمای خەیاڵات و قین و غەرەزە شەخسییەکانی خۆیان بنیات نراون و کێشە و گرفت بۆ خەڵك ساز دەکەن.

5ـ زێدەڕۆیی و کێبڕکێی شەخسییش فاکتەرێکی گرینگ بوو لە پێك هێنانی کەشی دڕدۆنگی و پاکسازی و گۆڕانی کتوپڕ لەرژێمە دیکتاتۆرییەکاندا.

لە رژێمە سەرەڕۆکاندا چوونە سەرێی پلەو پایەی کاربەدەستانی دەوڵەتی یاساو رێسایەکی دیاریکراو و تایبەتی نییە و لێوەشاوەیی و بڕینی قۆناغە ئیدارییەکان مەرجێکی سەرەکی نین بۆ چوونەسەری پلەوپایە. هەر بۆیەش هەرکەسەی بۆ گەیشتن بە پلەی باڵاتر هەوڵ دەدا، کە پێگەی کەسی سەرووی خۆی لەق و لەرزۆك بکا بۆ ئەوەی بەڵکو بتوانێ بە لابردنی ئەو جێی بگرێتەوە. هەڵبەت جار هەیە، کە لەو هەڤرکێیانەدا کارەکە پێچەوانە دەبێتەوە و کەسی سەروو بۆ نەهێشتنی جێگرەوەکەی خۆی تۆمەتێکی بۆ هەڵدەبەستێ و بە یارمەتیی کاربەدەستانی ئاسایش، کە لە تەواوی دامودەزگا ئیداری و ئابوورییەکاندا هەن پەروەندەی بۆ ساز دەکەن. لە پاکسازییەکانی ساڵانی 1936 هەتا 1938دا کەسانی لە جێگەی ئەو هەزاران بەرپرسە حیزبی و دەوڵەت و بەڕێوبەرانەی کارخانە و کێڵگە هاوبەشەکان دانران، کە یا لە سەر کار لابردرابوون یا ئەوەی کە کوژرابوون. ئەوانە پێشتر هەر لەو رێکخراوانەدا بە پلەیەکی خوارتر خزمەتیان دەکرد و زۆر جاران لە ئاشکراکردن و سیخوڕیکردن لە سەر بەرپرسەکانی خۆیان هاوکاریی بەرپرسانی ئاسایشییان کردبوو. هەڵبەت هێندێ لە بەرپرسان و بەڕێوەبەرانی کارخانەکان و کێڵگە هاوبەشەکانیش دەستی خۆیان وەپێش خستبوو و جێگر و کەسانی بن دەستی خۆیان بە کوشتن دابوو و خۆیان بۆی دەرچووبوون.

بێرژێنسکی لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا باسی چۆنێتیی دادگاییە گەورەکانی پاکسازییەکانی ستالین لە ماوەی ساڵانی 1936 هەتا 1938 دەکاو دەنووسێ: لە لێ-پێچینەوە لە تاوانبارانی ئەو دادگایانەدا کەهەمووان بەرپرسی دەوڵەتی و حیزبی بوون وهێندێکیان لە ستالینیان پتر زەحمەت لە پێناوی سەرکەوتنی شۆڕشی بۆلشەڤیکیدا کێشابوو پێیان گوترابوو، کە ئەگەر دان بە هەڵەکانیاندا بنێن سزاکانیان لە سەر سووکتر دەکرێ. زۆربەی تاوانباران خێرا خۆیان بەدەستەوە دا و هەم لە کاتی لێپێچینەوەدا و هەم لە دادگای ئاشکرایاندا دانیان نا بەو تاوانانەی کردبوویان و نەیانکردبوو. هێندێکیش لەوانەی کە بەربەرەکانێیان کرد ناچار بوون لە ژێر ئەشکەنجەی تاقەت پڕووکێندا ملکەچ بکەن و هەر وەکی داوایان لێکرابوو لە بەر دەم دادگادا داوای لێبوردن بکەن. ئەو دانپیانانە بە فەرمانی خودی ستالین لەو تۆمەتبار کراوانەوەرگیران، چونکی ستالین تەنیا لە نێو چوونی جەستەیانی پێ بەس نەبوو بۆ گەیشتن بەو مەبەستەی گەرەکی بوو. ئەو دەیویست بە ناچارکردنیان بەوەی، کە دان بە تاوانیان دابنێن و بپاڕێنەوە و بکڕووزێنەوە و داوای لێبووردن بکەن و بەر لە کوشتنیان کەسایەتییان و تەواوی شانازییەکانی رابردوویان وێڕای جەستەیان بە خاك بسپێرێ.

# بەشی شەشەم

## سالانی شەڕ و هەراوکردنەوەی ئیمپراتۆری

لە ماوەی سالانی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالیندا، ئەورووپا کۆمەڵێك رووداوی گرینگی بە خۆوەبینی. هیتلەر گەیشتبووە ئەوپەڕی دەسەلاتی خۆی و پاش ئەوەی، کە نەمسای خستە سەر ئەڵمانیاو پەیمانی مۆنیخی بەست پەیمانێك، کە داواکانی ئەوی سەبارەت بەچێکوسلۆڤاکیا دەسەلماند، هەوای داگیرکردنی پۆلۆنیاو هەراوکردنەوەی کەوشەنی حکوومەتەکەی بەرەو لای خۆرهەلات کەوتە سەری. لیتۆینۆف دەسەلاتداری روسی، کە لە سالّی 1930 یەوە مەترسیی شەڕێکی گەورەی جهانیی بە گوێی ستالیندا چرپاند و گوتی، کە هیتلەر پاش داگیرکردنی چێکوسلۆڤاکیا بە سەر پۆلۆنیایدا دەدا، ئامانجی دوایی ئەو یەکێتیی سۆڤیەتی دەبێ. سەرەڕای ئەوەی کە لەو کاتدا کەس نەیدەوێرا ستالین بدوێنێ و رەخنە لە سیاسەتەکانی بگرێ ، لیتۆیتۆف بە زمانێك، کە سالین پێی هەڵنەبەزێتەوە گوتی درێژەدان بەو پاکسازی و توند و تیژییە لە نێوخۆدا، پێگەی یەکێتیی سۆڤیەتی لە بەرامبەر مەترسییە دەرەکییەکاندا لاواز و لەرزۆك دەکاو باشتر وایە، کە هەتا زووە کۆتایی بەو توند و تیژییانە بهێندرێ.

بە روالّەت قسەکانی لیتۆنیۆف کاری خۆیان کرد وستالین لە دیسێمبەری 1938دا یەژۆف بەرێوەبەری سەرەکیی پاکسازییە خوێناوییەکانی سالانی 1936 هەتا 1938ی لەکۆمیسارییای کاروباری نێوخۆیی یەکێتیی سۆڤیەتی لابرد و مۆرەیەکی گورجیی دەستەمۆی خۆی واتە لاڤرێنتی بەریا ی لە جێگەی دانا و بەریا، کە پاش نزیك بە بیست سالّ لەو رێکەوتە بوو بە سەرۆکی دەزگای پاراستن و ئاسایشی یەکێتیی سۆڤیەتیی لەچاو کەسی پێشووی خۆی کابرایەکی هێدی و هێمن بوو و لە سەرەتای هاتنەسەرکاریدا لە سەرووی دامودەزگا

ئاسایشییەکانەوە ئـەرکی هێورکردنـەوەی شـێوازە تونـد و تیژانـەکانی رابـردوو و پاکسـازیی بەڕێوەبەرانی پاکسازییەکانی رابردووی لەئەستۆ بوو.

لە کۆتایی ساڵانی 1938 و سەرەتای 1939دا بە فەرمانی ستالین ژمارەیەکی زۆر لە دوور خراوە و بەندکراوە سیاسییەکان ئازاد کران و هێندێ لەو کەسانەی، کـە لـە سـەر کـار لابردرا بوون یا لە حیزب دەرکرابوون گەڕێندراتەوە سەر کـار و پلـەکانیان پێدرایـەوە. لـەو ماوەیەدا بۆ نەرم و نیان نیشاندانی ئەو وێنە سامناکەی، کە لە زەینی خەڵکـدا لـە سـتالین ساز ببوو کۆمەڵێك چیرۆك و بەسـەرهات لـە بـارەی گرینگییـدانی سـتالین بـەو کەسـانەی ناهەقی‌یان لێکراوە بڵاو دەکرانەوە. بۆ وێنە لە یـەکێك لـە رۆژنامـەکانـدا بـڵاو بـۆوە، کـە خوێندکارێکی لاو بەهۆی دەستبەسەر کرانی بـاوکی لـە پاکسـازییەکاندا لـە زانکـۆ وەدەر دەنرێ و ئەو خوێندکارە، کە خۆی بە شەریك تاوانی باوکی نەزانیوە پەنا دەباتە بەر ستالین و ستالین وێڕای تەواوی کێشەو چەرمەسەرییەکانی خۆی بەدوای گرفتی ئەو خوێندکارە دەکەوێ و خۆی تەلەفۆن بۆ سەرۆکی زانکۆکەی دەکاو پاش (مشتومڕێکی دوورودرێژ سەرۆکی زانکۆ قایل دەکا، کە لە دەرکردنی ئەو خوێندکارە گەنجە پاشگەز بێتـەوە) لـەو هەواڵـەدا سـەرنج دراوەتە ئەوەی کە ستالین نەك هەر بە کێشەی خوێندکارێك رادەگـا بـەڵکو بـۆ قـایلکردنی سەرۆکی زانکۆیەکیش چەنەی لەگەڵ لێـك دەدا و ئیـزن بـە خـۆی نـادا، کـە سـەبارەت بـە وەرگرتنەوەی خوێندکاری گۆرین• فەرمانی بەسەردا لێ بدا.!

پێکهاتنی هەژدەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتی لە مانگی مارسی ساڵی 1939دا دەرفەتێکی دیکە بۆ نیشـاندانی روخسـارێکی نـوێ و مرۆییانـە لـە سـتالین دەڕەخسێنێ. لەو کۆنگرەیەدا وێڕای پشتڕاستکردنەوەی گشتیی ئەو پاکسازییانەی، کە کراون و پێداگرتنەوە لە سەر ئەوەی کە ئەو کەسـایەتییە پایەبـەرزە حیـزب و دەوڵەتیانـەی، کـە لـەو پاکسازیانەدا تیرەباران کران "داخ و کەسەر بۆ هێندێ هەڵـە و زێـدەڕەۆییش دەردەبـڕدرێ." و ستالین پێدا دەگرێتەوە لە سەر ئەوەی کە قەرەبووی ئەو کەسانە بکرێتەوە، کـە بـە نـاڕەوا لـە حیزب وەدەرنراون و کاروباری دەوڵەتی‌یان لێ ئەستێندراوەتەوە. ئەو سـەرژمێرییەی، کـە لـەو کۆنگرەیەدا لە سەر ئەندامانی حیزبی بڵاو بۆتەوە لە چـاو سـەرژمێریی کـۆنگرەی حەڤدەهـەم قووڵایی و بەربڵاویی ئەو پاکسـازییانە دەردەخـا، کـە لـەنێوان ئـەو دوو کۆنگرەیـەدا کـراون. لەکۆنگرەی حەڤدەهـەمدا ژمـارەی ئەنـدامانی حیزبـی و پـاڵێوراوانی ئەندامـەتی بـە گشـتی

---

• گۆرین: ناوبراو، باسکراو

2,809,786کەس راگەیەندرابوو. لە حالێکدا ئەو ڕێژەیە لە کۆنگرەی هەژدەهەمدا سەرەڕای ئەوەی کە 400,000 کەسی تازە ببوونە ئەندامی حیزب. کۆی ئەندامانی حیزبی و پالێوراوان لـە 2,470,666 کـەس تێنەدەپـەڕین، بـەراوردی ئـەو دوو ژمارەیـە بـە لەبـەر چـاوگرتنی ئەندامانی نویێ ئەوە نیشان دەدا، کە زیاتر لە حەوتسەد وپەنجا هـەزار کـەس لـە ئەنـدامانی حیزبی وەبەر پاکسازی کەوتبوون. لـە ئاخافتنەکـەی سـتالین لـە کـۆنگرەی هـەژدەی حیزبـدا گرینگییەکی تایبەتی درابوو بە پرسـی پێوەندیـدار بـە سیاسـەتی دەرەکـی و گۆڕانـەکان لـە ئەورووپادا، بەڵام سەرەڕای هەوڵی لیتۆینۆف بۆ نزیك بوونەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی لە ڕۆژئاواو پێك هێنانی بەرە لەگەڵ بەریتانیاو فەڕەنسـا لەگـەڵ ئـەڵمانی هیتلەریـدا، سـتالین راسـت بـە پێچەوانەی بۆچـوونی وەزیـری دەرەوەی خـۆی جووڵایـەوە و لـە ئاخافتنەکەیـدا لـە کـۆنگرەی هەژدەیەمدا هێرشی کردە سەر بەریتانیا و فەڕەنسـا، کـە بەقسـەی وی هـەوڵیان دەدا کەشـی سیاسی بشێوێنن و بەبێ هیچ بنەمایەك دووبەرەکی بخەنە نێو ئەڵمانیاو یەکێتیی سۆڤیەتییەوە.

قسەکانی ستالین لە کۆنگرەی هەژدەیەمدا چرایەکی سەوز بوو بـۆ هیتلـەر. ریبـێن تـرۆف وەزیر دەرەوەی هیتلەر بە جوانی لەو ئاماژەیە تێگەیشت، و ئامـادەبوونی ئالمانیـای بـۆ واژۆی پەیمانی دۆستایەتی و دەسـتدرێژیینـەکرن بـۆ سـەر یـەکێتیی سـۆڤیەتیی دەربـڕی. لەمپـەری سەرەکیی ئەو نزیکبوونەوەیە لیتۆینۆف وەزیری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی بوو، کە ستالین لە سەرەتای مانگی مای 1939دا لـە سـەر کـاری لابـرد و مۆلۆتـۆف، کـە هـەروا سـەرۆکی وەزیرانیش بوو کردە بەرپرسی کاروباری دەرەوە و دانوستان لەگەڵ ئەڵمانییەکان. دانوستانەکانی نێوان مۆلۆتۆف و ریبێن ترۆف زوو بە ئاکام گەیشتن و رۆژی 23ی ساڵی 1939 پەیماننامەی دەساڵەی دۆستایەتی و دەسـتدرێژی نـەکردن بـۆ سـەریەکتری لـە نێـوان ئـەڵمانیاو یـەکێتیی سۆڤیەتیدا بەسترا. و ئاگری شەڕی دووەمی جیهانی هەڵایسا.

بە پێی پەیماننامەیەکی نهێنی، کە لە کاتی بەستنی پەیمانی دەسـتدرێژی نـەکردن لـەنێوان ئەڵمانیاو یەکێتیی سۆڤیەتیدا بەسترابوو هێزەکانی یەکێتیی سـۆڤیەتییش بـە دوای هێزەکـانی ئەڵمانیادا سـنوورەکانی رۆژهـەڵاتی پۆلۆنیایـان بـڕی و چـوونە نێـو پۆلۆنیـا. رۆژی بیسـت و هەشتەمی سێپتەمبەر هێزەکانی ئەڵمانیاو یەکێتیی سۆڤیەتی لە پایتەختی پۆلۆنیا رێککەوتن و بە پێی ئەو پەیمانە نوییەی، کە لە نێوان هـەر دوو وڵاتـدا بەسـترا و ناویـان لـێنـا پـەیمانی دۆستایەتی و دیاریکردنی سنووری نێـوان ئـەڵمانیا و یـەکێتیی سـۆڤیەتی سـنووره تازەکـانی دووولات لە ناخی پۆلۆنیادا دەسنیشان کران.

بە شوێن دابەشینی پۆلۆنیا بەسەر دوو وڵاتی داگیرکەردا، سێ وڵات بچووکی لێواری خۆرئاوای دەریای بالتیك واتە لیتوانی و ستۆنی لەلایەن سەربازانی لەشکری سوورەوە داگیرکران و ستالین هەر بەو لۆژیك و بیانووەی، کە هیتلەر وڵاتی نەمسای خستە سەر ئەڵمانیا سێ وڵاتی لێواری بالتیکی بە فەرمی خستە سەر وڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتی.

بۆ ئەوەی کە لە مەبەستی ستالین سەبارەت بەبەستنی پیمانی دۆستایەتی و دەستدرێژی نەکردنەسەر یەکتر لەگەڵ ئەڵمانیا و هێرش بۆ سەر پۆلۆنیا و لکاندنی وڵاتانی لێواری بالتیك بە یەکێتیی سۆڤیەتییەوە تێبگەین بێجێ نابێ ئەگەر چەندلاپەڕەیەك لە ژیاننامەی فەرمیی ستالین، کە بۆ ئەو بابەتە تەرخان کراوە بخوێنینەوە:

دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی هەوڵی دەدا نەهێڵێ کەوشەنی شەڕ لەوە هەراوتر بێتەوە و بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی ئاسایشی گشتی خەباتی دەکرد، بەڵام ئەو سیاسەتە لەلایەن کۆڕ و کۆبوونەوەکانی بەریتانیاو فەڕەنساوە پشتیوانیی لێ نەکرا. سیاسەتی خۆبواردن لە دەستێوەردانی مۆنیخ گران لە سەر وڵاتانی پەلامارنەدەر(غیر متجاوز) وەستا. هەر لەمانگی مارسی ساڵی 1939دا ئەڵمانی هیتلەری بە کەڵکوەرگرتن لەخەمساردیی دیپلۆماتیکی بەریتانیا و فەڕەنسا وڵاتی چیکوسلۆڤاکیای داگیر کرد و بە دوای ئەوەدا هێرش بۆ سەر وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیدا دەستی پێکرد. هەڵوێستی دیپلۆماتیکیی بەریتانیا و فەرەنیا بەرامبەر بە یەکێتیی سۆڤیەتیی ناشەرافەتمەندانە بووە... بۆ بەستنی پەیماننامە کۆمەڵە مەرجێکیان لەبەردەم یەکێتیی سۆڤیەتیدا دەنا، کە بۆ قەبوولکردن نەدەبوون. کاتێك حکوومەتی یەکێتیی سۆڤیەتی دیتی بەریتانیا و فەڕەنسا حەزیان لێ نییە بەمەبەستی ئاشتی هاریکاریی بکەن ناچار بوو بۆ دابینکردنی ئاسایشی وڵاتەکەمان هەنگاو بنێ.

لە مانگی ئووتی 1939دا دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی سۆسیالیستی پەیمانی دەستدرێژی نەکردنە سەریەکتریی لەگەڵ ئەڵمانیا بەست. ئەو پەیمانە هەروەکی دواتر هاوڕێ ستالین ئاماژەی پێکردنە، ڕاستەوخۆ و نە ناڕاستەوخۆ هیچ زیانێك بە سەروەریی وڵاتەکەمان ناگەیەنێ، بەڵام لە کاتێکی زۆر نزیکدا ئاشتییەکی خێرای بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی دابین دەکرد و بواری بۆ ئەوە خۆش دەکرد، کە ئەگەر هێرشی کرابایە سەر، ئەوا یەکێتیی سۆڤیەتی ئامادە بوایە بۆ دەستکردنەوە.

لە پاییزی 1939دا بە پێی هونەری هاوڕێ ستالین برا بەڕێزەکانمان، واتە نەتەوەکانی ئۆکراینی خۆرئاوا و بلاروسی خۆرئاوا(ڕۆژهەڵاتی پۆلۆنیا) لە ژێر کۆت و بەندی مڵکدارانی پۆلۆنیا ڕزگارییان هات، ئەو نەتەوانەش هاتنە نێو بنەماڵەی یەکگرتوو و برای نەتەوە

ئازادەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی. کەمێك دواتر کۆمارییەکانی لێواری بالتیك، لیتوانی و لیتۆنی و ستۆنی گەڕێندرانەوە نێو باوەشی کۆمارییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیی....

پاش لیتوانی ولیتۆنی و ستۆنی، ستالین کەوتە بیری ئەوەی کە بەشێك لەخاکی فەنلاند بە یەکێتیی سۆڤیەتییەوە بلکێنیٚ، بەڵام مارشال منرهایم ڕێبەری فەنلاند داواکانی ستالینی ڕەتکردنەوە. لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی 1939 دا فڕۆکەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی هێلسینکیی پایتەختی فەنلاندیان بۆردومان کرد و سەبازانی سوور هێرشیان کردە سەر فەنلاند. فەنلاندییەکان لە بەرامبەر هێرشی هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا وەدەست هاتن و زەبری کاریگەریان لێدان، لەلاّم ئاخری پاش سەد ڕۆژ شەڕ لە بەرامبەر هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا، کە بەهێزتر بوون پاشەکشەیان کرد و بە پێی پەیمانێکی ئاشتی، کە لە مانگی مارسی 1939 دا لە نێوان هەردوولادا مۆر کرا نزیك بە بیست و پێنج هەزارکیلۆمەتری چوارگۆشە لە خاکی فەنلاند خرایە سەر خاکی یەکێتیی سۆڤیەتی.

ڕۆژی بیست و یەکەمی دیسێمبەرری ساڵی 1939 ستالین جێژنی شێست و نۆیەمین ساڵەی تەمەنی لە تەنیشت سێیەمین ژنی واتە ڕۆزا کاگانۆڤیچ گرت. ڕۆزا خوشکی یەکێك لە هاوڕێیانی نزیکی ستالین بوو بە ناوی لازار کاگانۆڤیچ، کە لە ساڵی 1934 ـەوە سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بوو و پاش ئەوەی خوشکی شووی بە ستالین کرد بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب. ڕۆزا ژنێکی زۆر جوان و ژیر و تێگەیشتوو بوو و هەوڵی دەدا بە بیٚ دەست تێوەردان لە ژیانی تایبەتیی ستالین و پێوەندی گرتن لەگەڵ ژنانی دیکە، بە جوانی کەڵك لەو پێگە و پلەیە وەرگریٚ، کە وەکو هاوسەری ستالین بە دەستی هێنابوو.

لە ماوەی ساڵانی 1940دا لە حاڵێکدا، کە هێزەکانی هیتلەر وڵاتانی خۆرئاوایان داماڵیبوو و یەك لە دوای یەك داگیریان دەکردن دۆستایەتیی نێوان ئەڵمانیاو یەکێتیی سۆڤیەتیی هەروا بەردەوام بوو. لە نۆڤەمبەری ساڵی 1940دا بە دوای پەیمانێکی یەکگرتوویی لە نێوان ئەڵمانیاو ئیتالیاو ژاپۆندا، مۆلۆتۆڤی وەزیری دەرەوەی یەکێتیی سۆڤیەتی بانگهێشتن کرایە بەرلین و هیتلەر لە سەر ڕێگەکانی هاوکاریی نێوان یەکێتیی سیٚ کوچکە و یەکێتیی سۆڤیەتی و دابەشینی جیهان بەسەر ناوچەی ژێر دەسەڵاتدا دواندی. مۆلۆتۆف وەڵامدانەوەی سەرڕاستی بە پێشنیارەکانی هیتلەر، هێشتەوە بۆ گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ و قایلبوونی ستالین. ڕۆژی بیست و پێنجەمی نۆڤەمبەری ساڵی 1940 مۆلۆتۆف مەرجە

پێشنیارییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیی بۆ کەوتنە گەڵ یەکێتیی سێ کوچکە، کە ناوی (تەوەر)ی لێنرابوو دایە دەستی باڵوێزی ئەڵمانیا. ئەو مەرجگەلە بریتی بوون لە دەستەبەر بوونی پوانگەلێك بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی لە ئەورووپاو خۆرهەلاتی ناڤین و خۆرهەڵاتی دوور بە تایبەتی ناسینی ناوچەکانی باشووری قەفقاز واتە ئێران وەك ناوچەی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتی، بەڵام هیتلەر ئەو مەرجگەلەی قبووڵ نەکرد و چەند حەوتوو دواتر رۆژی هەژدەی دیسێمبەری ساڵی 1940 فەرماندا بە بنکەکانی فەرماندەیی هێزەکانی خۆی، کە گەڵاڵەی هێرش بۆ سەریەکێتیی سۆڤیەتی بە ناوی رەمزیی (بارباروسا) ناوبانگی دەرکرد داڕێژن. هیتلەر فەرمانی بە ژەنەراڵەکانی خۆیدا، کە پێویستییەکانی هێرشکردن بۆ نێوەڕاستی ساڵی 1941 ئامادە بکەن.

خرۆشۆف، کە لەو کاتەدا ئەندامی دەفتەری سیاسیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سۆڤیەتیی و سکرتێری حیزب بوو لە ئۆکراین، و بە رێگەی کاگانۆڤیچی ژن برای ستالین و قسەخۆشیی خۆیەوە رێگەی بۆ کۆبوونەوە تایبەتییەکانی ستالینیش کرابۆوە لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا سەبارەت بەو سەردەمە دەنووسێ: ستالین لە پێشڕەوییە خێراکانی هێزەکانی هیتلەر لە ئەورووپادا تۆقیبوو ئەو رۆژەی پاریس هەرەسی هێنا لە کۆبوونەوەیەکدا، کە مۆلۆتۆف و ژیدانێڤ و بەریاش بەشدار بوون بە سەرسووڕماویەوە لە مۆلۆتۆفی پرسیی: چۆن دەبێ ئەوان ئاوا خێرا و راشکاوانە خۆیان بە دەستەوە دابێ؟" هەرلەو کاتەدا ئەڵمانییەکان کۆمەڵە فیلیمێکیان لە شەڕەکانیان ناردبووە یەکێتیی سۆڤیەتی، کە ستالین لە سینەمای تایبەتیی کرێملین سەیریکردن و ئەوەندەی دیکە ئەوی لە هێزی مەکینەی شەڕی ئەڵمانی هیتلەری تۆقاند.

لەمانگی ئاپریلی 10941دا رێکخراوە سیخوڕییەکانی بەریتانیا کۆمەڵە زانیارییەکیان لە سەر لۆجستیکی جەنگیی ئەڵمانیا و بەڕێکردنی هێزەکانی هیتلەر بەرەو رۆژهەڵات وەدەست هێنا و چەرچیل لە پەیامێکی نهێنیدا وریایی دا بە ستالین، کە هیتلەر دەیەوێ هێرشێکی مەزن بۆ سەر یەکێتیی سۆڤیەتی دەست پێ بکا، بەڵام ستالین پێی وابوو، کە چەرچیل گەرەکیەتی کڵاوی لە سەر بنێ و هانی بدا لە شەڕی دژی ئەڵمانیادا ئەو دەستی خۆی رەپێش بخات. چەرچیل بۆ جارێکی دیکەش لەرێگەی باڵوێزی بەریتانیاوە لە مۆسکۆ رێکەوتی گریمانە کراوی هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر یەکێتیی سۆڤیەتیی بە ستالین راگەیاند، بەڵام ستالین دیسانیش ئەو وریاییەی لە گوێ نەگرت و بە جۆرێك، کە خرۆشۆف لە راپۆری نهێنیی خۆی بۆ کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیست وتوویەتی، ستالین نەك هەر گوێی نەدا بەو وریایی و

زانیارییانەی، کە لە سەر چاوەی دیکەوە سەبارەت بە لۆجستیکی جەنگیی ئەڵمانیا دەگەیشتن، بەڵکو لە ئەوانیتریشی شاردنەوە بۆ ئەوەی ڕێبەرانی حیزبی و دەوڵەتی و هێزەسەربازییەکان نەترسێن و ورە بەرنەدەن.

هەر لەو ڕۆژە قەیراناوییانەدا ڕۆژنامە و رادیۆکانی یەکێتیی سۆڤیەتی زیاتر باسیان لە پێشکەوتنەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی ستالیندا دەکرد و سەرژمێرییەکانی ساڵی 1940 یان تاوتوی و تەفسیر دەکرد.

بە پێی ئەو سەرژمێرییانە ئاستی بەرهەمهێنانی پیشەیی و کشتوکاڵی لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا لە ساڵی 1940دا لەچاو دوایین ساڵەکانی حکوومەتی تەزاری بەوشێوەیە بوو:

پازدەملیۆن تەن چێودەن(جۆرەئاسنێکە) واتە نزیك بە پازدە بەرامبەر بەرهەمی چێودەن لە روسیای تەزاری لە ساڵەکانی 1913دا، هەژدە ملیۆن و سێسەدهەزار تەن پۆڵاواتە 4/5 هێندەی بەرهەمی ساڵی 1913، سەد و شێست ملیۆن تەن بەردەرەژوو واتە5/5 هێندەی ساڵی 1913، سی و یەك ملیۆن تەن نەوت 3/5هێندەی ساڵی 1913، سی وهەشت ملیۆن و سێسەد هەزارتەن دانەوێڵە واتە 17 هێندە زیاتر لە ساڵی 1913 و دوو ملیۆن و حەوسەدت هەزار تەن پەمۆی خاو واتە 3/5 ئەوەندە زیاتر لە ساڵی دا1913.

## 2

سەر لە بەیانیی ڕۆژی بیست و دووی ژووئەنی 1941 لە ڕۆژ و کاتی دیاری کراودا، هێزەکانی ئەڵمانیا لە تەواوی سنوورەکانی خۆیانەوە لە خاکی پۆلۆنیادا و هەروەها بە درێژایی سنوورەکانی ڕۆمانیا لەگەڵ سۆڤیەتی و دەریای بالتیکدا، هێرشێکی بەربڵاویان کردە سەر یەکێتیی سۆڤیەتی.

لەو پەلامارەدا، بێجگەلە سوپای ئەڵمانیا، سەربازانی ڕۆژمانی و فەنلاندی و یەکەیەکی سەربازی ئیتالی، شان بە شانی سەربازگەلی ئەڵمانیایی، شەڕیان دەکرد. ڕێکەوتی هێرشی هێزەکانی هیتلەر بۆ سەر روسیا، لەوانەیە هەر بە ڕێکەوت بووبێ، کە هەر ئەو ڕێکەوتە بوو، کە ناپلیۆن هێرشی کردە سەر ئەو وڵاتە. ناپلیۆن ڕۆژی 24ی ژووئەنی 1812 هێرشی کردە سەر روسیا و ڕۆژی چواردەیەمی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ گەیشتە مۆسکۆ. هیتلەر بە دڵنیاییەوە بەهۆی هەبوونی کەرەسەو ئامرازی مۆدێرنی شەڕکردن چاوەڕوان بوو خێراتر سەرکەوێ.

ئەو هێزەی، کە لە هێرشەکەی هیتلەردا بۆ روسیا ئامادە کرا، هەتا ئەوکات لـە مێـژوودا نموونەی نەبوو، ژمارەی سەربازە ئەڵمانییەکان لە سەرەتای ئەو شەڕەدا خۆی لە سـێ ملیـۆن و پێنج سەد هەزار کەس دەدا، ژمارەی تانك (دەبابە)ـە کانیان لە نێوان 15000 هەزار هـەتا 18000دانە و ژمارەی فڕۆکەکانیان نزیك بە دەهەزار دانە بوون بێجگە لەوەش نزیکەی یەك ملیۆن سەربازی پۆلۆنی و فەنلاندی لەو شەڕەدا شان بە شانی سـەربازە ئەڵمانییـەکان شـەڕیان دەکرد. ژمارەی سەربازانی لەشکری سوور لە بەرامبەر هێزە پەلاماردەرەکاندا، زیاتر لە چـوار ملیۆن کەس بوو، بەڵام کەرەسە و ئامرازی شـەڕییان لـە ئاسـتی خـوارەوەتردا بـوو. ژمـارەی تانکـەکانی لەشـکری سـوور لـەم رێکەوتـەدا، لـە دەهـەزار دانـە تێنەدەپـەڕی و هێـزی ئاسمانییەکەشیان لە چاو هێزی ئاسمانیی هیتلەر هەر هیچ نەبوو.

هیتلەر بە پێی عادەت خەتای هەڵایسانی شەڕەکەی خستە ئەستۆی لایەنی بەرامبـەری و لە لێدوانێکدا، کە پاش دەستپێکی هێرشەکە بۆ سەر روسیا، گوتی: روسەکان سەرەڕای ئەوەی پەیمانی دۆستایەتی و هێرش نەکردنە سەر یـەکتریان لەگـەڵ ئـەڵمانیا بەسـتوو، لـە تـەدارەکی هێرشدا بوون بۆ سەر ئەڵمانیا و چەند جارێك هێڵە سنوورییەکانیان بەزاندووە. هەروەها هیتلەر گوتی: سەربازگەلی ئەڵمانی نەك هەر بۆ بەرگری لـە نیشـتیمانی خۆیـان بـەڵکو بـۆ رزگـاری ئەورووپا بە شەڕدێن.

هێزەکانی ئەڵمانیا بەخێرایی لە خاکی روسـیادا پێشـڕەوییان کـرد و لـە کۆتـایی مـانگی یەکەمی شەڕدا زیاتر لە 280/000 هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەی خاکی سۆڤیەتی کەوتـە بەردەستی ئەڵمانییەکان و دەستیان بەسەردا گرت. پێشڕەویی هێزەکانی ئەڵمانیا لە مانگەکانی یەکەم و دووەمی شەڕدا، هێواش تر بۆوە، بەڵام لەو دوو مانگەشدا زیـاتر لـە سێسـەد هـەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیان لە خاکی سۆڤیەتیی داگیر کرد.

گەورەترین سەرکەوتنی ئەڵمانییەکان لە بەرەی باشووری و ناوچەی ئـۆکراین بـوو و گـەورە شاری وەکو کێف (پایتەختی ئۆکراین) و خارکێف و بەندەرەکانی ئۆدێساو سیواستۆپۆل کەوتنە دەست هێزەکـانی مارشـاڵ ڤـۆن رۆنـد شـتاپ vpn Rundstedt هێـزە ئەڵمانییـەکان لـە نێوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەردا لەم بەرەیەوە گەیشتنە شاری رۆسـتۆڤ لـە بـاکووری خۆرئـاوای قەفقاز، بەڵام بەر لەوەی بگەنە ئەو شارە، بەسەر داهاتنی وەرزی سەرما و بەستەڵەك نەیهێشت بەرە و پێش ببزوون.

له بەرەی ناوەندیشەوە، هێزە ئەڵمانییەکان بـە فەرمانـدەرێتیی مارشـاڵ ڤـۆن بـۆك Von bok، پاش گرتنی شارەکانی "سمۆلینسك" و کالینین لـە سـەرەتاکانی ئۆکتۆبـەردا گەیشـتنە نزیك مۆسـکۆ و رۆژی شەشـەمی ئۆکتۆبـەر پـەلاماری گرتنـی مۆسـکۆیان دەسـت پێکـرد. پێشڕەویی هێزە ئەڵمانییەکان لە بەرەی مۆسکۆدا ستالینی تۆقاند. و رۆژی پازدەی ئۆکتۆبـەر، پایتەختی سۆڤیەتی بۆ ماوەی کاتی راگوێزرایە "کۆڤی بیشڤ"، کـە لـە هـەزار کیلۆمـەتریی خۆرهەڵاتی مۆسکۆوە هەڵ کەوتبوو. ستالین هەروەها بەشی هەرە زۆری هێزەکـانی خـۆی لـەم بەرەیەدا بۆ بەرگریکردن لە مۆسکۆ، کۆکردنەوە و لەگەڵ بەسەر داهاتنی وەرزی زستان مۆسکۆ مەترسیی داگیرکرانی لە سەر لاچوو.

له بەرەی باکووردا، هێزەکانی ئەڵمانی، پاش گرتنی وڵاتانی لێواری بالتیـك و دەوروبـەر و دراوسییەتی ئەویِ، لە خاکی روسیادا، هەتا بەندەری لینینگراد چوونە پێشێ، بەڵام سەربازانی سۆڤیەتی لەو بەندەرەدا، بە توندی بەرپەرچیان دانەوە. لینین گراد گەمارۆ درا و لەگەڵ هـاتنی زستاندا، هێرش و پەلامارەکانی هێزە کانی ئەڵمانیا لە دەوروبەری ئەو شارەش راوەستا.

هێرشی بەرپەرچدەرانەی لەشکری سوور لە کۆتاییەکانی نۆڤەمبەردا لە بـەرەی باشـوورەوە دەستی پێکرد و مارشال ڤۆن روند شتات، کە گەورەترین سەرکەوتنەکانی لە شەڕی چوارمانگە لە بەرەی روسیادا دەستبەر کردبوو، لە بەرامبەر گوشاری توندی هێزەکانی سـۆڤیەتیدا، رۆژی بیست و نۆیەمی نۆڤەمبەر فەرمانی پاشەکشەی لە شاری رۆستۆڤ دەرکـرد. رۆسـتۆڤ، کـە بـە دەروازەی قەفقاز ناودەبرا. رۆژی 3ی نۆڤەمبەر کەوتە دەستی هێزەکانی سـۆڤیەتیی و هیتلـەر بە بیستنی ئەو هەواڵە، کە بە یەکەمین بـەزین و پاشەکشـەی سـوپای ئـەو لـە قەڵـەم دەدرا، تەلەگرافێکی پڕ لە تووڕەیی بۆ رۆندشتات نارد و بـەبێ لەبەرچـاوگرتنی پێشـینە و رابـردووی درەوشاوەی ڤۆن رۆندشتات و ئەو پێگـە و خۆشەویسـتییەی لـە نێـو ئەفسـەرانی ئەڵمانیـدا هەیبوو. فەرماندەرێتیی هێزەکانی ئەڵمانیای لە بەرەی باشووری روسیادا، لێئەسـتاندەوە. لـە سەر کار لابردنی ڤۆن رۆند شتات، کاردانەوەیەکی خراپی لە نێـو سـوپا و خـەڵکی ئـەڵمانیادا هەبوو و حەوتوویەك دوای ئەوە، بە پاشەکشێی هێزەکانی ئەڵمان لە بەرەی مۆسکۆدا، هـەوڵی پێشەوا (هیتلەر) بەکردەوە، سەلما.

گەورەترین هەڵەی هیتلەر، یا باشترە بڵێین "هەڵەی هەڵسەنگاندن"ی ئـەو لـە هێـرش بـۆ سـەر روسیادا ئەوە بوو، کە پێی وابوو، دژایەتیی بەریتانیاو ئەمریکا لەگەڵ کۆمۆنیزم، بـوارێکی لـەبارتر بۆ رێککەوتنی ئەو لەگەڵ خۆرئـاوا پێـك دێنـاو یـا لانیکـەم سـتالینی کۆمۆنیسـت و چەرچـیل و

ڕۆزڤێلتی دژە کۆمۆنیست لە دژی ئەو (هیتلەر) ڕێك ناکەون. بە پێچەوانەی تێڕوانین و بۆچوونەکەی ئەو، چەرچیل و ڕۆزڤێلت، سبەینێی هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر ڕوسیا، ئامادەبوونی خۆیان بۆ هاوکاریی لەگەڵ ستالین لە بەرامبەر هیتلەردا دەربڕی. لەبەر ئەوەی کە ئەوان هیتلەریان بە مەترسییەکی گەورەتر و نزیکتر دەزانی و لە سەر ئەو باوەڕە بوون، کە ئەگەر هیتلەر بتوانێ ڕوسیا تێك بشکێناو دەستی بە سەرچاوەی سامانەکانی ئەو وڵاتە ڕابگا، ئیتر هیچ هێزێك باشاری ناکا و ناتوانێ پێش بە زاڵبوونی بەسەر جیهاندا بگرێ . ستالین پێشوازیی لە پەیامەکانی هاریکاری و هاودەردیی چەرچیل و ڕۆزڤێلت کرد و بەدوای ئەودا، سێرستافۆرد کریسپسsir staford crips لەلایەن بەریتانیاوە بۆ بەستنی پەیماننامەیەکی دۆستی و یەکێتیی. بەرەو مۆسکۆ کەوتنەڕێ. بەپێی ئەو پەیمانە، کە ڕۆژی 13ی ژووئیەی 1941 لە مۆسکۆ ئیمزا کرا، بەریتانیاو سۆڤیەتی لە بەرامبەر مەترسیی ئەڵمانیادا دەستیان دایە دەستی یەکتری و گفتیان دا، کە هیچکامیان یەك لایەنە لەگەڵ ئەڵمانیا پەیمانی ئاشتی مۆر نەکەن.

لە سەرەتاکانی مانگی ئوتدا "هاری هۆپکینز"hary Hopkins بە نوێنەرایەتیی سەرکۆمار ڕۆزڤێلت بەرەو مۆسکۆ کەوتە ڕاو پاش دانوستانێك، کە لە نێوان ئەو ستالیندا کرا، ئەمریکا ڕایگەیاند، کە ئامادەیە کەرەسەی سەربازی و شەڕ بۆ سۆڤیەتی بنێرێ. چونکی ئەمریکا هێشتا شەڕی دژی ئەڵمانیا ڕانەگەیاندبوو، یارمەتییەکانی ئەمریکا بۆ سۆڤیەتی بەناوی بەرنامەی "قەرزو ئیجارە" تەواوکردن، کە مەرجەکانی گەلێك سادە بوون. بەپێی ئەو بەرنامەیە، سۆڤیەتیی لە ماوەی یەك ساڵدا، زیاتر لە سێ هەزار فڕۆکە و چوارهەزار تانك و سیهەزار سەیارەی ڕاگواستن و 831000تەن چەك و تەقەمەنی لە ئەمریکاوەرگرت. ئەم کەرەسە و ئامرازانە سەرەتا لە ڕێگەی بەندەری مۆرمانسکەوە بۆ سۆڤیەتیی دەنێردران، بەڵام پاش ئەوەی کە هێزەکانی بەریتانیا و سۆڤیەتی ئێرانیان داگیر کرد، بەشی هەرە زۆری چەك و تەقەمەنییەکان، کە سۆڤیەتی پێویستیی پێیان بوو، لەم ڕێگەیەوە بۆ ئەو وڵاتە بەڕێ دەکران.

هۆکاری سەرەکیی داگیرکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتیی و بەریتانیاوە، ئەوە بوو، کە ئەوان لە ڕێگە و بان و ڕێگەی شەمەندەفەری سەرانسەری ئێران بۆ گەیاندنی چەك و تەقەمەنی و خۆراك و بژێو بە سۆڤیەتی، کەڵکیان وەردەگرت. بیانووی سۆڤیەتی و بەریتانیا بۆ داگیرکردنی ئێران، جموجۆڵ و چالاکیی سیخوڕیی ئەڵمانییەکان لە ئێراندا و هەڕەشەی ئاسایشی ئەوان لەو ڕێگەیەوە بوو. بەریتانیاو سۆڤیەتی، کە لە سەرەتای ساڵی 1941ەوە بۆ داگیرکردنی ئێران دەستیاندا بووە دەستی یەکتری، سەرەتا دەستیان کرد بە زنجیرەیەك

پڕوپاگەندەی رادیۆیی سەبارەت بە جموجۆڵی سیخوڕیی ئەڵمانییەکان لە ئێراندا و ئەو جار لە یادداشتێکی هاوبەشدا، داوایان لە ئێران کرد، کە تەواوی ئەڵمانییەکان لە ئێران وەدەربنێ.

دەوڵەتی ئێران، ئولتیماتۆمی سۆڤیەتی و بەریتانیای سەبارەت بە وەدەرنانی ئەڵمانییەکان لە ئێران بە ناتەباو دژایەتی لەگەڵ سەربەخۆبوونی خۆی لە قەڵەم دا و خۆی لێ بوارد و لە وەڵامی یادداشتی 16ی ئووتی 1941ی ئەو دوو دەوڵەتەدا، پێی لە سەر بێلایەنیی خۆی داگرتەوە، بەڵام سۆڤیەتی و بەریتانیا، کە هاوکات لەگەڵ ناردنی ئەو یادداشتە لە تەدارەکی هێرشی سەربازی بۆ سەر ئێران، دا بوون، وەڵامەکەیان بە قایلکەر نەزانی و سەر لە بەیانیی رۆژی 25ی ئووت (رۆژی سێی خەرمانانی 1320ی هەتاوی) لە باکوور و باشوورەوە هێرشیان کردە سەر ئێران. سوپای سەد و بیست هەزار کەسیی ئێران لە بەرامبەر ئەو هێرشەدا، هەر خۆی نەگرت و سێ حەوتوو دواتر "رەزا شا"ش ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە و ئێران جێبێڵێ.

# 3

رێژەی ئەو زیانە گیانیانەی، کە لە شەڕی سۆڤیەتی لە ساڵی 1941داوە ئەڵمانیا کەوت گەیشتە یەك ملیۆن کەس و راگیرانی بەرەو پێشڤەچوون یا پاشەکشەی سەربازانی ئەڵمانی لە زستانی تووش و سەختی روسیادا، هیتلەری ناچار کرد زیاتر لە پێشوو بۆ سەرکەوتن هەوڵ بدات و خۆی توندوتۆڵتر بکا. لە سەرەتای ساڵی 1942دا هیتلەر خۆی فەرماندەرێتی هەڵمەتی روسیای وەئەستۆ گرت و بنکەی فەرماندەیی خۆی بردە ئۆردوگایەکی سەربازی لە نزیکی ڤینیزتا لە ناخی ئۆکرایندا. هیتلەر لەم هۆردووەوە، راستەوخۆ چاوەدێریی بەسەر هەڵمەتەکانی سەرانسەری روسیادا دەکرد، بەڵام خۆتێهەڵقورتاندنی راستەوخۆ و دەست تێوەردانی لە شەڕدا ئەگەرچی لە سەرەتادا هێندێ سەرکەوتنی دەستە بەرکرد، بەڵام بووە هۆی لێکترازان و تێکشکانی سوپای ئەڵمان. هەتا پێش دەست تێوەردانی راستەوخۆی هیتلەر لە هەرێمە سەربازییەکاندا، فەرماندەکانی سوپای ئەڵمانیا، وێڕای ئەوەی هەوڵیان دەدا فەرمان و بۆچوونەکانی هیتلەریش لەبەر چاو بگرن، دەستیان ئاوەڵا بوو، کە چۆن تاکتیك و فەرمانە سەربازییەکانیان بەڕێوەبەرن، بەڵام دەست تێوەردانی هیتلەر لە وردەکارییەکاندا لە سەرەتای ساڵی 1942ـەوە و فەرمانە نەکردەنییەکانی ئەو بوونە هۆی ناکۆکی بکەوێنە نێوان ئەو و

فەرماندە پایەبەرزەکانی سوپای ئەڵمان و قسەیان لێك هەڵبەزێتەوە. هیتلەر، کە نەدەبوایە کەس قسەی لە قسەیدا بکاتەوە فەرماندە پایەبەرز و لێوەشاوەکانی سوپای ئەڵمانیای، یەك لە دوای یەك لە سەر کار لابرد و پلەی مارشالی و ژەنەراڵییدا بە کۆمەڵێك ئەفسەری کەم ئەزموون و کرچ و کاڵ و لە جێگای ئەوانی دانان، کە ئەم گۆڕانانە، چوارچێوەی سوپای ئەڵمانیان تێك شکاند و لە کۆتایی 1942دا تێك شکان و پاشەکشەی سوپای ئەڵمانیا لە هەموو بەرەکاندا دەستی پێکرد.

لە سەر کار لابردن و ڕەتاندنی فەرماندە پایەبەرزەکانی سوپای ئەڵمانیا، کە بە لە سەر کار لابردنی مارشالڤۆن رۆند شتاتی فەرماندەی هەڵمەتی بەرەی باشووری سۆڤیەتی دەستی پێکردبوو، لە ژووئیەی ساڵی 1942دا بە لە سەر کار لابردنی ڤۆن بوك ی فەرماندەی بەرەی ناوەندی درێژەی هەبوو. لە کۆتاییەکانی مانگی ئووتی هەر ئەو ساڵەدا، کە ژەنەراڵ "هالدر" سەرۆکی بنکەی گشتیی سوپای ئەڵمانیا و داڕێژەری سەرەکیی نەخشەی هێرش بۆ سەر روسیا کۆمەڵە گۆڕانێکی لە تاکتیکی سەربازیی ئەڵمانیادا خستە بەردەم هیتلەر، هیتلەر بە توندی دژی ئەو گۆڕانانە راوەستا، کە دەبوایە لە هێندێ بەرەدا پاشەکشە بکەن و دەستی فەرماندەکان ئاوەڵاتر بکەن.

یەکێك لەو پێشنیارانەی هالدر، کە لەلایەن هیتلەرەوە وەرنەگیرا ئەوە بوو، کە لەبری پێشڕەویکردن لە هێڵی پتەوی بەرگریکردن لە باکووری قەفقاز تا ستالین گرادا، راستەوخۆ هێرش بکەنە سەر قەفقاز. هیتلەر مارشال ڤۆنلیستای کردە فەرماندەی هەڵمەتی باکووری قەفقاز و چونکی لەو بەرەیەدا زۆر بەشێنەیی بەرەوپێش دەچوون، لە فەرماندەرێتی باکووری قەفقازی خست و خۆی بوو بە فەرماندە. ژەنەرال پاولوس paulus لەم هەڵمەتەدا جێگری هیتلەر بوو، کە هیتلەر ئەرکی گرتنی ستالینگرادی بەو ئەسپارد و خۆی گەڕایەوە ڤینیستا. هێزەکانی پاولوس لە سەرەتای سێپتەمبەردا گەیشتنە دەوروبەری ستالینگراد، بەڵام بەهۆی خۆڕاگریی توندی لەشکری سوور و ئەو هەمووە لەمپەر و پێش گێرەوەیەی، کە لە دەوروبەری شار سازیان کردبوون، هەتا مانگی ئۆکتۆبەر نەیانتوانی بچنە نێو شار و لە نێو شاریشدا بە بەربەرەکانێی ماڵەوماڵ و کۆڵانە و کۆڵان، هێزەکانی پاولوس هەتا کۆتایی مانگی نۆڤەمبەر تەنیا نیوەی شاریان گرت. لەشکری سوور لە نیوەی نۆڤەمبەردا لە پشتەوە هێرشیهێنانە سەر و لەبەر ئەوەی کە مەترسیی گەمارۆدرانی هێزەکان لە ستالینگرادا جیددی دیاربوو، ئەفسەرانی بنکەی هیتلەر و پێشنیاریان پێکرد فەرمانی پاشەکشێ لە ستالینگراد دەردەچێ.

هیتلەر ئەو پێشنیارەی وەرنەگرت و فەرمانی دا هێزی پشتیوان بەرێی ستالینگراد بکرێ، بەڵام هێزەکانی لەشکری سوور پێش ئەوەی هێزی پشتیوان بگاتێ گەمارۆی نزیك بە سێ‌سەد هەزار کەس لە هێزەکانی ژەنراڵ پاولوسیان دا و نەیان هێشت هێزی پشتیوانیان بگاتێ. گەمارۆی هێزەکانی ئەڵمانیا لە ستالینگراد نزیك بە دوو مانگی خایاند و لەو ماوەیەدا، زیاتر لە دووسەد هەزار سەربازی ئەڵمانی یا لە شەڕدا یا بەهۆی سەرماو برسێتی تێداچوون و زیاتر لە پەنجاهەزار کەس بە دیل گیران، بەڵام ژەنراڵ پاولوس هەتا کۆتایی ژانویەی ساڵی 1943 بەهیوای کۆتایی هاتنی وەرزی سەرما و سۆڵ و گەیشتنی، هێزی پشتیوان هەر خۆی راگرت و بەربەرەکانێی دەکرد. رۆژی سی30ی ژانویە، هیتلەر لە وەڵامی پەیامیی پیرۆزبایی پاولوس بە بۆنەی دەهەمین ساڵرۆژی بەدەسەڵات گەیشتنیدا پلەی فیلدمارشالێی بە پاولوس بەخشی، بەڵام "فیلد مارشال پاولوس" نەیتوانی پتر لە سێ رۆژی دیکە لە بەرامبەر پەلامار و گوشاری روو لە زیادبوونی لەشکری سووردا بەربەرەکانێ بکا. سەر لە بەیانیی رۆژی دووەمی فێبریوەر پاولوس و 23 ژەنراڵی دیکە لەگەڵ نزیك بە بیست هەزار سەرباز، کە زیندوو مابوون خۆیان بەدەستەوە دا.

ساڵی 1943 ساڵی دەست پێکردنی تێك شکان و پاشەکشێی هەمەلایەنەی هێزە ئەڵمانییەکان لە تەواوی بەرەکاندا بوو. پاش خۆ بەدەستەوەدانی پاشماوەی هێزە ئەڵمانییە گەمارۆ دراوەکان لە ستالینگراد. لەشکری سوور لە تەواوی بەرەکاندا هێرشی هێناو رۆژی 16ی فێبرییە، شاری گەورەی خارکێف لە ئۆکراین لە ئەڵمانییەکان ئەستێندرایەوە.

گەمارۆی شازدە مانگەی لینین گراد کۆتایی پێ‌هات و لە بەرەی مۆسکۆشدا ئەڵمانییەکان زیانی قورسیان وێکەوت و ناچار بوون پاشەکشێ بکەن. لەو پاشەکشە و شکستانەدا هیتلەر بەڵێنی بە خەڵکی ئەڵمانیا دەدا، کە لەگەڵ بەسەر داهاتنی بەهار هێرشی مەزنی هێزەکانی ئەڵمانیا بۆ تێك شکاندنی خۆڕاگریی روسییەکان دەست پێدەکات، بەڵام ئەو هێرشە گەورەیە، جیا لە گرتنەوەی بەشێك لەو شوێنانەی کەوتبوونەوە دەست لەشکری سوور، ئاکامێکی لێ-نەکەوتەوە. لە کۆتایی هاوین و سەرەتای پاییزی ساڵی 1943دا هێرشەکانی لەشکری سوور دەستیان پێکردەوە و ئەڵمانییەکان لە مەودای نێوان کۆتایی سێپتەمبەر هەتا سەرەتای نۆڤەمبەردا، شارەکانی "سولنسێك"و "کیێڤ" و"دنیپر و پێترۆسك"یان لەگەڵ خاکێکی بەرینی بەرەکانی باکوور و باشووری روسیا لە دەست دا.

رۆژی بیست و هەشتەمی نۆڤەمبەری ساڵی 1943، ستالین و چەرچیل و رۆزڤێلت بۆ یەکەمین جار لە تاران چاویان بە یەکتری کەوت. لەو کۆنفرانسەدا، کە هەتا رۆژی یەکەمی دیسێمبەری خایاند، گەڵاڵەی دوایین هێرش بۆ تێك شکاندنی هێزەکانی بەرگریی ئەڵمانیا دارێژرا، کە دەبوایە بە بەرەی دووەمی لە خۆرئاوای ئەورووپا بۆ بکرێتەوە و لەشکری سووریش لە بەرەی خۆرهەڵاتەوە هێرشی مەزن دەست پێبکات. بەپێی ئەو بەڵگە نهێنییانەی دواتر لە جەنگەی دانوستانەکانی تاراندا دەرکەوتن. لەو کۆنفرانسەدا ستالین مەسەلەی سەرچاوە نەوتییەکانی ئێران و وڵاتانی کەنداویشی خستە بەرباس و خوازیاری ئەوە بوو، کە لە سەر دابەشینی ئەم سەرچاوانە رێك کەون، بەڵام چەرچیل گوتی: کاتی هێنانە بەرباسی ئەو مەسەلەیە نییە و مەسەلە ئابوورییەکانی جیهان دەبێ بەگشتی لە پاش کۆتایی شەڕدا تاوتوێ بکرێن.

گەورەترین سەرکەوتنێك، کە لە کۆنفرانسی تاراندا بە ستالین بڕا، ئەوە بوو، کە لە رۆزڤێلت نزیك بۆوە و متمانەی ئەوی بۆلای خۆی راکێشا، کە لە ماوەی کۆتایی شەڕ و کۆنفرانسی یالتادا، دەرەنجامەکانی ئەو لێك نزیکبوونەوەیە دەرکەوت.

رۆز ڤێلت لە بەهاری 1942ـەوە پێخۆش بوونی خۆی بۆ دیتنی ستالین ئاشکرا کردبوو و لە سەرەتای ساڵی 1943ـەوە بۆ پێکهاتنی کۆنفرانسی تاران پێداگریی دەکرد، بەڵام ستالین تایبەتیی رێکەوتی پێکهاتنی کۆنفرانسەکەی وەدواخست بۆ ئەوەی سەرکەوتنی پتر لە شەڕی گەڵ هیتلەردا دەستەبەر بکا و لە پێگەی بەهێزییەوە رێبەرانی ئەمریکاو بەریتانیا بدوێنێ. شوێنی پێکهاتنی کۆنفرانسەکەش، لە سەر پێشنیاری ستالین و پێداگریی ئەو بۆ ئەوەی لە جەنگەی شەڕدا زۆر لە وڵاتی خۆی دوور نەکەوێتەوە، هەڵ بژێردرا و بە کورتی کاتێك رێبەرانی ئەو ساوڵاتە گەیشتنە تاران، رۆزڤێلت لە سەر پێداگریی ستالین لە باڵوێزخانەی سۆڤیەتی مایەوە و لە بەر ئەوەی کە، باڵوێزخانەکەی سۆڤیەتی و بەریتانیا، کە لێك نزیك بوون. بۆ گیرانی کۆنفرانسەکە دیاری کرابوون و هاتووچۆی رۆزڤێلت لە نێوان باڵوێزخانەی ئەمریکا و ئەو دوو باڵوێزخانەیەدا، بە باش نەزانرا.

دیارە رۆزڤێلت دەیتوانی لە باڵوێزخانەی بەریتانیاشدا بمێنێتەوە، بەڵام لە سەر پێداگری و سوور بوونی ستالین ئەوێی هەڵبژارد و ستالین لە راستیدا بەو کارەی بە تیرێك لە دوو کێلی دا، واتە هەم نەیهێشت چەرچیل و رۆزڤێلت وێککەون و چەرچیل لە گوێی بخوێنێ و هەم ئەوەی کە بە پێوەندیی بەردەوام لەگەڵ رۆزڤێلتدا و راکێشانی سەرنج و متمانەی ئەوە دەراوی خۆش کرد بۆ پلان و نەخشەکانی خۆی لە کۆنفرانسی یالتادا.

ناردنی چەك و تەقەمەنی و ئامراز و كەرەسەی راگواستن و بژێو لە ئەمریكاوە بۆ سۆڤیەتی لە پاش چاوپێكەوتنی رۆزڤێلت و ستالین لە تاران، دوو هێندە زیادی كرد و بەپێی ئەو بژاردنانەی، كە لە كۆی ئەو یارمەتییانەی لە شەڕی دووەمی جیهانیدا بڵاو بوونەتەوە، ئەمریكا لەو ماوەیەدا، شازدە ملیۆن تەن چەك و تەمەقەنی، نزیك بە پێنج سەد هەزار لۆری، زیاتر لە دەهەزار ماشێنی شەڕ، زیاتر لە سی هەزار مۆتۆر سیكلێت، نزیك بە سێ هەزار ئامرازی راگواستنی تۆپخانە، نزیك بە دوو هەزار شەمەندەفەری هەڵمی، زیاتر لە پەنجا شەمەندەفەری دیزێل، دەهەزار تەن گۆشتی كۆنسێرڤ كراو و شەكر و كەرە، بۆ سۆڤیەتی بەڕێ كران، كە بەشی هەرە زۆری لە رێگەی ئێرانەوە بەڕێی سۆڤیەتی كران.

لە مەودای نێوان پێكهاتنی كۆنفرانسی تاران و دووەمین كۆنفرانسی رێبەرانی هاوپەیمانەكان "متفقین"دا، كە لە فێبریوەری ساڵی 1945لە یالتا گیرا، هێزەكانی سۆڤیەتی توانیان سوپای هیتلەر بە تەواوی لە سەرانسەری خاكی سۆڤیەتی وەدەرنێن و دەسبەسەر ئەو وڵاتانەش دابگرن، كە هیتلەر لە ئەورووپای خۆرئاوا گرتبوونی، لە بەرەبەرەی گیرانی كۆنفرانسی یالتادا هێزەكانی سۆڤیەتی سەرانسەری پۆلۆنیایان گرتەوە و گەیشتبوونە سنوورەكانی خۆرهەڵاتی ئەڵمانیاو لە باشووری ئەم بەرەیەوە هەتا ناخی هەنگاریا چووبوونە پێش و بوداپێستیان گەمارۆدا بوو. لە وەها لە هەلومەرجێكدا ستالین دەیتوانی لە پێگەیەكی بەهێزترەوە لە چاو ئەو پێگەی لە تاران هەیبوو، قسە بكا، و قسەی خۆی بەرێتە سەرێ. هەڵبژاردن و دیاریكردنی شوێنێك لە خاكی سۆڤیەتیدا بۆ بەستنی دووەمین كۆنفرانسی رێبەرانی هاوپەیمانەكان (متفقین) خۆی نیشانەی بەهێزتر بوونی ستالین بوو بەر لە یالتا شوێنگەلێكی دیكە لە سكۆتلەند و ئاتێن(ئەسینا) و قیبرس و مالت و میسر و تەنانەت بیت المقدس بۆ گیرانی كۆنفرانسی دووەمی رێبەران پێشنیار كرابوو، بەڵام ستالین بە بڕ و بیانووی جۆراوجۆری وەك سەفەركردن بە فڕۆكە بۆ تەندروستیی ئەو خراپە، ئەو پێشنیارانەی رەتكردنەوە و ئاخری رۆزڤێلت و چەرچیلی قایل كرد لە لە یالتا كۆنفرانسەكە بگرن.

# 4

كۆنفرانسی یالتا بەهۆی گرنیگ بوونی بڕیارەكانی لە سەر چارەنووسی جیهان بە گرینگترین رووداوی سیاسیی زەمان (سەردەم) ناسراوە، لە ساڵەكانی پاش شەڕی دووەمی جیهانیدا بە

سەدان کتێب بڵاو بوونەتەوە، کە سەرنجراکێشترینیان کتێبێك بەناوی "یالتا یا دابەشینی جیهان" لە نووسینی ئارتۆرکۆنت ی دیپلۆمات و دیرۆکنووسی فەرەنسییە. ئارتۆرکۆنت، کە لە تەواوی سەرچاوەکانی بۆ تاوتوێکردنی مێژوویی، کەڵکی وەرگرتووە، بە وردی هەموو لایەنەکانی لێك داوەتەوە و لە بنی کوولەکەی داوە بۆ وێنە پاش ئاماژە بەو بابەتە، کە ستالین چۆن چاوەدێریی بەسەر هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێبوونی وەڤدەکانی نوێنەرایەتی ساولاّتدا لە سێ جێگە، دەکرد، دەنووسێ:

هەڵبژاردنی شوێنی مانەوەی وەڤدەکانی نوێنەرایەتیی ساولاّت لە بواری تاکتیکییەوە لێك درابوونەوە. ستالین بە ئانقەست وەڤدەکانی نوێنەرایەتیی ئەمریکاو بەریتانیای لە مەودایەکی دوورتردا، نیشتەجێ کردبوون. چونکی ئەگەر ئەوان لە شوێنێك مابانەوە و یا لێك نزیك بوایەن لە ماوەی کۆنفرانس و مەودای نێوان کۆبوونەوەکاندا بەردەوام بیر و رایان دەگۆڕییەوە و لە بەرامبەر سۆڤیەتدا دەکەوتنە بەرەیەکەوە. ستالین نەك هەر بە لێك دوور راگرتنی وەڤدی دوو وڵاتەکە، لێکی دابڕین بەڵکو بە هەڵبژاردنی ڤیلاکەی خۆی لە سەر رێگەی نێوان شوێنی مانەوەی وەڤدی بریتانی و ئەمریکییەکاندا، هاتووچۆکانیشیانی کۆنترۆڵ کرد.

کات و شوێنی کۆنفرانسەکەی یالتاش تەواو لێك درابۆوە ستالین بەخۆ بواردن لە قەبووڵی پێشنیارەکەی رۆزڤێڵت و چەرچیل بۆ بەستنی کۆنفرانسی رێبەران لە دەرەوەی روسیا و ناچارکردنیان بە سەفەرکردن بۆ کریمە و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو، بەر لە گیرانی کۆنفرانس کۆمەڵێك سەرکەوتنی مسۆگەرکردن. سەرکۆماری ئەمریکا و سەرۆك وەزیرانی بەریتانیاو هەلومەرجە نالەبارەی سەردەمی شەڕ و لەبەر چاوگرتنی رێوشوێنە ئاسایشییەکاندا، ناچار بوون بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ رێبەری سۆڤیەتیدا، سەفەر بکەن و ئەم مەسەلەیە بەتایبەتی بەلای رۆزڤێڵتەوە، کە پیرە پیاوێکی نەخۆش و نقوستان بوو، گرینگییەکی تایبەتی هەبوو، بەو شێوەیە تەواوی خەڵکی جیهان لەو هێزو دەسەڵاتە ئاگادر دەبوون، کە ستالین پێیگەیشتبوو و ئالبێر کامۆی نووسەری ناوداری فەرەنسی هەقی بوو، کە ئەو دیمەنە بە "تراژیدیایەکی تەواو" ناو بەرێ.

ستالین کاتی گیرانی کۆنفرانسەکەشی مەبەستدارانە هەڵبژارد. ئەو، هاوینێ، کە ئەمریکا و بەریتانیا بە هۆی هەڵمەتی دابەزاندنی هێز لەنۆرماندی و سەرکەوتنە درەوشاوەکانی بەرەی خۆرئاوا پێگەیەکی بەهێزتریان هەبوو پێشنیاری رۆزڤێلتی بۆ پێك هێنانی کونفرانسی رێبەران رەت کردەوە و خۆی لێ بوارد و کاتی ئەو چاوپێکەوتنەی ئەونده وەدواخست هەتا لەشکری سوور لە بەرەی خۆرهەڵاتدا کۆمە لە سەر کەوتنێکی دەستەبەرکردن و پێشڕەویی هێزەکانی

هاوپەیمانــەکان(متفقین) لــە بــەرەی خۆرئــاوادا بــە هــۆی بەربــەرەکانێی تونــد و هێرشــی بەرپەرچــدەرانەی ئەڵمانییــەکان هێــواشتــر بــۆوە. بــە تایبــەتیی رۆزڤێڵــت لەبەرەبــەری هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریدا لەوانە بوو شێوازێکی توندتر بگرێتە پێش و هەوڵی دەدا بـۆ راکێشانی سەرنج و وەرگرتنی دەنگی ئەمریکییەکان پوانی کەمتر بدا و پوانی پتر وەرگرێ ، لە حاڵێکدا ئێستا رۆزڤێلت لە هەڵبژاردن دەرچووبوو و بــە خــەیاڵی ئاســوودەوە ئامــادە بــوو بــۆ سەرکەوتنی یەکجارەکی هەرچەشنە پوانێك بدا. رۆژی 30ی دیسێمبەری ساڵی 1944 لە لە سەر گیرانی کۆنفرانسی رێبەران لە یالتا بەتەواوی رێککەوتن ستالین رۆژی چوارەمی فێبرییەی بـۆ دەستپێکی کۆبوونەوەکانی کۆنفرانس پێشنیار کرد، چونکی بەو تەدارەکــە جەنگییــەی لەبەرچــاو گیرابوو، کە قەرار بوو لە مانگی ژانوییەدا دەست پێ بکا، پێشبینیی ئــەوەی دەکــرد، کــە هــەتا رۆژی گیرانی کۆنفرانسەکە، وەرشۆ و بەشێکی زۆرلە خاکی پۆلۆنیا دەکەوێتــە دەســت هێزەکــانی لەشکری سوور، و هێزەکــانی یــەکێتیی ســۆڤیەتیی لــە چــاو ئــەمریکاو بــەریتانیا مەودایــەکی کەمتریان بۆ بەرلین دەمێنێ. ئەوە لە باری دیاریکردنی چارەنووسی پۆلۆنیا و داهاتووی ئەڵمانیاوە گرینگیەکی تایبەتی هەبوو. ستالین دەیویست هاوپەیمانانی خۆرئاوایی لە سەر مەسەلەی پۆلۆنیــا بەسەر کاری لە کار ترازاودا بخات و لە خۆڕایی نییە، کە بۆ سبەینێکەی راگەیاندنی رێککــەوتنی یــەکجارەکی لەمــەڕ رێکــەوتی گیرانــی کۆنفرانســی یالتــاوە، کۆمیتــەی لــۆبلینی خــۆی نــاو نا"حکوومەتی کاتیی پۆلۆنیای دیموکراتیك" و مۆسکۆ بۆ رۆژی دوایی بە فەرمیی ناسی.

و بە کورتی ستالین بۆ ئەوەی لەهەموو لایەنێکەوە کاریگەیی لــە ســەر میوانــەکانی خــۆی هەبێ زۆر بە گەرمی و شکۆمەندانە میوانــدارێتیی لێکــردن. ئــەو بــە تایبــەتیی دەیویســیت رۆزڤێلت و هاوڕێکانی بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و هەربۆیــەش کۆشــکی تــەزارەکانی، کــە بەشکۆترین وجوانترین بینای لێواری کرێمــە بــوو بــۆ ئــەوان تــەرخان کــرد. بــۆ میوانــدارێتی لەمیوانان سێزدە تەن خاویار لە سێ فارگۆندا لەمۆسکۆ و باکۆوە برانە یالتا. بۆ چێشت لێنــان و میوانداریێتیکردن لەماوەی کۆنفرانسدا بەرپرسی چێشت لێنەرەکانی کرێملین و بەردەستەکانی، کــە یــەکێکیان هەرمــەنی و پســپۆڕی چێشــتی قــەفقازی بــوو و هــەروەها ئــەوی دیکــە خزمەتکارەکەی کرێملین واتــە "لیڤیــت"، کــە لــە هەڵبــژاردنی باشــترین جۆرەکــانی مــەی و مەشرووبدا پسپۆڕیی هەبوو دیاری کران.

ئارتۆر کۆنت لە سەر ئەو باوەڕەیە، کە باشترین هۆکاری سەرکەوتنی ستالین لە کۆنفرانســی یالتادا جگە لەزیرەکی و فێڵبازیی خۆی، ساویلکەیی رۆزڤێلت بوو. نوسەری فەرنسی لــەزمانی

چەند کەسایەتیی ناوداری سیاسییەوە، کـە ئـەوکات لـە گـەڵ رۆزڤێلـت لـە پێوەندیـدا بـوون دەنووسێ، کە رۆزڤێلت پاش کۆنفرانسی تاران وەها ئاشقی کەسایەتیی ستالین ببوو، کە وریایی و ئاگادارکردنەوەی ئەوانیتر سەبارەت بە پارێزکردن لـە پێوەنـدیی لەگـەڵ سـتالیندا بـە هێنـد وەرنەگرت، و بەتایبەتیی لە بەرامبەر گومان و دڕدۆنگییەکانی چەرچیلدا لـە سـەر ئامـانج و مەبەستەکانی ستالین دژکردەوەی دەنواند. رۆزڤێلت تەنانەت جـارێکی لـە وتووێژێکـدا لەگـەڵ ئیسقۆفی مەزنی نیۆیۆرك یەكێك بوو لە دۆستەکانی ئەو گوتی:" راستییت دەوێ من باشتر لـە ڤینستۆن چەرچیل لەگەڵ ستالیندا رێكدەكەوم، ڤینستۆن ئایدیالیستە لە حاڵێکدا ستالین وەکو خۆم کابرایەکی ریالیستە.... کەوابوو رێککەوتن و لێك تێگەیشتنەکانیشـمان هـەر لـە سـەر بنەمای قەبوولکردنی واقعیەتەکان دەبێ... ئێمە تەنیا ئەوەندە گرفتەمان هەیـە، کـە سـتالین ناچار بکەین بەڵێن بدات، کە سنوورەکانی ئیمپراتۆریای داهاتووی خۆی نەبەزێنێ.

یەکێ لە فێڵەکانی ستالین لە کۆنفرانسی یالتادا ئەوە بوو، کـە لـە یەکـەمین کۆبوونـەوەی کۆنفرانسدا پێشـنیاری کـرد، کـە هـەتا کۆتـایی کۆبوونـەوەکان سـەرۆك کۆمـاری ئـەمریکا سەرۆکایەتیی کۆبوونەوەکانی لە ئەستۆ بـێ، لـە حاڵێکـدا لـە کۆنفرانسـەکاندا وا بـاوە، کـە سەرۆکایەتیی کۆبوونەوە نێودەوڵەتییەکان بە نۆرەن. مەبەستی ستالین لەو پێشنیارە ئەوە بـوو، کە جگە لە راکێشانی سەرنج و متمانەی رۆزڤێلت و دامرکاندنەوەی هەستی خۆپەرەستیی ئەو، زیاترلەگەڵ چەرچیل لێکیان دابڕێ، چونکی رۆزڤێلت وەکو سەرۆکی کـۆنفرانس ناچـار بـوو لـە نێوان دوو وەفدە نوێنەرەکەی دیکەدا رۆڵی بێ لایەنی بگرێتەبەر و تەنانەت بـە پێـی ئـەخلاق ناچار بوو، کە لای ستالین بگرێ لەبەر ئەوەی ستالین خانەخوێ بوو هەم ئـەوەی کـە ئـەوی بـۆ سەرۆکایەتیی کۆنفرانسەکە پێشنیار کردبوو.

کۆنفرانسی یالتا لەوەها کەشێکدا بە سەرکەوتنی ستالین کۆتـایی پـێ هـات. راگەیەنـدراوی کۆتایی کۆنفرانس زیاتر بۆ داهاتووی ئـەڵمانیاو چـۆنێتیی دابەشـینی و یاسـاو رێسـاکانی پێـك هێنانی مەکۆیەکی نـوێ (رێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان) تـەرخان کرابـوو، سـەبارەت بـە داهاتووی پۆلۆنیا ستالین بیر و رای خـۆی لەمـەڕ ناسـینی دەوڵـەتی دەسنیشـانکراوی یـەکێتیی سۆڤیەتی و گۆڕینی سنوورەکانی خۆرهەڵاتی پۆلۆنیا بردەسەراو رێککەوتن لـە سـەر هەڵبـژاردنی حکوومەتی داهاتووی وڵاتانی "رزگار کراولەدەست فاشیزم" لە سەر بنەمایەکی دیموکراتیك هـیچ گەرەنتییەکی لەمەڕ چۆنێتیی هەڵبژاردنی ئازادی ئەو حکوومەتەکانی ئەو وڵاتانە بە دواوە نەبوو.

لە مەودای نێوان کۆنفرانسەکانی تاران و یالتادا دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی بۆ وەرگرتنی پوانی هەڵێنجانی نەوت لەباکووری ئێران سەردانی دەوڵەتی ئێرانی کرد و قەبووڵنەکردنی داخوازیی یەکێتیی سۆڤیەتی لەلایەن ئێرانەوە بووە هۆی ئەوەی کە نێوانیان تێك بچی و پێوەندییەکانیان بشێوێ. بریتانییەکان، کە لە پلانەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیی پاش شەڕ لە ئێراندا نیگەران بوون لە کۆنفرانسی یالتادا مەسەلەی ئێرانیان بە وەبیرهێنانەوەی دەربەستبوونی هاوپەیمانەکان (متفقین) لە سەر گەرەنتیی سەربەخۆیی ئێران هێنایەگۆڕی و ئایدن ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا پێشنیاری کرد، کە لە رێککەوتننامەی پاشکۆی راگەیەندراوی کۆتایی کۆنفرانسدا جەخت لە سەر ئەو مەسەلەیە بکرێتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بنووسرێ، کە پێش لە چوونە دەرەوەی هێزەبیانییەکان لە ئێران هیچ جۆرە گوشارێك بۆ وەرگرتنی پوان نەخرێتە سەر ئەو وڵاتە. مۆلۆتۆف بە توندی دژی نووسرانی وەها شتێك لە رێککەوتننامەکەدا راوەستا و دواجار لە پرۆتۆکۆلی پاشکۆی راگەیەندراوی کۆتایی کۆنفرانسی یالتادا، کە وەزیرانی دەرەوەی بەریتانیا و ئەمریکا و یەکێتیی سۆڤیەتی مۆریان کردووە لە سەر ئێران هەر بەوەندە قایل بوون، کە تێیدا بنووسرێ " هاوڕێیان ئایدن و ستیننیۆس و مۆلۆتۆف لە سەر بارودۆخی ئێران بیر و رایان گۆڕیەوە. وا رێککەوتن، کە بیر و را گۆڕینەوە لە سەر ئەو مەسەلەیە لە رێگەی دیپلۆماتیکەوە درێژە بدرێ."

شەڕ لە ئەورووپادا کەمتر لە سێ مانگ پاش کۆنفرانسی یالتا کۆتایی پێهات و دەریاوان دۆنیتزDoneyiz، کە پاش خۆ کوشتنی هیتلەر بوو بە سەرۆك کۆمار و فەرماندەی گشتیی هێزەکانی ئەڵمانیا، رۆژی حەوتەمی مای ساڵی 1945 پەیمانی خۆ بەدەستەوەدانی بێ مەرج و شەرتی ئەڵمانیای مۆر کرد. لەشکری سوور هەتا کۆتایی شەڕ، پۆلۆنیاو بەشی رۆژهەڵاتی ئەڵمانیا و رۆمانیا و هەنگاریا و چیك و سلۆڤاکیاو بۆلغارستانی داگیر کرد. بەشی هەرە زۆری یۆگوسلاڤیا بەر لە هاتنی لەشکری سوور بە هۆی پارتیزانەکانی کۆمۆنیستی بە فەرماندەرێتیی تیتۆ رزگار و ئازاد کرابوو.

لە ماوەی کۆنفرانسی یالتاو تێکشکانی ئەڵمانیادا رۆزڤێلت سەرۆك کۆماری ئەمریکا توشی خوێن بەربوونی مێشك هات و لە شەوی دوازدەی ئاپریلی 1945دا گیانی دەرچوو. رۆزڤێلت پێش مەرگی، کە راست شێست و سێ رۆژ پاش دەرکرانی راگەیەندراوی یالتا رووی دا وردە وردە تێدەگەیشت، کە لە سەر ستالین و مەبەستەکانی ئەو بۆ پاش شەڕ بەهەڵە چووە.

رۆژی یەکەمی ئاپریلی 1945 (دوازدە رۆژ بەر لە مەرگی ) نامەیەکی تاڵی بـۆ سـتالین نووسی و تێیدا لە سەر سیاسەتەکانی یەکێتیی سـۆڤیەتیی لـە پۆڵۆنیـاو ئـەوەی کـە کـرێملین پەیمانەکانی یالتا دەشکێنێ گلەیی لێ کرد. ئەو راپۆرتانەی، کە لەرۆژانی چوارەم و شەشـەمی ئاپریلدا لە رێگەی هەریمەنی باڵوێزی ئـەمریکاوە لـە مۆسـکۆوە گەیشـتنە واشـنگتۆن و ئـەو زانیارییە نوێیانەی، کە لە سەر بارودۆخی پۆڵۆنیاو رۆمـانی و هـەروەها رێبـازی مۆسـکۆ لـە گەشتیاریی دەرەوەییدا دەدران، رۆزڤێلتیان راچڵەکاند. هەریمەن لەو راپۆرتانەدا نووسیبووی، کە یەکێتیی سۆڤیەتی گەرەکیەتی پشتوێنەیەکی پاراستن بـە هـۆی ئـەو دەوڵەتانـەوە، کـە خـۆی دایمەزراندوونە بـە دەوری خۆیـدا بکێشـێ و تەنانـەت دەیـەوێ تەشـەنە بکاتـە نێـو وڵاتـانی خۆرئاوایی بەتایبەتی فەرەنساو ئیتالیا لـە رێگـەی حیزبـە کۆمۆنیسـتەکانی ئـەو وڵاتانـەوە. رۆزڤێلت پاش لێکدانەوەی ئەو راپۆرتانـە لـە شـەوی دوازدەی ئاپریلـدا بـەر لـەوەی بکەوێتـە ئاویلکەدان دەقێکی تەلەگرافیی بۆ چەرچیل نارد و تێیدا بۆ یەکەمین جار باسی لە پێویسـتیی خۆڕاگرتن و "پتەو بوون" کرد، بەڵام ئیتر هەموو شتێك بۆ ئەو درەنگ ببوو.

پاش مەرگی رۆزڤێلت بە پێی یاسای بنەڕەتیی ئەمریکا جێگرەکەی ئەو واتە ترۆمـەن بـوو بە سەرۆك کۆماری ئەمریکاو چوار مانگ پاش وەرگرتنی ئەو پلەیە بۆ چـاوپێکەوتن لـە گـەڵ ستالین چووە پۆتسـدام.. کۆنفرانسـی پۆتسـدام رۆژی حەڤـدەی ژووئیـەی سـاڵی 1945 بـە بەشداربوونی ستالین و چەرچیل و ترۆمەن دەستی بە کارەکانی کرد. رۆژی بیسـت و پێنجـەمی ژوئیە چەرچیل جێگەی خۆیدا بە ئەتلیی Atlee، چونکی لە ئاکامی هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی بەریتانیادا چەرچیل بە تەواوی ئەو خزمەتانەی، کە لە سەردەمی شەڕدا بە نەتەوەی بەریتانیای کردبوو لە بەرامبەر حیزبی کرێکاردا شکستی خواردبوو و جێگەی خۆیدا بوو بە رێبـەری ئـەو حیزبە. هەڵبەت ئەتلیی لە کابینەی هاوپەیمانیی سەردەمی شەڕی بەریتانیاشدا ئەندام بوو و بە ماوەی شەڕدا دڵپاکانە هاریکاریی چەرچیلی کردبوو.

کۆنفرانسی پۆتسدام زیاتر بۆ باس لە سەر رێککەوتنەکانی یالتـاو شـێوەی بـەڕێوەبردنی و داهاتووی ئەڵمانیا تەرخان کرابوو و ستالین لە بەڕێوە بردنـی رێککـەوتنێکی نهـێنی، کـە لـە کۆنفرانسی یالتادا کرابوو بەڵێنیدا، کە پاش گەڕانەوەی بۆ مۆسکۆ شەڕ دژی ژاپۆن راگەیەنێ. ترۆمەن لە کۆنفرانسی پۆتسدامدا بە ستالینی راگەیاند، کە ئەمریکا دەستی بە بۆمبی ئـاتۆم راگەیوە و لەوانەیە لە دژی ژاپۆن دەکاری بێنێ. کەوابوو شکستی ژاپـۆن لـە شـەڕدا شـتێکی مسۆگەر بوو و ستالین لە بەشداربوون لەو شەڕەدا زیانێکی وێنەدەکەوت.

کۆنفرانسی پۆتسدام رۆژی دووەمی ئووتی 1945 کۆتایی پێهات و یەکەمین بۆمبای ئـاتۆم رۆژی شەشەمی ئوت بەسەر هیرۆشیمادا درا. ئەمریکا دووەمین بۆمبای ئاتۆمی خۆی لە رۆژی نۆیەمی ئـوت بەسەر ناکازاکیدا دا و هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی هەر لەو رۆژەدا دژی ژاپـۆن کەوتنـە شـەڕ. ژاپـۆن پێنج رۆژ دواتر لە ترسی ئەوەی نەکا بۆمبای تری پێدا بـدەن دەسـتی بەردایـەوە و دەوڵـەتی یـەکێتیی سۆڤیەتیی لە بەرامبەر شەڕی پێنج رۆژەی لەگەڵ ژاپۆندا بێجگە لە داگیرکردنـی دوورگـەکانی کۆریـل، ئەو پوانانەی، کە دەوڵەتی تەزاری لە ساڵی 1904دا دابوونی بە ژاپۆن لێـی ئەسـتاندنەوە. پـوانێکی گرینگی دیکە، کە یەکێتیی سۆڤیەتی لەو شەڕەدا بەدەستی هێنا زاڵبوون بوو بەسەر کۆریای باکووریـدا و دانانی دەوڵەتێکی دەستپەروەردەی خۆی.

دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتی لە ماوەی شەڕی دووەم ی جیهانیدا بیست و دوو ملیۆن کەسی کۆ کردەوە. ئەو زیانەی، کە لەو شەڕەدا وەیەکێتیی سـۆڤیەتی کـەوتووە هـەتا بیسـت ملیـۆن کەس بەراورد کراوە، کە زیاتریان خەڵکی سیڤیل بوون.

ستالین، کە هەتا شەڕ تەواو بـوو جلوبـەرگی سـەربازیی لەبـەردا بـوو و فەرمانـدەیی گشتیی هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیی وەئەستۆ گرتبوو، پاش تەواوبوونی شەڕ بە فـەرمی گەیشتە پلەی ژەنەراڵیزم" یـا فەرمانـدەرێتیی گشـتیی هێزەکـان، کـە بـەرزترین پلـەی سەربازییە و هەتا کۆتایی ژیانیشی لە نووسین و راگەیەندراوە فـەرمی و وتارەکـانی و لـە رۆژنامەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بە جێگەی "هاوڕێ ستالین" بە ژەنەراڵیزم ستالین ناویان دێنا. ستالین لە ساڵی 1941 ـەوە پۆستی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی کۆمیسارییای گەل یا سەرۆکی وەزیرانی یەکێتیی سۆڤیەتیی وەئەستۆ گرت و پاش کۆتایی شەڕ وەکو وڵاتانی خۆرئاوایی ئەو ناوەی کردە سەرۆکی وەزیران.

لە کاتی ژیانی ستالیندا لـە رێکەوتـە فەرمییـەکان و لـە لێکدانـەوە سیاسـی و سـەربازییەکانی پێوەندیدار بە شەڕەوە، تەواوی شانازیی ئەو سەرکەوتنانەی، کە لە شەڕدا بە یەکێتیی سۆڤیەتی بڕان لـە لێوەشاوەیی سەربازیی ستالین و توانایی فەرماندەرێتیی ئـەوەوە زانـران، بـەڵام خرۆشـۆف لـە راپۆرتـە نهێنییەکەی خۆیدا بۆ کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی یەکێتیی سـۆڤیەتیی، کـە لـە شـوێنی خۆیدا ئاماژەی پێ دەکرێ ئەو ئەفسانەیەی پووچەڵ کردەوە و گوتی، کە ستالین نەك هـیچ رۆڵێکـی لـە سەر کەوتنەکانی لەشکری سووردا نەبووە بەڵکو هەڵەو دەستێوەردانی بێجێـی ئـەو ملیۆنـان سـەربازی روسیی لەو شەڕەدا بە کوشتن داوە. خرۆشـۆف گـوتی سـتالین نـەك هەڵکەوتەیـەکی بـواری سـەربازی نەبووە، بەڵکو توانایی خوێندنەوەی نەخشەیەکی سەربازییشی نەبووە و شانازیی سـەرکەوتنی لەشـکری سوور هی فەرماندەرانی لێوەشاوە و سەربازانی گیان لە سەر دەسـتی روسـیایە. دەرکـرێ نـاوی دەیـان

فەرماندەی هەڵکەوتەی روسی بێنین، کە لـە شـەڕی دووەمـی جیهـانی و دەسـتکەوتەکانی لەشـکری سووردا ڕۆڵی بەرچاوو کاریگـەریان گێـڕا، کـە لـە نێویانـدا ژوکـۆڤ Zukov و کـۆنێڤ , Konevو ڕۆکۆزۆڤسکی Rokossovsky و مالینۆڤسکی Malinovsky، کە لە قۆناغەکانی کۆتایی شـەڕدا ڕۆڵی گرینگیان گێڕا زیاتر ناویان دەرکردووە.

# 5

ستالین حەوت سال و حەوت مانگ پاش کۆتایی شەڕی دووەم ی جیهانی ژیا. لەو ماوەیەدا زیاترین هەوڵەکانی ئەو لە پێناوی بـە هێزکردنـی ئیمپراتـۆریی نـوێی روسـیا لـە ڕۆژهـەڵاتی ئەورووپاو بەرین و هەراوکردنەوەی دەسەڵات و تەشەنەکردنە نێو ئاسیا تەرخان بوو.

یەکەمین پەیمان شکێنیی ستالین لە پاش کۆتایی شەڕ ئەوە بوو، کە لە شـەش مـانگی دیاری کراودا هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیی لـە ئێـران نـەبردە دەرێ. هـەر وەك دەزانـین دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ قایمکردنی پێگەی خۆی لە ئێراندا شۆڕشێکی چەکداریی لە ئازەربایجان وەڕێخست و نەی هێشت هێزی چەکداری سوپای ئێران بچـێتە سـەرکوتی ئـەو شۆڕشە. جیایی خوازانی ئازەربایجان حکوومەتێکی سەربەخۆیان لە ژێرچاوەدێریی یەکێتیی سۆڤیەتیدا دامـەزرانـد و دانوسـتانەکانی قەواموسـەلتەنە بـۆ چارەسـەریی ئـەو گێچـەڵە (هەڵبەت ئەوە رای نووسەرە) و بردنە دەرێی هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی لـە ئێـران بـە هیچ کوێ نەگەیشت. تەنیا ئاکامێکی، کە لـەو دانوسـتانانە کەوتـەوە، کـە بـە دانـانی باڵوێزێکی نوێ لە لایەن یەکێتیی سۆڤیەتییەوە دانوسـانەکان بـۆ چارەسـەریی کێشـەکان لەتاران درێژەی هەباو لەبەر ئەوەی کە قەواموسەلتەنە کۆمەڵە بـەڵێنێکی سـەبارەت بـە دانی پوانی نەوتی باکووری ئێران بە روسییەکاندا بـوو، دانوسـتانە دوولایەنـەکانیان لـەو بوارەدا ڕێککەوتننامەیەکی سەبارت بە دامەزراندنی کۆمپانیایەکی هاوبەشی نەوتی ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتی لێکەوتەوە، بەڵام پەسند کرانی ئەو ڕێککەوتننامەیە بۆ پێکهـاتنی پەرلمانی داهاتووی ئێران هەڵگیرا. مەرجی بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکانی پەرلمانیش چوونە دەرەوەی هێزەکانی روسیا بوو لە ئێران و روسییەکان بە هیوای وەرگـرتنی پـوانی نـەوتی باکووری ئێران دواجار قایلبوون، کە هێزەکانیان لە ئێران بەرنـە دەرێ، بـەڵام بـە چـوونە دەرەوەی هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی لە ئێران کۆڵەکەکانی ئـەو حکوومـەتـەی، کـە لـە

ئازەربایجان بە یەکێتیی سۆڤیەتی پشتیوانیی لێدەکرد لەرزۆك بوون و بە دوای رووخانی ئەو حکوومەتەدا پەرلمانی ئێرانیش رێککەوتن‌نامەی دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتیی هەڵوەشاندەوە.

مەسەلەی ئێران یەکەمین کێشەی سیاسیی توندی نێوان یەکێتیی سۆڤیەتی و هاوپەیمانانی پێشووی ئەو وڵاتەشی بە دواوە بوو، چونکە ئەمریکاو بەریتانیا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان پشتیوانیان لە سکاڵای ئێران دژی یەکێتیی سۆڤیەتی کردو دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتی ناچار بوو بۆ یەکەمین جار لە ئەنجوومەنی ئاسایش لە مافی ڤیتۆی خۆی کەڵك وەرگرێ. بە چەشنێك ترۆمەن سەرۆك کۆماری ئەو کاتی ئەمریکا لەبیرەوەرییەکانیدا نووسیویێتی، دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی دەیویست لە کاتی هێرشی سەربازیی ئێراندا بۆ ئازەربایجان هێزەکانی خۆی بۆ پشتیوانیکردن لە پیشەوەری بەرێتە نێو خاکی ئێران، بەڵام بە ئۆلتیماتۆمی ترۆمەن بە ستالین، کە ئەگەر یەکێتیی سۆڤیەتی خۆی تێهەڵ قورتێنێ ئەمریکاش هێزەکانی خۆی دەباتە نێو ئێرانەوە، یەکێتیی سۆڤیەتی دەستی لە پشتیوانیکردن لە پیشەوەری هەڵگرت. پێویستە بگوترێ، کە لەو کاتدا ئەمریکا تەنیا هێزی ئاتۆمیی(ناوکی) جیهان بوو و ستالین لە شەڕ لەگەڵ ئەمریکا تۆقیبوو.

لەماوەی ساڵانی 1946 هەتا 1950 یەکێتی یەکێتیی سۆڤیەتی وردە وردە بەسەر وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتدا زاڵ بوو و مۆرە و دەستوپێوەندی خۆی لەو وڵاتانەدا لە سەر کار دانا. لەهەر کام لەو وڵاتانەدا کۆمەڵە بەربەرەکانییەك لە بەرامبەر زاڵبوون و هێژموونیی کۆمۆنیستەکان و لایەنگرەکانیاندا هاتنە گۆڕێ، بەڵام بە هاتنی سوپای سوور ئەو بەربەرەکانییانە هیچیان لێ شین نەبۆوە. لە رۆمانیا بە دەست لە کار کێشانەوەی میشل پادشای ئەو وڵاتە لە دیسێمبەری 1947دا بەربەرەکانی کۆتایی هات و لە چیك وسلۆڤاکیاش بە دەست لە کار کێشانەوەی دۆکتور بنێش لە پۆستی سەرۆككۆماری لە فێبریەی ساڵی1948دا رێگە و دەراو بۆ دامەزرانی حکوومەتێکی کۆمۆنیستی خۆش کرا. لە پۆلۆنیاو هەنگاریاو بۆلغارستان کۆمۆنیستەکان بە گرفتی کەمترەوە بەسەر رەوشەکەدا زاڵ بوون و لە ئەڵمانی رۆژهەڵاتیش هەبوونی بەهێزی یەکەکانی لەشکری سوور لەوێ رێگەیەکی بۆ خۆڕاگری و بەربەرەکانی و دژایەتی لەگەڵ کۆمۆنیستە ئەڵمانییەکان، کە لە مۆسکۆوە هاتبوون نەهێشتبۆوە.

لە ساڵی 1947دا ستالین بە پێك هێنانی (کۆمین فۆرم) یا نووسینگەی زانیاریی حیزبە کۆمۆنیستەکان کەنوێنەرانی 9 حیزبی کۆمۆنیستی ئەورووپایی تێیدا ئەندام بوون هەوڵی دا

زیاتر حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپا بەتایبەتی حیزبی کۆمۆنیستی یۆگوسلاڤیاو حیزبە کۆمۆنیستەکانی فەرەنساو ئیتالیا، کە بە گەورەترین حیزبی کۆمۆنیستی ئەورووپای خۆرئاوایی لەقەڵەم دەدران بخاتە ژێر رکێف و چاوەدێریی خۆیەوە، بەڵام تیتۆ رێبەری یۆگوسلاڤیا، کە بە بێ یارمەتیی لەشکری سوور وڵاتەکەی خۆی ئازاد کردبووو و بە پێچەوانەی رێبەرەکانی دیکەی ئەورووپای رۆژهەڵات خۆی بە قەرزاباری ستالین نەدەزانی بڕیارەکانی کۆمین فۆرمی بەڕێوە نەبردن و لە کۆبوونەوەی 28ی ژووئەنی ئەو رێکخراوەدا لە پراگ لە کۆمین فۆرم وەدەر نرا. وەدەرنانی یۆگوسلاڤیا لە کۆمین فۆرم تەوژمی پرۆپاگەندەی رادیۆ و چاپەمەنییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی و وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتی بە دژی تیتۆ و رێبەرانی تری یۆگوسلاڤیا بە دواوە بوو. تیتۆ و سەرکردەکانی دیکەی حیزبی کۆمۆنیستی یۆگوسلاڤیا لە پێشدا مۆرکی لادەری و دواتر خەیانەت بە ئارمانجی کۆمۆنیزمیان لێدرا و لەبەر ئەوەی کە بە شوێن ئەو رووداوەدا مەیلی سەربەخۆیی لەنێو رێبەرانی حیزبەکۆمۆنیستەکانی وڵاتانی دیکەدا سەری هەڵدا بە فەرمانی ستالین حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای رۆژهەلات بەو مۆرە و لایەنانە پاك کرانەوە، کە ئامادە نەبوون گوێ لە مستی مۆسکۆ بن و هێندێك لە رێبەرانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات وەکو لازلۆ راجك ی رێبەری کۆمۆنیستی هەنگاریاو ترایکۆ کۆستۆڤی رێبەری کۆمۆنیستی بولغارستان و رۆدۆلف سلانسکیی رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی چیك وسلۆڤاکیا لە ماوەی ساڵانی 1949 هەتا 1952 ئیعدام کران. دادگاییکردنی سلانسکی و سێزدەکەسی دیکە لەرێبەرانی حیزبی کۆمۆنیستی چیك و سلۆڤاکیا، کە لە مانگی نۆڤەمبەری ساڵی 1952 لە پراگ بەڕێوە چوو دوایین نموونەی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالین بوو، کە رەنگی دژە جوولەکە و دژە سەهیۆنیستیشی پێوە بوو، چونکی هاوکات لەگەڵ ئەوەدا ستالین خۆیشی دەستی دایە خەباتێکی دژە جوولەکە و ژمارەیەك پزیشکی جوولەکەی تۆمەتبار کردبوو، کە ویستوویانە ئەو و رێبەرانی دیکەی یەکێتیی سۆڤیەتی بکووژن.

گەورەترین قەیرانی پێوەندییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی و خۆرئاوا لە ئاپریلی 1948دا بە گەمارۆدانی بەرلین لەلایەن هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتییەوە و دەستی پێکرد. بە پێی پەیمانی مۆر کراو لە یالتاو پۆتسدامدا بەرلین لە نێوان هێزەکانی چوار وڵاتی یەکێتیی سۆڤیەتیی و ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسادا دابەش کرابوو و وڵاتانی خۆرئاوایی دەیانتوانی بۆ هێنان و بردنی کاڵا و خۆراك و هێزەی ئینسانیی خۆیان لە جادە و رێگەی ئاسنی نێوان بەرلین و ناوچە

داگیر کراوەکانی خۆرئاوا لە خۆرئاوای ئەڵمانی خۆرئاوایی، کە بە نێوەڕاستی ناوچەکانی بـن دەستی یەکێتیی سۆڤیەتیدا تێدەپەڕین، کەڵك وەرگرن، بەڵام بەهۆی ئەو ناکۆکیانەی، کە لە سەر مەسەلەی ئەڵمانیا و شێوەی بەڕێوە بردنـی کاروبـاری بـەرلین کەوتـە نێـوان یـەکێتیی سۆڤیەتی و وڵاتانی خۆرئاواییەوە هێزەکانی سۆڤیەتیی لە سەرەتای ئاپریلی ساڵی 1948دا ڕێگەی هاتوچۆی نێوان بەرلین و ئەڵمانی خۆرئاواییان بەست. دەوڵەت گەلی خۆرئـاوایی بـۆ بەربەرەکانێی ئەو هەنگاوە پردێکی هەواییان لە نێوان بەرلین و ئـەڵمانی خۆرئـاوادا لێـدا و لەماوەی حەڤدە مانگدا، کە گەمارۆی بەرلین درێژەی هەبوو زیـاتر لـە 2343000 تـەن خۆراك و سووتەمەنییان بە ئاسماندا بۆ بەرلین بەڕێ کرد. دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە لـە گوشـار خسـتنە سـەر وڵاتـانی خۆرئـاوایی بەمەبەسـتی ناچـارکردنیان بـۆ پێداچـوونەوە بـە سیاسەتەکانیاندا بەرامبەر بەئەڵمانیا هیچی دەست نەکەوت و بـە پێچـەوانەوە بـووە هـۆی ئەوەی کە ناوچە داگیرکراوەکانی بەردەستیان تێکـەڵ بکـەن و لـە مـانگی مـای 1949دا کۆماری ئەڵمانی فیدراڵ دامەزرێنن ڕۆژی سی30 ی سێپتەمبەری ساڵی 1949 دەستی لە گەمارۆی بەرلین هەڵگرت. حەوتوویەك پاش تەواوبوونی گەمارۆی بەرلین یەکێتیی سۆڤیەتیی حکوومەتێکی سەربەخۆی لە بەرامبەر کۆماری ئـەڵمانی فیـدراڵی (ئـەڵمانی ڕۆژئـاوا) لـە ئەڵمانی ڕۆژهەڵاتدا پێك هێناو ناوی نا کۆماری دیموکراتیکی ئەڵمانیا. دامەزرانی ئـەو دوو حکوومەتە لە ڕۆژهەڵات و خۆرئاوای ئەڵمانیادا بەراییەك بوو بۆ لێکدابڕانی بـە تـەواوەتیی دوو بەشەکەی ئەڵمانیا، کە هەتا ساڵی 1990 ی خایاند.

ڕووداوێکی دیکە، کە لە نیوەی دووەم ی ساڵی 1949دا لە یەکێتیی سۆڤیەتی هاتە پێش تاقیکردنەوەی سەرکەوتوانەی یەکەمین بۆمبای ناوکی(ئاتۆم) و کۆتایی پـاوانخوازیی ئـەمریکا بوو، هەڵبەت چەندین سـاڵی خایانـد هـەتا یـەکێتیی سـۆڤیەتی لـە بـواری چـەك و چـۆڵەوە کەمایەسییەکانی خۆی قەرەبوو بکاتەوە و خۆی بگەیەنێتە ئاستی ئەمریکا.

لەماوەی ساڵی1949دا شەڕی نێوخۆیی چین بە سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان کۆتایی هات و لە سەرەتای مانگی دیسێمبەری هەر ئەوساڵەدا چیانکای شـێك Chianng Kay Sshek سەرۆکی حکوومەتی چینی نیشتیمانی و پاشماوەی هێزەکانی بەرەو دوورگـەی فورمۆز(تـایوان) تێیان تەقاند. زاڵبوون و بە دەسەڵات گەیشـتنی کۆمۆنیسـتەکان لەچـین دەسـەڵات و پێگـەی ستالینی لە جیهاندا بردە سەرتر. هەرچەندە مائۆتسێ تۆنگ ڕێبەری نـوێی کۆمۆنیسـتی چـین خۆی کەسایەتییەکی جیاواز بوو و پاش مەرگی ستالین بەتەواوەتی لە مۆسکۆ دابڕا و تەنانەت

بوو بە دژەدیوی سۆڤیەتی. هەڵبەت ستالین پێش لە سەر کەوتنی کۆمۆنیستەکان لە چین و دوای ئەویش هیچ باوەڕێکی بە رەسەنایەتیی باوەڕە کۆمۆنیستییەکانی ئەوان نەبوو و بە چەشنێك، کە خرۆشۆف لێیگێڕاوەتەوە، کە جارێکی گوتبووی:" کۆمۆنیستەکانی چین دەڵێی توور فەرەنگین، دەرەوەیان سوورە و ناوەوەیان سپییە!" خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ کەستالین جاری وابوو بە "مارکسیستی مارگارینی" ناوی مائۆی دێناومەبەستی لەو دەستەواژەیە ئەوە بوو، کە باوەرە مارکسیستییەکانی مائۆ بێ بنەما و لەرزۆکن.

سەرەڕای ئەوەی کە مائۆتسێ تۆنگ لە سەرەتای حکوومەتەکەیدا پێویستیی بە هاریکاری و یارمەتیی ستالین هەبوو رۆژی شازدەی دیسێمبەری1949 واتە تەنیا حەوتوویەك پاش ئەوەی، کە دوایین پاشماوەکانی "چیانکایشێك" لە چین وەدەر کەوتن بە سەرۆکایەتیی وڤدێکی سیاسی سەردانی مۆسکۆی کرد و پاش چاوپێککەوتن و دانوستان لەگەڵ ستالین لە جێژنێکدا، کە بە بۆنەی حەفتاهەمینساڵڕۆژی لە دایکبوونی ستالین گیرابوو بەشدار بوو و بە دۆستی مەزنی چین ناوی هێنا.

دانوستانەکانی بەستنی پەیمانی دۆستایەتی و یەکگرتوویی نێوان سۆڤیەتی و چین نزیك بە دوو مانگی خایاند و رۆژی چواردەیەمی فێبرییەی ساڵی 1950 لەمۆسکۆ واژۆ کرا. بە پێی ئەو رێککەوتن نامەیە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتیی قایل بوو بەوەی لەماوەی پێنج ساڵدا بڕی سێ سەد ملیۆن دۆلار یارمەتیی ئابووری بداتە چین و لەبەرامبەردا پوانێکی گرینگی سیاسی و ئابووریی لە چین وەدەست کەوت : چەندین کۆمپانیای هاوبەشی چین و سۆڤیەتیی بۆ بەڕێوەبردنی ئەو گەلالانە بەرەو چین رۆیشتن، چین مەغولستانی دەرەوەی، کە لە سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی سۆڤیەتییەوە لەگەڵ سۆڤیەتی لە سەری کێشەیان بوو بەفەرمیی ناسی و ئەوولاتە بوو بە یەکێك لە پاشکۆکانی یەکێتیی سۆڤیەتی.

پاش سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە چیندا ستالین بڕیاری دا، کە ئیمپراتۆرییەکەی خۆی بەرەو رۆژهەڵاتی دوور بەرینتر بکاتەوە و نیوەی باشووریی کۆریاش بە بەشی باکورییەکەیەوە بلکێنێ. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو پلانە سەر لەبەیانیی رۆژی بیست و پێنجەمی ژوئەنی ساڵی 1950 شێستهەزار سەربازی کۆریای باکوور لەحالێکدا، کە بە سەدان تانك (دەبابە)ی روسیی لە پێشیانەوە دەرۆیشتن سنووری هەردوو کۆریایان بەزاند و بە خێرایی بەرەو باشوور کەوتنە رێ. رۆژی بیست و حەوتەمی ژووئەن ترۆمەنی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە فەرمانی دا بە ژەنەراڵ ماك ئارتۆری فەرماندەی هێزە ئەمریکییەکان لە رۆژهەڵاتی دوور، کە بەبێ

راوەستان وەفریای کۆریای باشوور بکەوێ و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانیش داوای لە کریای باکووری کرد کەسەربازەکانی بکشێنێتەوە پشت هێڵی 38 دەرەجەی جوگرافیایی، کە سنووری نێوان هەر دوو کۆریایە، بەڵام کۆریای باکوور بە پشت بەستن بە یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو هەڕەشە و گوڕەشانەی بە هێند وەرنەگرتن لە چوارەمین ڕۆژی هێرش بۆ سەر کۆریای باشووریدا سۆلی پایتەختی ئەو وڵاتەیان داگیرکرد. هێزە ئەمریکییەکان ڕۆژی ڕۆژی 30 ژووئەن گەیشتنە شەڕی کۆریا و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە سەر داوای ئەمریکا بە پێك هێنانی هێزێکی نێونەتەوەیی هاتە سەر ئەوەی کە گێچەڵ و دەستدرێژیی کۆریای باشوور پووچەڵ بکاتەوە.

هێزەکانی ئەمریکاو پازدە وڵاتی دیکەی ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان تەنیا بە کۆتاییهێنان بە دەستدرێژییەکانی کۆریای باکووری و کشاندنەوەی هەتا پشت هێڵی 38 دەرەجە قایل نەبوون بەڵکو هەتا ئەودیو سنووری ئەو هێڵەشیان وەدووکەوتن. ڕۆژی پازدەی سێپتەمبەری ساڵی 1950 هێزە ئەمریکییەکان لە بەندەری ئینچۆن، کە لە کۆریای باکووری هەڵکەوتووە دابەزین و ڕۆژی بیست و یەکەمی ئۆکتۆبەر شاری پیۆنگ یانگی پایتەختی کۆریای باکووریان گرت. سەربازە ئەمریکییەکان ڕۆژی بیستەمی نۆڤەمبەری ساڵی 1950 گەیشتنە ڕوباری یالۆ لە سنووری نێوان کۆریای باکوور و چین و چی وای نەمابوو هێزەکانی کۆریای باکوور بە تەواوی تێدا بچن و بخرێنە سەر هێزەکانی کۆریای باشوور، کە چین لە سەر داوا و پێداگریی سۆڤیەتی هاتە نێو شەڕەکەوە و دووسەدهەزار سەربازی چینی وەك هێزی گیان لە سەر دەست لە ڕووباری یالۆ پەڕینەوە و هێزە ئەمریکییەکان و هێزەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیان ناچار بە پاشەکشێ کرد. ژەنەراڵ مەك ئارتۆر پێداگر بوو لە سەر ئەوەی کە بەهێنانی هێزی حەساوە و تەنانەت بە دەکارهێنانی بۆمبی ئاتۆم بەرپەرچی هێرشی چینییەکان بدرێتەوە و هێرش بکاتە سەر خاکی سەرەکیی چین، بەڵام ترۆمەن ئەو پێشنیارەی لێ وەرنەگرت و ناکۆکیی نێوانیان بووە هۆی لە سەر کار لابردنی ژەنەراڵ مەك ئارتۆر لە فەرماندەرێتیی هێزەکانی ئەمریکا لە کۆریا. ستالینیش هەوای داگیرکردنی کۆریای باشووری لە سەر ی کردە دەرێ و دانوستانەکانی ئاشتی و وەلانانی دوژمنایەتی لە ڕۆژی دەی ژووئیەی ساڵی 1951 ـەوە لە نێوان نوێنەرانی هەر دوو لایەندا دەستیان پێکرد، بەڵام هەتا ستالین زیندوو بوو ئەو دانوستانانە بە ئاکام نەگەیشتن.

دوایین ڕووداوی گرینگی سیاسی لە کاتی زیندووبوونی ستالیندا گیرانی نۆزدە ین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە ئۆکتۆبەری 1952دا بوو. گیرانی ئەو کۆنگرەیە پاش سێزدە

ساڵ راوەستان و گرینگی نەدانی ستالین بە ئۆرگانەکانی دیکەی حیزبی وەك کۆمیتەی ناوەندی، بە گۆڕانێکی گرینگ دەژمێردرا و نیشانەی پلانی نهێنیی ستالین بوون بۆ گۆڕانی نوێ لە سیستەمی ڕێبەرایەتیی وڵاتدا. ستالین لە تەمەنی حەفتاوسێ ساڵیدا بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕەنگی پیری و زورهانیی لێ نیشتبوو ئیتر وەك جاران بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بە تین و گوڕ نەبوو، بەڵام ئامادەش نەبوو لە هیچ کام لە کاروبارە دەوڵەتی و حیزبییەکاندا دەسەڵاتی خۆی بداتە کەسانی دیکە.

هاوکارەکانی ئەو لە حیزبدا زۆربەیان گەنج و کەسانێك بوون، کە خۆی بردبوونییە سەراو لە پۆستە گرینگە دەوڵەتییەکانیشدا کەسانێکی تازەی دامەزراندبوو و مۆلۆتۆف، کە کۆنترین و وەفادارترین هاوڕێی بوو لە ساڵی 1949دا پۆستی وەزارەتی لێ ئەستێندرابۆوە و لە دەفتەری سیاسیی حیزبیشدا وەکو راوێژکارێکی کاروباری دەرەوە کاری پێ دەکرا. ستالین لەشکری سووریشی راستەوخۆ هێنابووە ژێر چاوەدێریی خۆی و پاش رەتاندن و لە سەر کار لابردنی فەرماندە سەربازییە لێوەشاوەکان، کە لە شەڕی دووەم ی جیهانیدا رۆڵێکی گرینگیان گێڕابوو کۆمەڵێك ژەنەراڵی گەنجی هێنابوونە سەرکار و پۆستی وەزارتی بەرگریی بە بۆلگانین ئەسپاردبوو، کە هیچ جۆرە پێشینەیەکی سەربازیی نەبوو.

ستالین لە ساڵانی پاش شەڕدا بە جێگەی ڕێبەرانی کۆنی حیزبی زیاتر گرینگیی دا بە دوو گەنج، کە دەست پەروەردەی خۆی بوون و پلەی باڵای حیزبییشی پێدا بوون. یەکێك لەو جووتە ژیدانۆف بوو، کە لە ساڵی 1943دا کرابووە سکرتێری حیزب لە لینینگراد پێگەیەکی بەرزتر و باشتری هەبوو، بەڵام بە مەرگی کتوپڕی ئەو لە ساڵی 1948دا، کە لە کاتی خۆیدا بوو بە سەرچاوەی گەلێك گومان و دڕدۆنگی کەسی دووەم واتە مالینگۆف، کە ئەوکات چل و شەش ساڵی تەمەن بوو لە سەرووی بەرپرسانی حیزبییەوە دانرا و لە کاتی تەدارەکی کۆنگرەی نۆزدەیەمدا ستالین لە نێو سەری سوورماوی سەرکردە حیزبییەکانی دیکەدا ئەرکی خوێندنەوەی راپۆرتی سەرەکیی کۆنگرەی بە مالینکۆف سپارد. هەتا پێش گیرانی کۆنگرەی نۆزدەیەم هەمیشە ستالین خۆی ئەو ئەرکەی وە ئەستۆ دەگرت و ئێستا بە دەسنیشانکردنی مالینکۆف بۆ راپەڕاندنی ئەو ئەرکە دەیویست بیسەلمێنێ، کە لە بەرپرسانی دیکەی حیزب لە سەر ترە.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ، کە ستالین بەر لە گیرانی کۆنگرەی نۆزدەی حیزب لە زۆربەی سەرکردەکان بە تایبەتی لە مۆلۆتۆف و میکۆیان و ڤۆروشیلۆف بە گومان و دڕدۆنگ

ببوو و له کۆڕی بژاردەکانی لای خۆی دوور خستبوونەوە. بەدگومانیی ستالین لە مۆلۆتۆف زیاتر هۆی چالاکییەکانی هاوسەرە جوولەکەکەی ئەو بوو، کە لە ڕێکخراوێکدا بە ناوی "کۆمیتەی دژە فاشیستی جوولەکە" کاری دەکرد. ئەو کۆمیتەیە، کە لە سەردەمی شەڕدا دامەزرابوو دوای شەڕیش چالاکیی هەر مابوو و مۆلۆتۆف، کە خۆی وەزیری کاروباری دەرەوە بوو چالاکیی ئەو کۆمیتەیە و پێوەندیی بە ڕێکخراوگەلی جوولەکەی ئەمریکییەوە، کە لە سیاسەتەکانی ئەو وڵاتەدا ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو بە باش و بە قازانج دەزانی، بەڵام ستالین، کە لە ساڵانی کۆتایی تەمەنیدا بە توندی لە چالاکییەکانی سەهیۆنیزمی نێونەتەوەیی دڕدۆنگ ببوو کۆمیتەی دژە فاشیستی جوولەکەکانی سۆڤیەتییشی بە مۆرەی سەهیۆنیزم ناوبرد و فەرمانی قۆڵبەستکردنی ئەندامەکانی ئەو کۆمیتەیەی بە تایبەتی هاوسەرەکەی مۆلۆتۆفیشی دەرکرد. ستالین چاوەڕوانیی دەکرد، کە مۆلۆتۆف خۆیشی بڕیاری دەستبەسەر کرانی هاوسەرەکەی پشتڕاست بکاتەوە و جا، کە مۆلۆتۆف ڕای ستالینی سەبارەت بە قۆڵبەست کرانی هاوسەرەکەی پشتڕاست نەکردەوە ئەویشی بەوە تاوانبار کرد، کە سەر بە ئەمریکی و سەهیۆنیستەکانە. میکۆیانیش بە ئاوری مۆلۆتۆفەوە سووتا، بەڵام تۆمەتی ڤۆروشیلۆف، کە کاتی خۆی لە هەمووان بە ستالین نزیکتر بوو لە هەمووان سەیر و سەمەرەتر بوو، چونکی هەر وەکی خرۆشۆف لە ڕاپۆرتەکە نهێنییەکەی خۆیدا بۆ بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی نووسیوە دەڵێ، کە سالین پێی وابوو ڤۆروشیلۆف پێوەندیی بە بریتانییەکانەوە هەیە و سیخوڕی بۆ ئەوان دەکا.

بە ڕواڵەت بەریا، کە لەو کاتەدا وەزارەتی نێوخۆی بەدەست بوو بە هۆی دەست و پێوەندەکانییەوە لە وەزارەتی زانیاریی دەوڵەتیدا بەڕێوەبەری پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەتیش بوو لە دڕدۆنگکردنی ستالین لە ڕێبەرانی کۆنی حیزب، ڕۆڵێکی کاریگەریی هەبوو. ئەو، کە خۆی خولیای ئەوەی لە سەردا بوو جێگەی ستالین بگرێتەوە هەوڵی دەدا تەواوی ئەو کەسانە لابەرێ، کە لەوانەیە ببنە جێ نشینی ئەو، بەڵام لە نێو خوازیارانی جێنشینیی ستالیندا لایەنگریی لە مالینکۆف دەکرد، چونکی ئەوی پێ لە هەمووان لاوازتر بوو و پێی وابوو دواتر بە سانایی دەتوانێ لە سەر ڕێگەی خۆی لابەرێ.

ئەو کات لە نێو ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا کەسێك، کە هیچ کەس پێی وانەبوو کەمترین شانسی هەیە بۆ ئەوەی جێگەی ستالین بگرێتەوە خرۆشۆف بوو. خرۆشۆف، کە کە بە یارمەتیی کاگانۆڤیچ سەرەتا لە ئۆکراین کرایە سکرتێری حیزب و دواتر بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب زیاتر بە پسپۆڕێکی بواری کشتوکاڵ ناسرابوو،

بەڵام لە کۆنگرەی نۆزدەیەمدا ستالین ئەرکی ئامادەکردن و خوێندنەوەی راپـۆرتی رێکخسـتنی حیزبی بەو سپارد. خرۆشۆف لەو راپۆرتەدا گوتی، کە ژمارەی ئەندامانی حیزبـی کۆمۆنیسـتی سۆڤیەتی لە مەودای نێوان کۆنگرەی هەژدەیەمدا هەتا کۆنگرەی نۆزدەیەم چوار ئەوەندەی زیاد کردبوو و لە شەش ملیۆن کەس تێپەڕیبوو.

لە سەر پێشنیاری ستالین ژمارەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، کە لە کـۆنگرەی نۆزدەیەمدا هەڵبژێردران لە 71 کەسەوە کرلە 125 کەس و 110 کەسیش وەکو پـاڵێوراوی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێران. لە یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیشدا، کە لە رۆژەکانی کۆتایی کۆنگرەدا پێـك هـات سـتالین پێشـنیاری کـرد، کـە ئەنجوومـەنێکی سەرۆکایەتیی بیست و پێـنج کەسـی لـە ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدی لـە جێگـەی یـازدە کەسەکەی دەفتەری سیاسیی پێشوو دانرا. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ ستالین پاشهێنانە گۆڕی ئەو پێشنیارە چـاوەڕوانی ئـەوە نـەبوو، کـە ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدی پەسندی بکەن و لە رووی کوتە کاغەزێکی، کە لە گیرفانی دەری هێنا، نـاوی بیسـت و پێـنج کەسی ئەندامی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی خوێندەوە.

خرۆشۆف لە راپۆرتە نهێنییەکەیدا بۆ کۆبوونـەوەی نهێنیـی کـۆنگرەی بیسـتەمی حیزبـی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا گوتی: ئامانج و مەبەستی ستالین لە هەڵوەشاندنەوەی دەفتەری سیاسی و دانانی ئەنجوومەنێکی بیست و پێنج کەسی لە جێگەکەی ئەوە بوو، کـە پێگـەی ئەنـدامانی پێشووی دەفتەری سیاسی لەرزۆك بکاو وردە وردە کەسانێکی کەم ئەزموون و گوێ لـە مسـتی خۆی بێنێتە سەر کار. خرۆشۆف لێی زیاد کرد، کە هەر لەو یەکـەمین کۆبوونـەوەی کۆمیتـەی ناوەندیدا لە پاش کۆنگرەی نۆزدەیەم ستالین زۆر بە ناشیرینی هێرشی کـردە سـەر مۆلۆتـۆف و میکۆیان و پێی داگرتەوە لە سەر ئەوەی کە دەبێ پیر و پەککەوتەکان جێگە بۆ گەنجەکان چـۆڵ بکەن( هەڵبەت لەو تەمەنی حەفتاوسێ ساڵییەدا ئەو خۆی بە پیر و پەککەوتە نەدەزانی).

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ، کە ستالین لە دوایین مانگـەکانی تەمەنیـدا تـەنیا چوار کەس لە رێبەرانی حیزبی بە دەوری خۆیەوە هێشتبۆوە، کە بریتی بوون لە مالینکۆف و بـەریاو بۆلگانین و خۆی(خرۆشۆف). تەنانەت کاگانۆڤیچیش، کە لە رابـردوودا یـەکێك بـوو لـە مـەحرەمی رازەکانی وی، لەبەر چاوی رەش ببوو و کەمتر بـانگ دەکرایـە کۆبوونـەوە تایبەتییـەکانی سـتالین. مۆلۆتۆف و میکۆیان بە تەواوی وەلا نرابوون و ئەگەر ستالین چـەند مـانگێکی دیکـە ژیابایـە بـێ ئەملاولا لە یەکەمین شەپۆلی پاکسازییە تازەکاندا تێدا دەچوون.

# بەشی حەوتەم

# مەرگی ستالین و ململانێ لە سەر جێگەکەی

سەد رۆژی کۆتایی ژیانی ستالین بە پڕنهێنیترین رۆژەکانی ژیانی حەفتاوسێ ساڵەی تەمەنی ئەو لە قەڵەم دەدرێ و پاش تێپەڕینی زیاتر لە نیو سەدە بەسەر مەرگیدا هێشتا نهێنییەکانی ژیانی سەد رۆژی کۆتایی تەمەنی ئەو و ئەو بیرۆکانەی، کە لە مێشکیدا بوون و بە کورتی چۆنێتیی مەرگی ئەو بە روونی ئاشکرا نەکراون.

دەزانین، کە ستالین لە دوای نۆزدەیەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی شێوازێکی نوێی لە بەرامبەر حیزب و کۆنە هاوڕێیانی خۆیدا هەڵبژارد و بەشێك لە کۆنە سەرکردەکانی حیزبی وەك مۆلۆتۆف و میکۆیان و ڤۆروشیلۆفی تۆمەتبار کرد بە هەبوونی پێوەندییان بە بیانییەکانەوە و تەنانەت بە سیخوڕیکردن بۆ بەریتانیا و ئەمریکاش. گۆڕان لە سیستەمی رێبەریی حیزبی کۆمۆنیست و ئەوەش، کە دەفتەری سیاسیی یازدەکەسیی حیزبی کردە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتییەکی بیست و پێنج کەسی بە رای خرۆشۆف، کە چ لەو راپۆرتەدا، کە بۆ کۆبوونەوەی نهێنیی کۆنگرەی بیستەمی نووسیبوو و چ لە بیرەوەرییەکانیشیدا پێی لە سەر دادەگرێتەوە، بەو مەبەستە بوو، کە پێگە و دەسەڵاتی کۆنە رێبەرانی حیزب لەرزۆك و لاواز بکات و دەراوەکە خۆش بێ بۆ ئەوەی، کە کار و بار بە رێبەرگەلی گەنجتر و گوێ لە مستتر بسپێردرێ. هەروەها بەو شێوەی، کە نیشانەکان دەرێ دەخەن و بێجگە لە خرۆشۆف نووسەرانی دیکەی روسی و پسپۆڕانی کاروباری سۆڤیەتی لە خۆرئاوا لە سەر ی هاوبیر و کۆکن، ستالین لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا بیری لە پاکسازییەکی گەورەی سیاسیی دیکە و گۆڕانێکی دیکە لە

ڕێبەرایەتیی حیزبدا دەکردەوە و ئاشکراکردنی پیلانی پزیشکان لە سەرەتاکانی ساڵی 1953دا پێشەکییەك بوو بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە.

ڕۆژی سێزدەی ژانویەی ساڵی 1953 هەواڵی ئاشکرابوونی پیلانی پزیشکان بە درشتی لە سەر لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی (پراڤیدا)دا چاپ و بڵاو بۆوە و ناوەندی هەواڵدەریی فەرمی سۆڤیەتیی(تاس) یش ڕاگەیەندراوێکی پوختی لە سەر نووسی. ڕاگەیەندراوی تاس و هەواڵی پراڤیدا، کە لە ڕۆژەکانی دواتردا بە تێروتەسەلی و بە بەربڵاوی بڵاوبوونەوە، باسیان لەوە دەکرد، کە دەستەیەك لە پزیشکانی کریملین " لە پێوەندیی لەگەڵ ڕێکخراوی نێونەتەوەیی بۆرژۆوای جوولەکەدا، کە لە لایەن ڕێکخراوگەلی سیخوڕیی ئەمریکییەوە دامەزراوە و لە سەرانسەری جیهاندا چالاکیی سیخوڕی و تێکدەری و تیرۆریستی دەکەن" لە یەکێتیی سۆڤیەتییشدا تۆڕێکی سیخوڕییان پێك هێناوە و دەیانویست ڕێبەرانی حیزب و سوپای سۆڤیەتی لە ڕێگەی داوودەرمانی نابەجێ یا لە ڕێگەی دەرمانداو*کردنیانەوە لەنێوبەرن. تەواوی ئەو پزیشکانەی، کە لەو پێوەندییەدا دەستبەسەر کران، جگە لە سێ کەسیان، هەمووان جوولەکە بوون. ئەو ژمارەیە تۆمەتبار کران بەوەی کە دەیانویست پیلانێکی سەهیۆنیستی دژی ڕێبەرانی سۆڤیەتیی بەڕێوە بەرن و ئەو سێ پزیشکەش، کە جوولەکە نەبوون، بە مۆرەی ئینتالیجنس ی بەریتانیا لەقەڵەم دران.

خاڵێکی گرینگ کە لە ڕاگەیەندراوی فەرمیی سۆڤیەتیدا لە سەر پیلانی پزیشکان نووسرابوو و دەیتوانی ئەو ڕووداوە بەرێتە نێو بەرپرسانی سۆڤیەتیی و بە تایبەتی بەرپرسانی دامودەزگا تەناهییەکانی ئەو وڵاتە، ئەوە بوو، کە بەرپرسانی باڵای ئەو وڵاتە تاوانبار کران بەوەی کە بۆچی لەکاتی خۆیدا ئەو پیلانەیان لە قاو نەداوە و هیچ گومان لەوەدا نییە، کە کەمتەرخەمی و چاوەدێری نەکردنی ئەو ڕێکخراو و ناوەندگەلە دەتوانێ مەترسیی بەردەوامبوونی ئەو پیلان و تێکدەرییانەی بە دواوە بێ. ئەو دەرەنجامەی، کە دەبێ لەو ڕووداوەی وەرگرین ئەوەیە، کە بۆ کۆتاییهێنان بەو پیلان و تێکدەرییانە دەبێ کۆتایی بە کەمتەرخەمی و خەمساردیی ڕێکخراو و ناوەندە بەرپرسیارەکان بهێندرێ."

زمانی ڕاگەیەندراوەکە تەواو ڕو ون بوو و دەریدەخست، کە بەریاو وەزارتی تەناهیی دەوڵەتیی سۆڤیەتی بە خەمساردی و بێ ئاگایی لە ئاشکراکردن و لە قاودانی پیلان لە دژی "

---

* دەرمانداو: ژەهرخواردکردن

ڕێبەرانی حیزب و سوپای سۆڤیەتی" تاوانبار کراون. جەختکردنەوە لە سەر ئامانجی پیلانگێڕان بۆ " لەنێوبردنی ڕێبەرانی حیزب و سوپای سۆڤیەتی" و هێنانی ناوی چەند کەسێك لە ڕێبەرانی حیزبی و فەرماندەرانی سوپا، کە ئامانجی " پیلانی پزیشکان" بوونە، نیشانەیەکی دیکە بوو بۆ ئەوەی، کە ڕووی تۆمەتەکە لە کەسانێکە، کە مەبەست و ئامانجی پیلانگێڕان نەبوونە و لە قۆناغەکانی دواییدا تاوانی هاوکاری و پێوەندی لەگەڵ پیلانگێڕاندا دەخرێتە پاڵیان.

خرۆشۆف لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا بۆ کۆبوونەوەی نهێنیی کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی گوتی، کە ستالین ویستوویەتی تەواوی ئەندامانی کۆنی دەفتەری سیاسی و ئەویش لە نێو بەرێ، بەڵام لە بیرەوەرییەکانیدا تەنیا ئاماژە بە هێندێك لە کۆنە ئەندامانی دەفتەری سیاسی دەکا، کە ستالین لێیان بە گومان بوو و بەتایبەتی پێ لە سەر دڕدۆنگیی لەڕادەبەدەری ستالین لە "بەریا" دادەگرێتەوە. خرۆشۆف دەنووسێ پاش ئەوەی "بەریا" بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب و بە سەر ڕێکخستنی ئاسایشی و پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەتیدا زاڵ بوو، ستالین وردە وردە لێی وەشك کەوت و بە پێك هێنانی وەزارەت- خانەیەکی نوێی تەناهی* و جیاکردنەوەی لە کەوشەنی دەسەڵاتی بەریادا هەوڵی دا، کە دەسەڵاتی بەریا کەم بکاتەوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوە بوو، کە ئاباکومۆف وەزیری تەناهیی حکوومەتی خۆی لە دەست وپێوەندییەکانی بەریا بوو و ئەو ڕاپۆرتگەلەی، کە لە سەر کاروباری تەناهی دەیدانە ستالین پێشەکی بەریا چاوی پێیان دەکەوت.

لە لایەکی دیکەوە ئەندام و بەرپرسانی دامودەزگا تەناهییەکان، کە چەندین ساڵ بوو لە بن دەستی بەریادا کاریان کردبوو، بە گوێیان دەکرد و بە کردەوە لەبەردەستیدا بوون و بە هۆی ئەوەی کە بەریا ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب و لە ستالین نزیك بوو، بێ یەك و دوو بڕیار و فەرمانەکانیان بە جێ دەگەیاند. ستالین دوای ئەوەی کە ئاگاداری پێوەندیی بەریا و ئاباکومۆف بوو، پۆستی وەزارەتی تەناهیی حکوومەتی لێ ستاندەوە و ئیگناتۆفی لە جێگەکەی دانا. ئیگناتۆف بوو بە بەرپرسی بەدواداچوونی پەروەندەی پزیشکان و بە شێوەیەك، کە خرۆشۆف لە ڕاپۆرتەکەیدا بۆ کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی گووتوویەتی، ستالین خۆی چاوەدێریی بەسەر لێکۆڵینەوە لە پزیشکەکاندا کردووە و جارێکی بە ئیگناتۆفی گوتبوو " ئەگەر وای لێ بکەی دانی پێدا بنێ، دەتکەمە تۆزی بانان." لە بەڕێوەبردنی هەر

* تەناهی: پاراستن، ئاسایش

ئەو فەرمانەدا بوو، کە ئیگناتۆف و راسپێراوەکانی ئەو، بە دڕندانەترین شێوە پزیشکە پایەبەرزەکانی سۆڤیەتییان خستە ژێر ئەشکەنجەوە. پرۆفیسۆر " ڤینۆگرادۆف" یان کوت و بەند کرد و چەند پزیشکی دیکەی وەکو کۆگان Koganو ئێتینگێڤ Etingev لە ژێر ئەشکەنجەدا مردن، بەڵام زۆربەی دەستبەسەرکراوان بەرگەی ئەشکەنجەیان نەگرت و هەمووان دانیان بەو تاوانانەدا نا، کە نەیانکردبوون بۆ وێنە دەرمانداو* کردنی ژیدانۆف لە ساڵی 1948دا.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ ستالین بەر لە رووداوی پیلانی پزیشکانیش نەخشەیەکی بۆ تۆمەتبارکردنی بەریاو کوشتنی کێشابوو، بەڵام تێیدا سەرنەکەوت.

رووداوەکە ئاشکراکردنی پیلانێکی جوداییخوازی بوو لە لایەن مینگرێلەکانی گورجستانەوە. مینگرێلەکان لە رابردوودا هاریکاریی تورکانی عوسمانییان کردبوو. بەریاش، کە خۆی لە رەگەزی مینگرێلەکان بوو ماوەیەك راسپێراوی رێکخراوی یەکسانی و سیخوڕی تورکان بوو. زۆر بە ئاسانی دەکرا بەریا بەوە تاوانبار بکەی، کە پیلانی جوداییخوازی مینگرێلەکانی لەبن سەریدا بووە و پێوەندیی بە تورکانەوە هەبووە (هەرچەندە ئەو چیرۆکە لە بنەماوە هەڵبەستراو بوو)، بەڵام بەریا دەستی خۆی رەپێش خست و خۆی کەوتە کوشت و بڕی مینگرێلەکان و هەزاران کەس بێتاوان و داماوی وەك پەز سەر بڕین.

خرۆشۆف دەنووسێ یەکێك لە هۆکارەکانی تۆقینی ستالین لە بەریا ئەوە بوو، کە پێی وابوو تەواوی خزمەتکارەکانی و دەوروبەری و تەنانەت چێشت لێنەرەکانیشی دەست وپێوەندی "بەریا"ن و لە راستیشدا هەر وابوو، چونکی تەواویان پاش وەرگیرانیان لە لایەن دەزگای تەناهییەوە هاتبوونە نێو کریملین و بەریا کەسانێکی بۆ خزمەتکردن لە کریملیندا پاڵاوتبوون، کە تەواو گوێ لە مستی خۆی بوون. خرۆشۆف لە بەشێك لە بیرەوەرییەکانیدا سەبارەت بە هۆکارەکانی تۆقینی ستالین لە بەریاو ئەو مشتومڕەی لێیان پەیدا بوو، دەنووسێ:

"... ستالین وردە وردە لەو شتە ئاگادار بۆوە، کە بەریا دەتوانێ هەرکەسێکی، کە بیەوێ بە یەك ئاماژە و بە بێ هیچ لەمپەرێك لە نێو ببا کەواتە حەزی لێ بێ دەتوانێ هەر کەسی پێ خۆش بێ، شوێن بزری بکاو چووزانی رۆژێکیش ئەو (ستالین) وەبەر ناکەوێ؟ ستالین بە باشی لە تایبەتمەندییەکانی بەریا گەیشتبوو، کە ئەویش وەك خۆی گورجی بوو و دەیزانی، کە بۆ گەیشتن بە ئامانج و دامرکاندنەوەی هەستی زێدەخوازیی خۆی هیچ پرەنسیپێکی ئەخلاقی ناناسێ.

---

* ژەرخواردکردن

لەگەڵ ئەوەشدا ستالین لای کەس نەیدرکاند، کە نیگەرانی بەریایە، هەتا ئەوەی کە شەوێك لە سەر مێزی نانی ئێوارە لە پێش چاوی ئێمە رووی لە بەریا کرد و بە تووڕەییەوە گوتی:" ئەرێ ئەو هەمووە گورجییە چین دەوریان داوم؟؟!". ئاماژەی ستالین بەو خزمەتکار و گارسۆنگەلە بوو، کە هەمووان گورجی بوون. بەریا لەڕێوە لە سەریان هاتە جواب و گوتی:" هاوڕێ ستالین، ئەوانە هەمووان نۆکەری وەفادار و گیان لە سەر دەستی تۆن."

ستالین هەروا بە تووڕەییەوە گوتی واتە گەرەکتە بێژی، کە روسەکان خۆشییان لە چارەم نایە و خۆشیان ناوێم؟!.

بەریا گوتی نا مەبەستم ئەوە نەبوو. دەمویست پێت بڵێم ئەوانەی، کە بۆ خزمەتی بەڕێزتان هەڵبژێردراون هەمووان وەفادار و گیان لە سەر دەستن.

ستالین گوتی:" من ئەو نۆکەرە وەفادارانەم ناوێن. بیانگۆڕن."

ئیتر بەریا هیچی نەگوت و بۆ سبەینێ تەواوی خزمەتکارە گورجییەکانیان لەگەڵ چەند خزمەتکارێکی بەشەکانی دیکەی کۆشکدا گۆڕین. تەنانەت ئەو پاکسازییە ژەنەراڵە چێشتلێنەرەکانیشی گرتەوە و کەسانێکی دیکەیان لە چێشتخانە تایبەتییەکەی ستالیندا دامەزراند".

لەگەڵ ئەوەشدا خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ، کە بەریا هەتا دوایین رۆژەکانی ژیانی ستالین یەکێك بوو لەو دەگمەن کەسانەی، کە رێگەی بۆ دانیشتنە تایبەتییەکانی ستالین ئاوەڵا بوو و ئەگەر ستالین شتێکیشی لە بن سەریدا بایە بۆ ئەو و کەسانی دیکە نەیدەدرکاند. ستالین لە کۆتایی ژیانیدا لە تەنیایی تۆقیبوو و شەوێك نەبوو، کە تاقمێك لە مەحرەمەکانی خۆی بۆ شیوخواردن و مەی نۆشین و گاڵتە و جەفەنگ بانگهێشت نەکا. بەرنامەی شەوانەی ستالین زۆربەیان بە سەیرکردنی فیلیم لە هۆڵی سینەمای تایبەتیی کریملین دەستی پێدەکرد و پاشان بۆ مەی نۆشین و جەفەنگ و سوحبەت لە دەوری یەکتر کۆوە دەبوون و ستالین ئەو دەمانەی، کە کەیف خۆش بوو، فەرمانی دەدا شریتی مۆسیقای گشت بۆ سەما و هەڵپەرکێ باوێنە سەر و لەو جۆرە کۆڕانەدا هەمووانی ناچار دەکردن هەڵپەڕن. خرۆشۆف دەنووسێ هەتا ئەو کاتەی، کە مۆلۆتۆف و میکۆیان لە پێش چاوی رەش نەببوون، باشترین سەماکەرانی کۆڕە تایبەتییەکانی ستالین بوون و، کە دێتە سەر باسی سەماکردنی خۆیشی لە کۆڕە گشتییەکانی ستالیندا دەنووسێ:"، کە من سەمام دەکرد، دەتگوت گایەك لە سەر سەهۆڵ بەلادا دێ." هەروەها خرۆشۆف دەنووسێ : " ستالین پێی خۆش بوو ئەو کەسانە بشکێنێتەوە، کە خۆیان بە بەلاوە گرنگ بوو و چێژی لەوە وەردەگرت، کە لە بەر چاوی خەڵك تەریقیان بکاتەوە و

ئەزیەتیان بکا، بە جۆرێك، کە جارێکی خۆمی ناچار کرد، کە لەبەردەم ڕێبەرانی دیکەی حیزب سەمای ئۆکراینی بکەم، کە سەمایەکی زۆر پڕ جووڵەیە و لەو کاتەدا چێژی لەوە وەردەگرت، کە دەیزانی بەو سەمایە قەڵسم...

میکۆیان، کە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوو تێگەیشت کە، تێکچوومە، بەڵام من پێم-گوت، کە "کاتێك ستالین دەڵێ سەما بکە، مرۆڤی ژیر سەما دەکا!."

شێوخواردنی ستالین، کە مەی خواردنەوەشی لەگەڵ بوو، جاری وابوو هەتا بەرەبەیانیی دەخایاند، چونکی ستالین شەوانە نەدەخەوت و زۆربەی کات هەتا کاتی نیوەڕۆ لە خەودا بوو. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا نووسیویێتی: " هەرکات ئێمە شامان لەگەڵ ستالین خواردبایە ئەو بەر لەمیوانان دەمی لە هیچ شتێکی وەك، خواردن و خواردنەوە و زەلاتە و شتی وا نەدەدا، ئەوەش نیشانی دەدا، کە ستالین چەندە بە گومان و دڕدۆنگ بووە." خرۆشۆف دەنوسێ:" دوایین شەو، کە شیومان لەگەڵ ستالین خوارد، دوایین شەممەی فێبرییەی ساڵی 1953 بوو " ئەو شەوە من و بۆلگانین و بەریاو مالینکۆف لەگەڵ ستالین بووین. پاش سەیرکردنی فیلیمێك لە کریملین بۆ نان خواردن چووینە ڤیلای تایبەتیی ستالین. بە پێی عادەت شیو خواردن هەتا کاتژمێر پێنج یا شەشی بەیانیی درێژەیکێشا. ستالین دوای شیوخواردن زۆری خواردبۆوە و کاتێك ئێمە ماڵ ئاواییمان لێ دەکرد زۆر بە کەیف دیار بوو... سبەینییەکەی یەکشەممە و پشوودان بوو، بەڵام من دڵنیا بووم، کە ستالین دیسان لەکاتی دوانیوەڕۆ یا شەوێ بانگمان دەکاتەوە و هەر بۆیەش هەتا درەنگان شێوم نەخوارد، بەڵام بە پێچەوانەی چاوەڕوانیم هیچ هەواڵێکم لە لایەن ستالینەوە بۆ نەهات، من شتێکم هاویشتە بەردڵم و چووم لێی راکشام. .. هێشتا چاوم نەچووبووە خەو، کە تەلەفۆنەکەم زەنگی لێدا. مالینکۆف بوو و پێی گوتم، کە لێپرسراوانی ئاسایش لە ڤیلای ستالینەوە تەلەفۆنیان کردووە و دەڵێن ستالین شتێکی لێ قەوماوە. خێرا خۆت بگەیەنە ئەواو بەریا و بۆلگانینیشم ئاگادار کردۆتەوە، کە بگەنێ".خرۆشۆف هەروەها دەڵێ:" کاتێك گەیشتینە ئەوێ لێپرسراروانی ئاسایش گوتیان لەبەر ئەوەیکە هەتا کاتژمێر یازدەی شەوێ هیچ هەواڵێك لە ستالین نەبوو ئێمە نیگەران بووین و خاتوو پیترۆنا( خزمەتکاری تایبەتیی ستالین) مان ناردە دیوەکەی. مادام پێترۆنا گەڕایەوە و گوتی هاوڕێ ستالین لە سەر زەوی خەوتووە و وادیار بوو کاتاویستوویەتی لە سەر قەرەوێڵەکەی هەستاوەعەرز کەوتوە. لێپرساوەکان هەڵیان گرتووەتەوە و لە سەر قەرەوێڵەکە رایانکێشاوە."

ئەو خا لە سەر نج راکێشەی نێو چیرۆکەکەی خرۆشۆف، کە لە مەرگی ستالیندا دەیگێڕێتەوە و خوێنەر لە راستگۆییەکەی دەخاتە شك و گومانەوە ئەوەیە، کە دەنووسێ ئێمە ( واتە ئەو و مالینکۆف و بەریاو بۆلگانین) پێمان وابوو باش نییە، کە لەوەها بارودۆخێکی نالەباردا بچینە لای ستالین، هەر بۆیەش بە باشمان زانی هەر بەو شێوەیە لێی گەڕێین تا برێك دێتەوە سەرەخۆی، ! واتە ئەوان لەو قۆناغەدا سەرەڕای ئەوەی کە ستالین حاڵی باش نەبووە دوکتۆرێك بانگ ناکەن و دەگەرێنەوە ماڵی خۆیان هەتا ئەوەی کە مالینکۆف لە نیوەشەوێدا تەلەفۆن دەکاتەوە و دەڵێ، کە لە ڤیلای ستالینەوە خەبەر هاتووە، کە تالین وەزعی شپرێوە و بە سەختی هەناسەی دێتەدەرێ. ئەو جارە جگە لە سێ کەسەکەی پێشوو، کاگانۆڤیچ و ڤۆروشیلۆفیش ئاگادار دەکەنەوە و "چەند پزیشك"یش بۆ چارەسەرکردنی ستالین بانگ دەکەن، کە خرۆشۆف تەنیا ناوی یەکێکیانی بە ناوی پرۆفیسۆر لوکۆمسکی لە بیرە و دەنووسێ :" ئەو بە شێواوی لە ستالین چووە پێشێ و دەتگوت دەست بۆ ئاسنێکی سوورەوەکراو دەبا بەو شێوەیە دەستی گرت. بەریا تێی خوڕی و گوتی :"مەگەر تۆ دوکتۆر نی! بۆ بە جوانی نایپشکنی؟". لوکۆمسکی پاش پشکنینی پزیشکی گوتی دەستی راستی ستالین جووڵەی لێ بڕاوە و دەستی چەپیشی نیوە ئیفلیج بووە. ئەو نەیتوانیوە قسان بکات و لوکۆمسکی دەیگوت پرزەی لێ بڕابوو و تەواو شڕ و شپرێو ببوو. قەرار وابوو ئێمە هەر شەش کەسمان بە نۆرە ئاگامان لێی بێ. مالینگۆف و بەریا پێکەوە بوون، من و بۆلگانین نۆرەی دووەم و ڤۆروشیلۆف و کاگانۆڤیچ نۆرەی سێیەم بووین. ئەو دابەشینە کاری بەریا بوو و نۆرەی چاوەدێریی رۆژی بۆ خۆی و مالینکۆف دانا. .."

گێڕانەوەی خرۆشۆف سەبارەت بە مەرگی ستالین و سەربردەی باری تەندروستیی ئەو لەو چەند رۆژەی ژیانیدا هەر بەردەوام دەبێ. ئەو وێڕای چاوەدێرییە پزیشکییەکان لە ستالین لەو ماوەیەدا و ئەوەی کە بە هۆی خوێن بەربوونی مێشکەوە زمانی نەگەڕاوە و تەنیا بە ئاماژەی دەست و سەر و چاو شتی گوتووە، زیاتر باسی هەڵسوکەوتی قیزەونی بەریای کردووە و دەنووسێ:" پاش ئەوەی کە پزیشکان وتیان ئیتر ستالین هیوای ژیانی لێ ناکرێ و وێناچێ لەوە پتر بژی، بەریا ماهیەتی خۆی نیشان دا و چی قسەی ناشیرن و گاڵتەجاڕانەی لە سەر ستالین بەسەر زماندا دەهات نەیدەگێڕانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەردەگەڵ ئەوەی کە ستالین برێك وەخۆ دەهاتەوە و پێ دەچوو بەرەو باشی بچێتەوە لەبەرامبەریدا کڕنۆشی دەبردن و دەستەکانی ماچ دەکردن!". خرۆشۆف هەروەها دەنووسێ:"، کە ستالین گیانی دەرچوو بەریا لەرێوە سواری ماشێنەکەی خۆی بوو و رۆیشت بۆ ئەوەی پلانە شەیتانییەکانی خۆی جێبەجێ بکا. بێجگە لە

خرۆشۆف تەنیا شایەتی مەرگی ستالین، کە سەبارەت بە چۆنێتیی مردنی ئەو قسەی کردوون سۆتلانای کچێتی. ئەوەی سۆتلانا نووسیونی تاڕادەیەك قسەکانی خرۆشۆف پشتڕاست دەکەنەوە و، چونکی کۆمەڵێك خاڵی سەرنجڕاکێشی دیکەی دوایین رۆژەکانی ژیان و چۆنێتی مەرگی ستالینی لەخۆ گرتووە بێ جێ نییە، کە لێرەدا بەشێکی بێنینەوە.

سۆتلانا لە یەکەمین نامەیدا لە کتێبی "بیست و یەك نامە بۆ هاوڕێیەك"دا پاش پێشەکییەك لە سەر ئەوەی کە هەواڵی نەخۆشبوونی باوکییان چۆن پێی دا و چۆن خۆی گەیاندە هاوینە هەوارەکەی باوکی لە کۆنتسۆڤ، دەنووسێ:

لە تالارێکی گەورەدا، کە باوکمیان درێژ کردبوو خەڵکێکی زۆر کۆببوونەوە. ئەو پزیشکە نەناسراوانەی، کە بۆ یەکەمین جاریان نەخۆشەکەیان دەدی بە ترسەوە دەچوونە ژوور سەری ( ئاکادمیسین ڤیناگرێ دۆف، کە چەندین ساڵ پزیشکی چاوەدێری بوو لەو کاتەدا لە بەندیخانە بوو) زەروویان بە پشت و ملی نەخۆشەوە دەنا و دەیانخستە ژێر دەزگای کاردیۆگراف، وێنەیان لە سییەکانی هەڵدەگرت و پەرستارێك بەردەوام دەرزیی لێدەدا و پزیشکێك چۆنێتی باری نەخۆشینەکەی بەردەوام لە دەفتەرێکدا یادداشت دەکرد. چاوەدێرییەکان زۆر بە باشی بەڕێوە دەچوون. تەواوی کەسایەتییە پزیشکییەکان هەوڵیان دەدا ژیانی بوونەوەرێك رزگار بکەن، کە ئیتر هیچ هیوایەك بە رزگاربوونی نەبوو.

لە ئاکادیمیای زانستە پزیشکییەکاندا کۆبۆنەوەی ئەنجوومەنی بەرزی پزیشکان گیرا و ویستیان بزانن ئیتر چیان لە دەست دێ. لە تەلاری تەنیشتییەوە ئەنجوومەنێکی دیکە لە رێگەیەك بۆ رزگارکردنی ژیانی باوکم دەگەڕا. دەستەیەك پسپۆڕی گەنجیش دەزگایەکی پشووهەڵکێشانی دەستکردیان لە کۆلێژی لێکۆڵینەوە زانستییەکانەوە هێنابوو بۆ ئەوەی کەڵکی لێ وەرگرن، چونکی هەر ئەوان دەیانزانی بەکاری بێنن، بەڵام ئەو دەزگا زەبەلاحە هەروا لە گۆشەیەك بەبێ سوود فڕێ درابوو و پزیشکە گەنجەکان لە حاڵێکدا، کە بەرداشی رووداوەکانی دەوروبەریان دەیهاڕین مات و سەر لێ شێواو چاویان بە دەوروبەری خۆیاندا دەگێڕا. لە نێو پزیشکەکاندا چاوم بە کچێکی گەنج کەوت و پێم وابوو دەیناسم، لە کوێم دیتبوو؟ لە بیرم نەمابوو. بەسەر سلاوێکمان لێك کرد، بەڵام قسەمان نەکرد. هەمووان هەوڵیان دەدا وەك چون لە نێو پەرستنگەیەکدا بن ئاوا بێدەنگی بپارێزن. هیچ کەس باسی شتێکی دیکەی نەدەکرد. هەمووان وایان هەست دەکرد، کە لەو تەلارەدا رووداوێکی گەورە و شتێکی گرینگ خەریکە روو دەدا و هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵ ئەو رووداوە رێك

دەخست. تەنیا کەسێك هەڵسوکەوتێکی بێ ئەدەبانەی هەبوو ئەویش بەریا بوو. ئەو لەرادەبەدەر شڵەژاوو بێ ئۆقرە دیار بوو. روخساری ئەو، کە لە حاڵەتی ئاسیاییدا قیزەون و ناشیرن بوو لە ژێر کاریگەریی هەوا و هەوەس و زێدەخوازی و بێ بەزەیی و دڵڕەقی و گزیکاری و حەزی دەسەڵات، وا هەژابوو تێك چووبوو. لەو کاتە هەستیارەدا ئەو لە هەوڵی ئەوەدا بوو، کە کەس فێڵی لێ نەکا و بە گزە و فێل و تەڵەکە لە نێوی نەبەن. ئەو دڵەڕاوکییە لە تەوێڵیدا دەبریسکایەوە. ئەو لە قەرەوێڵەکە دەچووە پێش و بۆ ماوەیەکی زۆر لە روخساری نەخۆشەکە ورد دەبۆوە. باوکم لەو پەڕی بێهۆشیدا جاروبار چاوەکانی هەڵدێنان و لەو کاتەدا بەریا چاوی دەبڕییە ئەو چاوە لێل و بێ تیشکانە. ئەو تەنانەت لەو کاتەشدا دەیویست بە وەفادارترین و راستگۆترین کەس لەقەڵەم بدرێ. هەروەکی بەداخەوە توانیبووی بۆ چەندین ساڵان خۆی بەو شێوەیە بە باوکم بناسێنێ.

باوکم هەروەکی پزیشکەکان دەیانگوت بێ هۆش بوو. بەربوونی خوێنی مێشکی زۆر بە تەوژم بوو. ئەو زمانی نەدەگەڕا. لای راستی جەستەی ئیفلیج ببوو. لەو ماوە ماوەیەدا، کە چاوەکانی هەڵدێنان گلێنەکانی و روانینەکانی لێڵ و تار بوون. کەس نەیدەزانی ئاخۆ کەسی پێ دەناسرێتەوە یان نا؟ لەو کاتەدا هەمووان خۆیان بەسەر دەکێشا و هەوڵیان دەدا، کە وشەیەکی لەزمان بڕفێنن یا مەبەستێك لە نیگاکانیدا بخوێننەوە. من لە تەنیشتی دانیشتبووم و ئەو چاوی لێ دەکردم. پێ نەدەچوو ئاگای لە هیچ بێ من دەستەکانیم ماچکردن و هیچی دیکەم لە دەست نەدەهات.

باوکم بە دژواری گیانی دەرچوو. ئەوە یەکەم مەرگێك بوو، کە بە چاوی خۆم دەم دیت. خودا مەرگی سووگ و سانا تەنیا بە چاکەکاران دەبەخشێ. خوێنبەربوونی مێشك وردە وردە هەموو گیانیدا دەگرت و تەنانەت بە هەبوونی دڵێکی ساغ و بەهێزیش وردە وردە ناوەندەکانی پشوودانیشی دەگرت. پشوودان هەر دادەکشا لە دوازدە سەعاتی کۆتایی تەمەنیدا دیار بوو، کە وردە وردە ئۆکسیژنی پێ‌ناگا. روخساری رەش دادەگەڕا و دەگۆڕا. روخساری ئاشنای باوکم وردە وردە نامۆ دەبوو. لێوەکانی رەش دادەگەڕان و لە دوو سەعاتی کۆتایی دا وردە وردە پشووی لێ دەبڕی.

گیان دەرچوونێکی سامناك بوو. مەرگ بە بەر چاوی هەموانەوە ئەوی لە پێ دەخست. لە یەك ساتدا_ نازانم راست بوو یان وا دیار بوو_ وەك بڵێی لە دوایین ساتدا باوکم لەپڕ چاوی هەڵێنان و لە هەموو ئەو کەسانەی روانی، کە بە دەورییەوە بوون، ئەو روانینە زۆر سامناك

بوو. نیگای شێتانه و تووڕەیی و پڕ له ترس و تۆقین له بەرامبەر مەرگدا، لـه بەرامبـەر ئـەو پزیشکه نامۆیانەدا، که چاویان بەسەرییەوه بوو، باوکم پێموایه بۆ یەك خولەك لـه هـەمووانی روانی و له پڕ دەستی چەپی، که برێك هەست و جوولەی تێـدا مـابوو هـەڵێنا و ئامـاژەی بـه خاڵێك کرد. قەڵافەتێکی لێل و سـامناك بـوو و مـن نـه لێـی تێگەیشـتم و نـه لـه بیریشـم دەچێتەوه. کەس لەو جوولەی دەستی تێ نەگەیشت و دیار نـەبوو لەگـەڵ کـێ و چ شـتێکێتی، بەڵام هەرچی بێ هەڕەشه بوو و دوای ساتێك گیانی پاش هێندێ بەربەرەکانێ دەرچوو.

من دەتگوت دەخنکێم. به هەردوو دەستم باوەشم به هاوڕێ دوکتۆرە گەنجەکەم داکرد، ئـەو لەبەر ئازار ناڵەیەکی لێوەهات و هەردووکمان پاڵمان پێکەوه دا.

رۆح هەڵفڕی و جەسته ئارام بۆوه. روخسـار سـپی هەڵگەڕایـەوه و گەڕایـەوه سـەر دۆخـی ئاسایی خۆی، پاش چەند ساتێك هێمن و بێ خەم و جوان بۆوه.

چەند دەقیقه نازانم چەند بوو لەوانەیه زۆر بووبێ، هەمووان له دەوری تەرمەکه بێ دەنگ و بـێ جووڵه مانەوه و دواتر بەرپرسانی دەوڵەت بەرەو دەرگای وەدەر کەوتن و خرۆشان. ئەوان پێویست بوو برۆن و هەواڵەکه بدەنه کۆمیتەی ناوەندیی حیـزب، کـه هـەموو ئەندامـەکانی لـه کۆبوونەوەکـەدا دانیشتبوون و چاوەڕێبوون. ئەوان چوون هەواڵێك راگەیەنن، که هەمووان له ناخەوه چاوەڕوانی بوون. نامەوێ یەکتر تاوانبار بکەین: ئەوانیش وەکو من به دەست دوو هەستی ناتەبا و لێکدژەوه "خـەم و پەژاره له لایەك و رزگاربوون و حەسانەوه له لایەکی ترەوه" دەیانناڵاند.

# 2

سەبارەت به چۆنێتیی مەرگی ستالین "ئارتۆر خانۆف"، که یەکێکه له لێکۆڵەرانی ناوداری سـۆڤیەتیی و پێشـتریش نـاویم هێنـاوه جـۆرێکی دیکـەی دەگێڕێتـەوه. ئـەو بـه پێـی ئـەو زانیارییانەی، که له نێو خۆی سۆڤیەتی یا لەو لێپرسراوه ئاسایشییه راکردوانـەی وەرگرتـوون، که لەوێ هەڵاتوون، دەنووسێ، که ستالین به پیلانێکی لەوەپێش داڕێژراوەوه کوژراوه و تـاقمی چوارکەسیی مالینکۆف و بەریاو خرۆشۆف و بۆلگانین، کـه دوایـین شـامیان لەگـەڵ خـواردوه بەشداری ئەو پیلانه بوون. ئارتۆرخانۆف دەنووسێ، کـه بـەریا داڕێـژەر و کـارگێڕی سـەرەکیی کوشتنی ستالین بووه، بەڵام مالینکۆف و خرۆشۆف و بۆلگانینیش له رووی زێدەخوازییەوه یا له

ترسی ئەوەی کە نەکا لە شەپۆلی پاکسازییەکانی ئـەو دواییانـەی سـتالیندا وەبـەر کـەون لـە بەڕێوەبردنی ئەو پیلانەدا یارمەتیی بەریایان داوە. ئارتۆر خانۆف بە جۆرێکی جیاواز قسـە لـە سەر دوایین شامی ستالین لەگەڵ ئەو تاقمە چوارکەسییەو ڕووداوەکانی دوایی دەکا و بـۆ وێنـە دەڵێ:"پاش تەدارەکی پێویست تاقمی چوارکەسی لە شـەوی بیسـت و هەشـتەمی فێبریـوەری ساڵی 1953دا بەمەبەستی چاوپێکەوتن چونە لای ستالین لە شـوێنی ژیـانی لـە کۆنتسـۆڤ. مالینکۆف و خرۆشۆف و بۆلگـانین پـاش قسـەکردن لـە سـەر مەسـەلەی ڕۆژ و خواردنـەوەی مەشرووب، بڕێك زووتر لە ماڵی ستالین چوونە دەرێ، بـەڵام ئـەوان نەچـوونەوە مـاڵی خۆیـان بەڵکو بەرەو کۆشکی کرێملین وەڕێ کەوتن".

ئارتۆر خانۆف بـەو پێشـەکییە و وەبیرهێنانـەوەی ئـەوەی کـە مـالینکۆف و خرۆشـۆف و بۆلگانین ئاگاداری پلانی دوایی بەریا بوون لێی زیاد دەکا:

... بەریا بە پێی عادەت بە بیانووی باسکردنی هێندێ کاروبـاری نهـێنی لـە لای سـتالین مایەوە. لەو کاتەدا کەسایەتییەکی تازە دێتە ئاراوە. هێندێ کەس دەڵێن ئـەو کابرایـە پیـاوی بەریا بووە. هێندێکیش پێیان وایە، کە ژنێك بووە لە هاوکارانی بەریا. بەریا ستالینی ئاگـادار کردەوە، کە لە پێوەندی لەگەڵ پەروەندەی پزیشکانەوە هەواڵی ترسێنەر لـە دژی خرۆشـۆف بـە دەستی ئەو گەیون. لەو کاتەدا بەریا خاتوونی هاوکاری خۆی، کە پەروەندەیەکی بە دەستییەوە بوو بانگ کرد بۆ ڕاگەیاندنی ڕاپۆرتەکە. هێشتا بـەریا پەروەنـدەی گـۆڕینی لەبـەردەم سـتالین دانەنابوو، کە ئەو ژنە شتێکی وەك ئـاوی، کـە لەوانەیـە ئێتـەر بووبـێ بەسەروچـاوی سـتالین هەڵپڕژاند. ستالین دەمودەست لە هۆش خۆی چوو. لـەو کاتـەدا ئـەو ژنـە چـەند دەرزییـەکی ژەهراویی لە ستالیندا، کە وردە وردە کاریگەرییاندا دەنا. لە ڕۆژەکـانی دیکـەدا، کـە سـتالین هەروا بێ هۆش بوو ئەو ژنە وەکو پزیشك هاتەوە ژوور سەری ستالین و بڕێکی دیکەی لە ژەهـر لە جەستەی ستالین دەکردەوە بۆ ئەوەی ئەو وردە وردە بمراو وا نیشان بدرێ، کە مەرگی سـتالین بە شێوەیەکی سروشتی بووە...

ئارتۆر خانۆف بۆ سەلماندنی بۆچونەکەی خـۆی هێنـدێ بەڵگـەی هێناونـەوە و ئامـاژە بـە دووانیان دەکا، یەکەم ئەوەی کە لە ڕۆژی یەکەمی نەخۆش کەوتنی ستالیندا هـیچ پزیشـکیان نەهێنایە سەری و ئەوەش، کە هەرچی بەناوی پزیشك هێنابوویاننە سەری هـەموان نەناسـراو بوون. خرۆشۆف لە نێو ئەو هەمووە پزیشکەدا تەنیا ناوی یەکێکیان دێنا و دان بـەوە دادەنـێ، کە ئەویش زۆر ترساوە. سۆتلانا دەنووسێ لە نێـو ئەوکەسـانەی، کـە لـە کـاتی ئاویلکـەدانی

باوکیدا له ژوور سەری بوون تەنیا قەلافەتی ژنێکی لەبیرە، کە ناسیار دیار بووە"بەلام وەبیری نەهاتۆتەوە، کە لە کوێ دیتوویەتی." ئارتۆر خانۆف دەنووسێ ئەو ژنە گەنجەش لەوانەیە، کە هاوکارەکەی بەریا بووبێ و ئەو کەسە بێ، کە مادەی بێهۆش کەری بە سەروچاوی ستالین هەڵپرژاندووە و لێدانی دەرزییە ژەهراوییەکانی وەئەستۆ گرتووە.

بێرترام دی ۆولف نووسەر و لێکۆڵەری ناوداری ئەمریکییش، کە گەلێك کتێبی لە سەر سۆڤیەتیی نووسیون لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "خرۆشۆف و تاپۆی ستالین"دا دەنووسێ:" رۆژێك پاش مەرگی ستالین ترێتیاکۆڤ ی وەزیری تەندروستی، کە چارەسەریی ستالین لە ژێر چاوەدێریی ئەودا بەرێوە دەچوو شوێن بزر بوو. ژەنەراڵ پۆسکێربیشێڤ سەرۆکی نووسینگەی تایبەتیی ستالین، کە خرۆشۆف ناوی نابوو سەگە بەوەفاکەی ستالین و پەروەندەسازی بۆ پاکسازییەکانی دوایی لە ژێر چاوەدێریی ئەودا بەرێوە دەچوو هەر ئەو شەوەی ستالین مرد ئەویش شرت وگوم بوو و کەس بەسەروشوێنی نەزانی. ڤاسیلی کورِی ستالین، کە فەرماندەی بنکەی هەوایی مۆسکۆ بوو لە ریورەسمی بەخاك سپاردنی باوکیدا کەس نەیدیت و کەس نەیزانی چیی بەسەر هات. سێ ژەنەراڵی دیکەش، کە رۆژی دوای مەرگی ستالین ون بوون و کەس بە سەروشوێنی نەزانین، بریتی بوون لە ژەنەراڵ سپریدۆنۆڤ فەرماندەی بنکەی سەربازیی کریملین، ژەنەراڵ سینیلۆڤ فەرماندەی بنکەی سەربازیی شاری مۆسکۆ و ژەنەراڵ ئارتیمۆڤ فەرماندەی گشتیی بەشی سەربازیی مۆسکۆ."

بێرترام ۆولفیش وەکو ئارتۆر خانۆف لە سەر ئەو باوەرِەیە، کە ستالین بە شێوەی ئاسایی و سروشتی نەمردووە و شوێن بزرکرانی خزم وکەسەکانی ئەو بە تایبەتیی ژەنەراڵ پۆسکێربیشێڤ لە پاش مەرگی ستالین بە نیشانەی پیلانێك بۆ کوشتنی ئەو دەزانێ . ۆولف بە وردی لە راگەیەندراوی جێ نشینەکانی ستالین سەبارەت بە مەرگی ئەو لە رۆژی پێنجەمی مارسی ساڵی 1953دا، کە شەش سەعات پاش مەرگەکەی بلاو کرایەوە ورد بۆتەوە و دەنووسێ لەو راگەیەندراوەدا ئەگەرچی وەکو هاوسەنگەری لینین و درێژەپێدەری رێگەی ئەو و وەك رێبەر و مامۆستای ژیری حیزبی کۆمۆنیست و خەڵکی سۆڤیەتی باسی ستالین کراوە هیچ نیشانەیەك لە خەم و پەژارە لەو نامەیەدا بەدی ناکرێ. راگەیەندراوەکە پاش بەراییەکی کۆرت لە سەر ستالین " سەرەرِای ئەو هەمووە هەوڵەی، کە بۆ رزگاریی گیانی ئەو درا" چووەتە سەر ئەرکی حیزب و خەڵکی سۆڤیەتی و دەڵێ " دەبێ یەکێتیی پۆلایین و یەکگرتوویی حیزب وەکو بیبیلەی چاومان بپارێزین... لەبەرامبەر دوژمنانی نێوخۆیی و دەرەکیدا ئەو پەرِی سەرسەختی و رژدبوونمان

بپارێزین. له ڕێگەی بەردەوامبوونی ڕێبەرییەکی ڕاستگۆ و یەکڕیزیی حیـزب و دەوڵەتـدا تـێ بکۆشین پێش بە هەرچەشنە ئاڵۆزی و بێ سەروبەرەییەك بگرین." ۆولف بەتایبەتی لە سەر دوو وشەی ئاڵۆزی و بێ سەروبەرەیی پێدا دەگرێتەوە و دەنووسێ بە کارهێنانی وەهاوشـەگەلێك لـە ڕاگەیەندراوێکی فەرمیـدا خـۆی نیشـانەی تـرس و خۆفێکـە، کـە بـەرۆکی نووسـەرانی ئـەو ڕاگەیەندراوەی گرتووە.

تاقمی چوار کەسی "مالینکۆف، بەریاو خرۆشۆف و بۆلگانین"، کـە لـە دوایـین ڕۆژەکـانی ژیانی ستالیندا لەگەڵی بوون و(پێدەچێ، کە بە فیتی ئەوانیش کوژرابێ) پاش مـەرگی سـتالین خەڵکی دیکەشیان لە دابەشینی میراتەکەی ئەودا بەشدار کرد، چونکی وایان هەست دەکرد، کە بە تەنیایی ئەو بارە قورسەیان پێ هەڵناگیرێ. لە ڕۆژەکانی ئاویلکەدانی ستالیندا ڤۆروشـیلۆف و کاگانۆڤیچیش بانگ کران بۆ هاریکاری و مۆلۆتۆف و میکۆیانیش، کە کەوتبوونە بەر ڕقـی ستالین بانگ کران بۆ دابەشینی میراتەکەی. بەرپرسیارەتیی بە خاك ئەسپاردنی سـتالین خرایـە ئەستۆی خرۆشۆف و مالینکۆف و بەریاو مۆلۆتۆف دەسنیشان کران، کە لەو ڕێوڕەسمەدا قسـان بکەن. "پۆلیت بۆرۆ" یان دەفتـەری سیاسـیی حیـزب بـە ئەنـدامبوونی یـازدە کەسـی کۆنـە ڕێبەرانی پێشۆوە بووژێندرایەوە بۆ ئەوەی دابەشینی پۆست و پلە دەوڵەتییەکان ساناتر و بە بێ کێبڕکێی گەنجەکان بەڕێوە بچێ. بەو شـێوەیە لـە سـەر پێشـنیاری بـەریا مـالینکۆف کرایـە سەرۆکی وەزیران و سکرتێری گشتیی حیزب و لە سـەر پێشـنیاری مـالینکۆف دوو وەزارەتـی نێوخۆ و ئاسایشی دەوڵەتی تێکەڵ کران و درانە بـەریا. مۆلۆتـۆف دیسـان بـۆوە بـە وەزیـری کاروباری دەرەوە، کە لە ساڵی 1949 ـەوە لە دەسـتیدا بـوو و میکۆیـان بـوو بـە وەزیـری بازرگانی و بۆلگانین بە وەزیری بەرگری و کاگانۆڤیچ بوو بە وەزیری پیشە قورسەکان.

پۆستی تەشـریفاتیی سـەرۆکی شـاندی سـەرۆکایەتیی ئەنجوومـەنی بـەرزی یـەکێتیی سۆڤیەتیی درایە ڤۆرشیلۆف و بە ڕواڵەت تەنیا خرۆشۆف لـەو نێـوەدا دەسـت لـە گونـان درێژتر گەڕابۆوە، کە ڕۆژی چوارەمی مارسـی 1953 بـە دەسـت لـە کـار کێشـانەوەی مالینکۆف لە سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیست ئەو پلەیە بەو درا. ڕاگەیەندراوی هەواڵدەریی تاس لە سەر ئەو جێگۆڕکییە ئەوەی دەردەخست، کە مالینکۆف لە سەر داوای خۆی و بۆ ئەوەی بتوانێ کاتی خۆی بۆ کاروباری دەوڵەتی تەرخان بکات دەستی لە سکرتێریی حیزبی سۆڤیەتی کێشایەوە و هەتا هەڵبژاردنی جێنشـینێك بـۆ وی، هـاوڕێ خرۆشـۆف ئـەرکی سکرتێری ڕادەپەڕێنێ. هەڵبژاردنی خرۆشۆف بۆ سکرتێریی حیزب لە کۆبوونـەوەی دوایـی

کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا پەسند کرا و بواری بۆ هەڵکشان بەرەو لووتکەی دەسەڵات و جێنشینیی ستالین بۆ رەخسا.

# 3

ستالین سەرەڕای ئەو هەمووە جەنایەت و کارەساتانەی، کە دواتر بە ئەستۆی داهاتن، ئیمپراتۆرییەکی مەزنی بە میرات بۆ جێنشینەکانی خۆی بە جێ هێشت. یەکێتیی سۆڤیەتی بە تەنیا یەك لە شەشی گۆی زەویی داگرتبوو. بێجگە لە سێ وڵاتی لێواری دەریای بالتیك (لیتوانی و لێتۆنی و ستۆنی) و بەشێك لە خاکی پۆلۆنیا و فەنلاند و دوورگەکانی کۆریل، کە بە فەرمی خرانە سەر خاکی سۆڤیەتی، پۆلۆنیا و رۆمانیا و هەنگاریا و چیك وسلۆڤاکیا و بۆلغارستان و ئەڵمانیای رۆژهەڵات و کۆریای باکووری و ئەلبانی و مەغولستانی دەرەوەش بوونە پاشکۆی سۆڤیەتی سەر بەوێ بوون. سۆڤیەتی لە بواری پیشە و سنعەت و تیکنۆلۆژیاو بەرهەمی کشتوکاڵییەوە نەدەگەیشتەوە ئەمریکاو ئاستی ژیانی خەڵکەکەشی لەگەڵ ژیانی خەڵکی ئەمریکا و وڵاتانی دیکەی خۆرئاوا بەراورد نەدەکران، بەڵام لە پیشەقورسەکان و لە چەکوچۆڵ و تەقەمەنیدا قەرەی لە قەرەی ئەمریکا دەدا و بە گەورەترین بەرهەمهێنەری نەوتی جیهانیش دەناسرا.

ململانێ لە سەر گرتنەوەی جێگەی ستالین و گەیشتن بەو میراتەی لە پاشی بە جێ مابوو لەو کاتەوە دەستی پێکرد، کە ستالین گیانی دەرچوو. هەر وەکی گوتمان لەو ململانێیەدا بەریا و مالینکۆف دەستی خۆیان رەپێش خست و نیشانەکان وایان دەردەخست، کە بەریا هەر لەو رۆژەوە، کە بۆچی مالینکۆفی لە سەرۆکی وەزیرانەوە بۆ جێنشینی ستالین و سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێشنیار کرد، بە شوێن دەرفەت و هەلێکی لەباردا دەگەڕا، کە لێی بخا. لەو نێوەدا کەس بیری بۆ خرۆشۆف نەدەچوو و هەربۆیەش کاتێك مالینکۆف دەستی لە سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیست هەڵگرت هیچ کەس بیری لەوە نەدەکردەوە، کە خرۆشۆف بە وەرگرتنی ئەو پۆستە رێگەی خۆی بۆ گەیشتن بە دەسەڵات خۆش و لەبار دەکات.

له سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی ستالیندا بەتایبەتیی لە ساڵەکانی پاش شەڕی دووەم ی جیهانیدا، کە ستالین خۆی پۆستی سەرۆکایەتیی وەزیرانی وەئەستۆ گرت حیزبی کۆمۆنیست دەسەڵات و پێگەی خۆی لە دەست دابوو و ستالین لە سەر تەواوی شتەکان خۆی بە تەنیا و بەبێ راوێژ لەگەڵ ئۆرگانەحیزبیەکان بڕیاری دەدا. زۆر بە دەگمەن کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی دەگیران و هەروەك دەزانین ماوەی سێزدە ساڵ مەودا کەوتە نێوان کۆنگرەی هەژدەیەم و کۆنگرەی نۆزدەی حیزبەوە. مەبەستی ستالین لە گرتنی کۆنگرەی نۆزدەیەم لە کۆتایی ساڵی 1952دا زیاتر رێکخستنەوەی حیزب و تەدارەك گرتنی پاکسازییەکانی دوایی بوو و خۆ بواردنی ئەو لە وتاردان و پێشکەشکردنی راپۆرتی حیزبی لەو کۆنگرەیەدا نیشاندەری بە هێندنەگرتنی بەرزترین کۆڵەکە و ئۆرگانی حیزب بوو. ستالین تەنیا لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی نۆزدەیەمدا، ئەویش بۆ ماوەی چەند خولەکێك ئامادە بوو. پاش هەڵبژێرانی کۆمیتەی ناوەندییش تەنیا لە یەکەمین کۆبوونەوەیاندا بەشدار بوو بۆ ئەوەی پێشنیاری هەڵوەشاندنەوەی دەفتەری سیاسی و هەڵبژاردنی ئەندامانی بیست و پێنج کەسیی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی پەسند بکا.

بەو جۆرە وا وێدەچێ، کە سکرتێری یەکەمی حیزب لە قوچەکی دەسەڵاتدا رۆڵێکی پلە دووەم دەگێڕا و دەسەڵات لە راستیدا لە دەستی سەرۆکی دەوڵەت و وەزیرانی باڵا و کابینەدا پاوان دەکرێ. بە تایبەتی، کە خرۆشۆف وەك پسپۆڕێکی بواری کشتوکاڵ ناسرابوو سەرەڕای ئەوەی کە لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی ستالیندا، زۆری لێ نزیك بوو، خوازیارێکی بە هێز نەبوو بۆ گەیشتن بە لوتکەی دەسەڵات و خوازیارانی سەرەکی دەسەڵات واتە مالینکۆف و بەریا تووشی هەمان ئەو هەڵەیە هاتن، کە زینۆویێڤ و کامینۆف لە سەر ستالین تووشی بوون.

ئێستا بەر لەوەی بچینە سەر قۆناغەکانی هەڵکشانی خرۆشۆف بە پەیژەی دەسەڵاتدا، پێویستە چاوێك بە رابردوویدا بخشێنین و بزانین ئەو کابرا بە رواڵەت سادە و دێهاتییە، کە لە بنەماڵەیەکی وەرزێری ئۆکراینیدا لە دایك بووە و ژیانی خۆی بە کرێکاری لە شاری کانگایی یۆزۆکۆڤا دەست پێکردبوو چۆن توانیی لە بەرەبەری شەڕی دووهەمی جیهانیدا ببێتە ئەندامی پۆلیتبۆرۆ یا دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و دوای شەڕ بوو بە یەکێك لە دەگمەن باوەڕپێکراوان و هاوڕازەکانی ستالین.

نیکیتا سێرگێڤیچ خرۆشۆف ساڵی 1894 لە شاری کالینوکا لە دایك بوو. باووباپیرەی خرۆشۆف وەرزێر بوون، بەڵام لەگەڵ گەشەکردنی پیشەسازی و دوزینەوە و دەرهێنانی کانگاکان

له روسیای سەرەتای سەدەی بیستەمدا، باوکی خرۆشۆف وازی له کاری وەرزێری هێنا و رووی کردە کاری کانگا، و کوڕەکەشی وەدوای خۆیدا. نیکیتا له کاتی خوێندن و له رۆژانی پشووشدا له کانگاکانی بەردە ڕەژوودا کاری دەکرد، بەڵام وردە وردە بوو بە کرێکارێکی لێوەشاوە و یاریدەدەری مکانیك و له سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانیدا بە هۆی پێویستییەکی، کە لە بەرەی شەڕدا بەو جۆرە لێهاتوویيانەیان هەبوو خزمەتی سەربازییەکەیان پێ بەخشی.

ساڵی 1917، کە شۆڕشی دژە پادشایەتی و دواتر شۆڕشی بۆلشەڤیکی لە روسیا کرا، خرۆشۆف، کە لەو کاتەدا گەنجێکی بیست و سێ ساڵان بوو رەگەڵ بۆلشەڤیکی‌یەکان کەوت و لە شەڕە نێوخۆییەکانی روسیادا شانبەشانی بۆلشەڤیەکەکان شەڕی کرد. پاش گەڕانەی بۆ یۆزۆکۆڤا لە ساڵی 1922دا، کە لەو کاتەدا بە یەکێك لە چالاکانی حیزبی لەقەڵەم دەدرا بوو بە جێگری بەڕێوەبەری ئەو کانگایەی کاری تێدا دەرکرد و ساڵی داهاتوو بەڕێوەبەریی ئەو کانگایەیان پێ پێشنیار کرد، بەڵام خرۆشۆف، کە حەزی لێ بوو درێژە بە خوێندن بدا بەڕێوەبەری ناوچەی حیزبی قایل کرد بەوەی، کە لە کۆلێژی کرێکاریی یۆزۆکۆڤادا ناونووسی بکاو لە کاتی بێکاریدا لە دەفتەری حیزب کارەکانی خۆی راپەڕێنێ.

نادژدای هاوسەری دووەم ی ستالین لە کۆتاییەکانی ساڵی 1932دا دوای مشتومڕێك لەگەڵ مێردەکەی، خۆی کوشت( و هێندێکیش دەڵێن ستالین خۆی کوشتی)، بەڵام رەوتی هەڵکشانی خرۆشۆف، کە بە ناسینی ئەو دەستی پێکردبوو هەروا درێژەی هەبوو. لە ساڵی 1934دا خرۆشۆف بوو بە سکرتێری دووەم ی کۆمیتەی حیزبیی ناوچەی مۆسکۆ و لە ساڵی 1934دا لە حەڤدەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستدا بۆ یەکەمین جار وەك کۆمیتەی ناوەندیی حیزب هەڵبژێردرا. خرۆشۆف، کە لە ماوەی جێگرایەتیی کاگانۆڤیچ لە کۆمیتەی حیزبیی شاری و ناوچەیی مۆسکۆدا لە چالاکیی بیناسازیی شاریدا بە تایبەتیی لە سازکردنی مێترۆی بەناوبانگی مۆسکۆدا رۆڵێکی بەرچاوی گێڕابوو. لە ساڵی 1935دا لە جێگەی کاگانۆڤیچ کرایە سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی حیزبی لە مۆسکۆ لە ساڵانی پاکسازیە خوێناوییەکەی ستالیندا لەو پلەیەدا بەسەر تەواوی کاروباری شاری مۆسکۆ و دەوروبەریدا رادەگەیشت و چاوەدێریی دەکردن. ستالین ناوی نابوو "باوکی شار" و لە ماوەی ئەو ساڵانەدا لە سەر پێشنیاری کۆمیتەی ناوەندیی حیزب وەك ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب هەڵبژێردرا. خرۆشۆف لە ساڵی 1938دا واتە لە لوتکەی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالیندا بوو بە سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە ئۆکراین و لە و لە

ساڵی 1939دا تەواو بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی یا بەرزترین ناوەندی بڕیاردەری وڵات.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا زۆر ناچێتە نێو باسی رووداوەکانی ساڵانی 1934 هەتا 1939ـەوە، چونکی سەرکەوتنی خێرای ئەو لەو ماوەیەدا دەریدەخا، کە لە رەوڕەوەی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالینیدا بە تەواو مانا جێگەی متمانە و باوەڕ پێکراوی ستالین بووە و ئەگەر لە جەنایەتەکانی ئەو قۆناغەدا رۆڵێکی راستەوخۆی نەبووە لانیکەم بە قسەلێکردن و بە زمان سەلماندو ونی و ئەوەش شتێکە، کە خرۆشۆف وای پێ باشترە، کە بێدەنگەی لێ بکا.

پاش دەستپێکردنی شەڕی جیهانیی دووەم و داگیرکردنی خۆرهەڵاتی پۆلۆنیا لە لایەن لەشکری سوورەوە خرۆشۆف وەکو سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین و ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب، کە لە هەمانکاتدا سەرۆکی ئەنجوومەنی سەربازیی ئۆکراینیشی لە ئەستۆ بوو بەرەو ناوچەی داگیر کراوی خۆرهەڵاتی پۆلۆنیاوەڕێ کەوت و لە ساڵانی 1939 و 1940دا چاوەدێریی بەسەر چالاکیی سەربازیی سۆڤیەتییزاسیۆنی ناوچە داگیرکراوەکاندا کرد. بۆ پاساودانی لکاندنی ناوچە داگیرکراوەکان بە خاکی سۆڤیەتییەوە ناویان نا ئۆکراینی خۆرئاوا و لە ژێر چاوەدێریی راستەوخۆی خرۆشۆفدا بە سەدانهەزار کەس لە خەڵکی خۆرهەڵاتی پۆلۆنیا لەوڵاتی خۆیان وەدەرنران و خەڵکی ئۆکراینیان لە جێگەیان نیشتەجێ کردن.

لەگەل دەستپێکی هێرشی هێزەکانی هیتلەری بۆ سۆڤیەتی لە ژووئەنی ساڵی 1941دا هەڵمەتی خرۆشۆف لە ناوچە داگیرکراوەکانی خۆرهەلاتی پۆلۆنیادا بەنیوەچڵی مانەوە و خرۆشۆف لەگەڵ هێزەکانی سۆڤیەتی دەستی کرد بە پاشەکشێ لە پۆلۆنیا و دواتر لە خاکی سەرەکیی ئۆکراین. لە ساڵانی شەڕدا خرۆشۆف وەك نوێنەری دەفتەری سیاسیی حیزب بەشداری ئەنجوومەنی سەربازیی لە هەڵمەتی شەڕی ناوچەی ئۆکراین و بەرەی ناوەندی و شەڕی ستالینگراد بووو لە ماوەی ئەو ساڵانەدا لەگەڵ فەرماندەرانی سەربازیی وەك مارشال ژۆکێڤدا پێوەندیی دۆستانەی دامەزراند.

لە ساڵی 1944دا پش ئازادکرانی ئۆکراین خرۆشۆف وێڕای پاراستنی پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین، سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی وەزیرانیشی وەئەستۆ گرت و لە نۆژەنکردنەوەی ئەو کۆمارییەدا رۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵانی 1946 و 1947دا بە هۆی خراپبوونی رەوشی بەرهەم و دەغلّ و دان و قاتی و قڕی لە ئۆکراین، کە بووە هۆی

مردنی سەدان هەزار کەس، خرۆشۆف بۆ ماوەیەك لە پێش چاوی ستالین کەوت و کاگانۆڤیچ دیسان وەك سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین جێگەی گرتەوە، بەڵام خرۆشۆف، کە هێشتا هەر ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب بوو توانیی لە چەند چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ستالین دیسان دڵی وی وەدەست بێنێتەوە و لە دیسێمبەری ساڵی 1947دا بە دەست ئاوەڵایی تەواوەوە گەڕایەوە ئۆکراین.

خرۆشۆف هەتا دووساڵی دیکەش لە پۆستی سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین و سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئەو کۆمارییەدا مایەوە هەتا ئەوەی کە ستالین لە دیسێمبەری ساڵی 1949دا بانگی کردەوە مۆسکۆ و سکرتێریی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی لە سۆڤیەتی پێ سپارد. خرۆشۆف وەکو سەرۆکی ڕێکخستنی حیزبی لە مۆسکۆ جارلەجار زیاتر لە ستالین چووە پێشێ و لە ساڵانی 1950 هەتا 1953دا بوو بە ڕاوێژکاری پایەبەرزی ستالین لە کاروباری کشتوکاڵیدا. گەڵاڵەی تێکەڵکردنی زەوییە گچکە هاوبەشەکان لەگەڵ کێڵگەهاوبەشە گەورەترەکان، کە بووە هۆی بەرهەمهاتنی دەغڵ و دانی زیاتر، ئەو داڕشتن و جێبەجێی کردن و خرۆشۆف بۆ جێبەجێکردنی ئەو گەڵاڵانە لە ساڵانی 1950 هەتا 1952دا سەردانی گەلێك ناوەندی گوندنشینی و وەرزێریی روسیای کرد.

# 4

خرۆشۆف لە دوایین ساڵەکانی تەمەنی ستالیندا بە تەواوی باوەڕپێکراو و جێی متمانەی ستالین بوو و لە دوایین مانگەکانی ژیانیشیدا ببووە یەکێك لە دەگمەن هاوڕاز و مەحرەمەکانی ستالین، لەگەڵ ئەوەشدا خرۆشۆف لە ڕاپۆرتە نهێنییەکەی خۆیدا بۆ بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی روسیادا و لە نێو بیرەوەرییەکانیدا بە پێداگرییەوە باس لەوە دەکا، کە ستالین لە دوایین ساتەکانی تەمەنیدا لە هەموو کەس بە گومان و دڕدۆنگ ببوو و سەرەڕای ئەوەی کە لە بەریاش وەشك کەوتبوو، کۆنە ڕێبەرانی دیکەی حیزبیش لە مەترسیی ئەو پاکسازییانەدا بوون، کە خەریك بوو بۆی لە تەدارەکدا بوو و ستالین دەیویست، کە تەواوی ئەو کەسانەی پێگەیان لە نێو ڕێکخستنی حیزبی و دەوڵەتیدا هەیە و بە دەسەڵات گەیون کەسانی تازەکار و نۆکەر و گەنجانی گوێ لە مستیان لە جێگەی دابنێ.

ئەو ترس و نیگەرانییە لەوانەیە هۆکارێك بێ بۆ بەشداربوونی خرۆشۆف لە پیلانێکدا، کە بۆ لە نێوبردنی ستالین دارێژرابوو. خرۆشۆف دان بەبوونی وەها پیلانێك یا بەشداریی تێیدا، نانێ، بەڵام هەروەك گوترا لە گێڕانەوەیەکدا، کە ئەو باسی چۆنێیی مەرگی ستالین دەکا هێندێ خاڵی ناڕوون هەیە و پێداگرتنەوەی ئەو لە سەر هەڵسوکەوتی بەریا لەو رۆژانەدا، کە ستالین لە گیانەڵادا بووە خۆی وەها پیلانێك پشتڕاست دەکاتەوە، کە خرۆشۆف هەوڵ دەدا لە تەواوی ئەو رووداوەدا تاوانەکە تەنیا بخاتە ئەستۆی یەك کەس ئەویش بەریا.

لە رۆژەکانی ئاویلکەدانی ستالیندا خرۆشۆف زیاتر لە هەر شتێك لە بیری ئەوەدا بوو، کە پاش مەرگی ستالین چۆن دەکرێ لە تەشقەڵەی بەریا دەرباز بن. ئەو زۆر لە پلانەکانی بەریا بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات نیگەران بوو و دڵنیا بوو لەوەیکە ئەگەر بەریا سەرکەوێ ئەوا گیانی ئەو و تەواوی رێبەرانی دیکەش دەکەوتە مەترسییەوە. خرۆشۆف بەر لە هەموان لای بۆلگانین باسی ئەو نیگەرانییەی کرد و زانیی، کە ئەویش لەوەدا هاوخەمێتی.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا باسی رۆژی مەرگی ستالین دەکا و دەنووسێ کاتێك ستالین دوایین پشووی کێشا و پزیشکان رایانگەیاند، کە مردووە بەریا وەك کەسێکی، کە بارێکی قورست لە سەر شانی هەڵگرتبێ هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشاو نەك هیچ نیشانەیەکی خەم و پەژارەی لە روخساریدا بەدی نەدەکرا بەڵکو بە روخسارێکی گەش و شادەوە شۆفیرەکەی خۆی بانگ کرد و بەبێ ئەوەی بڵێ بۆ کوێ دەچێ ئێمەی لە لای تەرمەکەی ستالین بەجێ هێشت و رۆیشت.

خرۆشۆف ئەوجار دەنووسێ:

"... لەو کاتەدا سۆتلانکای کچی ستالینم دیت، کە سەری بە هەنیسکانەوە هەڵدەقەندرا... منیش خۆم پێ رانەگیرا و دامە قوڵپەی گریان دەبێ بڵێم، کە راستگۆیانە بۆ مەرگی ستالین گریام.

من تەنیا بۆ ستالین نەدەگریام. من زۆر نیگەرانی داهاتووی حیزب و وڵات بووم. من باش هەستم بەوە دەکرد، کە بەریا وردە وردە خۆی بەرەو سەرتر هەڵدەکێشێ و ئەو دەستپێکەش کۆتاییەکە بۆ هەموومان... من باش ئەوم دەناسی. ئەو کابرایەکی خەیانەتکار و گزیکار و بێ بەزەیی و هەلپەرست بوو، کە بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆی لە هیچ شتێ نەدەپرینگایەوە. من قەت ئەوم بە کۆمۆنیست نەدەزانی. ئەو قەساب و جەنایەتکارێکی لێهاتوو بوو..."

خرۆشۆف بەوەها بیرکردنەوەیەك لە سەر بەریا هەر لە رۆژێك دوای مەرگی ستالینەوە لە رێگە چارەیەك دەگەڕا، کە ئەو گێچەڵە لە کۆڵ خۆی بکاتەوە، لە بەشێکی بیرەوەرییەکانیدا،

کە بۆ ئەو باسەی تەرخان کردووە باسی ئەوەدەکا، کە چۆن سەرەتا لەگەڵ بۆلگانین و دواتر لەگەڵ مالینکۆف رێککەوت، پاش قایلکردنی مالینکۆف ئیتر رێککەوتن لەگەڵ ئەوانیتر بۆ بەرێوەبردنی ئەو پلانە دژوار نەبوو. بەریا خۆی بە هەوڵی وەك کۆکردنەوەی هێزەکانی پاراستنی ئاسایش لە مۆسکۆدا و دەست تێوەردانی جار بە جار زیاتر لە کاروباری دەوڵەتی و حیزبیدا جار لەگەڵ جار مالینکۆفی نیگەرانتر کرد و رێگەی بۆ خرۆشۆف خۆشتر کرد بۆ ئەوەی زیاتر هانی دڕدۆنگییەکەی بدا.

خرۆشۆف باسی ئەوە دەکا، کە چۆن پاش قایلکردنی مۆلۆتۆف و کاگانۆڤیچ بۆ جێبەجێکردنی پلانی لە سەر کار لابردن و قۆڵبەستکردنی بەریا، لەگەڵ مالینکۆف و بۆلگانین چۆنیان ئەو پلانە ئامادە و جێبەجێ کرد. لەو رێبەرانەی تر، کە بۆ بەرێوەبردنی ئەو پلانە بانگهێشت کرابوون تەنیا ڤۆروشیلۆف و میکۆیان لە هەولێکی چڕ دژی بەریا دەترسان و میکۆیان لە سەر ئەو باوەڕە بوو، کە تەنیا بەوەندە، کە کاروباری حیزبی و دەوڵەتیی لێ بستێننەوە وازی لێ بێنن، بەڵام دواجار ئەوانیش هاتنە سەر قسەی خرۆشۆف و مالینکۆف و مالینکۆف بۆ بەرێوەبردنی ئەو پلانە ئەندامانی دەفتەری سیاسیی و وەزیرە پایەبەرزەکانی بۆ گرتنی کۆبوونەوەیەکی تایبەتی لە کرێملین بانگهێشت کرد.

هێزەکانی پاراستنی ئاسایش، کە لە کرێملیندا دامەزرابوون گەورەترین نیگەرانیی خرۆشۆف و مالینکۆف بوون بۆ بەرێوەبردنی پلانەکەیان، چونکی فەرماندەکانیان دەسنیشانکراوو و جێ متمانەی بەریا بوون و پێنەدەچوو، کە ئەگەر لە لێ خستن و لە سەر کار لابردنی سەرۆکەکەیان ئاگادار بنەوە بێدەنگ بن و دەست لە سەر دەست دانێن. بۆلگانین، کە لەو کاتدا وەزیری بەرگری بوو پێشنیاری کرد، کە چەند کەسێك لە فەرماندەرانی سوپا تێگەیەنن، کە زۆریان خۆشیی لە بەریا نەدەهات و بۆ بەرپەرچدانەوەی هێزەکانی ئاسایشی کرێملین هەوڵی پێویست و گرێمانەکراو بدرێ. یازدە مارشال و ژەنەراڵ، کە ژۆکێڤ لە سەرووی هەمووانەوە بوو ئامادەبوونی خۆیان بۆ بەرێوەبردنی ئەو پلانە دەربڕی و وایان دانا، کە چەند کەسێکیان بە چەکی تەیار و پڕەوە لە ژووری تەنیشت کۆبوونەوەکە چاوەڕێ بن و ئەگەر پێویست بوو خۆیان بەریا چەك بکەن و دەستبەسەری بکەن.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا بە تێروتەسەلی باس لە وردەکارییەکانی ئەو کۆبوونەوەیە دەکا، کە شەوی بیست و شەشی ژووئەنی ساڵی 1935 بۆ وەلانانی بەریا پێکهات. سەرەڕای ئەوەی کە سی هەزار کەس لە سەر کردە حیزبی و دەوڵەتی و سەربازییەکان لەو

پلانە ئاگادار بوون، مەئموورەکانی بەریا ئاگاداری ناوەرۆکی ئەو کۆبوونەوەیە نەبوون، کە بە روالّەت بۆ تاوتوێکردنی کاروباری حیزبی و دەولّەتی بانگهێشتن کرابوون. بەریا خۆیشی، کە هاتە ئەو کۆبوونەوەیە ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو. مالینکۆف کۆبوونەوەکەی دەست پێکرد و بۆ هێنانە بەرباسی بابەتەکە شێر و رێویی دێنانەوە، کە خرۆشۆف قسەی پێ بڕی و گوتی: " هاوڕێ مالینکۆف وا باشترە راست باسی بابەتەکە بکەی و مەسەلەی بەریا بێنیتە گۆڕێ. "

خرۆشۆف هەروەها دەلێ:" ئەو دەمەی من ئەو قسەیەم کرد بەریا لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، راچلەکی و بە سەرسووڕماوییەوە گوتی:" نیکیتا... چیت فەرموو؟" ئێستا گوێت لێ دەبێ و کاتێك مالینکۆف قسەکانی بە من سپارد پێشینەیی بەریام هەر لەو رۆژەوە، کە مەئمووری رێکخراوی "یەکسانی" ی تورکان و سیخوڕی بریتانییەکان بوو لە باکۆ و هەتا ئەو کردە چەوتەی، کە لە سەردەمی ستالین و دوای مەرگی ئەو کردبوونی هەموویم لە بنی کوولەکە دا و گوتم ئێستاش ئەو خەریکی داڕشتنی پیلانێکە دژی حیزب و دەولّەتی سۆڤیەتی و ئەگەر پێشی پێ نەگیردرێ ئەوا دەستکەوتەکانی شۆڕشی بۆلشەڤیکی دەکاتە تۆزی بانان. من راشکاوانە لە سەر ئەو باوەڕەم سوور بووم و پێم چەقاند و، کە بەریا هەر لە بنەوە کۆمۆنیست نەبووە و تەنیا بۆ قازانج و بەرژەوەندی و مەبەستگەلی زێدەخوازانەی خۆی هاتۆتە نێو حیزبەوە.

خرۆشۆف لە کۆتایی قسەکانیدا پێشنیار دەکا بەریا بە هۆی ئەو کارە چەوتەی، کە کردوویەتی و پیلانی بە دژی حیزب و دەولّەتی سۆڤیەتی داڕشتوە هەموو پۆستە حیزبی و دەولّەتییەکانی لێ بستێندرێتەوە و لێپرسینەوەی لێ بکرێ. ئەندامانی دیکەی دەفتەری سیاسیش زۆربەیان ئەو بۆچوونەی خرۆشۆف دەسەلمێنن و تەنیا میکۆیان بە پارێزەوە پێشنیار دەکا، کە دەرفەت بە بەریا بدرێ هەلّەکانی قەرەبوو بکاتەوە. خرۆشۆف دیسان دەچێتەوە سەر قسەکانی و داوا لە مالینکۆف دەکا پێشنیارەکەی ئەو بۆ لە سەر کار لابردن و لێپرسینەوە لە بەریا بخەنە دەنگدانەوە، بەلاّم مالینکۆف بە شلّەژاوییەوە و بە بێ ئەوەی کە پێشنیارەکەم بخاتە دەنگدانەوە قامك بەو دوگمەیە دادەنێ کە لە پێشێتی و بەو ئاماژەیە مارشال ژۆکێڤ و بە شوێن ئەودا چەند مارشالێکی دیکە و مارشالەکانی سۆڤیەتی وەژوور دەکەون.

مالینکۆف لە پێش چاوی ئەندامانی سەرسووڕماوی دەفتەری سیاسییەوە، کە ئاگایان لەو شتە نەبوو بە مارشال ژۆکێڤ دەلێ:" وەك سەرۆکی وەزیرانی یەکێتیی سۆڤیەتیی پێتان دەلّێم بەریا قۆلّبەست بکەن بۆ ئەوەی لێکۆلّینەوەی پێویست لەو تۆمەتانەی بکرێ، کە دراونەتە

پالّی. ژۆکێف دەمودەست چەکەکەی خۆی دەردێنێ و بە بەریا دەڵێ مەبزوو." بەریا دەست بۆ جانتاکەی خۆی دەبا، بەڵام خرۆشۆف دەستی دەگرێ و بەریا، کە چاری نامێنێ دەست بەردەداتەوە (خرۆشۆف ئەوەی لێ زیاد دەکا، کە لە پشکنینەکەی جانتاکەی بەریادا دەرکەوت، کە بەریا چەکی پێ نەبووە و لە خۆڕا دەستی بۆ جانتاکەی بردووە).

سەبارەت بە رووداوەکانی دواتر لە دەسبسەرکرانی بەریاوە هەتا ئیعدامکرانی ئەو و شەش کەسی دیکە لە هاوکارەکانی، ئەوەی خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکاندا باسی کردوون هێندێ جیاوازییان هەیە لەگەڵ ئەوەی، کە پێشتر بەو بیانییانەی گوتوون، کە سەردانی مۆسکۆیان کردووە. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێ رودێنکۆ دادوەرە روسییەکەی دادگای نۆرینبێرگ، کە پاش گیرانی بەریا کرایە دادوەری گشتیی روسیا، چاوەدێریی بەسەر رەوتی دادگاییکردن و لێپرسینەوە و دادگایی بەریا و هاوکارەکانیدا دەکرد و لە کاتی لێکۆڵینەوە لە سەر بەریا بێجگە لەو جەنایەت و کارەساتگەلەی کردبوونی گەلێك کردەوەی چەوتی دیکەشی لە پێوەندی لەگەڵ دەستدرێژیکردنە سەر نزیك بە سەد کچ و ژن لێ ئاشکرا بوون، بەڵام خرۆشۆف پێشتر بە وەفدێکی نوێنەرانی حیزبی سۆسیالیستی فەرەنسای، کە بە سەرۆکایەتیی سیناتۆر پیرکۆمین، کە لە مانگی 1956دا سەردانی مۆسکۆیان کرد، گوتبوو، کە بەریا هەر ئەو رۆژەی گیرا لە کرێملین تیرەباران کرا و دواتر بەڵگەی تاوانباربوونی ئەو و هاوکارەکانیمان کۆکردنەوە. بە کورتی هەواڵی ئیعدامی بەریا و شەش کەس لە هاوکارەکانی، کە دوو وەزیری پێشووی ئاسایشیشیان لەگەڵدا بوون لە کۆتایی مانگی دیسێمبەری 1953دا راگەیەندرا. بە رواڵەت راستییەکەی ئەوەیە، کە بەریا هەر ئەو رۆژە یا چەند رۆژ دواتر ئیعدام کراوە، بەڵام گرتن و دادگاییکردنی هاوکارەکانی ئەو چەند مانگی خایاندووە و هەواڵی ئیعدامەکەیانیان پێکەوە راگەیاندووە، چونکی ئەوەی راستی بێ بڕیاری ئیعدامکردنی بەریا و شەش کەس لە هاوکارەکانی یەکجێ دەرکراوە.

## 5

بە لە سەر کار لابردن و گرتن و ئیعدامکردنی بەریا، خرۆشۆف گەورەترین کۆسپی سەر رێگەی گەیشتن بە دەسەڵاتی لە سەر رێی خۆی لابرد. دەسەڵات و پێگە سیاسییەکەی ئەویش بەو رۆڵەی، کە لەو ململانێیەدا وەئەستۆی گرتبوو زیاتر بوو. هاوکات لەگەڵ ئەو سەرکەوتنە خرۆشۆف توانی دەسەڵاتی سکرتێرەکانی حیزب لە کۆمارییەکانی سۆڤیەتیدا زیاتر بکات و دەستیان ئاوەڵاتر بکات و لەو رێگەیەوە جارلەگەڵ جار پێگەی خۆی پتەوتر بکا.

له لایەکی ترەوە ئەو بە ریفۆرم لە رەوشی کشتوکاڵدا، کە لە ساڵی 1953ـەوە تووشی قەیران هاتبوو ناوبانگی پتری دەرکرد. بە پێی پێشنیارەکانی خرۆشۆف ماڵیاتە کشتوکاڵییەکان لە سەر بەشی تایبەتیی وەرزێران لە زەوی و کێڵگە هاوبەشەکاندا کەم کرانەوە و نرخی دەغڵ و دانی کێڵگە هاوبەشەکان زیادی کرد. هەر بۆیەش لە ساڵی 1954 ـەوە دەغڵ و دان بە خێرایی رووی لە زیادبوون کرد. بۆ وێنە بەرهەمهێنانی دەغڵ و دان، کە لە ساڵی 1953 ـەوە لە هەشتا ملیۆن تەن تێنەدەپەڕی کەچی هەتا ساڵی 1958 گەیشتە سەد و سی و شەش ملیۆن تەن. گۆشت لە شەش ملیۆنەوە گەیشتە هەشت ملیۆن تەن. بەرهەمهێنانی چەوەندەری قەند دوو بەرامبەر بوو و بەرهەمهێنانی شیریش شێست لەسەد زیادی کرد.

گۆڕانی گرینگی دیکەی ساڵانی 1953 هەتا 1954 لە سۆڤیەتیدا، کە خرۆشۆف رۆڵی بەرچاوی تێیاندا هەبوو پاکسازیی قووڵی نێو دامودەزگا ئاسایشییەکانی سۆڤیەتی و لە سەر کار لابردن یا دەستبەسەرکردن یا دوورخستنەوەی زۆربەی بەرپرسانی پێشووی پاراستن و ئاسایشی سۆڤیەتی بوو. لە سەرەتاکانی ساڵی 1954دا رێکخستنی تەناهیی سۆڤیەتی لە فۆرمی وەزارەتخانەیەکی سەربەخۆ هێنرایە دەراو ناوی نرا کۆمیتەی تەناهیی دەوڵەتی، کە کورتکراوەی وشە روسییەکانی "کا، گا، ب" یە. رێکخستنی تەناهیی نوێ ئەو دەستڕۆیشتوویی و دەستئاوەڵاییەی پێشووی نەبوو بە تایبەتی بە شێوەی سەرەڕۆیانە نەیدەتوانی ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بگرێ . راوەدوونانی ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست بەبێ ئاگاداری و پەسندی بەرپرسانی حیزبی قەدەغە کراو ئەوە بووە هۆی بەدەسەڵاتبوونی ئەندامانی حیزبی و پتەوبوونی پێگەی خرۆشۆف لە نێویاندا.

یەکێك لەو کارە باشانەی دیکەی خرۆشۆف لە ساڵی 1954دا، کە لە سەر زیادبوونی دەغڵ و دان کاریگەریی باشی هەبو، گەڵاڵەی بووژاندنەوەی زەوییە بەیارەکان بوو. بە پێی ئەو گەڵاڵەیە سێزدە ملیۆن هەکتار لە زەوییەکانی باکووری قەزاقستان دەکێڵدران و دادەچێنران. گەڵاڵەی بووژاندنەوەی زەوییە بەیارەکان، کە گوژمەیەکی زۆری تێدەچوو لە لایەن هێندێ ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبەوە دژایەتیی کرا، بەڵام خرۆشۆف توانیی زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ ئەو گەڵاڵەیە هاودەنگ بکا و بە زۆرینەی دەنگ پەسندی بکا. لیۆنید برێژنێڤ Brejnev، کە لەو کاتدا کابرایەکی چل و هەشت ساڵان بوو و خۆشەویستی خرۆشۆفیش بوو کرایە سکرتێری دووەم ی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان و چاوەدێری جێبەجێ کرانی

ئەو گەلاڵەیە و ساڵێك دواتر پلەی چووە سەراو کرایە سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان و ڕێگەی سەرکەوتن و پێشکەوتنی بۆ داهاتووی خۆی خۆش کرد.

هەر لە سەرەتای ساڵی 1954 ـەوە ناکۆکی و هەڤرکێی نێوان خرۆشۆف و مالینکۆف لە سەر مەسەلەی حیزبی دەستی پێ‌کرد و لە کۆتایی ساڵی 1954دا بە هۆی دژایەتیی مالینکۆف لەگەڵ سیاسییەتە کشتوکاڵییەکانی خرۆشۆف چڕتر بۆوە. لەراستیدا خرۆشۆف هەر لە یەکەمین ڕۆژی هەڵبژێرانی مالینکۆف بۆ سەرۆکی وەزیران و سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی زۆری کەیف پێی نەدەهات و پاش ئەوەی کە بووە هۆی لە سەر کار لابردنی ئەو تەنیا بەمەبەستی ململانێ لەگەڵ بەریاو نەهێشتنی ئەو گیچەڵە لێی نزیك کەوتەوە. لەگەڵ لە سەر کار لابردن و ئیعدامی بەریا و پاکسازیی دامودەزگا تەناهییەکان و پاکژکردنەوەیان لە دەست وپێوەندی ئەو خرۆشۆف، کە ئیتر بە پێویستی نەدەزانی لەوە پتر لەگەڵ دۆستی تاکتیکیی خۆی دۆستایەتی بکا، وردە وردە تێی هەڵکێلاو مالینکۆفیش، کە وردە وردە لە لایەن خرۆشۆفەوە هەستی بە مەترسی دەکرد لەروویدا ڕاوەستا. خرۆشۆف لە سەرەتای ساڵی 1955 ـەوە راشکاوانە مالینکۆف ی تاوانبار کرد بە کارشکێنی لە پلانە کشتوکاڵییەکاندا و بە تەکنیکی دەراو خۆشکردنی لەوەپێش ئەو مەسەلەیەی لە کۆبوونەوەی گشتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا، کە لە مانگی فێبرییەی هەر ئەو ساڵەدا گیرا، هێنایە بەرباس. مالینکۆف، کە هەستی کرد لەکەمینەیە، بۆ ئەوەی تاوانبار نەکرێ بە خەیانەتکردن بە حیزب، دانی بەهەڵەکانی خۆیدا لە بواری کشتوکاڵیدا نا و، بەبێ ئەزمونی خۆی لە کاروباری دەوڵەتیشدا و لە سەر ویستی خۆی دەستی لە پۆستی سەرۆکی وەزیران هەڵگرت. کۆمیتەی ناوەندی مارشال بۆلگانینی، کە نزیکترین کەس بە خرۆشۆف و جێگە متمانەی ئەو بوو لە دەوڵەتدا، لە جێگەی ئەوی دانا و مالینکۆف، کە بە هۆی دانپیانان بە تاواندا لە مەترسیی پاکسازی رزگاری ببوو، لە دەوڵەتی نوێدا کرایە وەزیری کارەبا.

دوای لە سەر کار لابردنی مالینکۆف وهێنانەسەرکاری بۆلگانین وەك سەرۆکی وەزیرانی سۆڤیەتی خرۆشۆف زیاتر خۆی بە کاروباری سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتییەوە خەریك کرد. لە مانگی مای ساڵی 1955دا لە وەلامی بەرینکردنەوەی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری(ناتۆ)دا و وەرگیرانی ئەڵمانی خۆرئاواش بە ئەندامەتی تێیدا، پەیمانێکی بەرگریکردن لە نێوان سۆڤیەتی و حەوت وڵاتی دیکەی ئەورووپای خۆرهەڵات(پۆلۆنیا و هەنگاریا و ڕۆمانیا و ئەڵمانیای خۆرهەڵات و چیك و

سلۆڤاكيا و بۆلغارستان و ئەلبانی )دا بۆ ماوەی بیست ساڵ لە وەرشۆ مۆر كرا، كە بە پەیمانی وەرشۆ ناوبانگی دەركردووە. لە مانگی ژووئیەی هەر ئەو ساڵەدا خرۆشۆف بۆ ئەستاندنەوەی یۆگسلاڤیاو لكاندنەوەی بە یەكێتیی سۆڤیەتییەوە چووە بێلگراد و هەرچەندە لەو دەستێوەردانەدا ئامانجی راستەقینەی خۆی نەپێكا، بەڵام كۆتایی بە رەوشی قەیراناویی نێوان ئەو دوو وڵاتە، كە ساڵی 1948 ـەوە پێكهاتبوو هێنا. مۆلۆتۆف، كە لە كاتی سەرهەڵدانی ئەو قەیرانەدا لە ساڵی 1948داوەزیری كاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی بوو لەگەڵ ئەو تەكنیكە سیاسییەی خرۆشۆف دانەبوو و هەربۆیەش لە سەفەری بێلگراددا لەگەڵی نەچوو.

لە هاوینی ساڵی ی1955دا(18 هەتا 13ی ژووئیە) یەكەمین كۆنفرانسی رێبەرانی وڵاتانی گەورە پاش كۆنفرانسی ساڵی 1945 ی پۆتسدام لە ژنێڤ گیرا. لەو كۆنفرانسەدا ئایزینهاوێر ی سەرۆك كۆماری ئەمریكا، ئەنتۆنی ئەیدێنی سەرۆك كۆماری بەریتانیاو ئەدگارفاوری سەرۆكی وەزیرانی فەرەنسا لەگەڵ وەزیری دەرەوە و وەزیری بەرگریی خۆیان كۆببوونەوە. بۆلگانین سەرۆكی شاندی نوێنەرانی سۆڤیەتی بوو، كە لەو كاتدا سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتی بوو و ئەندامانی باڵای وەڤدی نوێنەرایەتیش، كە لەگەڵی بوون بریتی بوون لە وەزیری كاروباری دەرەوەی و وەزیری بەرگریی نوێی سۆڤیەتی مارشاڵ ژۆكێڤ، بەڵام خرۆشۆڤیش حەزی لێ بوو بەشداری ئەو كۆنفرانسە بێ. خرۆشۆف وەك یەكێك لە ئەندامانی وەڤدی نوێنەرایەتیی سۆڤیەتی لە كۆنرانسی ژنێڤدا بەشدار بوو، بەڵام بە كردەوە سەرۆكی وەڤدەكە بوو و رێبەرانی وڵاتانی تر، كە بەشداری ئەو كۆنفرانسە بوون بە تەواوەتی هەستیان بەوە دەكرد، كە ئەو لە هەموو ئەندامانی وەڤدەكەی لە سەرترە.

خرۆشۆف بەشێكی بیرەوەرییەكانی خۆی تەرخان كردووە بۆ كۆنفرانسی رێبەران لە ژنێڤ و دەنووسێ ئایزنهاڤری سەرۆك كۆماری ئەمریكا كابرایەكی ساویلكە بوو و لە ماوەی كۆنفرانسی ژنێڤدا فۆستەردالسی وەزیری دەرەوەی ئاگای لێی بوو. خرۆشۆف دەنووسێ لە كۆبوونەوەكانی كۆنفرانسدا لە تەنیشت ئایزنهاڤرەوە دادەنیشت و من، كە لە لای چەپی بۆلگانینەوە دانیشتبووم زۆری لێ دوور نەبووم و بە جوانی دەمدیت، كە هەر كات شتێكی تازە دەهاتە گۆڕێ‌دالس لەڕێوە یادداشتێكی دەنووسی و لە پێشیدا دەنا و ئایزنهاڤر بە خوێندنەوەی ئەو یادداشتە قسەی لە سەر ئەو مەسەلەیە دەكرد، كە خرابووە بەرباس.

خرۆشۆف ئەوەشی لێ زیاد دەكا، كە دالس دوژمنی سوێندخواردوومان بوو، بەڵام دوژمنێكی ژیر بوو و دەیزانی، كە دەتوانێ هەتا كوێ لەگەڵ ئەو ململانێیە بڕواتە

پێشێ. خرۆشۆف، "ئایدن"ی سەرۆکی وەزیرانی بەریتانیاش وەك سیاسەتڤانێکی واقیع بین و خۆگونجێن تاریف دەکا و دەڵێ کاتێك داوای لێکردین سەردانێکی بەریتانیا بکەین لە دڵەوە قەبووڵمان کرد.

خرۆشۆف و بۆلگانین لە کۆتایی ساڵی 1955دا سەفەرێکی پڕ لە هەڵلایان بەرەو هێندوستان و ئەفغانستان کرد. لەو سەفەرەشدا خرۆشۆف سەرۆکی راستەقینەی وەڤدی نوێنەرایەتیی سۆڤیەتی بوو هەڵویستی وەڤدی نوێنەرایەتیی سۆڤیەتی چ لە کۆبوونەوەکانی دانوستانی فەرمیدا و چ لە کۆنفرانسە رۆژنامەنووسییەکاندا لە لایەن ئەوەوە راگەیەندرا.

# بەشی هەشتەم

## حکوومەتی خرۆشۆف

زۆربەی دیرۆکنووسانی مێژوو فێبرییەی ساڵی1955یان، بە سەرەتای حکومەتی خرۆشۆف نووسیوە. هەروەکی دەزانین خرۆشۆف لەو ڕێکەوتەدا لە ململانیٚ لە سەر جێگرتنەوەی ستالیندا، دووەمین خەنیمی خۆی شکاند و مالینکۆف، کە بۆ ماوەی نزیك بە دوو ساڵ پاش مەرگی ستالین سەرۆکایەتیی وەزیرانی لە ئەستۆ بوو بە دانپیانان بە هەڵە و تاوانی خۆیدا دەستی لەو پۆستە کێشایەوە. ئەو سەرۆك وەزیرەی سۆڤیەتی، کە بە پێشنیاری خرۆشۆف لەو پۆستەدا دانرا بۆلگانین بوو، کە بە کردەوە لەبەردەستی خرۆشۆفدا بوو و لە مەسەلە پێوەندیدارەکانی بە کاورباری نێوخۆیی و دەرەوەی سۆڤیەتیدا بە بیٚ قسەی وی قامکی لە ئاویٚ ڕۆ نەدەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا گیرانی بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە فێبرییەی ساڵی 1956دا ڕێکەوتی دەستپێکردنی راستەقینەی حکوومەتی خرۆشۆفە. لەبەر ئەوەی کە هەتا گیرانی ئەو کۆنگرەیەش هێشتا لە نێو ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە دواتر ناویان نا دەفتەری سیاسی، کەسانێك هەبوون، کە لەبەرامبەریدا رادەوەستان و دژایەتییان دەکرد و بۆچوون و پێشنیارەکانی ئەویان بە مەسەلەی سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەکیی سۆڤیەتییەوە دەکردەوە بە هیچ و دەیانبردە ژێر پرسیار. مۆلۆتۆف وەزیری دەرەوە و کاگانۆڤیچ وەزیری پیشە قورسەکانی سۆڤیەتی و سەرۆکی پێشووی خرۆشۆف لەو کەسانە بوون، کە لە کۆبوونەوەکانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب رەخنەیان لە هێندیٚ گەلاڵەی ئابووری و شێوازەکانی خرۆشۆف لە سیاسەتی دەرەوەی خرۆشۆف دەگرت. مالینکۆف سەرەڕای ئەوەی کە لە سەرۆك وەزیری خرابوو، بەڵام لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا هەر مابوو و ڕێگەیەکی کۆنەپارێزانەی رەچاو کردبوو، بەڵام

له ناخەوە لەگەڵ خرۆشۆف هاوڕا نەبوو و ئەگەر پێگەی خرۆشۆف بەرەو لاوازی چووبایە ئەوا سێ ئەندامەکەی دیکەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیش حەزیان لێ بوو رەگەڵ دژبەرانی ئەو بکەون.

بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە رۆژی چواردەیەم هەتا بیست و پێنجەمی فێبرییەی ساڵی 1956دا لە مۆسکۆ گیراو خرۆشۆف لە سەرەتای کۆنگرەکەدا راپۆرتێکی تێروتەسەلی لە سەر کار و کردەوەکانی خۆی پێشکەش کرد. بەشێکی گرینگی ئەو راپۆرتە بۆ کاروبار و مەسەلەی حیزبی تەرخان کراوە بۆ وێنە خرۆشۆف ئاماژەی بە دوایین سەرژمێریی ئەندامەتیی لە حیزبدا، کە لە 6795896 تێپەڕیوە کرد. خرۆشۆف لە سەر ئەو سەرکەوتنانەی، کە لە بواری کشتوکاڵدا دەستەبەر بوونە گوتی بە تێکەڵکردنی زەوییە بچووکەکانی کێڵگەهاوبەشەکان لەگەڵ کێڵگە هاوبەشە گەورەکان ژمارەی کێڵگەهاوبەشەکان (ئەو وەرزێر و جوتیارانەی زەوی و زاری خۆیان هەیە) لە 254000 یەکەوە لە سەرەتای ساڵی 1950دا، دابەزیوەتە 61371 یەکە لە سەرەتای ساڵی 1956دا. هەروەها خرۆشۆف گوتی، کە دەغڵ و دان لە سۆڤیەتی لە ساڵی 1929 وە، کە سەرەتای هاوبەشکردنی کشتوکاڵە هەتا ساڵی 1955 تەنیا سی وپێنج لە سەد زیادی کردووە و زیاترین گەشەکردنەکە هی ئەو ساڵانەی دوایی واتە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی خۆی بووە. خرۆشۆف ئەوەی لێ زیاد کرد، کە حەشیمەتی سۆڤیەتی لەو بیس وشەش ساڵەی دواییدا 45٪ زیادی کردووە و دانی بەوەدا نا، کە پشکی خەڵکی سۆڤیەتی لە دەغڵ و دان و گۆشت و شیرەمەنی لەو ماوەیەدا 10٪ کەمی کردووە.

سەرژمێرییەکانی خرۆشۆف لە سەر گەشەی پیشەیی سۆڤیەتی زیاتر باس لە گەشەی پیشە قورسەکان و زیادبوونی مەکینەی شەڕیی سۆڤیەتی بوو. یەکێك لە کێشەکانی ئەو لەگەڵ مالینکۆف کەوازی پێ لە پۆستی سەرۆك کۆماری هەڵگرت پێداگرتنەوەی لە سەر گەشەی پیشەی بەکاربەری و پێداگرتنی خرۆشۆف لە سەر گەشە پێدانی پیشەقورسەکان بوو. لەوەشیاندا خرۆشۆف ئامانجێکی سیاسیی هەبوو و دەیویست ئەو فەرماندەرە سەربازییانەی، کە لایەنگری پیشەسازیی قورس بوون بۆ لای خۆی راکێشێ. کارخانەکانی چەکوچۆڵ سازکردن بەشی هەرەزۆری پیشەسازیی قورسیان پێك دێنا و بەرهەمەکانی ئەو کارخانانە لە ماوەی دوو ساڵی 1954ـەوە هەتا 1955 بەشێوەیەکی بەرچاو زیادیان کرد.

خرۆشۆف له راپۆرته فەرمییەکەی خۆیدا بۆ کۆنگرەی بیستەمی له ئاماژەی راستەوخۆ بە سەردەمی ستالین خۆی بوارد و تەنانەت ئاماژەی بەو کۆمیسیۆنەش نەکرد، کە لێکۆڵینەوەی لە هێندێك لە چەوتی و گەندەڵییەکانی پێشوو دەکرد. راپۆرتەکەی ئەو هەر وەکی چاوەڕوان دەکرا لەو دە رۆژەیدا، کە کۆبوونەوەکانی کۆنگرە درێژەیان کێشا لە لایەن نزیك بە هەزار و چوارسەد کەسەوە پەسند کراو پاش وتەی ئەو کەسانەی، کە بە نوێنەرایەتیی کۆماریە جۆراوجۆرەکان قسەیان دەکرد بە زۆرینەی دەنگ پەسند کرا. ئەوجار کۆنگرە دەستی بە هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی کرد، کە رێژەی ئەندامەکانی گەیشتبووە 133 ئەندامی سەرەکی و 122 ئەندامی جێگر یا پاڵێوراوی ئەندامەتی.

زۆربەی هەڵبژێردراوان کەسانی تازە بوون و لە لێکۆڵینەوەیەکیدا، کە دواتر لە لایەن یەکێك لە کارناس و پسپۆڕانی کاروباری روسیاوە کرا 76کەس لە ئەندامانی سەرەکیی کۆمیتەی ناوەندی کەسانێك بوون، کە خرۆشۆف خۆی پۆستی حیزبیی پێ سپاردبوون. دوو ئەندامی تازەی دەستەی رێبەرایەتیی کۆمیتەی ناوەندی و پێنج کەس لە پاڵێوراوان بۆ ئەندامەتی لە دەستەی رێبەریدا و هەروەها پێنج ئەندامی تازەی سکرتاریای حیزبیش بە گشتی لە لایەنگرانی خرۆشۆف بوون و خۆی داینابوون.

خرۆشۆف پاش ئەوەی کە دڵنیا بوو لەوەیکە لە کۆمیتەی ناوەندیدا پێگەی باشی هەیە نوێنەرانی کۆنگرەی بۆ کۆبوونەوەیەکی نهێنی بانگهێشت کرد. ئەو کۆبوونەوەیە، کە دوای کۆتایی هاتنی کاروبارە فەرمییەکانی کۆنگرە لە شەوی 24و 25ی فێبریبیەدا پێك هات تەرخان کرا بۆ بیستنی راپۆرتە بەناوبانگەکەی خرۆشۆف لە سەر سەردەمی ستالین. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ، کە پێشنیاریهێنانەبەر باسی پرسگەلی پێوەندیدار بە سەردەمی ستالینی لە کۆنگرەی بیستەمدا و لە کۆبوونەوەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا هێناوەتە گۆڕێ و تەنیا سێ کەس لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی (مۆلۆتۆف و ڤۆرشیلۆف و کاگانۆڤیچ) دژایەتیی ئەو گەلاڵەیەیان کردووە. میکۆیان و مالینکۆف (کە هێشتا ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی بوو) راشکاوانە دژایەتیی پێشنیارەکەی خرۆشۆفیان نەکردووە، بەڵام لە دڵەوە لەگەڵیدا نەبوونە و دواجار لە سەر ئەوە رێك کەوتوون، کە باسەکە پاش کۆتایی کاروبارە رەسمییەکانی کۆنگرە و لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیدا تاوتوێ بکرێ.

خرۆشۆف راپۆرتەکەی خۆی لە ژێر ناوی (ڕێبازی تاك پەرستی و ئاکامەکانی) بردە کۆبوونەوەی نهێنیی کۆنگرەی بیستەم. لە حاڵێکدا پێدەچێ نیازی سەرەکیی ئەو لەو راپۆرتە ئەوە بووبێ، کە خۆی زۆری حەز لە زێدەخوازی و بەرزکردنەوەی کەسایەتیی خۆی بووە، چونکی خرۆشۆف پێی وایوو تەنیا بە شکاندنی بتی ستالین دەتوانێ وەك کەسایەتییەکی بەرز و بەرجەستە و ناوازە دەرکەوێ و هاوکارەکانی سەردەمی ستالینی بخاتە ژێر هێژموونیی خۆیەوە. خرۆشۆف لە راپۆرتەکەیدا بۆ یەکەمین جار جەنایەتەکانی ستالین لەگەڵ هیتلەر بەراورد دەکا و دەڵێ نەیدەتوانی لە بەرامبەر ئەو هەمووە ناهەقییەدا بێدەنگ دانیشێ و حەقیقەتەکان لە خەڵك بشارێتەوە. ئەو هەروەها دەڵێ، کە ئەو راستییانە سەرەڕای تاڵبوونەکەشیان هەر دەبوو بگوترێن بۆ ئەوەی نەهێڵن ستالینی دیکە لە داهاتوودا دروست ببنەوە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە، کە خرۆشۆف لەراپۆرتەکەیدا بۆ کۆنگرەی بیستەم تەنیا باسی لە بەشێکی بچووکی حەقیقەتەکانی سەردەمی ستالین کردووە و زۆربەی ئەو کارەساتانەی سەردەمی ستالینی دیزەبەدەرخۆنە کردووە، کە خۆی تێیاندا بەشدار بووە.

راپۆرتەکەی خرۆشۆف بۆ بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە لە بەشی (سەردەمی حکوومەتی ستالینیشدا) ئاماژەمان پێکرد بە پێشەکییەك سەبارەت بە ڕێبازی تاك پەرستی و دژایەتیی لەگەڵ روانگەکانی مارکسیزم لینینیزم دەست پێدەکا. خرۆشۆف ئەو جار باسی تایبەتمەندییە تاکەکەسییەکانی لینین دەکا و بە هێنانەوەی چەند بەشێك لە وەسییەتنامە و نامەکانی لینین سەبارەت بە ستالین دەست دەکا بە هێرشکردن بۆ سەر ئەو(ستالین). راوێژی خرۆشۆف بەرامبەر بە ستالین هەر دی و توندتر دەبێ و بەشێکی زۆر لە جەنایەت و کارەساتەکانی سەردەمی ستالین و دەستبەسەرکران و ئەشکەنجە و ئیعدامی زۆربەی کەسایەتییە ناودارە حیزبی و دەوڵەتییەکان، کە ستالین خۆی بڕیاری لە سەر داون بە خستنەڕووی بەڵگە و دیکۆمێنتی دامودەزگا منییەتی و ئاسایشییەکان ئاشکرا دەکراو لە قاو دەدرێن. خرۆشۆف ئەمجار ئاماژە بە رۆڵی ستالین لە سەردەمی شەڕدا دەکاو دەڵێ بە پێچەوانەی ئەوەی، کە بڵاڤۆك و فیلیمە هێڵنجهێنەرەکانی سەردەمی ستالین دەیخەنە روو ستالین نەك هەڵکەوتوویەکی سەربازی نەبووە بەڵکو خەتای زۆربەی تێکشکان و بەزینەکانی لەشکری سوورر و تێداچوونی ملیۆنان سەرباز و خەڵکی بێ تاوانیش لە ئەستۆی ئەوە. هەروەها خرۆشۆف ئاماژە دەکا بە(کورتەیەك لە ژیاننامەی ستالین)، کە پاش شەڕ لە ملیۆنان بەرگدا بە زمانە جۆراوجۆرەکان چاپ و بڵاو بۆتەوە و لە بەشی رووداوەکانی پێوەندیدار بە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی ستالیندا باسی چەند بەشێکیمان کرد، و دەڵێ ستالین خۆی بەو کتێبە

پڕ له دەمتــەڕی و پەســن بێژییــەدا چــۆتەوە و بــە قەڵــەمی خــۆی شــتی لــە ماستاوچــێتییەکانی ماستاوچییەکان زیاد کردووە، کە ئەوە خۆی باشترین بەڵگەی خۆ پەرستییە.

بێرترام ۆولف لێکۆڵەری ناوداری ئەمریکی، کە پێشتریش ناومان هێنــا لــە کتێبێکــدا بــە ناوی (خرۆشۆف و تاپۆی ستالین) بە وردی راپۆرتەکەی ســتالینی بــۆ کۆبوونــەوە نهێنییەکــەی بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیست تاوتویێ کردووە. بێرترام ۆولف لەو لێکۆڵینەوەیەدا زیاتر ئاوڕی لە راستییە چەواشەکراوەکان و ئەو بابەتگەلە داوەتەوە، کە خرۆشۆف یا دیزەبەدەرخۆنەی کردوون یا هەر باسی نەکردوون.

بێرترام ۆولف بە تایبەتی لە سەر ئەو خاڵە پــێ دادەگرێتــەوە، کــە خرۆشــۆف وێــڕای پشتبەستن بە وەسییەتنامەکەی لینین بۆ مەحکومکردنی ستالین، گوێی نەداوەتە ئەوەی کە لە لایەن ترۆتسکی و زینۆویێڤ و کامینۆڤ و بۆخارینەوە بە راشکاوی پشتڕاست کراوەتەوە و رەتاندن و لە نێوبردنی ئەوان وەکو دژەلینینیستێك پشتڕاست دەکاتــەوە. خرۆشــۆف، کــە ئاماژە بە پاکسازییە خوێناوییەکانی ساڵانی 1934 هەتا 1938 دەکا دادگاییە مەزن و شانۆییەکانی ئەو سەردەم و حوکمدرانی کەسانی وەك "زینۆویێڤ و کامینۆڤ و بۆخارین و ریکۆڤ" مەحکووم ناکاو تەنیا ئەو جەنایەتگەلــە مــەحکووم دەکــا، کــە بــە شــوێن ئــەو دادگاییکردنانەدا هاتنە گۆڕێ، و دەڵێ : پاش ئەوەی کە بە تێکشکاندنی ترۆتسکیستەکان و لایەنگرانی بۆخارین و زینۆویێڤ یەکێتیی حیزب دابین کرایەوە" ئیدی ئەو جەنایەتگەلــە هیچ پێویست نەبوون. خۆ بواردنی خرۆشۆف لە مەحکوومکردنی دادگاییــە شــانۆییەکانی ساڵانی 1934 هەتا 1938 هۆکارێکی روونــی هەیــە، چــونکی هــەر ئــەو خــۆی لــەو ســـەردەمەدا وەك ســـکرتێری یەکـــەمی حیزبـــی کۆمۆنیســـتی ناوچـــەی مۆســـکۆ بـــۆ پشتڕاستکردنەوە و پشتگیری لەو دادگاییانە گەلێك وتاری دا و لــە ســایەی ئــەو خــۆش-خزمەتییانەوە ساڵی 1939 کرایە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی حیزبــی کۆمۆنیســت یــا بەرزترین ئۆرگانی بڕیاردەر لە ســۆڤیەتی. بێرتــرام ۆولــف دەڵــێ خرۆشــۆف دەبــێ وەك " هەوڵێك لە پێنــاوی دابینکردنــی یــەکێتیی حیــزب"دا باســی لــە نێــوبردنی کــامینۆڤ و ترۆتسکی و زیۆویێڤ بکا، چونکی بە بێ لەنێوچوونی ئەوان لە بەرزترین ئۆرگان و پۆســتە حیزبییەکاندا ئیدی جێگەیەك بۆ کەسانی وەکو مۆلۆتۆف و کاگانۆڤیچ و بەریا و خرۆشۆف و مالینکۆف نەدەمایەوە.

بێرترام ۆولف لە شیکردنەوەی کەسێتیی خرۆشۆفدا دەنووسێ، کە ئەو بە بێ گومـان یـەکێ بووە لە ماستاوچیترین دەوروبەرییەکانی ستالین هەر بۆیەش بۆ ماوەی چـواردە سـاڵ پۆسـت و پێگەی خۆی لە مەکتەبی سیاسیی حیزبدا پاراستووە و خۆی دەڵێ لە کۆتایی تەمەنی ستالیندا یەکێك بووە لەو دەگمەن کەسانەی، کە ستالین متمانەی پێی بووە. ستالین لە کۆتایی تەمەنیدا گومانی لە نزیکترین کەسانی خۆی واتە ۆورشیلۆف و مۆلۆتۆف و میکۆیـان و بـەریا هـەبوو، بەڵام خرۆشۆف قەت نەیوتووە، کە ستالین لـەو بـەگومان بـووە و وەهـا متمانەیـەك بـێ شـك سەرچاوەی لەوە دایە، کە خرۆشۆف هەمیشە بە بلوێری سـتالین سـەمای کـردووە و هیچـکات نەیویستووە دژایەتیی بکا.

دەڵێن کاتێك لە کۆبوونەوەی نهێنیی کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتیدا کاتێك خرۆشۆف بە تام و خوێوە باسی جەنایەتەکانی سـتالینی دەکـرد یـەکێك لـە نوێنـەرانی کۆنگرە لە کوتە کاغەزێکدا بۆی دەنووسێ:" ئەو کات بەڕێزتان چیتان دەکرد؟" خرۆشـۆف بـە دەنگی بەرز ئەو نووسراوەیە دەخوێنێتـەوە و ئـەوجار سـەری بـەرز دەکاتـەوە و چـاویلکەکەی دەردێنێ و دەپرسێ:" ئەو یادداشتە کێ ناردوویەتی؟" هیچ کـەس وەڵام ناداتـەوە و خرۆشـۆف بڕێك دەوێستی و دەڵێ " منیش هەر ئەو کارەم دەکرد، کە ئێوە دەیکەن." خرۆشۆف دەیویست بڵێ منیش وەك ئێستای ئێوە نەمدەوێرا خۆم دەرخەم.

راپۆرتە نهێنییەکەی خرۆشۆف هـەر بـەو شـێوەیەیش، کـە خـۆی دەیویسـت زۆریـش بـە نهـێنی نەمایەوە، چونکی جگە لەوەی زیاتر لە چوارسەد نوێنەری کـۆنگرە بیسـتیان چـەند نەسکێکیشـیان* (استنساخ، کۆپی) بۆ رێبەرانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی دیکە نارد بۆ ئەوەی لـە نێوەڕۆکەکـەی ئاگادار بن. دەقی ئـەو راپۆرتـە هـەروەها لـە کۆتاییـەکانی سـاڵی 1956 دا بـڵاو بـۆوە و کاتێـك پرسیاریان لە خرۆشۆف کرد، کە :"ئەو راپۆرتە نهێنییە چۆناوچۆن تەشەنەی کردۆتـە دەرەوە؟" وەڵامـی دابۆوە، کە پرسیاری ئەم نهێنییە لە ئالێندالس ( سەرۆکی رێکخراوی سیا) بکەن.

## 2

هەروەکی چاوەڕوان دەکرا راپۆرتەکەی خرۆشۆف بۆ کۆبوونەوەی نهێنیی کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە نێوخۆ و دەرەوەی وڵاتدا دەنگدانەوەیەکی بەربڵاوی هەبوو. لە

* نەسك: کۆپی، استنساخ

نێوخۆی وڵاتدا کۆنە ڕێبەران و ئەو کەسانەی کەم تا زۆر دەستیان هەبوو لەو جەنایەتانەدا، کە ستالین کردبوونی زۆری پێ قەڵس بوون، چونکی تەنانەت ئەو کەسانەش، کە لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیشدا دەنگیان دا بوو بە خستنەڕووی ڕاپۆرتێك لە سەر ئەو هەڵە و چەوتیانەی لە رابردوودا کرابوون پێیان وانەبوو، کە خرۆشۆف هەتا ئەو رادەیە پێ لە بەرەی خۆی راکێشی و بەم جۆرە ستالین بشکێنی و وردی بکا. ئەو راپۆرتە نیگەرانی و دڵەراوکێی خستە نێو ڕێبەرانی وڵاتانی کۆمۆنیستیی دیکەشەوە، چونکی زۆربەی ئەوانیش پاشماوەی ستالین و لە ستالینیستە ناودارەکان بوون. یەکێك لەو ستالینیستە ناودارانە "بولسلاو بیروت"ی ڕێبەری حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیا و یەکەمین سەرۆككۆماری ئەو وڵاتە بوو لە پاش شەڕی دووەمی جیهانی، کە پاش تەواوبوونی بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی مانگێکی نەبرد مرد و بە دوای مەرگی لە نەکاو و پڕ نهێنیی ئەودا کۆمەڵێك دەنگۆ لە پۆلۆنیاو وڵاتانی دیکەدا بڵاو بوونەوە. لە کۆتاییەکانی مانگی ژووئەنی ساڵی 1956دا یەکەمین سەرهەڵدانی کرێکاری لە شاری پێزنانی پۆلۆنیا دەستی پێکرد و درێژەی ئەو بشێوییانە هەتا مانگی ئۆکتۆبەر بۆوە هۆی دووبارە هەڵبژێرانەوەی ڤلادیلا و گۆمولکا ی ڕێبەری بە ناوبانگی پۆلۆنیایی، کە لە رەوتی پاکسازییە ستالینییەکانی ساڵی 1948دا لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیای لێ ئەستێنرابۆوە و بەند کرابوو. چەند رۆژ پاش هەڵبژێرانی گۆمولکا بۆ سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیا، کە سەرەڕای دژایەتیی مۆسکۆ بەرێوەچووبوو شۆڕشی هەنگاریا دەستی پێکرد و خرۆشۆف ناچار بوو بۆ پاراستنی دەسەڵاتدارێتیی مۆسکۆ بەسەر وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتدا بە هێزی سەربازیی ئەو شۆڕشە سەرکوت بکا. لە دوای شەڕی دووەم ی جیهانییەوە ئەوە یەکەمین دەستێوەردانی راستەوخۆی لەشکری سوور لە وڵاتێکی دەرەکیدا بوو، کە زیانێکی قورسی بە پێگەی نێودەوڵەتیی سۆڤیەتی گەیاند و بووە هۆی لەرزۆکی و لەتبوون لە نێو حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی دیکەی جیهاندا. هاوکاتیی دەستدرێژیی سۆپای سوور بۆ سەر هەنگاریا لەگەڵ قەیرانی کەناڵی سۆئیز و هێرشی هێزەکانی بەریتانیاو فەڕەنساو ئیسراییل بۆ سەر میسر، سەرنجی بیر و رای گشتیی بۆ لای ئەو مەسەلەیە راکێشاو دەوڵەتی روسیا بە پشتیوانیکردن لە میسر لە بەرامبەر هێرشی هێزەکانی سێ کوچکە(بەریتانیاو فەڕەنساو ئیسراییل)دا تا رادەیەك پێگەی خۆی بەدەست هێنایەوە. لەو کاتدا رۆژنامەیەکی بریتانی کاریکاتێرێکی بڵاو کردەوە، کە زۆر ناوبانگی دەرکرد. ئەو کاریکاتێرە خرۆشۆف و بۆلگانینی

نیشان دەدا، کە هەرکامیان چەقۆیەکیان بە دەمەوەیە و دەستە خۆیناوییەکانی خۆیان لە رووباری نیلدا دەشۆنەوە. لە سەر دمی چەقۆکە وشەی هەنگاریا دەخوێندرێتەوە.

رووداوەکانی پۆلۆنیا و هەنگاریا، کە بە ئاکامی راستەوخۆی سیاسەتی دژە ستالینیی خرۆشۆف لە قەلەم دەدران، بووە هۆی لەرزۆکبوونی پێگەی ئەو لە نێوخۆدا و لەو باس و خواسانەدا، کە لە کۆبوونەوە تایبەتییەکانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا لە سەر پرسە ئابوورییەکان هاتنە پێش خرۆشۆف کەوتە بەر هێرشی رەخنەی راشکاوانەی کۆنە رێبەرانی حیزبەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خرۆشۆف توانیی گەڵاڵەی دێسانترالیزەکردنی ئابووری (نەهێشتنی ئابوری لە دەست ناوەنددا)، کە بووە هۆی کەمبوونەوەی رۆڵی دەوڵەت لە دیاریکردنی سیاسەتگەلی ئابووری و دابەشینی بەرپرسیارەتییەکانیان بەسەر یەکە جۆراوجۆرەکاندا، پەسند بکات.

پەسند کرانی گەڵاڵەی دێسانترالیزەکردنی ئابووری، کە دەبووە هۆی بەهێزبوونی بەرپرسانی حیزبن ورۆڵ گێرانی زیاتریان لە بەرێوەبردنی سیاسەتە ئابوورییەکاندا پێگەی خرۆشۆفی لە نێو حیزبدا بەهێز کردەوە، بەڵام لە نێو دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا دژبەران و نارازییەکانی ئەوی پێ زیاتر بوو. دژبەرەکانی ئەو لە نێو دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا بۆلگانین ی سەرۆکی وەزیران و سابۆرۆف ی سەرۆکی رێکخراوی پلاندانانی سۆڤیەتی بوون، کە لە تاوتویکردنی گەڵاڵەی دێسانترالیزەکردنی ئابووریدا دژایەتییان کردبوو.

لە مانگی مای ساڵی 1957دا، کە خرۆشۆف بە بێ وەرگرتنی رەزامەندیی پێشووی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی گەڵاڵەیەکی نوێی لە سەر زیادکردنی بەرهەمی خواردنی وەك گۆشت و شیرەمەنی، هێنایەگۆرێ دژبەرەکانی بڕیاریان دا دژی زێدەڕۆیی و کردەوە سەرەڕۆییەکانی خرۆشۆف راوەستن. مۆلۆتۆف و مالینکۆف و کاگانۆڤیچ کەسانی سەرەکیی هێزی دژیەرانی خرۆشۆفیان پێکدێنا، کە لە نیوەی یەکەمی مانگی ژووئەنی ساڵی 1957دا توانییان چوار ئەندامی دیکەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندییش واتە ۆورشیلۆف، بۆلگانین و سابۆرۆف و پرووخین رەگەڵ خۆیان بخەن. وایان دانا لە سەفەری نیوەی دووەم ی ژووئەنی خرۆشۆف و بۆلگانیندا بۆ فەنلاند پیلانی لێخستنی لە سکرتێریی یەکەمی حیزب داڕێژن و خرۆشۆف لە گەڕانەوەیدا لە فەنلاند لە فڕۆکەخانەوە یەکڕاست ببردرێ بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا، و بەر لەوەی دەرفەتی دژکردەوەی پێ بدرێ بە دەنگی زۆرینە پۆستەکەی لێ بستێندرێتەوە.

ئەو پیلانە بە پراکتیك کراو خرۆشۆف لـە کۆبوونـەوەی رۆژی 18ی ژووئـەنی 1957 ی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا بە دەنگی زۆرینە پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی لێ ئەستێندرایەوە. لە یازدە کەسـی ئەنـدامی دەسـتەی سـەرۆکایەتی تەنیا سێ کەس واتە میکۆیان و سوسلۆڤ و کیرچێنکۆ بە لایەنگریی لە خرۆشۆف دەنگیـان دا، کە بە دەنگی خۆیشییەوە دەبوونە چوار دەنگ لە بەرامبەر حەوت دەنگدا، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوانەی دژی خرۆشۆف یەکیان گرتبوو ئەو سەری بۆ دانەنوانـدن و گـوتی، چـونکی کۆمیتـەی ناوەندی ئەوی بۆ سکرتێریی یەکەمی حیزب هەڵبژاردووە دەستەی سەرۆکایەتی بۆی نییـە ئـەو لە سەر کار لابەرێ و بۆ بڕیاردان لە سەر مانەوە یا بەردەوامیی ئەو لەم پۆسـتەدا دەبـێ هـەر 133 ئەندامەکەی کۆمیتـەی ناوەنـدی بانگهێشـت بکـرێن. زۆرینـەی ئەنـدامانی دەسـتەی سـەرۆکایەتی پێملـی داواکـەی خرۆشـۆف نـەبوون، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی بـۆ قـایلکردن و بـە چۆکداهێنانی خرۆشۆف لە بەرامبـەر بڕیارەکـەی خۆیانـدا بـەگوێرەی پێویسـت کارئاسـانییان نەکردبوو دەستیان کرد بە مشتومڕی بێ جێ لەگەڵ ئەو. لەو نێوەدا خرۆشۆف دەرفـەتی هێنـا پێوەندی بکا بە مارشال ژۆکێف ی وەزیری بـەرگری و ژەنـەراڵ سـێرۆڤ ی سـەرۆکی کۆمیتـەی منییەتی دەوڵەتی(کا.گا.ب)، کە هەر دووکیان لە لایەنگرە تۆخەکانی ئەو بوون و بەو شێوەیە هێزە چەکدارەکان بکاتە پشتیوانی خۆی.

بێژێنسکی لە کتێبی (دەسەڵاتی سیاسـی)دا بـە تێـرو تەسـەلی باسـی ئـەو دەمەقاڵـە و مشتومڕە سەیروسەمەرەی کرێملینی کردووە و لەم بارەیەوە دەنووسێ پاش ئەوەی کە خرۆشـۆف توانیی پێوەندی بە لایەنگرەکانی خۆیەوە بکا ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بە خێرایـی لە چوارقوڕنەی وڵاتەوە هاتنە مۆسکۆ و ژۆکێف بە فڕۆکەی سەربازی ژمارەیەکی زۆری ئـەوانی لە رۆژەکانی نۆزدەیەم هەتا بیست و یەکەمی ژووئەندا گەیاندە مۆسکۆ بە چەشنێك، کە رۆژی بیست و یەکەمی ژووئەن زیاتر لـە سـەد کـەس لـە ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیـزب گەیشتبوونە مۆسکۆ و لە سەر داوای ئەوان بە نووسراو بۆ گرتنی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی، دەستەی سەرۆکایەتی هیچ چارەیەکی نەما جگە لەوەیکە ئەو داوایە وەرگرێ . لەو نێوەدا چەند کەسێك لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی وەکو ڤۆرشیلۆف و سـابۆرۆف، کـە سـەری خۆیـان خوێندبۆوە وازیان لە دژایەتیکردنی خرۆشۆف هێنا بۆلگانین و پرۆخینیش پەژیوان بوونەوە لـەو دەنگەی بە دژی خرۆشۆف دابوویان.

رۆژی بیست و دووەم ی ژووئەن پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوە و بۆ ماوەی سی 30 کاتژمێر بەبێ وچان ئەو رەوشە قەیراناوییەیان تاوتوێ کرد، کە بە هۆی ناکۆکیی هێندێك لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی لەگەڵ خرۆشۆفدا پێکهاتبوو. مۆلۆتۆف و مالینکۆف و کاگانۆڤیچ هۆی دژایەتیکردنی خۆیان لەگەڵ مانەوەی خرۆشۆف لە پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبدا راگەیاند و شێپلۆفیش، کە پالێوراوی ئەندامەتی لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا بوو بە دژایەتی لەگەڵ خرۆشۆفدا رەگەڵیان کەوت. ڤۆرشیلۆف بێ دەنگەی لێ کرد و رەخنەکانی بۆلگانین و پرووخین و سابوورۆف لە خرۆشۆف سادە و نەرم و نیان بوون. خرۆشۆف وێڕای دیفاع و بەرگری لە سیاسەتەکانی خۆی بە توندی هێرشی کردە سەر دژبەرەکانی و بە "دژە حیزبی"ی ناو بردن، بەڵام دوخی تیژی هێرشەکەی ئەو بەرەو سێ کەس واتە مۆلۆتۆف و مالینکۆف و کاگانۆڤیچ بوو و ئەوانی دیکەی بە گۆپاڵ و دارەدەستی ئەوان ناوبرد. دواجار کۆمیتەی ناوەندی بە زۆرینەی دەنگ، دەنگیان بە مانەوەی خرۆشۆف لە پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبدا و چوار کەس ( مۆلۆتۆف و مالینکۆف و کاگانۆڤیچ و شپیلۆف) ی وەکو ماکەی سەرەکیی گرووپی دژە حیزبی، لە کۆمیتەی ناوەندی و دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی وەدەر نان.

چوار کەسەکەی تر واتە بۆلگانین و ڤۆرشیلۆف و سابورۆف و پرووخین سەرکۆنە کران، بەڵام پۆستی حیزبی و حکوومی خۆیان لەدەست نەدا، چونکی دەرکردنی ئەوان دەبووە خۆی ئاشکرابوونی دژایەتیی زۆرینەی ئەندامان دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لەگەڵ خرۆشۆف. لە سەر پێشنیاری خرۆشۆف رێژەی ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی لە یازدەکەسەوە بۆ پانزە کەس زیاد کران و حەوت ئەندامە نوییەکەی دەستەی سەرۆکایەتی هەر هەمووان لە لایەنگرانی تۆخی خرۆشۆف بوون. چوار پالێوراوی ئەندامەتیی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندییش، مارشال ژۆکێف فۆرتسیڤاو بێژنێڤ و سڤێرنیك، کە لە ململانێی نێوان خرۆشۆف و دژبەرەکانیدا پشتیوانییان لەو کردبوو بۆ یەکەمین جار وەك ئەندامی سەرەکیی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژێردران.

گومانی تێدا نییە وەها رووداوێك لە سەردەمی ستالیندا دەبووە هۆی دادگاییکردن و ئیعدامی تەواوی دژبەرەکان، بەڵام خرۆشۆف شێوازێکی نوێی لە بەرامبەر دژبەرەکانیدا رەچاو کرد و بە پێدانی پۆستی دەوڵەتی لە ئاستی خوارەوەدا، کە لەچاو پلە و پێگەی ئەوان سووك و بچووك بوو، و بە دوورخستنەوەیان لە ناوەند، کە بە چەشنێك دوورخرانەوەیەکی رێزدارانە بوو وازی لێهێنان. مۆلۆتۆف کرایە باڵوێزی سۆڤیەتی لە مەغولستانی دەرەوە. مالینکۆف کرایە

سـەرۆکی کارخانەیـەکی بەرھەمھێنـەری کارەبـا و کاگـانۆڤیچ بەرپرسـیارەتی کارخانەیـەکی چیمەنتۆی لە "سۆردلیفیێسك" پێ ئەسپێردرا و شیپلۆف، کە لەچاو ئەوانیتر کەم مەترسیتر بوو لە یەکێك لە ناوەندە زانستییەکانی مۆسکۆدا خەریکی وانەگوتنەوە بوو.

بەو جۆرە خرۆشۆف نەك هەر توانیی ئەو پیلانە پووچەڵ بکاتەوە، کـە بـۆ لێخسـتنی ئـەو داڕێژرابوو بەڵکو لە چاو رابردوو پێگەیەکی گەلێك لە جاران پتـەوتر و بـە هێزتـری بەدەسـت هێنا. شیکردنەوەی ئەو رووداوە پێمان دەڵێ ئەگەرچی دژبەرانی خرۆشۆف زۆرینەی ئەنـدامانی بـەرزترین ئۆرگـانی بڕیـاردەری وڵاتیـان رەگـەڵ خۆیـان خسـتبوو، بـەڵام بـۆ چەسـپاندن و جێبەجێکردنی بڕیارەکەیان کارقایمی و پێشبینیی پێویستیان نەکردبوو و خۆیشیان بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ لاساریی خرۆشۆف لە بەرامبەر دەنگی زۆرینەدا تەیار نـەکردبوو، لـە حاڵێکـدا ئەگەر ئـەوان بەشـێکی کـەمیان لـە رێکخسـتنی تـەناهی رەگـەڵ خۆیـان خسـتبایە لەگـەڵ بەربەرەکانێی خرۆشۆف و مل بادانی لە بەرامبەر دەنگی زۆرینەدا قۆڵبەسـتیان دەکـرد و کـار نەدەگەیشتە ئەو جێگەیە و ئەگەر خرۆشۆف دەسبەسەر کرابا یا لە سەر کار لابرابایە، زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیـزبیش دەکەوتنـە گـەڵ لایـەنی زاڵ و سـەرکەوتوو و بڕیـاری زۆرینەی دەستەی سەرۆکایەتییان پشتڕاست دەکردەوە.

## 3

ساڵی 1957 گەلێك سەرکەوتنی دیکەشی بۆ خرۆشـۆف بـە دواوە بـوو. دوو سـاڵ پـاش پووچـەڵ کرانـەوەی پیلانـی لێخسـتنی خرۆشـۆف یـەکێتیی سـۆڤیەتی یەکـەمین مووشـەکی وشکارۆپیێوی(ئەو جۆرە مووشەکەی دەگاتە هەموو کیشوەرەکان) بە سەرکەوتوویی تاقی کردەوە و لە مـانگی ئۆکتۆبـەری هـەر ئـەو سـاڵەدا یەکـەمین مـانگی دەسـکرد یـا "sputnik" ی سۆڤیەتی لەگەڵ یەکێك لەو مووشەکە بە هێزانە وەحەوا خرا. وەحەوا خستنی یەکەمین مانگی دەسکردی جیهان لە لایەن بیرمەندانی روسیاوە پێگە و کەسێتیی یـەکێتیی سـۆڤیەتی و خـۆی خرۆشۆفیشی لە ئاستی جیهاندا بردە سـەرتر و مانگێـك دواتـر (رۆژی سـێیەمی نۆڤەمبـەری 1957) بە وەحەوا خستنی دووەمین مانگی دەسکردی سۆڤیەتی، کە کێشەکەی دوو هێندەی یەکەمیان و هەڵگری موسافیرێك( سەگێك بە ناوی لایکا) بـوو ئـەو سـەرکەوتنانەی، کـە لـە

بواری پیشەسازییەوە کە بیرمەندانی روسی بەدەستیان هێنا جیهانی تووشی سەرسوورمان کرد. ئەو سەرکەوتنانە بە تایبەتی ئەمریکییەکانیان بە توندی راتڵەکاند، کە لە بواری تەکنۆلۆجیاوە خۆیان زۆر لە سۆڤیەتی بە پێشکەوتووتر دەزانی و بووە هۆی مشتومڕێکی زۆر لە کۆنگرە و بلاڤۆکی ئەمریکیدا سەبارەت بە هۆکارەکانی پاشکەوتنی ئەمریکا لە پیشەسازیی گەردوون پێو و مووشەکسازیدا.

سەرکەوتنی سۆڤیەتی لە سازکردنی مووشەکە وشکارۆپێوەکان و لە وەحەوا خستنی مانگی دەسکرددا، بە تایبەتی لە بواری سەربازییەوە زۆر گرینگ بوو، چونکی دەوڵەتی سۆڤیەتی دەیتوانی بە بەرهەمهێنانی مووشەکی وشکارۆپێو و تەیارکردنیان بە کلاوکەی ناوکی راستەوخۆ هەرشە لە ئەمریکا بکات. ئەگەر ئەمریکییەکانیش بە خێرایی هەولیان نەدابایە، کە ئەو دواکەوتووییەی خۆیان قەرەبوو بکەنەوە بالانسی هێز لە جیهاندا بە قازانجی سۆڤیەتی تەواو دەبوو.

هاوکات لەگەڵ هەڵفراندنی یەکەمین مانگی دەسکرد لە لایەن بیرمەندانی روسیاوە گۆڕانێکی سەرسوورِ هێنەری دیکەش لە مۆسکۆ هاتە ئاراوە و ئەویش لە سەر کار لابردنی مارشاڵ ژۆکێڤ لە پۆستی وەزارەتی بەرگری بوو. هیچ پاساوێکی قایلکەر و لۆژیکی بۆ لە سەر کار لابردنی ژۆکێف نەخرایە روو و، چونکی ئەو لە قۆناغە جیاجیاکانی هەڵکشانی خرۆشۆفدا بەرەو لوتکەی دەسەلات بە تایبەتی لە رووداوەکەی مانگی ژووئەن و پووچەڵبوونەوەی پیلانی دژبەرەکانیدا رۆڵی سەرەکیی دیتبوو، بەلام خرۆشۆف لە سەفەرەکەی ژۆکێفدا بۆ یۆگۆسلاڤیا لە مانگی ئۆکتۆبەری 1957دا پۆستی وەزارەتی بەرگریی لێ ئەستاندەوە و ژۆکێف، کە لە یۆگۆسلاڤیا گەڕایەوە زانی لە سەر کار لابراوە. ژۆکێف پاش لێکەوتن لە پۆستی وەزارەتی بەرگری پلە و پایە حیزبییەکەشی لە کۆمیتەی ناوەندی و دەستەی سەرۆکایەتیدا لە دەست دا و لە سەردەمی خانەنشینییەکەیدا بیرەوەرییەکانی خۆی لە سەردەمی شەڕ، نووسینەوە.

بێرژێنسکی لە کتێبی "دەسەلاتی سیاسی"دا هۆکاری لە سەر کار لابردنی لە نەکاوی ژۆکێفی لە وەزارەتی بەرگری و لێ ئەستاندنەوەی پلەو پایە حیزبییەکەی تاوتوێ کردووە و دەنووسێ:" ژۆکێف بە برِینی بەرزترین پلەو پایە حیزبییەکان ئیتر ئیزنی بە کاربەدەستانی حیزبی نەدەدا دەست لە کاروباری سەربازی وەردەن و ئەگەر خرۆشۆف لەکاتی گونجاودا هەولی لە سەر کار لابردنی نەدابا مەترسیی ئەوە دەکرا، کە ژۆکێف لە هەل و دەرفەتێکی لەبار و گونجاودا بە پشتیوانیی دەوڵەت دەسەلات بەدەستەوە بگری و کۆمیتەی ناوەندیی حیزب ناچار

بکا پێملی بڕیارەکانی ئەو بن. ژۆکێف بە وەها دەسەڵاتێك گەیشتبوو، کە هەتا خۆی لەویٚ بوو خرۆشۆف نەیوێرا لە سەر کاری لابەری و بۆ ئەوەی بتوانیٚ بە ئاسانی کارەکەی جێبەجیٚ بکا لە پێشدا سەفەرێکی بۆ دەرەوەی وڵات بۆ رێکخست و ئەجار لە پۆستی وەزارەتی بەرگریی خست. ژۆکێف بە تۆمەتی بیروبۆچوونی گێچەڵ خوڵقێنانە و " بناپارتیزم" پۆستی ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و دەستەی سەرۆکایەتییەکەی لیٚ ئەستێنرایەوە و ئیتر جێگرەکانیشی لە وەزارەتی بەرگری رێگەیان نەدرا بچنە نێو دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندییەوە.

خرۆشۆف لە لوتکەی دەسەڵات و پێگەی نێودەوڵەتیی خۆیدا لە مانگی نۆڤەمبەری 1957 لە مۆسکۆ کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتیی پێکهاتوو لە حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان پێك هێنا. لەو کۆنفرانسەدا رێبەرانی حیزب و کۆمۆنیستەکانی سەرانسەری جیهان بۆ وێنە مائۆتسیٚ تونگ ی رێبەری کۆمۆنیستی چین بەشدار ببوون. لە پاش مەرگی ستالین و بڵاوبوونەوەی راپۆرتەی نهێنییەکەی خرۆشۆف لە سەر ستالین ئەوە یەکەمین سەردانی مائۆتسیٚ تۆنگ بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی بوو. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسیٚ: مائۆ بە رواڵەت خەباتی دژە ستالینیی ئێمەی بەدڵ بوو، بەڵام خەباتی ئێمە دژی رێبازی تاك پەرستی لە راستیدا خەباتێك لە دژی ئەویش بوو، چونکی پەروەردەکردنی کەسایەتیی مائۆ لە چین کەمتر نەبوو لەوەی، کە لە سەردەمی ستالیندا دەکرا.

کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی حیزبە کۆمۆنیستەکان لە مۆسکۆ بە سەرکەوتنی بەتەواو مانای خرۆشۆف کۆتایی هات، ساڵی 1958 بە هەنگاوی پتەو و نوێوە لە پێناوی بۆ سەقامگیریی رێبەربوونی بیٚ ئەملاولای خرۆشۆف لە سۆڤیەتیدا دەستی پێکرد. لە مانگی مارسی ساڵی 1958دا بۆلگانین، کە بە تەواوەتی دەسەڵات و پلە و پایەی خۆی لەدەست دابوو دەستی لە پۆستی سەرۆکی وەزیرانی سۆڤیەتی هەڵگرت و کۆمیتەی ناوەندیی حیزب خرۆشۆڤی لە جێگەی دانا. بەم شێوەیە بۆ یەکەمین جار لە پاش مەرگی ستالین هەر دوو پۆستی دەوڵەتی و حیزبی واتە سکرتێری و سەرۆکایەتیی دەوڵەت درایە یەك کەس (هەڵبەت مالینکۆفیش تەنیا هەتا دە رۆژ پاش مەرگی ستالین هەر دوو پۆستەکەی پیٚ بوو، بەڵام ناچار بوو پۆستی سکرتێرییەکەی بداتە خرۆشۆف.)

رۆژی پازدەی مای ساڵی 1958 سێیەمین مانگی دەسکردی سۆڤیەتی بە کێشی هەزارو پێنسەد کیلۆ "تەن ونیوێك" وەحەوا خرا، لە حاڵێکدا ئەمریکییەکان تازە توانیبوویان

مانگێکی دەسکردی کەمتر لە پازدە کیلۆ وەحەوا بخەن. هەڵفڕاندنی قورساییەکی هەزاروپێنسەد کیلۆیی بۆ دەوری زەوی نیشانەی هەبوونی کۆمەڵە مووشەکێکی بە هێز لە تەقەمەنیی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بوون و پسپۆڕان و شارەزایانی سەربازی لە ئەمریکا بە نیگەرانییەوە باسی ئەو گۆڕانەیان دەکرد و لە دوارۆژی بەهێزبوونی باری سەربازیی سۆڤیەتی هەستیان بە مەترسی کرد.

خرۆشۆف بە کەڵکوەرگرتن لەوەها کەشێك ولاتانی خۆرئاوایی لە ئەڵمانیدا دەخاتە ژێر گوشارەوە و داوایان لێ دەکا کۆماری دیموکراتیکی ئەڵمانیا (ئەڵمانی خۆرهەلات) بە فەرمی بناسن. خرۆشۆف دەڵێ دەبێ سنوورەکانی نێوان ئەو دوو ئەڵمانە سەقامگیر و دەسنیشان بکرێن و وریایی دەدا ئەگەر دەوڵەتگەلی خۆرئاوایی لە بەفەرمی ناسینی ئەڵمانی خۆرهەلاتی خۆ ببوێرن دەوڵەتی سۆڤیەتیی پەیمانێکی ئاشتیی بە جیا لەگەڵ ولاتانی ئەورووپای خۆرهەلات دەبەستێ.

دوڵەتە خۆرئاواییەکان گوێ نادەنە ئەو هەڕەشە و گوڕەشانە و ئەمجارە خرۆشۆف مەسەلەی بەرلین دێنێتە گۆڕێ و داوا لە سێ ولاتی خۆرئاوایی دەکا لە ماوەی شەش مانگدا بەرلین چۆڵ بکەن، بەلام دەوڵەتەکانی خۆرئاوا بە خێرایی لە بەرامبەر ئەو هەڕەشەیەی خرۆشۆفدا دژکردەوە دەنوێنن و رادەگەیەنن، کە ئەگەر یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ گۆڕینی بارودۆخی بەرلین پەنا بەرێتە بەر هێز و توند و تیژی دەبێ لە بەرامبەر هەر چەشنە رووداو و دەرەنجامێکیدا بەرپرسیار بێ.

یەکێك لە رووداوە گرینگەکانی دیکەی ساڵی 1958 سەرهەڵدانی کێشەی نوێی نێوان یەکێتیی سۆڤیەتی و یۆگوسلاڤیایە. خرۆشۆف، کە بە رواڵەت بۆ دەستەمۆکردنی تیتۆ هەوڵەکانی بێ ئاکام مابوونەوە لە ژووئەنی ساڵی 1958دا لە کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی بولغارستاندا هێرش دەکاتە سەر کۆمۆنیستەکانی یۆگوسلاڤیاو بە رێڤیزیۆنیستRevisionit یا ریفۆرمخواز ناویان دەبا. خرۆشۆف رۆژی سی ویەکەمی ژووئیەی هەر ئەو ساڵە بۆ دانوستان لەگەڵ مائۆ و رێبەرانی دیکەی چین دەچێتە پەکەن. لە راگەیەندراوی هاوبەشی چین و سۆڤیەتیدا، کە پاش تەواوبوونی ئەو دانوستانانە دەردەچێ رێبەرانی یۆگوسلاڤیا بە تۆمەتی رێڤیزیۆنیستRevisionit و دووبەرەکی و ناکۆکی خولقێن لە نێوان ولاتانی سۆسیالیستیدا دەدرێنە بەر هێرش.

رووداوی گرینگی دیکەی ساڵی 1958، کە پێوەندیی بە سۆڤیەتییەوە هەبێ چاپ و بلاوبوونەوەی رۆمانی "دوکتۆر ژیواگۆ"ی بوریس پاسترناکە، کە نابێ لە بیر بکرێ. ئەو کتێبە،

کە ڕووداوەکانی شۆڕشی بۆلشەڤیکیی ڕوسیا و دواتری لە چوارچێوەی ڕۆمانێکدا تاوتوێ دەکا لە دەرەوەی سۆڤیەتی بڵاو بۆوە و هەر ئەو ساڵە خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیی وەرگرت.

بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە و ئەو هەڵڵایەی لە سەر ی ساز بوو خرۆشۆڤی پیس تووڕە کرد و پاش ڕەتاندن و وەدەرنانی پاسترناك لە یەکێتیی نووسەرانی سۆڤیەتی باسی شاربەدەرکردنی لە سۆڤیەتی هاتە گۆڕێ. پاسترناك ئەگەرچی بەو ناوبانگەی، کە بەدەستی هێنابوو دەیتوانی لە دەرەوەی ڕوسیا باشترین ژیانی هەبێ دیسان ئامادە نەبوو وڵاتەکەی جێ بێڵێ. ئەو تەنانەت بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکەشی هەتا وڵاتی سوید نەچوو و ڕۆژی سی و یەکەمی ئۆکتۆبەری ساڵی 1958 لە نامەیەکدا بۆ خرۆشۆف و کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست نووسی:

"نیکیتا سێرگیوڤیچی بەڕێز... من ڕاستەوخۆ دێمە لای ئێوە و کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و دەوڵەتی سۆڤیەتی. بە هۆی ئەو بابەتگەلەی بڵاوبوونەتەوە پێموایە دەوڵەت پێشوازی لە شاربەدەرکردنم دەکا، بەڵام ئەو شتە بۆ من کارێکی مەحاڵە. هەموو تانوپۆی ژیانی من بە ڕوسیاوە گرێ دراوە و چارەنووسی خۆم بە جیا لە ڕوسیا و لە دەرەوەی ئەو نابینم. چوونەدەر لە کەوشەنی ئەو نیشتیمانە بۆ من وەك مەرگ وایە. هەر بۆیەش داواتان لێ دەکەم وەها سزایەکی قورس لە سەر من بەڕێوە مەبەن. من بەوپەڕی خاکەڕاییەوە گەلێك خزمەتم بە ئەدەبیاتی سۆڤیەتی کردووە و دەتوانم دیسانیش قازانجم بۆ ئەو وڵاتە هەبێ.

خرۆشۆف پاش وەرگرتنی ئەو نامەیە چاوپۆشیی لە شاربەدەرکردنی پاسترناك کرد، بەڵام بە بڵاڤۆکی ئەو وڵاتە ڕاگەیەندرا، کە نابێ شێعر و بەرهەمەکانی بڵاو بکەنەوە. پاسترناك ساڵ و نیوێك زیاتر نەژیا و ڕۆژی بیستەمی مای 1960 لە مۆسکۆ کۆچی دوایی کرد.

## 4

لە یەکەمین ڕۆژی ساڵی 1959دا فیدل کاسترۆ لە کۆتایی شۆڕشێکی سەرکەوتوانەدا، کە لە سێ ساڵ لەمەوبەرەوە دەستی پێکردبوو بە دەسەڵات گەیشت. لەو کاتدا بڵاڤۆکی خۆرئاوایی و بە تایبەتی ئەمریکییەکان زۆریان پێشوازی لە شۆڕشێك کرد، کە کۆتایی بە بیست و دووساڵ حکوومەتی دیکتاتۆری لە کوبادا هێناو ڕێبەری ئەو شۆڕشەشیان وەکو قارەمانی ئازادی ناوبرد،

بەڵام زۆری نەخایاند، کە ڕێبەری شۆڕشەکەی کوبا بە مارکسیستێکی تۆخ دەرچوو و ئیدی ئەمریکییەکان لە دامەزرانی ڕژێمێکی کۆمۆنیستی لە بناگوێچکەی خۆیاندا زراویان چوو.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ فیدل‌کاسترۆ بەر لەوەی بگاتە دەسەڵات کۆمۆنیست نەبووە بەڵام دانی پیا دەنێ، کە برای کاسترۆ واتە رائۆل‌کاسترۆ و هاوسەنگەری نزیکی ئەو واتە چێ‌گیڤارا هەردووکیان بیر و باوەڕی مارکسییان هەبووە. خرۆشۆف هەروەها دەڵێ، کە پێوەندیی نێوان مۆسکۆ و شۆڕشڤانانی کوبایی ڕۆژنامەڤانێکی روسی بووە بە ناوی ئالێسکێڤ تەنانەت پاش هاتنە سەرکاری فیدل کاسترۆ و دامەزرانی پێوەندیی دیپلۆماتیك لە نێوان سۆڤیەتی و کوبادا ئالێکسێڤ، هەروا بە هۆی نزیکی و دۆستایەتی لەگەڵ ڕێبەرانی کوبادا رۆڵی سەرەکی هەبووە لە پێوەندییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتەدا.

کەمێك پاش هاتنەسەرکاری فیدل‌کاسترۆ میکۆیانی ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە بۆ تاوتوێ‌کردنی رێگەکانی پەرە پێدانی پێوەندییە بازرگانییەکانی نێوان سۆڤیەتی و ئەمریکا سەردانی واشنگتۆنی کردبوو لە سەر بانگهێشتنی فیدل‌کاسترۆ چووە کوبا و لە گەڕانەوەیدا لە کوبا ئەو هەل و دەرفەتە زێڕینەی، کە بۆ پەرە پێدانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی و تەشەنەکردنی لەو وڵاتەدا بەدەست هاتبوو لەگەڵ هاوکارەکانی خۆی لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا هێنایە بەرباس. پێوەندییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە لەساڵی 1959دا بە خێرایی پەرەی گرت و فیدل کاسترۆش بە جێبەجێکردنی پلان و بەرنامەی بە نیشتیمانیکردنی پیشەسازی و هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ دەریخست، کە گەرەکیەتی کوبا بکاتە وڵاتێکی کۆمۆنیستی. مەیلی کاسترۆ بەرەولای سۆڤیەتی و مارکسیزم بواری بۆ سازبوونی قەیران لە پێوەندییەکانی ئەمریکا و کوبادا خۆش کرد و لەو ساڵانەی دواییدا ئاڵۆزترین قەیرانی پێوەندییەکانی ئەمریکا و سۆڤیەتیی لێ کەوتەوە.

گرینگترین ڕووداوی ساڵی 1959 لە یەکێتیی سۆڤیەتی پێکهاتنی بیست و یەکەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستە. لەو کۆنگرەیەدا، کە لە 27ی ژانوییەوە هەتا 5ی فێبرییەی لە مۆسکۆ خایاند خرۆشۆف بنەما ئابوورییەکانی حەوت ساڵەی خۆی ڕاگەیاند و بەڵێنی دا، کە هەتا ئەو بەرنامەیە جێبەجێ دەکرێ، یەکێتیی سۆڤیەتی لە بواری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و بەرهەمی ئاژەڵدارییەوە شان لە شانی ئەمریکا دەدا و لە کۆتایی ئەو بەرنامەیەدا لە هێندێ بواردا وەپێش ئەمریکاش دەکەوێ.

سیاسەتی کشتوکاڵیی سۆڤیەتی لەو بەرنامەیەدا هەروا لە سەر بنەمای بەهێزکردنی کشتوکاڵی هاوبەش و پەرەپێدانی داچاندنی زەوییە بەیارەکان یا کێڵگە تازە بووژاوەکان دامەزرابوو، بەڵام گەورەترین هەڵەی خرۆشۆف لەو بەرنامەیەدا، کە زیانێکی گەورەی بە بەرهەمهێنانی کشتوکاڵی و ئاژەڵداریی سۆڤیەتی گەیاند، ئەوە بوو کە لە نێو زەوییە هاوبەشەکاندا کۆمەڵێك سنوور و پەرژینی نوێیان بۆ مڵك و کێڵگە تایبەتییەکانی وەرزێرەکان کێشا.

ئەو مڵك و کێڵگە تایبەتییانەی وەرزێران، کە لە بەشەکانی پێشووشدا باسمان کردن بەشێکی بچووکن لەو زەوییە هاوبەشانەی، کە بۆ داچاندنی سەوزی و میوە و ئاژەڵداری و کێڵگەی تایبەتیی پەلەوەر دراونەتە وەرزێران و ئەوان بۆیان هەیە لە کات و ساتی بێکاریدا واتە ئەو کاتانەی لە کێڵگە هاوبەشەکاندا ئیش و کاریان نەماوە بچن لەوێدا کار بکەن و بێجگە لە دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆیان لەو ڕێگەیەوە هەرچی لێیان زیاد بوو و لەبەریان مایەوە بە دەوڵەت یا بە بازاڕی ئازادی بفرۆشن. لە ساڵی 1959دا، کە خرۆشۆف بەرنامە تازە ئابوورییەکەی پێشکەش کرد ڕێژەی بەرهەمی ئەو کێڵگە بچووکە تایبەتییانە بەشێکی زۆری پێداویستییە گشتییەکانی دابین دەکرد. بە پێی ئەو ئامارگەلەی لە بەردەستن لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەو کێڵگە تایبەتییانەی وەرزێران زیاتر لە4٪ی تەواوی کێڵگە داچێنراوەکانی سۆڤیەتییان لەخۆنەدەگرت، 46٪ ی گۆشت و 45٪ی شیر و 78٪ ی هێلکە و 45٪ی سەوزیی خەڵکی یەکێتیی سۆڤیەتی هەر لەو کێڵگە تایبەتییانە دابین دەکران و هەژدە ملیۆن بنەماڵەی وەرزێر بەشێکی هەرەزۆری پێداویستییەکانی خۆیان هەر لەو ڕێگەیەوە دابین دەکرد. بە پێی ئەو ئامارەی، کە لە بەرەبەری گیرانی بیست و یەکەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا لە لایەن ئەنیستیتۆی ئابووریی کشتوکاڵیی سۆڤیەتییەوە بڵاو کرایەوە 40٪ی داهاتی نەغدیی وەرزێرانی سۆڤیەتییش هەر لە ڕێگەی فرۆشرانی بەرهەمگەلی کێڵگە تایبەتییەکانە دابین دەبوون.

خرۆشۆف و هەرکەسێکی دیکەی، کە باوەڕی بە بنەماکانی مارکسیزم هەبوو دەبوایە لەو ئامارە شەرم بیگرێ، چونکی گەشەی بەرچاوی بەرهەمە کشتوکاڵیی و ئاژەڵدارییەکان لە کێڵگە تایبەتییەکاندا لە چاو زەوی و زار و کێڵگە هاوبەشەکان نیشانەی شکستی بەرنامەی هاوبەشکردنی کشتوکاڵ و حەزی وەرزێران بوو بە مڵکە تایبەتییەکانی خۆیان، بەڵام ئەو ڕێوشوێنانەی، کە بۆ سنووردارکردنەوەی کاری وەرزێران لە مڵکە تایبەتییەکانیاندا ڕەچاو کرا و ئەو پوانگەلەی، کە بە دوای ئەوەدا بۆ زیادکردنی بەرهەمگەلی کێڵگە هاوبەشەکان لەبەرچاو گیرا کاریگەرییەکی زۆر کەمی لە سەر

زیادکردن و گەشەی بەرھەمھێنانی کێڵگە و ئاژەڵدارییە ھاوبەشەکان دانا، لە حاڵێکدا بەرھەمھێنانی مڵکە تایبەتییەکان بە شێوەیەکی بەرچاو داکشا و بووە ھۆی بەرزبوونەوەی نرخی ئەو بەرھەمگەلە لە بازاڕدا.

چۆو ئێن لای سەرۆك وەزیرانی چینی کۆمۆنیست، کە وەکو بەرپرسی وەڤدی نوێنەرایەتیی چین لە بیست و یەکەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا بەشدار ببوو وێڕای دانوستانەکانی خۆی لەگەڵ خرۆشۆفدا قایلی کرد، کە لەو چەکوچۆڵە نوییە و لەو تەکنۆلۆجیای ناوکییە بە چینیش بدات و بە مۆرکردنی پەیماننامەیەك لە سەر ھاریکاریی سەربازی و تەقەمەنی و چەکوچۆڵ لە داھاتوی ھەردوو وڵاتدا گەڕایەوە پەکەن، بەڵام دەوڵەتی سۆڤیەتی بە کردەوە لەدانی چەکی ناوکی و تەکنۆلۆجیای ناوکی بە چین خۆی بوارد و یەکەمین ناکۆکییە جیدییەکانی نێوان چین و سۆڤیەتی لە سەر ئەوە ھاتنە پێش. لەو پێك دادانانە سنوورییانەشدا، کە لە سەرەتای سێپتەمبەری 1959دا نێوان چین و ھیندا ھاتنە پێشێ یەکێتی سۆڤیەتی لە بەرامبەر ھیندستاندا پشتیوانیی لە چین نەکرد و ھەڵوێستی بێ لایەنانەی سۆڤیەتی لەو بارەیەوە بووە ھۆی رەخنە لێگرتنی توندی چین لە یەکێتیی سۆڤیەتی.

سەفەری پڕ لە ھات و ھەڵڵای خرۆشۆفیش بۆ ئەمریکا، کە لە نیوەی دووەم ی مانگی سێپتەمبەردا بوو، کەوتە بەر رەخنەی راشکاوانەی بەرپرسان و بلاڤۆکەکانی چینی کۆمۆنیست.

خرۆشۆف پاش گەڕانەوەی لە ئەمریکا لەگەڵ سۆسلۆف ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی و گرۆمیکۆ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی سەردانی پەکەنی کرد بۆ ئەوەی وێڕای بەشداری لە رێوڕەسمی دەیەمین ساڵھاتی دامەزرانی حکوومەتی کۆمۆنیستی لە چیندا ناکۆکییەکانی خۆی لەگەڵ رێبەرانی ئەو وڵاتە چارەسەر بکا. بەڵام دانوستانەکانی ئەو لە گەڵ مائۆ و رێبەرانی دیکەی چین، کە پێنج رۆژی خایاند ھیچی لێ نەکەوتەوە، لەبەر ئەوەی چینییەکان قایل نەبوون، کە تەکنۆلۆجیای ناوکی بە مەرجێك بدرێتە چین، کە سۆڤیەتییەکان چاوەدێری بکەن بەسەر دامەزراوگەلی ناوکیی چیندا.

جیھان، ساڵی 1960ی بە گەشبینی و ھیواداریییەوە دەست پێکرد، چونکی بە دوای سەردانەکەی مانگی سێپتەمبەری 1959ی خرۆشۆف لە ئەمریکا پێوەندییەکانی ئەو دوو زلھێزە بەرەو باشبوون چووبووو و بوار بۆ پێکھاتنی کۆنفرانسێکی بەرزی رێبەرانی خۆرھەڵات و خۆرئاوا لە مانگی مای 1960دا خۆش ببوو. پاش یەکەمین سەردانی سەرۆك وەزیرێکی سۆڤیەتی لە ئەمریکا، گۆڤاری بە ناوبانگی ئەمریکی foreign Affairs یا کاروباری

دەرەوە وتارێکی خرۆشۆفی لەمەڕ هەلومەرجەکانی پێکەوەژیانی ئاشتیخوازنە بڵاو کردەوە. ئەو وتارە لە بڵاڤۆکی سۆڤیەتییشدا بڵاو بۆوە و دواتر وەك نامیلکەیەك لە ملیۆنان بەرگدا بە زمانە جوراوجۆرەکانی جیهان بڵاو بۆوە. کورتەی ئەم وتارە پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی نێوان وڵاتانی سۆسیالیستی و سەرمایەداری و دانانی هەڤرکێی ئاشتیخوازانە بوو لە جێگەی بووبەڕوو بوونەوەی چەکدارانە، کە لە جیهانی لێوڕێژ لە چەکوچۆڵ ی ناوکیدا جگە لە نابودکردنی مرۆڤ ئاکامێکی دیکەی لێ نەدەکەوتەوە.

حیزبی کۆمۆنیستی چین لە بەرامبەر ئەو تێزە نوێیەدا دژکردەوەی نواند و لە ئاپریلی 1960 لە وتارێکدا بە بۆنەی نەوەدودووەمین ساڵرۆژی لەدایکبوونی لینین بیر و راکانی خرۆشۆفی لەمەڕ ئیمکانی پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی وڵاتانی سۆسیالیستی و سەرمایەداری و مەحاڵبوونی شەڕ و پێکدادان وەکو دژایەتی لەگەڵ بنەماکانی مارکسیزم و لینینیزم رەد کردنەوە. بڵاوکردنەوەی ئەو وتار لە رۆژنامەی ئۆرگانی فەرمیی حیزبی کۆمۆنیستی چیندا پێوەندییەکانی نێوان چین و سۆڤیەتی لێڵتر و ئاڵۆزتر کرد، بەڵام سەرهەڵدانی قەیرانێکی چاوەڕوان نەکراو لە پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا باڵی بەسەر ئەو پێوەندییانەدا کێشا.

رۆژی یەکەمی مانگی مای 1960 فڕۆکەیەکی سیخوڕیی ئەمریکا لە ئاسمانی سۆڤیەتی بەردرایەوە و فڕۆکەوانەکەی بە ناوی فرانسیس گاری، کە بە پەڕەشووت خۆی دەرباز کردبوو و هاتبووە خوار، دانی بەوەدا هێنا، کە گەلێك ئەرکی پێ ئەسپێردراوی لە ئاسمانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بەڕێوە بردوە. دەرکەوتنی کردەوەی سیخوڕییانەی ئەمریکا لە سەر ئاسمانی سۆڤیەتی لە هەلومەرجێکدا، کە بە رواڵەت پێوەندیەکانی ئەو دوو وڵاتە بەرەوە باشی رۆیشتبوو خرۆشۆفی لەرادەبەدەر تووڕە کرد. ئایزنهاڤری سەرۆك کۆماری ئەمریکا هیوای بەوە بوو، کە ئەو قەیرانە لە کۆنفرانسی سەرکردەکاندا، کە بەڵێن وابوو رۆژی شازدەی مای لە پاریس بەڕێوە بچێ چارەسەر بکرێ، بەڵام خرۆشۆف وێڕای چوونی بۆ پاریس بۆ بەشداری لەو کۆنفرانسەدا، داوای لێبووردنی ئایزنهاڤری لە سۆڤیەتی کردە مەرجی سەرکیی بەشداربوونی سۆڤیەتی لەو کۆنفرانسەدا. ئایزنهاڤر ئەو مەرجەی قەبووڵ نەکرد و کۆنفرانسی سەرکردەکان هەڵوەشایەوە.

هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانەوەی قەیران لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیدا پێوەندییەکانی چین و سۆڤیەتییش بەرەو خراپی چوون. لە سەرەتای مانگی ژووئەنی ساڵی 1960دا

چۆئێن‌لای سەرۆکی وەزیرانی چین لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ رێکخراوی سەندیکاکاندا لـە پەکەن رەخنەی لە سیاسەتی پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی خرۆشۆف و تیژی مەحاڵبوونی شەڕ لەگـەڵ سـەرمایەداری گـرت و بـە دوای ئـەوەدا رۆژنامـەی پراڤیـدا هەڵوێسـتێکی رەخنەگرانەی لە بەرامبەر رێبەرانی چیندا گرتە بەر. لە کۆتایی مانگی ژووئەندا خرۆشۆف لە کاتی کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی رۆمانیدا لە کۆبوونەوەیەك، کە نوێنەرانی تـەواوی حیزبە کۆمۆنیستەکانی هەموو وڵاتانی تێدا بەشداربوون، هێرشی کردە سەر رێبەرانی چین و مانگێك دواتر واتە لە ئوتی 1960دا هەموو پسپۆڕەکانی خۆی لە وڵاتی چـین بـانگ کردەوە و قەیرانی دوو وڵاتی مەزنی کۆمۆنیستی گەیشتە لوتکـەی خـۆی. لـە شەشـەمی نۆڤەمبەری 1960دا حیزبە کۆمۆنیستەکانی هەشتاویەك وڵاتی جیهان کۆنفرانسێکیان لە مۆسکۆ گرت، ناکۆکییەکانی سۆڤیەتی لەگەڵ چین یەکێکە لە گرینگترین بابەتەکانی ئـەو کۆنفرانسە. خرۆشۆف جارێکی دیکەش لە لێدوانێکیدا هێرش دەکاتەوە سەر رێبەرانی چین زۆربەی هەرە زۆری حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهـان لای سـۆڤیەتی دەگـرن، بـەڵام حیزبـە ئاسیاییەکان بێ لایەنی دەگرنە بەر و حیزبـی کۆمۆنیسـتی ئالبـانی بچـووکترین حیزبـی کۆمۆنیستیی جیهان بە توندی پشتیوانی لە چین دەکا.

کۆنفرانسی حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان لە مۆسکۆ پاش مانگێك مشتومڕ و گەنگەشـە بە دەرکرنی راگەیەندراوێك کۆتایی بە کارەکانی خۆی هێنا. ئەو راگەیەندراو یا بڕیارنامەیە بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی خرۆشۆف سـەرکردەکانی چـینی کۆمۆنیسـتی مـەحکوم نـەکرد، چونکی نوێنەرانی هێندێ لە حیزبە کۆمۆنیستەکان رازی نەبوون وەها بڕیارنامەیەك مۆر بکەن. نێوەرۆکی بڕیارنامەکە فرەماناو گشـتی و لـە پێنـاوی بانگهێشـتی حیزبـە کۆمۆنیسـتەکانی جیهاندا بوو بۆ پاراستنی یەکێتی و یەکڕیزی بـە چەشـنێك، کـە هـەم سـۆڤیەتی و هـەم چـین دەیانتوانی بە قازانجی خۆیان لێکیدەنەوە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە، کە خرۆشۆف نەگەیشـتە ئەو ئاکام و مەبەستەی، کە لە کۆنفرانسی حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان چاوەڕوانیی دەکـرد و ئەوەش بۆ ئەو شکستێکی سیاسیی گەورە بوو.

هاوکات لەگەڵ بەسترانی کۆنفرانسی حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان لە مۆسکۆ رووداوێکی گەورەی دیکەش لە خۆرئاوا هاتە پێشی و ئەویش هەڵبژێرانی کێنێدی بوو بۆ سەرۆك کۆماریی ئـەمریکا. هەڵبـژێرانی سـەرۆك کۆمـارێکی دیمـوکرات پـاش هەشـت سـاڵ دەسـەڵاتدارێتیی کۆماریخوازەکان وەك گۆڕانێکی گەورە لە ئەمریکادا سەیری دەکـرا. بـە تایبـەتی ئـەوەی کـە

سەرۆك كۆمارە لاوەكە بەوە ناوی دەركردبوو، كە باوەڕی بــە بــیر و رای ئازادیخوازانــە هەیــە و سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی ئەو لە ژووئیەی ساڵی 1961دا دەكرا لە سیاســەتی نێودەوڵەتیــدا سەرەتاو دەسپێكی گۆڕانێكی مەزن بێ.

خرۆشۆف ساڵی 1961ی بە هیــوای پێشــكەوتنی نــوێ لــە زیــاتركردنی دەغــڵ و دان و دەستەبەركردنی سەركەوتنی نوێ لە هــەڤركێی داگیركردنــی گەردوونــدا دەســت پێكــرد. رۆژی 12ی ئاپریلی 1961 بیرمەندانی سۆڤیەتیی توانییان یەكەمین گەردوون پێوی هەڵگری مرۆڤ بنێرنە ئاسمانی زەوی و گەڕانی یۆریگاگارین یەكەمین گەردوون گەڕی جیهــان بــە دەوری گــۆی زەویدا پێگەو ئیعتیبارێكی تازەی بە رێبەرانی ســۆڤیەتی بەخشــی. ئــەو ســەركەوتنە مەزنــە گەردونییەی سۆڤیەتی هاوكات بوو لەگەڵ یەكەمین شكستی سیاسیی ســەرۆك كۆمــاری نــوێی ئەمریكا، چونكی دەستدرێژیی سەربازی بۆ سەر كوبا لە نیوەی ئاپریلــدا، كــە بــە پشــتیوانیی راستەوخۆی ئەمریكاو بە مەبەستی هەرەس پێهێنان بە رژێمی كاسترۆ كرابوو تووشی شكســت هات. فیدل كاسترۆ پاش تێشكاندنی ئەو دەستدرێژییە زیاتر لە پێشوو پــاڵی وە ســۆڤیەتیدا و رۆژی یەكــەمی مــانگی مــای 1961 بــە فــەرمی دامــەزرانی حكوومــەتی دیمــوكراتیكی سۆسیالیستیی كوبا ی راگەیاند.

لە رۆژەكانی سێیەم و چوارەمی ژووئەندا خرۆشۆف و كێنێدی لە نەمسا چاویان بە یــەكتری كەوت. خرۆشۆف لەو چاوپێكەوتنەدا دیسان مەسەلەی بەرلین و پێویستیی بە فەرمی ناســینی حكوومەتی كۆمۆنیستیی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی لە لایەن وڵاتانی خۆرئاواییەوە هێنایەوە گۆڕێ. خرۆشۆف پێداگر بوو لە سەر ئەوەی، كە دابەشبوونی ئەڵمانیا لایەنی یاسایی و فــەرمیی پــێ-بدراو وێڕای مۆركردنی پەیمانێكی ئاشتی لەگەڵ دوو ئەڵمانەكەدا، بەرلین وەكو شــارێكی ئــازاد راگەیەندرێ. كێنێدی ملی بۆ داواكانی خرۆشۆف رانەكێشا و كۆنفرانسی نەمسا بە بــێ ئاكــام كۆتایی پێهات.

لە مانگی ئووتی ساڵی 1961دا خرۆشۆف لە سەر بەرلین دەستی كردەوە بــە هەڕەشــە و گوڕەشە و وریایی دا بــە دەوڵەتگــەلی خۆرئــاوایی، كــە بــۆ چارەســەریی مەســەلەی بــەرلین و بەردەوامییبوونی خۆیان لەو شارەدا دەبــێ دان بــە كۆمــاری دیمــوكراتیكی ئــەڵمانیادا بنــێن. دەوڵەتانی خۆرئاوایی هیچ گوێیان بەو وریاییە نەبزووت و خرۆشۆف فــەرمانی دا دیوارێــك بــە نێــوان بــەرلینی خۆرهــەڵاتی و بــەرلینی خۆرئاواییــدا بكێشــن. بینــای ئــەو دیــوارە، كــە

خۆرئاواییەکان ناویان نا دیواری شەرم رۆژی سێزدەی ئووتی ساڵی 1961 دستی پێکرد و لە کۆتایی ئوتدا تەواو بوو.

رۆژی حەڤدەی ئۆکتۆبەری ساڵی 1961 بیست و دووەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە مۆسکۆ پێکهات. لەو کۆنگرەیەدا، کە هەتا کۆتایی ئۆکتۆبەری خایاند گەلێك رەخنەی نوێ لە ستالین گیراو هێرش کرایە سەر مۆلۆتۆف و کاگانۆڤیچ و مالینکۆف تۆمەتبار کران بەوەی لە بەرێوەبردنی جەنایەتەکاندا هاودەستی ستالین بوون. خرۆشۆف لە ئاخافتنەکەی خۆیدا لەو کۆنگرەیەدا ناراستەوخۆ هێرشی کردە سەر رێبەرانی چینی کۆمۆنیست و چۆئێن لای سەرۆك وەزیرانی چینکە سەرۆکایەتیی وەفدێکی نوێنەرایەتیی وڵاتەکەی خۆیانی لە ئەستۆ بوو و لەو کۆنفرانسەدا بەشدار بوو وەڵامی هێرشکانی خرۆشۆفی دایەوە و پاش ئاخاوتن لە کۆنگرەدا مۆسکۆی بەجێهێشت.

راپۆرتی خرۆشۆف بۆ بیست و دووەمین کۆنگرەی حیزب زیاتر لە سەر پرسگەلی پێوەندیدار بە سیاسەتی دەرەوە و پێشکەوتنەکانی بواری پیشەسازی و گەردوون پێوی و نێوخۆیی بوو. ئەو ئامارەی خرۆشۆف لە سەر زیاد و گەشەکردنی ریزەکانی ناوخۆیی حیزب خستییە روو نیشاندەری ئەوە بوو، کە ئەندامانی فەرمیی حیزب لە ماوەی پێنج ساڵدا لە دوو ملیۆن کەس تێپەڕیوە و گەیشتۆتە 8862516 کەس، کە دەبێ 843489 کەسی پالێوراو بۆ ئەندامەتی لە حیزبیشیدا بخەینە سەر، خرۆشۆف بەو پییە پێشنیاری کرد، کە ژمارەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە 133 کەسەوە بکرێتە 175 کەس و ژمارەی پالێوراوانیش لە 122 کەسەوە بگاتە 155 کەس.

خرۆشۆف هەروەها پێشنیاری کرد گۆڕان لە بەرنامەو بنەماکانی حیزبدا پێك بێنن و بۆ تازەکردنەوەی قەوارەی رێبەریی حیزب، یەك لە سێی بەرپرسان و خاوەن پلەکانی حیزبی و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لە ماوەی نێوان کۆنگرەکاندا بگۆڕێن. لە کۆنگرەی بیست و دووەمدا خرۆشۆف ئیدی نەچۆوە سەر ئەو پێداهەڵگوتنانەی، کە لە کۆنگرەکانی پێشوودا لەمەڕ گەڵاڵە کشتوکاڵییەکانی خۆی و گەیشتن بە ئەمریکا و تەنانەت تێپەڕین لەویش کردبوونی، چونکی گەشەی دەغڵ و دان و بەرهەمگەلی ئاژەڵداری لە سۆڤیەتیدا بەرەو داکشان دەچوو و ئاستی بەرهەمهێنان لە سالانی 59-60 و 60_61دا لە چاو 58_59 زۆر کەم ببۆوە و داکشابوو. ئەو ئامارگەلەی، کە لەمەڕ رادەی دەغڵ و دانی ساڵی 60_61 بلاو بۆوە، نیشاندەری ئەوە بوو، کە رادەی بەهەمهێنانی گەنم لەو ساڵەدا بڕیك لە 130 ملیۆن

تەن زیاتر بووە لە حاڵێکدا گەنمی ئەمریکا هەر لەو ماوەیەدا لە 181 ملیۆن تـەن تێپـەڕیوە واتە پەنجاملیۆن تەن لە بەرهەمی سۆڤیەتی پتر بوو، لە حاڵێکدا وەرزێرانی ئەمریکی ئـەو بـڕە بەرهەمەیان لە 74 ملیۆن هەکتار زەویی داچـێندرا و لـە بەرامبـەر 116 ملیـۆن هـەکتار زەویی داچێندراوی سۆڤیەتیدا بەدەست هێنابوو.

خشتەیەکی ئاماریی دیکەی، کە هـەر لـەی سـاڵی 1961دا لـە بڵاڤـۆکێکی پسـپۆڕیی مۆسکۆدا چاپ و بڵاو بۆوە نیشاندەری ئەوە بوو وەرزێرێکی ئەمریکی بۆ بەرهـەمهێنانی هـەر کۆنتاڵێك* گەنم لە ساڵدا سەعاتێك کار دەکا، لە حاڵێکـدا وەرزێرێکـی سـۆڤیەتیی بـۆ ئـەو رادەیە 1\2 سەعات کار و لە کێڵگەی هاوبەشدا 7\2 سەعات کار دەکا، بە واتایەکی دیکە بەرهەمی کشتوکاڵیی وەرزێرێکی ئەمریکی حەوت هێندەی وەرزێرێکی هاوبەشە. ئـەو رێژەیـە لە بەرهەممهێنانی شیردا پێنج هێندە و لە بەرهەممهێنانی گۆشـتدا دە ئەوەنـدە بـووە، کـە لـە ساڵانی دواییدا زۆر نەگۆڕاوە.

هەر بە دوای تەواوبوونی کۆنگرەی بیست و دویەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی واتـە رۆژی یەکەمی نۆڤەمبەری 1961 خەڵکی مۆسکۆ لە گۆڕەپانی سووری ئەو شارە بینـەری دیمەنێکی سەیر بوون. تەرمی مۆمیایی کراوی ستالینیان لە گۆڕ دەرهێناو و لە گۆشـەیەکی دیواری کرێملین ناشتیانەوە و قەبری لینینیش، کە ناویان نابوو گڵکۆی لینین_ستالین، دیسان هەر ناوەکەی پێشووی واتە گۆڕی لینینی لە سەر دانرایەوە. لە مۆسکۆ و شارەکانی دیکەش پەیکەرەکانی لینین و ستالین هەڵگیران و ناوی ئەو شار و دامەزراو گەلەیان گۆڕین، کە بە ناو ستالین کرابوون.

## 5

ئەگەر بمانـەوێ سـەردەمی دەسـەڵاتدارێتیی خرۆشـۆف بەسـەر یـەکێتیی سـۆڤیەتیدا بـە خشتەیەك نیشان بدەین گیرانی کۆنگرەی بیست و دووەم ی حیزبی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی لـە کۆتایی ساڵی 1961دا بە لوتکەی دسەڵات و سەرکەوتنەکانی ئەو لە قەڵەم دەدرێ، چـونکی برێك پاش کۆتایی کۆنگرە سەردەمی داکشانی دەسەڵاتی ئەو دەست پێ دەکا و ئـەو داکشـانە

بە درێژایی ساڵانی 1962 و 1963 درێژە دەکێشێ. لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا هێشتا سۆڤیەتی لە هەڤرکێی داگیرکردنی گەردوون و سازکردنی مووشەکی وشکارۆپێودا پێشەنگە، بەڵام لە نێوخۆدا شکستی گەڵاڵەکانی گەشە پێدانی کشتوکال و درێژەکێشانی ناکۆکییە باوەڕی و رێبازییەکان لەگەڵ چیندا رۆژ بەرۆژ پێگەی خرۆشۆف لەرزۆکتر دەکا. لەو نێوەدا قەیرانی ئەمریکا و سۆڤیەتی لە سەر کوبا و پاشەکشەی خرۆشۆف لە بەرامبەر هەڕەشەکانی ئەمریکادا جارلەگەڵ جار پتر زیان بە پێگە و ئیعتیباری ئەو لە نێو وڵاتانی کۆمۆنیستیدا دەگەیەنێ.

قەیرانی کوبا، کە ئەمریکاو سۆڤیەتیی هەتا لێواری شەڕێکی ناوکی برد لە سەر دامەزراندنی سەکۆی مووشەکی و فڕۆکەی بۆمب هاوێژی سۆڤیەتی لە کوبا دەستی پێکرد. خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دان بەوەدا دەنێ، کە دامەزراندنی مووشەك و بۆمب هاوێژی سۆڤیەتیی لە کوبا داهێنانی خۆی بووە و لەو رێگەیەوە دیویست سەرەڕای دەستەبەرکردن و گەرەنتیی ئاسایش و سەربەخۆیی کوبا لەبەرامبەر هێرشی گریمانەیی ئەمریکادا باڵانسێکی سەربازییش لە نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا پێکبێنێ. خرۆشۆف دەڵێ کاتێك ئەمریکا بە ناوەندە سەربازی و موشەکییەکانی خۆی ئێمەی گەمارۆ داوە راستەوخۆ هەڕەشە لە ناوەندە هەستیارە پیشەیی و سەربازی و شارە گەورەکانی ئێمە دەکا دانانی ناوەندگەلی مووشەکی لە لایەن ئێمەوە لە دراوسییەتیی ئەمریکادا دژکردەوەیەکی سرووشتییە.

ئەمریکییەکان سەرەتا لە سیپتەمبەری ساڵی 1961دا بە بینای سەکۆی مووشەکەکانی کوبایان زانی. ئەو وێنانەی، کە بە فڕۆکەی سیخوڕیی یو-2 لە کوبا گیرابوون شوێنی بینای ئەو سەکۆیانەیان نیشان دەدا، بەڵام سەرەتا پێدەچوو، کە ئەو سەکۆگەلە بۆ مووشەکی دژە فڕۆکە ساز بکرێن هەتا ئەوەی کە رۆژی چواری ئۆکتۆبەر وێنەگەلێکی نوێ لە ئاسمانەوە لە کوبا هەڵگیران، ئەمجارەیان مووشەك گەلێکی گەورە، کە ئامادە کرابوون بخرێنە سەر سەکۆکان و فڕۆکەی زەبەلاح بۆمب هاوێژی روسیی لە تەنیشتیانەوە بینران. ئەو وێنانە لە لایەن پسپۆڕانی سەربازیی ئەمریکاوە ئەوەی پشتڕاست کردەوە، کە سۆڤیەتی گەرەکیەتی لە کوبا مووشەکی وشکارۆپێو و نێونجبڕ دامەزرێنا و کێنێدی سەرۆك کۆماری ئەمریکا، کە دەمودەست ئاگادار کرابۆوە ئەنجوومەنێکی شەڕی بۆ تاوتوێکردنی ئەو هەوڵانەی، کە ئەمریکا دەبێ بیاندا پێك هێنا. لەو ئەنجوومەنەدا، کە جێگری سەرۆك کۆمار و وەزیرانی دەرەوە و بەرگری و سەرۆکی ناوەندی هاوبەشی هێزە چەکدارییەکانی ئەمریکای تێدا بەشدار بوون، سێ پێشنیار بۆ بەربەرکانێ لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتی هاتە گۆڕێ.

پێشنیاری یەکەمی هێرشی هەمە لایەنە بۆ سەر کوبا و داگیرکردنی ئەو وڵاتە لە لایەن هێزەکانی ئەمریکاوە، و پێشنیاری دووەم بۆردوومانی سەکۆکانی ئامادەی مووشەك و ئەو مووشەکانە بوو، کە ئامادەکرابوون بخرێنە سەر سەکۆکان، کە زۆرینە ئەوەی پەسند نەکرد. پێشنیاری سێیەم، کە کێنێدی پێشوازیی لێ‌کرد گەمارۆی دەریایی کوبا و ورياییدان بوو بە سۆڤیەتی بۆ کۆکردنەوەی مووشەکەکانی و لابردنی فڕۆکەکانی لە کوبا. بڕیار درا بە خێرایی ئامادەکاری بکرێ بۆ گەمارۆی دەریایی کوباو هێزە چەکدارییەکانی ئەمریکا بۆ بەرپەرچدانەوەی رووداوگەلی گریمانەکراو وریا بن. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بە کێنێدی راگەیەندرا، کە چەند کەشتیی هەڵگری مووشەك و چەکوچۆڵی نوێی روسی بەرەو دەریای کاراییب بەڕێوەن و دەبێ پێش ئەوەی ئەو کەشتییانە بگەنە دەریای کاراییب گەمارۆە دەرياییەکەی کوبا تەواو بکرێ.

رۆژی بیست و دووەم ی ئۆکتۆبەری 1962 کێنێدی لە ئاخافتنێکی رادیۆ تەلەڤزیۆنیدا خەڵکی ئەمریکای لەو رەوشە مەترسێدارەی پێش‌هاتووە ئاگادار کردەوە و بڕیارەکەی خۆ بۆ گەمارۆی دەریایی کوبا هەتا کۆکردنەوەی مووشەك و بۆمب هاوێژە روسییەکان لەو وڵاتە راگەیاند. هاوکات لەگەڵ ئاخافتنەکەی کێنێدیدا کاروباری گەمارۆی کوبا تەواو ببوو و ئاخافتنەکەی کێنێدی ئەو هەڕەشەی بەدواوە بوو، کە ئەگەر سۆڤیەتییەکان بیانە وێ ئەو گەمارۆیە بشکێنن دەبێ بەرپرسیارەتیی دەرەنجامەکەشی وە ئەستۆ بگرن.

کەشتییە روسییەکان سەرەڕای هەڕەشەی کێنێدی لە رۆیشتن بەرەو دەریای کاراییب نەوەستان و جیهان بۆ ماوەی پێنج رۆژان لە دڵەڕاوکێ‌دا بوو هەتا ئەوەی کە دوای گۆڕینەوەی چەند پەیام لە نێوان خرۆشۆف و کێنێدیدا دواجار رۆژی بیست و هەشتەمی ئۆکتۆبەری 1962 خرۆشۆف ملی راکێشا و فەرمانی گەڕانەوەی کەشتییە مووشەك هەڵگرەکان و چەکوچۆڵ ی روسی و کۆکردنەوەی مووشەك و بۆمب هاوێژەکانی سۆڤیەتیی لە کوبا دەرکرد. خرۆشۆف لە دوایین پەیامی خۆیدا بۆ کێنێدی کۆکردنەوەی مووشەك و فڕۆکە روسییەکانی بە مەرجێك قەبووڵ کرد، کە ئەمریکا گەرەنتی بدا، کە دەست درێژی ناکاتە سەر کوباو کێنێدیش ئەوەی قەبوڵ کرد.

رێککەوتن لە سەر کوبا لە لایەن خەڵکی جیهانەوە پێشوازیی لێکرا، بەڵام لە یەکێتیی سۆڤیەتی و وڵاتانی کۆمۆنیستی بە خاڵێکی لاواز لە سەر خرۆشۆفو هەڵەی ئەو لە دامەزراندنی ناوندگەلی مووشەکی لە کوبادا لەقەڵەم درا. پاشەکشێی خرۆشۆف لە بەرامبەر

کێنێدیدا بە تایبەتی بیانوویەکی دایە دەست ڕێبەرانی چینی کۆمۆنیست، کە وەك سیاسەتوانێکی ترسنۆك و خۆڕێکخەر هێرشی بکەنە سەری. ئەو ڕووداوە بۆ ماوەیەکیش پێوەندییەکانی نێوان سۆڤیەتی و کوبای بەرەو ساردبوونە برد و فیدل کاسترۆ بالۆیزی سۆڤیەتیی بۆ ڕوونکردنەوە ڕێگە نەدەدا هەتا ئەوەیکە خرۆشۆف دیسان میکۆیانی بۆ دانوستان لەگەڵ فیدل کاسترۆ و پێشکردنی نامەی تایبەتیی خۆی بە کاسترۆ ناردە کوبا و پێوەندییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە وردە وردە ئاسایی بۆوە.

خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا بەشێکی بۆ ڕووداوی کوبا تەرخان کردووە و وێڕای بەرگری لە هەڵوێستی خۆی لە قەیرانی ئۆکتۆبەری 1962دا دەنووسێ، لەبەر پاراستنی ئاشتی و ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە دوارۆژی پڕ مەترسیی شەڕێکی ناوکی قایل بوو بەوەی چاوپۆشی لە گەڵاڵەی دامەزراندنی مووشەك و بۆمب هاوێژە ڕوسییەکانیان لە کوبادا بکا و پێدا دەگرێتەوە، کە لە بەرامبەر ئەوەدا بەڵێن نامەی فەرمیی لە سەرۆك کۆماری ئەمریکا وەرگرتووە، کە دەستدرێژی نەکاتە سەر کوبا. خرۆشۆف دەڵێ ئەوکات چینییەکان گوتیان ئیمپریالیستەکان هەرگیز لە سەر بەڵێنی خۆیان نامێننەوە، بەڵام بینیمان، کە پاش کێنێدی، جانسۆن و نیکسۆنیش ئەو بەڵێنەیان بردە سەر و، لە تەنیشت ئەمریکابوونی کوبایەکی سۆسیالیستی‌یان قەبووڵ کرد.

ناکرێ بە بی ئاماژە بە ڕووداوێکی گرینگی ئەدەبی دەفتەری ڕووداوەکانی ساڵی 1962 ی سۆڤیەتی ببەستین. لە مانگی نۆڤەمبەری ئەو ساڵەدا بەشێك لە چیرۆکی "ڕۆژێك لە ژیانی ئیڤان دنیسڤیچ" لە نوسینی نووسەرێکی ناوداری ڕوسی بە ناوی" ئالیکساندر سولێژنێتسین"، کە ئەو کات هێشتا نەناسرابوو لە گۆڤاری Noviy Mirیا جیهانی نوێی مۆسکۆدا چاپ و بڵاو بۆوە و لە ماوەیەکی کورتدا هەڵلایەکی گەورەی لێ کەوتەوە، چونکی ئەو پەردەی لە سەر جەنایەتەکانی دامودەزگای تەناهیی سۆڤیەتی و ئەو کارەساتانە هەڵدایەوە، کە لە ئۆردووگاکانی بێگاری پێکردنی سەردەمی ستالیندا کرابوون. ئەو چیرۆکە لە کۆبوونەوەی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە ڕۆژی نۆزدەی نۆڤەمبەری 1962 پێکهاتبوو تاوتوێ کراو خرۆشۆف، کە بەر لە چاپ خوێندبوویەوە بۆ لەقاودانی جەنایەت و کارەساتەکانی ڕابردوو بەرگریی لە چاپ و بڵاوبوونەوەی بەرهەمگەلی لەو چەشنە کرد. چەند ڕۆژ دواتر ڕۆژنامەی پراڤیدا لە ژمارەی ڕێکەوتی 23ی نۆڤەمبەری 1962ی خۆیدا وتارێکی لە پەسنی سۆلێژنێتسیندا نووسی و تێیدا شێوازی نووسەرێتی و توانای

قەڵەمی ئەوی لەگەڵ تالستۆی وەك یەك دانا. دەزگای هەواڵنێریی فەرمیی سۆڤیەتی (تاس) یش بە دوای پراڤیدادا هەواڵی بڵاوبوونەوەی بەرهەمێکی پڕ بایەخی ئەدەبیی دیکەی ڕاگەیاند و سەربردەی نووسەری ئەو بەرهەمەی، کە بە پلەی ملازمییەوە بەشداری شەڕی دووەم ی جیهانی ببوو و لە نەکاو بە تۆمەت و بوختانێکی هەڵبەستراو دەسبەسەر و بۆ ماوەی هەشت ساڵ بەند کرابوو بڵاو کردەوە و سەرەنجام ڕۆژی بیست و دووەم ی دیسێمبەری ساڵی 1962 ڕۆژنامەی پراڤیدا وتەکانی لیۆنید ئیلیچێڤ ی سکرتێری کۆمیتەی یەکێتیی سۆڤیەتیی لەمەڕ ئەو بەرهەمە بەرزانە بڵاو کردەوە، کە بەو دواییانە چاپ و بڵاو ببوونەوە و بە ئازایەتی سەرەڕۆییەکانی سەردەمی ڕێبازی تاك پەرستییان لەقاو داوە و "ڕۆژێك لە ژیانی ئیڤان دنیۆڤیچ" بە نموونەیەکی بەرزی ئەو بەرهەمانە ناو برد.

ساڵی 1963 بە مشتومڕ لە نێوان حیزبە کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەتی و چین دەست پێدەکاو خرۆشۆف لە کۆنگرەی حیزبی سۆسیال دیموکراتی هاوپەیمانی ئەڵمانیادا، کە لە پازدەهەمەوە هەتا بیست و یەکەمی ژانویە لە بەرلینی پایتەختی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی پێکهات، لە سەر ناکۆکییەکانی نێوان چین و سۆڤیەتی قسەی تازە دەکا. ئاخافتنەکەی خرۆشۆف ئاشتیخوازانەیە و بە دوای ئەودا کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێشنیار دەکا بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان سۆڤیەتی و چین دانوستان بکەن. چینییەکان ئەو پێشنیارە قەبووڵ دەکەن و لە سەرەتای ژووئیەی ساڵی 1963دا وەڤدێك بە سەرۆکایەتیی دێنگ شیائۆ پینگ، کە ئەو کات سکرتێری گشتیی چینی کۆمۆنیست بوو سەردانی مۆسکۆ دەکەن. بەڵام دانوستانەکانی ئەو وەڤدە لەگەڵ بەرپرسانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هیچی لێ ناکەوێتەوە و ئەندامانی وەڤدی چینی ڕۆژی بیست و یەکەمی ژووئیە مۆسکۆ بەجێدێڵن.

بەڵام گەورەترین گرفتی خرۆشۆف، کە لە ساڵی 1963دا بە توندی پێگەی ئەو لاواز دەکا شکستی پلان و گەڵاڵە کشتوکاڵییەکانی ئەوە، کە دیارە زیاتر هۆی وشکەساڵی و هەلومەرجی زەوییە تازە چێندراوەکان بوو. کەمایەسیی دەغل و دان ئەوەندە بوو، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ یەکەم جار ناچار بوو بۆ دابینکردنی لانیکەمی پێداویستییە نێوخۆییەکان ڕێژەیەکی زۆر دەغڵ و دان لەدەرەوە بێنێ و بە سەدان ملیۆن دۆلار لە خەزێنەی دراوی و ئاڵتوونی خۆی بۆ کڕینی گۆشت و مەوادی شیرەمەنی تەرخان بکا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی لە دەرەوە دەکڕدرا

پێداویستییە نێو خۆییەکانی پـێ دابـین نـەدەکرا و دەوڵـەت بـە ناچـاری سیسـتـەمی پشـك و دابەشینی کاڵای سەرەکییەکانی رەچاو کرد.

ئەگەرچی قـەیرانی کشـتوکاڵیی سـاڵی 1963 زیـاتر بـەهۆی وشکەسـاڵی و بـاردۆخ و هەلومـەرجی سروشـتییەوە سـەریهەڵـدا سیاسـەتەکانی خرۆشـۆفیش لـە دەرکـەوتنی ئـەو قەیرانگەلەدا دەوریان هەبوو، چونکی زەوییە بەیار و تازە کێڵـدراوەکان، کـە بـە زەویـی تـازە ئاوەدانکراو نێویان دەرکردبوو تۆفان و باهۆزی ناوچە بیابانییەکان زیاتر لە وشکەساڵی زیانیـان وێکەوت، کە نیشانەی هەڵەکردن بوو لە سەر مایەگوزاری بۆ ئاوەدانکردنەوە و نۆژەنکردنەوەی ئەو زەوییانە. لە زەوییە هاوبەشەکانیش‌دا بە هۆی ئەو ئاستەنگییانەی، کە بۆ کاری وەرزێـران لـە مڵکـە تایبەتییـەکانیان دا و فرۆشـتنەوەی زێـدە بەرهـەم خرابـووە بـەردەمیان ئاسـتی بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزی و ئەو داکشانە بە تایبـەتی لـە نـەبوونی گۆشـت و شیرەمەنیدا زۆر بەرچاوتر بوو. بەتایبەتی دەوڵەت هیچ بەرنامەیەکی بـۆ بەربـەرەکانێ لەگـەڵ هەلومەرجی نائاسایی و وشکەساڵی نەبوو و هەتا دەغڵ و دانیان لە دەرەوەی وڵات دابـین کـرد هێندێ بەشی وڵات تووشی قات و قڕی هاتن.

ریفـۆرم و رێوشـوێنە ئیدارییـەکانی خرۆشـۆف لـە سـاڵانی 1962 و 1963 شـدا لـە هۆکارگەلی سەرهەڵدانی قەیرانی کشتوکاڵیی سـاڵی 1963 دەژمێـردرا، چـونکی خرۆشـۆف ئەرك و وەزیفەی کۆمیتەکانی دابەش کردبوو بەسەر دوو بەشی پیشەسازی و کشتوکاڵدا و هەر بەشەی خستبووە ژێر چـاوەدێریی بەشـی پێوەندیـدار بـە خۆیـەوە لـە سـکرتاریا و کۆمیتـەی ناوەندیی حیزبدا. ئەو لێك جوێکردنەوەی ئەرکە جگە لەوەی بووە هۆی نارەزایـەتیی بەرپرسـی کۆمیتەکانی حیزبی لە کۆماری و پارێزگاکاندا، کە پێشتر کەوشەنی دەسەڵاتیان بەربڵاوتر بوو، تەکوزیی کاروبارەکانیشی شێواند، چونکی بەشەکانی پیشەسازی و کشـتوکاڵیی کۆمیتـەکان، کە هەرکام تارادەیەك سەربەخۆییان هەبوو بە کـردەوە دژ بەیـەك راوەسـتان و ئـەو دژایـەتی و هەڤرکییە زیاتر زیانی بە بەشی کشتوکاڵ گەیاند، کە ئیمکاناتی کەمترین بۆ دابین کرابوو.

لە نێوەراستی ساڵی 1963دا شان بەشانی قەیرانی کشتوکاڵی، کە قەیرانێکی سیاسـیش بوو لە سۆڤیەتی سەری هەڵدا و ئەویش گەشەی ئەدەبیاتی دژە ستالینی و بڵاوبوونەوەی کتێـب و وتار و هۆنراوە لەمەڕ جەنایەتەکانی رابردوو و دەستدرێژیکردنە سەر مـافی خـەڵك و پێشـێل کرانی لە لایەن کاربەدەستانی ئاسایشییەوە، کە ئێستاشـی دەگرتـەوە. پێشـەنگی ئـەو بزاڤـە سولێژنیستین بوو و، کە کتێبی (رۆژێك لە ژیانی ئیڤان دنیسڤیچ) لە سەرەتای سـاڵی 1963

هەزار بەرگی لێ چاپ و بڵاو بۆوە و لە ماوەی چەند حەوتوودا لە بازاڕدا نەما. شێعری شاعیرێکی گەنجی روسی بە ناوی یەڤتۆشنکۆ، کە لە پەسنی ئازادی و بە قیزەون زانینی سەردەمی گوشار و داپلۆسان و رێبازی تاك پەرستیدا بوو دەستاودەستی دەکرد و لە لاپەڕەکانی گۆڤاری نۆڤی‌میردا چیرۆك گەلێکی نوێ بە قەڵەمی نووسەرگەلێکی گەنجی روسی، کە بانگەشەکاری بیرۆکەی ئازادیخوازانە بوون بڵاو دەبوونەوە، بەڵام لەکۆبوونەوەی گشتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە لە مانگی ژووئەنی 1963 لە مۆسکۆ گیرا ئەو گرۆپیە تازەیە لە ئەدەبیاتی سۆڤیەتیدا بە توندی کەوتە بەر رەخنە و سۆسلۆف، کە لەو کاتدا وەك گەورەتری تیۆرداڕێژی سۆڤیەتی چاوی لێ دەکرا درێژەی ئەو رەوتەی بە شتێکی زیانبار و مەترسیدار زانی. خرۆشۆفیش، کە هەر خۆی ئیزنی بڵاوبوونەوەی یەکەمین بەرهەمی سۆلیژنیتسینیدا بوو و ئەو رێچکەیەی شکاندبوو لە کۆبوونەوەی مانگی ژووئەنی کۆمیتەی ناوەندیدا تا رادەیەك بیروبۆچوونەکانی رەخنەگرانی وەرگرت و بڕیار درا پێش بە هێندێ زێدەڕۆیی لە رەخنەگرتن لە رابردوو بگیردرێ، کە زیان بە پێگەی حیزب و رێکخراوگەلی دەوڵەتی دەگەیەنێ.

# 6

سەرەڕای تەواوی ئەو گیر و گرفتانەی، کە خرۆشۆف بە درێژایی ساڵی 1963 لەگەڵی دەستەویەخە بوو لە سەرەتای ساڵی 1964دا هیچ کس پێی وا نەبوو پلەی رێبەرایەتیی لێ دەستێندرێتەوە و لێدەخرێ. ئەو هێشتاش بە کەسایەتیی بەرز و بێ هاوتای حیزبی کۆمۆنیست و سۆڤیەتی لەقەڵەم دەدراو پاش کوژرانی کێنێدیی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە کۆتایی ساڵی 1963دا لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییشدا بێ هاوتا بوو. زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دەستەی سەرۆکایەتییەکەشی لە کاتی دەسەڵاتداریێتیی خرۆشۆفدا هەڵبژێردرابوون و هیچکامیان پێگەیەکی وەهایان نەبوو، کە بتوانن چاویان لە رێبەری و جێ نشینیی ئەو بێت. گەورەترین ئەندامانی دستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی سۆسلۆف و بێرژنێڤ بوون، کە یەکەمیان وای پێ باش بوو وەك تیۆرداڕێژی مەزنی حیزب بمێنێتەوە و دووەم یان، کە خۆی بە قەرزاباری خرۆشۆف دەزانی لەوەی، کە بەدەستی هێنابوو،

له دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا وەفـادارترین و تـۆخترین لایـەنگری ئـەو بـوو و خرۆشۆف لە سەردانەکانی خۆیدا بۆ نێوخۆ و دەرەوەی وڵات بـەو پـەڕی متمانـەوە چـاوەدێریی کاروباری حیزبی و دەوڵەتی بەو دەسپارد.

رۆژی حەڤدەهەمی ئاپریلی سـاڵی 1964 دەسـتەی سـەرۆکایەتیی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبی کۆمۆنیستی سـۆڤیەتی بـە بۆنـەی حەفتاهـەمین سـاڵهاتی لـە دایکبـوونی خرۆشـۆف جێژنێکی گرت و لەو کۆڕەدا بێرژنێف لە سەر خزمەتەکانی خرۆشۆف بە ئارمانجی کۆمـۆنیزم و یەکێتیی سۆڤیەتی زۆری بە شان و شەوکەتی خرۆشۆفدا هەڵگوت. پاش سێ مـانگ بێرژنێـف جگە لە ئەندامەتی لە دستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا بردرایە سکرتاریای حیزبیش و بوو بە سکرتێری دووەم ی کۆمیتەی ناوەندی لە دوای خرۆشۆف.

لە نیوەی دووەم ی سـاڵی 1964دا خـەبات و هـەوڵی ڕێبـەرانی کۆمۆنیسـتی چـین دژی خرۆشۆف چڕتر بۆوە و ئۆرگانی حیزبی کۆمۆنیستی چین لە دوو لێکدانەوەدا، کە لە مانگەکانی مارس و ژووئیەدا بڵاو بوونەوە ڕاستەوخۆ هێرشیان کردە سەر خرۆشۆف. لە لێکدانەوەی مانگی ژووئیەدا، کە لە ژێر ناوی ( سەبارەت بە کۆمۆنیزمی درۆیینی خرۆشۆف و وانە مێژووییـەکانی ئەو بۆ خەڵکی جیهان) بڵاو بۆوە و رادیۆ پەکەن چەندین حەوتوو لە بەرنامە نێودەوڵەتییـەکانی خۆیدا لە سەری ڕۆیشت، خرۆشۆف بـە ریفۆرمخـواز و خەیانـەتکار بـە ئارمـانجی کۆمـۆنیزم و خوازیاری گەڕانەوەی سەرمایەداری بۆ سۆڤیەتی تاوانبـار کرابـوو. راوێـژی ئـەو تەفسـیرەوای دەگەیاند، کە هەتا ئەو کاتەی خرۆشۆف سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیسـت و دەوڵـەتی سـۆڤیەتییە ئاشتی و ڕێککەوتن لە نێوان چین و یەکێتیی سۆڤیەتی مەحاڵە. لەگەڵ چڕتر بوونەوەی هێرشی چینییەکان بۆ سەر خرۆشۆف لە بڵاڤۆکەکانی مۆسکۆشدا هێـرش کرایـەوە سـەر چـینییەکان و خرۆشۆف بە مەبەستی پەراوێز خستنی کۆمۆنیستەکانی چین هەوڵی دا کۆنفرانسێکی دیکە بـۆ سەرکردە کۆمۆنیستەکانی جیهان پێك بێنێ، بەڵام ڕێبـەرانی حیزبـە کۆمۆنیسـتەکانی چـین و چەند وڵاتی ئاسیایی دیکە نەیانویست بەشداری ئەو کۆنفرانسـە بـن. وەڵام نەدانـەوە بـۆ ئـەو کۆنفرانسە لە لایەن هێندێ حیزبی کۆمۆنیستەوە وەك حیزبی کۆمۆنیستی کۆریای بـاکوور بـۆ خرۆشۆف بە شـێوەیەك سـووکایەتی بـوو و بـۆ یەکـەمین جـار لـەرزۆکبوونی پێگـەی حیزبـی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی لە نێو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهاندا دەرخست.

خرۆشۆف سەرەڕای ئەو هەمووە گیروگرفتە نێوخۆییەی خۆی، بەرنامـەی گـەڕان و گەشـت وگوزار بۆ وڵاتانی دەرەوەی، کە زیاتر باری بانگەشەی هەبوو لە خۆی تێك نـەدا و لـە مـانگی

مای هەتا سێپتەمبەری ساڵی 1964 سەردانی میسر و یۆگوسلاڤیا و سوید و دانیمارك و نەرویج و چیکوسلۆڤاکیای کرد. دوایین سەفەری ئەو بۆ دەرەوە وڵات سەردانی چیکۆسلۆڤاکیا بوو لە بیست و حەوتەمی ئووتەوە هەتا پێنجەمی سپتامبری 1964 و هەر لە کاتی ئەو سەفەرەیدا بوو، کە لە مۆسکۆ پیلانی لە سەر کار لابردنی ئەو دارێژرا.

بە پێی ئەو لێکۆڵینە وانەی، کە پسپۆڕی بەناوبانگی کاروباری سۆڤیەتی ساشاسیمۆن لە ژمارەی تایبەت بە رووداوگەلی دەیەی 1960 ی گۆڤاری فەرەنسیی هیستۆریا بڵاوی کردۆتەوە دووکەس واتە میخایل سۆسلۆف و ئالیکساندەر شلێپێن لە دڵی پیلانەکەدا بوون. پێشتر باسمان لە پێگەو رێز و حورمەتی سۆسلۆف لە نێو رێبەرانی سۆڤیەتیدا کردووە، بەڵام هەتا ئێستا باسی شلێپێن نەکراوە. شلێپێن لە ساڵانی کۆتایی حکوومەتی ستالیندا سەرۆکی رێکخراوی لاوانی کۆمۆنیست بووە وپاش مەرگی ستالینیش بۆ ماوەیەك هەر لەو پۆستەدا مایەوە هەتا ئەوەی کە توانی بە راکێشانی سەرنج و متمانەی خرۆشۆف بۆ لای خۆی و دەورگێڕانی لە پووچەڵکردنەوەی یەکەمین پیلانی لە سەر کار لابردنی ئەو لە ساڵی 1958دا لە جێگەی ژەنەراڵ سرۆف کرایە سەرۆکی کۆمیتەی ئاسایشی دەوڵەتیی (کا.گا.ب). شلێپێن ساڵی 1961 وێڕای پۆستەکانی دیکەی بوو بە ئەندامی سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیش. شلێپێن بە وەرگرتنی پۆستی نوێی حیزبی و دەوڵەتی دەستی لە سەرۆکایەتیی کا.گا.ب کێشایەوە، بەڵام دۆست و هاوکاری نزیکی خۆی واتە "سێمیت چاسنی" جێگەی گرتەوە و شلێپێن لە پلەی سەرۆکایەتیی کۆمیسیۆنی پشکنینی حیزبیدا پێوەندی و هاوکاریی نزیکی لەگەڵیدا هەبوو. هەربۆیەش کاتێك سۆسلۆف لە لاوازیی پێگەی خرۆشۆف و شکستەکانی ئەو لە سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەوەییدا تێگەیشت بەرلە هەر کەسێك باسی لە سەر کار لابردنی ئەوی لەگەڵ شلێپێن هێنایە گۆڕێ. هەردووکیان لە سەر پێویستبوونی لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف رێککەوتن و شلێپێن وەرگرتنی رەزامەندی و هاریکاریی کا.گا.ب ی بۆ راپەڕاندنی پلانەکە وەئەستۆ گرت. لە هەمان کاتدا هەردووکیان کۆك بوون لە سەر ئەوەی کە بەبێ رەزامەندیی بێرژنێڤ ئەو پلانە بەئاسانی سەرناگرێ . سۆسلۆف دواندنی بێرژنێڤی وەئەستۆ گرت و بێرژنێڤ لە سەر ئەو بەڵێنە، کە ئەو لە جێی خرۆشۆف دەکرێتە سکرتێری گشتیی حیزب زۆر بە خێرایی خۆی بە بەشداری بە لێ خستنی خرۆشۆف ئامادە کرد.

بە درێژایی مانگی سێپتەمبەر هەوڵ و تێکۆشان بۆ وەرگرتنی رەزامەندیی ئەندامانی دیکەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی درێژەی هەبوو و لەو ماوەیەدا بێجگە لە

زۆرینەی ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی چەند وەزیرێکی باڵای کابینەش وەك وەزیری بەرگری و بەرپرسانی سەربازی، کە بە هۆی کەمکردنەوەی گوژمەی سەربازی لە خرۆشۆف داغدار بوون ئامادەبوونی خۆیان بۆ لە سەر کار لابردنی ئەو راگەیاند. رۆژی 30 ی سپتامبری ساڵی 1964، کە بە تەواوی تەدارەکی کارەکەیان رێکخست خرۆشۆف لە سەر پێشنیار و پێداگریی بێرژنێڤ و سۆسلۆف بۆ ماوەی دوو حەوتوو پشوودان و حەسانەوە چووە ڤیلاکەی خۆی لە شێوەدوورگەی کریمە. لەو سەفەرەدا میکۆیانیش لەگەڵ خرۆشۆف چوو و وەك لە رواڵەتی مەسەلەوە دەردەکەوێ ئەویش لە پلانەکە ئاگادار نەبووە و بە ئامادەکاریی پێشوو لە مۆسکۆ دوورخرابۆوە بۆ ئەوەی تەگەرەیەك نەکەوێتە سەر رێگەی راپەڕاندنی پیلانی لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف.

لەماوەی دە رۆژی یەکەمی ئۆکتۆبەری ساڵی 1964دا لە هەموو بوارێکەوە بۆ لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف ئامادەکاری کرابوو و تەنانەت کەسانێك لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سکرتێری حیزبی کۆمارییەکان و پارێزگارە سەربەخۆکانی سۆڤیەتی یش بانگ کرانە مۆسکۆ بۆ ئەوەی ئاگاداری شتەکە بن و ئەگەر پێویست بە گێرانی کۆبوونەوەی گشتیی کۆمیتەی ناوەندی بکا خرۆشۆف وەك ساڵی 1957 دەرفەتی ئەوەی نەبێ زۆرینەی دەنگی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی رەگەڵ خۆی بخا. رۆژی دوازدەی ئۆکتۆبەر بۆ پێك هێنانی کۆبوونەوەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی وهێنانە بەرباسی مەسەلەی لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف لەبەر چاو گیرا، و بە رێکەوت هەر لەو رۆژەشدا زانا روسییەکان سەرکەوتنێکی تازەیان بەدەست هێنا و کەشتییەکی گەردوونگەڕیان بە سێ کەسەوە وەحەوا خست. خرۆشۆف لە شوێنی پشوودانەکەیەوە لە قەراخی دەریای رەش، بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ گەردوونگەڕەکان کرد و فیلمی تەلەڤزیۆنیی ئەو دیالۆگە دوایین وێنەی خرۆشۆف بوو، کە لە سەر شاشەی تەلەڤزیۆن بینرا.

لە کۆبوونوەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا، کە دوانیوەڕۆی رۆژی دوازدەی ئۆکتۆبەر لە کرێملین پێك هات سۆسلۆف دەستی بە قسان کرد و راپۆرتێکی پوخت و تێروتەسەلی لە هەڵەکانی خرۆشۆف لە بواری سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەکی و کاروباری حیزبیدا پێشکەشی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی کرد و بەوەی تاوانبار کرد، کە سەرەڕای رەخنە گرتن لە ستالین و رێبازی تاك پەرستی، ئێستا خۆی ئەو کارە دەکاو ویستی خۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا دەسەپێنێ. سۆسلۆف هەروەها گوتی، کە کاری بە پەلە و بێ لێکدانەوە و هەڵەشەیی خرۆشۆف گەلێك گرفتی لە سیاسەتی نێوخۆیی

و دەرەکیدا خستۆتە سەر رێگەی یەکێتیی سۆڤیەتی و لە کۆتاییدا داوای لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی کرد، کە بە لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف رێگە خۆش بکەن بۆ کردەوەی سەرکردایەتییەکی بە کۆمەڵ و چارەسەرکردنی ئەو گیر و گرفتانەی، کە لە حکوومەتی دووروودرێژی خرۆشۆفدا سەریان هەڵداوە.

ئەو بوارە لەبارەی پێشتر خۆش کرابوو ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی یەك لە دوای یەك راپۆرتەکەی سۆسلۆفیان پشتڕاست کردەوە. بەر لە هەمووان بێرژنێڤ، کە تازە لە سەفەرێکی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی گەڕابۆوە قسەکانی سۆسلۆف پشتڕاستکردنەوە و بە دوای ئەودا ئەوانی دیکەش قسەیان لە سەر کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی تاکەکەس و دامەزراندنی رێبەریی بە کۆمەڵ کرد.

جگە لە بێرژنێڤ، کە بڕیار بوو لە جێگەی خرۆشۆف بکرێتە سکرتێری گشتیی حیزب بەڵێن بە دوو کەسی دیکەی ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتیش درابوو، کە لە رێبەرایەتیی نوێدا پۆستی باڵایان پێ بسپێردرێ. یەکێك لەو دوانە نیکۆلای پیۆدگۆرنی بوو، کە ئەویش وەکو بێرژنێڤ لە وەرگرتنی پۆست و پلەوپایەدا قەرزداری خرۆشۆف بوو و بە رواڵەت پاش هەمووان ئاگادار کرایەوە و هەرکە بەڵێنی سەرۆکایەتیی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتیی پێدرا(پۆستێکی بێ دەسەڵات و شانۆیی وەك سەرۆك کۆماری) کەوتە گەڵ دژبەران و دووەم کەس ئالیکسی کاسیگین بوو، کە لە کۆتایی حکوومەتی ستالیندا کەوتبووە بەر رق و تووڕەیی و پاش کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی گەڕایەوە گۆڕەپانەکە و پۆستی سەرۆکی وەزیرانی بۆ لەبەرچاو گیرابوو.

پاش وەرگرتنی هاودەنگی لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا بڕیار درا خرۆشۆف و میکۆیان بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەی داهاتووی دەستەی سەرۆکایەتیدا بانگ بکرێنەوە مۆسکۆ. بێرژنێڤ بانگهێشتکردنەوەی خرۆشۆڤی بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکەدا وەئەستۆ گرت و بە بێ ئەوەی تێی گەیەنی و لە بڕیاری دەستەی سەرۆکایەتیی ئاگاداری بکاتەوە گوتی لەبەر ئەوەی مەسەلەیەك هاتۆتە پێشێ دەبێ خێرا خۆی بگەیەنێتەوە مۆسکۆ. بیرژنێڤ پێوەندیی بە میکۆیانیشەوە کرد و بە رواڵەت ئەوی ئاگادار کردەوە بۆ ئەوەی لە رێگەی گەڕانەوەدا خرۆشۆف هێور بکاتەوە و وای لێ بکا لەبەرامبەر بڕیاری کۆمیتەی ناوەندیدا رانەوەستێ و مل بانەدا.

خرۆشۆف دوانیوەڕۆی رۆژی سێزدەی ئۆکتۆبەر بە فڕۆکە گەیشتەوە مۆسکۆ و لەو پێشوازییەی، کە لێی کرا هەموو شتێکی لێ روون بۆوە. هیچ کام لە ئەندامانی دەستەی

سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی بۆ پێشوازیی ئەو نەهاتبوونە فڕۆکەخانە و تەنیا شلێپین ی سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی و سمێت چاسنی سەرۆکی کا.گا.ب لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستانی ئاسایشی هاتبوونە فڕۆکەخانە. خرۆشۆف و میکۆیانیان یەکراست بردە کۆبوونەی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی، کە لە کرێملین گیرابوو و لە وەڵامی پرسیاری پڕ لە تووڕەیی ئەودا، کە چ بووە؟ سۆسلۆف بە لە سەر ەخۆییەوە بڕیاری دەستەی سەرۆکایەتیی پێ ڕاگەیاند. خرۆشۆف، کە لە تووڕەییان دەلەرزی باسی خزمەتەکانی خۆی بە حیزب و یەکێتیی سۆڤیەتی کرد و ئەوانەی، کە لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا لە سایەی سەری ئەوەوە بەو جێگەیە گەیشتبوون بە چاوی هەمووانیدا دایەوە و پرسی، کە چ خراپەیەکی دەرهەق کردوون، کە بەو شێوەیە چاکەی دەدەنەوە؟ لە نێو ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا تەنیا میکۆیان، کە بەرواڵەت ئاگاداری پیلانەکە نەبوو لە سەر خرۆشۆف وەجواب هات و بەرگریی لێ کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هیوایەك بە رزگاریی خرۆشۆف نەبوو لە کۆتایی قسەکانیدا داوای لە خرۆشۆف کرد رێز بۆ دەنگی زۆرینە دانێ و دەست لە پۆست و کاروباری حیزبی و دەوڵەتی هەڵگرێ.

بە خرۆشۆفیان گوت ئەگەر مل بۆ بڕیاری دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی راکێشاو بە ویستی خۆی و بەناوی بەساڵاچوویی و نەخۆشی بکشێتەوە هەروا لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا دەمێنێتەوە و لە داهاتووشدا لە بڕیارگەلی حیزبی و دەوڵەتیدا پرس و راوێژی پێ دەکرێ، بەڵام خرۆشۆف ملی کەچ نەکرد و گوتی تەنیا پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی بۆی هەیە ئەو لە سەر کار لابەرێ. خرۆشۆف پێی وابوو، کە هەتا پێکهاتنی کۆبوونەوەی گشتیی کۆمیتەی ناوەندی دەرفەتێك بۆ گۆڕینی رەوشەکە دەقۆزێتەوە و، بەڵام ئەمجارەیان لە پێشدا چونێتیی پێکهاتنی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی ئامادەکاریی بۆ کرابوو و خرۆشۆف بەسەر سووڕماوییەوە تێگەیشت، کە زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی لەمۆسکۆن و هەتا چەند کاتژمێری دیکە لە کۆبوونەوەدا ئامادە دەبن.

لە یەکەمین ساتەکانی سەرلە بەیانیی رۆژی چواردەی ئۆکتۆبەردا خرۆشۆفیان بردە هۆڵی تەنیشت دیوی دەستەی سەرۆکایەتی، کە کۆبوونە وی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی لێ گیرابوو. بەر لەوەی خرۆشۆف بچێتە کۆبوونەوەکە سۆسلۆف و بێرژنێڤ چووبوونە کۆبوونەوە و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییان لە بڕیاری دەستەی سەرۆکایەتی ئاگادار کردبۆوە. دوای هاتنی خرۆشۆف سۆسلۆف کورتەی راپۆرتەکەی پێشووی خۆی دایە دەستەی سەرۆکایەتی و بڕیارەکانیشی لەمەڕ

ئەستاندنەوەی کاروبارو پۆستی حیزبی و دەوڵەتی لە خرۆشۆف بە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ڕاگەیاند. خرۆشۆف بە ڕواڵەتێکی شەکەت و خەمبار ئاماژەی بە کورتەیەك لە خزمەتەکانی خۆی بە حیزب و دوڵەتی سۆڤیەتی کرد و بەرپەرچی ئەو تۆمەتانەی دایەوە، کە لە ڕاپۆرتەکەی سۆسلۆفدا درابوونە پاڵی، بەڵام لە نزیکەی سەد وپەنجا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی (کە پتر لە سەد کەسیان لە سەردەمی خرۆشۆفدا ئەو پۆستەیان پێ درابوو) تەنانەت یەك کەسیشیان داکۆکی و بەرگرییان لە خرۆشۆف نەکرد.

ڕاپۆرتەکەی سۆسلۆف بە زۆرینەی دەنگ پەسند کرا و سۆسلۆف پاش ڕاگەیاندنی ئاکامی دەنگ وەرگرتنەکە وتی:" بە ڕەزامەندیی هاوڕێ خرۆشۆف بڕیاری پلینۆم بەو شێوەیە ڕادەگەیەندرێ، کە بەڕێزیان بە هۆی شەکەتی و ماندوویەتی بە دڵخوازی خۆی دەستی لە بەرپرسیارەتی و پۆستەکانی کێشاوەتەوە."

لە پلینۆمی چواردەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا پاش پەسند کرانی لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف، لیۆنید بێرژنێڤ وەك سکرتێری گشتیی حیزب و ئالیکسی کاسیگین بە سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی وەزیرانی یەکێتی سۆڤیەتی هەڵبژێران. وا دانرا، کە لە بیست کیلۆمەتریی مۆسکۆ ڤیلایەك بۆ خرۆشۆف دابین بکرێ بۆ ئەوەی قۆناغی خانەنشینیی خۆی لەوێدا بەسەر بەرێ. ئۆتۆمبیلێکی بە شۆفێر و چەند خزمەتکار و پارێزەری بۆ دانرا، کە دیارە زیاتر ئەرکی کۆنترۆل و چاوەدێریکردنی ئەویان لە ئەستۆ بوو و کاربەدەستانی کا.گا.ب، کە لە ڕێگەی بڕێك دوورترەوە ڕێگەی ڤیلاکەیان گرتبووە ژێر چاوەدێرییەوە بە کردەوە پێوەندیی خرۆشۆفیان لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا پساندبۆوە.

## 7

وێناچی داوەریکردن لە سەر سەردەمی حکوومەتی خرۆشۆف بەسەر یەکێتیی سۆڤیەتیدا زۆر ئاسان بێ، چونکی دەکرێ ئاماژە بە زۆر لایەنی چاك و خراپی حکوومەتەکەی بکەین، کە بایەخی مادی و مەعنە وییان وەك یەك نییە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بمانە واوەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، کە حکوومەتی خرۆشۆف بە گشتی بە قازانجی سۆڤیەتی و کۆمەڵگەی جیهانی بووە یان نە، دەڵێین بەڵێ.

سەرەتا دەبێ ئەو راستییەمان لەبەر چاو بێ، کە ئەگەر خرۆشۆف بە زیرەکی و وریایی خۆی لە یەکەمین مانگەکانی پاش مەرگی ستالیندا مۆرەیەکی چەپەلاو خراپی وەك بەریای لانەبردبا ستالینێکی دیکە و لەوانەیە توند و تیژتر و بێبەزەیی‌تر لەو دەبووە فەرمانڕەوای سۆڤیەتی و لەو رووداوگەلەی، کە لە ماوەی سالانی دەسەلاتدارێتیی خرۆشۆفدا هاتنە پێش ئەگەر ئەو بوایە لەوانەبوو ئاگری شەڕی سێیەمی جیهانی هەلایسێنێ و شارستانییەتی مرۆیی لەگەڵ مەترسیی تێداچوون رووبەڕوو بکاتەوە.

لە نێو ئەو کەسانەدا، کە لەوانەبوو جێگەی ستالین بگرنەوە هیچ کەس وەکو خرۆشۆف نەیدەوێرا جەنایەتەکانی ستالین لەقاو بدا و ئەگەر کەسانێکی وەکو مۆلۆتۆف یا مالینکۆف پالیان وە تەختی دەسەلات بدایە ئەو کارەسات و جەنایەتانە هەروا لە پەردەدا بە شاراوەیی دەمانەوە و سیاسەتی ستالینی بە شێوەیەکی دیکە درێژەی دەبوو. خرۆشۆف بەهەر هۆیەك جەنایەتەکانی ستالینی لەقاو دابێ بوێری و ئازایتیی ئەو لە ئاشکراکردنی ئەو راستییانەدا وەها زەبرێکی لە بتی ستالین و ستالینیزمدا، کە قەرەبووکردنەوە و بووژاندنەوەی هەرگیز مەیسەر و کردەنی نابێ.

ئازادیی سەدان زیندانیی سیاسی و دوورخراوەی ئۆردووگاکانی کاری زۆرەملی، کە شان بە شانی خەباتی دژە ستالینیی خرۆشۆف، روخساری کۆمەڵگای سۆڤیەتیی گۆڕی. بە هەزاران بیریار و نووسەر و هونەرمەندی بە ناوبانگ لە نێو ئەو ئازادکراوانەدا بەدی دەکران، کە هێندێکیان لە پێشکەوتنە سەرسووڕهێنەرەکانی سۆڤیەتی و لە بینای مووشەکە وشکارۆ پێوەکان و وەحەواخستنی مانگەدەسکردەکاندا رۆڵی بەرچاویان گێڕاو دەستەیەکی دیکە لە بوارە ئەدەبی و هونەرییەکاندا بزاڤێکی نوێیان وەڕێخست. ئەگەرچی خرۆشۆف ناچار بوو لە ژێر گوشاری ئەو کەسانەدا، کە تاقەتی ئەو بزاڤگەلەیان نەبوو هێندێ ئاستەنگی بۆ نووسەران و هونەرمەندانی سۆڤیەتی سازکردن، بەلام جلەوکردنی ئەو بزاڤگەلە کارێکی ئاسان نەبوو و جێ نشینانی خرۆشۆفیش ئیتر نەیانتوانی نووسەرگەلێکی وەکو سولێژنێتسین لە دەربڕین و نووسین بگێڕنەوە.

ئەو زەبرەی خرۆشۆف لە ستالین و ستالینیزمی وەشاند بووە هۆی لەرزۆکیی دەسەلات و هێژمونی سۆڤیەتی بەسەر ولاتانی سەر بە سۆڤیەتی و رووداوگەلی ناخۆشی پۆلۆنیاو هەنگاریا(و چەند ساڵ دواتر چیکۆسلۆڤاکیا)ی لێ کەوتەوە. دژبەرانی خرۆشۆف ئەو رووداوگەلە بە گەورەترین خاڵی لاوازی سەردەمی حکوومەتی خرۆشۆفدا دەنێن، بەلام لە روانگەی بێ

لایەنانە و ریالیستی‌یانەوە دەبێ ئەو هەولانە بە لایەنی باش و بە هێـزی سـەردەمی خرۆشـۆف بزانین، چونکی سەرەڕای دەستێوەردانە ناڕەواکانی سۆڤیەتی وردە وردە گوشار و سەرەڕۆیی لەو ولاتانەدا کەم بۆوە و دەسەلاتدارانی ولاتانی کۆمۆنیستی، کە لە سەر دەمـی سـتالیندا ناچـار بوون کوێرانە پێملی بڕیارەکانی مۆسکۆ بن لانیکەم لە بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی خۆیاندا ئازادییەکی رێژەییان وەرگرت.

لە سیاسەتی نێوخۆییشدا دەکـرێ هەڵـەکانی خرۆشـۆف لـە بـواری کشـتوکاڵیدا بـە گرینگترین خاڵی لاوازی ئەو دابنرێ. خرۆشۆف، کە خۆی بە پسپۆڕی بێ ئەملاولای بواری کشتوکاڵ دەزانی بە هۆی ئەو سەرکەوتنانەی، کە لە یەکـەمین سـاڵەکانی پـاش مـەرگی ستالین لەو بوارەدا بەدەستی هێنابوو لە خۆی دەرچوبوو و بە بێ راوێژ لەگەڵ کەسانی دیکە سەرەڕۆیانە لە بواری کشتوکاڵدا بڕیاری دیکەی دەدا، کـە لـە یەکـەمین سـالانی دەیـەی 1960دا شکسـت و داکشـانی دەغـڵ و دانـی لێکەوتـەوە و لـە سـاڵی 1963دا بـە هەڵەکانی خۆی زانـی و گەلاڵەیـەکی گشـتیی بـۆ پێداچـوونەوە و ریفـۆرم لـە سیاسـەتە کشتوکاڵییەکانی سۆڤیەتیدا ئامادە کردبوو و لە مانگی ئووتی 1964دا بۆ تاوتوێکردن و تێبینی ناردرایە کۆمیسیۆنی پسپۆڕیی کاروباری کشتوکاڵیی کۆمیتەی ناوەندی. بڕیـار بوو ئەو گەلاڵەیە پاش تاوتوێکردنو هەڵسەنگاندنی لە کۆمیسیۆنی پسـپۆڕیی کاروبـاری کشتوکاڵیی کۆمیتەی ناوەندیدا بخرێتـە بـەر بـاس و لـە سـەرەتای سـاڵی 1965 ـەوە جێبەجێ بکرێ، بەلام لەگەڵ لە سەر کار لابرانی خرۆشۆف پێڕاگەیشتن بەو گەلاڵەیە راگیرا، هەرچەندە لەو گەلاڵە نوێیەدا، کە بۆ پێداچوونەوەی سیاسەتە کشتوکاڵییەکانی سۆڤیەتی ئامادە کرا هێل و بنەما گشتی و سەرەکییە کانی گەلاڵەی پێشنیاریی خرۆشۆفیش رەچاو کرا.

هەڵەی دیکەی خرۆشۆف لە سیاسەتی نێوخۆییـدا، کـە پێگـەی ئـەوی لـە نێـو ریزەکـانی حیزبیدا بە توندی لاواز کرد دابەشینی ئـەرکی سـکرتێرەکانی حیـزب بـوو بەسـەر دوو بەشـی پیشەیی و کشتوکاڵیدا و گەلاڵەی نـوێی پێداچـوونەوە بـە ریزەکـانی حیزبـدا. بـە پێـی ئـەو گەلاڵەیە، کە دەبوایە هەتا گیرانی کۆنگرەی بیسـت و سـێیەمی حیـزب لـە سـاڵی 1966دا جێبەجێ بکرێ، لانیکەمی یەك ل ەسەر سێی ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدی و کۆمیتـەکانی کۆمارییەکان و پارێزگا سەربەخۆکان لە مەودای نێوان دوو کۆنگرەدا دەگۆڕدران. ئەو هەولانـە

پێگەی سکرتێرە حیزبییەکان و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییان لەرزۆك کرد و بواری بۆ هاودەنگی و هاریکاریی ئەوانیان لەگەڵ ئەو ڕەوتەدا خۆش کرد، کە دژی خرۆشۆف ساز بوو.

ڕەوشی ئابووریی سەردەمی حکوومەتی خرۆشۆف سەرەڕای شکستهێنان لە بەڕێوەبردنی بەرنامە کشتوکاڵییەکاندا، لە بەشی پیشەشازی و بەرهەمهێنانی وزە و گەشەی بازاڕدا باش و ئەرێنی بوو. دیارە لە بەشی پیشەسازیدا زیاتر گرینگی درایە بەشی پیشەقورسەکان و مووشەك سازی و وەحەوا خستنی مانگە دەسکردەکان خەرجی لەڕادەبەدەری خستنە سەر شان، بەڵام سەرەڕای بەزاندنی ئەمریکا لە هەڤرکێی داگیرکردنی گەردووندا بەڵێنەکانی خرۆشۆف بۆ گەیاندنی ئاستی ژیانی خەڵکی سۆڤیەتی بە رادەی ئەمریکا شتێکی ناکردەنی و خەیاڵی دەهاتە بەرچاو. هەتا ئەو جێگەی، کە خۆیشی لە دووساڵی کۆتایی حکوومەتەکەیدا خۆی لە دووپاتەکردنەوەی ئەو بەڵێنانە دەبواردو جارێکی کاتێك هەواڵنێرێك لە سوید ئەو بەڵێنانەی وەبیر هێنایەوە خرۆشۆف جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی خستە دوای کۆتایی دەیەی 1960.

بەڵام گرینگترین بەرهەمێك، کە خرۆشۆڤ لە سیاسەتی جیهانیدا لە پاش خۆی بە جێهێشت بوارڕەخساندن بۆ پەرە پێدانی پێوەندییەکانی کۆمۆنیزم لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا و ڕەوتێکە، کە پاش ئەو هەروا درێژەی کێشاو بە سیاسەتی نەهێشتنی گرژییەکان ناوی دەرکرد. خەباتی دژە ستالینیی خرۆشۆف، کە لە کۆنگرەی بیستەمەوە هەتا کۆنگرەی بیست و دووەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی درێژەی کێشا شان بەشانی ئەو خەباتە و لەگەڵیدا گەڵاڵەی تیزەی نوێی"ناچاربوونی جەنگ" و پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانەی نێوان سیستەمە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگاو ئەگەری دەستەبەربوونی سۆسیالیزم لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەوە و بە بێ توندو تیژی و شۆڕش، کە نەك هەر لەگەڵ ستالینیزم و شێوازی ئەو یەکیان نەدەگرتەوە بەڵکو لە گەڵ بیروبۆچوونەکانی مارکس و لینینیشدا دژایەتیی هەبوو و بە گۆڕانێکی بنەمایی لە ڕوانگەکانی کۆمۆنیزمدا لە قەڵەم دەدرا.

لە کۆبەندییەکی کۆتاییدا دەبێ سەردەمی خرۆشۆف بە خاڵێکی وەرچەرخانی گرینگ و مێژوویی لە مێژووی کۆمۆنیزم بزانین. خرۆشۆف نە تیۆرداڕێژێکی بە توانا بوو و نە خوێندەواریی بەرز و نە موتالای باشیشی هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا بە پشتبەستن بە لێوەشاوەیی و ئەزموونەکانی خۆی گۆڕانێکی لە جیهانی کۆمۆنیزمدا پێك هێنا، کە تەنیا کاری کەسێکی ناوازەی وەك ئەو بوو. گەورەترین تایبەتمەندیی باشی خرۆشۆف ئازایەتیی ئەو بوو لە دەربڕینی بیروبۆچووندا بوو و گەورەترین خاڵی لاوازیشی بڕیاردانی بە پەلە و بێ هەڵسەنگاندن بوو.

گەورەترین تاوانی ئەو سەرکوتی بێ بەزەییانەی شۆڕشی هەنگاریاو کێشـانی دیـواری بـەرلین و گەورترین خزمەتیشی لە قاودانی کارەساتەکانی سـەردەمی سـتالین و ئـازادیی سـەدان هـەزار بەندیی و دوورخراوەی ئۆردووگاکانی بێگارییپێکردن بـوو، کـە خـۆی دەراو خۆشـکردنێك بـوو بۆکردنەوەی ڕێگەکانی پێوەندی گرتن لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاواو سەرەتای ئەو چاخەی بـە نەهێشتنی گرژییەکان ناوی دەرکرد.

# بەشی نۆیەم

# سەردەمی بێرژنێڤ

لیۆنید ئیلیچ بیرژنێڤ رۆژی چواردەی ئۆکتۆبەری ساڵی 1964 لە تەمەنی پەنجاو هەشت ساڵیدا بۆ سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەڵبژێردراو رۆژی دەی نۆڤەمبەری ساڵی 1982 لە حاڵێکدا هاوکات سکرتێریی گشتیی حیزبی کۆمۆنیست و سەرۆکی دەوڵەتیش بوو(سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی)، لە تەمەنی 76 ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی ئەو بەسەر سۆڤیەتیدا، کە زیاتر لە هەژدە ساڵی خایاند لە دوای ستالین درێژترین ماوەی دەسەڵاتدارێتیی رێبەرێکی سۆڤیەتیی بوو.

لیۆنیدبیرژنێڤ ساڵی 1906 لە شاری دنیپرۆدرژینسك ی ئۆکراین و لە بنەماڵەیەکی کرێکاردا لە دایك بوو. باوکی لە کارخانەی پۆڵاسازیدا کاری دەکرد و لیۆنید خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەیەکدا، کە بۆ منداڵی کرێکاران ساز کرابوو تەواو کرد. لە ماوەی شۆڕشی بۆلشەڤیکیی روسیادا تەمەنی یازدە ساڵ بوو و هەتا ساڵی 1923، کە بوو بە ئەندامی رێکخراوی لاوانی کۆمۆنیستی کۆمسۆمۆڵ درێژەی بە خوێندندا. بێرژنێڤ ماوەیەك لای باوکی لە کارخانەی پۆڵاسازی خەریکی کار بوو و وێڕای کارکردن لە بواری ئەندازیاریدا درێژەی بە خوێندندا. ساڵی 1931 بێرژنێڤ بوو بە ئەندامی فەرمیی حیزبی کۆمۆنیست و یەکەمین کاری دەوڵەتیی ئەو زەوی پێوان و نەخشە هەڵگرتن لە کێڵگەکان لە سەردەمی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵدا بوو. ساڵی 1938، کە ژمارەیەك بەرپرسانی حیزبی کۆمۆنیست لە رەوتی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالیندا لێ خرابوون، خرۆشۆف، کە لەو کاتدا سکرتێری حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین بوو بێرژنێڤی بە فەرمی دامەزراند.

یەکەمین بەرپرسیارەتیی فەرمیی بێرژنێڤ لە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا سەرۆکایەتیی کۆمیتەی حیزبیی بەشی دنیپرۆپێترۆفسک بوو. ساڵی 1939 بێرژنێڤ کرایە بەرپرسی پروپاگەندە و بانگەشەی حیزبی لە ئۆکراین و هەتا سەرەتای هێرشی هێزەکانی هیتلەر بۆ سەر سۆڤیەت لە ژووئەنی ساڵی 1941دا ئەو پۆستەی هەر هەبوو. لەگەڵ هەڵایسانی شەڕ بێرژنێڤ کرایە کۆمیسێری سیاسیی لەشکری سوور لە بەرەی چوارەمی ئۆکرایندا و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا لە ژێر چاوەدێریی راستەوخۆی خرۆشۆفدا لە سوپادا خزمەتی دەکرد. بێرژنێڤ لە سەرەتای خزمەتی خۆیدا وەکو کۆمیسێری سیاسیی لەشکری سوور پلەی سەرهەنگیی پێدرابوو، بەڵام ساڵی 1945، کە شەڕ کۆتایی پێ هات بوو بە سەرلەشکەر(ئامر لیوا).

بێرژنێف ساڵی 1949 بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی ئۆکراین و ساڵێك دواتر وەك سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی کۆماری مۆلداڤیا خزمتکردن لەو کۆمارییەیدا پێ ئەسپێردرا.

لە کۆنگرەی نۆزدەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە دوایین کۆنگرەی بەر لە مەرگی ستالین بوو بێرژنێڤ لە سەر پێشنیاری خرۆشۆف خرایە لیستەی ناونووس کراوان بۆ ئەندامەتیی لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا و بۆ یەکەمین جار لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا لەگەڵ ستالین بەرەورِو بۆوە.

بێرژنێڤ پاش مەرگی ستالین بە پشتگیریی تایبەتیی خرۆشۆف پلە حیزبییەکانی بە خێرایی بڕی و بەرەوسەر هەڵکشا. ساڵی 1953 بێرژنێڤ کرایە راوێژکاری سیاسی یا نوێنەری حیزب لە هێزی دەریاییدا، و لە فێبریی ساڵی 1945دا وەکو سکرتێری دووەم ی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان بۆ ئەو کۆمارییە بەڕێ کرا. بێرژنێڤ لە مانگی ئووتی 1955دا کرایە سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان و ساڵێکی پێنەچوو، کە لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا سەرەتا کرایە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و دواتر وەك پاڵێوراوی ئەندامەتی لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا هەڵبژێردرا.

برێك دوای کۆنگرەی بیستەم بێرژنێڤ لە لایەن خرۆشۆفەوە کرایە سکرتێری حیزب. ئەندامەتیی بێرژنێڤ لە سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیدا پێگەی ئەوی لە حیزبدا جارلەگەڵ جار بە هێزتر کرد و ئەو راسپاردە هەستیارانەی، کە لە لایەن خرۆشۆفەوە بەو دەسپێردران، وردە وردە بێرژنێڤیان کردە یەکێك لە بەرپرسانی دەسترۆیشتوو و بە دەسەڵاتی حیزب. لە قەیرانەکەی ساڵی 1957دا، کە خرۆشۆف لە دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیدا کەوتە کەمینە، بێرژنێڤ بە هەموو تواناوە

بەرگری و پشتیوانیی لە سەروەرەکەی خۆی کرد و لە جوابی ئەو خزمەتانەدا لە مانگی ژووئەنی ساڵی 1957دا کرایە ئەندامی فەرمیی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب.

بە لابردن و وەلانانی ئەندامانی کۆن و بە بڕشتی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی (مۆلۆتۆف و مالینکۆف و کاگانۆڤسچ ) بێرژنێڤ، کە تەواو لە ژێر چەتری پشتیوانیی خرۆشۆفدا بوو وردە وردە بوو بە دەستڕۆیشتووترین ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی و ساڵی 1960 وێڕای پۆستە حیزبییەکەی لە جێگەی ڤۆرشیلۆڤیش کرایە سەرۆکی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتی، کە پۆستێکی کارتۆنی و لە ئاستی سەرۆك کۆماریدا بوو. بێرژنێڤ لە سەرەتای ساڵی 1964دا بە قازانجی میکۆیان وازی لەو پۆستە هێناو لە سکرتاریای حیزبدا کرایە جێگری خرۆشۆف. بێژنێڤ لە پۆستە تازەکەیدا پێوەندییەکی چڕی لە گەڵ سۆسلۆفدا، کە یەکێك بوو کۆنترین و دستڕۆیشتووترین ئەندامانی سکرتاریا و دەستەی سەرۆکایەتی کۆمیتەی ناوەندی پێك هێناو دۆستایەتی و نزیکایەتیی ئەو جووتە پیلانی هاوبەشی بۆ لێخستنی خرۆشۆف لێ کەوتەوە.

سۆسۆلۆف و بێرژنێڤ لەو پیلانەدا، کە بە هاریکاریی دامودەزگاکانی ئاسایش و تەناهی دژی خرۆشۆف رێکیان خست لە سەر یەك بنەما پێکەوە رێککەوتبوون و ئەویش ئەوەی کە پاش خرۆشۆف دەبێ بەرپرسیارەتییەکان لە نێوان چەند کەسێکدا دابەش بکرێن و رێبەرایەتییەکی بە کۆمەڵ بە مانای راستەقینەی وشە لە سۆڤیەتیدا پێك بێ. سۆسلۆف خۆی هیچ حەزی لە وەرگرتنی بەرپرسیارەتی و پۆستی بەڕێوەبەری نەبوو هەربۆیەش توانیی لەگەڵ ئەوانیتر رێککەواو دوو پۆستی گرینگی حیزبی و دەوڵەتیی خرۆشۆف لە نێوان دووکەسدا واتە بێرژنێف و کاسیگیندا بەش بکا. ئەندامێکی دیکەی کۆمیتەی ناوەندی واتە پادگۆنی یش، کە هەتا دوایین رۆژ بەرگری و داکۆکی لە خرۆشۆف کرد بۆ وەرگرتنی پۆستی رێزدارانە و کارتۆنیی سەرۆکی دەستەی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی لەبەرچاو گیردراو بەرپرسانی دیکەی حیزبی، کە کەوتنە گەڵ کارگێڕانی سەرەکی و بەڕێوەبەرانی سەرەکیی پیلانەکە دڵنیا کرانەوە، کە پاش خرۆشۆف لە بەڕێوەبەریی حکوومەتیدا رۆڵی باشتریان پێ دەدرێ.

ئالیکسی کاسیگین، کە دوای لە سەر کار لابردنی خرۆشۆف پۆستی سەرۆکی وەزیرانی پێ ئەسپێردرابوو یەکێك بوو لە پسپۆڕە بەرزەکانی ئابووری لە یەکێتیی سۆڤیەتیدا. ئەو لە ساڵانی کۆتایی دەسەڵاتی ستالیندا ماوەیەك وەزیری دارایی و دواتر وەزیری پیشەسازییە سووکەکان و

چنین بوو و دوای مەرگی ستالین وەکو جێگری سەرۆکی وەزیران چاوەدێریی بەسەر چەند وەزارەتخانەدا دەکرد، کە کاروباری ئابوورییان لە ژێر چاوەدێریدا بوو. کاسیگین ساڵی 1959 بوو بە سەرۆکی کۆمیسیۆنی بەرنامەی سۆڤیەتی یا Gosplan و ساڵی 1960 کرایە جێگری یەکەمی سەرۆکی وەزیران و ئەندامەتیی دستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندییشی پێ درا. بە وەها پێشینەیەکەوە هەڵبژاردنی کاسیگین بۆ پۆستی سەرۆکی وەزیرانی سۆڤیەتی نیشاندەری ئەو راستییە بوو، کە رێبەرایەتیی نوێی سۆڤیەتی سەرنجێکی تایبەت دەدا بە چارەسەریی ئەو گیروگرفتە ئابوورییانەی، کە لە ساڵانی دوایی حکوومەتی خرۆشۆفدا هاتبوونە گۆڕێ.

## 2

مین گۆڕانێك، کە پاش لێکەوتنی خرۆشۆف لە سیستەمی ئیداریی سۆڤیەتیدا پێك هات گەڕانەوە بوو بۆ بنەمای سانترالیزم و دەست ئاوەڵاترکردنی وەزارەتخانەکان و دابەشینی ئەرکی سکرتێرەکانی حیزب بەسەر بواری کشتوکاڵی و پیشەسازیدا هەڵوەشێندرایەوە و لە هەر کام لە کۆمارییەکان و پارێزگا سەربەخۆکانی وڵاتدا سکرتێرێکی حیزبی بۆ چاوەدێریی و رێکوپێککردنی کاروبارەکان دەسنیشان کرا. بۆ سەقامگیریی و دڵنیایی زیاتر لە پۆستە حیزبییەکاندا ئەو پێڕەوە نێوخۆییەی حیزب هەڵوەشێندرایەوە، کە گۆڕینی لانیکەمی یەك لە سەر سێی بەرپرسانی حیزبی و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی لە مەودای دیاریکراودا پێشبینی دەکرد و هێندێ لە بەرپرسانی حیزبی، کە لە کۆتایی حکوومەتی خرۆشۆفدا لە سەر کار لابرابوون کاروباری دیکەیان پێ ئەسپێردرا.

لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنێکی هەمەلایەن بۆ چارەسەریی گیروگرفتەکان کشتوکاڵ دەستی پێکرد و دواجار لە کۆبوونەوەیەکی تایبەتیی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیدا، کە بۆ تاوتوێکردنی بواری کشتوکاڵ پێکهاتبوو کۆمەڵێك گۆڕان و ریفۆرمی نوێ لە بەڕێوەبەریی کاروباری کێڵگە دەوڵەتی و هاوبەشەکان و زەوییە تازە نۆژەنکراوەکاندا پێکهات. بۆ پەرە پێدان و گەشەی پیشەسازیی سەر بە بواری کشتوکاڵ بە تایبەتیی کارخانەکانی بەرهەمهێنانی هێزدەرە کیمیاییەکان گوژمەی زیاتر لەبەر چاو گیردرا و بۆ هاندانی وەرزێران بۆ کارکردن و

بەرهەمهێنانی زیاتری بازنەی ملکە تایبەتییەکانی هەر بنەماڵەیەکی وەرزێر لە دۆنمێکەوە گەیشتە دوو دۆنم و ئاستەنگییەکانی پێشوو لەمەڕ بەخێوکردنی پەلەوەر لە سەر رێ لابران.

شێوازی خرۆشۆف لە حکوومەتدا زیاتر لە سەر بنەمای داهێنانی خۆی و پێوەندیی راستەوخۆ لەگەڵ خەڵکی رەشایی بوو، بەڵام جێگرەوەکانی وازیان لەو شێوازە هێناو ئۆرگانە حیزبییەکان و رێکخراوە دەوڵەتییەکان رۆڵێکی زیاتریان لە حکوومەت و بڕیارە بنەماییەکاندا پێدرا. رێبەرە نوییەکان شێوازی بانگەشە و سەفەری پڕ لە هەڵڵای خرۆشۆفیان وەلا نان و بۆ پتەوکردنی کۆڵەکەی حکوومەتەکەی خۆیان دامودەزگاکانی ئاسایش و تەناهیيان بە هێزکردن. ئەو بڕە ئازادییانەی لە سەردەمی خرۆشۆفدا بە نووسەران و رۆشنبیران و هونەرمەندان درابوو وردە وردە لەنێو بران و خەباتی دژە ستالینی، کە بواری بۆ ئەو جۆرە ئازادییانە خۆش کردبوو وەستێندرا تا ئەو جێگەیەی، کە شەش مانگ پاش لە سەر کار لابردنی خرۆشف لە بلاڤۆکەکانی سۆڤیەتیدا وتارگەلێك لە پەسنی ستالیندا بڵاو کرانەوە و رۆژی نۆیەمی مانگی مای ساڵی 1965 بێرژنێڤ لە ئاخافتنێکدا بە بۆنەی بیستەمین ساڵهاتی سەرکەوتن لە شەڕی دووەمی جیهانیدا باسی رۆڵی حاشاهەڵنەگری ستالینی کرد.

لە سیاسەتی دەرەکیدا رێبەرانی نوێی سۆڤیەتی بەر لە هەر شتێك بۆ چارسەریی کێشەکانی خۆیان لەگەڵ چیندا دەست بەکار بوون. چینییەکان رۆژی شازدیەمی ئۆکتۆبەری ساڵی 1964 واتە تەنیا دوو رۆژ پاش لە سەر کار لابرانی خرۆشۆف یەکەمین بۆمبی ناوکیی(ئاتۆمی)ی خۆیان تاقی کردبۆوە و ببوونە هێزێکی ناوکی. چۆئێن‌لای سەرۆك وەزیرانی چین رۆژی شەشەمی نۆڤەمبەری ساڵی 1964 لە سەر بانگهێشتنی سەرۆك‌وەزیرانی نوێی سۆڤیەتی چووە مۆسکۆ و کاسیگینیش لەبەرامبەردا لە فێبریبەی 1965دا سەردانی پەکەنی کرد. کاسیگین لە پەکەنەوە چووە هانە وایی پایتەختی ڤێتنامی باکوور و سەردانەکەی لە هانە وای هاوکات بوو لەگەڵ گەرمەی شەڕی ڤێتنام و سەرەتای بۆمبارانی ڤێتنامی باکوور لە لایەن فڕۆکە ئەمریکییەکانەوە.

لە ماوەی ساڵی 1965دا شەڕی پڕۆپاگەندە لە نێوان مۆسکۆ و چیندا وەستێندرا، بەڵام ناکۆکییە بنەماییەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتە هەر لە جێگەی خۆی مایەوە. توندتربوونی شەڕ لە ڤێتنامدا بە جۆرێك هاوئاهەنگیی لە یارمەتیی بە ڤێتنامی باکوور و شەڕی پڕۆپاگەندەیی لە نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا ساز کرد، بەڵام مۆسکۆ و پەکەن وێڕای هاوکاری بۆ بەهێزترکردنی ڤێتنامی باکووری لە بەرامبەر ئەمریکادا بۆ تەشەنەی

دەسەڵاتی خۆیان لەو وڵاتەدا کەوتنە هەڤرکێیەکی شاراوە لەگەڵ یەکتر، کە هەتا کۆتـایی شەڕی ڤیتنام و لەپاش ئەویش هەر درێژەی هەبوو.

سۆڤیەتی لە ماوەی ساڵی 1965دا هەروا لە بواری گـەردوون پێویـدا بـاڵاتربوونی خـۆی لەچاو ئەمریکا پاراست و لە ڕۆژەکانی هەژدەیەم و نۆزدەی مارسی هەر ئەو سـاڵەوە گـەردوون گەڕێکی ڕوسی بە ناوی لیۆنۆف توانیی بۆ یەکەمین جار وێـڕای گـەڕان لـە دەوری زەویـدا لـە کەشتییەکەی خۆی بێتە دەرێ و لە کەشدا پیاسە بکا، بەڵام لە سـاڵی 1965 ـەوە بـەولاوە بەهۆی کەمبوونەوەی گوژمەی لێکۆڵینـەوەی بـواری گـەردوون پێـوان، دەسـتوبرد و خێرایـی پێشکەتنەکانی سۆڤیەتیی لە هەڤرکێکانی داگیرکردنـی گەردوونـدا کـەم کـردەوە و بیریـارانی ئەمریکی توانییـان لـە قۆناغـەکانی دیکـەی ئـەو هەڤرکییـەدا وەکـو دابەزانـدنی یەکـەمین گەردوونگەڕەکان لە سەر گۆی مانگ وەپێش سۆڤیەتییەکان کەون.

لە کۆتاییەکانی ساڵی 1965دا ڕێبەرانی نوێی سۆڤیەتی زیاتر خەریکی ئامادەکاری بوون بۆ گرتنی بیست و سێیەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سـۆڤیەتی و بـۆ سـەقامگیرکردنی پێگەی خۆیان لەو کۆنگرەیەدا پۆستە هەستیارەکانیان لەو مۆرە و بەرپرسانە ئەستاندەوە، کـە بە کۆسپی سەر ڕێگەی خۆیانیان دەزانین. یەکێك لەو مۆرانە، کە بێرژنێڤ بە مەترسیی دەزانی ئالیکساندر شلێپێن بوو، کـە ڕۆڵێکـی بەرچـاوی لـە لـێ خسـتنی خرۆشـۆفدا هـەبوو و بـەو دەسەڵاتەی، کە لە پۆستی سەرۆکایەتیی کۆمیسیۆنی پشکنینی حیزبیدا وەدەسـت هێنـابوو و دەیتوانی ببێتە خەنیمێکی جیدی بۆ بێـرژنێڤ. بێـرژنێڤ بـە هەڵوەشـاندنەوەی کۆمیسـیۆنی پشکنینی حیزب ئەو پێگەیەی لە دەست دەرهێناو شلێپێن لەگەڵ ئەوەدا، کە هەتا چەند ساڵی دیکەش ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندی و یەکێك لە سـکرتێرەکانی حیـزب بوو نەیتوانی لە بەرامبەر بێرژنێڤدا ڕاوەستێ.

ڕۆژی نۆیەمی دیسێمبەری 1965 پادگۆرنی بە جێگەی میکۆیان کرایە سەرۆکی دەستەی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتی، بەڵام هاوکات لەگەڵ وەدەستهێنانی ئـەو پۆستە شانۆییەدا سکرتێریی حیزبی لێ ئەستێندرایەوە و بەو شێوەیە پێگەی سەرەکیی خۆی لە حیزبدا لە دەست دا. پادگۆرنی هەتا ئەوکاتـەی ئـەو پۆسـتەی بەدەسـت بـوو بـە یـەکێك لـە ڕێبەرانی سۆڤیەتی لەقەڵەم دەدرا، بەڵام لە ڕاستیدا هێز و دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو.

گرینگترین ڕووداوی ساڵی 1966 لە سۆڤیەتیدا، گیرانـی کـۆنگرەی بیسـت و سـێیەمین کۆنگرەی حیزب یا یەکەمین کۆنگرەی حیزبی لە دوای لێکەوتنی خرۆشۆفەوەیە. بەر لە گیرانـی

ئەو کۆنگرەیە ڕێبەرانی نـوێی سـۆڤیەتی بـە سـنووردارکردنی نووسـەران و دەستبەسـەرکردنی ژمارەیەك ڕۆشنبیری ناڕازی نیشانیان دا، کە تاقەتی بیستنی ڕەخنـەیان نییـە. لـە ڕۆژی دەی فێبریيەی 1966دا دوو نووسەری ناڕازی بە ناوەکانی ئاندرێ سیناڤسـکی و یۆلیـدانیل، کـە بەرهەمەکانیان لە بلاڤۆکی نهێنی یان لە دەرەوەی وڵات چـاپ و بـڵاو کردبـۆوە بـە تۆمـەتی بانگەشە بە مەبەستی زیان گەیاندن بە یەکێتیی سۆڤیەتی و بڵاوکردنەوەی بابەتگـەلی گاڵتـەو گەپی تۆمەتبارانە دژی سیستەمی کۆمەڵایـەتی و دەوڵـەتی سـۆڤیەتی دادگـایی کـران و لـە ئاکامی دادگاییەکی پێنج ڕۆژەدا هەردووکیان حەوت ساڵ بەندیخانە و کار لـە ئۆردووگاکـانی بێگارییاندا بۆ بڕایەوە. مەحکووم کرانی ئەو دوو نووسەرە، کە لە دەرەوەی وڵاتـیش ناوبانگیـان دەرکردبوو هەڵلاڵیـەکی گـەورەی نایـەوە و وەکـو گەڕاندنـەوەی سـەردەمی سـەرکوتی سـتالین مەحکووم کرا.

بیست و سێیەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لـە بیسـت و نۆیـەمی مارسـی 1966دا گیرا و هەتا هەشتەمی ئاپریلی خایاند. بە پێچەوانەی کۆنگرەی بیست و دووەم لـە ڕاپۆرتی بێرژنێڤ و ئاخافتنەکانی نوێنەراندا هیچ جۆرە ڕەخنەیەك لە سـتالین و سـەردەمەکەی ناگیردراو بە پێچەوانەوە ڕاوێژی قسەکان و دەربڕینی ئـاخێوەرانی سـەرەکی کـۆنگرە لـە سـەر بنەمای خۆ بواردن لـە خـەباتی دژە سـتالینی و ڕەخنـە گـرتن لـە سیاسـەتە ئابوورییـەکانی سەردەمی خرۆشۆفە. کۆنگرەی بیست و سێیەم هەروەها پێ لە سەر گوشـاری یـاتر بـۆ سـەر، نووسەران و هونەرمەندان و پێشگرتن لە پەرە پێدانی بیروبۆچوونی بۆرژۆوایانـەدا دەگرێتـەوە و پێشنیاری زیـاترکردنی وریـایی و چـاوەدێری بـۆ پاراسـتنی سۆسـیالیزم واتـە بـەهێزترکردنی دامودەزگا ئاسایشی و تەناهییـەکان دەکـا. لـە کـۆنگرەی بیسـت و سـێیەمدا بێـرژنیڤ لـە سکرتێری یەکـەمی حیزبـی کۆمۆنیسـتەوە دەبێتـە سـکرتێری گشـتیی حیـزب، کـە هـەمان نازناوەکەی سەردمی سـتالینە و نـاوی دەسـتەی سـەرۆکایەتیی کۆمیتـەی ناوەنـدییش وەکـو سەردەمی ستالین دەکرێتەوە بە دەفتەری سیاسی یا پۆلیت بۆرۆ.

پاش کۆنگرەی بیست و سێیەم ئـەو دەرووە بچـووکەی وا، لـە سـەردەمی خرۆشـۆفدا بـۆ هەناسەکێشان و دەربڕینی باوەڕ لە چوارچێوەی شێعر و چیرۆکدا کرابۆوە داخـران، نووسـەران و شاعیرە ئازادیخوازەکان لـە بڵاوکرنـەوەی بەرهەمـەکانیان بێبـەش کـران. لـە ژووئیـەی سـاڵی 1966دا وەزارەتخانەیەکی نوێ بە ناوی تەکووزی گشتی بۆ سانترالیزەکردنی کاروباری تەناهی و ئاسایش پێك هێنرا و بڕگەگەلێك لە یاسای سزادران لـە سـۆڤیەتیدا زیـاد کـران بـۆ ئـەوەی

راوەدوونــان و گــرتنی ئەوانــەی گومــانی چــالاکیی سیاســی و بڵاوکرنــەوە بــیر و رای دژی حکوومەتیان لێ دەکرێ ئاسانتر بکاتەوە.

سەرەڕای ئەو هەمووە گوشارە لە دیسێمبەری 1966دا بۆ یەکەمین جار ژمارەیەك لاو بە نیشانەی نارەزایەتی دژی کردەوەکانی دامودەزگاکانی ئاسایش و تەناهی خۆپیێشاندانێکیان لــە گۆڕەپانی پوشکیندا ساز کرد. خۆپیێشاندەران کۆمەڵێك درووشمیان هەڵگرتبوو، کە لە زۆریانــدا رێزنان لە مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی مرۆڤیــان لــە یاسـای بنــەڕەتیی سـۆڤیەت داوا کردبــوو. هێزەکانی ئاسایش خۆپیێشاندانەکەیان لێك بڵاو کرد و بە دوای لێکۆڵینەوە لە ســەر هانــدەرانی ئەو خۆپیێشاندانانە لە ژانوییەی 1967دا چەند کەس لە نووســەران و هونەرمەنــدانی گــەنجی سۆڤیەتی قۆڵبەست کران.

رۆژی بیست و یەکەمی ئاپریلی ساڵی 1967 سۆتلانای کچی ستالین، کــە لــە سـۆڤیەتی رای کردبوو پەنای بۆ ئەمریکا برد و راگەیەنەکانی خۆرئاوایی هەڵڵایەکی زۆریان لێ ســازکرد. دوای ئــەو رووداوە سێمیت چاستنی سەرۆکایەتیی "کا.گا.ب"ی لیٚ ئەستێندرایەوە و یــۆری ئانــدرۆپۆف، کــە بەرپرسی کاروباری ئاسایشیی سکرتاریای حیزب بوو لە جێگەی دانرا. بێرژنێڤ لە لابردنی ســێمیت چاستنی تاقانە خەنیمی خۆی لە رێبەریی حیزبی کۆمۆنیستدا لە سەر رێگە لابرد، چونکی ســێمیت چاستنی بە مۆرە و کەسی نزیکی شلێپین دەژمێردراو شلێپین، کــە لــە هەڵبژاردنــەوەی ئەنــدامانی دەفتەری سیاسیدا سەرلەنوێ کرابۆوە بە ئەندامی ئەو دەفتەرە هێشتا دەیتوانی بە کەڵك وەرگرتن لە پێگە و دەرفەتی لەبار هیوادار بێ بە گەیشتن بە پۆستی رێبەری.

رۆژی بیســت و ســێیەمی ژووئــەنی 1967 رێبــەرانی ئــەمریکاو ســۆڤیەتی پــاش چاوپێکەوتنەکەی کێنێــدی و خرۆشــف بۆیەکــەمین جــار چــاویان بــە یــەکتری کەوتــەوە. لــەو چاوپێکەوتنەدا، کە دوای شەڕی شەش رۆژەی نێوان عەرەب و ئیسراییل و دەرکەوتــەکانی ئــەو شەڕە پێك هات بیرژنێف بەشدار بوو و کاســیگین وەکــو ســەرۆکی دەوڵــەتی ســۆڤیەتی لەگــەڵ جانسۆنی سەرۆك کۆماری ئەمریکا چاویان پێك کەوت و دانوستانیان کرد. لــە مــاوەی شــەڕی شــەش رۆژەی نێــوان عــەرەب وئیســراییل و پێشــڕەویی هێزەکــانی ئیســراییل بــەرەو خــاکی عەرەبستان دیسان ئەوە کاسیگین بوو، کە بە تەلەفۆنی سوور پێوەنــدیی بــە ســەرۆك کۆمــاری ئەمریکاوە دەکردو داوای لێدەکرد نەهێڵێ هێزەکانی ئیسراییل بەرەو پێشتر بچن. لەو قەیرانەدا دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە پێوەندییەکی باشی لەگــەڵ میســر و ســوریە دامەزرانــدبوو پێوەندییــە سیاسییەکانی خۆی لەگەڵ ئیسراییلدا پساندەوە و ئیسراییلییەکان لە ترسی دژکردەوەی تونــد و

خێرای سۆڤیەتی لە پێشرەوی لە خاکی میسردا و لە گرتنی دمیشق، کە لە سێرەی چەکەکانی ئەو دابوو، خۆیان بوارد.

دانوستانەکانی جانسۆن و کاسیگین، کە لە کۆلێژێکی نیۆجیرسی ی ئەمریکادا کرا، ئەو ڕێککەوتنە گرینگەی لێ کەوتەوە، کە ئەمریکاو سۆڤیەتی هەرگیز ئیزن نەدەن قەیرانێکی جیهانی ئەوان تێك بەردا. ئەو ڕێکەوتنە وێڕای ڕەوشی قەیراناویی ڕۆژهەلاتی ناڤین لەو لایەنەوە گرینگ بوو، کە شەڕی ڤێتنام لەو کاتدا گەیشتبووە لووتکەی خۆی و ترسی ئەوە هەبوو، کە ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی پڕ مەترسی تووشی ئەمریکاو سۆڤیەتی بێ.

# 3

ڕۆژی حەڤدەی نۆڤەمبەری ساڵی 1967 جێژنەکانی پەنجاهەمین ساڵهاتی شۆڕشی بۆلشەڤیکی لە ڕوسیادا بە ڕێوڕەسمیکی مەشقی سەربازی(ڕژە) لە مۆسکۆ بەڕێوە چوو و لە بڕیارنامەکانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە بە بۆنەی ئەو ڕێوڕەسمە و جێژنانەوە بلاو بۆوە نەك هەر باسی خراپەی ستالین و سەردەمی ئەو نەکرا بەلکو تاریفی پێشکەوتنە مەزنەکانی سۆڤیەتی لەو سەردەمەدا کرا. بەو شێوەیە بوو، کە قۆناغی ستالین شکێنی لە سۆڤیەتی کۆتایی پێ هات، بەلام مەبەستی ڕێبەرانی نوێی کرێملین لەو سیاسەتە نوییە بەر لەوەی گەڕاندنەوەی ئابڕوو بۆ ستالین بێ سڕینەوەی ئەو زیانانە بوو، کە بەرهەمی خەباتی دژە ستالینیی خرۆشۆف و سەرکوتی بزاڤەگەلی ئازادیخوازی لە سۆڤیەتی و ولاتانی دیکەی ئەورووپای خۆرئاواییدا بوو.

بەلام ئەو تەدبیر و ڕێوشوێنانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە سەر چێکۆسلۆڤاکیا نەبوو، کە لەوێ بزووتنەوەی ئازادیخوازانە بە خێرایی سەریان هەلّ دەدا. ڕۆژی چوارەمی ژانویەی ساڵی 1967 پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی چیکۆسلۆڤاکیا لە هەولێکی چاوەڕواننەکراودا "نۆڤێتنی"ی سەرۆك کۆمار و سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی چیکۆسلۆڤاکیای، کە لە سەردەمی ستالینەوە لەو پۆستەدا بوو لە سەر کار لابرد و یەکێك لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەندیی بەناوی ئالیکساندر دۆبچێك، کە بە

خاوەن بیرۆکەی ئازادیخوازانە ناوی دەرکردبوو لە جێگەی ئەو کردە سکرتێری یەکـەمی حیـزب. ئەوە یەکەمین کردەوەی سەرەڕۆیانەی یەکێك لە حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای خۆرئـاوایی دوای رووداوەکانی پۆلۆنیاو هەنگاریا لە سـاڵی 1956دا بـوو، کـە بـووە هـۆی نیگـەرانیی مۆسکۆ. دۆبچـێك لـە چـەند ئاخافتنـدا، کـە تێیانـدا پێـی لـە سـەر درێـژەدان بـە رێبـازی چیکۆسلۆڤیاکیا لە چوار چێوەی وڵاتانی سۆسیالیسـتیدا دەگرتـەوە هەوڵێـدا نیگەرانییـەکانی مۆسکۆ بڕەوێنێتەوە، بەڵام درێژەی رەوتی بزاوتگەلی ئازادیخوازانە لە چیکۆسلۆڤاکیا، کە رۆژی بیست و دووی مارسی 1968، کە بووە هۆی ئەوەی نۆڤـۆتنی دەسـت لـە سـەرۆك کۆمـاری بکێشێتەوە نیگەرانییەکانی مۆسکۆی زیاتر کرد.

بە دوای دەست لەکار کێشانەوەی بە زۆر و ناچاری نۆڤۆتنی لە پۆستی سەرۆك کۆماری بێرژنێڤ بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە شاری درێسدێن ی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی بـۆ ئـەوەی چاوی بـە رێبـەرانی وڵاتـان ئـەورووپای خۆرهـەڵاتی بکـەوێ. دۆبچـێکی رێبـەری نـوێی کۆمۆنیستی چیکۆسلۆڤاکیاش بانگهێشـت کرایـە ئـەو شـارە بـۆ ئـەوەی سـەبارەت بـەو رووداوانەی لە وڵاتەکەیـدا روودەدەن روونکردنـەوە بـدا. ئانـدرێ فۆنتـاین نووسـەری بـە ناوبانگی فەرەنسی دەنووسێ:" دۆبچێك لە کۆنفرانسی درێسدێن، لە تاوانبارێـك دەچـوو، کە دەبووایە وەڵامی زنجیرە پرسیارێك لەمەڕ ئەو سیاسەتگەلە بداتـەوە، کـە گەرەکیـەتی رەچاوی بکا. دیارە ئەو پێشنووسی راگەیەندراوێکی نیگەرانی رەوێنەرەوەی لەگـەڵ خـۆی بردبـوو و، کـە تێیـدا بەشـدارانی کـۆنفرانس بەرامبـەر بـە چـینی کرێکـار و هـەموو زەحمەتکێشانی چیکۆسلۆڤاکیا بۆ درێژەدانی رێبازی سۆسیالیزم لـەو وڵاتـەدا دڵنیـایی و متمانەی خۆیان دەردەبڕی، بەڵام سەرنەکەوت ئەو ئیعتیبارانە بەدەست بێنێ، کە ئابووریی چیکۆسلۆڤاکیا پێویستیی لەڕادەبەدەری پێیان بوو. مۆسکۆ بـەو کـردەوەی خـۆی پراگـی ناچار کرد داوای ئیعتیبار و یارمەتی لە خۆرئاوا بکاو بـەو شـێوەیە تۆمـەتبارکردنی بـە دۆستایەتیی خۆرئاوا ئاسانتر بۆوە."

بەهاری پراگ، کە بە دەست لـەکار کێشـانەوەی نۆڤـۆتنی لـە بیسـت و دووەم ی مارسـی 1968دا دەستی پێکردبوو لە ئاپریلدا بـووە هـۆی لـە سـەر کـار لابرانـی تـەواوی مـۆرە و لایەنگرەکانی ئەو لە پۆستە حیزبی و دەوڵەتییەکان و کەسانی لیبراڵ، کە هـەموان دۆسـت و

هاوبیری دۆبچێك بوون پۆستگەلی گرنگی وەك سەرۆك وەزیری و سەرۆكی پارلەمانیان بەدەستەوە گرت.

پۆستی سەرۆك كۆمارییش دوای دەست لە كار كێشانەوەی نۆڤۆتنی بە ژەنەراڵێكی بەساڵاچوو بە ناوی سڤۆبۆدا ئەسپێردرا، كە بە كردەوە رۆڵێكی لە حكوومەتدا نەبوو.

بە دوای ئەو گۆڕانانەدا رۆژی دەی ئاپریلی 1968 كۆمیتەی ناوەندیی حیزبی كۆمۆنیستی چیكۆسلۆڤاكیا پرۆگرامێكی نوێی بۆ كارباری خۆی پەسند كرد، كە دابینكردنی ئازادیی بنەمایی وەكو ئازادیی چاپەمەنی و لابردنی سانسۆر و دانی ئازادیی سەفەركردن و دابینكردنی ئاسایشی دادوەری تاكەكان بوو. بەرنامەی تازەی كاركردن پێكهاتەی سانترال و پاوانخوازانەی سۆسیالیسیتیی وڵاتی دەگۆڕی بۆ پێكهاتەیەكی دیموكراتیكی و دیسانترال و و سەندیكا كرێكارییەكان و ئەنجوومەنە پیشەییەكانی دەستئاوەڵاتر دەكرد.

لە خۆپێشاندانەكانی یەكەمین رۆژی پراگدا دەسەڵات و خۆشەویستیی دۆبچێك گەیشتە لووتكەی خۆی. دۆبچێك بۆ یەكەم جار دەستەواژەی " سۆسیالیزم بە روخساری مرۆییانەوە"ی لە سەر بەرنامە سۆسیالیستییەكانی خۆی دانا، كە بە باوەڕی ئاندرێ فۆنتاین خۆی درووشمێكی ورروژێنەر بوو و ئەو مانایەی لێ وەردەگیردرا، كە ئەو سۆسیالیزمەی هەتاكوو ئێستا سۆڤیەتی و وڵاتانی دیكەی بلۆكی خۆرهەڵات بەڕێوەیان بردووە روخساری مرۆییانەی نەبووە.

سێ رۆژ پاش جێژنەكانی سەرەتای مانگی مای دۆبچێك بۆ روونكردنەوە لە سەر كردەوەكانی خۆی چووە مۆسكۆ. بێرژنێڤ نیگەرانیی خۆی سەبارەت بەو رەوتەی لە چیكۆسلۆڤاكیادا بەڕێوەیە بۆ دۆبچێك دەربڕی و بە پێداگرتنەوە لە سەر ئەو خاڵە، كە لەوانەیە جڵەوی كارەكە لە دەستی خۆیشی(دۆبچێك) یش بچێتە دەرێ بە راشكاوی پێی گوت، كە دەوڵەتی سۆڤیەتی ناتوانێ تەنیا سەیركەری ئەو رەوشە بێ. دۆبچێك دڵنیایی دایە، كە بە تەواوی بەسەر رەوشەكەدا زاڵە بۆ ئەوەی نیازپاكیی خۆی نیشان بدا رازی بوو بەوەی، كە هێزەكانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ مانۆڕە هاوبەشەكەیان لە خاكی چیكۆسلۆڤاكیادا بەڕێوەبەرن. مانۆری هێزەكانی پەیمانی وەرشۆ رۆژی هەژدەی ژووئەن دەستی پێكرد و رۆژی یەكەمی ژووئیە كۆتایی پێهات، بەڵام هێزەكانی سۆڤیەتی لە باریكەی سنووری نێوان هەردوو وڵات مانەوە.

لە ماوەی مانگی ژووئیەدا گۆڕانی نوێ لە پێوەندییەكانی نێوان سۆڤیەتی و چیكۆسلۆڤاكیادا هاتنە پێش و بە دوای راگەیەندراوی حەفتا كەس لە كەسایەتییە ناودارەكانی چیكۆسلۆڤاكیا، كە تێیدا داوای خێرایی بەخشینیان بە دانی ئازادییە سیاسییەكان كردبوو

نارەزایەتیشیان بەرامبەر بە دەستێوەردانە دەرەکییەکان لـە کاروبـاری نێوخـۆیی وڵاتەکەیانـدا کردبوو، بێرژنێڤ هێرشی کردە سەر چاوقایمیی مۆرە دژە شۆڕشەکانی نێو چیکۆسـلۆڤاکیا. لـە ڕۆژەکانی چواردە و پازدەی ژووئیەدا سەرکردەکانی پێنج ئەندامی پەیمانی وەرشۆ لە پایتـەختی پۆلۆنیا کۆبوونەوە لە کۆتـایی کۆبوونەوەکـەدا ڕێبـەرانی پێـنج وڵاتـی سـۆڤیەتی و پۆلۆنیـاو هـەنگاریاو بۆلغارسـتان و ئـەڵمانی خۆرهـەڵات نامەیـەکی تونـدیان بـۆ دۆبچـێك نووسـی و دەقەکەشی درایە بڵاڤۆکەکان. لەو نامەیەدا هاتبوو، کە لە چیکۆسلۆڤاکیا "ڕەوشێکی نالـەبار و تاقەت پڕووکێن بۆ سۆسیالیزم هاتۆتە پێش... و بەرەنگاریی شێلگیرانە لەگەڵ کردەوەی هێزە دژەکۆمۆنیسـتەکان نـەك هـەر ئـەرکی ئێـوە بـەڵکو ئـەرکی سەرشـانی ئێمەشـە". ڕێبـەری کۆمۆنیستی ڕۆمانیا نەچووە کۆنفرانسـەکە و ئـەو نامەیەشـی واژۆ نـەکرد و تیتـۆی ڕێبـەری یۆگوسـلاڤیاش دەمودەسـت دژکـردەوەی نوانـد و لێبڕاوانـە پشـتیوانیی خـۆی لـە ڕێبـەرانی چیکۆسلۆڤاکیا دەربڕی.

بە دوای بڵاو بوونەوەی ئەو نامە پڕ لە هەڕەشەیەدا، هەواڵ و دەمگۆی وروورژێنـەریش بۆ خۆشکردنی بوارێکی لەبار بۆ دەستێوەردانی سەربازی لە چیکۆسلۆڤاکیادا بڵاو کرانەوە و بۆ وێنە پراڤیـدا هـەواڵی دۆزینـەوەی عـەمبارێکی چـەك و تەقەمـەنیی ئـەمریکی و خەریتەی نهێنیی پێنتاگۆن و سیا ی بۆ کۆدەتایەکی سەربازی لە چیکۆسلۆڤاکیا ڕاگەیاند. بێرژنێڤ جارێکی دیکەش داوای لە دۆبچێك کـرد، کـە بەمەبەسـتی دیـدار لەگـەڵ ئـەو بچێتەوە بۆ سۆڤیەتی، بەڵام دۆبچێك بە ئەدەبەوە ئەو چاوپێکەوتنەی قەبووڵ نـەکرد بـەو بیانووەی لە هەلومەرجی ئێستادا چیکۆسلۆڤاکیا بۆ بەجێهێشتن نابێ و حـەزی لییـە لـە خاکی چیکۆسلۆاکیادا چاوی بە ڕێبـەری سـۆڤیەتی بکـەوێ. بێـرژنێڤ بـە ناچـاری ئـەو بانگهێشتنەی قەبووڵ کرد و ڕۆژی بیست و نۆی ژووئیـە لـە شارۆچـکەی چیرنا، کـە لـە خۆرهەڵاتی چیکۆسلۆڤاکیا هەڵکەوتووە چاوی بە دۆبچێك کەوت. ئەو چاوپێکەوتنە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە سـەرکردەی وڵاتـانی دیکـەی ئەنـدامی پـەیمانی وەرشـۆش سـەردانی چیکۆسلۆڤاکیا بکەن و ڕۆژی یەکەمی ئووت لە براتیسلاڤا کۆنفرانسێك بە بەشداریی ئەو وڵاتانە پێکهات. لە کۆتایی ئەو کۆنفرانسە یەك ڕۆژەیەدا ڕاگەیەندراوێکی تێروتەسـەلیان دەرکرد، کە بە ڕواڵەت تێیدا باسـی چارەسـەریی ناکۆکییـەکان و قـەبووڵکردنی بنـەمای یەکسانیی مافی حیزبە کۆمۆنیستەکان و ڕێزگرتن لە مافی دەسـەڵاتدارێتی و سـەربەخۆیی وڵاتی یەکتر کرابوو، بەڵام ڕستەیەکی تێدا گونجێندرابوو، کە بواری بۆ دەسـتێوەردانەکانی

دوایی و داهێنانی "دۆکترینی بێرژنێڤ" خۆش دەکرد. ناوەرۆکی ئەو رستە کورت و پڕ مانایە ئەوە بوو، کە پاراستنی ئەو دەستکەوتانەی، کە بە نرخی تێکۆشانی قارەمانانە و فیداکارییەکانی رابردووی خەڵکی وڵاتانی سۆسیالیستی بەدەست هاتوون ئەرکی هاوبەشی هەموو وڵاتانی سۆسیالیستییە".

دۆبچێك بە دڵنیایی لەوەی، کە مەترسییەکە چارەسەر کراوە و دەتوانێ بە خاترجەمی درێژە بە رێگەکەی بدا گەڕاوە پراگ و لە ئاخافتنێکدا باسی لە لێك تێگەیشتنی تەواوی دانوستانەکانی چیرناو براتیسلاڤا کرد. لەوانەیە بیرژنێڤیش لە دانوستانەکانی چیرناو براتیسلاڤادا لە سەر دەستێوەردانی سەربازی بۆ سەرکوتی بزووتنەوە ئازادیخوازییەکانی چیکۆسلۆڤاکیا ساخ نەببۆوە، بەڵام گۆڕانەکانی دوایی و گوشاری مۆرەی توندرەو لە نێو دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا ئەویان ناچار کرد بڕیاری توندتر لە سەر چیکۆسلۆڤاکیا بدا. لە نیوەی یەکەمی مانگی ئووتدا تیتۆ سەرۆك کۆماری یۆگوسلاڤیاو چائۆشسکۆ رێبەری رۆمانیا سەردانی پراگیان کرد و دۆبچێکیان دڵگەرم کرد و هانیان دا بۆ درێژەدانی ئەو رێگەیەی گرتبوویە بەر.

یۆری ئاندرۆپۆف سەرۆکی نوێی کا.گا.ب، کە لە کاتی رووداوەکانی هەنگاریادا و سەرکوتی شۆڕشی ئەو وڵاتە باڵوێزی سۆڤیەتی بوو لە هەنگاریا، کاربەدەستی تایبەتی ناردنە چیکۆسلۆڤاکیاو لە دانیشتنێکی نائاساییی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا رایگەیاند، کە بەسەدان کاربەدەستی سیاو رێکخراوگەلی سیخوڕیی دیکە لە پراگدا خەریکی چالاکین. کاربەدەستانی کا.گا.ب هەروەها رایانگەیاندبوو، کە بێرژنیسکی مامۆستای بەرەگەز پۆلۆنی ی زانکۆی کۆلۆمبیا، کە یەکێکە لە خەباتکارانی دژە کۆمۆنیست لە ئەمریکا بە نهێنی سەردانی پراگی کردووە. ئاندرۆپۆف بە سەرنجدان بە پێوەندییەکانی پێشووی بێرژنیسکیی لە چیکۆسلۆڤیاکیا، ئەو سەردانەی ئەوی زۆر بە گرینگ لەقەڵەم دەدا. کورتە و ئاکامی راپۆرتەکەی ئاندرۆپۆف بۆ کۆمیتەی ناوەندی ئەوە بوو، کە ئەگەر بە جیدیی و دەمودەست فریای چیکۆسلۆڤاکیا نەکەون ئەو وڵاتە لە کیس دەچاو وڵاتانی دیکەی ئەورووپای خۆرهەڵاتیش و لە سەرووی هەمووانەوە رۆمانیاش بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکا.

لە کۆبوونەوەی هەژدەی ئووتی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا بڕیار درا و لە سەر ئەوە ساخ بوونەوە، کە دەستێوەردانی سەربازی لە چیکۆسلۆڤاکیادا بکەن و چوار وڵاتەکەی دیکەی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ ش، کە بڕیاری مۆسکۆیان بەڕێوە دەبرد ئاگادار

کرانەوە. بیست و چوار لەشکەر، کە پێکهاتبوو لە هێزەکانی پەیمانی وەرشۆ، کە پاش مانۆرە هاوینییەکانیان لە چیکۆسلۆڤاکیا هەروا لە حاڵەتی ئامادەدا لە سنوورەکانی چیکۆسلۆڤاکیا مابوونەوە نیوەشەوی رۆژی بیست و یەکەمی ئووت چوونە نێو خاکی چیکۆسلۆڤاکیاو بە بێ هیچ بەرەنگاربوونەوەیەك بەرەو پایتەخت وەڕێ کەوتن. بەر لەوەی ئەو هێزانە بگەنە پراگ بەرەبەیانیی رۆژی بیست و یەکەمی ئووت لە فڕۆکەخانەی پراگ دابەزین و خاڵە هەستیارەکان پایتەختیان گرت.

دۆبچێك، کە نەیانهێشتبوو بەخۆی بزانێ(خافڵگر کرابوو) بەربەرەکانێی لە بەرامبەر داگیرکەراندا بە کارێکی بێهوودە زانی و هەربۆیەش کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست لە سەر داوای ئەو بە هێزە سەربازییەکانی چیکۆسلۆڤاکیای گوت، کە لە بەرامبەر داگیرکەراندا بەربەرەکانێ مەکەن. جیهانی خۆرئاوا هەروەکی چیکۆسلۆڤاکیای لە بەرامبەر هیتلەردا بە تەنیا بەجێهێشتبوو ئاواش ئەمجارەشیان بێجگە لە دەرکردنی چەند راگەیەندراوێك و دەربڕینی نارەزایەتیی زارەکی هیچ کارێکی دیکەیان نەکرد، چونکی چسکۆسلۆڤاکیا بە پێی پەیمانی یالتا ناوچەی ژێر دەستی سۆڤیەتی بوو. دۆگۆل ی سەرۆك کۆماری فەرەنسا لە راگەیەندراوێکدا، کە بە بۆنەی دەستدرێژیی هێزەکانی پەیمانی وەرشۆ بۆ سەر چیکۆسلۆڤاکیا بڵاوی کردەوە ئاماژەی بەو بابەتە کرد و وێڕای مەحکوومکردنی دابەشینی ئەورووپا لە کۆنفرانسی یالتادا نووسیی، کە دەستدرێژی بۆ سەر چیکۆسلۆڤاکیا نەك هەر پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و پێشێلکردنی مافی گەلێکی دۆستمانە بەڵکو بووەتە هۆی لەناوچوونی تەناهی و هێمنیی ئەورووپاش.

بێرژنێڤ بەو جۆرە پاکانەی بۆ دەستدرێژیی هێزەکانی پەیمانی وەرشۆ بۆ سەر چیکۆسلۆڤاکیا کرد، کە هەرکات دەستکەوتەکانی سۆسیالیزم لە وڵاتێکی سۆسیالیستیدا بکەوێتە مەترسییەوە وڵاتە سۆسیالیستییەکانی دیکە بۆ پاراستنی ئەو دەسکەوتانە بەرپرسیارەتیی وەك یەك و هاوبەشیان هەیە. ئەو تیۆرییە، کە بە دۆکترینی بێرژنێڤ یا ئەسڵی دەسەڵاتی سنووردار ناسراوە هەر ئەو بابەتە بوو، کە لە راگەیەندراوی براتیسلاڤاشدا بە وریاییەوە گونجێندرا بوو و لێی تێنەگەیشتبوو.

بێرژنێڤ بە تەمابوو هەر لە یەکەم رۆژەکانی داگیرکردنی چیکۆسلۆڤاکیاوە بە دەستی هێزەکانی پەیمانی وەرشۆ کۆتایی بە کێشەی ئەو وڵاتە بێناو دۆبچێك و هاورێکانی لە سەر کار لابەرێ. هەر بۆیەش هەر لە یەکەمین رۆژەکانی داگیرا کرانی پراگەوە دۆبچێك و هاوڕێکانی واتە سەرۆکی وەزیران و سەرۆکی پەرلمانی چیکۆسلۆڤاکیا رفێنران و بۆ بەندیخانەیەکی خۆرئاوای ئۆکراین راگوێزران. رێبەرانی سۆڤیەتی هیوادار بوون، کە کێشەکانی خۆیان لەگەڵ ژەنەراڵ

سڤۆبۆدای سەرۆك كۆماری بەسالآچووی چیكۆسلۆڤاكیا چارەسەر بكـەن و پۆسـتە باڵاكـان بـە كەسانی دڵخوازی خۆیان بسپێرن، بەڵام سڤۆبۆدا ملی بۆ ئـەوە رانەكێشـاو درێـژەی ئـاڵۆزی و خۆپێشاندانە گشتییەكان لە چیكۆسلۆڤاكیادا بێرژنێڤیان ناچار كـرد، كـە بـە شـێوەی كـاتی لەگەڵ دۆبچێك رێككەوێ هەتا لە دەرفەتێكی لەباردا مشووری بخوا.

دۆبچێك رۆژی بیست و پێنجەمی ئووتی 1968 لە گرتووخانەی ئۆكراینەوە بـۆ كۆشـكی كرێملین راگوێزراو بێرژنێڤ بە هەرەشە و لە هەمانكاتدا رێز لێگرتن توانیی قایلی بكـا بـەوەی وەك سكرتێری یەكەمی حیزبی كۆمۆنیستی چیكۆسلۆڤاكیا بمێنێتەوە. دۆبچێك ئەو پێشنیارەی بەو مەرجە وەرگرت، كە ئەو خاڵە لە راگەیەندراوی هاوبەشی بێرژنێڤدا بنووسرێ، كە هێزەكانی پەیمانی وەرشۆ بۆ ماوەی كاتی هاتوونەتە نێو چیكۆسلۆڤاكیاوە و هەر لەگەڵ ئاسایی بوونەوەی دۆخەكە لەو وڵاتە دەچنە دەرێ. دیارە دۆبچێك دیسـان فریـوی بێرژنێڤـی خواردبـوو، چـونكی نەیدەزانی مەبەستی بێرژنێڤ لە ئاسایی بوونەوەی دۆخەكە رەخسانی هەل و دەرفەتە بۆ لە سەر كار لابردنی دۆبچێك و دامەزراندنی حكوومەتێكی گوێ لەمستی مۆسكۆ لە پراگدا.

رەوتی ئاساییكردنەوەی رەوشەكە لە چیكۆسلۆڤاكیا بە لە سەر كار لابردنـی چـەند بەرپرسـێكی ئەو وڵاتە، كە دەوڵەتی سۆڤیەتی لێیان رازی نەبوو دەستی پێ كـرد. دەقـی راگەیەنـدراوی مـانگی ئاپریلی حیزبی كۆمۆنیستی چیكۆسلۆڤاكیا، كە تێیدا برە ئازادییەكـە بـە خـەڵكی چیكۆسـلۆڤاكیا درابوو بە بیانووی نائاساییبوونی رەوشـەكە هەڵوەشـێندرایەوە و دیسـان یاسـای سانسـۆركردنەوەی چاپەمەنییەكان هاتەوە گۆڕێ. رۆژی بیست و شەشەمی سـێپتەمبەر رۆژنامـەی پراڤیـدا وتـارێكی تێروتەسەلی بۆ پاساودان و تەفسیری سیاسەتی سۆڤیەتی لە چیكۆسلۆڤاكیا بڵاو كردەوە و تێیدا بـەو رستەیە، كە " دەسەڵاتی هەر وڵاتێكی سۆسیالیستی بۆی نییە دژایەتیی هەبێ لەگـەڵ بەرژەوەنـد و ئاسایشی وڵاتانی سۆسیالیستیی دیكـە یـا بزاڤـی شۆڕشـگێڕیی جیهانیـدا" دۆكترینـی بێرژنێڤـی سەبارەت بە دەسەڵاتی سنوورداری وڵاتانی سۆسیالیستی چەسپاند.

# 4

بێرژنێڤ سالێ پڕ لە رووداوی 1968 ی بە بـرە هێمنایەتییەكـەوە تـەواو كـرد. لـە مـانگی نۆڤەمبەری هەر ئەو ساڵەدا نیكسۆن بۆ پۆستی سـەرۆك كۆمـاریی ئـەمریكا هەڵبـژێردراو لـەكاتی

گۆڕان و دەستاودەستکردنی دەسەڵات لە دەوڵەتی ئەمریکادا، کە هەتا بیستەمی ژانوییەی 1969 ی دەخایاند گۆڕانێکی گرینگ و نوێ بەسەر پێوەندییەکانی ئەمریکاو سۆڤیەتیدا نەهات.

لە سەرەتاکانی ساڵی 1969دا ناکۆکییەکانی نێوان چین و سۆڤیەتی، کە ساڵی 1968 کەوتبوونە ژێر سێبەری رووداوەکانی چیکۆسلۆڤاکیاوە دیسان بوونەوە بە یەکێك لە پرسە باوەکانی رۆژ. لە رۆژی دووەم هەتا هەژدەی مارس کۆمەڵە تێکهەڵچوونێکی خوێناوی بە درێژایی رووباری ئۆسوری لە نێوان هێزەکانی چین و سۆڤیەتیدا روویان دا و لە کۆتایی مانگی مارسدا دەوڵەتی چین لە کتێبێکدا بە ناوی "مەرگ و نەمان بۆ تەزارە تازەکان" کۆمەڵێك بەڵگەی لە سەر دەستدرێژیی هێزەکانی سۆڤیەتی بۆ سەر چین بە درێژایی رووباری ئۆسوری خستە روو.

رۆژی حەڤدەی ئاپریلی ساڵی 1969 دوایین قۆناغی "ئاسایی بوونەوەی رەوشەکە" لە چیکۆسلۆڤاکیادا تەواو بوو و دۆبچێك لە پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست لابردرا. گۆستاڤ هۆزاك لە جێگەی دۆبچێك دانراو، کە پێشتر گوێڕایەڵیی خۆی بۆ مۆسکۆ سەلماندبوو. دۆبچێك سەرەتا کرایە باڵوێزی چیکۆسلۆڤاکیا لە ئەنکارا، بەڵام پاش چەند مانگان بانگ کرایەوە بۆ پراگ و کرایە کار بەدەستێکی سادەی کۆمپانیایەکی هەرەوەزیی کشتوکاڵی لە براتیسلاڤا.

هەر لەو مانگەدا نۆیەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی چین بە دەرکردنی راگەیەندراوێکی توند دژی سۆڤیەتی کۆتایی بە کاری خۆی هێنا. لەو راگەیەندراوەدا نازناوی تەزارە تازەکان بۆ رێبەرانی سۆڤیەتی دووپاتە کرابۆوە و تێیدا هاتبوو، کە رێبەرانی سۆڤیەتی هەر بە رێوشوێن و رێبازی ئیمپریالیستەکانی ئەمریکاو فاشیستەکانی ئەڵمانیادا دەڕۆن و دۆکترینی دەسەڵاتی سنووردار، کە سۆڤیەتییەکان بۆ پاکانە و پاساوی داگیرکردنی چیکۆسلرۆڤاکیا هێنایانە گۆڕێ بیانوویەك بوو بۆ بەڕێوە بردنی سیاسەتە ئیستیعماری و داگیرکارییەکانیان.

سێیەمین کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی حیزبە کۆمۆنیستەکان، کە لە رۆژی پێنجەمەوە هەتا حەڤدەهەمی مانگی ژووئەنی 1969 لە مۆسکۆ گیرا هەل و دەرفەتێکی بۆ وەڵامدانەوە بە چینییەکان دایە دەست بێرژنێڤ. ئاخافتنی توندی بێرژنێڤ دژی چینییەکان و تۆمەتبارکردنیان بە دووبەرەکی نانەوە لە نێوان کۆمەڵگە سۆسیالیستییەکاندا و ئاو لە ئاشی ئیمپریالیستەکانکردن، دەرێ دەخست، کە هەوڵەکانی ئەو چەند ساڵە بۆ چاککردنەوەی پێوەندی لەگەڵ چین تەواو بێ ئاکام بووە و پێنج ساڵ پاش لە سەر کار لابرانی خرۆشۆف قەیرانی پێوەندیی سۆڤیەتی و چین گەڕاوەتەوە هەمان قۆناغ. لە کۆنفرانسی جیهانیی حیزبە

کۆمۆنیستەکاندا هێندێ باسی مەسەلەی چیکۆسلۆڤاکیاش هاتە گۆڕاو نوێنەرانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئیتالیاو سپانیا راشکاوانە نارەزایەتیی خۆیان بە دەستێوەردانی سەربازیی هێزەکانی پەیمانی وەرشۆ لەو ولاتە دەربڕی، هەربۆیەش لە راگەیەندراوی کۆتایی کۆنفرانسەکەدا هیچ ئاماژەیەك بە مەسەلەی چیکۆسلۆڤاکیا نەکرا. گیرانی سێیەمین کۆنگرەی جیهانیی حیزبە کۆمۆنیستەکان بە گشتی بۆ بێرژنێڤ سەرکەوتنێکی گەورە نەبوو، چونکی نوێنەرانی حەڤدە حیزبی کۆمۆنیست بۆ وێنە حیزبە کۆمۆنیستەکانی چین و ژاپۆن و ئیندۆنیزیاو ڤیتنام و ئەلبانی و یۆکوسلاڤیا تێیدا بەشدار نەبوون و نوێنەرانی هێندێ لە حیزبە کۆمۆنیستەکانیش بۆ یەکەم جار راشکاوانە رەخنەیان لە سیاسەتەکانی مۆسکۆ گرت.

بێرژنێڤ هیچکام لە دوو مەبەستەکەی خۆی، کە ئەو کۆنفرانسەی بۆ گرتبوون نەپێکا، کە یەکێکیان پشتڕاستکردنەوەی دۆکترینی سنووورداربوونی دەسەلات وێڕای پشتراستکردنەوەی دەستێوەردانی پەیمانی وەرشۆ لە چیکۆسلۆڤاکیادا بوو و بێدەنگیی راگەیەندراوی کۆتایی کۆنفرانسیش لە بەرامبەر مەسەلەی چیکۆسلۆڤاکیادا خۆی شکستێك بوو بۆ وی.

لە مانگی ژووئیەی 1969دا هەلفڕینی سەرکەوتوانەی کەشتیی گەردوونگەڕی ئەمریکا(ئاپۆلۆ11) بۆ دەوری گۆی مانگ و دابەزینی یەکەمین مرۆڤ لە سەر گۆی مانگ ئیتر بالادەستیی سۆڤیەتی لە گەردوونپێوی دا بەسەر ئەمریکادا، کە بە هەلفڕینی یەکەمین مانگی دەستکرد بۆ دەوری زەوی دەستی پێکردبوو کۆتایی پێ هات. ئەو گۆڕانە زیاتر بەرهەمی هەولە شێلگیرییەکانی ئەمریکییەکان لە ماوەی دەیەی 1960دا و خەرجکردنی بە ملیار دۆلار لە رێگەی بەرێوە بردنی بەرنامە گەردوونییەکانیاندا بوو، بەلام گرینگی پێنەدانی جێ-نشینەکانی خرۆشۆف بۆ راپەڕاندنی ئەو بەرنامەگەلە و قەبوولێ نەکرانی ئەو گوژمە زۆرەی، کە لە لایەن بیریارانی بواری گەردوون پێویی سۆڤیەتییەوە پێشنیار کرابوو هۆکارێکی دیکە بوو لە وەدواکەوتنی سۆڤیەتییەکان لە هەڤرکێی داگیرکردنی گەردووندا. دیارە جێنشینەکانی خرۆشۆف لە بری دەکارهێنانی ئەو گوژمانە کەزیاتر لایەنی نومایشی و پرۆپاگەندەی هەبوو بودجەیەکی زیاتریان بۆ بەرهەمهێنانی کالای مەسرەفی و باشترکردنی ئاستی ژیانی خەلکی سۆڤیەتی تەرخان کرد و لەو کارەیان ئاکامی زیاتریان لە چاو خۆ نواندنە فەزاییەکان وەرگرت.

لە نیوەی دووەم ی سالی 1969دا بە دستپێکردنی کێشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ڤیتنام و رەچاوکردنی سیاسەتی ئاشتیخوازنەی نیکسۆن لە بەرامبەر سۆڤیەتیدا ریفۆرمێك لە پێوەندییەکانی ئەمریکاو سۆڤیەتیدا بەدی دەکراو لە نۆزدەی نۆڤەمبەری هەر ئەو سالە دا

دانوستانەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتــە پــەیمانی پێشــگرتن بــە پــەرەگرتنی چــەکە ناوکییــەکانی لێکەوتەوە.

دیارە نیکسۆن وێڕای نزیك بوونەوەی لە سۆڤیەتییەکان لەگەڵ چینییەکانیشدا گەرم و گــوڕ ببوو و یەکەمین چاوپێکەوتنی باڵوێزی ئەمریکاو چین لە وەرشۆ بواری بۆ پەرەگرتنی پێوەنــدیی راستەوخۆی نێوان ئەو دوو وڵاتە لە کاتی دانوســتانەکانی ئاشــتی لــە ڤیتنامــدا خــۆش کــرد. سۆڤیەتییەکان، کە نیگەرانی ئاکامی ئــەو پێوەندییانــە بــوون جــارێکی دیکــەش هــەوڵیان دا پێوەندییەکانیان لەگەڵ چیندا چاك بکەنەوە و رۆژی یازدەی سێپتەمبەری 1969 کاسیگین ی سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتی بۆ دانوستان و وتووێژ لەگەڵ رێبەرانی چین سەردانی پەکــەنی کــرد. مائۆتسێ تــۆنگ، کــە شۆڕشــەکولتوورییە بەناوبانگەکــەی تێپــەڕ کردبــوو و پــاش وەلانــانی خەنیمەکانی خۆی ئێستا لە لووتکەی دەسەڵاتدا بوو سەرۆك وەزیرانی ســۆڤیەتیی وەرنــەگرت، بەڵام کاسیگین چاوی بە هاوتای خۆی واتە چۆئێن لای کەوت و لەگــەڵی دانیشــت و هەرچــەندە ئەو دانوستانانە کێشە بنەماییەکانی نێوانیانی چارەسەر نەکرد، بــەڵام گرژییــەکانی نێوانیــانی خاوتر کــردەوە و بــواری بــۆ بــەردەوامیی پێوەندییــەکانی دوو وڵات بەمەبەســتی چارەســەریی کێشەکان رەخساند.

ساڵی 1970، کە خرۆشۆف لە ســەر ەمــی دەســەڵاتدارێتیی خــۆی داوای پێشــبینی کردبــوو خاڵێکی وەرچەرخان بی و ساڵی کەوتنە پێش ئەمریکا لە هەموو بوارەکاندا بێ بــۆ جــێنشــینەکانی ساڵێکی خۆش نەبوو، چونکی سۆڤیەتی نەك ئەوەی لە زۆربــەی بوارەکانــدا هــەروا کــەوتبووە پــاش ئەمریکا بەڵکو هەوڵ وتێکۆشانەکانی دەســاڵەو ســەرمایەگوزاریی قــورس بــۆ چارەســەریی کێشــە کشتوکاڵییەکانیش بەرهەمێکی دڵخوازیان لێ نەکەوتبۆوە و هەروا دەغڵ و دانیان لە دەروەڕا دێنــا. هەر ئەو ساڵە لە نێوخۆشدا کۆمەڵێك بزووتنەوەی دژبەرانە سەریانهەڵدا، کە رێبەرانی سۆڤیەتی بــە هیچ شێوەیەك ئەوەیان پێ قــەبووڵ نــەدەکرا: رۆژی چــواردەی مارســی 1970 ئانــدرێ ســاخارۆف بیریاری بەناوبانگی ناوکیی سۆڤیەتی و چەند بیریارێکی دیکە و نووسەرانی روسی لە نامەیەکــدا بــۆ رێبەرانی سۆڤیەتی داوای چاکسازی و ریفۆرمیان لەو وڵاتەدا کــرد و پێشــنیارەکانی خۆیانیــان، کــە زیاتر پشتیان بە لەبەرچاو گرتن و دانی ئەو ئازادییانەی لە یاسای بنەڕەتیدا هــاتبوون، بەســتبوو لــە پازدە بڕگەدا گەڵاڵەیانکردن. لە مانگەکانی ئاپریــل و مایــدا بەرهــەمی کۆمــەڵێك لــە نووســەرانی نارازیی روسیی لە دەرەوەی وڵات چاپ و بڵاو بوونەوە. کاربەدەســتانی کا.گــا.ب لــە کۆتاییــەکانی مانگی مایدا دوو کەس لە نووسەرانی ئەو کتێبانــەیان بــە ناوەکــانی ئانــدرێ ئامالریــك و ژۆرێــس

مێدڤێدێڤ دەستبەسەر کرد. شێوازێکی نویٚ بۆ قۆڵبەستکردنی مێدڤێدێڤ، کە خۆی پزیشك و لێکۆڵەرێکی ناوداری بواری بیۆلۆجی بوو لەبەرچاو گیرا ئەو لە بری ئەوەی بیبەنە گرتووخانەوەك شێت بردیانە شێتخانە. دەستەیەك لە بیریاران و نووسەرانی سۆڤیەتی و لە سەرووی هەموانەوە ساخارۆف و سولێژنێتسین و رۆی مێدڤێدێڤ ی برای ژۆرێس مێدڤێدێڤ، کەوتنە هەوڵی رزگارکردنی. ئەو هەوڵە بە ئاکام گەیشت و ژۆرێس مێدڤێدێڤ لە خەستەخانەی شێتان بەردرا، بەڵام هەروا لە ژێر چاوەدێریی کاربەدەستانی کا.گا.ب دا بوو هەتا ئەوەی کە دواجار لە سۆڤیەتی شاربەدەر کرا.

سۆلێژنێتسین نووسەری ناوداری روسی، کە بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی لە سۆڤیەتیدا قەدەغە کرابوو لە ئۆکتۆبەری 1970دا بە بۆنەی گرینگیی ئەدەبیی بەرهەمەکانی خۆی خەڵاتی ئەدەبیی نۆبلی وەرگرت. دانی خەڵاتی نۆبل بە سۆلێژنیتسین وەك درانی ئەو خەڵاتە بە پاسترناك ی نووسەری دوکتۆر ژیڤاگۆ بووە هۆی تووڕەیی و بێزرایی لەرادەبەدەری بەرپرسانی سۆڤیەت و بە پیلانێکی دارێژراو بە دژی سۆڤیەتییان لەقەڵەم دا. سۆلیژنیتسین بۆ دامرکاندنەوەی تووڕەیی رێبەرانی سۆڤیەتی وەکو پاسترناك بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل نەچوو بۆ سوید، بەڵام ئەو ناوبانگەی، کە پاش وەرگرتنی خەڵاتەکە دەریٚ کرد بووە هۆی ئەوەی کە هەموو بەرهەمەکانی لە دەرەوەی وڵات بڵاو ببنەوە.

لە ساڵی 1970دا بڵاوبوونەوەی بەرهەمگەلێك، کە بە ناوی"سام ئیزدات"(واتە ئەو بەرهەمانەی، کە قەدەغە کراون و نووسەرەکانیان خۆیان تایپ و بڵاویان دەکردنەوە"، لە سۆڤیەتیدا رۆژبەرۆژ زیاتر برەوی سەند و بڵاوبوونەوەی هێندیٚ لەو کتێبانە لە دەرەوەی وڵات ئەوەندەی دیکەی رێبەرانی سۆڤیەتی نیگەران کرد. بێرژنێڤ داوای لە ئاندرۆپۆڤی سەرۆکی کا.گا.ب کرد، کە بۆ پێشگرتن لە بڵاوبوونەوەی ئەو بەرهەمانە هەوڵەکانیان چڕتر بکەنەوە و لە ماوەی نیوەی ساڵی 1970دا بە سەدان کەس بە تاوانی بەشداری لە چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە قەدەغە کراوەکاندا قۆڵبەست کران.

رۆژی یەکەمی نۆڤەمبەری 1970 ئاندریٚ ساخارۆف بیریاری مەزنی سۆڤیەتی رایگەیاند، کە لەگەڵ دەستەیەك لە بیرمەندان و نووسەرانی سۆڤیەتی "کۆمیتەیەکی داکۆکی لە مافەکانی مرۆڤیان پێك هێناوە" و داوای لە دەوڵەتی سۆڤیەتی کرد، کە ئەو کۆمیتەیە بە فەرمی بناسیٚ. ئەو کارەی ساخارۆف بووە هۆی ئەوەی کە رێبەرانی سۆڤیەتی ئێجگار تووڕە بن، بەڵام

دژ کردەوەی خێرایان لە بەرامبەریدا نیشان نەدا و تەنیا داوایان لە کا.گا.ب کرد، کە چالاکی و هاموشۆ و نامەگۆڕینەوە و تەلەفۆنەکانی ساخارۆف کۆنترۆل بکەن.

ساڵی 1970 بە ڕووداوێکی تاڵی دیکەوە بۆ ڕێبەرانی سۆڤیەتی تەواو بوو و ئەویش ئەوە بوو، کە لە هێندێ لە شارە گەورەکانی پۆلۆنیادا بە هۆی گرانی و قاتی و قڕی و کەمبوونی بژیو ڕێپێوان و سەرهەڵدان کرا. لە ئاکامی ئەو شۆڕش و سەرهەڵدانانەدا گۆمولکای ڕێبەری حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیا، کە خۆی بە دوا سەرهەڵدانە کرێکارییەکانی ساڵی 1956 هاتبووە سەر کار ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە. گۆمولکا ئەگەرچی بە دوای گیرانی کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و سەرەتای خەباتی دژە ستالینیستیی خرۆشۆفدا هاتبووە سەرکار و بۆ دەربڕینی پشتیوانیی خۆی لە سیاسەتەکانی خرۆشۆف حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیای لە ستالینیستەکان پاك کردبۆوە و پاش هەرەسی دەسەڵاتی خرۆشۆفیش دۆستانە هاوکاریی جێنشینەکانی دەکرد و یەکێك بوو لە لایەنگران و داکۆکیکارانی تۆخی دەستێوەردانی سەربازی لە چیکۆسلۆڤاکیاو دۆکترینی بێرژنێڤ.

لە ژانوییەی سالی 1971دا بە هۆی کەمبوونی بژیو و دەغڵ و دان هێندێ لە شارە گەورەکای سۆڤیەتییش هەستان و دەوڵەت بۆ پێشگرتن لەو بشێوییانە داوای یارمەتیی لە سوپا کرد. کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە کۆبوونەوەیەکدا، کە بۆ ئامادەکاریی کۆنگرەی بیست و چوارەمی حیزب پێکی هێنابوو هۆکارەکانی ئەو بشێوییانەی تاوتوێ کرد و بڕیاری دا لە نۆیەمین بەرنامەی پێنج ساڵەی ئابووریی سۆڤیەتیدا (1971هەتا 1975) گوژمەی زیاتر بۆ بواری کشتوکاڵو بەرهەمهێنانی کاڵا مەسرەفییەکان تەرخان بکا. ئەو گۆڕانانە لە کۆنگرەی بیست و چوارەمیی حیزبدا پەسند کران.

بیست و چوارەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە 30 ی مارەسەوە هەتا 9ی ئاپریلی 1971 لە مۆسکۆ گیرا. خا لە سەر ەکییەکانی ڕاپۆرتی بێرژنێڤ بۆ ئەو کۆنگرەیە پێویستبوونی ڕەچاوکردنی سیاسەتێکی توندوتۆڵ لە کاروباری نێوخۆیی و کولتووری و نەرمی نواندن و خۆگونجاندنی زیاتر لە سیاسەتی دەرەوەدا بە تایبەتی لە پێوەندی لەگەڵ ئەمریکادا بوو. لەو ڕاپۆرتەدا، کە وەك باو بوو بە کۆی دەنگ پەسند کرا تەرخانکردنی گوژمەی زیاتر بۆ بواری کشتوکاڵو پەرە پێدان بە بەرهەمهێنانی کاڵای مەسرەفییش گونجێنرابوو. ژمارەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی تازەش لە سەر پێشنیاری بێرژنێڤ لە 195 کەسەوە گەیشتە 241 کەس بۆ ئەوەی پۆستی زۆر کەس بچێتە سەرێ. کۆمیتەی ناوەندییش بە نۆرەی خۆی

ژمارەی ئەندامانی دەفتــەری سیاسـیی گەیانــدە 15 کــەس بــۆ ئــەوەی وێــڕای هێشــتنەوەی ئەندامەکانی پێشوو چەند کەس لە پالێوراوانی ئەندامەتییش بتوانن ببنە دەفتەری سیاسی.

لە رووداوگەلی شیاوی باسکردنی سالّی 1971 لە پێوەندی لەگەلّ سۆڤیەتیدا لە سەر کار لابرانی والتەریۆلبریشت دوایین رێبەری ستالینیستی ئــەورووپای خۆرهــەلآت لــە رێبەرایــەتیی حیزبــی کۆمۆنیســتی ئــەلّمانی خۆرهــەلآت(3ی مــای) واژۆی پــەیمانی دۆســتایەتی لەگــەلّ میسردا(27ی مای) واژۆی پەیمانی دۆستایەتی سۆڤیەتی و هیندوستان(9ی ئوت) و ســەفەری پادگۆرنی سەرۆك وەزیری سۆڤیەتی بۆ هانۆوەی و زیادکردنی یارمەتیی سۆڤیەتی بە ڤیێتنــامی باکوور بوو، بەلآم ئەو روداوەی لە تەواوی ئەوانە پتر کاریگەریی لە سەر سۆڤیەتی دانا سەردانی نهێنیی کیسینجێر ی راوێژکاری تەناهیی نەتەوەیی نیکسۆنی ســەرۆك کۆمــاری ئــەمریکا لــە پەکەن و ئامادەکاریی سەفەری نیکسۆن بۆ چین بوو. هەر لە ئۆکتۆبەری ئەو ســالّەدا کۆمــاری گەلیی چین پــاش بیســت و دووســالّ بەســەر دامــەزرانی داوەك ئەنــدامی رێکخــراوی نەتــەوە یەککگرتووەکان وەرگیراو لە ریزی پێنج ولآتی ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی تەناهیدا کورسیی وەرگرت و بوو بە خاوەنی مافی ڤیتۆ.

ناکرێ بە بێ ئامــاژە بــەو رووداوەی، کــە لــە چــاپەمەنییەکانی ســۆڤیەتیدا تــەنیا چــەند دێڕێکیان بۆ تەرخان کراوە دەفتەری رووداوەکــانی ســالّی 1971 ســۆڤیەتی پێــوەدەین. ئــەو رووداوە مەرگی خرۆشۆف بوو لە یازدەی سپتامبر و لــە تەمــەنی 77 ســالّیدا. هیچــکام لــە بەرپرسانی سۆڤیەتی، کە دەستپەروەردە و مەزنکراوی دەستی خرۆشۆف بوون هیچ یادێکیان لێ نەکردەوە و کۆڕیادێکیان بۆ دانەنا خرۆشۆف بەر لە مردنی بیرەوەرییەکانی خۆی لە کاسێتێکدا تۆمار کردبوو و ناردبوویە دەرەوەی ولآت. رەسەنبوونی ئەو شریتانە لە لایەن پســپۆڕانی دەنــگ ناسی خۆرئاواییەوە پشتڕاست کرایەوە و یەکەمین چاپی کتێبی بیرەوەرییەکانی خرۆشــۆف، کــە هەر لەو شریتانەوە وەرگیرابوون لە سالّی 1971دا و هاوکات لەگەلّ مەرگی ئەودا بلآو بۆوە.

# 5

سالّی 1972 لە مێژووی پێوەندییەکانی خۆرهەلآت و خۆرئاوادا بە خالّێکی وەرچەرخانی گرینگ لە قەلّەم دەدرێ. نیکسۆنی ســەرۆك کۆمــاری ئــەمریکا لــە فێبریــوەری ئــەو ســالّەدا

سەردانی چینی کرد و سێ مانگ دوای ئەو سەفەرە لە مانگی مای 1972دا چۆوە سۆڤیەتی. نیکسۆن، کە سەرەڕای هەڵەکانی لە سیاسەتی نێوخۆیی ئەمریکادا، لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا یەکێك بوو لە بەهێزترین سەرۆك کۆمارەکانی ئەمریکا، بەو دوو سەردانە توانی لەگەڵ هەر دووك جەمسەری بەهێزی جیهانی کۆمۆنیزم رێککەواو وێڕای نزیك بوونەوە لە هەردووکیان بەگژ یەکتریاندا بکا. سەفەری چین بووە هۆی کرانەوەی ئەو بازارە مەزنەی ئەوێ بەسەر کالاّی ئەمریکیدا و سەفەر بۆ سۆڤیەتییش، کە واژۆکرانی پەیمانی پێشگرتن بە پەرەگرتنی چەکە ستراتیژی یەکانی بە ناوی "سالت1" لێ کەوتەوە. بە پێی ئەم پەیماننامەیە ئەمریکاو سۆڤیەتی رێککەوتن ژمارەی مووشەکە وشکارۆپێو و کلاّوکە ناوکییەکانیان سنووردار بکەنەوە و لە بەرهەمهێنانی مووشەك و چەکی ناوکیی زیاتر خۆ ببوێرن.

نیکسۆن هاوکات لەگەڵ چاککردنەوەی پێوەندییەکانی لەگەڵ چین و سۆڤیەتی لە کاتی هەڵبژێرانی بۆ سەرۆککۆماریدا بەڵێنەکەی خۆی بە جێ گەیاند و کۆتایی بە شەڕی ڤێتنام هێنا. لە ئۆکتۆبەری ساڵی 1972دا بۆمبارانی ڤێتنامی باکوور لە لایەن ئەمریکاوە راگیراو بە دوای ئەوەدا گەلاّڵەی 9 بڕگەیی ئەمریکاو ڤێتنامی باکوور بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕ بلاّوبۆوە. کشاندنەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ڤێتنام، کە لە سەرەتای سەرۆك کۆماریی نیکسۆنەوە دەستی پێکردبوو خێرایی زیاتری بە خۆوە دی و نیکسۆن لە نۆڤەمبەری 1972دا بە زۆرینەی دەنگ بۆ دووەمین جار بۆوە بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا. ساڵی 1972 لە رووی کشتوکاڵییەوە بۆ سۆڤیەتی ساڵێکی شووم بوو، بەلاّم هەر لەو ساڵە رەشەی دەغڵ و داندا ئەندازیارێکی کشتوکاڵ تاقیکردنەوەیەکی سەرنج راکێشی کرد، کە ئەگەر رێبەرانی سۆڤیەتی دەمارگرژیی خۆیان وەلا نابایە و ئەزموونەکەی ئەویان لە ئاستێکی بەربلاّوتردا وەگەڕ خستبایە لەوانەبوو سۆڤیەتی لە کڕیارێکی گەنمەوە ببوایەتە یەکێك لەو ولاّتانەی دەغڵ و دان بۆ دەرەوەی ولاّت هەنارده دەکەن لەگەڵ گەورەترین ولاّتی هەناردەکەری گەنم واتە ئەمریکا دەکەوتە هەڤرکێوە. ئەو ئەندازیارە ناوی ئیڤان خودێنکۆ بوو و هەتا ساڵی 1972 یەکێك بوو لە بەرپرسە بالاّکانی قەزاقستانی سۆڤیەتی. خۆدێنکۆ گەلاّڵەیەکی دایە بەرپرسانی بالاّی خۆی لە کۆماری قەزاقستان و تێیدا پێشنیاری کرد زەوی و زار و کێڵگەکان لە پەڵەی بچووك بچووکدا بدرێتە وەرزێران و حەقدەستەکانیان بە پێی ئەوەندەی، کە بەرهەمیان هێناوە بە نەغدی یا لە بەرهەمەکە پێیان بدرێ. خۆدێنکۆ ئامادە بوو، کە لەگەڵ شێست کەس لەو وەرزێرانەی خۆی هەڵیدەبژاردن لە شوێنێکی دەسنیشان کراودا ئەو ئەزموونە بخاتەگەڕ و پێشنیارەکەی ئەو وەکو

تاقیکردنەوە وەرگیرا. ئەو بەرهەمەی خۆدێنکۆ هەر لەو برە زەوییەی، کە لەو ساڵە رەشەی کشتوکاڵەی 1972دا بەدەستی هێنا بیست هێندەی بەرهەمی ئەوەندە زەوییە بوو، کە بە شێوەی هاوبەش بەڕێوەدەچوون. ئاکامی ئەو ئەزموونەیان بە مۆسکۆ راگەیاند و مەسەلەکە لە دەفتەری سیاسیی حیزبدا هاتەبەر باس، بەلام دژکردەوەی حیزبی پێچەوانەی چاوەڕوانیی بەرپرسانی کشتوکاڵیی قەزاقستان توند و نەرێنی بوو و بە لێبڕاوی فەرمانیان دا نەهێڵن ئەو تاقیکارییە سەرەڕۆیانەیە دووپاتە ببێتەوە. رۆژنامەڤانی بە ناوبانگی ئەمریکی هێدریك سمیت، کە لە کتێبە ناودارەکەیدا بە ناوی "روسییەکان" باسی ئەو رووداوەی کردووە دەڵێ هۆکاری تووڕەیی بەرپرسانی کرێملین لە تاقیکارییەکەی خۆدێنکۆ روون بوو، چونکی بە کەلك وەرگرتن لەو تاقیکارییە سیستەمی کشتوکاڵی هاوبەشی و دەوڵەتی سۆڤیەتی بە تەواوی لێك هەڵدەوەشایەوە. بەرپرسانی قەزاقستان، کە سەربەخۆ ئەو ئیزنەیان بە خۆدێنکۆدا بوو لە سەر کار لابران و خۆدێنکۆش بە تاوانی کەڵکی خراپ وەرگرتن لە سامانی دەوڵەتی و دزیکردن شەش ساڵی بەندیخانە بۆ بڕیایەوە، بەلام خۆدینکۆ لە دووساڵ پتر لە بەندیخانەدا نەمایەوە و لە ساڵی 1974دا مرد.

ساڵی 1973 بۆ سیاسەتی دەرەوە و نێوخۆیی سۆڤیەتی ساڵێکی پڕ لە جموجۆڵ بوو. لە سەرەتای ئەو ساڵەدا بێرژنێڤ بە راگەیاندنی ئەوەی کە ژمارەی ئەندامانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە چواردە ملیۆن وهەشتسەد هەزارکەس تێپەڕیوە فەرمانی هەڵسەنگاندنی سەرلەنوێی ئەندامانی رێبەری و دانی کارتی پێناسی ئەندامەتیی نوێی دەرکرد. کارتی ئەندامەتیی ژمارە یەك بەناوی لینین و کارتی ئەندامەتیی شمارە دوو2 بە ناوی بێرژنێڤەوە کران. لە حاڵێکدا لە مەودای نێوان ئەندامەتیی لینین و بێرژنێڤدا بە ملیۆنان کەس ببوونە ئەندامی حیزب و بە سەدان هەزار کەس لەوانە هێشتاکەش هەر زیندوو بوون و ئەندامی حیزب بوون.

لە ئاپریلی ساڵی 1973دا پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست گۆڕانێکی گرینگی لە قەوارەی دەفتەری سیاسیی حیزبدا پێك هێنا. دوو کەس لە کۆنە ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب (ۆرونۆف و شلێست) وەلانران و سێ ئەندامی نوێ ئاندرۆپۆف سەرۆکی کا.گا.ب و مارشال گرێچکۆ وەزیری بەرگری و گرۆمیکۆ کرانە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب. هیچ کام لەوانە پێشتر خۆیان بۆ ئەندامەتی لە دەفتەری سیاسیدا نەپالاوتبوو و هەر بۆیەشبوونیان بە ئەندامی دەفتەری سیاسی شتێکی سرووشتی نەبوو. دواتر ئاشکرا بوو، کە

بێرژنێڤ خۆی لە سەر لابردنی ئەو دوو ئەندامەی دەفتەری سیاسیی سوور و پێداگر بووە و بەو شێوەیە زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی لەدەست خۆیدا پاوان کردووە. دیارە هێشتا خەنیمی سەرەکیی بێرژنێڤ واتە ئالیکساندر شلێپێن هەروا ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو، بەڵام هاوڕاو هاوبیرێکی لە دەفتەری سیاسیدا نەبوو هەربۆیەش بێرژنێڤ لە ساڵی 19975دا بە ئاسانی توانیی ئەویش وەلابناو بە تەواوی دەفتەری سیاسی بخاتە ژێر چۆکی خۆیەوە.

بێرژنێڤ ئەگەرچی هێشتا هیچ پۆستێکی فەرمیی دەوڵەتیی نەبوو لە ساڵی 1973دا وەکو سەرۆکی دەوڵەتی سۆڤیەتی سەردانی ئەمریکا و فەڕەنسا و ئەڵمانی خۆرئاوایی کرد. سەفەری ئەو بۆ ئەمریکا سەرکەوتنی زۆری تێدا بوو. لەو سەفەرەدا، کە لە رۆژی شانزەیەمەوە هەتا بیست و پێنجەمی ژووئەنی خایاند 9 رێککەوتن لە نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا واژۆ کران، کە گرینگترینیان پەیمانی پێشگرتن بە شەڕی ناوکی بوو. بە پێی ئەو پەیمانە ئەمریکاو سۆڤیەتی دەروەست بوون لەبەرانبەر ئەوەدا، کە هەرکات شەڕێکی ناوکی (ئاتۆمی) لە نێوان دوو وڵات یاوڵاتانی تری خاوەنی چەکی ناوکیدا هەڵاییسێ رێبەرانی ئەو دوو وڵاتە خێرا بۆ چارەسەریی ئەو مەترسییە بکەونە دانوستان.

پاش واژۆی ئەو پەیمانە چوارمانگی نەخایاند، کە گرینگییەکەی لە چوارەمین شەڕی ئیسراییل و عەرەباندا دەرکەوت. لەو شەڕەدا، کە لە شەشەمی ئۆکتۆبەری ساڵی 1973دا بە پەڕینەوە لە کەناڵی سویز هێزەکانی میسر و پێشڕەوییان لە بیابانی سینادا دەستی پێکرد بۆ یەکەمین جار لە ماوەی شەڕەکانی ئیسراییل و عەرەباندا هێزەکانی ئیسراییل بە زیان وێکەوتوویییەوە ناچار بوون پاشەکشێ بکەن و لە بەرەی باکوور(سوریا) یش کەوتنە حاڵەتی بەرگرییەوە. ئیسرایلییەکان لە قۆناغەکانی کۆتایی ئەو شەڕەدا وەدەست هاتنەوە و پاش پەڕینەوە لە کەناڵی سویز لە نێو خاکی میسردا دەستیان بە پێشڕەویی کرد. ئەمریکاو سۆڤیەتی بۆ وەستاندنی ئەو شەڕە زۆر دۆستانە هاوکاریی یەکتریان کرد و ئەو بڕیارنامەیەی، کە لە لایەن ئەمریکاو سۆڤیەتییەوە بە هاوبەشی بۆ تەقەوەستاندن و دەستپێکردنی دانوستانەکان پێشنیار کرابوو رۆژی بیست و دووی ئۆکتۆبەر بەکۆی دەنگ لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان پەسند کرا.

رۆژی بیست و چوارەمی ئۆکتۆبەر هەڵمەتە سەربازییەکان راگیران و، بەڵام رۆژی بیست و پێنجەمی ئۆکتۆبەر قەیرانێکی بێ وێنە کەوتە پێوەندییەکانی ئەمریکاو سۆڤیەتییەوە و دەوڵەتی ئەمریکا لە سەرانسەری جیهاندا فەرمانی ئامادەبوونی بەهێزە ناوکییەکانی خۆیدا.

قەیرانەکە بە دوای لە قاودرانی بڕیاری یەك لایەنەی سۆڤیەتی بۆ ناردنی هێـز بـۆ رۆژهـەڵاتی ناڤین دەستی پێ‌کرد، بەڵام بە پێوەندیی گـرتنی راسـتەوخۆی رێبـەرانی ئـەمریکاو سـۆڤیەتی دەوڵەتی سۆڤیەتی لە بڕیارەکەی پێشووی خـۆی پاشەکشـێی کـرد و هاتنـە سـەر ئـەوەی کـە سەربازی هیچـکام لـەو دوو زلهێـزە لـە هێـزە حـەوت هـەزار کەسـییەکەی ئاشـتیی نەتـەوە یەکگرتووەکاندا بەشدار نەبن.

لە ماوەی ساڵی 1973دا رێبەرانی سۆڤیەتی وێڕای چاکردنەوەی پێوەندییەکانیان لەگـەڵ خۆرئاواو درێژەدانی سیاسەتی نەهێشتنی گرژی، گوشارەکانی خۆیان بۆ سەر دژبـەرەکانیان لـە نێو سۆڤیەتیدا چڕتر کردەوە و ئاندرۆپۆف سەرۆکی کا.گـا.ب بـە ئەنـدامبوونی لـە دەفتـەری سیاسیی حیزبدا دەستڕۆیشتووتر ببوو بەسـەدان کـەس لـە کەسـانی نـاڕازی و رەخنـەگری لـە گرتووخانە و شـێتخانە تونـدکردن، بـەڵام لـە مـانگی سـپتامبری هـەر ئـەو سـاڵەدا نامـەی سەرئاوەڵای سۆلیژنێتسین بۆ رێبـەرانی سـۆڤیەتی بـە شـێوەی کـۆپی کـراو لـەدەرەوەی وڵات کا.گا.ب ی خافڵگیر کرد. سۆلیژنیتسین لـەو نامەیـەدا وێـڕای تـاوتوێکردنی کێشـە و پرسـە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی سۆڤیەتی و ئەو مەترسییانەی، کە هەڕەشە لە کۆمەڵگەی سۆڤیەتی دەکەن، بەگفت ولفتێکی تال و چزوودار هێرشی کردۆتـە سـەر بنـەماکانی کۆمـۆنیزم و تێیـدا دەنوسـێ:" مارکسـیزم نـەك شـتێکی وردبـین و زانسـتیانە نییـە بـەڵکو هـیچ بەربێژییـەکی دروستیشی بە پێی ئامارو چەندێتی و خێرایی و شوێنەوە نەخسـتۆتە روو". سۆلیژنێسـین لـەو نامەیەدا مارکسیزم بە "گاڵتەی سامناکی سەدە" ناو دەبا و داوا لە سەر کردەکانی سـۆڤیەتی دەکا " کۆتی ئەو ئایدۆلۆژییە شکست خواردوە لە ئەسـتۆیان داڕنـن" و ئـەو کراسـەش، کـە خوێنی شێست وشەش ملیۆن مرۆڤی پێوەیە لە بەر خەڵکی سۆڤیەتی داکەنن.

گوشاری کا.گا.ب بۆ سەر سۆلیژنێتسین نەیتوانی پێش بە سۆلیژنیتسین بگرێ، کە بەرهەمە بە ناوبانگەکەی خۆی بە ناوی "کۆ دوورگەی گولاگ"، کە لە سەر هەلومەرجی تـال و دژواری بەندیخانە و تاراوگەکانی بەندییە سیاسییەکان لە سۆڤیەتیدا نووسیوێتی لە ساڵی 1973دا لە سۆڤیەتی نەباتە دەرەوە. کۆ دوورگەی گولاگ لەژانوییەی ساڵی 1974دا لە خۆرهەڵات بـڵاو بۆوە و مانگێك دوای ئەو سۆلیژنێتسین قۆڵبەست و لە سۆڤیەتی وەدەر نـرا. سۆلیژنێتسـین لـە خۆرئاوا پێشوازییەکی گەرمی لێ کراو کۆمەڵێك کتێبی تازەی نووسین، کە تێیاندا رەخنەی لە سیستەمی حکوومەتی سۆڤیەتی گرتبوو، بەڵام دواتر دوورەپـەرێزیی گرتـە بـەر و لـەو چـەند

ووتووێژە کەمەی، کە لەگەڵیدا کراوە بەردەوام بە خەمی غوربەتەوە نالاندوویەتی و بە ئاواتی گەڕانەوە بۆ نیشتیمان و زێدەکەی بوە.

لەساڵی 1974دا کۆمەڵێك گۆڕانی گرینگ لە ئەورووپاو ئەمریکادا هاتنە ئارا، کە کاریگەرییان بەسەر سیاسەتی جیهانیی سۆڤیەتیشەوە هەبوو. لەمانگی ئاپریلدا پۆمپیدۆ سەرۆککۆماری فەرەنسا مرد. لەمانگی مایدا ویلی برانت سەدریئەعزەمی ئەڵمانی خۆرئاوا، کە سیاسەتی مەیل بۆلای چەپی وی ببووەهۆی لێك نزیك بوونەوەی ئەڵمانیاو سۆڤیەتی بە هۆی ئاشکرابوونی ئەندامەتیی سەرۆکی نووسینگەکەی لە رێکخراوی کا.گا.ب دا دەستی لە پۆستەکەی کێشایەوە. لەمانگی مای ـەوە هەتا ئوتی 1974 قەیرانی نێوخۆیی ئەمریکا لە سەر ئاشکرابوونی کردەوەی نائاسایی نیکسۆن و راوێژکارەکانی لە کاتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریی نیکسۆن لە ساڵی 1972ی ئەمریکادا، کە بە رووداوی واتێرگیت ناوی دەرکردووە گەیشتە لووتکەی خۆی و نیکسۆن رۆژی هەشتەمی ئووتی 1974 دەستی لە پۆستەکەی خۆی کێشایەوە. دەست لە کار کێشانەوەی نیکسۆن و ئەو لەرزۆکییەی کەوتبووە بنەمای حکوومەتی ئەمریکاوە باشترین دەرفەتی لە گۆڕەپانی سیاسەتی جیهانیدا بۆ سۆڤیەتییەکان رەخساند دەوڵەتی سۆڤیەتی هەلی بە دەرفەت زانی و لە سەرانسەری جیهان و بە تایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا هەوڵی بەربڵاوی دەست پێکرد. یەکەمین ئاکامی ئەو هەوڵانە لە سپتامبری ساڵی 1974دا بە هەرەسهێنانی حکوومەتی لایەنگری خۆرئاوای هایل‌سێلاسی لە ئیتیۆپیی و دامەزرانی حکوومەتێکی مارکسیستی لە وڵاتەدا، کە هەڵکەوتەیەکی ستراتژیکیی هەستیاری لە باکووری خۆرهەڵاتی ئەفریقاو زارکی دەریای سووردا هەبوو دەرکەوت.

دەوڵەتی سۆڤیەتی هەروەها درێژەیدا بە هەوڵەکانی خۆی بۆ چاككردنەوەی پێوەندی لەگەڵ ئەمریکاو ئەو دانوستانانەی، کە لە سەردەمی سەرۆك کۆماریی نیکسۆندا بۆ واژۆکردنی پەیماننامەی سنووردارکردنی چەکە ستراتژییەکان دەستی پێ کرابوو لە سەردەمی سەرۆك کۆماریی جێ نشینەکەی ئەویشدا واتە جراڵدفۆرد درێژەی پێدراو بێرژنێڤ و فۆرد لەکۆتایی چاوپێکەوتنە دوو رۆژەکەیاندا لەبەندەری ڤلادیۆسك لە سەر سنووردارکردنی مووشەکەوشکارۆپێوەکانی هەر دووولات بۆ 2400دانە رێککەوتن.

لە کۆتاییەکانی ساڵی 1974دا و سەرەتاکانی 1975دا کۆمەڵە ئامارێك لە لایەن دەوڵەتی سۆڤیەتییەوە لە سەر پێشکەوتنە ئابوورییەکانی سۆڤیەتی لە ماوەی دە ساڵ 1964

ـەوە هەتا 1974 بڵاو بۆوە، کە مەبەست لەو کارە نیشـاندانی پێشـکەوتنگەلێك بـوو، کـە لەدەساڵی دوای خرۆشۆفەوە دەستەبەر ببوون.

بەپێی ئەو ئامارگەلە بەکارهێنانی گۆشت لە بۆ هەر یەك کەس سۆڤیەتی لـە 38 کیلـۆوە لە ساڵی 1964دا گەیشتبۆ 53 کیلۆ و شیر و شیرەمەنی لە233 کیلۆوە ببووە 307 کیلۆ و هێلکـە لـە 13دانـەوە گەیشـتبووە 195دانـە و تـەنیا مەسـرەفی نـانی یـەك کـەس و سێوك(پەتاتە) لە چاو ساڵی 1964 بڕێك لە کەمییدا بوو.

راپۆرتێکی ئاماریی دیکە ئەوەی نیشان دەدا، کە لە ساڵی 1965دا تەنیا یازدە لەسەدی بنەماڵەکانی سۆڤیەتی سارنجۆك (سەلاجە)یان هەبوو لە حاڵێکدا لە ساڵی 1974دا ژمـارەی ئەو بنەماڵ نەی لە ماڵەوە سارنجۆکیان هەبوو گەیشتبووە 56لەسەد. هەر بە پێی ئەو ئامـارە ئەوەندە بنەماڵەیـەی، کـە خـاوەنی تەلـەڤزیۆن بـوون لـە 24لەسـەدی سـاڵی 1965 ـەوە گەیشتبووە 71 لەسەدی 1974 و ئەوەندە بنەماڵەیەی، کە خاوەنی مەکینەی جـل شـۆردن بوون لە 21لەسەدی ساڵی 1965 ـەوە گەیشتبووە 62 لەسەدی ساڵی 1974. بـە پێـی راپۆرتە ئامارێکی دیکە، کـە لـە سـەر رەوشـی خانووبـەرە درابـوو، زیـاتر لـە 70لەسـەدی بنەماڵەکان لە ساڵی 1975دا لە ئاپارتمانی سـەربەخۆدا دەژیـان و جێگـەی نیشـتەجێبوونی شارنشینەکان لە دە مەتری چوار گۆشەی ساڵی 1964 ـەوە گەیشتبووە دوازدە مەتری چوار گۆشە.

## 6

سـاڵی 1975 کۆمـەڵێك سـەرکەوتنی مـەزنی بـۆ سـۆڤیەتی لـە گۆڕەپـانی سیاسـەتی نێودەوڵەتیدا پێوە بوو. لە ئاپریلی ئەو ساڵەدا ڤێتنـامی باشـووری و کامبۆجیـاو لـە مـانگی ئووتیشدا لائـۆس کەوتـە دەسـتی کۆمۆنیسـتەکان و هـەر لـە نیـوەی دووەم ی ئـەو سـاڵەدا کۆمۆنیستەکان لە دوو وڵاتی ئانگۆلاو موزامبیك دەسەڵاتیان بەدەسـتەوە گـرت. کۆنفرانسـی هاوکاری و تەناهیی ئەورووپا، کە بە بەشداریی 33 وڵاتی ئـەورووپی و ئـەمریکا و کانـادا و هیلسـینکی پێکهـاتبوو رۆژی یەکـەمی مـانگی ئـووتی سـاڵی 1975 بـە کـۆی دەنـگ راگەیەندراوێکی پەسند کرد، کە بە پێی ئەو راگەیەندراوە سنوورەکانی پـاش شـەڕی ئـەورووپا

سەلمێنران و وڵاتانی بەشدار لە سەر رەچاوکردنی مافی مرۆڤ و ئازادیی زانیاری گۆڕینەوە کەمکردنەوەی هێزە سەربازییەکان و چارەسەرکردنی ناکۆکی و کێشەکانیان لە رێگەی ئاشتیخوازانەوە پێکهاتن. کۆنفرانسی هیلسینکی گەورەترین مەبەست و ئامانجی سۆڤیەتیی لەئەورووپادا وەدی هێنا لە حاڵێکدا رێککەوتنەکانی دیکەی ئەو کۆنفرانسە بە تایبەتی لە بواری رەچاوکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادیی زانیاری گۆڕینەوە هیچ گەرەنتییەکی بەڕێوەبردنی لە پشت نەبوو. لە ساڵی 1975دا بێرژنێڤ لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێوخۆییشدا کۆمەڵێ سەرکەوتنی دەستەبەر کرد و پێگەی خۆی وەك رێبەری بێ ئەملاو ئەولای سۆڤیەتی پتەو کرد. لە ئاپریلی ئەو ساڵەدا کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە کۆبوونەوەی گشتیی خۆیدا بڕیاری دا بیست و پێنجەمین کۆنگرەی خۆی لە فێبریوەی 1976دا بگرێ. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا ئالیکساندرشلێپێن تەنیا خەنیمی بێرژنێڤ لە ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی لابراو مانگێك دواتر پۆستی گرینگی حیزبییەکەشی واتە سەرۆکایەتیی سەندیکا کرێکارییەکانیشی لێ ئەستێنرایەوە. هەرلە مانگی مای ئەو ساڵەدا بێرژنێڤ لەرێوڕەسمێکدا، کە بە بۆنەی سی ساڵەی کۆتایی هاتنی شەڕی دووەم ی جیهانییەوە گیرابوو و بۆ رێز گرتن لە خزمەتەکانی خۆی لە سەردەمی شەڕدا پلەی مارشالیی یەکێتیی سۆڤیەتیی پێدرا.

بیست و پێنجەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە مانگەکانی فێبریە و مارسی 1976دا گیراو بێرژنێڤ وێڕای پێشکەشکردنی راپۆرتی ئەو کۆنگرەیە رایگەیاند، کە ژمارەی ئەندامە فەرمییەکانی حیزب سنووری پازدە ملیۆنی بەزاندوە. راپۆرتەکەی بێرژنێڤ لە بواری ئابووریدا زیاتر پشتی بە بەرهەمهێنانی کاڵای مەسرەفی بەستبوو و لە بواری کشتوکاڵیشەوە سەرنەکەوتن و دەستەبەر نەبوونی ئامانجەکانی بەرنامەی پێنج ساڵەی نۆیەمی سۆڤیەتیی پێوە دیار بوو. لە بەرنامەی پێنج ساڵەی نۆیەمدا (1971 هەتا 1975) پێشبینی کرابوو، کە نێونجی بەرهەمهێنانی گەنم لە خولی پێنج ساڵەدا بگاتە 195 ملیۆن تەن و نێونجی بەرهەمهێنانی سێوك (پەتاتە) بگاتە 105 ملیۆن تەن، لە حاڵێکدا نێونجی بەرهەمهێنانی ساڵانەی گەنم لەو ماوەیەدا 181/5 ملیۆن تەن و سێوکیش ساڵانە لە 89/7 تێی‌نەدەپەڕاند. بەرهەمهێنانی شیرەمەنییش بە رێژەیەکی زۆر کەمتر لەوەی پێشبینی کرابوو دابەزیبوو و هۆکاری راستەقینەی ئەوەی کە بەرهەمەکانی ئەو بەشە بڕێك جێی دڵخۆشی بوون ئەوە بوو، کە لەو ماوەیەدا بەرهەمی ملك و بەشە تایبەتییەکان بە شێوەیەکی بێ وێنە زیادی کردبوو و دان نان بەو راستییەش نیشانەی شکست خواردنی بەرنامەی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ

بوو. لە ڕاپۆرتەکەی بێرژنێڤدا ئاماژەیەك بە ئاماری بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ساڵی 1975 نەکرا، چونکی ڕەوشی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ لە سۆڤیەتیدا لەتەواوی ساڵانی پێشوو خراپتر و شپرزەتر بوو. لە ساڵی 1975دا تەنیا 140 ملیۆن تەن گەنم بەرهەم هات لـە حاڵێکـدا بـە پێی پێشبینییەکەی بەرنامەی نۆیەم لەو ساڵەدا دەبوایـە بەرهـەمهێنانی گـەنم بگاتـە 214 ملیۆن تەن. هەر لەو ساڵەدا تـەنیا 88/5ملیـۆن تـەن سـێوك بەرهـەم هـات، لـە حاڵێکـدا بەرنامەی نۆیەمی ئـابووریی سـۆڤیەتی بەرهـەمی سـێوکی لـەو سـاڵەدا 111 ملیـۆن تـەن پێشبینی کردبـوو. دەوڵـەتی سـۆڤیەتی ناچـار بـوو بـۆ چارەسـەریی ئـەو کەمایەسـی‌یانـە و دابینکردنی لانیکەمی پێداویستیی خەڵکی سۆڤیەتی لە سـاڵی 1976دا نزیکـەی بیسـت و پێنج ملیۆن تەن دانەوێڵە لە دەرەوەڕا بێنی، کە هەتا ئەو ڕێکەوتە بەو ڕادەیـەی دەغـڵ و دان لەدەرەوە نەکڕیبوو. بەشی هەرە زۆری ئەو دانەوێڵەیە لە ئەمریکاوە دەهێنـراو سـۆڤیەتییەکان بەکردەوە ڕۆڵێکی بەرچاویان لـە چارەسـەرکردنی کێشـەی زێـدەیی بەرهەمەکشـتوکاڵییەکانی ئەمریکادا گێڕا.

لەگەڵ هەمووی ئەو گێروگرفتانەشدا کـۆنگرەی بیسـت و پێنجـەمی حیزبـی کۆمۆنیسـتی سۆڤیەتی بە پەسندکردنی بێ ئەملاوئەولای سیاسـەتەکانی بێـرژنێڤ و هەڵبـژاردنی کەسـانی دڵخوازی وی بۆ ئەندامەتی لە کۆمیتەی ناوەندی حیزبدا کۆتـایی هـات. ژمـارەی ئەنـدامانی کۆمیتەی ناوەندی گەیشتنە 287 کەس و ژمارەی پاڵێوراوان بۆ ئەندامەتی کۆمیتەی ناوەندی گەیشتنە 139 کەس. ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبیش لە جێـی خۆیـان مانـەوە و دوو کەسی دیکە لە پاڵێوراوانی دڵخوازی بێرژنێڤ بۆ دەفتەری سیاسی دیاری کران.

دوو ڕووداوی گرینگی سـاڵی 1976، کـە لـە ڕووی سیاسـەتی جیهـانیی سـۆڤیەتییەوە گرینگ دەنوێنن مەرگی مائۆتسێ تۆنگ ڕێبەری چین و هەڵبژێرانی جیمی کارتەر بـۆ سـەرۆك کۆماریی ئەمریکا بوو. بە مەرگی مائۆ و ئەو کێشمەکێشمەیەی، کە لە سەر جێ نشینیی ئەو لە چیندا دەستی پێکرد دەوڵەتی سۆڤیەتی هەلێکی لەباری بـۆ چـاککردنەوەی پێوەندییـەکانی لەگەڵ چیندا بۆ ڕەخسا، و سەرۆك کۆماری ئەمریکا کارتەریش هەرچـەندە سـەرەتاکان لەگـەڵ ئاڵۆزیی پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا بوو لاوازیی بەڕێوەبەریی ئـەو لەسیاسـەتی دەرەوەی ئەمریکادا بە قازانجی سۆڤیەتی تەواو بوو.

کارتەر، کە بە بانگەشەی خەباتی بێ وچان بۆ بە جیهانیکردنی مافی مرۆڤ بۆ سـەرۆك کۆماریی ئەمریکا هەڵبژێرابوو لە سەرەتای سەرۆك کۆماریی خۆیدا لە ژانویەی 1977دا

بە پێچەوانەی ڕێسای باوی دیپلۆماسی کۆمەڵە نامەیەکی بۆ دژبەران و نارازییەکانی سۆڤیەتی و یەك لەوان بۆ ساخارۆف نارد و بووە هۆی تووڕەیی ڕێبەرانی سۆڤیەتی و هەربۆیەش دەستپێشخەرییە دیپلۆماتیکییەکانی ئەو و یەك لەوان پێشنیارەکەی بۆ وەستاندنی بەتەواویی تاقیکارییە ناوکییەکان لە جیهاندا لەلایەن مۆسکۆوە بە هێند وەرنەگیرا. هەراوهۆریای کارتەر بۆ دەروەستبوونی سۆڤیەتی لەمەڕ دابینکردن و لەبەرچاو گرتنی مافی مرۆڤ نەك نەبووە هۆی کەم بوونەوەی گوشار بۆ سەر نارازی و دژبەرانی سۆڤیەتی بەڵکو زیاتر خستنییە بن بەرداشی گوشارەکانەوە.

بێرژنێڤ بە جێگەی ئەوەی کە گوێ بداتە هەراوهۆریای پروپاگەندەکانی کارتەر و داوای ئەو بۆ ڕێز گرتن لە مافەکانی مرۆڤ لە سۆڤیەتیدا گەڵاڵەی یاسای بنەڕەتیی نوێی سۆڤیەتیی بڵاو کردەوە، کە لە دوای حکوومەتی خرۆشۆفەوە موتالای لە سەر دەکرا. بە پێی ئەو گەڵاڵەیە، کە دواتر لە ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتیدا تاوتوێ کرا و لە جێگەی یاسای بنەڕەتیی ساڵی 1936ی ستالین دانرا، تەواوی ئەو ئازادییانەی، کە بە ڕوونی لە جاڕنامەی مافی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتوون وەك ئازادیی بیر و ڕا دەربڕین و نووسین و پێك هێنانی کۆڕوکۆبوونەوە و ئازادیی ئایین م بۆ خەڵکی سۆڤیەتی لەبەرچاو گیران، بەڵام تەواوی ئەو ئازادییانە بەمەرجێك دەدرێن، کە "کەڵك وەرگرتن لێیان دژی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە نەبێ"و بە هۆی ئەوەی، کە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگە و سنوورەکانی دژایەتییان لە لایەن دەوڵەتەوە دیاری دەکرێ ناکرێ ناوێك لە سەر ئەو ئازادییانە دابنێین. لە یاسای بنەڕەتیی نوێدا جەختی زیاتر لە سەر ڕۆڵی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە ئیدارە و بەڕێوەبەریی وڵاتدا کراوە و وەك "هێزی ڕێ نیشاندری کۆمەڵگەی سۆڤیەتی و کاکڵی سیستەمی سیاسیی وڵات" ناسێنراوە، لە حاڵێکدا پێشبینیی پێکهاتنی هیچ حیزب و گرووپی سیاسیی دیکە لەو یاسایەدا پێشبینی نەکراوە سیستەمی پێ لە سەر تاك حیزبی لە وڵاتدا داگیراوە.

لە ڕووداوگەلی گرینگی دیکەی ساڵی 1977 ی سۆڤیەتی لە سەر کار لابرانی پادگۆرنی لە پۆستی سەرۆکایەتیی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی و بەدەستەوە گرتنی ئەو پۆستە لە لایەن بێرژنێڤەوە بوو. ستالین و خرۆشۆف جگە لە پۆستی سکرتێری گشتی یا سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست پۆستی سەرۆکی وەزیرانیشیان بە دەستەوە بوو و وەك سەرۆکی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەگەڵ ڕێبەرانی وڵاتانی دیکە دانوستانیان دەکرد، بەڵام بێرژنێڤ بۆ بەدەستەوە گرتنی پۆستی سەرۆکایەتیی دەوڵەت شێوازێکی دیکەی

لەبەرچاو گرت و لەبری پۆستی سەرۆکی وەزیـران، کـە بـە کاسـیگین بـوو پۆسـتی کـارتۆنیی سەرۆکایەتیی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتیی وەئەستۆ گرت، کـە شتێکە لە ئاسـتی سـەرۆك کۆماریـدا. پـادگۆرنی پـاش لابرانـی لـە پۆسـتە دەوڵەتییەکـەی ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیشی لێ ئەستێنرایەوە و دواتر دەرکەوت، کە لە هێندێ مەسـەلەی نێوخۆیی و دەرەکیدا دژایەتیی بێرژنیڤی کردووە و وەبەر رق و غەزەبی وی کەوتووە.

ساڵی 1978 بێرنێڤ لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا چـەندین سـەرکەوتنی دیکـەی بەدەسـت هێنـا. رۆژی بیسـت و حەوتـەمی ئاپریـل بـە دوای کۆدەتایـەکی کۆمۆنیسـتی لـە ئەفغانستان حکوومەتی داوود خان، کـە لایـەنگری خۆرئـاوا بـوو رووخێنـراو حکوومـەتێکی کۆمۆنیستی بە سەرۆکایەتیی نوور محەممەد ترەکی جڵەوی دەسەڵاتی ئەو وڵاتـەی بـە دەسـتەوە گرت. هەر لە مانگی ژووئەنی ئەوساڵەدا کۆدەتایەکی سەربازی لـە یەمـەنی باشـووری بـووە هۆی هاتنە سەرکاری حکوومەتێکی لایەنگری سۆڤیەتی لەو شوێنە جوگرافیاییە هەستیارەدا. هەڤرکێی چەند ساڵەی چین و سۆڤیەتی لە ڤێتنام بە سەرکەوتنی سۆڤیەتی کۆتایی پێهات و لە مانگی ژووئیەی 1978دا چین یارمەتییە ئابوورییەکانی خـۆی لـە ڤێتنـام بـڕی. هـەر لـە مانگی نۆڤەمبەری ئـەو سـاڵەدا سـۆڤیەتی و ڤێتنـام پـەیمانێکی دۆسـتانەیان مـۆر کـرد لـە کۆتاییەکانی دیسێمبەردا هێزەکانی ڤێتنام بە یارمەتی و پشـتیوانیی راسـتەوخۆی سـۆڤیەتی کامبۆجیایان داگیر کرد و حکوومەتی خومرەسوورەکانیان، کە لایەنگری چین بوو رووخاند.

دەوڵەتی سۆڤیەتیی لە گەورەترین رووداوی سیاسیی ساڵانی 1978 و 1979دا واتە لە شۆڕشی گەلانی ئێراندا هیچ دەورێکی نەبوو و هەربۆیەش زۆر پەرۆش و نیگەرانی ئـەو ئاقـارە بوو، کە ئەو شۆڕشە دەیپێوا. لەگەڵ ئەوەدا، کە شۆڕشی گەلانی ئێـران نـزیکترین هاوپـەیمانی ئەمریکای واتە رژێمی شای کردبووە ئامانجی هێرشی خۆی دیسـان دەوڵـەتی سـۆڤیەتی لەبـەر ئەوەی نەیدەزانی و دڵنیا نەبوو، کە شۆڕشەکە بەرەو وێ دەڕوا هەتا دوو مانگ پێش رووخـانی رژێمی پاشایەتی لایەنگریی لەو رژێمە دەکرد و کاتێك دەستی لە پشتیوانیی شا هەڵگرت، کە هیوایەك بە مانەوەی رژێمەکەی نەمابوو. بەو شێوەیە روسـییەکان وەك ئـەو مەسـەلەی دەڵـێ سواری شەپۆل بوون و مۆرە سـیخوڕییەکانی خۆیـان بـۆ کـەڵکوەرگرتن نـاردە نێـو ئێرانـەوە. بێرژنێڤ لە دوایین رۆژەکانی حکوومەتی شـادا بـە قسـەگەلێکی وەك : سـۆڤیەت قایـل نییـە بەوەی، کە ئەمریکا دەست لە کاروباری ئێران وەربدا ویستی خۆی لە لای شۆڕشگەرانی ئێرانی

شیرن بکاو رادیۆ مۆسکۆ و بلاڤۆکی سۆڤیەتیش پاش وەدەرکەوتنی شا لە ئێران لە هێرشدا بـۆ سەر رژێمی هەرەسهێناوی رابردوو لەگەڵ شۆڕشی ئێران هاودەنگ بوون.

کۆتایی هاتنی دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویی ئەمریکا لـە ئێرانـدا و کۆکرانـەوەی ئیسـتگەکانی شوێن هەڵگرتن و گوێهەڵخستنی ئەمریکی لە ئێراندا بۆ سۆڤیەتی سەرکەوتنێکی گەورە بوو، بەڵام هەوڵەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ تەشەنەی دەسەڵاتی خۆی لە ئێرانی پاش رووخانی شادا بـێ ئاکـام مانەوە و مۆرە لایەنگرەکانی سۆڤیەتییش یەك بە دوای یەکدا لە گۆڕەپانەکە وەدەر نران .

دەستبەسەر کرانی رێبەرانی حیزبی توودە، کە لـە یەکـەمین سـاڵی دامـەزرانی کۆمـاری ئیسلامیدا گەڕابوونەوە ئێران دوایین و کاریگەرترین زەبـر بـوو، کـە لـە ئێرانـدا وەدەسـەڵاتی سۆڤیەتی کەوت و دانپیانانە روونـەکانی سـەرکردەکان و وئەنـدامانی بـاڵای تـوودە لـە سـەر سیخوڕیکردن بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی بـۆ هەمیشـە رێگـەی گەڕانـەوەیانی بـۆ نێـو گۆڕەپـانی سیاسەتی ئێران بەست.

سەرلێ شێواویی ئـەمریکا لـە کـاتی شۆڕشـی ئێرانـدا و لاوازیـی سیاسـەتی دەرەوەی کارتـەر لەماوەی ساڵی 1979 دا دەرفەتێکی لەباری دیکەی بۆ پەرە پێدانی هێزو دەسەڵاتی سۆڤیەتی لـە جیهاندا رەخساند. رۆژی سێزدەی مارسی 1979 لە دوورگەی گرانـادای هەڵکـەوتوو لـە دەریـای کاراییبدا کودیتایەکی چەپی کراو حکوومەتێکی لایەنگری سۆڤیەتی و کوبا لەو وڵاتە گچکە و تازە بەسەر بەخۆیی گەیشتوەدا هاتە سـەرکار. رۆژی حەڤـدەی ژووئیـە شۆڕشـگێڕانی" ساندنیسـت "ی نیکاراگۆیە، کە دەست و پشتیوانیی سۆڤیەتی و کوبایان لەپشت بوو دەسەڵاتیان بەدەستەوە گـرت و سێیەمین حکوومەتی دەستەچەپی لە بناگوێچکەی ئەمریکادا دامەزرا.

رۆژی پازدەی ژووئەنی 1979 بێرژنێڤ و کارتەر لە ڤیەن چاویان پێك‌کەوت و لە کۆتایی دانوستانەکانیاندا دووەمین پەیماننامەی سـنووردارکردنەوەی چـەکە سـتراتژییەکانیان، کـە بـە "سالت2" بەناوبانگە مۆر کرد، بەڵام ئەو پەیماننامەیە بە هۆی دەستدرێژیی سۆڤیەتی بۆ سەر ئەفغانستان لـە دوایـین رۆژەکـانی سـاڵی1979دا بـە هەڵپەسـێردراوی مایـەوە. هێزەکـانی سۆڤیەتی رێك سەد رۆژ پاش لە سەر کار لابران و ئیعدامی تەرەکیی رێبەری ئەفغانیی لایەنگری سۆڤیەتی بەدەستی حەفیزولائەمین هێرشیان کردە سەر ئەو وڵاتە و بیانووی دەسـتدرێژییەکەش " داوای دەوڵەتی ئەفغانستان" لە سۆڤیەتی بوو، لە حاڵێکدا حەفیزولائەمین سەرۆکی دەوڵەتی ئەفغانستان، کە دەبـێ وەهـا داوایـەکی لـە سـۆڤیەتی کردبـێ هـەر ئـەو رۆژەی، کـە هێـزە

ئاسمانییەکانی سۆڤیەتی کابۆل دەگرن کوژراو بەبرەك کارمێل، کە لەگەڵ هێزەکـانی سـۆڤیەتی هاتبۆوە کابۆل دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت.

دەستدرێژیی هێزەکانی سۆڤیەتی بۆ سەر ئەفغانستان لە دوای شەڕی دووەم ی جیهانییــەوە یەکەمین دەستدرێژیی لەو شێوەیە بوو. لە رووداوەکەی چیکۆسلۆڤاکیاو هــەنگاریادا هێزەکـانی سۆڤیەتی لە چوارچێوەی پەیمانی وەرشۆدا هێرشیان کردبووە سەر وڵاتێکی کۆمۆنیســتی، بــەڵام ئەمجارەیان وڵاتێك لە دەرەوەی کەوشەنی ژێــر دەســەڵاتی ســۆڤیەتیدا دەکەوتــە بــەر هێــرش و هەربۆیەش دژکردەوەی خۆرئاوا زۆر توند بوو. بێرژنێڤ پێی وابوو، کە ئەمریکا لەبەر کێشــە و گرفتی رووداوی بەبارمتە گیرانی کاربەدەستانی باڵوێزی ئەمریکا لە تاران ئیتر دژکردەوەیــەکی ئەوتۆی لە بەرامبەر کردەوەکەی سۆڤیەتیدا نابێ و ئەوپەڕەکەی لەوانەیە ئەو هەلە بقۆزێتەوە و بۆ رزگارکردنی بەبارمتە گیراوەکانی لە ئێران هەوڵێکی جیــددی بــدا، بــەڵام کارتــەر لــە بــری کەڵکوەرگرتن لەو دەرفەتەی، کە بێرژنێڤ بۆی رەخساندبوو لەبەرامبەر سۆڤیەتیدا هەڵوێســتی گرت و جگە لە هەڵپەساردنی پەیمانی "سالت2"نەشیهێشت دەغڵ ودانی ئەمریکا بۆسۆڤیەتی بچاو یارییەکانی ئۆلەمپیکی ساڵی 1980شی بایکۆت کرد.

لە ماوەی ساڵی 1980دا سۆڤیەتی هەروا خەریك بوو باجی دەستێوەردانە سەربازییەکانی خۆی لەئەفغانستاندا دەدا. جگە لە وڵاتــانی خۆرئــاوایی، کــە بــە چــاولێکەری لــە ئــەمریکا یارییەکانی ئۆلەمپیکیان بایکۆت کرد کۆماری گەلیی چینیش بە توندی ناڕەزایەتیی خۆی لــە بەرامبەر دەستێوەردانی سۆڤیەت لە ئەفغانســتاندا دەربــڕی و پێوەندییــەکانی ئــەو دوو وڵاتــە دیسانیش ئاڵۆز بوونەوە. هێندی لە حیزبە کۆمۆنیستە ئەورووپاییەکانیش نەیانویست لای ئــەو کردەوەیەی سۆڤیەت بگرن و حیزبی کۆمۆنیستی ئیتالیا راشکاوانە دژایــەتیی خــۆی دەربــڕی. دەوڵەتی ســۆڤیەتی ناچــار بــوو لەبەرامبــەر دژایەتییــە نێوخۆییەکانــدا لــە ســەر هێــرش بــۆ ئەفغانستان، دژکردەوەی توند بنوێناوساخارۆف بیریاری ناودار بە هــۆی گــرتنی کۆنفرانســێکی چاپەمەنی و رەخنە گرتن لە سیاسەتەکانی بێرژنێڤ لە نێوخۆ و دەرەوە، دەستبەسەر کــراو بــۆ شاری گورکی لە 360کیلۆمەتری خۆرهەڵاتی مۆسکۆ دوورخرایەوە.

بێرژنێڤ ساڵی 1980 لە ئــەورووپای خۆرهەڵاتــدا تووشــی قــەیرانێکی دیکــەش هــات. ئەمجارەیان دەسەڵاتی حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیا بە هۆی بشــێوی و ســەرهەڵدانی کرێکــاری و ئەو مانگرتنانەی، کە لە لایەن رێکخراوێکی سەربەخۆوە بە ناوی "یەکگرتوویی" رێبەرایــەتی دەکــرا کەوتــە مەترســییەوە. دەوڵــەتی پۆلۆنیــا لــە 30ی ئــوتی 1980دا رێکخــراوی

یەکگرتوویی بەفەرمی ناسی وئێدوارد گیرك سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی پۆلۆنیا دوای ئەو ڕووداوانە دەستی لە پۆستەکەی خۆی کێشایەوە.

ڕۆژی بیست و سێیەمی ئۆکتۆبەری 1980 کاسیگین سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتی، کە لە پاش ڕووخانی خرۆشۆفەوە ئەو پۆستەی بەدەستەوە بوو مرد. لە جێگەی ئەو تیخۆنۆف، کە یەکێك بوو لە ئەندامانی بەساڵاچووی دەفتەری سیاسی و بۆ ماوەی چوارساڵ جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتی بوو بۆ کاروباری ئابووری، کرایە سەرۆکی وەزیران. هەڵبژاردنی تیخۆنۆف بۆ پۆستی سەرۆکی وەزیران نیشانی دا، کە ئەو پۆستە لە سۆڤیەتیدا ئەو گرینگیەی پێشتر لەباری سیاسییەوە هەیبوو نەیماوە و زیاتر بووەتە پۆستێکی ئیداری و ئابووری.

لەو ڕووداوگەلەی ساڵی 1980، کە کاریگەریی زۆری لە سەر سیاسەتی جیهانیی سۆڤیەتی داناوە دەبێ ئاماژە بە دوو ڕووداوی گرینگی دیکەش بکەین:ڕۆژی بیست و دووی سێپتەمبەری 1980 هێزەکانی عێراق لە زەوی و ئاسمانەوە هێرشیان کردە سەر ئێران و هەتا کۆتایی ساڵ بەکەڵك وەرگرتن لە نائامادەیی و پێنەزانینی هێزە سەربازییەکانی ئێران بەشێکی زۆری خاکی خوزستانیان گرت. دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە پەیمانی دۆستایەتی ویەکێتیی پازدەساڵەی لە گەڵ هەبوو، جگە لە داخ و کەسەر دەربڕین و ناڕەزایەتی دەربڕین بەوشە هیچ هەوڵێکی دیکەی نەدا بۆ ئەوەی پێش بەو دەستدرێژییە بگری و بە پێچەوانەوە هەولی دا لەو دەرفەتە بۆ وەرگرتنی ئیمتیاز و پوان لە ئێران کەڵك وەرگرێ ، کە دیارە هیچی دەست نەکەوت.

لەنۆڤەمبەری 1980دا کارتەر لە هەڤرکێی سەرۆك کۆماریی ئەمریکادا لەبەرامبەر ڕۆناڵد ڕەیگانی خەنیمیدا شکستی خوارد. سەرکەوتنی ڕەیگان لەو هەڵبژاردنانەدا بۆ سۆڤیەتی هەواڵێکی خۆش نەبوو، چونکی لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی کارتەردا دەوڵەتی سۆڤیەتی ئەوپەڕی کەڵکی لە سەر لێ شێواویی ئەو لە بواری سیاسەتی دەرەوەیدا وەرگرتبوو ئیمپراتۆریی جیهانیی خۆی فرەوانتر کردبۆوە. ڕەیگان بە ئیدیعای بەربەرەکانێ لەگەڵ سیاسەتی زێدەڕۆیانەی سۆڤیەتی و بەکارهێنانی هێز، بەسەرکارتەردا سەرکەوت و هەڵبژێرانی ئالیکساندر هیگ فەرماندەی پێشووی هێزەکانی ڕێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیك(ناتۆ) بۆ وەزیری دەرەوەی نوێی ئەمریکا نیشانەی سووربوونی ئەو بوو لە بەکارهێنانی سیاسەتێکی توند وتیژ. لەگەڵ ئەوەدا دەوڵەتی سۆڤیەتی سیاسەتێکی خۆپارێزانەی لە بەرامبەر گۆڕانەکانی ئەمریکادا گرتەبەر و

هەتا دەستپێکردنی دەوری سەرۆك کۆماریی رەیگان لە ژانوییەی 1981 خۆی لە هەرجۆرە دەربڕینێکی نەرێنی و رەشبینییەك لەمەڕ سیاسەتەکانی داهاتووی وی بوارد. دەوڵەتی سۆڤیەتی لە سەرەتای دەیەی 1980دا لەگەڵ هەموو کەمایەسی و گیروگرفتە نێوخۆییەکانیدا ببووە گەورەترین هێزی سەربازیی سەرزەوی و ئەو ئامار و زانیارییانەی، کە لە لایەن ناوەندە سەربازی و دامەزراوە بەناوبانگەکانی خۆرئاواوە لەو بارەیەوە بڵاو بوونەوە، نیشانی دەدا، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی لە ماوەی دەیەی 1970دا بە تایبەتی لە ساڵانی 1975 هەتا 1980دا توانایی سەربازیی خۆی لەبواراە جۆراوجۆرەکاندا لە بیستەوە هەتا چل لەسەد بردۆتە سەرێ. گۆڤاری تامی ئەمریکا لە ژمارەیەکی تایبەتیی خۆیدا، کە رۆژی 23ی ژووئەنی 1980 لە سەر سۆڤیەتی بڵاوی کردەوە بە پشتبەستن بە دەربڕینی سەرچاوە باوەڕ پێکراوە سەربازییەکانی ئەمریکاوە نووسی:، کە ژمارەی مووشەکە وشکارۆپێوەکانی سۆڤیەتی لەو رێکەوتەدا 1398دانە بووە لە بەرامبەر 1054 مووشەکی وشکارۆپێوی ئەمریکادا و هێز و توانای کاولکاریی بۆمب و کلاوکە ناوکییەکانی سۆڤیەتی 7836 میگاتەن لەبەرامبەر 3253 میگاتەن توانای کاولکاریی ئەو چەکانەن کەلە عەمباری تەقەمەنیی ناوکیی ئەمریکادا هەن. تایم هەر لەو راپۆرتەدا نووسی، کە ژمارەی هێزەکانی سۆڤیەتی لەو رێکەوتەدا سێ ملیۆن و شەشسەد هەزار کەسە واتە دوو هێندەی هێزەکانی ئەمریکاو ژمارەی دەبابەکانی سۆڤیەتی لە دەیەی 1970دا سی وپینج لەسەد زیادی کردووە و هەر ساڵەی بیست دەزگا کەشتیی جەنگی بە هێزی دەریایی سۆڤیەتییەوە زیاد دەبێ.

بە پێی راپۆرتێکی دیکە بۆ بەراوردکردنی هێزی سەربازیی پەیمانی وەرشۆ و پەیمانی ئاتلانتیك، کە لە ژمارەی رێکەوتی 27ی ئۆکتۆبەری 1980 ی گۆڤاری نیوزویکی ئەمریکادا چاپ کراوە ولە راپۆرتەکانی دامەزراوی لێکۆڵینەوەی ستراتژی وەرگیراوە هاتووە، کە ژمارەی هێزە سەربازییەکانی سۆڤیەتی و وڵاتانی هاوپەیمانی 7100000 کەسە لەبەرامبەر 6700000 هێزی ئەمریکی و وڵاتانی ئەندامی پەیمانی ئاتلانتیکدا. ژمارەی فڕۆکە شەڕکەرەکانی دوولایەن دەکرێ بڵێین وەك یەکن، بەڵام لە بەرامبەر 27000 دەبابەی پەیمانی ئاتلانتیکدا سۆڤیەتی و هاوپەیمانەکانی 64270 دەبابەیان هەیە و توانای ئاگری تۆپخانەی وڵاتانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ بە 34000 تۆپەوە چل لەسەد لەتۆپخانەی پەیمانی ئاتلانتیك زیاترە. لەو راپۆرتەدا گرینگیی زیاتر دراوەتە توانای هێزە ئاسمانییەکانی سۆڤیەتی و نووسیوییانە، کە ئەو هێزانە دەتوانن ئەگەر پێویست بوو لە ماوەیەکی کەمتر لە بیست و چوار

سەعاتدا لە ناوچە هەستیارەکانی خۆرهەڵاتی ناڤین و لە بەندەرەکانی کەنداودا دابەزن لە حاڵێکدا هێزەبەدەستوبردەکانی ئەمریکا لانیکەمەکەی سی وشەش کاتژمێری بۆ بەڕێوەبردنی کردەوەی ئۆرژانسیی خۆی داناوە.

# 7

لە دووساڵی کۆتایی حکوومەتی بێرژنێڤدا سیاسەتی سۆڤیەتی ئەو روخسار و حاڵەتە هێرشبەرانەیەی ساڵانی دەیەی 1970 ی لەدەست دا و شێوازێکی ئاشتیخوازانەی لە پرسە نێودەوڵەتییەکاندا وەئەستۆ گرت. هۆکاری ئەو گۆڕانی سیاسەتەش جگە لە هاتنە سەرکاری حکوومەتێکی نوێ لە ئەمریکا بوو، کە ئامادە نەبوو لە بەرامبەر سیاسەتی هێرشبەرانەی سۆڤیەتیدا پاشەکشێ بکاو هەروەها رەوشی تەندروستیی بێرژنێڤ و بۆشاییبوونی ئەو لەگۆڕەپانەکەدا بوو، کە دەرفەتی بۆ دەستپێشخەریی نوێی سیاسی نەدەهێشتەوە. لەو سەروبەندەدا سۆسلۆف ئەندامی مەزنی دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە بۆماوەی چارەکە سەدەیەك تیۆرداڕێژی حیزب و پلاندانەری زۆربەی رەوتە سیاسییەکانی سۆڤیەتی بوو مرد و نەخۆشبوونی بێرژنیڤ مەسەلەی جێ نشینیی ئەوی کردبوو بە یەکێك لەو کێشانەی، کە مێشکی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی بەخۆیەوە خەریك کردبوو. لە لایەکی دیکەوە درێژەی قەیران و بشێوییە کرێکارییەکانی پۆلۆنیا نەی هێشت بێرژنێڤ وریبەرانی دیکەی سۆڤیەتی بپرژێنە سەر هیچی تر و سەرەڕای دامەزرانی حکوومەتی سەربازی لە پۆلۆنیاو هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوی یەکگرتوویی کرێکاران مەترسیی سەرهەڵدانەوە هەتا کۆتایی حکوومەتی بێرژنیڤ نەڕەوییەوە.

گرینگترین رووداوی دوو ساڵی کۆتایی حکوومەتی بێرژنێڤ لە بواری نێوخۆییەوە گیرانی بیست و شەشەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی یا دوایین کۆنگرەیەکە، کە بێرژنێڤ تێیدا بەشدارە و لە مانگەکانی فێبرییە و مارسدا گیرا. نیشانەکانی نەخۆشیی و بێرژنێڤ بۆ بەڕێوەبەریی وڵات هەر لەو کۆنگرەیەدا دەرکەوت، چونکی ئەو کاتێك، کە بۆ خوێندنەوەی راپۆرتی سیاسییەکەی بۆ کۆنگرە چووە پشت تریبوون زیاتر لە حەوت دەقیقە نەیتوانی لە سەر پێ راوەستاو خوێندنەوەی باقی راپۆرتەکەی بە یەکێك لە ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتیی کۆنگرە ئەسپێردرا. ئەو کۆنگرەیە جگە لە پەسندکردنی بەرنامەی پێنج ساڵەی نوێی ئابووری

هیچ کارێکی گرینگی دیکەی نەکرد و لە پێکهاتەی کۆمیتەی ناوەندی و ئۆرگانەکانی دیکەی بەڕێوەبەریی حیزبیشدا هیچ گۆڕانێکی بەرچاو بەدی نەکرا.

تەنیا سەرکەوتنی بێرژنێڤ لە سیاسەتی دەرەوەی ساڵانی 1981 و 1982دا کەشیاوی باسکردن بێ سەردانی ئەڵمانی خۆرئاوا لە کۆتاییەکانی نۆڤەمبەری 1981 و واژۆی گەورەترین پەیمانی بازرگانیی خۆرهەڵات و خۆرئاوا بۆ راگواستنی گازی سرووشتیی سۆڤیەت بۆ ئەورووپای خۆرئاوا بوو. بە پێی ئەو پەیماننامەیە لوولەیەکی پێنج هەزار کیلۆمەتریی گازی سرووشتیی سۆڤیەتی لە سیبریایەوە بۆ ئەڵمانیاو لەوێوە بۆ وڵاتانی دیکەی ئەورووپای خۆرئاوایی رادەگوێزێ. ئەمریکا بە نیشانەی دژایەتی لەگەڵ ئەو پەیمانە ناردنی کەلوپەلی لوولەکێشانی گازی بۆ سۆڤیەتی قەدەغە کرد و ئەو بڕیارە کەوتە بەر رەخنەی توندی رێبەرانی ئەورووپای خۆرئاوایی.

گرژی و ئاڵۆزیی پێوەندییەکانی ئەمریکاو سۆڤیەتی لە ساڵی 1982دا دامرکایەوە و دانوستانەکانی پێوەندیدار بە واژۆکردنی پەیمانێکی تازەی سنووردارکردنی چەکە ستراتژییەکان لە مانگی ژووئەنی ئەو ساڵەدا لە نێوان نوێنەرانی هەردوو وڵاتدا دەستی پێکرد.

وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو سۆڤیەت لە کاتی کۆبوونەوەکانی کۆڕی گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە مانگی سێپتەمبەردا پێکەوە دانوستانیان کرد و ئامادەکارییان بۆ یەکەمین چاوپێکەوتنی بێرژنێڤ و رەیگان لە کۆتاییەکانی ساڵی 1982 یا سەرەتاکانی 1983دا دەکرد، کە بێرژنێڤ کتوپڕ بە هۆی جەڵتەی دڵ مرد. رێکەوتی مەرگی بێرژنێڤ بەرەبەیانیی رۆژی 10دەی نۆڤەمبەری 1982 بوو، بەڵام راگەیەندراوی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست و دەوڵەتی سۆڤیەتی بە بۆنەی مەرگی وی بیست و شەش سەعات دوای مردنەکەی نزیك سەعات یازدەی بەیانیی رۆژی یازدەی سپتامبر بڵاوبۆوە.

راپۆرتی دارایی حکوومەتی هەژدە ساڵەی بێرژنێڤ بەسەر سۆڤیەتیدا نیشانی دەدا، کە لە رووی ئابووریی و سەربازییەوە سەرکەوتوو بووە. هەرچەندە لە بەشی کشتوکاڵدا پێشکەوتنەکانیان کەمتر لەوە بوونە، کە لە بەرنامە ئابوورییەکانی سۆڤیەتیدا پێشبینییان کردبوو و تەنیا لە ساڵی 1981دا دەوڵەتی سۆڤیەتی ناچار بوو 64 ملیۆن تەن دەغڵ و دان واتە نزیك بە بیست لەسەدی پێویستیی نێوخۆیی وڵاتەکەی لە دەرەوەڕا بێناو بۆ کڕینی ئەوەش حەوت ملیار دۆلار بداتە هەناردەکەرەکانی بەتایبەتی بە ئەمریکا. دەوڵەتی سۆڤیەتی نەیتوانی ئەو بڕە پارەیە بە فرۆشتنی بەرهەمە نەوتییەکانی دابین بکاو هەربۆیەش ناچار بوو 250 تەن لە ئاڵتوونی پاشەکەوتی خۆی بە نرخی سێ ملیارد دۆلار لە بازارەکانی جیهاندا بفرۆشێ.

به پێی راپۆرتێکی ئابووری، کە لە ساڵی 1982دا بڵاو بۆتەوە بەرهەمهێنانی پۆڵا لە سۆڤیەتی لە 91 تەنی ساڵی 1965ەوە گەیشتە 149 تەن، ساڵی 1981 بەرهەمهێنانی ساڵانەی نەوتی خاو هەر لەو ماوەیەدا لە 243 ملیۆنەوە گەیشتە609 ملیۆن تەن و بەرهەمهێنانی کارەبا لە 507 ملیۆن کیلۆوات سەعات لە ساڵی 1965دا گەیشتە 1325 ملیۆن کیلۆوات سەعات لە 1981دا. بەرهەمهێنانی سەیارە لە 201/200دانە لە ساڵدا گەیشتۆتە 1/324/000دانە لە ساڵی 1981دا، کە زیاتر لەشەش هێندە نیشان دەدا. هەر لەو راپۆرتەدا لە بەشی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ و بژێودا هاتووە، کە بەرهەمی دانەوێڵە لە 121ملیۆن تەنی ساڵی 1965 ـەوە گەیشتۆتە 160 ملیۆن تەنی ساڵی 1981و بەرهەمهێنانی ساڵانەی گۆشت هەر لەو ماوەیەدا لە 9/9 ملیۆن تەنەوە گەیشتۆتە 15/2 ملیۆن تەن، بەرهەمهێنانی شیر لە 72/9 ملیۆن تەنەوە گەیشتۆتە 88/5 ملیۆن تەن، کە هەر سێکی ئەوانە کەمترن لەوەی، کە لە بەرنامەدا پێشبینی کرابوون.

هێندێ لە ئامارەکانی پێوەندیدار بە پێشکەوتنە سەربازییەکانی سۆڤیەتیی سەردەمی حکوومەتی بێرژنێڤ لە لاپەڕەکانی پێشوودا باس کران و پێویست ناکا دووپاتە بکرێنەوە. بەکورتی دەبێ بگوترێ، کە توانای سەربازیی سۆڤیەتی لە سەردەمی بێرژنێڤدا بە شێوەیەکی بەرچاو چووە سەرێ بە وتەی خودی ئەمریکییەکانیش بە گشتی کەوتنە پێش ئەمریکییەکان. رەیگان لە سەرەتای دەسەڵاتداریێتیی خۆیدا لە ساڵی 1981دا بۆ قەرەبووکردنەوەی دواکەوتووییەکانیان لە سۆڤیەتی بەرنامەیەکی بەربڵاوی داڕشت و بەڕێوەی برد و لە ماوەی دەسەڵاتداریێتیی خۆیدا ساڵ بە ساڵ لە بودجەی ئەمریکای زیاد کرد هەرچەندە دەوڵەتی سۆڤیەتی ئەو هاتوهەرا بانگەشەیی و پرۆپاگەندەییانەی ئەمریکییەکانی بە زێدەخوازیی بەرپرسانی پینتاگۆن(وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا) و تاکتیکێك بۆ پەرە پێدان بە پیشەسازیی سەربازیی ئەمریکا زانی.

سیاسەتی دەرەوەی بێرژنێڤ تێکەڵاوییەك بوو لە خۆپارێزی و هەلپەرستی. ئەو لە هەمان کاتدا، کە هەوڵی دەدا پێش بە سەرهەڵدانی قەیرانێکی نوێ لە پێوەندییەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوادا بگرێ بۆ بەربڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەتی لە دوورترین شوێنەکانی جیهاندا هیچ دەرفەتێکی لەدەست نەدەدا و لە ماوەی ساڵانی دەیەی 1970دا، کە ئەمریکا سەرەتا لەگەل قەیرانی رێبەرایەتی( لە سەر رووداوی واتێرگیت و دەست لە کار کێشانەوەی نیکسۆن) و دواتر حکوومەتێکی لاواز و بێ ئەزموون لە کاروباری نێودەوڵەتیدا بەرەوڕوو بوو رێگەی بۆ تەشەنەی

دەسەڵاتی سۆڤیەتی لە 10دە وڵاتی ئاسیایی و ئەفریقایی و ئەمریکای لاتین (ڤێتنام، لائۆس، کامبۆج، یەمەنی باشوور، ئیتیۆپی، ئانگۆلا، موزامبیك، نیکاراگۆیە و گرانادا)دا خۆش کرد.

لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی کۆمۆنیست یا پاشکۆکانی سۆڤیەتییش بێرژنێڤ توندی و نەرمی و نیانیی تێکەڵاو کرد و لە حاڵێکدا لە بەرامبەر چیکۆسلۆڤاکیادا بە دەستێوەردانی سەربازی لە ساڵی 1968دا دژکردەوەی نواند لەگەڵ رۆمانیادا، کە سیاسەتێکی نزیك بەسەربەخۆیی لە نێو بلۆکی کۆمۆنیزمدا گرتبووە بەر هەڵیکرد و لەگەڵ پۆلۆنیا سیاسەتێکی تێکەڵاو بە هەڕەشە و رێزلێگرتنی رەچاو کرد.بەڵام گەورەترین شکستی ئەو لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی کۆمۆنیستیدا ئەوە بوو، کە کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان چین و سۆڤیەتیی تەنانەت پاش مەرگی مائۆش بۆ چارەسەر نەکرا.

لە باری نێوخۆییەوە دەبێ سەردەمی حکوومەتی بێرژنێڤ لە سۆڤیەتیدا بە سەردەمی سەقامگیری ناوبەرین، چونکی زۆرینەی ئەو کەسانەی، کە ساڵی 1964 لە کاتی هەرەسی خرۆشۆفدا پۆستی باڵای حیزبی و دەوڵەتییان بەدەستەوە بوو لە سەردەمی دوور ودرێژی بێرژنێڤدا پۆستەکانی خۆیان پاراست و چەند کەسێکیان وەك کاسیگین و سۆسلۆڤ و مارشال گرێچکۆ لەکاتێکدا مردن، کە دەفتەری سیاسیی حیزب بوون. ئەو پارێزراوبوونی پۆستە وێڕای لایەنە باشەکانی کۆمەڵێك گەندەڵیشی لێکەوتەوە و پاش مەرگی بێرژنێڤ پەردە لە سەر زۆربەی ئەو گەندەڵییانە لادرا، کە بەسەدان بابەتی بەرتیل خۆری و خراپ کەڵك وەرگرتن و دزینی دارایی دەوڵەتیشی لەخۆ دەگرت.

خۆشگوزەرانی و ژن خۆشەویستی بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی بێرژنێڤ بوون. گۆڤاری تایمی ئەمریکا لە ژمارەی رێکەوتی 22ی نۆڤەمبەری 1982 ی خۆیدا، کە حەوتوویەك پاش مەرگی بێرژنێڤ بلاو بۆتەوە وێڕای باسێکی پوخت لە سەر ژیان و تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکانی بێرژنێڤ لە زمانی نیکسۆنی سەرۆك کۆماری پێشووی ئەمریکاوە دەنوسێ "بێرژنێڤ شێت و شەیدای سەیارەی جوان و ژنی جوان بوو و تەنانەت لە سەفەرە فەرمییەکانیشیدا وازی لە چاوەچاو و دواندنی ئافرەتی جوان نەدێنا." نیکسۆن وێڕای گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی سەفەری بێرژنێڤ بۆ ئەمریکا دەڵێ:" من، کە ئاگاداری ئەوە بووم، کە بێرژنێڤ زۆر خولیای سەیارەی جوانە لەو سەردانەیدا سەیارەیەکی لینکۆڵن کۆنتیناتاڵم بە دیاری پێدا. بێرژنێڤ بە دیتنی ئەو سەیارەیە وا شاگەشکە بوو، کە خۆی پێ نەگیراو خێرا خۆی خستە نێو و لەبەر چاوی ئەو خەڵکە سەرسوڕماوەی لەوێ بوون ماوەیەك لێیخوڕی و تاقیی کردەوە."

تایم هەر لەو وتارەیدا ئاماژە بە ژمارەیەك لەو ترۆمبیلە گرانباییـە بیانییانـە دەكـا، كـە بێرژنێڤ لە گەراجەكەی خۆیدا كۆی كردبوونەوە و دەنووسێ: زۆربەی ئەو ترۆمبیلانە بـۆ وێنـە "رۆلزرۆیس"ێك و "مێرسێدێس بێنزێكـی SLC1450 " و یەكدانە"سـیترۆئێن ماسـراتی" هەمووان دیاریی رێبەرانی بیانی بوون بە بێرژنێڤ. تایم هەروەها دەڵێ، كە بێـرژنێڤ چـەندین ڤیلای رازاوەی تایبـەتی لـە لێـوار مۆسـكۆ و لێـواری كرێمـە هـەبوون و لـە كۆشـكە رازاوە هاوینییەكەیدا لە یالتا مەلەوانگەیەكی گەورەی "سایزی ئۆلەمپیكیان" ساز كردبوو، كـە بـە شووشەی ئەستووری گەڕیانەوە، كە لە دەوروبەری خۆیان جیا دەبوونەوە و بێرژنێڤ هـەر كـات كەیفی لێ بایە بە داگرتنی دوگمەیەك مەلەوانگە تایبەتییەكەی خۆی لە باوبۆران دەپاراست.

بە قسەیەكی خۆش لە كتێبی "روسەكان"ی هێدریك سمیت لە سـەر بێـرژنێڤ ئـەو بەشـە تەواو دەكەین:

رۆژێك بێرژنێڤ دایكی لە ئۆكراینەوە بانگهێشت كردە مۆسكۆ بۆ ئەوەی ژیانی تازەی خۆی لە كرێملین نیشانی دایكی بدا، دایكـی بـە دیـتنی ژیـانی وا رازاوەی كوڕەكـەی لـە كـرێملین شاگەشكە بوو، بەڵام بێرژنێڤ گوتی :"دایە ئەوانە شتێكی ئەوتۆ نین وەرە با بتبەمە ڤیلاكـەی خۆم لە ئۆسڤۆ، كە پێشتر ستالین و خرۆشۆڤی تێدا ژیـاون". بێـرژنێڤ ئـەمجارە بـە یـەكێك لـە جوانترین ترۆمبیلەكانی خۆی دایكی بردە ڤیلاكەی لە ئۆسڤۆ و تەواوی دیوەكانی ئـەو كۆشـكە رازاوەیەی نیشان دا. دایكی هەروا شاگەشكە و سەرسـووڕماو بـوو، كـە بێـرژنێڤ فڕۆكەوانـە تایبەتییەكەی خۆی بانگ كرد و لەگەڵ دایكی بەرەو نێچیرگاكەی خۆی لە زاڤیدۆڤ كەوتـە رێ. بێرژنێڤ وێڕای نیشاندانی تاخمی مۆبل و تفەنگە جۆراوجۆرەكانی راوكردن بە دایكـی هەسـتی كرد دایكی زویرە و كتوپڕ لێی پرسی، كە بۆچی زویری و بیر لە چی دەكەیتەوە؟

دایكی وتی: لیۆنید... دەترسم دیسان بۆلشەڤیكەكان بێنەوە و تەواوی ئـەو شـتانەت لـێ بستێننەوە.!

# بەشی دەیەم

## لە ئاندرۆپۆفەوە هەتا گورباچۆف

ململانێ لە سەر جێ نشینیی بێرژنێڤ حەوت ساڵ بەر لە مردنەکەی واتە بە دوای یەکەم جەڵتەی دڵی ئەو لە ساڵی 1975دا دەستی پێکرد. پاش جەڵتە لێدانی بێرژنێڤ لە سەرەتاکانی ساڵی 1975دا ئالیکساندر شلێپێن، کە هێشتا خەونی بە سەرۆکایەتیی سۆڤیەتییەوە دەبینی، بەڵام سۆسلۆڤ، کە لە پیلانی دژ بە خرۆشۆفدا هاوکاریی کردبوو ئەمجارەیان رووی خۆشیی پێ نیشان نەدا. بێرژنێڤیش لە چنگی مەرگ رزگاریی هات و ئیتر دەرفەتی بۆ هەوڵەکانی شلێپێن نەهێشتەوە و ئاکامی ئەو پەلەپەلە ئەوەی لێ شین بۆوە، کە لە شازدەی ئاپریلی 1975دا پۆستی دەفتەری سیاسیی لێ ئەستێنرایەوە و لە گۆڕەپانی سیاسەتی سۆڤیەتی وەدەر نرا.

بێرژنێڤ پاش ئەوەی بۆ دووەمین جار لە ساڵی 1978دا جەڵتە لێیدا خۆی کەوتە بیری هەڵبژاردنی جێ نشین، بەڵام هیچ کام لە ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبی بە شیاوی ئەو پۆستە نەزانی. کەسی دڵخوازی ئەو کابرایەکی بێ نێوونیشان لە نێو ئەندامانی سکرتاریای

حیزبدا بوو بە ناوی کۆنستانتین چرنێنکۆ، کە تازە ببووە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب. چرنێنکۆ، کە لە ساڵی 1967ـەوە سکرتێری بەشی ئیداریی حیزب و لە راستیدا سەرۆکی دەفتەری و هاوکاری بێرژنێڤ بوو لەو کاتدا تەمەنی 67 ساڵ بوو و تەنیا پێنج ساڵ لە بێرژنێڤ کەمتەمەنتر بوو. بێرژنێڤ ساڵی 1979 چرنێنکۆی بەمەبەستی بەشداربوون لە کۆنفرانسی ریبەران و گرێبەستی "ساڵت2" لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ڤیەنناو لە کاتی ئەو کۆنفرانسەدا و پاش ئەویش بە بۆنەی جۆراوجۆرەوە کەوتە تاریف و پەسنی چرنێنکۆ و زیرەکی و وردبینیی وی. لە سەر پێداگریی بێرژنێڤ چرنێنکۆ، کە تەنیا ساڵێك پاڵێوراوی ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیی حیزب بوو کرایە ئەندامی تەواوی دەفتەری سیاسی و هەتا ساڵی 1982، کە بێرژنێڤ مرد بە نوێنەرایەتیی ئەو بەشداری چەندین کۆنفرانسی حیزبی و کۆنگرەی حیزبە کۆمۆنیستەکانی فەرەنسا و دانیمارك و کوبا و ئەڵمانی خۆرهەڵات بوو. لەگەڵ ئەوەشدا چرنێنکۆ، کە پێشینەی ئەندامەتیی لە دەفتەری سیاسیدا لە دوو کەس نەبێ لە هەمووان کەمتر بوو هەتا کاتی مەرگی بێرژنێڤ لە ساڵی 1982 دەرفەتی ئەوەی نەبوو، کە پێگەی خۆی وەکو جێنشینی بێرژنێڤ لە پلەی رێبەرایەتیی حیزبدا مسۆگەر بکا.

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین، کە دوایین هەوڵی بێرژنێڤ بۆ بردنەسەری پلەی چرنێنکۆ وەك ئەندامی بەرزی سکرتاریای حیزب سەری نەگرت و سەرنەگرتن و شکستەکەشی لە هەڵبژاردنی چرنێنکۆدا بۆ جێنشینی سۆسلۆڤ، کە لە ژانوییەی 1982دا مرد لاوازیی پێگەی ئەوی لە ئاستی رێبەریدا لە کۆتایی ژیانیدا دەردەخست. ئەرك و بەرپرسیارەتییەکانی سۆسلۆف، کە گرینگترین ئەندامی دەفتەری سیاسی و سکرتاریای حیزب لە دوای بێرژنێڤ بوو درایە ئاندرۆپۆف ی سەرۆکی کۆمیتەی ئاسایشی دەوڵەتی(کا.گا.ب)، کە لە ساڵی 1973ـەوە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب بوو و هەر لەو رێکەوتەشدا دەرکەوت، کە زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب لە بەرامبەر ئەو کەسەی، کە بێرژنێڤ گەرەکیەتی بیکاتە جێنشینی خۆی دەستیان لە سەر ئاندرۆپۆڤ داناوە.

بێرژنێڤ سەرلە بەیانیی رۆژی دەی نۆڤەمبەری ساڵی 1982 مرد و دەفتەری سیاسی دوانیوەڕۆی هەر ئەو رۆژە و بەر لەوەی خەبەری مەرگی بێرژنێڤ بڵاوبێتەوە بۆ دیاریکردنی جێنشینی ئەو کۆبوونەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا جگە لە ئەندامانی سەرەکیی دەفتەری سیاسی پاڵێوراوانی ئەندامەتی لە دەفتەری سیاسیدا و ئەندامانی سکرتاریاو چەند مارشاڵێکی

سۆڤیەتی بەشدار بوون. بانگهێشتنی فەرماندەرانی سەربازی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە بە روالّەت بە مەبەستی تاوتویّکردنی پرس و رەوشەکانی ئاسایش و تـەناهی لـە کـاتی دەستاودەسـتکردنی دەسەلّاتدا بوو، بەلّامبوونی ئەوان لە کۆبوونەوەکەدا و هاوکـات قورسـایی مارشـال سـتینۆف وەزیری بەرگریی سۆڤیەتی و ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی بۆ ناساندنی کەسی دلّخواز بـۆ جیّنشینی بیّرژنێڤ قورستر دەکرد.

لە کۆبوونەوەی نائاسایی دەفتەری سیاسیی حیزبدا ستینۆف وەزیری بەرگریی سۆڤیەتی لـە پێشنیارکردنی هەلّبژاردنی ئاندرۆپۆفدا بۆ سکرتێری گشتیی حیـزب دەسـتپێشـخەریی کـرد. ئەندامی دەستڕۆیشتووی دیکەش واتە گرۆمیکۆ ئەو پێشـنیارەی بـە بـاش زانـی و گـەنجترین ئەندامی دەفتەری سیاسی واتە گۆرباچـۆف بـە تـین و گـوڕەوە باسـی شـیاوی و لێوەشـاوەیی ئاندرۆپۆفی کرد.

چرنێنکۆ، کە پێی وابوو دۆڕاندوویەتی و لە دوو یا سیّ کەسی ئەندامی دەفتەری سیاسـی پتری لایەنگر نییە، خۆی کەوتە گەلّ لایەنگرانی هەلّبژاردنی ئاندرۆپۆف بـۆ سـکرتێری گشـتی حیزب بۆ ئەوەی لانیکەم پۆستی ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی و سکرتێری کاروبـاری ئیـداریی حیزبیەکەی پارێزراو بیّ. لـە گـەلّ راگەیانـدنی رەزامەنـدیی ئـەو بـۆ پێشـنیاری هەلّبـژێرانی ئاندرۆپۆف بە سکرتێری گشتیی حیزب لایەنگرەکانیشـی کەوتنـە گـەلّ زۆرینـە و پێشـنیاری هەلّبژێرانی ئاندرۆپۆف بۆ جیّنشینیی بیّرژنێڤ بە کۆی دەنگ پەسند کرا.

هەوالّی مەرگی بیّرژنێڤ سەرلە بەیانیی رۆژی یـازدەی نۆڤەمبـەر راگەیەنـدراو پلینـۆمی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیـزب بـۆ پەسـندکردنی دواجـاری بڕیـاری دەفتـەری سیاسـی لەمـەڕ دیاریکردنی سکرتێری گشتیی حیزب، رۆژی دوازدەی نۆڤەمبەر کۆبوونـەوە. ئـەرکی راپـۆرتی دانوستانەکانی دەفتەری سیاسی و پێشنیاری هەلّبـژێرانی ئانـدرۆپۆف بـۆ سـکرتێری گشـتیی حیزب خرایە ئەستۆی چرنێنکۆ بۆ ئەوەی لایەنگرەکانی وی هیچ دژکردەوەیەك نـەنوێنن و بـۆ پاراستنی یەکێتی و یەکگرتوویی حیزب سکرتێری گشتیی تازە بە کۆی دەنگ هەلّبژێردریّ.

2

هەڵبژێرانی ئاندرۆپۆف بۆ جێنشینیی بێرژنێڤ، ئەویش لە مەودای بیست و چوار سەعات پاش راگەیاندنی هەواڵی مەرگی وی کۆر و کۆمەڵەکانی جیهانی راچڵەکاند، لە حاڵێکدا بێرژنێڤ هێشتا نەمردبوو، کە ئامادەکاری کرابوو بۆ هەڵبژێرانی ئاندرۆپۆف بۆ ئەو پۆستە و هەر وەکی ئاماژەشی پێدرا بێرژنێڤ لە کۆتایی تەمەنیدا هەم بە هۆی نەخۆشی و نەبوونی بۆ ماوەی دوورودرێژ لە مۆسکۆ و هەمیش لەبەر مەرگی دەستڕۆیشتووترین و کۆنترین ئەندامی لایەنگری خۆی لە دەفتەری سیاسی و سکرتاریای حیزبدا، واتە میخاییل سۆسلۆڤ ئیتر نەیدەتوانی بیروبۆچوون و باوەڕەکانی خۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێ. جگە لەوەش ئاندرۆپۆف لەو کاتەوە، کە لەساڵی 1967دا سەرۆکایەتیی کۆمیتەی تەناهیی دەوڵەتیی(کا.گا.ب)ی پێئەسپێردراوردە وردە و بە بێ دەنگی ئامادەکاریی دەکرد بۆ گەیشتن بە لووتکەی دەسەڵات، بە شێوەیەك، کە لە ژانوییەی 1982دا پاش مەرگی سۆسلۆڤ زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسی و سکرتاریای حیزب بە پێچەوانەی ویستی بێرژنێڤ ئەویان کردە ئەندامی بەرزی دەفتەری سیاسی و سکرتاریای حیزب و لە دەزگای رێبەریدا ئەرکی هەستیاری رێبەرایەتیان پێ ئەسپارد.

یوری ڤیلادیمیر ئاندرۆپۆف رۆژی پازدەی ژووئەنی 1914 لە وێستگەی شەمەندەفەری ناگۆتسکایای باکووری قەفقاز لە دایك بوو. باوکی کرێکارێکی هێڵی شەمەندەفەر بوو. یوری پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی وەك تەلەگرافچی و دواتر لە سەر کەشتییە بارهەڵگرەکانی سەر رووباری ڤۆلگا کاری دەکرد. یوری ئاندرۆپۆف لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا بوو بە ئەندامی رێکخراوی لاوانی کۆمۆنیست(کامسۆمۆل)و هاوکات لە قوتابخانەیەکی دواناوەندیشدا ناونوسیی کرد و ساڵی 1936 ئەو قوتابخانەیەی تەواو کرد. لەو رێکەوتە بە دواوە ئاندرۆپۆف وەك سکرتێری بەرپرسی یەکێك لە یەکێتییەکانی رێکخراوی لاوانی کۆمۆنیست لەو رێکخراوەدا خەریکی کار بوو و لە کاتی پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالیندا، کە ژمارەیەك لە رێبەرانی رێکخراوی لاوانی کۆمۆنیستیشی لە خۆ دەگرت گەیشتە ئاستی بەرپرسانی باڵای ئەو رێکخراوە.

ئاندرۆپۆف لە ساڵی 1939 ـەوە بە ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وەرگیراو لە کاتی شەڕی جیهانی دووەمدا وەکو کۆمیسێری حیزب لە رێکخراوە چریکییەکانی "کارلیا"ی نێوان سۆڤیەتی و فەنلاندا خزمەتی کردووە و تێکۆشاوە. ئاندرۆپۆف لە ماوەی خزمەتکردنیدا لەو ناوچانە رۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە راگواستنی چەك وچۆل و تەقەمەنی و بژیو، کە لە

ڕێگەی بەندەری مۆرمانسکەوە بۆ روسیا بەڕێدەکران و بە هۆی ئـەوەی لەگـەڵ کاربەدەسـتانی هاوپەیماندا لە پێوەندیدا بووە فێری ئینگلیزییش ببوو.

یوری ئاندرۆپۆف دوای کۆتایی هاتنی شەڕ بۆ مۆسکۆ بەڕێکراو لە بەشی پێوەنـدی لەگـەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی لە سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیدا خەریکی کار بوو. ساڵی 1953 بـۆ وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتی راگوێزراو وەك راوێژکاری باڵوێزی سۆڤیەتی لـە هـەنگاریا بـەڕێی بۆداپێست کرا.

ئاندرۆپۆف پاش نزیکەی ساڵێك خزمەتکردن لە بوداپێست بە باشی فێری زمانی هـەنگاری بوو و لە ساڵی 1945دا پۆسـتی بـاڵوێزیی پێـدرا. لـە هێنـدێ سەرچـاوەدا نووسـراوە، کـە ئاندرۆپۆف لە کاتی راگوێزرانی بـۆ وەزارەتـی دەرەوەی سـۆڤیەتییەوە لـە سـاڵی 1935دا و یەکەمین بەرپرسیارەتییەك، کە لە دەرەوەی وڵات پێی درا ئەندامی سەر بە رێکخراوی ئاسایش و تەناهیی سۆڤیەتی بووە و هەر بەو پێشینەیەشەوە کراوەتە سەرۆکی کا.گا.ب.

یەکەمین رووداوی ژیانی سیاسیی ئاندرۆپۆف رۆڵی ئەو بـوو لـە سـەر کـوتی سـەرهەڵدانی 1956ی خەڵکی هەنگاریادا. ئاندرۆپۆف وەکو باڵوێزی سۆڤیەتی لە هەنگاریا لـە جەنگـەی گۆڕانەکانی ساڵی 1956 ی ئەو وڵاتەدا، کە دەستێوەردانی سەربازیی سۆڤیەتی و دامەزرانی حکوومەتێکی گوێ لەمستی مۆسکۆی لێکەوتەوە بە دڵنیاییەوە رۆڵێکی کاریگـەری گێـڕاوە، بەڵام ژورێس مێدڤێدێڤ ی نووسەری ناوداری روسی، کە لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد لـە کتێبێکدا بە ناوی ئاندرۆپۆف، کە ساڵی 1984 بڵاوی کردۆتەوە دەنووسێ:" چیرۆکگەلێکی لەو شێوەیە، کە ئاندرۆپۆف راستەوخۆ لە هەڵفریواندن و لە دا و خستنی رێبـەرانی هەنگاریـدا رۆڵی گێڕاوە و بەرپرسی راستەوخۆی ئیعدامی "ئیمرێ نـاگی" و رێبـەرانی تـری ئـازادیخوازی هەنگاریایە درۆیە و راست نییە و تەواوی ئەوەی کە لە سـاڵی 1956دا لـە هـەنگاریا هاتـە پێشێ لە لایەن خودی خرۆشۆف و نێردراوەکانییەوە بۆ هەنگاریا، واتـە لـە لایـەن سۆسـلۆڤ و میکۆیانەوە بەڕێوە چووە. دیارە ئاندرۆپۆف وەك باڵوێزی سۆڤیەتی، کە لە سـاڵی 1953 بـە دواوە لە هەنگاریا بووە و لەگەل زۆربەی سەرکردەکانی ئەوێ دۆسـتایەتیی هـەبووە هاوکـاریی چڕوپڕی سۆسلۆڤـــــ و میکۆیانی کردووە بە شێوەیەك سەرنج و رەزامەندیی ئەوانی راکێشاوە، کە ساڵێك دواتر بانگ دەکرێتەوە بۆ مۆسکۆ و لە سکرتاریای حیزبدا کراوەتە سەرۆکی ئیدارەی پێوەندییەکانی سۆڤیەتی لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی.

ئاندرۆپۆف هەتا ساڵی 1961، کە سەرۆکایەتیی ئەو ئیدارییەی لە ئەستۆ بوو کۆمەڵە سەفەرێکی بۆ وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی و ڤێتنامی باکووری کرد و لەو ماوەیەدا راستەوخۆ هاوکاریی سۆسلۆڤی دەکرد. ئاندرۆپۆف لە ساڵی 1961دا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەڵبژێردراو ساڵێك دواتر وەك یەکێك لە سکرتێرەکانی کۆمیتەی ناوەندی بوو بە ئەندامی سکرتاریای حیزب. ئاندرۆپۆف لەو بەشەدا ئەرکی پێوەندیی نێوان حیزب و کۆمیتەی تەناهیی دەوڵەتی یا "کا.گا.ب" شی لە ئەستۆ بوو و لە سەفەرەکانی خرۆشۆفدا بۆ نێوخۆ و دەرەوەی وڵاتدا لەگەڵیدا دەبوو.

ئاندرۆپۆف لە جەنگەی لە سەر کار لابردنی خرۆشۆفدا لە ساڵی 1964دا هاوکاریی سۆسلۆڤ و بێرژنێڤی کرد و پێگەی خۆی لە سکرتاریای حیزبدا مسۆگەر کرد. ساڵی 1967 بێرژنێڤ لە سەر پێشنیار و راسپاردنی سۆسلۆف کردیە سەرۆکی کا.گا.ب و بە دوای ئەوەدا وەکو پاڵێوراوی ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی ناودێر کرا. لە جەنگەی رووداوەکانی چیکۆسلۆڤاکیادا، کە دەستێوەردانی سەربازیی سۆڤیەتی و ئەندامانی پەیمانی وەرشۆی لێکەوتەوە ئاندرۆپۆف یەکێك لە راوێژکارانی بێرژنێڤ بوو لە سەفەرەکانی بێرژنێڤدا بۆ چیکۆسلۆڤاکیاو وڵاتانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ لەگەڵیدا دەچوو.

ئلتدرۆپۆف نزیکەی پازدە ساڵ (لەساڵی 1967 ـەوە هەتا 1982) سەرۆکی کا.گا.ب یان رێکخراوی زانیاری و پاراستنی سۆڤیەتی بوو و لە ساڵی 1973 ـەوە جگە لەو پۆستە ئەندامی سکرتاریای حیزبی کۆمۆنیستیشدا واتە بەرزترین ئۆرگانی بڕیاردەری سۆڤیەتییش بوو. ئاندرۆپۆف لە ماوەی پازدەساڵ سەرۆکایەتی بەسەر کا.گا.ب دا، کە درێژماوەترین سەرۆکایەتیی کەسێکە بەسەر رێکخراوی تەناهی و ئاسایشی سۆڤیەتدا ئەو رێکخراوەی کردە بەهێزترین و گەورەترین رێکخراوی زانیاری و سیخوڕی لە جیهاندا. زۆر شت لە سەر کارەسات و جەنایەتەکانی کا.گا.ب لەو قۆناغەدا نووسراوە، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە، کە توند و تیژیەکانی ئەو رێکخراوەیە لە سەردەمی سەرۆکایەتیی ئاندرۆپۆفدا بۆ سەر دژبەران و رەخنەگران لە چاو رێکخراوی ئاسایش و تەناهیی سەردەمی ستالین و تەنانەت سەردەمی خرۆشۆفیش شتێکی ئەوتۆ نییە. راستە کا.گا.ب لە بە پێی سیاسەتی دەوڵەت و حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی گەلێك کەسی قۆڵبەست و بەرێی گرتوخانە کرد یا دووری خستنەوە و یا لە سۆڤیەتیی وەدەرنان یا هێندێ کەسی ناردنە نەخۆشخانەی نەخۆشییە دەروونییەکان(شێتخانە)، بەڵام راپۆرتێك لە ئیعدامی زیندانیی سیاسی لەو سەردەمەدا

نەخراوەتە روو و لەمەڕ هێندێ لە تۆخترین دژبەرانی سیاسەتی سۆڤیەتی وەك سۆلیژنێتسین، کە لە سەردەمی ستالیندا بێ ئەملاوئەولا ئیعدام دەکران بە دوورخستنەوە یـا دەرکـردن لـە وڵات وازیان لێ هێنراوە. تەنانەت ژۆرێس مێدڤێدێڤ، کـە خـۆی یەکێکـە لـە قوربانیـانی شـێوەی بەندکرانی رەخنەگرانی سیاسی لە نەخۆشخانەی شێتاندا و لە ساڵی 1973داواتـە لـە کـاتی سەرۆکایەتیی ئاندرۆپۆف بەسەر کا.گا.ب لە سۆڤیەت دەرکراوە ئەو بە کابرایـەکی رۆشـنبیر و نەرم ونیان ناو دەبا، کە لە ماوەی سەرۆکایەتیی خۆیدا بەسەر کا.گا.ب دا پێی لە بەرەی خۆی درێژتر نەکردووە و لە زێدەرۆیی خۆی بواردوە.

ئاندرۆپۆف لە ماوەی سەرۆکایەتی بەسەر کا.گا.ب دا تۆڕەکانی ئەو رێکخراوەیەی لـە نێـو رێکخراو ئۆرگانەکانی حیزبی و وەزارەتخانە و دامودەزگا دەوڵەتییەکانی سۆڤیەتدا پەرە پێـدا و لە کۆتایی حکوومەتی بێرژنێڤدا شێلگیرانە هەوڵی بنەبڕکردنی ئەو گەندەڵییەیدا، کە حیـزب و دامودەزگا دەوڵەتییەکانی داگرتبوو. کۆمارییەکانی ئازەربایجان و گورجستان گۆڕەپانی بەرینی ئەو هەولاو خەباتە بوون و سەرۆکەکانی کا.گا.ب لـەو دوو کۆمارییـەدا پۆسـتی رێبەرایـەتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئەو کۆمارییانە و دواتر پلەی پـاڵێوراویی ئەندامـەتی دەفتـەری سیاسـیی حیزبیان پێدرا، بەڵام گەورەترین سەرکەوتنی ئاندرۆپۆف لە ماوەی سەرۆکایەتی بەسەر کا.گا.ب دا پەرە پێـدان بـە چـالاکییەکانی ئـەو رێکخراوەیـە لـە دەرەوەی وڵات و تەشـەنەکردنە نێـو رێکخراوە دەوڵەتی و سەربازی و تەنانەت ئۆرگانەکانی پارستن و تـەناهیی وڵاتـانی خۆرئـاوایی بوو. کاربەدەستانی کا.گا.ب لەو ماوەیەدا گەلێك نهێنیـی زانسـتی و سـەربازیی خۆرئاوایـان بەدەست کەوت و بە راگواستنی ئەو زانیارییانە و گەیاندنیان بە دەستی بەرپرسانی وەزارەتـی بەرگریی سۆڤیەتی توانایی سەربازیی ئەو وڵاتەیان بردە سەرێ. بەو شێوەیە پێوەندییەکی نزیك و چڕ لە نێوان ئاندرۆپۆف و وەزیـری بـەرگری و فەرمانـدەرانی سـوپادا دامـەزرا و هـەروەکی ئاماژەی پێکرا ئەوە ستینۆفی وەزیری بەرگریی سۆڤیەتی بوو، کە بۆ یەکەمین جار لە دەفتـەری سیاسیدا ناوی ئاندرۆپۆف وەکو پاڵێوراوی جێنشینیی بێرژنێڤ هێنایە گۆڕێ.

گەڕانەوەی ئاندرۆپۆف بۆ سکرتاریای حیزب دوای مەرگی سۆسلۆڤ یش لە ژیـانی ویـدا بـە خاڵێکی وەرچەرخانی گرینگ لەقەڵەم دەدرێ. سۆسلۆڤ لە ژانوییەی 1982دا نزیك دە مانگ بـەر لـە مـەرگی بێـرژنێڤ مـرد و ئانـدرۆپۆف هـەر لـەو مـاوە کورتـەدا، کـە ئـەرك و بەرپرسیارەتییەکانی ئەوی لە سکرتاریای حیزبـدا گرتـە ئەسـتۆ دەسـەڵات و سـەربەخۆییەکی سەرنجراکێشی لە خۆی نیشان دا. هێندێ لەو فایلە گەندەڵییانەی، کە لە رێکخراو و دامودەزگا

حکوومییەکاندا لە سەر دۆستان و خزم و کەسانی بێرژنێڤ بە تایبەتی یوری بێرژنێڤ ی کوڕی، کە جێگری وەزیری بازرگانیی سۆڤیەتی و گالینای کچی، کە جێگری وەزیری نێوخۆ بوو گران دەوەستان، و لە سەردەمی سۆسلۆڤدا بێدەنگەیان لێکرابوو دیسان وەگەڕ کەوتنەوە، و خۆ تێهەڵقورتاندنی بێرژنێڤ تەنیا بووە هۆی ئەوەی کە نەهێڵێ هەتا ئەو زیندووە لێکۆڵینەوەی ئەو فایلانە ئاشکرا بکرێ.

ئاندرۆپۆف هاوکات لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ سکرتاریای حیزب وازی لە سەرۆکایەتیی کا.گا.ب هێنا لە دەسنیشانکردنی جێنشینەکەیدا راوبۆچوونی بێرژنێڤ بە هێند وەرنەگیرا. بێرژنێڤ دەیویست یەکێك لە جێگرەکانی ئاندرۆپۆف لە کا.گا.ب دا، کە سەر بەو بوو بکرێتە سەرۆکی کا.گا.ب، بەڵام ئاندرۆپۆف سەرۆکی کا.گا.ب یێ ئۆکراینی بە ناوی ڤیتالی فێدۆرچۆك بۆ جێ نیشنیی خۆی پێشنیار کرد و دەفتەری سیاسی پێشنیارەکەی ئەوی وەرگرت. فێدۆرچۆك دەستپەروەردەی ئاندرۆپۆف و لە هەمو بارێکەوە گوێڕایەڵی ئەو بوو و ئاندرۆپۆف بە دانانی ئەو هێژمۆنی و چاوەدێریی خۆی لە سەر ئۆرگانە تەناهی و ئاسایشییەکانی وڵات پاراست.

بەو دەسەڵاتەی ئاندرۆپۆف لە دەفتەری سیاسی و سکرتاریای حیزب و لە نێو هێزە چەکدارەکان و ئۆرگانە تەناهییەکانی سۆڤیەتیدا وەدەستی هێنابوو هەڵبژێرانی بۆ جێنشینیی بێرژنێڤ سرووشتیی دەنواند و ئەوەش، کە خۆرئاوا لەو مەسەلەیەدا سەری بێ کڵاو مایەوە نیشانەی لاوازیی رێکخراوە زانیاری و سیخوڕییەکانی ئەوان بوو. ئەو زانیاریانەی، کە دوای مەرگی بێرژنێڤ وەدەست کەوتن نیشاندەری ئەوە بوون، کە لە سەرەتاکانی 1982 ـەوە پێگە و دەسەڵاتی بێرژنێڤ وەك رێبەری سۆڤیەتی تەواو لاواز ببوو و زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب شێلگیرانە پشتیوانی و لایەنگرییان لە ئاندرۆپۆف و بەرنامە دژەگەندەڵییەکانی وی دەکرد بە شێوەیەك ئەگەر بێرژنێڤ لە کۆتاییی ساڵی 1982دا بە مردنی خۆی نەمردبا زۆر پێدەچوو، کە لە ساڵی 1983دا کاردروستاییی بۆ لێ خستنی لە دەفتەری سیاسی و کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بکرێ و ئەگەر ئەوەش کرابایە ئەوا جیا لە ئاندرۆپۆف کەسی دیکە نەدەبووە جێنشینی ئەو.

## 3

ئاندرۆپۆف، کە هەتا پێش هەڵبژێرانی بۆ جێنشینیی بێرژنێڤ لە دەرەوەی وڵات ناوبانگێکی نەبوو هەر لە رێوڕەسمی ناشتنی بێرژنێڤدا خۆی بە خەڵکی جیهان ناساند و

ڕێبەرانی وڵاتان، کە بۆ بەشداری لەو ڕێوڕەسمەدا چوبوونە مۆسکۆ ئەویان بە سەرکردەیەکی زیرەك و هۆشیار و بە سیاسەتڤان ناسی. ئەو بەسەرهات و زانیارییانەی، کە لە سەر ڕەوشت و تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکان و باوەڕەکانی ئاندرۆپۆف وەدەست بڵاڤۆکی خۆرئاوایی کەوتن تێیاندا ئەو وەکو کابرایەکی زاناو خوێندەوار و هونەر خۆشەویست و نەرم ونیان و کتێب خوێنەرەوە ناساند و ئامانجی دیاری ئەو بانگەشەکارییانەش پووچەڵکردنەوەی کاریگەریی نەرێنیی پازدەساڵ پێشینەی سەرۆکایەتیی ئەو بەسەر ڕێکخراوی سامناك و ناوزڕاوی کا.گا.ب دا بوو. ئاندرۆپۆفیش هەر وەکو تەواوی ڕێبەرانی سۆڤیەتی لە سەرەتادا هەموو سەرنجی خۆی دایە کاروبار و مەسەلە نێوخۆییەکانی سۆڤیەتی و بەر لە هەر شتێك لە ڕێبەرایەتی و دەوڵەتی سۆڤیەتیدا پێگەی خۆی پتەو کرد. ئەو میخاییل گورباچۆڤی، کە ئەوکات گەنجترین ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو کردە جێگریی خۆی لە سکرتاریای حیزبدا و حەیدەر عەلیۆڤی سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی ئازەربایجانی سۆڤیەتیی کردە ئەندامی ئەسڵیی دەفتەری سیاسی و نیکۆلای ڕیژکۆڤ، کە پسپۆڕێکی گەنجی بواری ئابووریی سۆڤیەتی بوو کردە سکرتێری کۆمیتەی ناوەتندیی حیزب. حەیدەر عەلیۆف، کە یەکێك بوو لە دەستپەروەردەکانی ئاندرۆپۆف و ماوەیەك سەرۆکی کا.گا.ب ێی ئازەربایجانی سۆڤیەتی بوو جگەلەوە، کە کرایە ئەندامی دەفتەری سیاسی، پۆستی جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتییشی پێ ئەسپێردراو بەو ڕابردوە درەوشاوەیەی، کە لە خەباتی دژی گەندەڵی لە ئازەربایجاندا وەدەستی هێنابوو خەبات دژی گەندەڵیی لە ئاستی وڵاتدا پێ ئەسپێردرا.

یەکەمین ڕاپۆرتی پێوەندیدار بە ڕەهەندی بەربلاوی گەندەڵیی سەردەمی بێرژنێڤ لە نێوەڕاستی مانگی دیسێمبەردا واتە مانگێك پاش هەڵبژێرانی ئاندرۆپۆف بۆ سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە چاپەمەنییەکاندا بڵاو بۆوە و یەکەمین گۆڕانی گرینگ لە ئاستی بەرپرسانی دەوڵەتیدا ڕۆژی حەڤدەی دیسێمبەر کرا. لەو گۆڕانانەدا ژەنەراڵ شێچێلۆکۆڤ دۆستی نزیك و هاوشاریی بێرژنێڤ، کە لە ساڵی **1966** ـەوە واتە شازدە ساڵ وەزیری وڵات بووە لە سەر کار لابراو فێدۆرچۆك ی سەرۆکی کا.گا.ب کرایە جێنشینی وی. ئەو زانیارییانەی دواتر لە سەر چەوتییەکانی شێچێلۆکۆف بڵاوبوونەوە نیشاندەری ئەوە بوون، کە لەو سەردەمەیدا، کە پۆستی وەزارەتی نێوخۆی سۆڤیەتیی بەدەستەوە بووە لەگەڵ جێگرەکەی یوری چۆربانۆف ی زاوای بێرژنێڤ بە ملیۆنان ڕۆبڵیان لە دارایی دەوڵەت پاشقول داوە و ژیانێکی

خۆشیان بۆخۆیان پێکەوە ناوە. چۆربانۆفیش برێك پاش لە سەر کار لابرانی شێچێلۆکۆف وەلا نراو بە تۆمەتی کەڵکی خراپ وەرگرتن لە دارایی دەوڵەتی و بەرتیل خۆری راوەدوونرا.

خەبات دژی مۆرە گەندەڵەکانی سەردەمی بێرژنێڤ، کە لە بلاّقۆکی خۆرئاواییدا بە "مافیای بێرژنێڤ" ناوی دەرکردبوو بە وەلانرانی وەزیری بازرگانیی سۆڤیەت ئالیکساندر ستروٚیڤ درێژەی کێشا. وەزارەتی بازرگانی یەکێك لە گەندەڵترین وەزارەتخانەکانی سەردەمی بێرژنێڤ بوو، کە تێیدا پەردە لە سەر کۆمەڵێك دزی و پاشقولدان لە کڕین و دابەشینی کالاّ و کەلوپەلی بەکارهێنان و خواردندا هەڵدرابۆوە. دەستڕۆیشتووتۆین بەرپرسی ئەو وەزارەتخانەیەش یوری بێرژنێڤ بوو، کە وەك جێگری یەکەمی وەزیری بازرگانی، بەسەر کاروباری بازرگانیی دەرەکیدا رادەگەیشت و بۆ جێبەجێکردنی ساتوسەودای بازرگانی بەردەوام لە سەیران و سەفەردا بوو. لە سەر کار لابرانی ستروٚیڤ وەلانرانی یوری بێرژنێڤیشی بە دواوە بوو، بەلاّم هیچ زانیارییەك لە سەر فایلەکەی ئەو وەکو کەڵکی خراپ وەرگرتن لە پلەوپایە و بە فیڕۆدانی دارایی دەوڵەت بلاّو نەبۆوە.

ئامارگەلی پێوەندیدار بە پێشکەوتنی بەرنامە ئابوورییەکانی سۆڤیەتی لە ساڵی 1982 یا دواین ساڵی حکوومەتی بێرژنێڤدا، کە ساڵی 1983 بلاّو بوونەوە بێ ئاکامیی بە تەواو مانای زۆربەی ئامانج و مەبەستە پێشبینی کراوەکانی بەرنامەی ئابووریی ولاّتی پێوە دیاربوو. بەرنامەی پێنج ساڵەی ئابووریی سۆڤیەتی رادەی گەشە و پێشکەوتویی ساڵی 1982 ی چوار لەسەد پێشبینی کردبوو لە حاڵێکدا گەشەی ئابووریی ولاّت لە ساڵی 1982دا گەیشتبووە 2/8 لەسەد، واتە دابەزیبووە کەمترین رادەی گەشەکردنی مێژووی سۆڤیەتی. تەنیا بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لە چاو چوار ساڵ پێش، چوار لەسەد زیادی کردبوو، کە ئەویش سەرکەوتنێکی ئەوتۆ نەبوو، چونکی ئاستی بەرهەمە کشتوکاڵییەکانی ساڵی 1981 بە هۆی خراپبوونی باری کەش و هەوا زۆر لە خوارێ بوو و دەوڵەتی سۆڤیەتی ناچار بوو بۆ قەرەبووی کەمایەسیی بژیو و تفاقی ئاژەلاّن نزیك بە چل ملیۆن تەن گەنم و گەنمەشامی و برینج و دانەوێڵەی دیکە بکڕێ.

لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا، ئاندرۆپۆف لە یەکەمین چاوپێکەوتنەکانیدا لەگەڵ رێبەران و بەرپرسانی ولاّتانی دەرەکیدا، بۆ وێنە بووش ی جێگری سەرۆك کۆمار و شۆلتێرز وەزیری دەرەوەی ئەمریکادا، کە بۆ بەشداری لە رێوڕەسمی ناشتنی بێرژنێڤدا چوبوونە مۆسکۆ نیشانی دا، کە حەزی لە کۆتاییهێنانە بە گرژی و ئالۆزییەکانی نێوان خۆرهەلاّت و خۆرئاوا، بەلاّم

سەرەتای حکوومەتەکەی ئەو هاوکات بوو لەگەڵ بڕیاری ڕێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری(ناتۆ) لە سەر دامەزراندنی مووشەکی پرشینگ و کرووزی ئەمریکی لە ئەورووپای خۆرئاوایی و دەوڵەتی سۆڤیەت ناچار بوو بۆ پێشگرتن لە دامەزرانی ئەو مووشەکانە لە ئەورووپای خۆرئاواییدا دەست بکا بە بانگەشە و پروپاگەندەی بەربڵاو. ڕۆژی 31ی ژانویەی ساڵی 1983 ڕەیگان سەرۆك کۆماری ئەمریکا ڕایگەیاند، کە ئامادەیە بۆ بەستنی پەیمانێك لە سەر کۆکرنەوەی تەواوی مووشەکە ناوکییەکان لە ئەورووپای خۆرئاوایی لەگەڵ ئاندرۆپۆف دانوستان بکا. ئەگەر سۆڤیەت ئەو چاوپێکەوتنەی قبووڵ کردبایە دەبوایە سەدان مووشەکی جۆری (ئێس، ئێس، 20) ی سۆڤیەتیی لە ئەورووپای خۆرهەڵاتی کۆبکاتەوە. هەر بۆیەش ئەو پێشنیارە وەکو تاکتیکێکی بانگەشەیی و پروپاگەندەی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە لایەن سۆڤیەتەوە وەرنەگیرا. ڕۆژی هەشتەمی مارسی 1983 ڕەیگان لە ئاخافتنێکدا لە کۆڕێکی ئایینیدا بەزمانێکی زۆر تاڵ قسەی لە سەر سۆڤیەتی کرد و سۆڤیەتیی بە ئیمپراتۆرییەکی شەیتانی ناو برد. ڕۆژی بیست و سێیەمی مارس ڕەیگان لە لێدوانێکی گرینگدا ڕایگەیاند، کە گۆڕانێکی گرینگی لە ستراتژیی ئەمریکادا کردووە و گوژمەیەکی زۆری بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی دژە موشەکی تەرخان دەکا.ڕەیگان بۆ پاکانەی ئەو گەڵاڵەیەی خۆی، کە دواتر بە پڕۆژەی شەڕی ئەستێرەکان ناوی دەرکرد گوتی سۆڤیەتییەکان بە شێوەیەکی مەترسیدار مووشەکە ناوکییەکانی خۆیان پەرە پێداوە و ئەمریکا دەبێ پشتێندێکی بەرگری و خۆپاراستن بۆ مووشەکەکانی دوژمن ساز بکا بەر لەوەی بگەنە سەری.

ئاندرۆپۆف لە وەڵامی ڕەیگاندا دژکردەوەیەکی توند و چاوەڕواننەکراوی نواند و ڕەیگانی بە درۆزن ناو برد، کە سۆڤیەتی بەوە تۆمەتبار دەکا، کە خەریکی ئامادەکاری بۆ هێرش بۆ سەر ئەمریکایە. ئاندرۆپۆف هەروەها گوتی مەبەستی ڕاستەقینەی گەڵاڵەکەی ڕەیگان ئەوەیە، کە نەهێڵێ ئەگەر ئەمریکا هێرشی کرد سۆڤیەتی تۆڵەی خۆی بکاتەوە و وێڕای ڕەتکردنەوەی بانگەشەکانی ڕەیگان لەمەڕ زیادبوونی چەکوچۆڵ ی مووشەکیی و ناوکیی سۆڤیەتی دژی ئەمریکاوتی:، کە لە بواری چەکی مووشەکی و ناوکییەوە باڵانسێکی ڕێژەیی لە نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا هەیە و مەبەستی پروپاگەندەی ئەمریکییەکان لە سەر زیادبوونی چەکی مووشەکی و ناوکیی سۆڤیەتی لە چاو ئەمریکا، ئەویە، کە بیر و ڕای گشتیی ئەمریکییەکان و کۆنگرەی ئەمریکا قایل بکەن بۆ ئەوەی کە گوژمە و بودجەیەکی پتر بۆ مەکینەی جەنگیی خۆیان تەرخان بکەن.

ئاندرۆپۆف لە وەڵامی قسەکانی رەیگاندا ئاماژەی بەو ئامارانە کرد، کە لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە سەبارەت بە باڵاتر بوون و بەهێزتربوونی توانای سەربازیی سۆڤیەتی لە چاو ئەمریکا بڵاو بوونەوە. بە پێی ئەو ئامارگەلـە، کـە لـە راپۆرتێـك بـە نـاوی (توانـای هێـزی سەربازیی سۆڤیەتی) لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە بڵاو بۆتەوە، دەڵێ: لە مـاوەی دە ساڵی رابردوودا واتە لە ساڵانی 1972 وە هەتا 1982 یەکێتیی سۆڤیەتی زیاتر لـە 200 مووشەکی وشکارۆپێوی ساز کردووە لە حاڵێکدا ئەمریکا لەو ماوەیەدا تەنیا 350دانەی لەو جۆرە ساز کردووە. هەر لەو ماوەیەدا سـۆڤیەتی 6000 فڕۆکـەی جـەنگیی لـە فڕۆکـەکانی پێووی زیاد کردووە لە حاڵێکدا ژمارەی فڕۆکەی سازکراوی ئەمریکا لەو ماوەیەدا 3000دانە واتە نیوەی سۆڤیەتییە. بڵاوکراوەی پێنتاگۆن لە درێژەیدا دەڵێ:" لە ماوەی دە ساڵی رابردوودا روسەکان 85 پاپۆڕی جەنگی و 61 ژێردەریاییان خستۆتە سەر پاپۆڕە جەنگییـەکانیان. لـە حاڵێکدا ئەمریکا هەر لەوەندە ماوەیەدا 72 پاپۆڕی جەنگی و 27 ژێردەریایی ساز کـردووە. لە بواری چەکوچۆڵ ی هێزی زەوییەوە پێشکەوتنی روسییەکان بەرچاوە بۆ وێنـە لـە دە سـاڵی رابردوودا 54000 دەبابەیان ساز کردووە، ژمارەی ئـەو دەبابانـەی، کـە لـەو ماوەیـەدا لـە ئەمریکا ساز کراون نزیك بە یەك لە پێنجی بەرهەمی سۆڤیەتی واتە 11000دانەیە."

وەین بەرگـەر وەزیـری بـەرگریی ئـەمریکا لەمـەڕ چـۆنایەتی و توانـای چـەکە تازەکـانی سۆڤیەتییەوە راپۆرتێکی راچڵەکێنەری داوەتە کۆنگرەی ئەمریکاو بۆ وێنە گـوتی ژێردەریاییـە تازە ناوکییەکانی سۆڤیەتی هەرکام تەیارن بـە مووشـەکێکی ۆشـکارۆپێو و هەرکامێکیشـیان شەش هەتا نۆ کلاوکی ناوکییان لە سەر ە. ئەو موشەکانە هـەتا هەشـت هـەزار کیلـۆ مـەتر بڕدەکەن و ژێردەریاییەکانی سۆڤیەتی دەتوانن لە ئاوەکانی نزیك لێواری خۆرهەڵاتی سیبریایەوە یا لە خۆرهەڵاتی ئۆقیانووسی گەورەوە شـار و ناوەنـدە سـەربازی و سـتراتژییەکانی ئـەمریکا بپێکن. وەین بەرگەر هەروەها گوتی ژمارەی مووشەکەکانی ناسراو بـە (ئـێس ئـێس 20) ی سۆڤیەتی، کە لە ئەورووپای خۆرهەڵاتی دامەزرێنراون و دەتـوانن تـەواوی شـار و ناوەندگـەلی سەربازی و ستراتژیی ئەورووپای خۆرئاوایی بپێکن لە ساڵی 1981دا 250 سەکۆی هاویشتن بوون و لە ساڵی 1983دا بوونەتە سەکۆو هەروا بەرەوە سەرتر دەڕوا.

وەین بەرگـەر لـە راپۆرتەکەیـدا بـۆ کـۆنگرە ئامـاژەی بـە ژمـارەی ئـەو مووشـەکە وشکارۆپێوانە کرد، کە بە "بەك فایر " ناسراون و دەتوانن بۆمبی ناوکی هەڵگرن و گوتی، کە ئەگەر شەڕێکی جیهانی هەڵاییسێ هیچ بستۆکەیەکی خۆرئاوا لە مووشـەك و فڕۆکـە

چەکی ناوکی هەڵگرەکانی سۆڤیەتی پارێزراو نین و ئەمریکا بۆ پاراستنی تەناهی و ئاسایشی خۆی ناچارە گەڵاڵەی سەرۆك کۆمار رەیگان بۆ پەرە پێدانی سیستەمێکی دژە مووشەکی جێبەجێ بکا. وەزیری بەرگریی ئەمریکا هەروەها وریایی دا، کە جێبەجێکردنی ئەو گەڵاڵەیە و سازکردنی پشتێندێکی بەرگری بە دەوری ئەمریکادا و پەرەپێدانی ئەو شتە، چەندین ساڵان دەخایەناو ئەمریکا لەو ماوەیەدا دەبێ رادەی بەرهەمهێنانی مووشەك و فڕۆکە و ژێردەریاییەکانی بەرێتە سەرێ.

سەرەڕای ئەو شەڕە بانگەشەییەی، کە بە دوای راگەیاندنی گەڵاڵەکەی رەیگان لە نێوان مۆسکۆ و واشنگتۆندا هەڵاییسا، هەر دوو وڵات دواجار لە سەر زیندووکردنەوەی دانوستانەکانی پێوەندیدار بە بەستنی پەیمانێکی تازە بۆ سنووردارکردنی چەکە ستراتژییەکان رێککەوتن و خولی نوێی دانوستانەکان بە ناوی کورتکراوەی "ستارت" یا دانوستانەکانی کەمکردنەوەی چەکە ستراتژییەکان ناوی دەرکردووە و لە کۆتایی بەهاری ساڵی 1983دا دەستی پێکرد، بەڵام سۆڤیەتی و ئەمریکا لە بووژاندنەوی دانوستانەکانی پێوەندیدار بە کەمکردنە وی چەکە ستراتژییەکان مەبەستی دیکەیان دەپێکا. ئەمریکا، کە دەویست دواکەوتوویی‌یەکەی لە سۆڤیەتی بە دامەزراندنی سیستەمێکی بەرگریکاری کاریگەر قەرەبوو بکاتەوە زیاتر بۆ رەواندنەوی نیگەرانیی هاوپەیمانەکانی لە دوارۆژ و ئاکامی ناکۆکیی نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتی و لە ژێر زەختی بیر و رای گشتیی خەڵکی جیهانیشدا ملی بۆ دانوستانی کەمکردنەوەی چەکە ستراتژییەکان راکێشاو سۆڤیەتییش، کە نیگەرانی گەڵاڵە تازەکەی ئەمریکاو ئەگەری تێکچوونی باڵانسی هێز بە زیانی خۆی بوو، بە هیوای کەمکردنەوەی گرژییە دیپلۆماتیکییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاواو ناچارکردنی ئەمریکا بە پێداچوونەوەیەك بە بەرنامە سەربازییە تازەکانیدا پێشوازیی لە خولی نوێی دانوستانەکان کرد، بەڵام ئەوەی کە بە لای سۆڤیەتییەوە زۆر گرینگ و جێی بایەخ بوو دامەزراندنی مووشەکی جۆری کروز و پرشینگ2 ی ئەمریکی لە ئەورووپا بوو، چونکی رێکخراوی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری (ناتۆ) پێشنیاری ئەمریکای بۆ دامەزراندنی ئەو مووشەکانە لە ئەورووپادا قەبووڵ کردبوو و ئامادەکاری دەکرا بۆ ئەوەی کە لە کۆتایی ساڵی 1983دا راگوێزرێنە ئەواو دامەزرێندرێن. ئەو مووشەکانە، کە بە جۆری نێونجی بڕ لەقەڵەم دەدرێن لە روانگەی ئەمریکییەکانەوە بە چەکی ستراتژیك لە قەڵەم نادرێن و بە تایبەتی دامەزراندنی ئەو مووشەکانە لە ئەورووپای خۆرئاواییدا بە کردەوەیەکی بەرگریکەرانە لە بەرامبەر مووشەکە

ئێس ئێس 20 کانی سۆڤیەتی لە ئەوروپای خۆرهەڵاتیدا دەژمێردران. لەگەڵ ئەوەشدا لە سەر ئەوە رێککەوتن، کە هاوکات لەگەڵ دانوستانەکانی پێوەندیدار بە کەمکردنەوەی چەکە ستراتژییەکان کۆمەڵە وتووێژێکیش لە سەر سنووردارکردنی چەکە ناوکییەکان لە ئەوروپادا لە نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیدا دەست پێ بکرێ و ئەکەر رێککەوتنێك بوو پێداچوونەوە بە دامەزراندنی مووشەکی کرووز و پرشینگ2 ـەکانی ئەمریکا لە ئوروپادا بکرێ. گرینگترین پێشنیارێك، کە لەو بوارەدا لە دانوستانەکانی ژێنێودا خرایە روو گەلاڵەی پێشنیار کراوی رەیگان لە سەر (حالّی سفر) بۆ هەر دوو لایەن بوو. پێشنیاری سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە سەر بنەمای کۆکردنەوەی تەواوی مووشەکە ئێس ئێس 20 ـەکانی سۆڤیەتی لە ئەوروپای خۆرهەڵاتی بوو بۆ ئەوەی ئەمریکا دەست لە دامەزراندنی مووشەکی کروز و پرشینگ 2 لە ئەوروپای خۆرئاواییدا هەڵگرێ. سۆڤیەتییەکان لە وەڵامدا گوتیان، کە بە مەرجێك ئەو پێشنیارە وەردەگرن، کە مووشەکەکانی بەریتانیاو فەرەنساش کۆ بکرێنەوە لە حالێکدا بەریتانیاو فەرەنسا مووشەکەکانی خۆیان بە هێزی بەرگریی نیشتیمانیی خۆیان لەقەڵەم دەدا و قایل نەبوون، کە لەو ساتوسەودایەی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتییان بهاوێن.

پاش دژایەتیی بەریتانیاو فەرەنسا لەگەڵ ئەوەی کە مووشەکەکانی ئەوانیش لەومامەڵەیەدا حسێبیان لە سەر بکرێ سۆڤیەتی رایگەیاند، کە ئامادەیە ژمارەی مووشەکەکانی خۆی هەتا رادەی مووشەکەکانی بەریتانیا و فەرەنسا کەم بکاتەوە و ژمارەیان بکاتە 162دانە، بەڵام ئەو پێشنیارە بە هۆی نابەرابەریی هێز و بڕکردنی مەودای مووشەکە بریتانی و فەرنسییەکان لە چاو مووشەکەکان سۆڤیەتی و هەروەها بێ لەمپەر مانەوەی وڵاتانی دیکەی ئەوروپای خۆرئاوایی لە بەرامبەر ئەگەری هێرشی سۆڤیەتیدا وەرنەگیردرا. دەوڵەتی سۆڤیەتی دواتر قایل بوو بەوەی، کە ژمارەی مووشەکەکانی خۆی هەتا 140 و تەنانەت 120دانەش دابەزێنێ دامەزراندنی ژمارەیەك مووشەکی کرووزی ئەمریکیش لە ئەوروپای خۆرئاواییدا قبووڵ بکا، بەڵام بەرپرسانی پێنتاگۆن و راوێژکارانی تەناهیی سەرۆك کۆماری ئەمریکا لەگەڵ تەواوی ئەو پێشنیارانە دژایەتییان کرد و لە سەر ئەو خاڵە پێیان داگرت، کە سۆڤیەتی یا دەبێ مل بۆ پێشنیاری خالّی سفری رەیگان راکێشێ، کە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی تەواوی مووشەکە روسییەکان لە ئەوروپای خۆرهەڵات ئینجا ئەمریکا واز لە دامەزراندنی مووشەکەکانی خۆی لە ئەوروپای خۆرئاواییدا دێنێ و یا ئەوەی کە سۆڤیەتی دەبێ قایل بێ بە دامەزرانی

ژمارەیەك مووشەكی كـروز و پرشـینگ2ی ئـەمریكا لـە بەرامبـەر مووشـەكە ئـێس ئـێس 20ـەكانی خۆیدا.

لێرەدا پێویستە بە كورتی باسێكی تایبەتمەندییەكانی مووشەكی مووشەكی ئێس ئێس 20 ی سۆڤیەتن ومووشەكی ئەمریكیی كرووز و پرشینگ 2 بكەین بۆ ئەوەی بزانین ئـەمریكا بـۆ سوور و پێداگر بوو لە سەر دامەزراندنی مووشەكە كروزەكانی لـە بەرامبـەر مووشـەكە ئـێس ئێس 20 ـەكانی سۆڤیەتیدا و هەروەها سۆڤیەتییەكان بـۆ لـە دامـەزرانی مووشـەكی نـوێی ئەمریكی لە ئەورووپای خۆرئاواییدا نیگەران بوون.

مووشەكی ئێس ئێس 20ی سـۆڤیەتی، كـە سـازكردنیان لـە سـاڵی 1977دا دەسـتی پێكردد و یەكەمین یەكەكانی لە ساڵی 1979 و لە ئەورووپای خۆرهەڵاتیدا دامەزراند بە رای پسپۆڕانی بواری سەربازیی خۆرئاوا یەكێك لە كاریگەرترین مووشەكە روسییەكانە و هەڕەشەی راستەوخۆیان بۆ سەر وڵاتـانی ئـەورووپای خۆرئـاوا هۆكـاری سـەرەكیی پـەیمانی ئـاتلانتیكی باكوورییە بۆ دامەزرانی مووشەكە ئەمریكییەكان لە ئەورووپای خۆرئاواییدا. مووشەكە ئـێس ئـێس 20ــەكانی سـۆڤیەتی، كـە بـە پێچـەوانەی مووشـەكەكانی پێشـووی سـۆڤیەتی بـە سووتەمەنیی توند(توند لو بەرامبەر سووتەمەنیی ئاوەكییانـەی وەك نـەوت و بـەنزین) ئـیش دەكەن نزیك بە پێنج هەزار كیلۆمەتر بڕ دەكەن و لە سەر بازگـەكانی خۆیـان لـە نێـو خـاكی سـۆڤیەتی و وڵاتـانی خۆرهەڵاتییـەوە دەتـوانن تـەواوی شـار و ناوەندگـەلی سـەربازی و پیشەسازییەكانی ئەورووپای خۆرئـاوایی بپـێكن. هـەر مووشـەكێكی ئـێس ئـێس 20 سـێ كڵاوكەی ناوكیی بەسەرەوەیە، كە سێ خاڵی مەبەستی جیـاواز دەپـێكن. توانـای كاولكـاریی هەركام لەو كڵاوكانە بەقەدرایی سەد وپەنجا تەن واتە دە هێندەی ئەو بۆمبـە ناوكییەیـە، كـە ئەمریكا بەسەر هێرۆشیمایدا دا. خاڵی بەهێزی دیكـەی ئـەو مووشـەكەی سـۆڤیەتی توانـای رۆیشتنێتی، كە لە جەنگەی شەڕدا دۆزینەوەی شوێنی دامەزرانەكەی دژوار دەكاتەوە.

مووشەكە پرشینگ 2 ـەكانی ئەمریكا، كە بڕیار بوو سەد وهەشـت دانـەیان لـە كۆتـایی ساڵی 1981دا لە ئەڵمانی خۆرئاوادا دابمەزرێندرێن جـۆری پێشـكەوتووتری پرشـینگ 1 ی ئەمریكین، كە خەتاكردنیان لە پێكـانی ئامانجـدا ئەوپەڕەكـەی لـە بیسـت هـەتا سـی مـەتر تێناپەڕێ. هەر مووشەكێكی پرشینگ هەڵگری كڵاوكێكی ناوكییە، كە توانای كاولكارییەكەی دوو سەد و پەنجا تەنە، كە پازدە هێندەی توانای ئەو بۆمبەیـە، كـە بەسـەر هێرۆشـیمادا درا. لایەنی باشی دیكەی مووشەكەكانی پرشینگی 2 خێرایی لەرادەبەدەریانـە بـە شـێوەیەك، كـە

هەرکام لەو مووشەکانە دەتوانن لە مەودای شەش هەتا دوازدە خولەکدا لە بنکەکانیانەوە لە ئەورووپای خۆرئاواییەوە زۆربەی ناوەندە گرینگەکانی پیشەسازیی سەربازیی سۆڤیەتی و وڵاتانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ بپێکی و خێراییەکەیان دەرفەتی پێشگیری و هەوڵی بەربەرەکانێی خێرا بە بەرامبەر نادا.

مووشەکە کرووزە ئەمریکییەکان، کە بڕیار بوو 464دانەیان لە ماوەی پێنج ساڵدا لە ئەڵمانی خۆرئاواو بەریتانیاو ئیتالیاو بلژیك و هۆلەندا دابمەزرێندرێن لە چاو مووشەکی پرشینگ پانتاییەکی زیاتر دادەگرن، بەڵام خێراییان کەمترە، بە شێوەیەك، کە دەکرێ بە بۆمب هاوێژی ئۆتوماتیکیی بێ فڕۆکەوانیان بچوێنی. خێرایی مووشەکە کرووزەکان دەوروبەری هەشت سەد کیلۆمەتر لە سەعات دایە و بۆ گەیشتن بە خاڵی مەبەستیان لە نێو سۆڤیەتدا دەبێ سێ سەعات یا زیاتر بەڕێوە بن. هە مووشەکێکی کرووز هەڵگری کلاوکێکی ناوکییە بە توانای کاولکاریی دووسەد کیلۆ تەن (زیاتر لە دوازدە هێندەی ئەو بۆمبەی بەسەر هێرۆشیمادادرا) خاڵی بەهێزیشی ئەوەیە، کە ئامانجەکەی بە باشترین شێوە دەپێکێ.

دەوڵەتی سۆڤیەتی لە جەنگەی دانوستانەکانی پێوەندیدار بە راگرتنی کێبرکێی مووشەکی لە ئەورووپادا خەباتێکی بەربلاویشی بۆ پێشگرتن لە دامەزرانی مووشەکە ناوکییەکانی ئەمریکا لە ئەورووپادا وەڕێخست بەڵکو وڵاتانی ئەورووپی خۆیان لە ژێر گوشاری بیر و رای گشتیدا و لە ترسی ئەوەی نەکا بە هۆی دامەزرانی ئەو مووشەکە ئەمریکییانەوە تووشی شەڕێکی ناوکی بن نەهێڵن ئەو مووشەکانە لە خاکی ئەواندا دابمەزرێن، بەڵام ئەو شەری بانگەشە و پروپاگەندەییە کەکۆمەڵێك رێپێوانی بەرین و رێکخراوی لە سەرانسەری ئەورووپا بەدواوە بوو هیچی لێ نەکەوتەوە و لە مانگی نۆڤەمبەری 1983دا یەکەمین مووشکە کرووز و پرشینگ 2ـەکان گەیەنرانە بەریتانیاو ئەڵمانی خۆرئاوایی.

شکستی هەوڵەکانی سۆڤیەتی بۆ پێشگرتن لە دامەزراندنی مووشەکە ناوکییەکانی ئەمریکا لە ئەورووپای خۆرئاواییدا لە سەر رێبەرانی کرێملین گران تەواو بوو و خولی نوێی شەڕی ساردی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتی، کە لە رێکەوتی داگیرکردنی ئەفغانستانەوە لە لایەن هێزەکانی سۆڤیەتییەوە لە کۆتایی ساڵی 1979دا دەستی پێکردبوو چڕتر بۆوە. رۆژی بیست و چوارەمی نۆڤەمبەری 1983 ئاندرۆپۆف لە راگەیەندراوێکی توندا، کە لە مێژووی پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیی سالانی پاش شەڕی دووەم ی جیهانیدا بێوێنە بوو ئەمریکای بە ئامادە کاری بۆ شەڕێکی ناوکی دژی سۆڤیەتی تۆمەتبار کرد و لە لایەکیشەوە

هەڕەشەی لە ڕێبەرانی ئەمریکا کرد، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی بە هەموو تواناوە بۆ بە هێزکردنی توانای سەربازی و چەکوچۆڵ ی ناوکین و ستراتژیی خۆی تێدەکۆشێ. ئاندرۆپۆف لەو ڕاگەیەندراوەدا پێی لە سەر ئەوە داگرتەوە، کە سۆڤیەتی بڕیارە یەك لایەنەکانی خۆی سەبارەت بە ڕاگرتنی مووشەکە ناوکییەکانی لە ئەورووپادا هەڵدەوەشێنێتەوە و بە مەبەستی بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەو مەترسییەی، کە بە هۆی دامەزرانی مووشەکە تازە ناوکییەکانی ئەمریکا لە ئەورووپای خۆرئاواییدا لە سەر سۆڤیەتییە مووشەکە ناوکییە تازەکانی خۆی لە ئوقیانوس و دەریاکانی دەوروبەری ئەمریکادا دادەمەزرێنێ.

ڕۆژێك بەر لە دەرکردنی ئەو ڕاگەیەندراوە توندە، کە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە شەڕێکی ناوکیی تێدا بوو دەوڵەتی سۆڤیەتی دانوستانەکانی پێوەندیدار بە سنووردارکردنی چەکە ناوکی و مووشەکە نێونج بڕەکانی لە ئەورووپادا ڕاگرت و حەوتوویەك پاش دەرکردنی ئەو ڕاگەیاندنەی ئاندرۆپۆف، دانوستانەکانی ئەمریکا و سۆڤیەتییش لە سەر کەمکردنەوەی چەکە ستراتژییەکان لە ژێنێ بە بێ ئاکام و بەبێ ئەوەی کاتێکی نوێ بۆ دەستپێکردنەوەی دانوستانەکان دیاری بکرێتەوە کۆتایی پێهات. هاوکات لە گەڵ ئەوگۆڕانانە ڕێبەرانی سۆڤیەتیی کۆمەڵە نامەیەکیان بۆ ڕێبەرانی ئەورووپای خۆرئاوا ناردن و هەڕەشەیان لێکردن، کە ئەگەر مووشەکە ئەمریکییەکان لە خاکی ئەواندا دابمەزرێندرێن، ئەوا وڵاتەکەیان دەکەوێتە بەر مەترسیی شەڕێکی ناوکییەوە.

ڕاگەیەندراوی توندی ڕێکەوتی 24ی نۆڤەمبەری 1983 و نامەکانی ئاندرۆپۆف بۆ ڕێبەرانی وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوایی تەواوی لە سەر جێ وبان(ئاندرۆپۆف نەخۆش بووە و لە جێدا کەوتووە) لە لایەن ئاندرۆپۆفەوە مۆر کراون و پێدەچێ، کە خۆی هەر نەشیزانیبێ چیان تێدا نووسراوە، چونکی دوایین جار، کە ئاندرۆپۆف لەبەر چاوی خەڵك بینرا ڕۆژی هەژدەی ئووتی 1983 و لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ وەڤدێکی سناتۆرە ئەمریکییەکان بوو. ئاندرۆپۆف لەو چاوپێکەوتنەدا جارێکی دیکەش پێی لە سەر هۆکریی خۆی بە باش بوونەوەی پێوەندی لەگەڵ ئەمریکادا دەربڕی و گرێبەستی پێنج ساڵەی فرۆشتنی دانەوێڵەی ئەمریکا، کە حەوتوویەك پاش ئەو چاوپێکەوتنە واژۆ کرا هیوای باشتر بوونەوەی پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیی زیاتر کرد، بەڵام ڕۆژی یەکەمی سێپتەمبەر بەردانەوەی فڕۆکەیەکی نەفەر هەڵگری کۆریایی لە لایەن فڕۆکە جەنگییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتییەوە، کە کوژرانی 269 کەس لە سەر نشینەکانی بەدواوە بوو پێوەندییەکانی ئەو دوو وڵاتەی تووشی قەیرانێکی

تازەتر کردەوە و ڕەیگان بە دەرکردنی ڕاگەیەنـدراوێکی تونـد بـۆ بەشـەرمەزاری زانـینی ئـەو کوشتارە دڕندانەیە، پێوەندییەکانی ئاڵۆزتر کرد. یەکێك لە هەوڵە تۆڵەستێنەوەکانی ئـەمریکا لە بەرامبەر بەردانە وی فڕۆکە نەفەرهەڵگرەکەی کۆریادا، ئەوە بوو، کە نەیان هێشت فڕۆکـەی "ئایر فلووت"ی سۆڤیەتی بەرەو ئەمریکا هەڵفڕێ. گرۆمیکۆ وەزیری دەروەی سۆڤیەتی بڕیاری دا بۆ شکاندنی ئەو ئابلۆقەیە بە فڕۆکەیەکی ئایرفلووت بچـێتە نیویـۆرك، بـەڵام فڕۆکەخانـەی نیۆیۆرك ئیزنی نەدا، کە فڕۆکەی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی بنیشێ و هـەر بۆیـەش گرۆمیکـۆ نەچووە کۆبوونەوەکانی کۆڕی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

ئاندرۆپۆف لە جەنگەی ئەو قەیرانەدا نەخۆش بوو و فەرمان و بڕیارەکـانی وی لـە ڕێگـەی گۆرباچۆڤەوە بە دەفتەری سیاسی یا سکرتاریای حیزب رادەگەیەنران. نەخۆشییەکەی ئاندرۆپۆف لە مانگەکانی ئۆکتۆبەر و نۆڤەمبەردا لێی پیس کرد بە شێوەیەك، کە نەیتوانی لە جێژنەکانی شێست وشەشەمین ساڵهاتی شۆڕشـی بۆلشـەڤیکیی ڕوسـیا و ڕێـوڕەسمی "ڕژە" لـە مەیـدانی سووردا بەشدار بێ. لە کۆتایی ساڵی 1983دا لە ژانوییەی 1984دا ئـیتر دیـار بـوو، کـە ئاندرۆپۆف ناژی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە مەسەلەی جێنشینییەکەی چارەسەر نەکرابوو دەفتەری سیاسی پێی باش بوو، کە هەتا ئاندرۆپۆف دەمرێ ئەو مەسەلەیە وەدرەنگی بخا.

یوری ئاندرۆپۆف ئاخری پاش پێنج مانگ نەخۆشی لە ڕۆژی نۆیەمی فێبریـیـەی 1984دا مرد. ئەو لە ماوەی پازدە ساڵ دەسەڵاتدارێتی بەسەر سۆڤیەتیدا، کە زیاتر لە یەك لە سێی ئەو ماوەیە لە جێدا بوو و نەیتوانی بە دڵخوازی خـۆی لـە سیسـتەمی حکوومـەت و کۆمەڵگـەی سۆڤیەتییدا گۆڕانکاری بکا، بەڵام ڕێگەی ئەو گۆڕنانەی کردەوە. ڕوونترین تایبەتمەندی قۆناغی حکوومەتی کورتی ئەو خەبات لە دژی گەندەڵی و لەقاودانی هێنـدێك لـە چـەوتییەکان و لـە هەڵڵادانی کەڵکی خراپ وەرگرتنی دەوروبەرییەکانی بێرژنێڤ لە سامان و دارایی دەوڵەت بوو، و لەوانەیە بە هۆی هەر ئەو خەبات و بەربەرەکانییـە و ترسـی بەرپرسـان لـە سـزاو سـەرکۆنە بووبێ، کە نرخی گەشەی ئابووریی وڵات لە قۆناغی کـورتی حکوومـەتی ئاندرۆپۆفـدا لەچـاو کۆتاییەکانی حکوومەتی بێرژنێڤ بڕێك چووە سەرێ.

ئاندرۆپۆف ئەگەرچی خۆی کابرایەکی پیر و نەخۆش بوو، بەڵام هەوڵی دەدا ڕوخساری گەنج و نوێ بێنێتە نێو کادیری ڕێبەریی حیزب و دەوڵەتی سۆڤیەتییەوە. لە نێو جیلی نوێی ڕێبەرانی حیزبیدا میخایل گورباچۆڤ و حەیدەر عەلیۆف ی لە هەموان خۆشتر دەویستن. عەلیۆف لەبـەر ئەوەی کە ڕوسی نەبوو و دیارە باوەڕی ئایینیشی نەبوو، بلێی و نەڵێی بە موسڵمانیان دەزانی و

شانسی ئەوەی نەبوو ببێتە جێنشینی ئاندرۆپۆف، بەڵام گورباچۆڤ ناودێرکراوی بێئەملاولای ئەو بوو بۆ رێبەریی داهاتووی سۆڤیەتی. ئاندرۆپۆڤ تاڕادەیەك دەکرێ بڵێین بەڕێوەبەریی کاروباری حیزبی بە تەواوەتی خستە بەردەستی گورباچۆڤەوە و چرێنێنکۆی پیر ئەگەرچی بە ناو سکرتێری گشتی و ئیداری حیزب بوو هیچ دەسەڵاتێکی نەبوو. پۆستی فەرمیی گورباچۆڤ لە حیزبدا سکرتێری یەکەمی کشتوکاڵ بوو، بەڵام ئاندرۆپۆف لە تەنیشت ئەو ئەرکەدا بەرپرسیارەتیی گرینگی پێداچوونەوە بە ئۆرگانە حیزبییەکان و ئامادەکاریی گیرانی بیس وحەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتییشی بەو ئەسپاردبوو و ئەگەر هەتا ئەو کۆنگرەیە ژیابا بە لەقاودانی زۆربەی گەندەڵییەکانی قۆناغی هەژدە ساڵەی حکوومەتی بێرژنێڤ هەڵڵایەکی تازەی دەنایەوە.

# 4

هەڵبژاردنی کۆنستانتین چرێنێنکۆ بۆ جێنشینیی ئاندرۆپۆف وەکو هەڵبژاردنی ئەو بۆ جێنشینیی بێرژنێڤ سەری خۆرئاواییەکانی بێ کڵاو هێشتەوە، چونکی پاش شکستی ئەو لە بەرامبەر ئاندرۆپۆفدا و ئەو رۆڵ و دەورە پلە دووەم ەی، کە کادیری رێبەرایەتیدا درابوو بانگەشەکارانی کرێملین ناسیی خۆرئاوا لە سیاسەتی سۆڤیەتیدا هیچ شانسێکیان بۆ هەڵبژێرانی چرێنێنکۆ لەبەر چاو نەگرتبوو و باسی ئەوەیان دەکرد، کە لەوانەیە بانگەشەکارێکی گەنجی وەك گریگۆری رۆمانۆف ی 61 ساڵ تەمەن یا گورباچۆڤی 53 ساڵان بۆ جێنشینیی ئاندرۆپۆف هەڵبژێردرێن، بەڵام زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسی هێشتا لە جیلی کۆن بوون و مەیلیان لەوە نەبوو کاروبارەکان بە دەستی گەنجەکان بسپێرن.

لەگەڵ ئەوەشدا چوار رۆژ مەودای نێوان مەرگی ئاندرۆپۆف و دەسنیشان کرانی چرێنێنکۆ بۆ جێنشینیی ئەو نیشاندەری ئەوە بوو، کە لە نێو قەوارەی رێبەریدا ململانێیەکی خەست لە نێوان جیلی گەنج و لاودا لە ئارا دایە و روون و ئاشکرایە، کە لەو ململانێیەدا مارشال ستینۆف وەزیری بەرگری و گۆرمیکۆ وەزیر دەرەوەی سۆڤیەتی، کە لەململانێی نێوان ئاندرۆپۆف و چرێنێنکۆدا ریەنی ئاندرۆپۆفیان گرتبوو ئەمجارەیان چرێنێنکۆیان لە هێندێ کەسی

گەنج پێ باشتر بوو، بە تایبەتی، کە لە نێو خوازیارانی گەنجیشدا کێبرکییەکی چڕ لە نێوان گورباچۆف و رۆمانۆفدا لە ئارادا بوو.

کۆنستانتین چرێنێنکۆ، کە لە کاتی هەڵبژێرانیدا بۆ جێنشینیی ئاندرۆپۆف تەمەنی 72 ساڵ بوو لە سپتامبری ساڵی 1911دا لە بنەماڵەیەکی جوتیار لە گوندی بۆلشایاتس ی سیبریا لە دایك بوو و هەر لە کاتی خوێندنەوە بوو بە ئەندامی یەکێتیی لاوانی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی. چرێنێنکۆ ساڵی 1931 وەك ئەندامی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و لە ماوەی دە مانگدا پلە حیزبییەکانی هەتا ئاستی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بڕی و ئەوجار بۆ درێژەدان بە خوێندن لە قوتابخانەی سیاسیی حیزبدا چووە مۆسکۆ. ئەو رووداوە گرینگەی دیکەی ژیانی چرێنێنکۆ، کە رێگەی هەڵکشانی بەرەو ئاستی رێبەری بۆ کردەوە و دەراوەکانی دواتری بۆ خۆش کرد، ئەو بەرپرسیارەتییە حیزبییە بوو، کە لە کۆماری خودموختاری مۆلداڤیدا پێی درابوو، کە تێیدا توانیی بە بەردەوامی و نیازپاکی لە بەڕێوەبەریی ئەرکەکانی داوای لێکرد، کە بکەوێتە بەردڵی بێرژنێڤ سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی.

پاش مەرگی ستالین لە ساڵی 1953دا و هەڵکشانی بێرژنێڤ لە سەردەمی حکوومەتی خرۆشۆفدا چرێنێنکۆ لە سەر پێشنیاری خرۆشۆف بانگ کرایە مۆسکۆ و لە پلە جۆراوجۆرە حیزبییەکانی بێرژنێڤدا وەکو بەردەست و سکرتێری وی خزمەتی کرد. کاتێك بێرژنێڤ بە دەسەڵات گەیشت چرێنێنکۆ سەرۆکایەتیی کاروباری گشتیی سکرتاریای حیزبی وەئەستۆ گرت و لە ساڵی 1971دا بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب. لە ساڵی 1975دا بێرژنێڤ بۆ بەشداری لە کۆنفرانسی هاوکاری و تەناهیی ئەورووپادا لە هێلسنکی، لەگەڵ خۆی بردی و لە ساڵی 1976دا چرێنێنکۆ لە پۆستی سکرتێری کاروباری گشتی و ئیداریی حیزبەوە بوو بە ئەندامی سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیی حیزب. ساڵێك دواتر چرێنێنکۆ خۆی بۆ ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی پاڵاوت و ئاخری لە ساڵی 1978دا بە پێشنیاری بێرژنێڤ کرایە ئەندامی ئەسڵیی دەفتەری سیاسیی حیزب.

چرێنێنکۆ، کە زیاتر بە هۆی وەفاداری بە بێرژنێڤ گەیشتبووە بەرزترین پلە حیزبییەکان لە نێو رێبەرانی سیاسیدا رێز و متمانەیەکی ئەوتۆی نەبوو هەتا ئەو جییەی، کە سۆسلۆڤ ئەو وتارانەی، کە ئەو بۆ گۆڤاری تیۆریکیی "کۆمۆنیست"ی حیزبی دەناردن بۆی بڵاو نەدەکردەوە. پاش مەرگی سۆسلۆڤ، کە باوەڕێکی زۆری پێی نەبوو پێگەی چرێنێنکۆ لە دەفتەری سیاسیدا برێك باشتر بوو، بەڵام زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسی پاش مەرگی بێرژنێڤ ئاندرۆپۆفیان

بەلاوە لەو باشتر بوو و چرنێنکۆ تەنانەت بۆ ئەندامەتیی پۆستی کارتۆنیی سەرۆك کۆماریی سۆڤیەتییش، کە پیشتر بەڵێنییان پێدا بوو هەڵنەبژێردرا. ئەو پۆستە لە لایەن ئاندرۆپۆف خۆیەوە وەکو بێرژنێڤ بە ناوی سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیست لێی زیاد کرد و ئەگەر حکوومەتەکەی بەردەوام بایە و مابایە ئەو شەپۆلەی، کە بۆ پاکسازیی مۆرە و کەسانی گەندەڵی سەردەمی بێرژنێڤ وەڕێکەوتبوو هەروا درێژەی کێشابا بێ گومان چرنێنکۆ ئەندامەتیی سکرتاریا و دەفتەری سیاسیی حیزبیشی لێ دەستێنرایەوە. بەو وەها ئامادەکارییەکەوە هەڵبژێرانی چرنێنکۆی 72 ساڵە ئەویش بە نەخۆشیی پشووسوارییەوە، کە دەمێك بوو پێوەی دەینالاند جگە لە ڕێگەچارەیەکی کاتی بۆ چارەسەریی کێشەی ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیست و دەوڵەتی سۆڤیەتی لە دەرفەتێکی گونجاوی دیکەدا هیچ مانایەکی دیکەی نەبوو. هەرچەندە پسپۆڕانی کاروباری سۆڤیەتی لە خۆرئاوا، ئەو هەڵبژێرانە دەکرا مانای دیکەشی هەبێ، و ئەویش ئەوەی کە کۆنە ئەندامانی کادیری ڕێبەریی حیزب ڕەزامەندییان لە سەر ئەو خێراییە نەبوو، کە ئاندرۆپۆف و بەردەستەکانی لە خەبات دژی گەندەڵی و ئەو لەقاودانانەی، کە لە مەڕ کەلکی خراپ وەرگرتنی دەوروبەرییەکانی بێرژنێڤ دەستیان پێکردبوو و بە هەڵبژاردنی یەکێك لە نزیکترین هاوکارانی بێرژنێڤ دەیانویست خاڵێکی کۆتایی لە بەردەم ئەو خەباتەدا بنێن، چونکی ترسی ئەوەیان هەبوو، کە بەرین بوونەوەی ئەو خەباتە دواجار پێی خۆشیان بگرێتەوە.

یەکەمین ئاخافتنی چرنێنکۆ وەك سکرتێری گشتیی حیزب هیچ بابەتێکی نوێی تێدانەبوو و لە زنجیرەیەك بابەتی گشتی لە سەر بەرنامە ریفۆرمییە نێوخۆییەکان و پێداگرتنەوە لە سەر سیاسەتی "پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە" و خۆبواردن لە هەڵاییسانی شەڕێکی ناوکی پێکهاتبوو، بەڵام چرنێنکۆ بە رواڵەت بۆ رازیکردنی دڵی هێزی سەربازی گوتی " دەوڵەتی سۆڤیەتی وێڕای درێژەدان بە هەوڵەکانی خۆی لە ڕێگەی کەمکردنەوەی گرژییە نێودەوڵەتییەکان سەرنج و گرینگییەکی تایبەت بە هێزی بەرگریی خۆی دەدا بۆ ئەوەی پێش بە گێچەڵ خولقێنیی کۆڕوکۆبوونەوە خۆرئاواییەکان بهێنێ".

چرنێنکۆ بەو شێوازە نەرم ونیان و پارێزکارانەیەی، کە بۆ قایلکردنی باڵە جۆراوجۆرەکانی کادیری ڕێبەریی حیزب گرتبوویە پێش توانیی لە سێ مانگی یەکەمی سکرتێریی گشتیی حیزبدا دوو پۆستی دیکەی ئەنجوومەنی بەرزی بەرگری و سەرۆك کۆمارییش بە سکرتێریی گشتیی حیزبەوە زیاد بکا. خاڵێکی سەرنجڕاکێش لە جەنگەی هەڵبژێرانی بۆ پۆستی

سەرۆکایەتیی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتیدا ئەوە بوو، کە گورباچۆڤ گەنجترین خوازیاری پۆستی ڕێبەریی حیزب ئەرکی پێشنیارکردنی ئەوی بۆ ئەو پۆستە پێ ئەسپێردراو لە ئاخافتنێکدا لە کۆبوونەوەی تایبەتیی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتیدا وەك "لینینیستێکی ڕاستەقینە" و "بەرپرسێکی خاوەن ئەزموون" بە تاریفی چرنینکۆدا هات. ئاخافتنی گورباچۆڤ بۆ پشتگیری لە چرنینکۆ جگە لەوەیکە نیشانەی پێکهەڵکردنی دوو ڕەوتی فیکری لە کادیری ڕێبەریی حیزبدا بوو بۆ جارێکی دیکەش پێگەی گورباچۆڤی وەکو کەسی ژمارە 2ی ڕژێم مسۆگەر دەکرد. هەڵبژاردنی گۆرباچۆڤ وەکو سکرتێری حیزب لە کاروباری ئایدۆلۆژیکیدا پێداگرتنەوەیەکی دیکە بوو لە سەر پێگەی تایبەتیی ئەو لە نێو کادیری ڕێبەریی حیزبدا و لە هاوینی ساڵی 1984دا، کە چرنینکۆ بە هۆی نەخۆشی بۆ ماوەی دوو مانگ نەیتوانی لە کۆبوونەوەکانی دەفتەری سیاسیدا بەشدار بێ گۆرباچۆڤ بە نوێنەرایەتیی ئەو سەرۆکایەتیی کۆبوونەوەکانی دەفتەری سیاسیی لە ئەستۆ بوو.

چرنینکۆ پاش گەڕانەوەی بۆ سەر کاریش هەروا بە نەخۆشییەکانی شەکرە و دل و بە پشووسوارییەوە دەیناڵاند و ڕۆڵێکی کاریگەری لە بەڕێوەبەریی کاروباری وڵاتدا نەدەگێڕا. قۆناغی کورتی حکوومەتی ئەو قۆناغی ڕاستەقینەی حکوومەتی بەکۆمەڵ لە سۆڤیەتیدا بوو، چونکی هەرکام لە بەرپرسان بە دەسەڵاتی تەواوەوە ئەرك و کاروباری خۆیان ڕادەپەڕاند. گورباچۆڤ ئۆرگانە حیزبییەکانی لە ژێر چاوەدێریدا بوو و گرۆمیکۆ ش لە سیاسەتی دەرەوەدا بە سەربەستی و سەربەخۆیی تەواوەوە کاری دەکرد، ستینۆف هەتا لە دیسێمبەری 1984دا مرد بەسەر کاروباری سوپاو هێزە چەکدارییەکاندا ڕادەگەیشت و تیخۆنۆف وەك سەرۆکی وەزیران ئۆرگانە دەوڵەتییەکانی بەڕێوە دەبردن.

قۆناغی حکوومەتی چرنینکۆ تەنانەت لە قۆناغی ئاندرۆپۆفیش کورتتر بوو، چونکی ئەو ڕۆژی دەی 1985 واتە کەمتر لە سێزدە مانگ پاش هەڵبژێرانی بۆ پۆستی سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی مرد و لەو سێزدە مانگ حکوومەتەشیدا نزیك بە چوار مانگی هەر لە جێدا بوو. لە قۆناغی کورتی حکوومەتەکەی ئەودا ئەو ریفۆرمانەی، کە لە سەردەمی حکوومەتەکەی ئاندرۆپۆفەوە دەستیان پێکرابوو هێورتر بوونەوە و گۆڕانێکی ئەوتۆش بەسەر کادیری ڕێبەریدا نەهات. لە سیاسەتی دەرەوەدا قەیرانی پێوەندییەکانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا هەر لە سەر دامەزران و دانەمەزرانی مووشەکە ناوکییەکانی ئەمریکا لە خۆرئاوادا و لە سەر پرۆژەی"شەڕی ئەستێرەکان" ڕەیگان ڕۆیشت و تەنیا لە کۆتایی حکوومەتی چرنینکۆدا دوای

ئەو دانوستانانەی، کە لە نێوان وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی و ئەمریکا کران دانوستانەکانی پێوەندیدار بە سنووردارکردنی چەکە ستراتژییەکان لە ژێنێڤ دەستیان پێکرایەوە.

دوایین دەستپێشخەریی دیپلۆماتیکیی سۆڤیەتی لە کۆتایی حکوومەتی چرنێنکۆدا ناردنی وەفدێکی پەرلمانی بە سەرۆکایەتیی گورباچۆڤ بۆ بەریتانیا بوو، کە سەرەتای بزووتنێک بۆ وەرگرتنی متمانەی وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوایی و ناچارکردنیان بوو بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ گەڵا لە سەر بازییەکانی حکوومەتی رەیگان. گورباچۆف لەو سەفەرەدا بۆ یەکەمین جار سەرنجی راگەیاندن و کۆڕوکۆبوونەوە ئەورووپییەکانی بۆ لای خۆی راکێشا و تاچێری سەرۆك وەزیری بەریتانیا پاش چاوپێکەوتنێکی سێ کاتژمێری لەگەڵیدا گوتی"دەکرێ لەگەڵ ئەو پیاوە رێککەوی". گورباچۆف، کە لەگەڵ هاوسەرە جوانەکەی خۆی رایسا چووبووە بەریتانیا بە رووگەشی و بە گاڵتە و رابواردنەوە لەگەڵ هەواڵنێران بە شت کڕین لە فرۆشگە و بووتیکەکانی لەندەن و بەو جلوبەرگە رازاوەیەی دەیانپۆشی روخسارێکی نوێیان لە روسییەکان پێشانی خۆرئاوادا و یەکێك لە رۆژنامەکانی لەندەن بە هۆی ئەو شتانەی، کە لە بووتیکی بەناوبانگ و گرانبایی "گوچی" کڕیبوویان نازناوی "هاوڕێیانی گوچیی" لە سەر دانان.

# 5

کۆنستانتین چرنێنکۆ دوانیوەڕۆی رژی دەی مارسی 1985 مرد و هەواڵی مەرگی وی نزیك بە نۆ سەعات بەدرەنگییەوە کاتژمێر دووی دوانیوەڕۆی رۆژی یازدەی مارس راگەیەندرا. دەفتەری سیاسیی حیزب لە هەمان شەوی مەرگی چرنێنکۆ کۆبۆوە و میخاییل گورباچۆڤیان کردبووە جێنشینی وی، کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیش چەند سەعات پاش راگەیاندنی هەواڵی مەرگی چرنێنکۆ کۆبوونەوە و دوانیوەڕۆی هەر ئەو رۆژە هەڵبژێرانی گورباچۆڤی بۆ سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پشتڕاست کردەوە. ئەو خێراییەی، کە بۆ هەڵبژاردنی گورباچۆڤ بۆ جێنشینیی سکرتێری گشتیی کۆچکردووی حیزب بەکارهێنرا بێوێنە بوو و نیشانەی رێککەوتن و بوارێکی لەوەپێش رەخسا و بوو. گورباچۆڤ لە تەمەنی 54 ساڵیدا گەنجترین ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو و هەڵبژێرانی ئەو بۆ رێبەریی حیزب نیشاندەری لێبڕاویی کۆنە رێبەرانی ئەو حیزبە بوو بۆ وەگەڕ خستنی خوێنێکی

نوێ له دەمارەکانی سیستەمی کۆنی حکوومەتی سۆڤیەتییدا. پێشنیاری ئەوەی کە گورباچۆڤ بکرێتە سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە لایەن گرۆمیکۆ یەکێك لە پیرترین ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزبەوە هاتە گۆڕا و زۆرینەی ئەندامە کۆنەکانی دەفتەری سیاسیی حیزب پێشوازییان لەو پێشنیارە کرد. رۆمانۆف ئەندامە گەنجەکەی دیکەی دەفتەری سیاسیی حیزبیش هێندێ لایەنگری هەبوون، بەڵام زیاتر لە دوو لە سێی ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب گورباچۆڤیان پێ باشتر بوو.

پێشنیاری هەڵبژێرانی گورباچۆڤ بۆ جێنشینیی چرێنێنکۆ لە کۆبوونەوەی نائاسایی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا، کە دوانیوەڕۆی رۆژی یازدەی مارسی 1985 لە کرێملین پێکهاتبوو بە زۆرینەی دەنگ پەسند کرا بۆ سبەی بەیانییەکەی رۆژنامەی پڕاڤیدا بە وێنەیەکی گەورەوە هەواڵی هەڵبژێرای گورباچۆڤی بۆ پۆستی سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە لاپەڕەی یەکەمی خۆیدا بڵاو کردەوە. وێنەی رێبەری کۆچکردوو و راگەیەندراوی پێوەندیدار بە مەرگی ئەوەوە، کە هەمیشە لە نێو چوارچێوەیەکی رەش و لە لاپەڕەی یەکەمدا بڵاو دەبۆوە ئەمجارەیان لە لاپەڕەی دووەم دا بڵاو بۆوە ئەو دژەباوە بەر لەوەی نیشانەی بێ رێزی بە رێبەری کۆچکردووی حیزب بێ نیشانەی خێرایی هەڵبژێرانی رێبەری تازە و سەرەتیبوونی هەواڵی ئەو هەڵبژاردنە بوو بەسەر هەواڵی کۆچی دوایی رێبەری پێشوودا.

میخاییل گورباچۆڤ یەکەمین رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو، کە پاش شۆڕشی بۆلشەڤیکیی روسییە لە دایك ببوو و لە "شەڕی مەزنی نیشتیمانیدا"، کە زۆربەی رێبەرانی سۆڤیەتی پێیان وابوو تێیدا قارەمانەتییان نواندووە و فیداکارییان کردووە ئەو رۆڵێکی نەبووە. گورباچۆڤ رۆژی دووەم ی مکارسی ساڵی 1931 لە ستاڤرۆپۆل ی باکووری قەفقاز واتە هەر ئەو ئەیالەتەی، کە ئاندرۆپۆف لە یەکێك لە وێستگەکانی شەمەندەفەڕی ئەوێدا لە دایك ببوو لە دایك بوو و هەر ئەوەش بە یەکێك لە خاڵەکانی هەڵکشانی ئەو لە حیزبی کۆمۆنسیتی سۆڤیەتیدا دەژمێردرێ. ئاندرۆپۆفیش وەکو ستالین، کە گرینگیی زۆری بە دۆستە گورجییەکانی خۆی دەدا یا وەك چۆن خرۆشۆف و بێرژنێڤ پۆستە باڵاکانیان بە خەڵکی شار و زێدە ئۆکراینییەکانی خۆیان دەسپاردن ئەویش خەڵکی زێدەکەی خۆی زۆر خۆش دەویستن و لە نێو خەڵکی ستاڤرۆپۆلدا گورباچۆڤی لە هەمووان زیاتر وەبەر دڵ کەوت. دیارە ئەو شتەی، کە گورباچۆڤی لەبەر چاوی ئاندرۆپۆف شیرن کرد توانای جەوهەری و خوێندەوارییی ئەو لە ئاستی باڵادا بوو. گورباچۆڤ، کە لە بنەماڵەیەکی جوتیاردا لە دایك ببوو پاش تەواوکردنی خوێندنی

سەرەتایی چووە نێو یەکێتیی لاوانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و یەکەمین ئیشی ئەو پاش تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی لێخوڕینی تەراکتۆر بوو. گورباچۆڤ کاتە بۆشەکانی ژیانی خۆی بۆ چالاکیی لە یەکێتیی لاوانی حیزب یا بەشداری لە کێبرکێی چوونە زانکۆ دەکرد و ساڵی 1950 توانیی لە تاقیکارییەکانی چوون بۆ زانکۆی دەوڵەتیی مۆسکۆ دەربچێ. وەرگیران لە تاقیکارییەکانی چوون بۆ نێو ئەم زانکۆیە پێویستیی بە "واسیتەی" بە دەسەلات و دەسرۆیشتوو و توانای لە رادەبەدەر هەبوو و گورباچۆڤ لەو کاتدا ئاشنا و رۆشنایەکی دەسرۆیشتووی نەبوو و بە دڵنیاییەوە ئەوە توانا و زیرەکیی لەرادەبەدەری ئەو بوو، کە گەیاندییە ئەم زانکۆیە.

گورباچۆڤ وێڕای وەرگیرانی لە زانکۆی مۆسکۆدا بە ئەندامەتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی وەرگیرا و، ساڵی 1955 بەڵگەنامەی(شهادەی) لە بواری مافدا لە زانکۆ وەرگرت و گەڕایەوە ستاڤرۆپۆل. گوورباچۆڤ وێڕای وەرگرتنی کۆمەڵێك پۆستی دەوڵەتی، کە زیاتریان پێوەندییان بە بواری کشتوکال و سەرپەرشتیاریی کێڵگە هاوبەشەکانەوە هەبوو لە حیزبی کۆمۆنیستی ستاڤرۆپۆلدا چالاکیی دەنواند و یەکەمین جار، کە بە نوێنەرایەتیی ئەو ناوچەیە بەشداری کۆنگرەی بیست و دووی حیزبی کۆمۆنیست بوو لەوێ لەگەڵ ئاندرۆپۆف، کە ئەو کات یەکێك بوو لە سکرتێرەکانی حیزب ئاشنا بوو. گورباچۆڤ هەر لەو ساڵانەدا بوو، کە لەگەڵ رایسای هاوسەری زەماوەندی کرد و کچێکی لێی بوو.

ساڵی 1970 گورباچۆڤ بە سکرتێری یەکەمی ناوچەیی حیزب هەڵبژێردراو لە کۆنگرەی بیست و پێنجەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا بوو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب. هەر لەو کاتەوە گورباچۆڤ پێوەندییەکی نزیك و چڕی لەگەڵ سۆسلۆڤ ئەندامی بەرزی سکرتاریای حیزب و ئاندرۆپۆف، کە ئەو کات سەرۆکی کا.گ.ب و ئەندامی دەفتەری سیاسی بوو دەمەزراند و لە سەر پێشنیاری ئەوان لە ساڵی 197دا وەکو سکرتێری کاروباری کشتوکاڵی لە سکرتاریای حیزبدا خەریکی کارکردن بوو. گورباچۆڤ لە راپەڕاندن و جێبەجێکردنی ئەرك و بەرپرسیارەتییەکانیدا ئەوەندە بە گەرموگوڕی و بەردەوامییەوە هەوڵی دەدا، کە جۆرێك سەرنجی سۆسلۆڤ و ئاندرۆپۆفی بۆ لای خۆی راکێشا، کە ساڵێك دواتر لە نۆڤەمبەری 1979دا وێڕای پاراستنی پۆستی سکرتێری کاروباری کشتوکاڵی بۆ پاڵێوراو و ناودێر کراوی ئەندامەتی دەفتەری سیاسییش هەڵبژێردراو ساڵی 1980 لە تەمەنی 49 ساڵیدا بوو بە ئەندامی ئەسڵیی دەفتەری سیاسیی حیزب، کە لە سۆڤیەتیدا بە بەرزترین پۆستی حیزبی لەقەڵەم دەدرا،

له حاڵێكدا نێونجی تەمەنی ئەندامانی دەفتەری سیاسی لەو كاتدا 65 هەتا 80 ساڵ بوو و تەنیا یەك نەفەر لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی (ڕۆمانۆف) لە خوار شێست ساڵەوە بوو.

گورباچۆڤ لەو كاتەوە جگە لە سۆسلۆڤ و ئاندرۆپۆف، كە پشتیوانی سەرەكیی ئەو بوون پێوەندییەكی باش و پتەوی لەگەڵ باقی ئەندامانی دیكەی دەفتەری سیاسی و سكرتاریای حیزب دامەزراند و بە راكێشانی سەرنج و متمانەیان ڕێگەكانی گەشە و هەڵكشانی خۆی ئاوەڵاكردن. پاش مەرگی بێرژنێف و هەڵبژێرانی ئاندرۆپۆف بۆ سكرتێری گشتیی حیزبی كۆمۆنیستی سۆڤیەتی گورباچۆڤ نزیكترین كەسی متمانە پێكراوی ڕێبەری تازەی سۆڤیەتی و بەردەستی ئەو لە سكرتاریا و دەفتەری سیاسیدا بوو. بە شێوەیەك، كە لە كاتی مەرگی ئاندرۆپۆفدا (ساڵی 1984) بە پیاوی ژمارە 2ی ڕژێم و جێنشینی سرووشتیی ئاندرۆپۆف لە قەڵەم دەدرا لەگەڵ ئەوەشدا لەبەر ئەو هۆیانەی، كە بۆ هەڵبژێرانی چرێنێنكۆ بۆ جێنشینیی ئاندرۆپۆف باسمانكردن دەفتەری سیاسیی حیزب و كۆمیتەی ناوەندی ئەوەی بۆ پۆستی سكرتێری گشتیی حیزب هەڵبژارد. پاش هەڵبژاردنی چرێنێنكر بۆ پۆستی سكرتێری گشتیی حیزب گورباچۆڤیش وەكو سكرتێری كۆمیتەی ناوەندی لە بواری ئایدۆلۆژیادا پۆستی دووەم ی لە سكرتاریای حیزبدا وەدەست هێنا و وەكو پیاوی ژمارە 2ی حیزب پێگەی خۆی مسۆگەر كرد.

مەرگی كونستانتین چرێنێنكۆ لە دەی مارسی 1985دا، كە لە ماوەی كەمتر لە دووساڵ و نیودا سێیەمین مەرگی ڕێبەرێكی سۆڤیەتیی بوو دەفتەری سیاسیی حیزبی ناچار بەوە كرد، كە بۆ هەڵبژاردنی ڕێبەرێكی گەنج كۆنەپارێزی و دڕدۆنگی وەلا بنێ و ئەمجارەیان گرۆمیكۆ، كە لە دوای سۆسلۆڤ و ستینۆڤ، بە دەسەڵاتترین ئەندامی دەفتەری سیاسیی بوو گورباچۆڤی بۆ وەرگرتنی پۆستی سكرتێری گشتی پێشنیار كرد. ئەو پێشنیارە بەبێ مشتومڕێكی ئەوتۆ لە لایەن زۆرینەی ئەندامانی دەفتەری سیاسییەوە وەرگیرا و ڕۆژی یازدەی مارس لە كۆبوونەوەی نائاسایی كۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا پەسند كرا. گورباچۆڤ لە یەكەمین ئاخافتنیدا وەك سكرتێری گشتیی حیزبی كۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە كۆبوونەوەی نائاسایی كۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا زیاتر باسی لە مەسەلە و كێشە نێوخۆییەكانی سۆڤیەتی و پێویستیی هەنگاوی بنەمایی هەڵگرتن لە ئاقاری بردنە سەرێی ئاستی ژیانی خەڵك، كرد و لە مەسەلەی پێوەندیدار بە سیاسەتی دەرەوەدا تەنیا ئاماژەی بە پاراستنی پێوەندییە دۆستایەتی و نزیكەكان لەگەڵ وڵاتانی سۆسیالیستی و بەردەوام بوون لە سەر درێژەدان بە چارەسەریی ناكۆكییە نێودەوڵەتییەكان لە ڕێگەی ئاشتیخوازانەوە كرد.

گورباچۆڤ لە یەکەمین بەرەوڕوو بوونەوەیدا لەگەڵ ڕێبەران و بەرپرسانی خۆرئاواییدا، کە بۆ بەشداری لە ناشتنی چرێنێنکۆدا چووبوونە مۆسکۆ کاریگەرییەکی باشی لە سەریان دانا. میتران سەرۆك کۆماری فەڕەنسا و هێلمۆت کۆل سەدری ئەعزەمی ئەڵمانی خۆرئاوایی ئەویان وەك پیاوێکی زیرەك و تێگەیشتوو ناو برد و هەردووکیان داوایان لە گورباچۆڤ کرد، کە لە یەکەمین دەرفەتدا بەشێوەی فەرمی سەردانی فەڕەنسا و ئەڵمانی خۆرئاوایی بکا. گۆرباچۆڤ بەدەم ئەو بانگهێشتنانەوە چوو و لە وەڵامی نامەی رەیگاندا، کە لە ڕێگەی جۆرج بووشی جێگری سەرۆك کۆماری ئەمریکا و شۆلتێرزی وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتەوە پێی گەیشت گوتی:"ئەو بانگهێشتە بە خۆشحاڵییەوە تاوتوێ دەکەم". لەگەڵ ئەوەشدا بووش و شولتێرز هەر دووکیان پاش دیمانەیەکی 58 خولەکی لەگەڵ گورباچۆڤ سەبارەت بە داهاتووی پێوەندیی نێوان سۆڤیەتی و ئەمریکا گەشبینیی خۆیان دەربڕی.

گوورباچۆڤ لە سەر یەك 15 کاتژمێر لەگەڵ ڕێبەران و ئەو کەسایەتییانەی، کە بۆ بەشداری لە ڕێوڕەسمی ناشتنی چرێنێنکۆدا هاتبوونە مۆسکۆ دیمانە و دانوستانی کرد. مارگارێت تاچێر سەرۆك وەزیری بەریتانیا و راجیۆ گاندی سەرۆك وەزیری هیند، ژەنەراڵ زیائولحەق سەرۆك کۆماری پاکستان و تەواوی ڕێبەرانی کۆمۆنیست لەو کەسایەتییانە بوون، کە چاویان بە گورباچۆڤ کەوت و دانوستانیان لەگەڵ کرد. خاتو تاچێر، کە لە ساڵی 1984 یشدا لە سەفەرێکدا لەگەڵ گورباچۆڤ بۆ لەندەن چاوی پێی کەوتبوو پاش دووەم دیمانە لەگەڵ ئەودا گوتی بۆچوونی سەبارەت بە گورباچۆڤ نەگۆڕاوە و لە سەر ئەو باوەڕەیە، کە ئەو لە چاو ڕێبەرانی پێشووی سۆڤیەتی کەسێکی جیاوازە و "دەکرێ لەگەڵی رێککەوی". راجیۆ گاندی سەرۆك وەزیری هیند بۆ سەردانێکی فەرمی گورباچۆڤی بانگهێشت کرد بچێتە هیندستان و گورباچۆڤ گوتی، کە لە دڵەوە ئەو بانگهێشتنە قبوولْ دەکاو لە یەکەمین دەرفەتدا سەردانی هیندستان دەکا. دانوستانەکانی گورباچۆڤ لەگەڵ زیائولحەق سەرۆك کۆماری پاکستان زیاتر پێوەندییان بە مەسەلەی ئەفغانستانەوە هەبوو و ڕێبەری تازەی سۆڤیەتی لە هەمان کاتدا گوتی بە دڵ بە شوێن ڕێگە چارەیەك دایە بۆ کێشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئەفغانستان و وریایی بە سەرۆك کۆماری پاکستاندا، کە درێژەی دەستێوەردانەکانی پاکستان لە ئەفغانستان نەك چارەسەریی کێشەی ئەفغانستان ئاڵۆزتر دەکا بەڵکو شوێنە واری خراپ لە سەر پێوەندییەکانی داهاتووی سۆڤیەتی و پاکستانیش دادەنێ.

گورباچۆڤ لە شەش مانگی یەکەمی ڕێبەرایـەتیی سـۆڤیەتیدا روخسـارێکی تـەواو نـوێ و جیاوازی لە شێوازی حکوومەتکردنی لە سۆڤیەتیدا نیشانی خەڵکی جیهانـدا. بـە پێچـەوانەی ڕێبەرانی پێشووی سۆڤیەتی (جگە لە خرۆشۆف)، کە خـۆی لـەودیو دیوارەکـانی کرێملینـەوە حەشاردا بوو و کەمتر وەدەر دەکەوتن، گورباچـۆڤ بـە بـێ تـرس و دڵـەڕاوکێ لـە مەترسـییە گریمانەییەکان دەچووە نێو خەڵك و بۆ هەر حەوتوویەك بەرنامەیەکی بۆ سەردانی کارخانەکان یا کێڵگە هاوبەشەکان و ناوەندە ئاوەدانەکانی دیکە دانا و گۆڤارێکی ئەڵمانی وێـڕای چـاپکردنی چەند وێنەیەکی ڕێبەری تازەی سۆڤیەتی لە نێو چین و توێژەکانی خەڵکدا ئەوی بـە "کێنێـدیی سوور " ناو برد. قسەکانی گورباچۆڤ لە جەنگەی ئەو سەردانانەدا، کە لـە لاپـەڕەی بلاڤـۆك و راپۆرتە رادیۆیی و تەلەڤزیۆنییەکاندا بلاو دەبوونەوە تەواوی نیشانەی گرینگی و سەرنجدانی ئەو بوو بە رەوشی ژیانی خەڵکی و بەڵێنی گۆڕانی بنەمایی لە سیاسەتە ئابوورییەکاندا بـۆ خـۆش بژیوکردن و بردنە سەری ئاستی ژیانی خەڵکی.

لە شێوازە جیاوازەکانی گورباچۆڤ لە هەڵسوکەوتیدا لە گەڵ خەڵك و سـەفەرەکانی ئـەو بـۆ دەرەوەی وڵات لە چاو ڕێبەرانی پێشووی سۆڤیەتی ئەوە بوو، کە رایسیای هاوسەری بۆ هەموو جییەك لەگەڵ خۆی دەبرد لە حاڵێکدا خەڵکی سۆڤیەتی جیا لە لینین و خرۆشۆف هیچـکام لـە ڕێبەرانی دیکەیان لەگەڵ هاوسەرەکانیان نەدیبوون و وێنەی هاوسەر یا منداڵەکانیان تـەنیا لـە ڕێوڕەسمی بە خاك سپاردنیاندا دیتبوو. گورباچـۆڤ نـەك هـەر هاوسـەرەکەی، کـە مامۆسـتای فەلسەفەی مارکسیستیی زانکۆی مۆسکۆ بوو بۆ زۆربەی سـەردانەکان و سـەفەرە نێوخـۆیی و دەرەوەییەکاندا لەگەڵ خۆی دەبرد جاروبارە لەگەڵ ئیرنای کچیشی، کە پزیشك بوو یا لەگەڵ نەوە منداڵەکەیـدا ئۆکسـانا وەدەردەکـەوتن و هـەر بـەو کـارە سـادانە روخسـارێکی مرۆییانـە و خۆشەویستی لە خۆی نیشانی خەڵکدا بوو.

گورباچۆڤ لەگەڵ ئەو خۆنواندنە سۆزدارییانەیدا لە سەر کاری خۆی زۆر جیددی و شێلگیر بوو. بە شێوەیەك، کە تەنیا لە شەش مـانگی یەکـەمی سـکرتێر بوونەکەیـدا زیـاتر لـە پـەنجا کـەس لـە بەرپرسانی گرینگی حیزب و دەوڵەتیی بە هۆی لاوازبوون و چـەوتییان لـە بەڕێوەبەرێتیـدا بـە هـۆی کەڵکی خراپ وەرگرتن لە پێگە و پۆستەکانیان لە سەر کار لابردن و کۆمەڵێك گۆڕانی گرینگـی لـە پێکهاتەی دەفتەری سیاسیدا پێك هێنا. لـە جەنگـەی ئـەو گۆڕانانـەدا چـوار ئەنـدامی نـوێ، کـە هەمووان لایەنگری تۆخی گورباچۆڤ بوون هاتنە نێو دەفتەری سیاسییەوە و تەنیا خـەنیمی جیـددیی گورباچۆڤ لە دەفتەری سیاسیدا وات گریگۆری رۆمانۆف، کە لەگەڵ ڕێبـەریی نـوێ هـەڵی نـەدەکرد

ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە. گورباچۆڤ بە پێچەوانەی سێ سکرتێری پێشووی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پۆستی کارتۆنیی سەرۆکایەتیی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتی یا سەرۆك کۆماریی لە پۆستە حیزبییەکەی خۆی زیاد نەکرد و ئەو پۆستەی بە گرۆمیکۆ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی بەخشی. هەڵبژاردنی گرومیکۆ بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری لە هەمانکاتدا، کە وەك بردنە سەری پلەی ئەو سیاسەتوانە 75 ساڵەیە لە قەڵەم دەدرا دەستی گورباچۆڤیشی لە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتیدا ئاوەڵاتر دەکرد، چونکی وەزیری تازەی کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی شێڤارد نادزێ، کە هاوکات لەگەڵ هەڵبژێرانی بۆ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی کرایە ئەندامی دەفتەری سیاسییش یەکێك بوو لە دۆستە نزیکەکانی گورباچۆڤ و لە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتیدا وەشوێن بیروبۆچوونەکانی وی دەکەوت.

# 6

گورباچۆڤ لە شەش مانگی سەرەتای ڕێبەرییدا زیاتر خەریکی کاروباری نێو خۆیی سۆڤیەتی و پێداچوونەوە بە ئۆرگانە حیزبییەکان و ئامادەکاری بۆ پێك هێنانی بیست و حەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە سەرەتاکانی 1986دا بوو. گورباچۆڤ وەك سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای بەرگری، چاوەدێری و کۆنترۆڵێکی زیاتری بەسەر کارو کردەوەی سوپادا هەبوو و بۆ ئەوەی ڕێگە لە پێوەندیی ڕاستەوخۆی سوپا و دەفتەری سیاسیی حیزب و دەستێوەردانی سوپاییەکان لە بڕیارەکانی پێوەندیدار بە سیاسەتی دەرەوە و بەرگریی وڵاتدا بگرێ نەیهێشت مارشال سۆکۆکلۆڤ ی وەزیری بەرگریی سۆڤیەتی ببێتە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب لە حاڵێکدا کەسی پێش وی واتە مارشال ستینۆف یەکێك بوو لە بەدەسەڵاتترین ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب و ڕۆڵێکی گرینگی لە دەسنیشانکردنی ڕێباز و ڕێچکەکانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتیدا دەگێڕا.

گورباچۆڤ ئەو هەوڵانەی وەگەڕ خستنەوە، کە لە سەردەمی حکوومەتی ئاندرۆپۆفدا لە ئاقاری بنەبڕکردنی گەندەڵی دەستی پێکرابوو و لە سەردەمی چرنێنکۆدا بێ دەنگەی لێکرابوو، بەڵام ئەو گۆڕانە بنەڕەتییانەی، کە لەوانە بوو بە لادان لە بنەماکانی مارکسیزم لێکدرێتەوە هەڵیگرتن بۆ کاتی پەسند کرانی بەرنامەکانی لە پاش کۆنگرەی بیست و

حەوتەمـدا. لـە هەولـە گـرینگ و هـەڵڵا خولڤێنـەکانی ئـەو لـە شـەش مـانگی یەکـەمی ڕێبەرایەتییەکەیـدا دژایـەتیکردنی لەگـەڵ ئـەلکۆلیزم بـوو، کـە بـە یـەکێك لـە گـەورەترین گەندەڵییەکانی کۆمەڵەگەی سۆڤیەتی دەژمێردرا. گورباچۆڤ نرخـی مەشـروبی بـردە سـەرێ و فرۆشتن و خواردنەوەی لە ریسـتورانەکاندا سـنووردارکردن. ژمـارەی دووکانـەکانی مەشـرووب فرۆشی کەم کرانەوە و کەمترین ئاستی تەمەنێك، کـە یاسـا ئیزنـی خواردنـەوەی پێـدابێ لـە 18ـەوە کرایە 21 ساڵ.

یەکەم ژێستی سەرنجڕاکێش و بێوێنەی گورباچـۆڤ لـە سیاسـەتی دەرەوەیـدا بانگهێشـتنی سەرنووسەرانی گۆڤاری ئەمریکایی تایم بۆ کرێملین و وتووێژی تێروتەسەل بوو لەگەڵ ئەوان لـە سەر بواری سیاسەتەکانی نێوخۆیی و دەرەوەی سۆڤیەتی. لەو وتووێژەدا، کە هەشـت لاپـەڕەی تەواوی ژمارەی ڕێکەوتی سپتامبری 1985ی گۆڤاری تایمی ئـەمریکیی گرتبـوو، گورباچـۆڤ هەوڵی دا ڕاستییەکەی ئەو گۆڕانانـەی، کـە سـۆڤیەتیدا هاتوونـە ئـاراوە بـۆ ئەمریکییـەکان بسەلمێنێ و متمانەی ئەمریکییەکان بۆ لای ئەو ڕاستییە رابکێشـێ، کـە حکوومـەتی تـازەی سۆڤیەتی بە ڕاستی خوازیاری ئاشتی و کۆتاییهێنان بە کێبڕکێی چەکوچۆڵ و خۆ پڕچەککردن و چارەسەرکردنی کێشە نێو دەوڵەتییەکانە لە ڕێگەی ڕێککەوتن و لێك تێگەیشتن و بە زمانێکی سادەتر لە ڕێگەی دانوستانەوە. گورباچۆڤ لەو وتووێژەدا لە سەر ئەو خاڵە پێی داگرتـەوە، کـە باشتربوونی ڕەوشی ئابووریی سۆڤیەتی بە لای ئەوەوە و بردنەسەری ئاسـتی ژیـانی خـەڵك لـە پلەی یەکەم دایە و بۆ گەیشتن بەو مەبەست و ئامانجانە لە دڵەوە خوازیاری ڕاگـرتنی کێبڕکێـی خۆپڕچەککردن و بەکارهێنانی ئەو هەمووە خەرجە سەربازییەیە لە پێناوی باشـترکردنی ژیـانی خەڵکدا.

بە دوای بڵاوبوونەوەی ئەو وتووێژەدا، کە دەنگدانەوەیەکی نێودەوڵـەتیی بـەربڵاوی هـەبوو هێرشـی ئاشـتیی سـۆڤیەتی لـە سەرانسـەری جیهانـدا دەسـتی پێکـرد و لـەو دیمانـە و چاوپێکەوتنانەدا، کە لە نێوان شۆلتێرز و شێڤاردنازێ وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا و سۆڤیەتیدا هاتنە ئاراوە پاش شەش ساڵان ئامادەکاری بۆ گێرانی یەکەمین کۆنفرانسی ڕێبـەرانی دوو وڵات کرا، بەڵام گورباچۆڤ بەر لە دیمانە لەگەڵ ڕەیگان، کە بۆ نۆڤەمبەری 1985 پێشبینی کرابـوو لە سەرەتاکانی ئۆکتۆبەردا چووە فەڕەنسا و بە هەڵسوکەوتی خۆی لەو سەفەرەدا و پێداگرتنەوە لە سەر مەبەرست و نیازی ئاشتیخوازانەیان، بیر و ڕای گشتیی جیهانی بۆ لای خۆی ڕاکێشـا. ڕایسا هاوسەری گورباچۆڤیش، کە لەو سەفەرەدا لەگەڵی بوو بەشی خۆی سـەرنجڕاکێش بـوو و

سەردانەکانی ئەو بۆ هۆڵەکانی مۆدە و فرۆشگە گەورەکانی پاریس بابەتێکی سەرنجڕاکێشی دایە دەست بڵاڤۆکەکانی جیهان.

گورباچۆڤ و رەیگان لە کۆتاییەکانی نۆڤەمبەری 1985دا لە ژێنێڤ چاویان بە یەکتری کەوت، و وێڕای ئەوەی کە دەستکەوتەکانی ئەو چاوپێکەوتنە کەم بوون، ئەو لێك تێگەیشتنەی، کە لە زۆر بواری قسەلێکراودا لە نێوان رێبەرانی دوو وڵاتەوە بەدەست هات و رێککەوتنیان بۆ درێژەدان بە هەوڵەکانیان لە پێناوی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و دانوستانی دوایی لە ئاستی جیاجیادا کەش و هەوایەکی نوێی لە پێوەندییەکانی نێوان ئەو دوو زلهێزەدا پێك هێنا و گورباچۆڤ لە ژنێڤەوە بە پێگەیەکی پتەوتر لە جاران گەڕایەوە مۆسکۆ.

بەر لە گیرانی بیست و حەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە 25ی فێبریەی 1986دا گورباچۆڤ لە نێو ریزەکانی رێبەریی حیزبی کۆمۆنیست و دەوڵەتی سۆڤیەتیدا کۆمەڵێك گۆڕانی گرینگی دیکەی کرد و بواری بۆ کۆنگرەیەك، کە دەبوایە لە بیروبۆچوونەکانیدا هاودەنگی بێ خۆش کرد. لە ئاستی بالآی رێبەریدا دوو ئەندامی پیروکۆنی دەفتەری سیاسی جێگەی خۆیان بۆ گەنجەکان بە جێهێشت و لە ئاستی خوارترەوەدا 30لەسەدی رێبەرانی ناوچەیی حیزب گۆڕدران. گرینگترین گۆڕان لە ئاستی رێبەرانی ناوچەیی حیزبدا لابرانی ڤیکتۆر گریشین کۆنترین ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب بوو، کە وەك سکرتێری یەکەمی کۆمیتەی حیزبیی مۆسکۆ دەستی زۆر دەڕۆیشت. جگە لە گریشین شارەوانی مۆسکۆش، کە بۆ ماوەی بیست و دووساڵ بە پشتیوانیی ئەوەوە ئەو پۆستەی پارێزرابوو بە تاوانی بەڕێوەبەرێتیی چەوت و خراپ و کەڵکی خراپ وەرگرتن لە کاروبارەکانی بیناسازیدا، لە سەر کار لابرا.

گرینگترین گۆڕان لە ئاستی رێبەرایەتیدا وەلانرانی تیخۆنۆف سەرۆك وەزیری هەشتا ساڵە و هەڵبژاردنی نیکۆلای ریژکۆڤ ی پەنجاوشەش ساڵان بۆ جێنشینیی ئەو بوو. تیخۆنۆف، کە لە ساڵی 1980 وە پۆستی سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتیی بەدەستەوە بوو و لەگەڵ بەرنامەکانی گورباچۆڤدا نەبوو بە ناوی نەخۆشییەوە پۆستی سەرۆکی وەزیران و دەفتەری سیاسیی لێ ئەستێنرایەوە و ریژکۆڤ، کە هەروەك گورباچۆڤ کابرایەکی گورج وگۆڵ و باوەڕمەند بە گۆڕانی بنەڕەتی لە سیاسەت ئابوورییەکانی سۆڤیەتیدا بوو جگە لە پۆستی سەرۆکی وەزیران جێگە بەتاڵەکەی ئەویشی لە دەفتەری سیاسیدا گرتەوە. لە ئەنجوومەنی نوێی وەزیراندا، کە بە سەرۆکایەتیی ریژکۆڤ پێك هات بیست و یەك کەس لە وەزیرانی پێشوو وەلانران و

جێنشینەکانیشیان زیاتر پیاوانی خوێندەواری تەمەن چل هەتا پەنجا ساڵ بوون، کە هێندێکیان پێشینە و رابردووی کاری دەوڵەتییان نەبوو.

بەر لە گیرانی کۆنگرەی بیست و حەوتەمی حیزب، کە دەبوایە بەرنامەی ئابووریی پێنج ساڵەی 1986 هەتا 1990 تاوتوی و پەسند بکا دەفتەری سیاسی ئەو بەرنامە ئابوورییەی، کە بۆ کۆنگرە ئامادە کرابوو بەهۆی دووربوونی لە واقیع بینی و هێندێ بەرنامەی ناپێویست رەت کردەوە و گرووپێکی نوێی راسپارد بەرنامەکی نوێی ئابووریی پازدە ساڵە بنووسنەوە و، کە دەبێ لە سێ قۆناغدا هەتا کۆتایی سەدەی بیستەم جێبەجێ بکرێ. ئەو مەبەستەی، کە لە لایەن دەفتەری سیاسیی حیزبەوە بۆ ئەو بەرنامەیە دیاری کرا دوو بەرامبەرکرانی رادەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و داهاتی نیشتیمانی هەتا کۆتایی سەدەی بیستەم بوو. بۆ گەیشتن بەو ئامانجەش گەشەی ئابووریی سۆڤیەتی دەبوو بگاتەنێونجی ساڵانەی 4/7 لەسەد، کە نزیك بە دوو هێندەی نرخی گەشەی ئابووریی وڵات لە دەیەی رابردوودا بوو. بیست و حەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی رۆژی بیست و پێنجەمی فێبرییەی ساڵی 1986 بە بەشداریی نزیك بە پێنج هەزار نوێنەر، کە لە لایەن حەڤدە ملیۆن وپێنج سەد هەزار کەس لە ئەندامانی حیزبی هەڵبژێرابوون لە مۆسکۆ دەستی بە کارەکانی کرد. ئاخافتنی پێنج کاتژمێریی گورباچۆڤ لەو کۆنگرەیەدا پڕ بوو لە رەخنەی توند لە کەمکاری و پشت گوێخستن و گەندەڵی لە سەردەمی حکوومەتی بێرژنێڤدا، بەڵام گورباچۆڤ لە تەواوی کاتی ئاخافتنەکەیدا ناوی بێرژنێڤی نەهێنا و لە هێرشی راستەوخۆ بۆ سەر وی خۆی بوارد. گورباچۆڤ پاش پەردەلادان لە سەر کەمایەسی و گەندەڵییەکانی رابردوو باسی زنجیرەیەك ریفۆرمی بنەڕەتیی لە سیستەمی ئابووریی وڵاتدا کرد و جەختی کردەوە لە سەر ئەوەی کە ریفۆرم و چاکسازیی رووکەشیانە بارێکیان لێ سووك ناکا و چارەسەرییان ناکا. گورباچۆڤ لە پێشدا وەڵامی ئەو کەسانەی دایەوە، کە لەوانەیە ئەو چاکسازیی و ریفۆرمە بە لادان لە رێبازی سۆسیالیزم و لە بنەماکانی سۆسیالیزم ناو بەرن و گوتی ئێمە هەرگیز لە رێبازی سۆسیالیزم لا نادەین و تەواوی ریفۆرمەکانی خۆمان لە چوارچێوەی سۆسیالیزمدا بە کارێکی کردەنی دەزانین.

بەمای ریفۆرمەکانی گورباچۆڤ بۆ ریفۆرم و چاکسازیی لە بواری ئابووریی سۆڤیەتیدا، بردنە سەرێی ئاستی بەرهەمهێنانی پیشەیی و کشتوکاڵی و گرینگیدانی زیاتر بە چۆنایەتیی ئەو بەرهەمانە و دێسانترالیزەکردن و زیاتر دەست ئاوەڵاکردن و دانی سەربەخۆیی زیاتر بە یەکە پیشەییەکان ودانی هەقدەستی زیاتر بە بەڕێوەبەران و کرێکارانی یەکە پیشەیی و بەهەمهێنەرەکان

به پێی ئاستی بەرهەمهێنانیان دانرابوو. گورباچۆڤ پێی لە سەر ئەوە داگرتەوە، کە شێوازەکانی پێشوو زیاتر لە سەر بنەمای چەندایەتیی بەهەمی یەکەی پیشەییەکان و گەیشتنی ئاستی بەرهەمهێنانی کارخانەکان بە رادەی پێشبینی کراو بوو، کە دەبوو وەلا بنرێ. لەمەودوا چۆنایەتیی کالاّ و چۆنێتیی خستنە رووی لە بازاردا لە پلەی یەکەم دایە و هەقدەست و مووچەی بەرێوەبەران و کرێکارانی هەر یەکەیەکی پیشەیی بە پێی ئەو داهاتە دەبێ، کە لە فرۆشتنی کالاّ بەرهەم-هاتووەکانەوە وەدەست دا. گورباچۆڤ، کە ئاخافتنەکەی لە رووی نووسراوەوە دەخوێندەوە کاتێ گەیشتە ئەو بەشەی راپۆرتەکەی خۆی لەبەر ئەوەی هیچ هەستێکی لە جەماوەرەکەدا بەدی نەکرد سەری هەلێنا و گوتی :"بۆچی چەپلە بۆ ئەو قسانە لێنادەن؟ ئاخۆ گەرەکتانە هەر وەك رابردوو کەلوپەل و کالاّی پووچ و بێ کەلّك بەرهەم بێنن و مووچەکەشی لە دەولّەت وەرگرن؟".

بیست و حەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لەگەلّ ئەو هەمووە ئامادەکارییەی، کە بۆی کرابوو نیشانی دا، کە لە بەرامبەر بەرنامە چاکسازییەکانی گورباچۆڤ و ئەو گرووپە گەنجەی، کە لەگەلّیدا هاتوونەتە نێو دەزگای رێبەرییەوە دژکردەوە و پێ چەقاندنێك لە گۆرِێیە و بەرپرسانی حیزبی و دەولّەتی، کە هێشتا دوو لە سێیان لە بەرماوەکانی سەردەمی بێرژنێڤ بوون ئامادە نەبوون وا بە سووك وئاسانی ئەو ماف و پوانانە لەدەست خۆیان بدەن، کە بەدەستیانەوە بوون. لە هەلّبژاردنەکانی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیشدا دیسان ژمارەیەك هەر لەوانە بۆ پۆستی کۆمیتەی ناوەندی هەلّبژێرانەوە و، بەلاّم زیاتر لە چل لەسەدی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی نوێ کەسانی تازە بوون و زۆرینەی ئەندامانی پێشووی کۆمیتەی ناوەندی، کە دیسان دەنگیان هێنابۆوە لایەنگری جیدیی بەرنامە ریفۆرمیستییەکانی گۆرباچۆڤ بوون. گورباچۆڤ دەیتوانی بە پشتبەستن هەر بەو زۆرینەیە بەرنامە دلّخوازەکانی خۆی بە ئازایەتییەکی زیاترەوە بەرێتە پێشێ.

گورباچۆڤ پاش ئەوەی کۆنگرەی بیست و حەوتەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی لە کۆلّ بۆوە، کە رۆژی شەشی مارسی 1086 کۆتایی پێهات جارێکی دیکەش سەرنج و گرینگیی دایەوە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتی و رۆژی بیست و نۆی مارس لە ئاخافتنێکی تەلەڤزیۆنیدا داوای لە رەیگان سەرۆك کۆماری ئەمریکا کرد بە زووترین کات لە پایتەختی یەکێك لە ولاّتانی ئەورووپایی چاویان بە یەکتر بکەوێ و لە سەر پێشگرتنی یەکجارەکی بە تاقیکردنەوە ناوکییەکان، کە دەتوانێ پێشەکییەك بێ بۆ ئابلۆقەی بە تەواویی چەکە ناوکییەکان دانوستان بکەن. وتە بێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هەر بۆ سبەینێی ئەو رۆژە ئەو داوایەی رەت

کردەوە و رایگەیاند، کە بە پێی رێککەوتنی پێشوو لە ژنێڤدا رێبەرانی هەر دوو وڵات دەبێ لە ئەمریکا کۆبنەوە و بڕیاری داهاتووی سەرکردەکانیش ناکرێ تایبەت بۆ مەسەلەی پێشگرتن بە تاقیکردنەوە ناوکییەکان تەرخان بکرێ. بلاڤۆکی ئەمریکیش نووسیان، کە پێشنیارەکەی رێبەری سۆڤیەتی تەنیا لایەنی بانگەشەیی هەیە ئەگینا ئەو لە بری ئەوەی کە ئەو گەلاڵەیە لە بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنیدا بێنێتە گۆڕێ دەیتوانی نامەیەك بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا بنووسێ و بنەما پێشنیارییەکانی خۆی تێدا بگونجێنێ.

رۆژی بیست و پێنجەمی ئاپریلی 1986 تەقینەوەیەکی گەورە لە وزەخانەی ناوکیی چێرنۆبیلی ئۆکرایندا باڵی بەسەر مەسەلە پێوەندیدارەکانی بە سیاسەتی نێوخۆیی و دەرەوەی سۆڤیەتیدا کێشا. دەوڵەتی سۆڤیەتی هەتا بیست و هەشتەمی ئاپریل، کە رادەی تیشکدانەوە(تشعشع) ناوکییەکان لە وڵاتانی سکاندیناڤیادا بە شێوەیەکی مەترسیدار رووی لە زیادبوون کرد هەواڵی ئەو تەقینەوەیەی رانەگەیاندبوو و وەدرەنگی خستنی بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵە بووە هۆی نارەزایەتیی توندی وڵاتانی ئەورووپی و ئەمریکا. بەرپرسانی سۆڤیەتی لە کۆتاییەکانی ئاپریلدا هەواڵەکانی پێوەندیدار بە چۆنێتیی تەقینەوەکەی چێرنۆبیل و راگواستنی سەد وسی هەوار دانیشتووی دەوروبەری ئەو وزەخانەیەیان بڵاو کردەوە و رۆژی سی ویەکەمی ئاپریل یەکێك لە بەرپرسانی باڵوێزخانەی سۆڤیەتی لە واشنگتن بەشداری کۆنگرەی ئەمریکا بوو و وێڕای شیکردنەوەی کردەوەی کۆنترۆلکردنی سووتمانی وزەخانەکەی چێرنۆبیل دڵنیایی پێدان، کە مەترسییەکە تەواو بووە. لەگەڵ ئەوەشدا هەتا رۆژی دەی مانگ واتە شازدە رۆژ پاش تەقینەوەکە، بلاڤۆکە خۆرئاواییەکان بە پشتبەستن بە وێنەی وەرگیرا و بە مانگی دەسکرد و راپۆرتی رادەی رادیۆ ئەکتیڤیتە لە وڵاتانی سکاندیناڤیا و ئەورووپای خۆرئاواییدا باسی درێژە و بەردەوامیی سوتمانیان لە وزەخانەی چێرنۆبیلدا دەکرد.

ئاخرییەکەی گورباچۆڤ رۆژی چواردەی مانگی مای واتە بیست رۆژ دوای تەقینەوەکە وزەخانەی چێرنۆبیل، کە بە گەورەترین رووداوی لەو جۆرە لە سەرانسەری جیهاندا لەقەڵەم دەدرا، لە ئاخافتنێکی تەلەڤزیۆنیدا کۆتایی رووداو و کۆنترۆل کرانی سووتمانەکەی بە تەواوەتی راگەیاند و بە توندی رەخنەی لەو هەڵلا و هاتوهاوارە گرت، کە بلاڤۆکی خۆرئاوایی بە تایبەتی ئەمریکییەکان لەو پێوەندییەدا وەڕێیان خستبوو. سەرەڕای ئەوە خۆبواردنی سۆڤیەتی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی تەقینەوەکە هەتا سێ رۆژ دواتر پاکانەی بۆ نەدەکرا و پاساوی هەڵنەدەگرت و بە هۆی ئەو رووداوەوە بایەخ و ئیعتباری گورباچۆڤ زیانی وێکەوت. رادەی

تیشکدانەوەکانی رووداوی تەقینەوەکەی چێرنۆبیل لە ولاتانی ئەوروو پێـدا هـەتا سـەرەتاکانی مانگی ژووئەن واتە هەتا چل رۆژ پاش رووداوەکە لە رادەبەدەر بوو و دامەزراوە پزیشکییەکانی ئەورووپای خۆرئاوایی رایانگەیاند، کە دەرکەوتەکانی ئەو تەقینەوەیە هەتا سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەکەمیش تەواو نابێ.

# 7

رێبەرانی ولاتانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ لە رۆژانی دە و یازدەی ژووئـەنی 1986دا لـە بوداپێست کۆنفرانسێکیان گرت و گورباچۆڤ لەو کۆبوونوەیە بـۆ روونکردنـەوە و شـیکردنەوەی سیاسییەتە تازەکانی خۆی بۆ رێبەرانی ولاتگەلی ئەورووپای خۆرهەلاتی کەڵکی وەرگرت.

رێبەرانی ولاتانی ئەورووپاش خۆرهەلاتی کە زۆربەیان تەمەنیان لە سەرووی حـەفتا سـال و لە بەرماوەکانی سەردەمی بێرژنێڤ بوون نیگـەرانی ئـەوە بـوون، کـە گۆڕانـەکانی سـۆڤیەتی کاریگەریی و شـوێن لـە سـەر ولاتـەکانی ئـەوان دابـنێ و ترسـی ئـەوەیان رێنیشـتبوو، کـە هەولەکاتی گورباچۆڤ وەکو خەباتی دژەسـتالینیی خرۆشـۆف لـە سـالی 1956دا کۆمـەڵێك بزووتنەوەی لێ بکەوێتەوە و جلەوی کاریان لـە دەسـت دەربچـێ. گورباچـۆڤ بـە روالـەت لـە کۆنفرانسی بوداپێستدا رێبەرانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆی دلنیا کـردەوە، کـە ئازادیـان دەکـا لەوەی خۆیان لەگەل سیاسەتە نوییـەکان رێکبخـەن یـان نـا، و پێـی داگرتـەوە، کـە هـەرکام لەولاتانی سۆسیالیستی دەبێ سیاسـەتە ئابوورییـەکانیان وردە وردە و بـە پێـی هەلومـەرجی تایبەتی هەر ولاتێك بگۆڕن.

کرنفرانسی ولاتانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ بە پەیامێکی مێـژوویی بـۆ ولاتـانی ئەنـدامی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری(ناتۆ) لە سەر کەمکردنەوەی دوولایەنـەی هێـزە نـاوکی و غـەیرە ناوکییەکان (لـە ئاتلانتیکـەوە هـەتا ئـۆرال) کۆتـایی پێهـات و بـە دوای ئـەوەدا گورباچـۆڤ

پێشنیارێکی نوێی بۆ سنووردارکردنی چەکە ناوکی و گەردوونییەکان خستەروو. ڕۆژی هەژدەی ئووت گورباچۆڤ لە ئاخافتنێکی تەلەڤزیۆنیدا رایگەیاند، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی بڕیارەکەی پێشووی خۆی لە سەر راگرتنی یەکلایەنەی تاقیکردنەوە ناوکییەکان هەتا سەرەتای ژانوییەی 1987 رەچاو دەکا و بۆ جارێکی دیکەش پێشنیاری بە رەیگان کرد، کە هەتا کۆتایی ساڵی 1986 لە سەر راگرتنی بە تەواوەتیی تاقیکارییە ناوکییەکان هەر دوو وڵات دانوستان بکەن.

هێرشی ئاشتیی سۆڤیەتی لە کۆنفرانسی چەککردنی ئەورووپا، کە لە نێوەڕاستی سێپتەمبەردا بە بەشداریی نوێنەرانی 35 وڵاتی ئەندامی رێکخراوی هاوکاری و تەناهیی ئەورووپا لە ستۆکهۆلم پێك هات رێککەوتنێکی نوێی بە مەبەستی زیادکردنی هاوکار و هەستی متمانەی دوو لایەنەی نێوان ئەو وڵاتانە لە رێگەی گۆڕینەوەی زانیاری لە سەر جموجۆڵی سەربازیی لە ئەورووپادا لێکەوتەوە و بە دوای ئەوەدا راگەیەندرا، کە ئەمریکاو سۆڤیەتی دواجار لە سەر دەست پێکردنی کۆمەڵێك دانوستانی نوێ لە ئاستی رێبەرانی دوو وڵاتدا رێککەوتوون. دووەمین چاوپێککەوتنی رەیگان و گورباچۆڤ لە رۆژەکانی یازدە و دوازدەی ئۆکتۆبەری 1986 لە ریێکیاڤیك ی پایتەختی ئیسلەند بوو، بەڵام سەرەڕای کۆمەڵێك رێککەوتنی بنەمایی لەنێوان رێبەرانی دوو وڵاتدا لە سەر کۆکردنەوەی مووشەکە ناوکییەکان و کەمکردنەوەی دوو لایەنەی هێزەکان لە ئەورووپادا، پێداگریی گورباچۆڤ لە سەر پاشگەزبوونەوەی ئەمریکا لە جێبەجێکردنی گەڵاڵەی مەشهوور بە شەڕی ئەستێرەکان و خۆبواردنی رەیگان لە قەبووڵکردنی ئەو پێشنیارە، دانوستانەکانی کێشایە بن بەست و راگیران. لەگەڵ ئەوەشدا دانوستانەکانی ریێکیاڤیك بە قازانجی سۆڤیەتی تەواو بوو، چونکی ئاشکرابوونی رێککەوتنەکانی نێوان رەیگان و گورباچۆڤ بە بێ پرس و راوێژ بە وڵاتانی هاوپەیمانی ئەمریکا لە ناتۆدا بووە هۆی تووڕەیی هاوپەیمانانی ئەورووپیی ئەمریکا و زیاتربوونی بەدگومانی و دڕدۆنگیی ئەوان لە ئەمریکا.

گورباچۆڤ لە کۆتاییەکانی نۆڤەمبەری ساڵی 1986دا سەردانی هیندستانی کرد و لە کاتی گەڕانەوەیدا لە هیند سەردانی کۆمەڵێك لە کۆمارییە ئاسیاییەکانی سۆڤیەتییشی کرد. گورباچۆڤ هەر لە جەنگەی ئەو سەفەرانەدا وێڕای ئاخافتنێك لە تاشکەند بۆ یەکەمین جار رەخنەی لەو رێبەرە حیزبی و دەوڵەتییانە گرت، کە لە رێوڕەسمە ئایینییەکاندا بەشداری دەکەن و گوتی ئەگەر ئەوان کۆمۆنیستن چۆن دەتوانن باوەڕی ئایینییان هەبێ و ئەگەر باوەڕی ئایینیشیان نییە و تەنیا خۆی پێوە دەنوێنن ئەوە نیشانەی لاوازی و نەبوونی لێوەشاوەییانە.

وتەکانی گورباچۆڤ لە بڵاڤۆکەکانی جیهانداوا لێکدرانــەوە، کــە رێبــەری ســۆڤیەتی نێگــەرانی دزەکردن و نفوزی کۆماری ئیســلامییە بــۆ نێــو کۆمارییــە موســڵمانەکانی ســۆڤیەتی و ئــەو راپۆرتگەلەی، کە لە پێوەندی لەگەڵ بەشداریی هێنــدێ لــە بەرپرســانی حیزبــی لــە رێورەسمــە ئایینییەکاندا پێی گەیون ئەوی نیگەرانتر کردووە.

بە دوای وتەکانی گورباچۆڤدا کۆمەڵێك گۆڕان لــە بەرپرســانی حیزبــی و دەوڵــەتیی پێــنج کۆماری ئاسیای ناوەندیی سۆڤیەتی: تاجیکستان و قیرقیزستان و تورکەمەنستان و قەزاقستاندا پێکهات، بەڵام ئەو گۆڕانانەی، کە لە گەورەترینی ئەو کۆمارییانەدا کرا کۆمــەڵێك ئــاڵۆزی و رووداوی خوێناویی لێکەوتنەوە. گرینگترینی ئەو رووداوانــە لابرانــی "دیــن محمــد کونــاوێڤ" رێبەریی خۆجێیی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقســتان و دەسنیشــانکردنی کابرایــەکی روســی بــە ناوی"گێنادی کۆلبین" لە جێگەی ئەو بوو. دین محمد کوناوێڤ، کە رۆژی شازدەی دیســێمبەری 1986 بە فەرمانی راستەو خۆی گورباچــۆڤ لــە ســکرتێریی یەکــەمی حیزبــی کۆمۆنیســتی قەزاقستانی لێ ئەستێنرایەوە لایەنگری تۆخی بێرژنێڤ بوو، کە شــازدە ســاڵ پــێش ئەنــدامی دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو و پاش کۆنگرەی بیست و حەوتەم دیســان بۆ ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی هەڵبژێردرابۆوە.

سبەینێی لە سەر کار لابرانی دین محمد کۆناوێڤ رۆژی حەڤــدەی دیســێمبەر بــە نیشــانەی نارەزایەتیی بە لە سەر کارلابردنی ئەوو و دانانی کەسێکی روسی لە جێگەی ئەو بۆ ســکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان خوێندکارانی موسڵمانی زانکۆی ئالمائاتا ی پایتــەختی کۆماری قەزاقستان خۆپێشاندانیان وەرێخست. بۆ ســبەی رۆژێ ئــەو خۆپێشــاندانانە لــە رۆژی هەژدەی مانگدا بەرینتر بۆوە و لــە پایتــەختی قەزاقســتاندا ئــاڵۆزی و بشــێوییەکی بێوێنــەی لێکەوتەوە. هەواڵگریی فــەرمیی ســۆڤیەتی _تــاس) بــە پێچــەوانەی نــەریتی ئاســایی خــۆی راپۆرتێکی تێروتەسەلی لە سەر ئــەو ئالۆزییانــە بڵاوکــردەوە و تێیــدا رایگەیانــد "کۆمــەڵێك هەرچی و پەرچی و بەرەڵلا و لۆتی و پۆتی و دژە کۆمەڵ ولاتیان ئاڵۆز کردووە و فرۆشگەکانیان تالان کردووە و ترۆمبیلیان ئاگر داون." لــە راپۆرتەکــەدا ئاماژەیــەك بــە هۆکــاری ئــاڵۆزی و بشێوییەکان و پێوەندیی بە لە سەر کار لابرانی دین محمد کۆناوێڤ سکرتێری یەکــەمی حیزبــی کۆمۆنیستی قەزاقستان ــەوە نەکرابوو، بەڵام بەو راپۆرتانەی، کە لە رۆژانی دواتردا لە رێگەی هەواڵنێری و بڵاڤۆکە خۆرئاواییەکانەوە بڵاو بوونەوە دەرکەوت، کە بەربڵاویی خۆپێشــاندانەکان لە پایتەختی کۆماری قەزاقستاندا بووەتە هۆی دەستێوەردانی هێــزە چــەکدارەکان و کــوژران و

بریندار‌بوونی ژماره‌یه‌ك لـه خۆپێشـانده‌ران و چـه‌ند كـه‌س لـه ده‌وروبه‌رییـه‌كانی كۆنـاوێڤ و مامۆستایانی زانكۆی ئالمائاتا وه‌كو تاوانبـارانی بشـێوییه‌كان ده‌ستبه‌سـه‌ر كـراون. كۆنـاوێڤ خۆیشی جگه له‌وه‌یكه پۆستی سكرتێریی یه‌كه‌می حیزبی كۆمۆنیستی قه‌زاقستانی له ده‌ست دا له گۆڕانه‌كانی دواییشدا پۆستی ده‌فته‌ری سیاسیی حیزبی لیٚ ئه‌ستێنرایه‌وه.

دوایـین رووداوی گرینگـی سـاڵی 1986 لـه سـۆڤیه‌تیدا، كـه لـه لایـه‌ن سـۆڤیه‌تییه‌وه پێشوازییه‌كی خه‌ستی لێكـرا ئـازادبوونی سـاخارۆف بیرمه‌نـدی نـارازی و نـاوداری روسـی و هاوسه‌ره‌كه‌ی له تاراوگه و گه‌ڕانه‌وه‌یان بۆ مۆسكۆ لـه شـه‌وی كریسمه‌سـی سـاڵی 1986 دا بوو. گورباچۆڤ، كه خۆی بڕیاری هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی حوكمی دوورخرانه‌وه‌ی سـاخارۆفی ده‌ركردبـوو ئیزنـی دا لـه مۆسـكۆ كۆنفرانسـێكی چـاپه‌مه‌نی پێـك‌بـێنیٚ و سـاخارۆف لـه‌و كۆنفرانسـه چاپه‌مه‌نییه‌دا وێڕای ده‌ربڕینی خۆشحاڵی له‌و گۆڕانانه‌ی به‌سه‌ر سۆڤیه‌تیدا هاتوون گـوتی، كـه ئه‌وه‌نده ریفۆرمه‌ی به لاوه به‌س نییه و ئه‌و خوازیاری ئازادیی ته‌واوی زیندانییه سیاسـییه‌كانی سۆڤیه‌تییه. ساخارۆف سیاسه‌ته‌كانی گورباچۆڤی به گۆڕانێكی گه‌وره له سۆڤیه‌تیدا زانی، به‌ڵام گوتی بۆداوه‌ریكردن له سه‌ر نیازپاكیی ئه‌و تێپه‌ڕینی كات پێویسته.

له سه‌ره‌تای ساڵی 1987 گورباچۆڤ یه‌كه‌مین هه‌نگاوه‌كانی خۆی له ئاقـاری گـۆڕانێكی بنه‌ڕه‌تی له سیسـته‌می ئـابووریی سـۆڤیه‌تیدا هـه‌ڵگرت: ئه‌سـڵی ئۆتۆنـۆمی بـه شـێوه‌یه‌كی ئه‌زموونی له هێندیٚ له دامه‌زراوه پیشـه‌یی و به‌رهه‌مهێنه‌ره‌كانـدا به‌ڕێوه‌چـوو، وه‌رزێـران لـه به‌ڕێوه‌به‌ریی كاروباری جوتیاری و وه‌رزێریدا له كێڵگه هاوبه‌شه‌كاندا رۆڵێكی زیاتریان پێـدرا و به‌ڕێوه‌به‌رانی یه‌كه كشتوكاڵییه هاوبه‌شه‌كان له فرۆشتنی به‌رهه‌مه‌كانیاندا و له تـه‌رخانكردنی به‌شێك له‌و به‌رهه‌مگه‌له بۆ وه‌رزێره‌كان ده‌ستیان ئاوه‌ڵاتر بوو،

چالاكیی تایبه‌تی له هێندیٚ بوارگه‌لی ئابووریدا ئازاد كرا و هاووڵاتیانی سۆڤیه‌تیی ئیزنیان پیٚ درا به دانان و كردنه‌وه‌ی رسـتورانت و كاروبـاری تـه‌كنیكی وه‌ك لووله‌كێشـی و كاروبـاری بیناسازی و میكـانیكی و خزمـه‌تی كولتـووری و هونـه‌ری وه‌كـو گوتنـه‌وه‌ی وانـه‌ی زمـان و شێوه‌كاری و به‌رگدوورین بژیوی خۆیان ده‌ربێنن. گرینگیـی ئـه‌و گۆڕانـه له‌گـه‌ڵ ئـه‌وه‌دا، كـه بواره‌كانی چالاكی نواندن له كه‌رتی تایبه‌تدا به‌رته‌سك بوون ئه‌وه بوو، كه بۆ یه‌كه‌مین جار ئیزن به خه‌ڵكی سـۆڤیه‌تی درا، كـه لـه‌و دراوه‌ی، كـه پاشـه‌كه‌وتیان كـردووه بـۆ كـار وكاسـبی و ده‌سته‌به‌ركردنی داهاتی پتر كه‌ڵك وه‌رگرن له حاڵێكدا پێشتر كه‌ڵك وه‌رگرتن له سـه‌ر مایـه بـۆ ده‌سته‌به‌ركردنی داهات دژایه‌تیی له‌گه‌ڵ بنه‌ماكانی ماركسیزمدا هه‌بوو.

لە ژانوییەی ساڵی 1987دا گورباچۆڤ لە ئاخافتنێکدا لە بەردەم زیاتر لە سێسەد کەس ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا گوتی، کە پێداچوونەوە و ریفۆرم لە سیستەمی ئابووریی وڵاتێکدا پێویستە و کۆمەڵێك بەرنامە و پرۆژە بۆ گۆڕانی بنەمایی لە بەڕێوەبەریی کاروباری ئابووریی وڵاتدا دەدرێتە کۆبووونەوەی داهاتووی کۆمیتەی ناوەندی. گورباچۆڤ هەر لەو ئاخافتنەدا بە توندی رەخنەی لە بەربلاویی پانتایی گەندەڵی لە دەیەی 1970 واتە لە سەردەمی حکوومەتی بێرژنێڤدا گرت و دانی بەوەدا نا، کە پاش دوو ساڵ خەبات دژی گەندەڵیی ئیداری هێشتا لە رێکخراوە دەوڵەتی و دامەزراوە بەرهەمهێنەرەکاندا گەندەڵی بنەبڕ نەکراوە و بەرهەمی یەکە پیشەییەکان لە رووی چۆنایەتییەوە نەگەیشتۆتە ئاستی چاوەڕوانکراو. گورباچۆڤ لەو ئاخافتنەدا بۆ یەکەم جار باسی لە پێویستیی دیموکراتیزەکردنی هەڵبژاردنەکانی بەرپرسانی حیزبی و ئەندامانی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتی کرد و رایگەیاند، کە لە داهاتوودا لە بری ناساندنی پاڵێوراوێکی حیزبی بۆ ئەو پۆستانەی ئەندامیان بۆ هەڵدەبژێردرێ، دەبێ ئیزن بدرێ کەسانی جۆراوجۆر خۆیان بپاڵێون و دەنگ دەران لە هەڵبژاردن لە نێوانیاندا ئازاد بن. وتەکانی گورباچۆڤ لە لایەن زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییەوە بە گەرمی پێشوازیی لێکرا، بەڵام بووە هۆی نیگەرانی لە نێو پاشماوەکانی سەردەمی بێرژنێڤدا، کە لە پۆست و پێگەی خۆیان دەترسان.

لە سەرەتاکانی فێبریەی 1987دا نزیك بە سەد و پەنجا بەندیی سیاسیی سۆڤیەتی، کە کۆمەڵێك کەسایەتیی ناوداریشیان لەگەڵدا بوو ئازاد کران و لە نێوەڕاستەکانی فێبریەدا گورباچۆڤ بە گرتنی کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی بۆ "جیهانی سەربەست لە مەترسیی ناوکی و مانەوەی مرۆڤایەتی"، کە نزیك بە هەزار کەسایەتیی سیاسی و بیرمەند و هونەرمەند و نووسەری ناوداری دەرەکیی تێیدا بەشدار بوون شتێکی سەرسووڕهێنەری خولقاند. لەو کۆبوونەوەیەدا، کە لە هۆڵی گەورەی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتیدا لە کرێملین بەڕێوە چوو، ساخارۆف بیرمەندی ناوداری سۆڤیەتی، کە سێ مانگ لەوەپێش لە تاراوگەکەخۆی لە گورکییەوە گەڕابۆوە مۆسکۆ بەشداری ئەو کۆبوونەوەیە بوو و بە ئازادی لەگەڵ بانگهێشت کراواندا قسەی دەکرد.

لە کۆبوونەوەی کردنەوەی ئەو کۆنفرانسەدا، کە لە رۆژی چواردەهەمەوە هەتا رۆژی شازدەی فێبریوەری لە مۆسکۆ خایاند گورباچۆف لێدوانێکی گرینگی دا و تێیدا گوتی، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی لە دڵەوە خوازیاری نەهێشتنی چەکە ناوکییەکان و کۆتاییهێنانە بە کێبڕکێی

چەکوچۆڵ و تەقەمەنی و جێبەجێ بوون و بەڕێوە چوونی زۆربەی ریفۆرمە کۆمەڵایەتی و پێشکەوتە ئابوورییەکان لەو وڵاتەدا گرێ دراونەوە راگرتن و کۆتاییهێنان بە کێبڕکێی چەکوچۆڵ و گوژمەی سەربازی لە پێناوی دابینکردنی ژیانی کۆمەڵگەدا. گورباچۆڤ گوتی خۆرئاوا دەبێ ئەوە قبووڵ بکا، کە زنجیرەیەك گۆڕانی بنەڕەتی لە سۆڤیەتیدا بەڕێوەن و ئەو گۆڕانانە لە بیرۆکە و نوێگەرایی سەرکردایەتیی سۆڤیەتییەوە سەرچاوە دەگرن نەك لە گوشارەکانی خۆرئاواوە. ئاخافتنی گورباچۆڤ لەو کۆنفرانسەدا دەربڕینی هەست و ئیحساساتی زۆربەی بانگهێشت کراوانی خۆرئاوایی بە دواوە بوو، بەڵام هەواڵنێرانی چاپەمەنی و تەلەڤزیۆنەکانی جیهان لە هەمووان پتر سەرنجیان بە لای چەپڵەلێدانی ساخارۆفەوە بووو.

ساخارۆف لە سێ ئاخافتندا لە کۆبوونەوەکانۆ ئەو کۆنفرانسەدا لە سەر رەوش و مەسەلە نێودەوڵەتییەکان قسەی کرد و لە سەر قۆناغگەلی نەهێشتنی چەکە ناوکییەکان کۆمەڵێك پێشنیاری خستنە روو، کە گورباچۆڤ لە سەرەتای مانگی مارسدا هاوشێوەی ئەوەی لە گەڵاڵەیەکی نوێدا بۆ کۆکردنەوەی مووشەکە ناوکییەکان لە ئەورووپادا هێنایە گۆڕێ. ساخارۆف لە یەکەمین ئاخافتنی خۆی لەو کۆنفرانسەدا وێڕای پشتڕاستکردنەوەی وتەکانی گورباچۆڤ وتی:" درێژە کێشانی کێبڕکێی خۆ پڕ چەککردن کۆسپێکی گەورەیە لەبەر دەم رەوتی گۆڕان و ریفۆرم و دیموکراسی و ئازادی و پێشکەوتنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لە سۆڤیەتیدا. گورباچۆڤ و هاوکارەکانی ئەو، کە لەگەڵ خەباتێکی جیددی و دژوار دژی مۆرەگەلی دەمارگرژ و کۆنەپەرست و خۆپەرست لە ئاستی رێبەریی ئەو وڵاتەدا دەستەو یەخە بوو لە قسەکانیاندا لە ئاقاری راگرتن و تەواوکردنی کێبڕکێی خۆ پڕ چەککردندا راستگۆن و درۆ ناکەن، چونکی بە بێ تەرخانکردنی بەشێك لە گوژمە و بودجەی سەرسووڕ هێنەری تایبەت بە چەکوچۆڵ أ بۆ دابینکردنی بژیو و ژیانی کۆمەڵگە و بەهەمهێنانی کەلوپەل و کاڵای بەکارهێنان، لەو خەباتەدا سەرناکەون".
ساخارۆف هەر لەو ئاخافتنەیدا داوای لە دەوڵەتە خۆرئاواییەکان بە تایبەتی ئەمریکا کرد، کە ئەو هەلە بێوێنەیە بۆ پێوەندی گرتنی زیاتر بە یەکێتی سۆڤیەتییەوە بقۆزنەوە و بە پێشوازیکردن لە پێشنیارەکانی رێبەرانی نوێی سۆڤیەتی بۆ راگرتن و کۆتاییهێنان بە کێبڕکێی خۆ پڕ چەککردن، یارمەتیی رەوتی گۆڕان لەو وڵاتەدا بەرەو ئازادی و دیموکراسی بکەن.

کۆنفرانسی ئاشتی و چەکداماڵینی ناوکیی مۆسکۆ یەکێك لە سەر کەوتووترین بەرنامە پروپاگەندەییەکانی سۆڤیەتی بوو، چونکی ئەو سەدان نووسەر و کەسایەتییە ناودارە

نێونەتەوەییەی وەك جۆن كێنێت گالبرایت" و "نۆرمەن میلەر" و"گراهام گرین" و گۆرێ ڤیجال" و "گریگۆری پەك"، كە بەشداری ئەو كۆنفرانسە بوون لە گەڕانەوەیاندا لە مۆسكۆ وە دەستیان كرد بە پەسنی سۆڤیەتیی گورباچۆڤ و داوایان لە رێبەرانی خۆرئاوایی كرد، كە نیاز پاكیی خۆیان لە بەرامبەر پێشنیاری ئاشتیخوازانەی رێبەری نوێی سۆڤیەتیدا نیشان بدەن و متمانە بە قسەكانی بكەن.

گورباچۆڤ دوو حەوتوو پاش كۆنفرانسی ئاشتی و دامالینی چەكی ناوكیی مۆسكۆ بە مەبەستی كەڵك وەرگرتن لەو كەشە لە بارەی، كە لە خۆرئاوادا پێكهاتبوو پێشنیاری هەڵلا خولقێنی كۆكردنەوەی تەواوی مووشەكە نێونج بڕە ناوكییەكانی لە ئەورووپا هێنایە گۆڕی و و لە راستیدا هەر هەمان پێشنیارەكەی پێشووی رەیگانی، كە پاشگەز بوونەوە لە دامەزراندنی مووشەكە كرووز و پرشینگ2 ـەكانی بەستبۆوە بە كۆكردنەوەی مووشەكە ئێس ئێس 2ـەكانی سۆڤیەتی لە ئەورووپای خۆرهەلات، دایەوە بە خۆی. ئیتر رەیگان لە دۆخێكدا نەبوو، كە وەلامی "نا" بە سۆڤیەتی بداتەوە و هەربۆیەش بە هەنگاوێكی گرینگ لە پێناوی رێككەوتن لەگەڵ سۆڤیەتیدا ناوی برد و رایگەیاند، كە وەزیری دەرەوەی خۆی بۆ دانوستان لە سەر وردەكارییەكانی پێوەندیدار بەو مەسەلەیەوە دەنێرێتە مۆسكۆ.

بەلام ئەمجارەیان هاوپەیمانە ئەورووپییەكانی ئەمریكا لە سەر مەسەلەی كۆكردنەوەی مووشەكە ناوكییەكانی ئەورووپا دڕدۆنگییان دەربڕی و خاتو مارگارێت تاچێر سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، كە لە كۆتایی مانگی مارسدا بە فەرمی سەردانی سۆڤیەتیی كرد راشكاوانە گوتی، كە كۆكردنەوەی مووشەكە ناوكییەكان لە ئەورووپا نەك مەترسیی جەنگ لەو وشكارۆیەدا لە نێونابا بەڵكو زیاتری دەكا. مارگارێت تاچێر لە وتووێژێكی تەلەڤزیۆنیدا لەگەڵ هەواڵنێرانی سۆڤیەتییدا، كە دەقەكەی بە تەواوی بۆ ماوەی پەنجا دەقیقە لە تەلەڤزیۆنی مۆسكۆوە بلاو بۆوە گوتی، بەو بالادەستییە كلاسیكییەی هێزەكانی سۆڤیەتی و ولاتانی ئەندامی پەیمانی وەرشۆ بەسەر ولاتانی ئەندامی پەیمانی ئاتلانتیكی باكووریدا، كۆكردنەوەی مووشەكە ناوكییەكان لە ئەورووپادا تەناهیی ولاتانی ئەورووپای خۆرئاوایی دەخاتە مەترسییەوە. تاچێر چەكە ناوكییەكانی بە زامن و دەستەبەر كەری ئاشتی ناوبرد و گوتی، كە ئەورووپا هەتا بە تەواوەتی لە نیازپاكیی سۆڤیەتی دلنیا نەبێ و لەوانەیە هەتا بیست سالی دیكە ناتوانێ واز لە چەكی ناوكی بێنێ.

بڵاو بوونەوەی دەقی وتەکانی تاچێر لە تەلەڤزیۆنی مۆسکۆ لە خۆیدا کارێکی سەیر و سەمەرە و بێوێنە بوو، چونکی سەرۆك وەزیری بەریتانیا لەو وتووێژەدا راشکاوانە رەخنەی لە سۆڤیەتی گرت و رەخنەکانیشی لە هێندێ بواردا بە تایبەتی لە سەر ئەفغانستان و مەسەلەی چەکوچۆڵ دا تاڵ و رەق بوون. لەگەڵ ئەوەشدا خاتو تاچێر لەمەڕدانی ماف و ئازادیی زیاتر بە خەڵکی سۆڤیەتی، تاریفی سیاسەتەکانی گورباچۆڤی کرد و پەسنیکردن و گوتی سەرکەوتنی ئەو سیاسەتە و گۆڕینی سۆڤیەتی بۆ کۆمەڵگەیەکی کراوە، لە رەوت وئاقاری زەمەندا دەبێتە هۆی گەشەو بەربڵاوتر بوونەوەی پێوەندییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاواو دەبێتە هۆی متمانەی پتر لە نێوانیاندا.

# 8

گورباچۆڤ لە سێیەمین ساڵی حکوومەتەکەیدا توانیی بەسەر زۆربەی ئەو نیگەرانی و رەش بینییانەدا زاڵ بێ، کە لە خۆرئاوادا سەبارەت بە سیاسەتە نوییەکانی سۆڤیەتی باسیان لە سەر دەکرا و وشەگەلی گلاسنۆست Glasnost و دیموکراتیزاتسیا Demokratizasiya و و پێرێسترۆیکا Peretroika، کە هەر کام بە مانای کەشی کراوە و سەقامگیریی دیموکراسی و نوێگەرایی (نۆژەنکردنەوە) دێن و لە ئاخافتنەکانی گورباچۆڤدا لە زار و زمانی نەدەکەوتن ئیتر بۆ خوێنەرانی چاپەمەنییە خۆرئاواییەکانیش ببوونە وشەگەلێکی ئاشنا. بەرپرسانی فەرمیی وڵاتانی خۆرئاوایی هێشتا بە دڕدۆنگی و گومانەوە لە راستگۆیی و نیازپاکیی گورباچۆڤیان دەڕوانی لێی دەدوان، بەڵام بڵاڤۆکی خۆرئاوایی، کە لە بیچمدان بە بیر و رای گشتیی خەڵکی وڵاتەکانیاندا رۆڵی کاریگەرییان هەیە باوەڕیان بە گۆڕانی بنەڕەتی و بنەمایی لە سیاسەتەکانی سۆڤیەتیدا کرد و گۆڤارێکی وەکو تایم، کە بڵاوکەرەوەی کۆنەپارێزترین توێژی سیاسەتڤان و بەرپرسانی ئەمریکییە لە ماوەی کەمتر لە سێ مانگدا دوازدە جار وێنەی گورباچۆڤی لە سەر بەرگی خۆی چاپ کرد و لە ژمارەی رێکەوتی 27ی ژوئیەی 1987 یدا هەوڵەکانی ئەوی وەك شۆڕشی دووەم ی روسییە ناو برد. هەر ئەو گۆڤارە لە ساڵی 1987دا

بۆ یەکەمین جار وتاری نووسەرانی روسیی وەك "یفتۆشێنگۆ"ی بڵاو کردەوە و لە زمانی ئەوانەوە کەوتە پاساو و پاکانە بۆ سیاسەتەکانی کەشی کراوە و ئاوەڵای گورباچۆڤ.

گورباچۆڤ لە ماوەی ساڵی 1987دا کۆمەڵێك هەنگاوی نوێ و کاریگەری لە پێناوی راکێشانی سەرنج و متمانەی وڵاتانی خۆرئاواییدا هەڵگرت، کە بۆ نموونە دەکرێ باسی بڕینی پارازیت(خەش) لە سەر بەرنامە رادیۆییەکانی ئەمریکا و BBC و ئازادیی بڵاوکردنەوەی وتارگەلی رەخنەیی لە چاپەمەنییەکانی سۆڤیەتیدا و بەشداریی پاڵێوراوانی جۆراوجۆر لە هەڵبژاردنە خۆجییەکانی سۆڤیەتیدا و هەروەها نیشاندانی فیلم و بڵاوکردنەوەی کتێب گەلێك، کە لەوە پێش قەدەغە بوون، بکەین. بۆ یەکەمین جار بڵاو بوونەوەی دەقی روسیی دوکتور ژیڤاگۆ لە سۆڤیەتیدا ئازاد کراو گرینگتر لەوە لە کۆتایی ساڵی 1987دا چیرۆکێك بە ناوی "منداڵانی ئاریات" لە سۆڤیەتی بڵاو بۆوە، کە بە باشترین شێوە کارەساتەکانی سەردەمی ستالین وێنا دەکا. نووسەری ئەو کتێبە "ئاناتۆلی ریباکۆڤ" ـە و رەخنەگرانی خۆرئاوایی پاش رۆمانی دوکتۆر ژیڤاگۆ بە گەورەترین بەرهەمی ئەدەبیی سۆڤیەتیی دەزانن.

بەڵام گرینگترین گۆڕانەکانی ساڵ 1987 ی سۆڤیەتی بڕیارەکانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە مانگی ژووئەندا بوون. لە کۆبوونەوەی گشتیی کۆمیتەی ناوەندیدا، کە رۆژی بیست و پێنجەمی مانگی ژووئەنی 1987 لە مۆسکۆ گیرا گورباچۆڤ لە راپۆرتێکی پوخت و تێر و تەسەلدا لە سەر رەوشی ئابووریی سۆڤیەتی گوتی، کە ئابووریی سۆڤیەتی لەگەڵ کۆمەڵێك کێشە و کەمایەسی بەرەوڕووبۆتەوە و "لە هەلومەرجی بەر لە قەیران دایە". گورباچۆڤ وێڕای دانپێدانان بەوەدا، کە سۆڤیەتی لە بواری تێکنۆلۆجیادا لە خۆرئاوا دواکەوتووە گوتی بۆ ریفۆرمی بنەڕەتیی ئابووری لە سۆڤیەتیدا لە دوو سێ ساڵ پتر هەل و دەرفەت لەبەر دەستدا نییە هێندێ گۆڕان و ریفۆرمی رووکەشیانە چارەسەریی هیچ کێشەیەك ناکا. گورباچۆڤ لەو راپۆرتەدا بە راشکاوی باسی لەو دژکردەوانە کرد، کە لە بەرامبەر ریفۆرم و چاکسازییدا دەکرێن و "گلەیی لە کەم کاری و کارشکێنیی کەسانێك کرد، کە تەنیا بیر لە بەرژەوەندی تایبەتیی خۆیان دەکەنەوە". گورباچۆڤ لە کۆتایی ئەو راپۆرتەدا بنەمای ئەو چاکسازی و ریفۆرمەی، کە خۆی دەیویست و لە سەر ئەو چوار بنەمایەی خوارەوە دامەزراوە خستییە روو:

1ـ کەمکردنەوەی زیاتر لە جارانی ناوەندگەرایی و دانی دەسەڵاتی زیاتر بە یەکە بەرهەمهێنەر و پیشەیی و کشتوکاڵییەکان، کە زامن و دەستەبەرکەری "ئوتۆنۆمی"ی ئەوان و

ئازادیی بۆ کڕینی کەرەسەی پێویست و فرۆشتنی کاڵای بەرهەمهاتوو و بەرهەمە کشتوکاڵی و ئاژەڵییەکانە لە بازاڕدا.

2ـ بەستراوەیی مووچەو هەقدەستەکان بە رادەی بەرهەمهێنان و رۆندمانی هەر یەکەیەکی بەرهەمهێنەر.

3ـ هەڵکشان و داکشانی نرخەکان بە پێی داواکاری و خستنەبازاڕ، بەو مەبەستە، کە دەستکرد و بەرهەمەکانی ئەو یەکانەی لە باری چۆنایەتییەوە(کوالیتی) باشترن بە نرخی زیاتر بخرێنە بازاڕەوە.

4ـ بە پێی کاروباری خۆش بژیوی و بردنەسەری بەرهەمی کاڵا مەسرەفییەکان.

گورباچۆ گوتی، کە جێبەجێکردنی ریفۆرمە ئابوورییەکان سێ ساڵی کات پێویستەو لەو ماوەیەدا وردە وردە لە دەسەڵاتی کۆمیتەی بەرنامەی دەوڵەتی یا "گۆسپلان" و کۆمیتەی ئامادەکاریی یەکە بەرهەمهێنەرەکان یا "گوسناپ" کەم دەکرێتەوە، ئەو وەزارەتخانانەی، کە بەشگەلی جۆراوجۆری ئابووری و بەرهەمهێنەر و پیشەییەکانیان خستۆتە ژێر دەسەڵات و چاوەدێریی خۆیانەوە تێکەڵ بە یەکتر دەکرێن و ئەو وەزارەتخانانەش، کە دەمێننەوە زیاتر رۆڵی چاوەدێر و راوێژکار و رێکخەریان دەبێ. گورباچۆڤ هەروەها کوتی دەست ئاوەڵایی یەکە بەرهەمهێنەرەکان هەتا ئاستی ساتوسەودای راستەوخۆ لەگەڵ کۆمپانیا دەرەکییەکان و تەنانەت بەشداربوونیش لەگەڵیاندا پێشبینی کراوە.

گەڵاڵەی "شۆڕشگێڕانەی" گورباچۆڤ پاش دوو رۆژ تاوتوێکردن لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا پەسند کرا و کۆمیتەی ناوەندی کەوتە باس و راوێژ لە سەر هەڵبژاردنی ئەندامانی تازەی دەفتەری سیاسی.

یەکێك لە خاڵە نوێ و سەرنج راکێشەکانی ئەو کۆبوونەوەیەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، بریتی بوو لە باس و لێدوانی ئازاد لە لایەن ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندییەوە لە سەر مەسەلەی جۆراوجۆر و بە پێچەوانەی رابردوو هێندێ لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەند بە راشکاوی دژی ئەو بیر و رایانە دەوێستان، کە سکرتێری گشتیی حیزب دەریدەبڕین. هەر لەو کۆبوونەوەیەدا دین محمد کۆناویڤ سکرتێری یەکەمی لە سەر کار لابراوی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان ئیزنی پێدرا، کە بەرگری لە خۆی بکا لە حاڵێکدا لە رابردوودا هیچکات باو نەبوو، کە بەرپرسێکی رەتێنراو و لە سەر کار لابراو ئیزنی پێ بدرێ لە

کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی یا لەهەر کۆبوونەوەیەکی فەرمیی دیکەدا قسە بکا و لە سەر خۆی وەجواب بێ.

پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە گەورەترین سەرکەوتنەوە بۆ گورباچۆڤ کۆتایی پێهات، چونکی نەك هەر بەرنامە ریفۆرمیە ئابوورییەکانی ئەو بە زۆرینەی دەنگ پەسند کران بەڵکو سێ ئەندامی نوێی دەفتەری سیاسییش لە هاورێیانی نزیکی گورباچۆڤ و لەلایەنگرانی تۆخی بەرنامە ئابوورییەکان سیاسەتە دەرەوەییەکانی ئەو هەڵبژێران. بەو شێوەیە لە چواردە کەسی ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزب تەنیا چوار کەسیان لە پاشماوەکانی سەردەمی بێرژنێڤ بوون، کە یەکێکیان گورباچۆڤ خۆی بوو و ئەوی تر گرۆمیکۆ سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتی بوو.

سەرکەوتنێکی دیکەی، کە لە بواری سیاسەتی نێوخۆییدا بۆ گورباچۆڤ دەستەبەر بوو و پێگەی ئەوی لە جاران پتەوتر کرد ئەوە بوو، کە ئەو بە تەواوەتی هێزی سەربازیی سۆڤیەتیی خستە ژێر فەرمان و کۆنترۆڵی خۆیەوە. لە کۆتایی مانگی مای 1987دا فڕۆکەوانێکی تازەکار و بێ ئەزموونی نۆزدە ساڵەی ئەڵمانی بە ناوی ماتیاس رۆست بە فڕۆکەیەکی جۆری سەسنا لە رێگەی فەنلاندەوە هاتە نێو خاکی سۆڤیەتییەوە و پاش بڕدنی مەودای نزیك بە حەوسەد کیلۆمەتر لە گۆڕەپانی سووری مۆسکۆ نیشتەوە. هەڵفڕینی ئەو فڕۆکەیە بە مەودای حەوسەد کیلۆمەتر لە خاکی سۆڤیەتیدا هەڵلا و هەنگەمەیەکی لە جیهاندا نایەوە و گورباچۆڤ بە دوای ئەو رووداوەدا مارشاڵ سۆلۆکۆڤ وەزیری بەرگریی سۆڤیەتی و مارشاڵی ئاسمانی "کۆلدۆنۆڤ"ی بە هۆی کەمتەرخەمی لە راپەڕاندنی ئەرك و بەرپرسیارەتییەکانیاندا و ئاگا لێ- نەبوونیان لە ئاسمانی سۆڤیەتی لە سەر کار لابرد. گورباچۆڤ، کە وەك سەرۆکی ئەنجوومەنی بەرزی بەرگریی سۆڤیەتی مافی چاوەدێریی بەسەر کاروباری هێزە سەربازییەکانی ئەو وڵاتەدا هەبوو پاش لە سەر کار لابردنی سۆکۆلۆڤ ژەنەراڵێکی 63 ساڵەی بە ناوی دیمیتری یازۆڤ لە جێگەی دانا و ئیزنی پێدا، کە پێداچوونەوە و چاکسازییەکی بنەڕەتی بە هێزە سەربازییەکانی سۆڤیەتیدا بکا.

لەدوایین کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە لە مانگی نۆڤەمبەری 1987دا پێك هات کۆمەڵێك گۆڕانی نوێ لە دەفتەری سیاسیی حیزبدا کران، کە سەرەتاوەك لاوازبوونی پێگەی گورباچۆڤ لە بەرامبەر باڵی کۆنەپارێزی حیزبدا لێکدرایەوە، بەڵام رەوتی گۆڕانەکانی دوایی و سەفەری سەرکەوتووانەی گورباچۆڤ بۆ ئەمریکا لە دیسێمبەری

1987دا پێچەوانەی ئەوەی سەلماند. لەو کۆبوونەوەیەدا حەیدەر عـەلیۆف، کـە دەگـوترا لـە لایەنگرانی تۆخی گورباچۆڤ بووە بە روالەت بە بیانووی نەخۆشـی و لـە سـەر داوای خـۆی لـە دەفتەری سیاسیدا نەما و "بوریس یەلتسین" سکرتێری یەکەمی حیزب لـە مۆسـکۆ، کـە بـە لایەنگری جیددی و تۆخی بەرنامە ریفۆرمیستییەکانی گورباچۆڤ لە قەلەم دەدرا پۆستەکەی لێ ئەستێنرایەوە. پسپۆڕانی کاروباری سۆڤیەتی لە خۆرئاوا لەڕێوە وایان لێك دایەوە، کە پێگـەی گورباچۆڤ لە لە بەرامبەر پیاوی ژمارە 2 ی حیزب واتە لیگاچۆڤدا، کە دەگوترا سەرۆکایەتیی باڵی کۆنەپارێزی حیزب دەکا لاواز و لەرزۆك بووە، بەلام لە حەوتووەکانی دواییدا گورباچۆڤ لەو رێورەسمانەدا، کە بە بۆنەی جێژنی حەفتا ساڵەی شۆڕشی ئۆکتۆبـەر قسـەی کـرد ناراسـتەوخۆ رەخنەی لە هەردوو ئەندامی لە سەر کار لابراوی سەرکردایەتی گرت و بۆ وێنە لە ئاماژەیەکی ئاشکرادا بە یەلتسین رێبەری لـە سـەر کـار لابـراوی حیزبـی کۆمۆنیسـتی مۆسـکۆ گـرت و گوتی:"هێندێ کەس لە بەرنامەی ریفـۆرم و چاکسـازی و نۆێکردنـەوەدا زۆر بەپەلـە و کەللـە وشکن لە حالێکدا جێبەجێکردنی ئەو بەرنامانە پێویستییان بە هێوری و لە سەر ەخۆیی و خۆ گونجاندنە. ئێمە دەبێ بە بەرنامەیەکی ریزبەنـدی و تایبەنـدی کـرا و و قۆنـاغ بـە قۆنـاغ بـۆ نوێکردنەوەی ولات هەنگاو بنێین.

لە جەنگەی جێژنەکانی حەفتا ساڵەی شۆڕشی بۆلشەڤیکیی روسیادا، کە لە حەوتووی یەکـەمی مانگی نۆڤەمبەری ساڵی 1987 لـە مۆسـکۆ بـەڕێوە چـوون گورباچـۆڤ لـە چـەند ئاخـافتنێکی گرینگدا بنەمای سیاسەتە نوییـەکانی سـۆڤیەتیی لـە بـواری چاکسـازیی نێـو خـۆیی و مەسـەلە نێودەوڵەتییەکاندا شیکردنەوە. گرینگترین و پوختترین ئاخافتنی ئەو وتارێـك بـوو، کـە رۆژی دووی نۆڤەمبەر لە بـەردەم ژمارەیـەکی زۆر لـە رێبـەران و بەرپرسـانی حیزبـی لـە کۆشـکی کرێملینـدا پێشکەشی کرد. ئەو وتارە تاوتوێکردنێکی کورت و پـوختی مێـژووی حـەفتا سـاڵەی سـۆڤیەتی و رەوتی ئەو گۆڕانانەیە، کە بوونەتە هۆی پێویستبوونی ئەو گۆڕانانەی ئێستا. گورباچـۆڤ بـە پەسـنی لینین ی بنیاتنەری حکوومەتی سۆڤیەتی وتارەکەی دەست پێدەکاو وێڕای پەسن و تاریفی لیـنین بـە تایبەتی پەسنی "سیاسەتە ئابوورییە نوییەکـەی" ئـەو، کـە دەسـتەبەرکەری جۆرێـك لیبڕاڵێسـمی ئابووری و خۆگونجاندن بوو لـە بـەڕێوەبردنی بنـەماکانی سۆسـیالیزمدا. لـە تێپـەڕین لـە قۆنـاغی لینینەوە بەرەو ستالین گورباچۆڤ رەخنە لە ترۆتسکی و زینۆوێڤ و کامێنۆڤ دەگرێ، بەلام بەرامبـەر بە بۆخارین، کە لە لایەن ستالینەوە تۆمەتی راستگەرایی لێدرا نەرم و نیان ترە. گورباچـۆڤ پەسـنی پێشکەوتنەکانی سەردەمی ستالین بە تایبەتی لە بواری پیشەسازیدا دەکا و هاوبەشکردنی کشتوکاڵ

سەرەڕای تەواوی ئەو زێدەڕۆیی و هەڵانەی تێیدا کران پشتڕاست دەکاتەوە، بەڵام لەگەڵ خرۆشۆف لـە ئیدانەکردنی شێوازی حکوومەتی ستالین و ئەو جینایەت گەلەی لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی ئەودا هاتنە پێشێ هاوڕایە و تاوانەکانی ستالین زۆر گەورەو نەبەخشراو دەزانێ. گورباچۆڤ وێـڕای پەسـن و تاریفدانی ئازایەتیی خرۆشۆف لە ئاشـکراکردنی جینایەتـەکانی سـەردەمی سـتالیندا، شـێوازەکەی ئەویش لە دەسەڵاتداریێتیدا پەسند ناکا و، کە دێتە سـەر قۆنـاغی دوورودرێـژی بێـرژنێڤیش وێـڕای پشتڕاستکردنەوەی ئەو پێشکەوتنانەی، کە لـە سـەردەمی دەسـەڵاتداریێتیی ئـەودا دەسـتەبەربوونە شێوازی دەسەڵاتکردنەکەی ئەویش لە سەرەتای دەیەی 1970 لە دواوە دەداتە بەر رەخنە و دەڵـێ لە ماوەی ئەو ساڵانەدا بە هۆی کەڵکی خراپ وەرگـرتن و لادان لـە بنـەماکانی سۆسـیالیزم رەوتـی پێشکەوتنە ئابوورییەکانی یەکێتی سۆڤیەتی خـاو دەبێتـەوە و پـەرەگرتنی گەنـدەڵی لـە رەهەنـدە جۆراوجۆرەکانیدا دەبێتە هۆی لاوازبوونی باوەڕی گشتی بەرامبەر بە حکوومەت ". گورباچـۆڤ بـەو پێشەکییە دەچـێتە سـەر شـیکردنـەوە و پاسـاودانی سیاسـەتی نـوێی خـۆی "پێرێسـترۆیکا" یـا نوێکردنــەوە و مەبەســت لــەو سیاســەتەش نۆژەنکردنــەوە و بووژاندنــەوەی سۆســیالیزم" و قەرەبووکردنەوەی دواکەوتوویی و کەمایەسـییەکانی سـاڵانی کۆتـایی دەیـەی 1970 و سـەرەتای 1980 و "خێرایی بەخشین بە گەشەی ئابووریی وڵات" لە قەڵەم دەدا و هاوکـات ئـەوەش قبـووڵ دەکا، کە ئەو سیاسەتە لەگەڵ "بەربەرەکانێی جار بەجار زیاتری ئەو کەسانە بەرەوڕوو دەبێتەوە، کـە بیر لە بەرژەوەندە تایبەتییەکانی خۆیـان دەکەنـەوە و پـێ لـە سـەر پێویسـتیی تێکشـکاندنی ئـەو بەربەرەکانی و بەرگرییانە لە لایەن زۆرینەی باوەڕمەند و ریفۆرمخوازەوە دەکاتەوە.

سەفەری گورباچۆڤ بۆ ئـەمریکا و سـێیەمین چـاوپێکەوتنی ئـەو لەگـەڵ رەیگـان سـەرۆک کۆماری ئـەمریکا لـە رۆژانـی هەشـتەم هـەتا دەی مارسـی 1987 سـێبەری خسـتە سـەر گۆڕانکارییە نێوخۆییەکانی سۆڤیەتی لە کۆتاییەکانی ساڵی 1987 و مۆرکردنی گرێبەسـتی گرینگی فەوتاندنی مووشەکە ناوکییە نێونج برەکانی هەردوو وڵات، پێگەی نێودەوڵەتیی ئەوی جار لەگەڵ جار پتەوتر کرد. بە مۆرکردنی ئەو گرێبەستە، کە ئەنـدامانی هـەر دووك پـەیمانی سەربازیی خۆرهەڵات و خۆرئاوا ( ناتۆ و وەرشۆ) لە سەر ی کۆك بوون و تێیـدا گونجـابوو، کـە چاوەدێریی ورد بەسەر چۆنێتیی لەنێوبردنی مووشەکە نێونج برەکانی هەر دوو وڵات و کڵاوکـە ناوکییەکانیان لە ماوەی سێ ساڵدا بکرێ، بوار و هەلێکی لەبار بۆ چارەسـەریی زۆربـەی ئـەو کێشە و مەسەلانە رەخسا، کە خۆرهەڵات و خۆرئاوا لە سەر ی ناکۆك بوون و گورباچۆڤیش ئەو مەبەستەی خۆی پێکا، کە قورسایی خۆ پڕچەککردن و گوژمە و خەرج و مخاریجی سەربازیی لـە

کۆڵ خۆی بکاتەوە و خەریکی نۆژەنکردنەوەی وڵات و چارەسەریی کەموکورتی و گیر و گرفتە ئابوورییەکانی سۆڤیەتی بکا.

لە مانگی مای ساڵی 1988دا رەیگان سەردانی مۆسکۆی کرد و کۆمەڵێك گرێبەستی نوێ لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیدا مۆر کران. راگەیاندنی بڕیاری دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ کێشانەوەی سەربازەکانی لە ئەفغانستان و جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە، کە لەگەڵ چوونەدەرەوەی دوایین یەکەی سەربازانی سۆڤیەتی لە ئەفغانستان لە فێبرییەی 1989دا کۆتایی هات دوایین ناکۆکیی گرینگی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیی چارەسەر کرد و گورباچۆڤ لە دوو چاوپێکەوتن دا لەگەڵ بووشی سەرۆك کۆماری نوێی ئەمریکا لە ساڵی 1989دا زیاتر لە جاران لە ئەمریکا نزیك بۆوە، بەڵام لە ماوەی ساڵانی 1989 و 1990دا سۆڤیەتی زیاتر بەو کێشە نێوخۆیی و بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازانەی نێو کۆمارییەکانی سۆڤیەتی و هەروەها بە قەیرانی نێو وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی و هەرەسهێنانی رژێمەکانی ئەو وڵاتانەوە خەریك و سەرقاڵ بوو، کە لە بەشەکانی داهاتوودا دەچینە سەریان.

# بەشی یازدەهەم
# پێکهاتەی حکوومەتی سۆڤیەتی

پێرێسترۆیکا یا پرۆژەی نوێکردنەوە لە سۆڤیەتیدا، کە گورباچۆڤ لە مانگی نۆڤەمبەری 1987دا بە بڵاکردنەوەی کتێبێك هەر بەو ناوە بۆ خەڵکی سۆڤیەتی و جیهانی روون کردەوە هاوکات لەگەڵ گلاسنۆست یا کەشی کراوەی سیاسی و دیموکراتیزاسیا یا سەقامگیربوونی دیموکراسی، کە لە بەشی پێشوودا باسی کرا لە سەرەتادا خەڵکی سۆڤیەتی و جیهانی زۆر هیوادار کرد، بەڵام گرفت و کێشەی جێبەجێکردنەکەی زۆر بە خێرایی دەرکەوتن و نیشانەکانی قەیران لە کۆمارییەکانی سۆڤیەتیدا لە ساڵی 1988 ـەوە لەگەڵ یەکەمین تێکهەڵچوونەکانی نێوان کۆمارییەکانی ئازەربایجان و ئەرمەنستانی سۆڤیەتیدا دەرکەوت.

ئەوە گرفتی بنەمایی تەواوی رژێمە دیکتاتۆرییەکانە لە قۆناغی گۆڕاندا، کە هاوشێوەی ئەوە لە روسییەی پێش شۆڕشی بۆلشەڤیکی یا فەڕەنسای بەر لە شۆڕش و ئێرانی دوایین ساڵەکانی دەسەڵاتدارێتیی رژێمی (شا)دا بەدی دەکرێ. لە رژێمە دیکتاتۆریەکاندا زۆرینەی خەڵك سەرەڕای ناڕازیبوونیان لە سیستەمی دەسەڵات ملکەچ و تۆقیون و دژکردەوەی توندی رژێم لە بەرامبەر هەر بزووتنەوەیەکی دژبەرانەدا کۆمەڵگا دەگێڕێتەوە سەر باری هێمنی و بێدەنگیی رواڵەتی. لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا، کە هەنگاونان بەرەو دیموکراسی زۆربەی جاران نەخوازراو و لە ژێر گوشاری دەرەکی یا نێوخۆیی دایە، ئەگەر هەموو لایەنەکانی بە وردی لێك نەدرێتەوە و بە وردبینی و هەڵسەنگێندراوی بۆی نەچن دەتەقێتەوە جڵەوەکەی لە دەستی ئەو حکوومەتە دەترازێ، کە خوازیاری ریفۆرم و ئاڵوگۆڕە لە خۆیدا.

ئالیکسی دۆتوکۆڤیل نووسەر و مێژوونووسی ناوداری فەرەنسی لە کتێبی "رژێمی رابردوو و شۆڕشی فەرەنسا"دا، کە تەرخانە بە باسی رەوش و دۆخی فەرەنسای بەر لە شۆڕشی 1789 ی ئەو وڵاتە و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو شۆڕشە وێڕای ئاماژە بە هۆکارەکانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا دەنووسێ:

"... زۆر هەڵدەکەوێ خەڵکێك، کە بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ ملکەچی رژێمێکی ستەمکار و زاڵم بوونە و نقەیان لێوە نەهاتووە لەگەڵ کەم بوونەوەی گوشار و سەرکوتەکان لە سەریان وەجووڵە کەوتوون و دژی سیستەمی دەسەڵات راپەڕیون. ئەزموون فێرمان دەکا، کە جیدی ترین و هەستیار ترین ساتەکان بۆ رژێمێکی خراپ ئەو دەمەیە، کە بەخۆیدا دێتەوە و دەیەوێ ریفۆرم لە خۆیدا بکا. تەنیا سیاسەت و زیرەکییەکی بەتەواو مانا دەتوانێ تەخت وبەختی پادشایەك لەو کاتەدا، کە پاش سەرەڕۆییەکی درێژماوە دەیەوێ چاکسازییەك لە خۆیدا پێکبێنێ، رزگار بکا... ژانێك، کە بەهیوای هەتوان و چارەسەر بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ خۆی لەبەر راگیراوە کاتێك هیوای چارەسەریی هەبێ و دەرمانێك شك ببردرێ ئیتر تاقەتپڕووکێن دەبێ..."

ئەوەی کە نووسەر و بیرمەندی ناوداری فەرەنسی لە سەر شۆڕشی فەرەنسا و رژێمی زاڵ بەسەر ئەو وڵاتەدا بەر لە سەر هەڵدانی شۆڕش نووسیوێتی هەموو ئەو رژێمە دیکتاتۆرییانە لە خۆ دەگرێ، کە لە ژێر گوشاری هێندێ هەلومەرجدا ناچار دەبن برێك ئازادی بە خەڵك بدەن. خەڵکی سۆڤیەتی لە ماوەی حەفتا ساڵ دەسەڵاتی رەهای ستالین و جێنشینەکانیدا خوویان بە زەبروزەنگی زاڵ بەسەر ئەو وڵاتەدا گرتبوو و ئەو دەنگانەش، کە جاروبارە لێرەولەوێ بە نیشانەی نارەزایەتی دەبیسران زایەڵە و دەنگدانەوەیەکی ئەوتۆیان لە کۆمەڵگەی داخراو و ژێر کۆنترۆلی سۆڤیەتیدا نەدەبوو. کەمایەسیترییە[1] ئابوورییەکانیش لەگەڵ ئەو هەوڵانەی، کە لە لایەن حکوومەتەوە بۆ دابینکردنی لانیکەمی پێداویستییەکانی خەڵك دەدران بۆ خەڵك ببوونە شتێکی ئاسایی و ئەو گەندەڵییەی، کە لە تەنیشت ئابووریی دەوڵەتییەوە گەشەی دەکرد و پەرەی دەگرت خۆی ببووە بەشێك لە سیستەمی حکوومەت و گرووپێکی زۆر و بەرچاو، کە تێکەڵی ئەو گەندەڵییە بوون بۆ پاراستنی پوان و بەرژەوەندییەکانیان بە توندی لایەنگریان لە سیستەمی دەسەڵات دەکرد.

---

[1] کەمایەسی: کەموکورتی

بەرنامە ریفۆرمیستییەکانی گورباچۆڤ هەر وەکی پێشتریش ئاماژەی پێکرا سەرەتا لەنێو ئەو سەرکردە حیزبی و بەرپرسە دەوڵەتییانەدا، کە لە حکوومەتی پێشووی سۆڤیەتیدا خاوەنی کۆمەڵێك پوان و ماف و دەسەڵات بوون تووشی دژایەتی و دژکردەوە هات. ئەو دژایەتی و بەرەورووبوونەوەیە بە تایبەتی لە چالاکییەکانی بەشی بەرهەمهێنان و کشتوکاڵدا کۆمەڵێك بشێویی لێکەوتەوە و دانی بژیو و خواردەمەنی و کاڵای بەکاربەری بە خەڵك کەم کرایەوە. بەرنامە ئابوورییەکانی گورباچۆڤ، کە بۆ کەمکردنەوەی هەنگاو بە هەنگاوی کۆنترۆلی دەوڵەت بەسەر کاروباری ئابووریدا داڕێژرابوو لە قۆناغی سەرەتایی خۆیدا سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا لەبەر ئەوەی کە بەڕێوەبەرە تازەکان کارامەیی پێویستیان نەبوو و بەڕێوەبەرانی پێشووش لەگەڵ دەستوپێوەندەکانیان لە ئاستی جۆراوجۆردا کارشکێنییان دەکرد. کرێکارانی روسییش، کە خوویان بە تەوەزەلی و کەمکاری گرتبوو زۆریان کەیف بەو بەنامە نوێیانە نەدەهات، کە چالاکی و ئیشی زیاتریان دەویست و مەترسیی بێکاریی ملیۆنان کرێکار، کە لە ئاکامی جێبەجێ کرانی گەڵاڵە ئابوورییە تازەکاندا دەبووە هۆی ئاڵۆزی و بشێوی لە یەکە بەرهەمهێنەرەکاندا.

نارەزایەتیی خەڵك لە روشی ئاڵۆزی ئابووری لە هێندێ کۆمارییەکانی سۆڤیەتیدا تێکەڵاوی کەفوکول و هەستی ناسیۆنالیستی و نەتەوەخوازیی ببوو و بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازەکانی لێکەوتەوە و زۆربەی کۆمارییەکان لە سەرووی هەموانەوە گەورەترین کۆماریی یەکێتی سۆڤیەتی واتە فدراسیۆنی روسیا دەستیان کرد بە سەرپێچیکردن لە فەرمان و بڕیارەکانی حکوومەتی ناوەندی، بەڵام بەر لە تاوتوێکردنی ئەو گۆڕانانە و دەرکەوتەکانی، پێویستە پێکهاتەی حکوومەتی سۆڤیەتی و سیستەمی ئیداریی ئەو وڵاتە بەر لە لێکترازانی تاوتوێ بکەین.

# 2

یەکێتی سۆڤیەتیی سۆسیالیستی بە 22402200 کیلۆمەتری چوار گۆشە بە بەرینترین وڵاتی جیهان دەژمێردرا، کە یەك لە شەشی گۆی زەویی داگرتبوو. حەشیمەتی یەکێتیی سۆڤیەتی بە پێی دوایین سەرژمێری، کە بەر لە لێکترازانی سۆڤیەتی بڵاو کراوەتەوە نزیك بە

290 ملیۆن کەس بوو، کە دوا چین و هندستان ئەو وڵاتەی دەخستە ریزی سێیەمین وڵاتی جیهانەوە لە رووی ژمارەی حەشیمەتەوە.

ئەو رۆژەی یەکێتی سۆڤیەتی لە دایك بوو حەشیمەتی ئەو وڵاتانەی، کە لە دەوروبەری ئەو بوون نزیك بە 155 ملیۆن کەس بوو، کە نزیك بە 90 ملیۆن کەسی لە فدراسیۆنی روسیای ئێستادا دەژیان و باقییەکەی لە وڵاتانی ژێر دەسەڵاتی روسیادا دەژیان. لە ماوەی ئەو 73 ساڵەدا، کە بەسەر دامەزرانی حکوومەتی بۆلشەڤیکیی لە روسیادا تێدەپەڕی حەشیمەتی روسیا لە 90 ملیۆن کەسەوە گەیشتبووە 144 ملیۆن کەس لە حاڵێکدا حەشیمەتی ئەو وڵاتانەی تر، کە لە کەوشەنی یەکێتیی سۆڤیەتیدا دەژیان لە 165 ملیۆن کەسەوە گەیشتبووە زیاتر لە 145 ملیۆن کەس. بە واتایەکی دیکە گەشەی حەشیمەتی روسیا لە ماوەی حەفتا ساڵدا برێك لە پەنجالەسەد زیاتر بووە لە حاڵێکدا حەشیمەتی وڵاتانی دیکەی نێو کەوشەنی یەکێتیی سۆڤیەتی لە سەداسەد بەرەوژوور چووە و لە دوو بەرامبەری ساڵی 1917 تێپەڕیبوو. بە واتایەکی دیکە کاتی دامەزرانی حکوومەتی کۆمۆنیستی بە سۆڤیەتی رێژەی حەشیمەتی روسەکان لە چاو ئەو نەتەوانەی، کە دواتر یەکێتیی سۆڤیەتیيان پێك هێنا نزیك بە شێست لە سەد بوو، بەڵام ئەو رێژەیە پاش حەفتا ساڵ گۆڕاوە و رێژەی حەشیمەتی نەتەوە غەیره ر ووسەکان لەچاو روسەکان سنووری پەنجا لە سەدی تێپەڕاندبوو و هەروا لە زیادبوونیش بوو.

یەکێتی سۆڤیەتی پازدە کۆماریی هەبوو، کە بیست کۆماریی خودموختار و شەش Krays یا وڵات سەد وبیست Oblast یا ناوچە، هەشت ناوچەی خودموختارو دە یەکەی سەربەخۆی نەتەوەیی لە خۆ گرتبوو. هەرکام لەو دابەشینە لاوەکییانە لە کەوشەنی یەکێك لە کۆمارییەکانەوە بە حکوومەتی ناوەندییەوە گرێ دەدرایەوە. بە گشتی زیاتر لە سەد نەتەوەی جۆراوجۆر، کە بە زیاتر لە سەد زمان قسە دەکەن لەو وڵاتانەدا دەژیان.

لە پازدە کۆمارییەکەی یەکێتیی سۆڤیەتی گەورەترینیان کۆماری سۆسیالیستیی فدراتیڤی روسیا بوو، کە جگە لە بەشی ئەورووپایی روسیا بەشی بەرینی سیبریایشی لە خۆ دەگرت و زیاتر لە سێ لە چواری تەواوی رووبەری یەکێتیی سۆڤیەتیی لە خۆ دەگرت. دووەمین کۆماری لە رووی حەشیمەتەوە ئۆکراین بوو، کە کەوتبووە بەشی ئەورووپایی یەکێتیی سۆڤیەتییەوە و حەشیمەتەکەی نزیك بە پەنجا و دووملیۆن کەس بوو. سێیەمین کۆماریی لە رووی حەشیمەتەوە ئۆزبەکستان بوو، کە نزیك بە بیست ملیۆن کەس حەشیمەتی هەبوو و چوارەمین کۆمارییش قەزاقستان بوو، کە بە پێی

دوایین سەرژمێرییەکان حەشیمەتەکەی دەگەیشتە حەڤدەملیۆن کەس. قەزاقستان یەکێك لە کۆمارییەکانی بەشی ئاسیای ناڤینی یەکێتیی سۆڤیەتی بە دووملیۆن و حەوسەدهەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەوە بەرینترین کۆماریی سۆڤیەتی لە پاش روسیاوە بوو.

کۆمارییەکانی دیکەی سۆڤیەتی بە ریز بریتی بوون لە کۆماری بیلوروسی یا روسیای سپی بە نزیك دوملۆن کەس حەشیمەتەوە، ئازەربایجانی سۆڤیەتی بە نزیکەی حەوت ملیۆن کەسەوە، گورجستان بە پێنج ملیۆن و سێسەد هەزار کەسەوە، قیرقیزستان بە چوارملیۆن و سێسەد هەزار کەسەوە، لیتوانی بە سێ ملیۆن و حەوسەد هەزار کەسەوە، ئەرمەنستان بە سێ ملیۆن و سێسەد هەزار کەسەوە تورکەمەنستان بە سێ ملیۆن و پێنجسەد هەزار کەسەوە و لێتۆنی بە دوو ملیۆن و شەش سەد هەزار کەسەوە و ستۆنی بە یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار کەسەوە. لەو کۆمارییانەی ناومان هێنان گرینگترین ناوەندە پیشەییەکانی سۆڤیەتی لە کۆمارییەکانی روسیا و بیلورۆسی و ئۆکراین و گرینگترین کانگاکان لە کۆمارییەکانی قەفقاز و ناوەندە کشتوکاڵییەکان لە ئۆکراین و کۆمارە ئاسیاییەکاندا بوون. یەکێك لە کۆمارییە ئاسیاییەکانی سۆڤیەتی ئازەربایجان بوو، کە بە هۆی سەرچاوە نەوتییەکان و ئۆزبەکستان بە هۆی دەغڵ و دان و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانەوە پێگەیەکی تایبەتییان هەبوو. ئۆزبەکستان بە تاقی تەنیا 67 لە سەدی پەمۆ و 50 لەسەد برنجی سۆڤیەتیی دابین دەکرد.

بە پێی راپۆرتێکی سەرژمێری، کە لە نێوەی ساڵی 1987دا کراوە و لە ژمارەی رێکەوتی دیسێمبەری 1987 ی گۆڤاری روسیی سپوتینك لە زمانی پراڤیداوە چاپ و بڵاو بۆتەوە لە 282 ملیۆن و سێسەد هەزار کەس حەشیمەتی سۆڤیەتی زیاتر لە 150 ملیۆن کەسیان مێینە و 132 ملیۆنیان نێرینە بوون واتە ژمارەی ژنان هەژدە ملیۆنی لە پیاوان زیاتر بووە، کە لە دەگمەن وڵاتێکدا وەها جیاوازییەك لە رێژەی ژن و پیاودا بەدی دەکرێ. هەر بە پێی ئەو ئامارانە زیاتر لە نیوەی خەڵکی سۆڤیەتی بە زگورتی دەژیان و لە حەفتاودوو ملیۆن هاوسەر 29/5 لەسەدی بێ منداڵان و نزیك بە سی لە سەدی تەنیا یەك منداڵیان هەبوو.

# 3

بنەمای فەلسەفیی کۆمۆنیزم، کە بەسەر یەکێتیی سۆڤیەتیدا زاڵ بوو ماتریالیزمە. کەوابوو لە یاسای ئەو وڵاتەدا ئایین پێگەیەکی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی خەڵکی سۆڤیەتی پاش

تێپەڕینی زیاتر لە حەفتا ساڵ بەسەر دامەزرانی حکوومەتی کۆمۆنیستیدا، باوەڕە ئاینییەکانی خۆیان پاراستبوو. زۆربەی خەڵکی سۆڤیەتی، کە لە روسیا و کۆمارییە ئەورووپاییەکانی ئەو وڵاتەدا دەژیان مەسیحی بوون و موسوڵمانەکان، کە 18 لەسەد ی کۆی حەشیمەتی ئەو وڵاتەیان پێکدێنا، لە پازدە کۆمارییەکەی سۆڤیەتی لە شەشیاندا زۆرینە بوون.

لە سەرەتای پێکهاتنی یەکێتیی سۆڤیەتیدا چوار یاسای بنەڕەتیی بۆ دانرابوو، کە یەکەمیان لە ساڵی 1918 هەتا 1924 و دووەم یان لە 1924 هەتا 1936 و سێیەمیان لە 1936 هەتا 1977 برەو و ئیعتباری هەبووە و چوارەمین یاسای بنەڕەتیی سۆڤیەتی، کە ساڵی 1977 پەسند کرا هەتا لێکترازان و هەرەسی سۆڤیەتی لە برەودا بوو. لەو یاسایەدا هەروەکی لە بەشی نۆدا باسمان کرد تەواوی ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکان بۆ خەڵکی سۆڤیەتی لەبەرچاو گیرا بوون، بەڵام هیچ کات پشتگیریی جێبەجێ کرانیان نەبوو.

بە پێی یاسای بنەڕەتیی سالچی 1936 و چوارەمین یاسای بنەڕەتیی سۆڤیەتی بەرزترین ئۆرگان و سەرچاوەی یاسادانان و دەسەڵات لە سۆڤیەتیدا " ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی" بوو، کە لە دوو پەرلمانی ئەنجوومەنی یەکێتی و ئەنجوومەنی نەتەوەکان پێکهاتبوو و 1500 نوێنەری ئەو ئەنجوومەنە هەر پێنج ساڵ جارێك بە دەنگی راستەوخۆی خەڵك بۆ نوێنەرایەتی هەڵدەبژێردران. جگە لە ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی هەر کۆمارییەکیش بۆخۆی خاوەنی ئەنجوومەنێك بوو بۆ تاوتوێکردنی مەسەلەکان و پەسندکردنی یاسای ئەو کۆمارییە و هەر ناوچە یا کۆمارییەکی خودموختار و بە گشتی هەر شار و گوندێکیش ئەنجوومەنێکیان بۆخۆیان هەڵدەبژارد. لە جەنگەی ئەو هەڵبژاردنانەدا ناودێرکراوانیش کۆمەڵێك چالاکی‌یان دەنواند کۆبوونەوەی هەڵبژاردن بۆ ناساندنی پاڵێوراو و ناودێرکراوەکان و بیستنی وتە و بیروبۆچوونەکانیان پێکدەهات، بەڵام جیا لە دوایین هەڵبژاردنی یەکێتیی سۆڤیەتی، کە بۆ یەکەمجار زیاتر لە پاڵێوراو و ناودێرێك ئیزنی چالاکیی پێدرا لە هەڵبژاردنەکانی رابردوودا تەنیا یەك ناودێر بۆ هەر بیاڤێك دەسنیشان دەکرا و دەنگدەران، کە ناچار بوون بەشداری ئەو هەڵبژاردنانە بن جگە لەو کەسەی ناودێر و دەسنیشان کراوە مافی دەنگدان بە کەسی دیکەیان نەبووە، بەڵام ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی، کە لە یاسای بنەڕەتیدا وەك بەرزترین ئۆرگان و چاوگەی دەسەڵات و بڕیاردان ناوی هاتووە هەتا بەر لە گوڕانە نێوخۆییەکانی حکوومەتی گورباچۆ لە سیستەمی هەڵبژاردنەکانی سۆڤیەتی تەنیا دوو جار لە ساڵدا ئەویش بۆ ماوەی چەند رۆژێك کۆدەبۆوە و نوێنەرەکانی جگە لە بیستنی راپۆرتی تێروتەسەلی بەرپرسانی فەرمی و پەسندکردنی بە تێکڕایان هەل و دەرفەتێکیان نەدەبوو. هەڵبەت لە

کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتیدا هێندێ لە نوێنەران قسەیان لە سەر راپۆرتی سەرۆکی دەوڵەت و گەڵاڵە پێشنیارییەکانی دەکرا، کە هەمیشە بۆ پشتڕاستکردنەوە و بە لایەنگریی لەو گەڵاڵەو پێشنیارانە بوون و گەڵاڵە و پێشنیارەکانی دەوڵەتیش بە زۆرینەی دەنگ پەسند دەکران.

ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی لە هەر کۆبوونەوەیەکی خۆیدا دەستەیەکی بەڕێوەبەریشی هەڵدەبژارد، کە لە نەبوونی ئەنجوومەنەکەدا کاروبارەکانی ئەوی رادەپەڕاند. ئەرك و دەسەڵاتی سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەریی یەکێتیی سۆڤیەتی تارادەیەك وەك سەرۆك کۆماری وابوو و سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی بەرزی یەکێتیی سۆڤیەتی لە رووی پرۆتۆکۆل و دامودەستوورەوە سەرۆکی دەوڵەت بوو. هەربۆیەش چەند کەس لە رێبەرانی پێشووی سۆڤیەتی (بێرژنێڤ، ئاندرۆپۆف، چرنێنکۆ و گورباچۆڤ) جگە لە سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئەو پۆستە کارتۆنییەشیان بۆ خۆیان تەرخان کردبوو.

هەڵبژاردنی بەرپرسانی بەڕێوەبەری هەر لە شارەدارەوە بگرە هەتا سەرۆك وەزیران لەبەردەستی ئەنجوومەنەکانیدا بوو، کە لە سەر شارەدار بە بڕیاری ئەنجوومەنی شار و سەرۆك وەزیرانی کۆمارییەکان بە بڕیاری ئەنجوومەنی باڵای هەر کۆمارییەك و سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتییش بە بڕیاری ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتی هەڵدەبژێردرا. سەرۆك وەزیر و ئەنجوومەنی وەزیرانی سۆڤیەتی لە بەرامبەر ئەنجوومەنی باڵا و لە نەبوونی ئەویشدا لە بەرامبەر دەستەی سەرۆکایەتیی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەتیدا بەرپرسیار بوو، بەڵام بەو شێوەی، کە باسی کرا پێکهاتەی حکوومەتی سۆڤیەتی هەتا بەر لەو گۆڕانکارییانەی تێیدا کرا جۆرێك بوو، کە هیچ کام لەو ناوەند و ئۆرگانە یاساییانە بە کردەوە دەسەڵاتێکیان لە بەڕێوەبەریی وڵاتدا نەبوو و ئەوە رێبەری حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بووکە بڕیار و بۆچوونەکانی خۆی بەسەر ئەو ئۆرگانانەدا دەسەپاند و ئەنجوومەنی باڵای یەکێتی سۆڤیەتی و ئەنجوومەنەکانی دیکەش لە ئاستی جیاجیادا جگە لە پشتڕاستکردنەوەی بڕیارەکانی رێبەری ناوەندی و بەرپرسانی خۆجێیی حیزبی کۆمۆنیست رۆڵێکیان نەبوو.

یاسای بنەڕەتیی سۆڤیەتی بە شێوەیەکی رووکەشیانە و لێڵ باسی رۆڵ و دەوری حیزبی کۆمۆنیست لە بەڕێوەبەریی وڵاتدا دەکا و پاش ئەوەی وەك "دڵی حکوومەتی سۆڤیەتی" باسی حیزبی کۆمۆنیست دەکا و رێگەی پێکهێنانی رێکخراوگەلی سیاسیی دیکەی لە سۆڤیەتیدا دەگرت و چۆنێتیی دەسەڵاتگەریی سیاسیی لە لایەن حیزبی کۆمۆنیستەوە روون نەدەکردەوە، بەڵام ئەوەی کە رۆڵی زاڵ و داسەپاوی حیزبی کۆمۆنیستی لە بەڕێوەبەریی وڵاتدا روون و

ئاشــکرا دەکــرد، کۆکردنــەوەی بڕیــارە سیاســییەکان لــە ڕێکخراوەکــانی ئــەو حیزبــەدا و دەسنیشانکردنی تەواوی بەرپرسانی هەڵبژێراو و دانــراو، لــە لایــەن ئۆرگانــە جۆراوجۆرەکــانی ڕێبەریی ئەو حیزبەوە بوو. بە واتایەکی دیکە هەتا بەر لە پێداچــوونەوە بــەو ئەســڵەی یاســای بنەڕەتیی سۆڤیەتیدا، کە ڕێگەی بۆ چالاکیی گرووپ و حیزبی سیاسیی دیکەش لە ســۆڤیەتیدا کردەوە و دەسەڵاتی حیزبــی کۆمۆنیســتی لــە بەڕێوەبــەریی وڵاتــدا بەرتەســك کــردەوە، ئــەوە ڕێکخراوی ڕێبەریی حیزبی کۆمۆنیست لە ناوەندەوە بــوو، کــە ســەرۆك وەزیــران و ئەنــدامانی ئەنجوومەنی وەزیران و بەرپرسانی دیکەی دەوڵەتیی دەسنیشان دەکردن و ئەندامانی ئەنجوومەنی بــاڵای یــەکێتیی ســۆڤیەتی یــا دەســتەی ســەرۆکایەتیی ئــەو ئەنجوومەنــە، کــە تــەواویان دەسنیشانکراوی ئەم حیزبە بوون جگە لە پەیرەوی و ملکەچیی بڕیارەکانی ڕێبەری چــارەیەکیان نەبوو و لە ئاستی خوارەوەتریش دا ئەوە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی کۆماری بــوو، کە سەرۆك وەزیرانی کۆماریی دیاری دەکرد و یا کۆمیتەی خۆجێیی بوو، کە شارەداری شــاری دەسنیشان دەکرد و بە ئەنجوومەنی شاری دەناساند.

کەوابوو قۆچەکی دەسەڵاتی ڕاستەقینەی ســۆڤیەتی هــەتا بــەر لــە هــەرەس و لــێکترازان، ڕێکخراوەکانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوو، کە لــە یەکــەی حیزبــی لــە هــەر ئیــدارە و کارخانە و کێڵگــە و زانکــۆوە دەســتی پێــدەکرد و هــەتا کۆمیتــە خۆجــێیی و ناوچــەییەکان هەڵدەکشا. ڕێکخراوەکانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە هەر کۆماری یا لە هەر ناوچەیەکی سەربەخۆدا لە کۆمیتەیەکی ناوەنــدی و دەفتــەرێکی سیاســی و ســکرتاریایەکی وەك ناوەنــدی حیزب پێکدەهات، کە ئەندامەکانیان لە کۆنفرانسە ناوچەییەکاندا هەڵدەبژێردران. کۆنفرانســی حیزبیی ناوچە و کۆمارییە جیاجیاکان، کە بەر لە کــۆنگرەی سەرانســەریی حیــزب دەبەســتران نوێنــەرەکانیان بــۆ بەشــداری لــەو کۆنگرەیــەدا هــەڵ دەبــژارد. کــۆنگرە وێــڕای پەســندکردنی هێڵەگشتییەکانی ڕێبازی حیزب ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبــی هەڵدەبــژاردن، کــە بــە نۆرەی خۆیان سکرتێری گشتی و ئەندامانی دەفتەری سیاسییان دیاری دەکرد.

لە سەردەمی لینین و سەرەتای حکوومەتی ستالیندا کۆنگرەکانی حیزبی کۆمۆنیســت بــە دوو ساڵ جارێك دەبەستران، بــەڵام لــە کۆتاییــەکانی حکوومــەتی ســتالیندا مــەودای گیرانــی کۆنگرەکان درێژتر کرانەوە و مەودای نێــوان کــۆنگرەی هەژدەهــەم، کــە لــە ســاڵی 1939دا بەدوای پاکسازییە خوێناوییەکانی ستالیندا بەسترا هەتا کۆنگرەی نۆزدە، کــە چــەند مانگێــك بەر لە مەرگی ستالین گیرا سێزدە ساڵی مەودا بوو. خرۆشــۆف لــە ســەردەمی حکوومــەتی دە

ساڵەی خۆیدا سێ کۆنگرەی گرت و پاش لێکەوتنی ئەویش کۆنگرە حیزبییەکان دەکرێ بڵێین بە رێکوپێکی دەگیران.

ستالین لە دە ساڵی یەکەمی حکوومەتەکەیدا چوار کۆنگرەی گرت و بە هۆی ئەو گۆڕانانەی، کە لە هەر کۆنگرەیەکدا لە پێکهاتەی رێبەریدا دەیکردن پێگەی خۆی یتەو تر و قایمتر کرد. لە مەودای نێوان کۆنگرەی حەڤدە و هەژدەی حیزبدا، کە پێنج ساڵی خایاند ستالین پاکسازییەکی خوێناویی وەڕێخست، کە تێیدا دوو لە سێی نوێنەرانی کۆنگرەی حەڤدەهەم و ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی ئەو کۆنگرەیە وەبەر کەوتن و تێداچوون و ستالین پاش کۆتایی ئەو پاکسازییانە لە ساڵی 1939دا کۆنگرەی هەژدەی حیزبی بۆ پاکانەکردن و پاساودانی جینایەتەکانی خۆی گرت. کۆنگرەی نۆزدە یا دوایینی کۆنگرەی حیزبیی سەردەمی ژیانی ستالین لە کۆتایی ساڵی 1952داواتە سێزدە ساڵ پاش کۆنگرەی هەژدە بەسترا، بە شێوەیەك، کە خرۆشۆف لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ لەو ماوەیەدا ستالین تەنانەت پرس و راوێژیشی بە کۆمیتەی ناوەندیی حیزب نەدەکرد و لە کۆبوونەوەکانی دەفتەری سیاسی یا دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبیشدا، کە بە دەگمەن دەگیران تەنیاگوێی لە قسەکان رادەگرت و خۆی بە بێ گوێ پێدان بە قسەی زۆرینە بڕیاری دەدا.

لە پاش مەرگی ستالینەوە بایەخ و گرینگیی و دەسەڵاتی ئۆرگانە حیزبییەکان زیادیان کرد و چوونە سەر و بڕیارگەلێکی گرینگی وەك وەلانان و دەسبەسەرکردنی بەریا و لابردنی مالینکۆف لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی سۆڤیەتی لە دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمیتەی ناوەندیدا دران. خرۆشۆف لە سەردەمی حکوومەتەکەیدا سێ کۆنگرەی حیزبیی گرت، کە بە هۆی راپۆرتە بە ناوبانگەکەی ئەو لە سەر جینایەتەکانی ستالین لە کۆنگرەی بیستەمدا و ئەو بڕیارانەی، کە لە دوو کۆنگرەی دواییدا بۆ سڕینەوەی ئاسەواری ستالین ناوبانگێکی زۆری دەرکرد. ئۆرگانەکانی حیزبی کۆمۆنیست لە سەردەمی حکوومەتی خرۆشۆفدا ئەوەندە بەهێز و بەدەسەڵات ببوون، کە بڕیاری پێوەندیدار بە لابردنی خۆیشی لە پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست و سەرۆکایەتیی وەزیرانی سۆڤیەتی لە کۆبوونەوەیەکی نائاسایی دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبدا دراو لە دوای ئەوەوە بۆ پێشگرتن لە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەستی سکرتێری یەکەمی حیزبدا پۆستی سەرۆکایەتیی وەزیرانیان لێ جیا کردەوە.

قۆناغی حکووومەتی هەژدەساڵەی بێرژنێڤ قۆناغی هەڵکشان یا داکشان لە ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا بوو و لە چوار کۆنگرەی حیزبیدا، کە لەو ماوەیەدا گیرا گۆڕانێکی بەرچاو لە پێکهاتەی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسیدا(کە جێگەی دەستەی بەڕێوەبەریی کۆمیتەی ناوەندیی گرتبۆوە) نەدرا بە شێوەیەك، کە هێندێ لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسیی حیزب پازدە تا بیست ساڵ بوو، کە لەو پۆستەدا ئەندام بوون و مەرجی هاتنی ئەندامێکی نوێ بۆ ئەو پۆستە مەرگی یەکێك لە ئەندامانی پیر بوو. میخاییل گورباچۆڤ دوایین سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە ساڵی 1980دا پاش مەرگی کاسیگین لە سەر کورسییەکەی ئەو لە دەفتەری سیاسیدا دانیشت و هەڵبژێرانی ئەو بۆ ئەندامەتیی دەفتەری سیاسی لە تەمەنی 49 ساڵیدا یەکێك لە حاڵەتە ناوازەکانی سەردەمی حکوومەتی بێرژنێڤ بوو.

لە مەودای نێوان کۆنگرەی بیستەم و شەشەمدا حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەتا کۆنگرەی بیست و هەشتەم، کە ساڵی 1986 گیرا کۆمەڵێك ڕووداوی گرینگ لە سۆڤیەتیدا هاتنە پێش. بێرژنێڤ مرد و جێنشینەکانی ئەو واتە ئاندرۆپۆف و چرێنێنکۆ، کە هەر دووکیان لە بە سەری پیری بۆ سکرتێریی گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەڵبژێردرا بوون بەسەر یەکەوە دووساڵ و برێك زیاتر نەژیان. دەفتەری سیاسیی حیزب، کە هێشتا پیاوی ژوور حەفتا ساڵ تەمەن تێیدا ئەندام بوون دواجار بڕیاریان دا گەنجترین ئەندامی خۆیان بکەنە سکرتێری گشتی و ئەو پیاوە گەنج و گورجوگۆڵە لە میخاییل گورباچۆڤ بەو لاوە کەسی دیکە نەبوو. گورباچۆڤ نەیهێشت ساڵێکی پێ بچێ، کە بیست و حەوتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە بەشداریی نزیك بە پێنج هەزار نوێنەر لە سەرانسەری وڵاتەوە، پێك هێنا و کۆمەڵێك گۆڕانی گرینگی لە ئۆرگانی بەڕێوەبەریی حیزبدا پێك هێنا.

## 4

پاش گیرانی کۆنگرەی بیست و حەوتەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە ساڵی 1986دا گورباچۆڤ هەم لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و هەم لە دەفتەری سیاسیی حیزبدا زۆرینەیەکی بە هێزی لەگەڵ بوو، بەڵام هێشتا هێندێ لە دژبەرو خەنیمەکانی ئەو لە هەر دووك ئۆرگانی حیزبیدا دژایەتیی بەرنامەکانی ئەویان دەکرد. ئیگۆر_لیگاچۆڤ لە سەرووی ئەو

دژبەرانەوە بوو، کە وەك سکرتێری حیزب لە کاروباری ئایدۆلۆژیکدا کەسی ژمارە 2 بوو و گورباچۆڤ لەودا هەستی بە هەڕەشەو مەترسییەکی گەورە بۆ سەر پۆست و پلەو پایەی خۆی دەکرد .

لە ساڵانی 1987ـەوە هەتا 1989 گورباچۆڤ هەوڵیدا تا بە وەرگرتنی پۆستی سەرۆك کۆماری و بەرفرەوانکردنەوەی دەسەڵاتی سەرۆکی کۆمار لە بەرامبەر خەنیمەکانیدا خۆی بە هێز بکا. گورباچۆڤ هەروەها بە پێداچوونەوە بە یاسای هەڵبژاردنی سۆڤیەتیدا، ڕێگەی بۆ هەڵبژاردنی ژمارەیەك لە ناودێرکراوانی دەرەوەی حیزبی بۆ ئەندامەتیی لە پارلەمانی سۆڤیەتیدا خۆش کرد و لە چاکسازی و ریفۆرم و پەسندکردن و تەنانەت رەتکردنەوەی گەڵاڵە پێشنیارییەکانی دەوڵەتدا دەسەڵاتی پەرلمانی بەرفرەوانتر کردەوە. پێشنیاری زیادکرنی دەسەڵاتی سەرۆکی کۆمارییش لەگەڵ کۆمەڵێك دژایەتی لە پەرلماندا بەرەوڕوو بۆوە و ژمارەیەك لە نوێنەران گورباچۆڤیان بەوە تۆمەتبار کرد، کە بە وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتانە گەرەکیەتی لە سۆڤیەتیدا دیکتاتۆرییەکی یاسایی دامەزرێنێ، بەڵام گورباچۆڤ وێڕای وەڵامدانەوە بەو هێرشانەوتی، کە لە هەلومەرجی قەیراناویی وڵاتدا بە بێ ئەو ئۆتوریتە و دەسەڵاتانە کاری پێناکرێ و پەرلمانی سۆڤیەتی دواجار بە زۆرینەی دەنگ پێشنیاریدانی دەسەڵاتی لە رادەبەدەری بە سەرۆکی کۆمار پەسند کرد. گورباچۆڤ بە وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتانە لە پەرلمانی سۆڤیەتی بە کردەوە خۆی لە ژێر دەسەڵات و هێژمونیی دەفتەری سیاسیی حیزب لە کاروباری بەڕێوەبەریدا هێنایە دەرەوە، بەڵام هەتا بەر لە گیرانی کۆنگرەی بیست و هەشتەمی حیزب لە مانگی ژووئیەی 1990دا بە تەواوەتی لە خۆتێهەڵقورتاندنی دەفتەری سیاسیی حیزب دەرباز نەببوو.

بیست و هەشتەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە لە مانگی ژووئیەی 1990دا بە بەشداریی 4957 نوێنەر لە مۆسکۆ بەڕێوەچوو خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە مێژووی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا. لەو کۆنگرەیەدا بۆ یەکەمین جار ژمارەیەك لە نوێنەران رەخنەیان لە سیاسەتەکانی سکرتێری حیزب گرت و گرووپێك بە نیشانەی ناڕەزایەتیی بە سیاسەتەکانی حیزب دەستیان لە ئەندامەتیی حیزب هەڵگرت. توندترین هێرشەکان بۆ سەر سیاسەتەکانی گورباچۆڤ لە لایەن لیگاچۆڤ ئەندامی باڵای دەفتەری سیاسیی حیزبەوە بوو، کە بە راشکاوی باسی لە مەترسیی لێکترازان و هەرەسی یەکێتیی سۆڤیەتی کرد. بوریس یەلتسین سکرتێری یەکەمی پێشووی حیزبی کۆمۆنیستی مۆسکۆش، کە پاش وەلانرانی لەو پۆستە لەلایەن پەرلمانی فدراسیۆنی روسیاوە بۆ سەرۆك کۆماریی گەورەترین کۆمارییەکانی سۆڤیەتی هەڵبژێردرابوو لە لایەنێکی دیکەوە واتە لە رەهەندی خاوبوون و هێوریی رەوتی ریفۆرم لە

سۆڤیەتیدا رەخنەی لە سیاسەتەکانی گورباچۆڤ گرت و لە دوایین کۆبوونەوەی کۆنگرەدا بە ناوی ئەوەی کە قسەکانی بە هێند وەرنەگیراون دەستی لە ئەندامەتیی حیزب کێشایەوە. لە تاوتوێکردنی پێکهاتەیی حکوومەتی سۆڤیەتیدا پاش حیزب و دەوڵەت دەبێ ئاماژە بەسوپا و رێکخراوە تەناهییەکانی ئەو وڵاتەش بکەین.

سوپای سۆڤیەتی، کە لە بەرامبەر بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازییەکانی کۆمارییەکانی ئەو وڵاتەدا رۆڵێکی هەستیاری گێڕابوو لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆکار و فاکتەرێکی سەقامگیری لە نێوخۆی سۆڤیەتیدا لەقەڵەم دەدرا و پێگەی نێو دەوڵەتیی ئەو وڵاتەشی وەك زلهێزێك پاراستبوو. سوپای سۆڤیەت سەرەڕای ئەو گۆڕانانەی، کە بە گشتی بوونە هۆی لاوازبوونی پێگەی ئەو وڵاتە لە ئاستی نێو دەوڵەتیدا بەر لە هەرەسهێنانی سۆڤیەتی بە هەبوونی نزیك بە پێنج ملیۆن سەرباز و گەورەترین هێزی مووشەکی و زیاترین سەرچاوەی چەکی ناوکی و بە هێزترین هێزی جەنگی و زیاترین ژمارەی فڕۆکەی جەنگی، بە گەورەترین هێزی سەربازیی ناوچە دەژمێردرا. بە پێی و سەرژمێرییانەی، کە لە لایەن دامەزراوەی نێونەتەوەیی لێکۆڵینەوەی ستراتژیکیی لەندەن بڵاوبۆتەوە ژمارەی هێزە چەکدارییەکانی سۆڤیەتی لە بەراورد لەگەڵ ئەمریکادا لە ساڵی 1990 زیاتر لە دوو بەرامبەر و ژمارەی دەبابەکانی چوار ئەوەندە و هێزی تۆپخانەکەی سێ بەرامبەر بوو. ژمارەی کلاوکە ناوکییەکان و هێزە مووشەکییەکانی سۆڤیەتی و هێزی کاولکاریشیان بە گشتی لە هی ئەمریکا پتربوو. لە باری هێزی دەریاییشەوە سۆڤیەتی وەدواکەوتووی خۆی لە چاو ئەمریکا لە ساڵانی 1970 ە 1980دا قەرەبوو کردبۆوە و نزیك بە سێسەد کەشتی جەنگی و 286 ژێردەریایی هەبووە و، کە زیاتر لە 120دانەیان مووشەکی ناوکییان لە سەر بوو.

رێکخراوی کا.گا.ب یا رێکخراوی تەناهیی سۆڤیەتییش، کە یەکێك بوو لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی دەسەڵاتی سۆڤیەتی بەر لە هەرەسهێنانی سۆڤیەتی گەورەترین رێکخراوی زانیاری و تەناهیی جیهان بوو. کا.گا.ب لە دوو بەشی تەناهیی نێوخۆیی و دەرەکی پێکهاتبوو و نزیك بە پێنج سەد هەزار ئەندامی ئەو رێکخراوەیە لە بەشی تەناهیی دەرەکییدا، کە کاروباری سیخوڕی و دژە سیخوڕی یان بەڕێوە دەبرد کاریان دەکرد و چوارسەد هەزارەکەی دیکەشی نزیك بە سەد هەزار کەسیان کاربەدەستی سیڤیل یا نهێنی و باقییەکەی هێزی رێکخراو و خاوەن یۆنیفۆرمی کا.گاب بوون.

ئابووریی سۆڤیەت ئابوورییەکی سۆسیالیستی بوو، کە لە سەر بنەمای گشتیی سەرچاوەکانی سامان و کێڵگەکان و ئامرازی بەرهەمهێنان و پاوانکردنی هەرچەشنە

دانوستان و کاروبارێکی بازرگانی بەدەست دەوڵەتەوە دامەزرابوو. لە بەشەکانی پێشوودا لەگەڵ قۆناغە جیاجیاکانی جێبەجێکردنی ئابووریی سۆسیالیستی کۆمەڵگەی سۆڤیەتییدا، کە سەرەتا بە توند و تیژییەوە بوو و دواتر لە قۆناغی سیاسەتی ئابووریی نوێی لینیندا نیانتر بۆوە و دواجار لە سەردەمی حکوومەتی ستالیندا گەڕایەوە سەر توند و تیژییەکەی سەرەتا، ئاشنا بووین. بەرنامەی هاوبەشکردنی بە زۆرەملیی کشتوکاڵیش لە دووەمین دەیەی حکوومەتی سۆڤیەتیدا جێبەجێ کرا و لە جەنگەی بەڕێوەبردنی ئەو بەرنامەیە و ئەو قاتیوقڕییەی بەدوای داهات بە ملیۆنان کەس تیداچوون.

ئابووریی سۆڤیەتی ئابوورییەکی گەڵاڵەداڕێژراو بوو، کە لە دەسپێکی دووەمین دەیەی حکوومەتی سۆڤیەتییەوە بە شێوەی بەرنامەی پێنج ساڵە ڕێکدەخرا و جێبەجێ دەکرا. لە هەر بەرنامەیەکی ئابووریدا ئامانجەکانی بەرنامە لە تەواوی بوارەکانی پیشەیی و کشتوکاڵی و بیناسازی لە ماوەی پێنج ساڵەکەیدا دیاری دەکرا و بەرنامەی بەرهەمهێنانی هەر کارخانە یا یەکەی کشتوکاڵی بۆ ساڵێك، کە بەسەر دوازدە مانگدا بەش دەکرا لە سەرەتای ساڵدا بە کارخانە یان بە یەکەی کشتوکاڵی رادەگەیەنرا. لە یەکەمین بەرنامەی پێنج ساڵەوە، کە لە کۆتایی دەیەی 1920دا دارێژرا هەتا دوایین بەرنامە سەرەتیی بەرنامەداڕێژیی ئابووریی وڵات بە پیشە قورسەکان بووە و بەشی هەرە زۆری گوژمە و بودجەی دەوڵەت بۆ پەرە پێدان و گەشەی پیشەی قورس تەرخان دەکرا. ئامارە فەرمییەکانی دەوڵەتیش ئەو سەرەتی و گرینگی پێدانە پشتڕاست دەکەنەوە و بە پێی ئەو راپۆرت گەلەی، کە لە سەر گەشەی ئابووریی سۆڤیەتی لە ماوەی حەفتا ساڵدا بڵاو بوونەتەوە گەشەی پیشە قورسەکان لە چاو کاڵا بەکاربەرییەکان نزیك بە چوار بەرامبەر بووە.

ئابووری سۆڤیەت سەرەڕای تەواوی کەموکورتییەکانی بە تایبەتی لە بواری کشتوکاڵدا لە ماوەی حەفتا ساڵدا گەشەیەکی سەرسووڕهێنەری بووە و لە هێندێ بوارگەلی پیشەییدا لە بەراورد لەگەڵ پێش دامەزرانی حکوومەتی سۆڤیەت سەد بەرامبەر چووەتە سەر. یەکێتیی سۆڤیەتی لە بەرهەمهێنانی پۆڵا و نەوت و هێندێ کانگای دیکەی وزەیی وەك بەردەڕەژوو پلەی یەکەمی لە جیهاندا وەدەست هێنابوو و بەرهەمهێنانی پیشەی جەنگییەکەی لانییەکەم لە بواری چەندایەتییەوە لە سەرووی ئەمریکاوە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا دواکەوتوویی سۆڤیەتی لە بوارەکانی دیکەی بەرهەمهێنانیدا بە تایبەتی کاڵای بەکاربەریدا، ڕێبەرانی سۆڤیەتیی ناچار کرد، کە بە شێوەی بنەمایی بە سیستەمی ئابووریی ئەو وڵاتەدا بچنەوە.

به پێی یەکەمین بەرنامەی ئابووریی گورباچۆڤ، کە بڕیار بوو لە ماوەی سێ ساڵدا بەڕێوەبچێ پێشبینی کرابوو، کە 48000 یەکەی بەرهەمهێنان و پیشەیی، کە لە ژێر چاوەدێریی دەوڵەتدا بوون سەربەخۆ بکرێن و لە چوارچێوەی بەرنامەی گشتیی ئابووریی وڵاتدا بە سەربەخۆییەکی زیاترەوە کار بکەن. بە پێی ئەو بەرنامەی سەربەستی و ئۆتۆنۆمییە، بەڕێوەبەریی هەر یەکەیەکی بەهەمهێنان و پیشەیی بە بەڕێوەبەرایەتیی هەڵبژێردراوی ئەو یەکەیە دەسپێردرا و ماف و هەقدەستی بەڕێوەبەران و کرێکارانی هەر یەکەیەك بە پێی بەرهەم و رۆندمانی خۆی دیاری دەکرا. گورباچۆڤ، کە خۆی چەندین ساڵ لە سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا سکرتێر و بەرپرسی کاروباری کشتوکاڵی بووە ویستی کۆمەڵە گۆڕانێکی هاوشێوە لە بەڕێوەبەریی کاروباری کشتوکاڵیی سۆڤیەتیدا بکا و وا دانرا، کە لە کێڵگە دەوڵەتییەکانی سۆڤیەتی یا "کەلخۆز"ـەکاندا، کە هەروەك یەکە پیشەیی و بەرهەمهێنەرەکانی دیکەی وڵات بەڕێوە دەچوون و کرێکارانی ئەندام تێیدا مووچەی دیاریکراوی مانگانەیان وەردەگرت وەك یەکە پیشەییەکان هەقدەستەکانیان بە پێی بەرهەمی هەر یەکەیەکی دەوڵەتی دیاری بکرێ و ئەسڵی یەکسانیی مووچە هەڵگیری و لە کێڵگە هاوبەشەکانیشدا سەربەستیی زیاتر لە خستنە نێوبازاڕی بەرهەم و داهاتی زیاتر لە بەرامبەر بەرهەمی زیادیدا لەبەر چاو گیردرا. بەشی تایبەتیی وەرزێران لە کێڵگە هاوبەشەکاندا زیاد بکرێ و لە راگرتنی ئاژەڵ و پەلەوەردا سەربەستتر کران. دیارە ئەو رێوشوێنانە بۆ تەکانێکی بنەمایی لە کشتوکاڵی سۆڤیەتیدا بەس و وەڵامدەر نەبوو و لەبەرنامە نوییەکانی یەکێتیی سۆڤیەتیدا ئیجارە و تەنانەت فرۆشتنی کێڵگەکان بە وەرزێرەکان پێشبینی کرابوون.

یەکێك لە گرفت و کەمایەسییە گەورەکانی ئابووریی سۆڤیەتی لەکاروباری بیناسازی و نەبوونی توانای دەوڵەت لە دابینکردنی شوێنی پێویست بۆ نیشتەجێکردن خەڵکدا بەدی دەکرێ. پاش تێپەڕینی حەفتا و چەند ساڵ بەسەر حکوومەتی سۆڤیەتیدا، زیاتر لە بیست لە سەدی دانیشتوانی مۆسکۆ لە بینا کۆنەکاندا و بە شێوەی هاوبەشی دەژیان و لەهەر خانوەکدا چەند بنەماڵە بە هاوبەشی و بە نۆرە لە چێشتخانە و لە حەمامەکەی کەڵکیان وەردەگرت. ئاپارتمانە سەربەخۆکانیش زۆر بەرتەسك بوون. و بە پێی ئەو لێکۆڵینە وانەی کە لە سەر رەوشی پێك هێنانی ژیانی هاوبەش لە سۆڤیەتیدا کران دەرکەوت، کە زۆربەی زەماوەندەکان لەبەر کەڵکی زیاتر وەرگرتن لە کەشی زیاتر و بەرینتر کراون نەك لەبەر خاتری خۆشەویستی و

عیشقی راستەقینە، چونکی رووبەری ئاپارتمانەکان بە پێی ژمارەی ئەندامانی بنەماڵـە دیـاری دەکرا و ژن ومێردێك شوێنی زیاتریان لە کەسانی زگورتی و سەڵت بۆ لەبەر چاو دەگیرا.

هێدریك سمیت نووسەری کتێبی بە ناوبانگی روسەکان، کە لـە بەشـەکانی پێشـوودا باسـی کرا، ئاماژەی بە هێندێ شتی سەرسووڕهێنەری دیکەش وەك زیانەکانی ئاستەنگیی خانووبـەرە لە مۆسکۆ کردووە و دەنووسێ لەبەر ئەوەی بە هۆی کەمبوونی شوێنی مانەوە و نیشتەجێبوون لە مۆسکۆ ئیزنی مانەوە بە خەڵکی شارەکانی دیکەی سۆڤیەتی نادرێ زۆر کەس بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئیزنی مانەوە لە مۆسکۆ لەگەڵ کەسێکی خـەڵکی مۆسـکۆ بـە شـێوەی کـاتی (مەسڵەحەتی) زەماوەندی دەکرد و بۆ وێنە باسی کچێکی روسی دەکا، کە پـاش تـەواوکردنی خوێندنەکەی لەمۆسکۆ 1500 رۆبڵی بەرتیل دایە پیاوێکی مۆسکۆیی بۆ ئەوەی بـۆ مـاوەی شەش مانگ بیخوازێ، چونکی پاش شەش مانگ مانەوەی یاسایی لە مۆسکۆ دەیتوانی ئیزنی کارکردن و مانەوەی هەمیشەیی لەو شـارەدا وەرگـرێ . هێـدریك سمیـت ئامــاژە بـە شـتێکی دیکەش دەکا و دەنووسێ ژن و مێردێکی روسی لە شارێکی بچووکەوە هـاتبوون و بـۆ ئـەوەی بتوانن لە مۆسکۆ بمێننەوە ئیزنی کارکردنیان پێ بدرێ لێك جیا بوونەوە و هەر کـان بـە دانـی بڕێـك بـەرتیل، کـە لـەو جـۆرە زەماوەنـدە مەسـڵەحەتییانەدا بـاوە، لەگـەڵ ژن و پیـاوێکی مۆسکۆییدا زەماوەندیان کرد. پاش شەش مانگ، کە هەردووکیان ئیزنی مانەوە و کارکردنیان لە مۆسکۆ وەرگرت لە هاوسەرە کاتییەکانیان جیا بوونەوە و دیسان چوونەوە لای یەکتر.

لە بەرنامەکانی گورباچۆڤدا رێگەچارەیەك بۆ گرفتی خانووبەرە پێشبینی نـەکرابوو، بـەڵام یەکێك لە راوێژکارانی ئابووریی ئەو رایگەیاند، کە خـەریکی تـاوتوێکردنی چارەسـەریی ئـەو گرفتەن لە رێگەی ئیجارەدانی چالاکییەکانی بیناسازی بـە کـەس و کۆمپانیـا تایبەتییـەکان. هەروەکی لە بەشەکانی پێشوودا باسی کرا لە سەرەتای 1987 ـەوە ئیزنی چالاکیی تایبـەتی لـە هێنـدێ بـوارە گشـتییەکاندا بـە خـەڵکی سـۆڤیەتی درا و چـالاکیی کـەس و کۆمپانیـا تایبەتییەکان لە بەشێك لە خزمەت و چالاکییەکانی بیناسازیدا بە رەوا و ئیزن پێدراو زانرا.

# 5

شۆڕشـی بۆلشـەڤیکیی روسـیا شۆڕشـێك بـوو دژی دەرەبەگایـەتی و پـوان و جیاوازییـە چینایەتییەکان بوو و لینین و سەرکردەکانی دیکەی شۆڕشی بۆلشەڤیکی بـەو درووشمـەی، کـە دەبێ جیاوازییە چینایەتییەکان هەڵگیردرێن و بنەمای یەکسانی لە کۆمەڵگەدا رەچـاو بکـرێ، دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت. پاش تێپەڕینی زیاتر لە حەفتا ساڵ بەسەر شۆڕشی بۆلشەڤیکیدا ئەو پرسیارە لە ئارادایە، کە ئاخۆ پوانە چینایەتییەکان لـە روسـیا و کۆمارییـەکانی دیکـەی سۆڤیەتیدا هەڵگیران و کۆمەڵگـەی سـۆڤیەتی کۆمەڵگەیـەکی بـێ چین و لـە سـەر بنـەمای یەکسانی بووە؟

وەڵامی ئەو پرسیارە "نا"یە و پوانە چینایەتییەکان و خاوەنـدارێتیی تایبـەت هەرچـەندە بـە رواڵەت لە سۆڤیەتیدا نەمابوو، یەکسانی بە مانای راستەقینەی خۆی بەرێوە نەچووە و جیاوازییە چینایەتییەکان بە شێوەی جیاوازی خستن لە دابەشینی پوان و ئیمکاناتەکانی ژیان لـە کۆمەڵـەدا تەواو روون و بەر چاو بوو. ئەو چینەی، کە دەسەڵاتی بەدەسـتەوە گرتبـوو زیـاترین ئیمکانـات و پوانەکانی کۆمەڵگەی لە دەست خۆیدا پاوان کردبوو و بە بێ ئـەوەی خـاوەنی کۆشـك و تـەلار و دیوەخانی دەرەبەگ و دەوڵەمەندانی پێشوو بێ مافی کەڵك وەرگرتن لەوانەی بۆخۆی پاوان کردبوو. میلۆڤان جیلاس یەکێك لە رێبەرانی کۆمۆنیستی یۆگۆسلاڤیا، کە بۆ یەکەمین جـار دەرکـەوتنی ئەو چینە تازەیەی لە کۆمەڵگە کۆمۆنیستییەکاندا تاوتوێ کرد و بە تاوانی نووسـینی کتێبێکـی هەر بەو ناوە پۆستە حیزبی و دەوڵەتییەکانی لێ ئەستێندرایەوە و حەوت ساڵی زیندانی بۆ بڕایەوە وێڕای شی کردەنەوەی تایبەتمەندییەکانی ئەو چینە نوییە دەنووسێ:

"چینی نوێ بە پێـی وارسـکەکانی خـۆی پێـی وایـە تـەواوی دەسـکەوتەکانی کۆمەڵگـەی سۆسیالیستی بە تـەواوی بـۆ ئـەو تـەرخان کـراوە و دەسـتەواژەکانی خاوەنـدارێتیی دەوڵـەتی و سۆسیالیستی و کۆمەڵایەتی تەنیا لایەنی حقووقیی‌یان هەیە. چینی نوێ لە سەر ئەو باوەڕەیە، کە هەرچەشنە لادانێك بەرامبەر بـە حکوومـەتی تۆتالیتـەر و سـەرەڕۆی ئـەو، خاوەندارێتییەکـەی دەخاتە مەترسییەوە. هەربۆیەش دژی هەرچەشنە ئازادییەکە و بیانووی بۆ ئـەو دوژمنایەتییـەش

ئەوەیــە، کــە دەیــەوێ داکــۆکی و بــەرگری لــە خاوەنــدارێتیی سۆسیالیســتی بکــا. ڕەخنــە لــە خاوەندارێتیی پاوانخوازانەی چینی نوێ، مەترسیی لەدەستدانی ئەو خاوەندارێتییە دێنێتە ئــاراوە. چینی نوێ لە بەرامبەر ئەو جۆرە ڕەخنەگەلەو ویستگەلێك، کە لە ئاکامی ئــەو ڕەخنەگرتنانــەوە سەر هەڵ دەدەن بە توندی دژ کردەوە دەنوێنێ. لەبەر ئەوەی کــە ئــەو ڕەخنانــە دەبنــە هــۆی لــە قاودرانی نهێنییەکانی شێوەی بەڕێوەبەریی وڵات و بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات.... خاوەنــدارێتی لە رووی حقووقییەوە، خاوەندارێتیی کۆمەڵایەتیی تــەواوی خەڵکــە، بــەڵام لــە کــردەوەدا تــەنیا گرووپێك بە تەواوەتی ئەوەیان لەبەر دەست دایە و تێیدا قازانجی خۆی لێ هەڵدەکڕێنێ و گوێی لە بەرژەوەندیی گشتیی تاکەکانی کۆمەڵگە نییــە. دژایــەتی و ناتــەبایی نێــوان ئــەو دوو ڕەهەنــدە حقــووقی و کردەییــە، بــەردەوام دەبێتــە هــۆی ئــاڵۆزی و ســەرلێ شــێواوی لــە پێوەندییــەکانی کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێناندا. بە واتایەکی دیکە ئەوە بەو مانایەیە، کــە دەســەڵاتداران قســە و کردەوەیان وەك یەك نییەو ناتەبان، چونکی تاقمی دەسەڵاتدار جگە لە پتەوکردنی خاوەنــدارێتی و بەربڵاوترکردنەوەی سنووری دەسەڵاتی خۆی مەبەست و ئامانجێکی دیکەی نییە.

... چینی نوێ بەڵێن دەدا، کە تەواوی جیاوازییە چینایەتییەکان لادەبا، بەڵام لە راســتیدا بە پاوانکردنی بەرهەمی هەوڵ و مانــدووبوونی خــەڵك و بەدەســتەوە گــرتنی مــافی دابەشــینی نیعمەت و پێدراوە مادییەکان بە دڵخوازی خۆیان بەردەوام پوانەکان بەسەر لایــەنگرانی چــینی نویدا دابەش دەکەن و لەم ڕێگەوە جیاوازییە چینایەتییەکان زیاتر دەکەن."

لە سۆڤیەتیدا بە چینی نوێ یا دەسەڵاتدار دەڵــێن "نــۆمێن کلاتــورا". ئــەو واژەیــە، کــە ڕەچەڵەکی لاتینیی هەیە بە مانای لیسەی ناوەکانە، کە لێرەدا مەبەســت لیســتەی نــاوی ئــەو کەسانەیە، کە ئیشیان هەیە. ئەو لیستەیە 750000 کــەس لــە پلــە و پایــەی جۆراجــۆری حیزبی و دەوڵەتی لە خۆ دەگرێ، کە هەرکام بە پێی پلە و پێگەی خۆی خاوەنی پوانی تایبــەت بە خۆیەتی و بە سەرنجدان بەوەی کە ئەندامانی بنەماڵەکەسی لەو پوانگەلە کەڵك وەردەگرن بە لەبەر چاوگرتن و حسێبکردنی نێونجی هەر چواردە کەس لە بنەماڵەیەکدا، دەکــرێ بڵــێین، کــە چینی خاوەن پوان و ئیمتیاز لە سۆڤیەتیدا سێ ملیۆن کەس واتە، بڕێك زیاتر لە یەك لە سەدی کۆی حەشیمەتی سۆڤیەتیی لە خۆ دەگرت.

حەوسەد و پەنجا هەزار کەس لەوانەی، کە ئیش پلەو پایە و پوانی حیزبی و دەوڵەتییان لــە سۆڤیەتدا هەبوو لە راستیدا بــژاردە و هەڵبــژێراوانی حەشــیمەتی 17/5 کەســیی ئەنــدامانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بوون، چونکی مەرجی یەکەمی وەرگرتنی پلەوپایە لە سۆڤیەتیدا

ئەندامەتی لە حیزبی کۆمۆنیستدا بووە و هێرش بۆ بوون بە ئەندام لەو حیزبەدا، کە لە تەمەنی لاوێتییەوە بە ئەندام بوون لە یەکێتیی لاوانی حیزبی کۆمۆنیست"کۆمسۆمۆل"دا دەستی پێکرد زیاتر بەمەبەستی گەیشتن و وەرگرتنی پلەو پایە و کەڵك وەرگرتن لە پوانەکانی چینی دەسەڵاتدار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لە پێنج لە سەدی ئەندامانی حیزب نەدەگەیشتنە ئەو پلە و پۆستانەی، کە بە پوانی تایبەتیی نۆمێنکلاتورا لە قەڵەم دەدران و 95 لە سەدەکەی دیکەش خۆی دەچوونە خانەی ناڕازی و رەخنەگرانی دەسەڵاتەوە.

هێدریك سمیت نووسەری کتێبی روسەکان لە شیکردنەوەی رێکخستن و پلەبەندیی نۆمێنکلاتورا و ئەو پوانگەلەدا، کە لە پلە جۆراجۆرەکاندا پێیان دەدرێ دەنووسێ نۆمێنکلاتورا لە تەواوی ئاستەکانی کۆمەڵگەی سۆڤیەتیدا هەر لە گوندەکانەوە هەتا کرێملینبوونی هەیە... بەرزترین ئاستەکانی نۆمێنکلاتورا ئەندامانی دەفتەری سیاسی و سکرتاریای کۆمیتەی ناوەندیی حیزب و خوارترین ئاستەکەشی سەرۆکی ئەنجوومەنەکانی گوند و ئاوایی و سکرتێری کۆمیتەی حیزبییەکانیانن...

لە نێو ئەو ئەو پوانانەدا، کە دەدرێنە ئەندامانی چینی دەسەڵاتدار دەکرێ ئاماژە بە خانووبەرە و ڤیلا بۆ ژیان وکردنەوەی فرۆشگەی تایبەتی لە کاتی کەمبوونی کەرەسەی خواردەمەنی و بژیو و کاڵای بەکاربەری و لەو کاتانەدا، کە بۆ وەدەستهێنانی ئەو شتانە لە بەردەم فرۆشگە گشتییەکاندا ریزی دوورودرێژ دەگیردرا و ئەو فرۆشگە تایبەتییانە پڕن لە باشترین جۆرەکانی مەواد و کەرەسەی خواردن و بژیوی باش و کەلوپەلی بەکاربەری، کە بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر پێیان دەدرێ، بەڵام بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بە چۆنێتی کەڵك وەرگرتن لە ترۆمبیلی سواری بکەین، کە لە هەمان کاتدا ناسێنەری جیاوازیی پوانەکانی پلە جۆراوجۆرەکانی چینی دەسەڵاتداری سۆڤیەتییە:

"ئاستی باڵا و سەرەوەی بژاردەکانی حیزبی، کە بەرپرسانی باڵای حیزبین ترۆمبیلی رەشی زۆر جوانی "زیل"یان لە بن پێدایە، کە لە شێوەی ترۆمبیلی ئەمریکیی لینکۆڵن کۆنتینانتالن و رادیۆ و تەلەڤزیۆن و ئامێری فێنك کەرەوە و گەرمکەرەوەیان تیدایە و نرخیشیان نزیك بە 75000 دۆلارە. ئەندازیارێکی روسی پێی وتم، کە کەڵك وەرگرتن لەو ترۆمبیلی جۆراوجۆر لە سەردەمی ستالیندا باو بووە و ستالین هەمیشە لە کاتی هاتوچۆدا پێنج ترۆمبیلی جۆری زیلی بەکاردێنا بۆ ئەوەی کەس نەزانێ لە کامیاندایە. خرۆشۆف و بێرژنێڤیش هەر ئەو

ڕێوشوێنەیان ڕەچاو کرد و تەنیا شتێکی، کە لە چاو سەردەمی ستالین نەیانکرد ئەوە بوو، کـە کاروانی پێنج سەیارەی زیلیان کەم کردەوە و کردیانە چواردانە.

"بەرپرسانی پلە دووی دەسەڵاتداری سۆڤیەتی، کە وەزیرانـی کابینـەکان و مارشـاڵەکان و دەریاوانی سوپای سوور و بەرپرسانی زانسـتیی و زانکـۆیی و ئەنـدامانی کۆمیتـەی ناوەنـدیی حیزبی لە خۆوە دەگرت، کەڵك لە ترۆمبیلی جۆری چایکاوەردەگرن. ئەو بەرپرسـانەی، کـە لـە ترۆمبیلی جۆری زیل و چایکا کەڵك وەردەگرن لـە شـەقامەکانی مۆسـکۆدا هێڵـی هاتوچـۆ و پارکینگی تایبەتی‌یان هەیە و پوانی ئەوان لە بەراورد لەگەڵ پلەکانی خوارەوەی دەسەڵاتداران و ئەو کەسانەی لە ترۆمبیلی خۆیان کەڵك وەردەگرن روون و دیارە.

"پلەکانی خوارەوەتری چینی دەسەڵاتدار لە ترۆمبیلـی جـری وێلگـا و جۆرەکـانی دیکـەی ترۆمبیلی روسی کەڵکیان وەردەگرت. زۆربەی ئەو بەرپرسانە شۆفێری تایبـەتییان هەیـە و لـە کاتی هاتوچۆ لە شەقامەکاندا بە خۆیانەوە ڕەوا نابینن، کە ڕەچاوی ڕێوشوێنەکان و یاسـاکانی هاتوچۆ بکەن. ترۆمبیلی بەرپرسـانی حیزبـی و دەوڵـەتی لـە سـۆڤیەتی کـەڵك لـە بـەنزین و کاروباری چاککردنەوەی خۆڕایی وەردەگرن و شۆفێری هێندێ لەو ترۆمبیلانـە بـە تایبـەتی لـە پلەکانی خوارەوەدا بە کەڵك وەرگرتن لە بەنزینی دەوڵەتی لە شەقامەکانی مۆسکۆدا موسـافیر کێشی دەکەن..."

هیدریك سمیت گەلێك چیرۆك و بەسەرهات لە برەوی گەندەڵی لە نێوان بەرپرسانی حیزبی و حکوومیدا و هەروەها باسی خراپ کەڵك وەرگرتن لە پلە و پایە و پێگـەیان دەگێڕێتـەوە، کـە ناکرێ لێرەدا هەمووان بخەینە ڕوو و بەهێنانەوەی نموونەیەك لێرەدا وەك لاوێچێك لە خـەروارێك و هەشتێ لە مشتێ باسەکە تەواو دەکەین. چیرۆکەکە باسی تاقانە ژنـی ئەنـدام لـە دەفتـەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیست و وەزیری ڕۆشنبیریی سۆڤیەتی لە ساڵانی حکوومەتی خرۆشـۆف و بێرژنێڤدا، واتە خاتو یەکاترینا فورتسێڤا یە، کە بە پێی نووسینەکەی هێدریك سمیت خرۆشۆف حەزی لێی بووە و هەر بۆیەش گەیاندبوویە بەرزترین پلەی حیزبی و دەوڵەتی. فۆرتسـێڤا پـاش چوار ساڵ ئەندامەتی لە دەفتەری سیاسیی حیزبدا (کە لە سەردەمی خرۆشۆف دا پێی دەگـوترا دەستەی سەرۆکایەتیی کۆمیتەی ناوەنـدی) ئـەو پۆسـتەی لـێ ئەسـتێنرایەوە، بـەڵام پۆسـتی وەزارەتی خۆی هەتا دە ساڵ دوای لە سەر کار لابرانی خرۆشۆف پاراست و ئەو کاتەش، کە مرد هەر لەو پۆستەدا بوو.

ئەو چیرۆکەی هیدریك سمیت لە خراپ کەڵك وەرگرتنی فۆرتسیڤا لە پلە و پۆستی دەوڵەتیی خۆی دەیگێڕێتەوە پێوەندیی بە بینای ڤیلایەکی گرانباییەوەیە، کە بە کەرەســەی دەوڵــەتی بــۆ سۆتلانای کچی ساز کردبوو و خاڵی جێگەی سەرنج ئەوەیە، کە ئەو خاتوونە و نیکۆلافیریڤبینی مێردی، کە جێگری وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی بوو، جگە لەو ڤیلایە دووانی دیکەشی لە قەراغ مۆسکۆ و لێواری دەریای رەش هەبووە. کاتێك لە ساڵی 1974دا ئەو نهێنییە ئاشــکرا بــوو فۆرسیڤا بۆ دانی بڕی شێست هەزار ربل (هەشــتاهەزار دۆلار)ی نرخــی کەرەســەی بیناســازیی دەوڵەتی کەوتە ژێر گوشارەوە. فۆرتسیڤا لە ماوەی دوو رۆژدا ئــەو بــڕە پارەیەیــدا، کــە خــری باسێکی نوێی لێکەوتەوە، چونکی پاشکەوتکردنی ئەوەندە پارەیە لــە ســەر چــاوەی مووچــەی دەوڵەتی لە سۆڤیەتیدا رێی تێناچی و توانای فۆرتسیڤا لە دانی شێست هەزار رۆبل بە دەوڵەت خۆی نیشانەی ئەوە بوو، کە ئەو لە رابردوودا کەڵکاژۆی(کەڵکی پێچەوانە و خراپ) لە پێگەی خۆی وەرگرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا بێرژنێڤ نەیهێشت پلەی وەزارەتی لێ بستێننەوە و فۆرتســێڤا لە ئۆکتۆبەری ساڵی 1974دا هەر وا ئەو پۆستەی هەبوو، کە مرد.

# 6

یاسای بنەڕەتیی سۆڤیەتی بۆ هەرکام لـە کۆمارییـەکانی ئـەو وڵاتـە ڕێکخراوێکـی دەوڵـەتیی سەربەخۆی پێشبینی کردووە و هەر کام لـە کۆمارییـەکانی ئـەو وڵاتـە خـاوەنی سـەرۆك کۆمـار و سەرۆکی وەزیـران و ئەنجوومـەنی وەزیـران و وەزارەتخانـەی سـەربەخۆ بـوون. هـەتا بڕێـك بـەر لـە هەرەسـهێنانی سـۆڤیەتی دەسـەڵاتی سـەرۆکی کۆمـاریی هـەر کـام لـە کۆمارییـەکان هێنـدەی پارێزگارەکانی ئێمە بوو سەرۆکی وەزیرانی هەرکامیش لەوان، کە لە ژێر چـاوەدێریی ئـەودا کاریـان دەکرد ناچار بوون پێملی فەرمانەکانی حکوومەتی ناوەندی بوون. لە لایەکی دیکەوە بەو دەسەڵات و ئۆتوریتەیەی، کە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە بەڕێوەبەریی کاروباری وڵاتدا هەیبوو بەرپرسـانی دەوڵەتیی هەر کۆمارییەکیش بە کردەوە پێملی ئۆرگانەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەو کۆمارییە بوون و کەسی یەکەمی هەر کۆمارییەکیش سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی ئـەو کۆمارییـە بـوو، کە بە نۆرەی خۆی پێملی فەرمانەکانی کۆمیتەی ناوەندیی و دەفتەری سیاسیی حیزب بوو.

یاسای بنەڕەتیی سۆڤیەتی وێڕای ئەو ماف و ئازادییانەی، کە لە سەر کاغـەز بـە خـەڵکی سۆڤیەتیی داون ئیزنی بە کۆمارییەکانی سۆڤیەتییشدا بوو، کە ئەگەر زۆرینەی خەڵك ویستیان لە یەکێتیی سۆڤیەتی جیا ببنەوە، بەڵام ستالین و جێنشینەکانی، کاتی نووسینی ئـەو یاسـایە باشیان دەزانی، کە ئەگەر حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و تۆڕی بەربڵاوی کۆمیتەی ئاسایشـی دەوڵەتیی کا.گا.ب بە دەسەڵات بگەن کەس ناوێرێ هەستی سـەربەخۆیی خوازانـەی خـۆی لـە هیچ کام لە کۆمارییەکاندا دەربڕێ و ئەو بڕگەیەی یاسای بنـەڕەتیی سـۆڤیەتی بـۆ نیشـاندانی ئازادیی خەڵکی کۆمارییەکانی سۆڤیەتی لە دیاریکردنی چارەنووسـی خۆیانـدا تـەنیا لایـەنی پڕوپاگەندەیی بۆ دەرەوە هەبوو.

بەڵام بەو گۆڕانانەی، کە لە ساڵانی دەسەڵاتدارێتیی گورباچۆڤدا لە سۆڤیەتیدا پێك هات و بەو ئازادییانەی، کە بە خەڵکی ئەو وڵاتە دران، هەر ئەو یاسا بنەڕەتییە بێکەڵکەی سـۆڤیەتی بووە کاریگەرترین چەك بە دەست ڕێبەرانی کۆمارییەکانی ئەو وڵاتەوە بۆ سەربەخۆیی بڕیاردان لە بەرامبەر حکومەتی ناوەندیدا و هێندێ لەو کۆمارییانە بە پشتبەستن بەو بڕگەیـەی یاسـای بنەڕەتی داوای سەربەخۆییان کرد. لە پازدە کۆمارییەکـەی سـۆڤیەتی سـێ کۆمـاریی لێـواری

دەریای بالتیك(لیتوانی و لیتۆنی و ستۆنی)، کە لە ساڵی 1940دا پاش ڕێککـەوتنی نێـوان هیتلەر و ستالین خرانە سەر یەکێتیی سۆڤیەتی بەر لە هەمووان داوای سەربەخۆییان کرد و بـە شوێن ئەواندا کۆمەڵێك بزووتنەوەی سەربەخۆیی خـوازی لـە کۆمارییـە موسـوڵمانەکانی ئـەو سۆڤیەتییشدا وەڕێ کەوتن.

لە شەش کۆمارییە ئاسیاییەکەی سۆڤیەتی، کە موسـوڵمانان لـە زۆرینـەدان (ئازەربایجـان قەزاقستان و ئۆزبەکستان و تاجیکستان و تورکەمەنستان و قیرقیزستان) هەسـتی نەتەوایـەتی لەگەڵ هەستی ئاینی تێکەڵاو ببوو و دانیشتوانی ئەو کۆمارییانە هەست و حەزی سـەربەخۆیی خوازیی خۆیان لە چوارچێوەی دەمارگرژیی ئـایینی و پێداگرتنـەوە لـە سـەر بـە جێگەیانـدنی ڕێوڕەسمە ئایینییەکاندا دەردەبڕی. حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پاش تێپـەڕینی حـەفتا سـاڵ خەبات دژی ئاین لە کۆمارییە موسوڵمانەکانی سـۆڤیەتیدا هیچـی پـێ نـەکرا و نـەوەی ژێـر تەمەنی 65 ساڵ لەو کۆمارییانـەدا، کـە هـەمووان لـە سـەردەمی حکوومـەتی سـۆڤیەتیدا چوونەتە قوتابخانە و وانەی دژە ئـایینی‌یـان پـێ وتـراوە دەسـتیان لـە بـاوەڕە ئایینییـەکانیان هەڵنەگرتبوو. خاتو هێلێن کارێردێنکوس لێکۆڵەر و پسپۆڕی ناوداری پرسەکانی سۆڤیەتی، کە کۆمەڵێك بەرهەمی لە پێەندی لەگەڵ سۆڤیەتیدا هەیە بەشێکی گرینگـی کتێبـە ناودارەکـەی خۆی بە ناوی "ئیمپراتۆریای لێکترازاو"، کە چەند ساڵ بەر لە هەرەسـهێنانی سـۆڤیەتی بـڵاو بۆتەوە بۆ تاوتوێکردنی کێشە و گرفتەکانی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەگەڵ موسوڵمانەکانی ئەو وڵاتە تەرخان کردووە و بۆ وێنە نووسیوێتی دەوڵەتی سۆڤیەتی نەك نـەیتوانیوە نـەوەی پـیر و کـۆنی کۆمارییە موسوڵمانەکان لە ئاین بشواتەوە بەڵکو نەیتوانیوە گەنجانی ئـەو کۆمارییانـەش لـە ئـاین دوور بخاتـەوە و بێجگـە لـە ژمارەیـەکی کـەمی ئەنـدامانی یـەکێتیی لاوانـی حیزبـی کۆمۆنیست (کە ژمارەیان ناگاتە 10 لە سەدی گەنجان) ئەوانی دیکە ڕێوڕەسمە ئایینییـەکانی خۆیان بە جێ دەگەیەنن. نیشانەیەکی دیکـەی هـەبوونی بـاوەڕی ئـایینیی لـە نێـو گەنجانـدا سووربوونیانە لە سەر بەجێگەیاندنی ڕێوڕەسمی ئایینی لە زەماوەندکردنیاندا و هەر وەها ئەوەی کە زیاتر لە حەفتا لە سەدیان لە زەماوەندکردن لەگەڵ ناموسوڵمان خۆ دەبوێرن.

نووسەری فەڕەنسی هەر لەو کتێبەدا دەنووسێ سەرەڕای ئەو هەمووە کۆسپ و لەمپـەرەی، کـە بەرپرسـانی سـۆڤیەتیی دەیخەنـە سـەر ڕێگـەی بـەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمـە ئایینییـەکانی موسوڵمانان، دیسانیش ئەوان هەروا سوور و پێداگرن لە سەر بەڕێوە بردنی جێژن و تازییەبارییە ئایینییەکانیان و ڕێژەی ئەوانەی، کە لە مانگی ڕەمەزاندا بەرۆژوو دەبن لـە زۆربـەی وڵاتـانی

موسوڵمانی دیکه زیاترن.دانکوس ئاماژه به خاڵێکی سەرنجڕاکێشی دیکـەش دەکـا و ئـەویش بەڕێوەچوونی ڕێورەسمی تازییەبارییی ڕۆژانی مەحەڕەم و عاشورایه له نێو موسوڵمانانی شـیعەی سۆڤیەتیدا. بەڕێوەچوونی ئەو ڕێوڕەسمانه له ساڵی 1929وه له کۆمارییه موسـوڵمانەکان بـه تایبەتی له ئازەربایجاندا قەدەغه کرابوو، بەڵام نووسەری فەڕەنسـی لـه زمـانی سەرچـاوەگەلی متمانەپێکراوەوه دەنووسێ، که موسوڵمانه شیعەکانی سۆڤیەتی تەنانەت بەر لـه گۆڕانـەکانی ئەو دواییانەش هەموو ساڵێك ئەو ریۆرەسمانەیان له ڕۆژانی عاشووورادا به جێگەیاندووه.

دەوڵەتی سۆڤیەتی، که نەیتوانیوه به شێوەی بنەمایی دژایـەتیی ئیسـلام بکـا لـه دیـەی 1960وه هەوڵ دەدا کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش له نێوان ئیسـلام و کۆمۆنیزمـدا ببینێتـەوه و زانایانی موسوڵمانی سۆڤیەتی بۆ پروپاگەندە و بانگەشه بۆ ئەو بیروبۆچوونه هان بدا. له ساڵی 1970دا کۆنگرەی موسوڵمانانی سۆڤیەتی له تاشـکەندی پایتـەختی کۆمـاری ئوزبەکسـتان پێك هات و ئاخێوەرانی سەرەکیی کـۆنگره زیـاتر بانگەشـەیان بـۆ ئـەو بیرۆکەیـه کـرد، کـه هەوڵەکانی حکوومەتی سۆڤیەتی له پێنـاوی سـەقامگیریی دادپـەروەری و یەکسـانیدا لەگـەڵ بنەماکانی ئیسلام یەك دەگرنەوه. یەکێك له ئاخێوەرانی ئەو کۆنگرەیه هـەزایۆڤ لـه زانایـانی ئازەربایجانی سۆڤیەتی بوو، که گوتی:"نابێ گومان لەوه بکەین، که بنەماکانی سـەرمایەداری له سەر نا دادپەروەری و چەوساندنەوه دامەزراون لـه حاڵێکـدا سۆسـیالیزم لـه سـەر بنـەمای یەکێتی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی لەگەڵ ئامۆژگاری و فێرکارییه ئاسمانییەکانی ئێمەدا یـەك دەگرنەوه". هێلێندانکوس هەر لەم زانایه دەگێڕێتەوه، کـه وتوویەتی:"ئـەوه نیشـانەیەکه لـه بژاردەبوونی پێغەمبەری مەزنی ئێمه بنەما کۆمەڵایەتییەکانی سۆسیالیزمی له چاخی نـەزانی و جاهلیدا هێنایه گۆڕێ و زۆر پێ خۆشحاڵم ئەگەر بڵێم، که زۆربەی بنەماکانی سۆسیالیزم، که ئەمڕۆ دەیانبینین یەکەم جار لـه لایـەن ئـەو حەزرەتـەوه هێنراونەتـه بـەر بـاس". هـەر لـەم کۆنگرەیەدا زانایەکی دیکه به ناوی ئەحمەد حـەبیبولاًبوزگۆزیڤ، کـه وەك مـوفتیی ئەوبـەری قەفقاز ناویان هێناوه گوتی:" ڕێبەرانی سۆڤیەتی، که نه خوایان قەبووڵه و نه پێغەمبەرەکـەی هەر ئەو یاسایانه بەڕێوه دەبەن، که خودا پێغەمبەرەکەی خۆی بۆ بەڕێوەبردنیان ناردبوو".

ئیسلام له هێندێ له کۆمارییـەکانی سـۆڤیەتیدات وای ڕەگـاژۆ کردبـوو، کـه بەرپرسـانی حیزبی و دەوڵەتی ناچار بوون جاروباره له ڕێورەسمه ئایینییەکاندا بەشدار بن و هەر ئەوەش بوو کەوای له گورباچۆڤ کرد، که له سەردانەکەی تاشکەندیدا لەبەر بەشداریی هێندێ له بەرپرسانی حیزبی و حکوومی له ڕێوڕەسمه ئایینییەکانـدا ڕەخنـەیان لـێ بگـرێ . یـەکێك لـه ڕێبـەرانی

خۆجێیی، کە زۆر تاسەباری بەشداری لە ڕێوڕەسمە ئایینییەکان بوو"دین محەممەد کۆنایۆڤ "ی سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستان بوو، کە ناوە ئەسڵییەکەی خۆی "تەیموور ئیمام قولی ئۆغلی "بوو و پێدەچوو، کە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی هاونیشتیمانە موسوڵمانەکانی ناوی دین محەممەدکۆنایۆڤی لە سەر خۆی دانا. دین محەممەدکۆنایۆڤ پاش قسەکانی گورباچۆڤ پۆستی سکرتێریی یەکەمی حیزبی کۆمۆنیستی قەزاقستانی لێ ئەستێنرایەوە و هەر وەکی لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کرد بە دوای لە سەر کارلابرانی ئەودا کۆمەڵێك بشێوی و نائارامی لە ئالمائاتا ی ناوەندی کۆماری قەزاقستاندا دەستی پێکرد. گۆڤاری تایمی ئەمریکی نزیك بە دوو مانگ پاش ئەو ڕووداوانە لەژمارەی ڕێکەوتی دووی مارسی 1987ی خۆیدا ڕاپۆرتێکی لە زمانی هەواڵنێری ئەو گۆڤارەوە لە مۆسکۆ بڵاو کردەوە، کە سەردانی ئالمائاتای کردبوو و تێیدا نووسیی خۆپیشاندانەکانی پایتەختی کۆماری قەزاقستان، کە بووە هۆی تێکهەڵچوونی نێوان خەڵك و هێزەچەکدارەکانی سۆڤیەتی زۆر لەوە بەرینتر و بەربڵاو تر بوو، کە هەواڵنێریی تاس باسی کردووە. لەو خۆپیشاندانانەدا نزیك سێ هەزار کەس، کە زۆربەیان خوێندکار و گەنج بوون بەشدارییان کرد و بە شێوەیەك، کە سەرۆك وەزیری موسوڵمانی قەزاقستان "نوور سوڵتان نەزەربایۆڤ" بە هەواڵنێریی تایمی وتووە، کە خۆپێشاندەران درووشمی ناسیۆنالیستی و هاندەرانەی وەك قەزاقستان بۆ قەزاقان"یان دەدا بۆیە هێزە چەکدارەکان بۆ بڵاوەپێکردنیان هاتنە پێشەوە.

خاڵێکی گرینگ، کە لێرەدا پێویستە وەبیری بێنینەوە هەوڵدان بوو بۆ پاراستنی تەشەنە و ئۆتوریتەی ڕوسیا لە نێو کۆمارییە جۆراجۆرەکانی سۆڤیەتیدا لە ڕێگەی کۆچکردن و نیشتەجێکردنی حەشیمەتێکی بەرچاوی ڕوسیاییەوە لە هەر کام لەو کۆمارییانەدا. خاتودانکوس ئامارێکی سەرنجڕاکێشی لە ڕەوتی ڕوولەزیادبوونی ئەو لێشاوی کۆچە لە ماوەی ساڵانی 1959 هەتا 1970 لە کتێبەکەیدا هێناوە و بۆ وێنە دەنووسێ لەو ماوەیەدا حەشیمەتی ڕوسەکانی نێو ئۆکراین لە 7091000 کەسەوە گەیشتە 9126000 کەس، واتە 28/7 لە سەد و حەشیمەتی ڕوسەکانی قەزاقستان لە 3972000 کەسەوە گەیشتە 5522000 کەس، واتە 39/2 لەسەد زیادی کردووە، کە لە چاو حەشیمەتی ئۆکراین نزیکەی بیست لە سەدی حەشیمەتی ئەو کۆمارییە و لە چاو حەشیمەتی قەزاقستان زیاتر ل بەك لە سێی حەشیمەتی ئەو وڵاتە پێکدێنن. هەر بە پێی ئەو ئامارانە لە کۆماری ئوزبەکستان دا 1473000 کەسی ڕوسی، لە بیلوڕۆسی

938000 کـەس، لـەئازەربایجانی سـۆڤیەتی 510000 کـەس، لـە قیرقیزسـتان 856000 کەس و لە گورجستان 397000 کـەس و لـە تاجیکستان 344000 کەس و لە تورکەمەنستان 313000 کەس، لە لیتۆنی 705000 کەس و لە مۆلداوی 414000کەس و لە ستۆنی 335000 کـەس لـە لیتـوانی 268000 کـەس لـە ئەرمەنستان 66000کەسی روسیایی دەژیان، کە لـە چـاو حەشـیمەتی هـەر کـام لـەو کۆمارییانە لە سێ هەتا سی لە سەدی کۆی حەشیمەتەکەیان پێك هێناون. کەمترین رێژەی روسییەکان لە کۆمارییانەدا لـە ئەرمەنستاندا بـەدی دەکـرێن و زیـاترین رێـژە لـە دوو کۆماریی ئاسیای ناڤین (قەزاقستان و قیرقیزستان) و لـە دوو کۆمـاریی لێـواری دەریـای بالتیك (لیتۆنی و ستۆنی)دان.

دەبێ ئەوەشی لێ زیاد بکەین، کە فاکتەرێکی گرینگـی پـەرەگرتنی تەشـەنە وبـوونی روسییەکان لـە کۆمارییـەکانی دیکـەی سـۆڤیەتیدا، جگـە لـە کـۆچ و نیشـتەجێکردنی روسییەکان لەو کۆمارییانەدا، مەسەلەی زمان و تەشەنە و پەرە گرتنی ئەدەبیاتی روسییە لە ولاّتانەدا. زمانی فەرمیی تەواوی ئەو کۆمارییانە زمانی روسییە و فێرکردنـی زمـانی روسی وەك زمانی دووەم لە تەواوی قوتابخانەکانیدا بە زۆر بوو. فێربوون و زانینی زمـانی روسی کلیلی چوونە نێو پۆستە حیزبی و دەوڵەتییەکان بوو و هەر بۆیەش چینی خوێندەوار و رۆشنبیر مەیل و گرۆییەکی زۆریان بۆ فێربوونی زمانی روسی هەبوو. بە تایبەتی شێوەی نووسینی کتێبە خۆجێییەکانیش کۆڕابوون بۆ زمانی روسـی و سـەرەڕای ئـەو کۆمـەڵێك بەربـەرەکانێ، کـە لـە هێنـدێ کۆمارییـەکانی سـۆڤیەتیدا بـە تایبـەتی لـە کۆمارییـە موسولمانەکاندا لە بەرامبەر زاڵبوونی کولتـووری روسـدا دەسـتی پێکـردووە، گـۆڕانێکی گرینگ و بنەمایی لە رەوتی ئێستادا پێویستیی بە کاتێکی زۆر هەیە.

لێرەدا بە سەرەنجدان بەو بابەتانەی، کە لە سەر کەمبوونەوەی رێژەی حەشیمەتی روسـەکان لە چاو نەتەوەکانی دیکە لە سەرەتای ئەو بەشەدا باسیان لێوە کـرا دەبـێ ئەوەشـی لـێ زیـاد بکرێ، کە لە نزیکەی 144 ملیۆن حەشیمەتی کۆماری فدراتیڤی روسیای بەر لە لێکترازانـی زیاتر لە حەڤدە لەسەدی واتە نزیکەی بیست و پێنج ملیۆن کەسیان غـەیرە روسـی بوونـو ئـەو روسیانەش، کە لە کۆمارییەکانی دیکەدا نیشتەجێ کرابوون هەر بەو رێژەیە بەراورد دەکران.

# بەشی دوازدەهەم

# سۆڤیەت لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا

کۆمۆنیزم ئایدۆلۆژیایەکی جیهانییە و ئەو رۆژەی، کە کۆمۆنیستەکان لە روسیای ئەوکاتدا بە دەسەڵات گەیشتن مەبەستی خۆیان لە بەرینکردنەوەی کەوشەنی حکوومەتەکەیان هەتا چوار قوڕنەی دونیا لە کەس نەشاردەوە. یەکەمین هەنگاوی بۆلشەڤیکەکان بۆ بەرینکردنەوەی ئەو پێگەرە زاڵبوون و دەست گرتن بوو بەسەر تەواوی ناچەکانی ژێر دەستی تەزارەکاندا و هەروەها وەرگرتنەوەی ئەو زەوییانەی، کە لە جەنگەی شۆڕشدا لە چنگی تەزارەکان رزگارییان هات و هەرکام حکوومەتێکی سەربەخۆیان بۆ خۆیان پێك هێنابوو.

لینین هەر لەگەڵ ئەوەی کێشە و گرفتە نێوخۆییەکانی لە کۆڵ بوونەوە و حکوومەتی بۆلشەڤیکیی دامەزراند کەوتە بیری پەرە پێدانی شۆڕشی کۆمۆنیستی بۆ بەشەکانی دیکەی جیهان و ئامانجی پێك هێنانی (بین الملل)ی سێیەم یا کۆمینترێن گەیشتن بەو مەبەستە بوو. یەکەمین کۆنگرەی نێونەتەوەیی کۆمۆنیست لە مانگی مارسی 1919دا لە مۆسکۆ گیرا و لینین، کە خۆی بەشداری کۆبوونەوەکانی ئەو کۆنگرەیەی دەکرد ئامانجەکانی خۆی لە بە جیهانیکردنی شۆڕش و رێگەکانی گەیشتن بەو ئامانجەی بۆ نوێنەرانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی وڵاتانی دیکە روون دەکردەوە، هاوکات لەگەڵ گیرانی یەکەمین کۆنگرەی نێودەوڵەتیی کۆمۆنیست یەکەمین حکوومەتی کۆمۆنیستی لە دەروەی قەڵەمڕەوی حکوومەتی سۆڤیەتیدا لە ئەورووپا دامەزرا و بێلانکون رێبەری کۆمۆنیستی هەنگاری بە کۆدەتایەکی سەربازی لە رۆژی 21 ی مارسی 1919دا جڵەوی دەسەڵاتی ئەو وڵاتەی بەدەستەوە گرت، بەڵام حکوومەتەکەی زۆری خۆ رانەگرت و لە نۆڤەمبەری هەر ئەو ساڵەدا بە کۆدەتایەکی دیکە لە لایەن دەریاوان هۆرتییەوە رووخێنرا.

لینین له یەکەمین کۆنگرەی نێودەوڵەتیی کۆمۆنیستدا یــەکێك لــە نــزیکترین هاوکارەکــانی خۆی واته زینۆویێڤی کــردە ســەرۆکی و وێــڕای ئــەو هــەمووە کێشــە و گرفتــە ماڵییــەی، کــە حکوومــەتی بۆلشــەڤیکی لــە یەکــەمین ســاڵانی دامەزرانیــدا لەگــەڵی دەســتەو یەخــە بــوو گوژمەیەکی بەرچاو و سەرنجڕاکێشی بە مەبەستی پــەرە پێــدانی شــۆڕش لــە وڵاتــانی دیکــەی جیهاندا خستە بەر دەستی.

ئەمجارەیان لینین بۆ شۆڕشێکی کۆمۆنیستی ئەڵمانیای هەڵبژاردبوو و پاش گرتنی دووەمــین کۆنگرەی کۆمینترێن لە مۆسکۆ، کە لە هــاوینی ســاڵی 1920دا بەڕێوەچــوو زینــۆویێڤی بــە رواڵەت بەمەبەستی بەشداری لە کۆنگرەی حیزبــی سۆسیالیســتی ســەربەخۆی ئــەڵمانیا و لــە راستیدا بۆ وەڕێخستنی شۆڕش لە ئەڵمانیادا بەڕێی ئەو وڵاتە کرد. زینۆویێڤ، کە بــە تــەواوی بەسەر زمانی ئەڵمانیــدا زاڵ بــوو لــە کــۆنگرەی حیزبــی سۆسیالیســتی ئــەڵمانیادا وتــارێکی تێروتەسەلی پێشکەش کرد، بەڵام قسەی هاندەرانەی ئەو، کە هەڵگری بانگهێشتنی راشکاوانە لە سۆسیالیستەکان بوو بۆ هەستان و راپەڕین دژی دەسەڵات، بووە هۆی ئاڵۆزی و چەندبەرەکی لە حیزبی سۆسیالیستدا. لە کاتی دەنگوەرگرتندا بۆ دیاریکردنی رێبــازی داهــاتووی حیــزب، زۆرینە بە لایەنگری لە باڵی شۆڕشگێر و لایەنگرانی بیروبۆچوونی سەرۆکی کۆمینترێن دەنگیان دا و کەمینە کۆبوونەوەی کۆنگرەیان بەجێهێشت. زۆرینــەی کــۆنگرە دواجــار بڕیــاری دا، کــە گەڵاڵەی پێشنیار کراوی زینــۆویێڤ بــۆ وەڕێخســتنی شۆڕشــێکی کۆمۆنیســتی لــە ئــەڵمانیادا جێبەجێ بکا، بەڵام هەوڵی کۆمۆنیستەکان بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات لە مانگی مارســی 1921دا تووشی شکست بۆوە و ئەو شۆڕشە کرچ وکاڵ و بە هەڵپەیە بووە هــۆی دامــەزرانی حیزبی نوێی نازی یا ناسیۆنال سۆسیالیستەکانی ئەڵمانیا بە رێبەرایەتیی هیتلەر.

بە دوای مەرگی لینین و کێشە لە سەر بەدەستەوە گــرتنی دەســەڵات لــە ســۆڤیەتیدا، کــە سەرەتا لە نێوان ستالین و ترۆتسکی و دوایی لــە نێــوان ســتالین و زینۆویێڤــدا دەســتی پێکــرد چالاکییە نێودەوڵەتییەکانی کۆمینترێنیش لە کەمییدا. ململانێی دەســەڵاتی نێــوان ســتالین و زینۆویێڤ، کە ستالین تێیدا ســەرکەوت، لێکــەوتنی زینــۆویێڤی لــە ســەرۆکایەتیی کــۆمینترێن لێکەوتەوە و سەرۆکی دوایی کۆمینترێن واتە بۆخارین یش لە ســاڵی 1929دا پــاش کێشــەو ناکۆکی لەگەڵ ستالین لە پۆستە لابردرا. لە ماوەی ســاڵانی 1929 هــەتا 1939دا ســتالین سەرقاڵی پاکسازیی نێوخۆیی و پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی بوو هەتا ئەوەی کە پــاش بەســتنی پەیمانی دۆســتایەتی و پاراســتنی دوولایەنــە لــە نێــوان ســۆڤیەتی و ئــەڵمانیای هیتلەریــدا و

دەستپێکردنی شەڕی دووەم ی جیهانی، لەشکری سوور لە پێشدا دەستی بەسەر بەشێك لە خاکی خۆرهەڵاتی پۆلۆنیادا گرت و دوایی دەستدرێژیی کردە سەر فەنلاند. قۆناغی دوایی ئەوە بوو، کە سێ وڵاتی لێواری دەریای بالتیك (لیتوانی و لیتۆنی و ستۆنی) وەسەر خاکی سۆڤیەتی خران و بە پێی ئەو بەڵگانەی، کە دواتر لە مەڕ دانوستانە نهێنییەکانی نێوان مۆلۆتۆف و ربێن ترۆپ، وەزیرانی دەرەوەی سۆڤیەتی و ئەڵمانیادا بلاو بوونەوە سۆڤیەتییەکان گەرەکیان بوو کەوشەنی دەسەڵاتیان بگەیەننە لێوارەکانی کەنداوی فارس، کە ئیتر هیتلەر وازی لە پەیمانی دۆستایەتی و یەکێتی لەگەڵ ستالینی هێنا و بە هێرشی هێزەکانی ئەڵمانیا بۆ سەر سۆڤیەتی نەخشەکانی ستالین بۆ دابەشینی جیهان لەگەڵ هیتلەردا بوونە بلقی سەر ئاو.

لە باسی رووداوەکانی سەردەمی ستالین لە بەشی شەشەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەوە کراوە، کە ستالین چۆنی توانی بە راکێشانی متمانەی رۆزڤێلت و وەرگرتنی یارمەتیی لەرادەبەدەری سەربازی و ئابووریی بێ بەرامبەر لە ئەمریکا هێزەکانی هیتلەری لە سۆڤیەتی وەدەربنێ و لە قۆناغەکانی کۆتایی جەنگدا دەسبەسەر پێنج وڵاتی خۆرهەڵاتی ئەورووپا و نزیك بە یەك لە سێی خاکی ئەڵمانیادا بگرێ و زیاتر لە یەك کیلۆمەتری چوار گۆشەی بخاتەسەر کەوشەنی دەسەڵاتەکەی. لە دوایین رۆژەکانی شەڕدا و پاش ئەوەی ژاپۆن لە دوای وێکەوتنی دوو بۆمبی ناوکی گەیشتە سەر هەڵدێری خۆبەدەستەوەدان و رووخان لەشکری سوور لە خۆرهەڵاتی نزیکیشەوە خۆی لە شەڕ وەردا و دەستی بەسەر کۆریای باکووری و مەنچۆری و دوورگەکانی ساخالینداگرت. پاش دامەزرانی حکوومەتی کۆمۆنیستی بە چین لە ساڵی 1949دا لەشکری سوور خاکە داگیرکراوەکانی مەنچۆریی پێدانەوە، بەڵام دوورگەکانی ساخالین خرانە سەر خاکی سۆڤیەتی و لە کۆریای باکووریش کۆمارێکی دیموکراتیك لە سەر شێوازی وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتیدامەزرێنرا.

## 2

لە ماوەی چل ساڵدا، لە مەودای نێوان کۆتایی شەڕی دووەم ی جیهانی لە ساڵی 1945دا هەتا هاتنەسەرکاری حکوومەتی گورباچۆڤ لە ساڵی 1985دا، کە لە بەشەکانی داهاتوودا باس لە سیاسەتە جیهانییەکانی ئەو دەکەین دەوڵەتی سۆڤیەتی لە حەوت وڵاتی دەسبەسەر

داگیراوی سەردەمی شەڕدا(پۆلۆنیا و هەنگاریا و چیکۆسلۆڤاکیا و ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی و رۆمانی و بۆلغارستان و کۆریای باکووری) نەك هەر دەسەڵاتی خۆی پاراست بەڵکو بەسەر دە وڵاتی دیکەی جیهانیشدا زاڵ بوو و لە سی وڵاتی دیکەی جیهانی سێیەمدا بوو بە پێگە و جێگە متمانەیەکی سەرنجڕاکێش؟

دەکرێ قۆناغەکانی پێشکەوتنی سیاسەتی سۆڤیەتی لە جیهاندا لە ماوی چل ساڵی دوای شەڕی دووەم ی جیهانیدا بکەینە سێ قۆناغ:

1ـ قۆناغی شەڕی سارد: ئەو قۆناغە رێك لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە دەست پێدەکا و هەتا ساڵی 1962 دەخایەنێ. دەستەواژەی شەڕی سارد، کە بە واتای شەڕی دەروونی و پروپاگەندەیی و بە بێ کەڵك وەرگرتن لە چەکوچۆڵ ە، یەکەمین جار سیاسەتوانی ئەمریکی "بیرنارد بارۆخ" لە ساڵی 1948دا بەکاری هێنا، بەڵام شەڕ بە کردەوە لە ساڵانی 1945 و 1946دا لە جەنگەی یەکەمین کێشە و ململانێی سۆڤیەتی لەگەڵ هاوپەیمانانی خۆی لە سەردەمی شەڕدا، لە سەر مەسەلەی ئازەربایجان دەستی پێکردبوو. ستالین سوور بوو لە سەر ئەوەی شوێن پییەك بۆخۆی لە ئێراندا بکاتەوە و هەربۆیەش بەر لە کێشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ئێراندا حکوومەتێکی سەربە، خۆی لە ئازەربایجاندا دامەزراند، بەڵام پاش کشانەوەی سەربازەکانی سۆڤیەتی لە ئێران ئەو حکوومەتە کارتۆنییەش رووخا و ستالین لە بەرامبەر هەڕەشە و وریایی پێدانی ئەمریکادا، کە لەو کاتدا تاقانە هێزی خاوەن چەکی ناوکی بوو، نەیتوانی بچێ بە هانای حکوومەتی سەر بە، خۆی لە ئازەربایجانەوە.

شەڕی سارد بەهێنانەگۆڕێی دۆکترینی ترۆمەن بۆ "پشتیوانی لەو وڵاتانەی، کە هەڕەشەی دەستدرێژی لە دەرەوەیان لە سەر ە یا ئەوەی کە بە پشتیوانیی دەرەکی راپەڕینی چەکدارییان تێدا کراوە" پەرەی گرت. بە پێی ئەو گەڵاڵەیە، کە لە مانگی مارسی 1947دا لە لایەن کۆنگرەی ئەمریکاوە پەسند کرا، ئەمریکا چوارسەد ملیۆن دۆلاری وەك یارمەتیدایە تورکیا و یۆنان، کە هەڕەشەی دەستدرێژیی سۆڤیەتییان لە سەر بوو و گەڵاڵەی مارشال، کە بە دوای ئەودا بەڕێوە چوو پێشی تەشەنە و دزەکردنی سۆڤیەتیی بۆ نێو وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوایی گرت.

شەڕی سارد لە ساڵی 1948دا بە گەمارۆدرانی بەرلین لە لایەن هێزەکانی سۆڤیەتییەوە و گرتنی رێگەکانی پێوەندیکردنی زەمینیی ئەو شارە بە ئەڵمانیای خۆرئاواییەوە بە لووتکە گەیشت. وڵاتانی خۆرئاوایی بەکردنەوەی پردێکی ئاسمانی لە نێوان بەرلین و ئەڵمانی خۆرئاواییدا هەوڵەکانی سۆڤیەتییان بۆ وەدەرنانی هێزەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و فەڕەنسا

لەو شارەدا پووچەڵ کردەوە و دەوڵەتی سۆڤیەتی ناچار پاش ساڵێك دەستی لە گەمارۆی بەرلین هەڵگرت، بەڵام شەڕی سارد بە بەسترانی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری لە ساڵی 1949دا درێژەی کێشا و دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو، ڕێکخراوی پەیمانی وەرشۆی لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی دامەزراند.

لە ساڵی 1950دا لەگەڵ هێرشی هێزەکانی کۆریای باکووری بۆ سەر کۆریای باشوور بە دنەدان و هاندانی ستالین، شەڕی سارد بۆ ماوەیەك بوو بە شەڕی گەرم، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە سۆڤیەتی خۆی ڕاستەوخۆ خۆی لەو شەڕە هەڵنەقورتاند و شەڕەکە لە کەوشەنی کۆریا دەرنەچوو بەر بە هەڵایسانی شەڕێکی گەورە لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیدا، گیردرا. شەڕی کۆریا لە مانگی ژووئیەی 1953دا چەند مانگ پاش مەرگی ستالین کۆتایی هات و هێزەکانی کۆریای باکووری و باشووری گەڕانەوە سەر سنوورەکانی پێشووی خۆیان.

شەڕی سارد پاش مەرگی ستالین لە ساڵی 1953دا کەمێکدامرکایەوە، بەڵام شەڕی سویز و شۆڕشی هەنگاریا لە ساڵی 1956دا بۆ جارێکی دیکە شەڕی دەروونیی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوای بە تەوژمتر کرد. خرۆشۆف پاش وەحەواخستنی یەکەمین مانگی دەسکرد بە دەستی بیریارانی سۆڤیەتیی ویستی بە ئۆتۆریتە و هێزەوە لە ئەمریکا نزیك بێتەوە و سەردانەکەی ئەو لە ئەمریکا لە ساڵی 1959دا، کە یەکەمین سەفەری ڕێبەرێکی سۆڤیەتیی بۆ ئەمریکا بوو لە لایەن ئەمریکییەکانەوە پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا. هەر لە ساڵی 1959دا بوو، کە فیدل کاسترۆ لە کوبا بە دەسەڵات گەیشت و ئاشکرابوونی ئینیتما و رووگە کۆمۆنیستییەکەی ئەو ئەمریکییەکانی تۆقاند.

لە سەرەتای ساڵی 1960دا پێوەندییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا گەیشتە باشترین ئاستی خۆی لە پاش شەڕی جیهانیی دووەم ەوە و ئامادەکاری دەکرا بۆ کۆنفرانسێکی گرینگ لە نێوان ڕێبەرانی سۆڤیەتی و ئەمریکا و بەریتانیا و فەرنسا لە پاریس، کە بەردرانەوەی فڕۆکەیەکی سیخوڕیی ئەمریکی لە ئاسمانی سۆڤیەتی لە رۆژی یەکەمی مانگی مای 1960دا قەیرانێکی نوێی لە پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیدا ساز کرد و خرۆشۆف لەو کۆنفرانسەدا، کە دەبوو لە شازدەی ئەو مانگەدا بەڕێوە بچێ بەشداریی نەکرد. شەڕی سارد لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیدا هەتا کۆتایی حکوومەتی ئایزێنهاڤر لە ژانویەی 1961دا درێژەی کێشا و لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی سەرۆك کۆماری دوایی ئەمریکادا، کێنێدییش قەیرانی کوبای خستە سەر ئاڵۆزییەکانی پێوەندیی نێوان ئەو دوو وڵاتە.

2ـ سەردەمی خاوکردنەوەی گرژییەکان: کێنێدی لە سەرەتای سەرۆك کۆماریی خۆیدا بە بەهێزکردنی ژمارەیەك لە نەیارانی فیدل کاسترۆ و ناردنیان بۆ کوبا ویستی حکوومەتەکەی بڕووخێنێ، بەلاّم ئەو هەولّە بێ ئاکام مایەوە و فیدل کاسترۆ جارلەگەلّ جار پتر پشتی بە سۆڤیەتی بەست. لە ئۆکتۆبەری سالّی 1962دا ئەوە ئاشکرا بوو کەسۆڤیەتی گەرەکیەتی لە کوبا کۆمەلّێك بنکەی سەربازی و سەکۆی مووشەکی دامەزرێنێ و کێنێدی وێڕای ڕاگەیاندنی مەترسی و وریاییدان بە نەتەوەی ئەمریکا، ڕایگەیاند، کە هەتا کۆکردنەوەی تەواوی بنکە و مووشەکەکانی سۆڤیەتی لە کوبا ئەو ولاّتە(کوبا) گەمارۆ دەدا. بە وەڕێکەوتنی پاپۆڕە مووشەك هەلّگرە روسییەکان بەرەو کوبا جیهان کەوتە بەردەم شەڕێکی سامناکی ناوکییەوە، بەلاّم خرۆشۆف لە دوایین ساتەکاندا فەرمانی گەڕانەوەی پاپۆڕە روسییەکانی دەرکرد و ڕێککەوتنی ڕێبەرانی هەردوو ولاّت و فەرمانی کۆکردنەوەی چەکوچۆلّ و مووشەکە روسییەکان لە کوبا، بە سەرەتای چاخی خاوکردنەوەی گرژییەکان یا "Détente" لە قەلّەم دەدرێ.

کێنێدی لە سالّی 1963دا کوژرا و خرۆشۆفیش لە سالّی 1964دا لە سەر کار لابردرا، بەلاّم جێنشینەکانیان جانسۆن و بێرژنێڤ لە سەر سیاسەتی خاوکردنەوەی گرژییەکان ڕۆیشتن. لە ماوەی سالاّنی حکوومەتی جانسۆندا ئەمریکا وەها بەدەست شەڕی ڤیتنامەوە پێوە ببوو و سۆڤیەتییش بە هۆی سەرهەلّدانی ناتەبایی و ناکۆکی لەگەلّ چیندا نەیدەتوانی لە بەرامبەر ئەمریکادا ڕۆلّێکی بەرچاو بگێڕێ. لە سالّی 1968دا، کە شەڕی ڤیتنام گەیشتە لووتکە سۆڤیەتییش لە چیکۆسلۆڤاکیا تووشی چەرمەسەری بوو و دواجار بە دەستێوەردانی سەربازیی لەو ولاّتەدا ئەو حکوومەتەی رووخاند، کە لەوانەبوو ئالّقەکانی پێوەندیی خۆی لەگەلّ سۆڤیەتیدا بپسێنێ. دۆکترینی بێرژنێڤ، کە بۆ پاساوی دەستێوەردانی سۆڤیەتی لە چیکۆسلۆڤاکیا خرایە روو لە سەر ئەو بنەمایە دامەزرابوو، کە " دەولّەتی سۆڤیەتیی ئیزن نادا دەسکەوتەکانی سۆسیالیزم لە ولاّتێکی سۆسیالیستیدا بکەوێتە مەترسییەوە". ئەمریکا و دەولّەتە خۆرئاواییەکان بە تەواوی هاتوهەلّلایەکی، کە بۆ مەحکوومکردنی دەستێوەردانی سۆڤیەتی لە چیکۆسلۆڤاکیادا وەڕێیان خست بە کردەوە هیچیان نەکرد و لە ڕاستیدا دۆکترینی بێرژنێڤیان لە سەر مافی دەستێوەردانی سۆڤیەتی بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندەکانی خۆی لە ولاّتانی کۆمۆنیستدا بە ڕەوا زانی.

لە سالّی 1968دا نیکسۆن بە سەرۆك کۆماریی ئەمریکا هەلّبژێردرا و لەگەلّ ئەوەدا، کە بەر لەوەی ببێتە سەرۆك کۆمار وەك سیاسەتوانێکی دژە کۆمۆنیزم ناسرابوو هەولّیدا لە گەلّ سۆڤیەتی

ڕێککەوێ و کێشەکان چارەسەر بکا و لە ئاستێکی بەربلاوتردا سیاسەتی پێشینیانی خۆی لـە سـەر خاوکردنەوەی گرژییەکان درێژەدا. سەرکەوتنی ڤیلی برانـت لـە هەڵبژاردنـەکانی ئۆکتۆبـەری سـاڵی 1969 ی ئەڵمانی خۆرئاواییدا و سیاسەتی مەیلەو خۆرهەلاتیی ئەو، کە لـە دیسـێمبەری سـاڵی 1970دا مۆرکردنی گرێبەستی ئەڵمانیا و پۆلۆنیای لێکەوتەوە هەنگاوێکی دیکە بوو لـە پێنـاوی نەهێشتنی ئەو گرژییانەدا. برێك پاش مۆرکردنی ئەو گرێبەسـتە کۆمـەڵێك ئـاڵۆزی لـە پۆلۆنیـادا هاتنە ئاراوە، کە لە سەر کار لابرانی گۆمولکا و هاتنە سـەرکاری "گیرێـك" ی لێکەوتـەوە، بـەلام ئەمریکا نەیویست کەڵکی سیاسی و پرۆپاگەندەیی لەم ڕووداوانە وەربگرێ .

لە ساڵی 1971دا نیکسۆن بە ناردنی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتـەوەیی و وەزیـری دەرەوەی خۆی کیسنجەر بۆ پەکەن و نزیکی لەگـەڵ چین، دەسـتی مۆسـکۆی لـە گـۆزەدا هێشـتەوە و سۆڤیەتی بۆ بەرپەرچدانەوەی دیپلۆماسـیی نـوێی ئـەمریکا پـەیمانێکی دۆسـتایەتیی لەگـەڵ هیندوستاندا مۆر کـرد. لـە ئۆکتۆبـەری سـاڵی 1971دا چـینی کۆمۆنیسـت بـە ئەنـدامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگیرا و چوار مانگ دواتر نیکسـۆن بـە فـەرمی سـەردانی چینی کرد و پێوەندیی دیپلۆماتیك لە نێوان چین و ئەمریکادا دامەزرا. نیکسـۆن سـێ مـانگ پاش سەفەر بۆ پەکەن لە مانگی مـای 1972دا سـەردانی مۆسـکۆی کـرد و لـە یەکـەمین سەفەری ڕێبەرێکی ئەمریکیدا بۆ سۆڤیەتی گرێبەستی سنووردارکردنی چەکە ستراتژییەکان، کە بە "سالت_یەك" بەناوبانگە لە نێوان ڕێبەرانی دوو ولاتدا مۆر کرا.

کۆتایی شەڕی ڤیتنام لە ژانوییەی 1973دا هەنگاوێکی گرینگی دیکە بـوو لـە پێنـاوی خاوکردنەوە و نەهێشتنی گرژییەکانی نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوادا، و سـەفەری بێـرژنێڤ بـۆ ئەمریکا هەر لە ژووئەنی ئەو ساڵەدا چەندین گرێبەسـت و ڕێککەوتننامـەی وەك گرێبەسـتی پێشگرتن بە شەڕی ناوکیی نێوان ئەمریکاو سۆڤیەتیی لێکەوتـەوە، کـە بـە خـاڵی لووتکـەی قۆناغی نەهێشتنی گرژییەکان لەقەڵەم دەدرێ. پاش مۆرکردنی ئەو گرێبەستانە ئەو قەیرانەی، کـە بـە دوای ئاشـکرابوونی هـەوڵ و کۆششـە چەواشـەییەکانی نیکسـۆندا لـە جەنگـەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی 1972 ئـەمریکا سـەری هـەڵدا بـوو سیاسـەتی دەرەوەی ئـەمریکای ئیفلیج کرد و نیکسۆن پاش مشتومڕێکی دوور ودرێژ لەگەڵ کـۆنگرە و بەرپرسـانی مـاف لـە ئەمریکا ڕۆژی هەشتەمی ئوتی ساڵی 1974 دەستی لە سەرۆك کۆماری کێشایەوە.

جیرالدفۆرد سەرۆك کۆماری نوێی ئـەمریکا بـە دانـانی کیسـنجەر بـۆ پۆسـتی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمریکا سیاسەتی نیکسۆنی بۆ نزیك بوونەوە و ڕێککەوتن لەگەڵ سـۆڤیەتیدا درێـژە

پێدا و لە نۆڤەمبەری ساڵی 1974دا بۆ چاوپێکەوتن و دانوستان لەگەڵ بێرژنێڤ چووە بەندەری ڤیلادیۆستك لە خۆرهەڵاتی سیبریا.

لەو چاوپێککەوتنەدا رێککەوتننامەیەکی نوێ بۆ سنووردارکردنی چەکە ستراتژییەکان بە ناوی سالت ـ 2 مۆر کرا.

گیرانی کۆنفرانسی هاوکاری و تەناهیی ئەورووپا، کە رۆژی 30 ی ژووئیەی 1975 بە بەشداریی رێبەرانی 33 وڵاتی ئەورووپی و ئەمریکا و کانادا لە هێلسینکی پایتەختی فەنلاند، بە خاڵێکی دیکەی بە لووتکە گەیشتنی سیاسەتی نەهێشتنی گرژییەکان لەقەڵەم دەدرێ. ئەم کۆنفرانسە بۆ سۆڤیەتی سەرکەوتنێکی سیاسیی گەورە بوو، چونکی سنوورەکانی پاش شەڕی ئەورووپا واتە سنوورەکانی پۆلۆنیا و سنوورەکانی نێوان هەر دوو ئەڵمانیای چەسپاند و هەر چەشنە هەوڵێکی توند و تیژانەی بۆ گۆڕینی ئەو سنوورە دیاریکراوانە قەدەغە کرد. راگەیەندراوی هێلسینکی پێشنیاری لەبەرچاو گرتنی بڕگە و پرەنسیپەکانی جاڕنامەی مافی مرۆڤ و ئازادیی گۆڕینەوە و راگواستنی زانیاری لە نێوان وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی و خۆرئاواییدا دەکرد، بەڵام ئەو پێشنیار و راسپاردانە گەرەنتییەکی جێبەجێکردنیان لە پشت نەبوو.

لە ساڵی 1975دا، کە دەکرێ ناوی قۆناغی سەرلێشێواویی ئەمریکای بە دوای رووداوی واتێرگیت و لێکەوتنی نیکسۆندا لێ بنێین سۆڤیەت دەسەڵاتی خۆی لە سێ وڵاتی ئاسیایی دیکەو لە ئەفریقادا بە هێزتر کرد. لە وڵاتی ئەفریقایی موزامبیکدا، کە لە ژووئەنی 1975دا سەربەخۆیی وەرگرت حکوومەتێکی مارکسیستی هاتە سەر کار و لە مانگی ئوتی 1975دا کۆمۆنیستەکان لە لائۆس بەدەسەڵات گەیشتن و دواجار هەر لە نۆڤەمبەری ئەو ساڵەدا پاش راگەیاندنی سەربەخۆیی وڵاتی ئەفریقایی ئانگۆلا هێزە چەپگەراکان بە یارمەتیی سەربازانی کوبایی، کە بە دڵخواز نێردرابوونە ئەو وڵاتە هێزە راستگەراکانیان بەرەو ناوچە لێڕەوارەکان راونان و پایتەختیان گرت.

لە نۆڤەمبەری ساڵی 1976دا کارتەر بوو بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا و قۆناغی چوار ساڵەی سەرۆك کۆماریی ئەو، کە لە ژانویەی 1977 ـەوە دەستی پێکرد سەردەمی کارەسات و چەرمەسەریی گەورە بۆ ئەمریکا و جیهان بوو. کارتەر بە هەڵڵا و هەنگەمەیەکی زۆر لە سەر مافی مرۆڤ و بەو نامەیەی، کە لە یەکەمین رۆژەکانی سەرۆك کۆماریی خۆیدا بۆ کەسایەتیی ناودار و نارازیی سۆڤیەتی، ساخارۆڤی نارد، قەیرانێکی نوێی لە پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتیدا ساز کرد. ئەو قەیرانە هەتا ساڵی 1978 درێژەی کێشا هەتا ئەوەی کە دیسان

کۆمەڵە دانوستانێك بۆ جێبەجێکردنی رێککەوتننامەی بێرژنێڤ و فۆرد لە سەر واژۆکردنی گرێبەستی نوێی سنووردارکردنەوەی چەکە ستراتژییەکانی نێوان دوو وڵاتدا دەستی پێکردەوە و لە ژووئەنی ساڵی 1979دا دیمانەی بێرژنێڤ و کارتەر لە ڤیەنناو مۆرکردنی گرێبەستی "سالت ـ2" ی لێکەوتەوە. دەکرێ مۆرکرانی ئەو گرێبەستە بە دوایین قۆناغی نەهێشتنی گرژییەکان ناوبەرین، چونکی بەر لە پەسند کرانی لە کۆنگرەی ئەمریکادا، هێزەکانی سۆڤیەتی چوونە نێو ئەفغانستانەوە و کارتەر بە وەرگرتنەوەی گرێبەستی سالت ـ2 لە کۆنگرە و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی فرۆشتنی گەنم بە سۆڤیەتی و بایکۆتی یارییەکانی ئۆلەمپیکی 1980 ی مۆسکۆ قۆناغێکی نوێی شەڕی ساردی دەست پێکرد. لە سێ ساڵی دوایی قۆناغی نەهێشتنی گرژییەکاندا، کە هاوکات بوو لەگەڵ سەرۆك کۆماریی کارتەر دەوڵەتی سۆڤیەتی بەسەر شەش وڵاتی ئاسیایی و ئەفریقایی و ئەمریکای لاتیندا گرت. لە فێبریوەری 1977دا ئیتیۆپی بە کۆدەتایەکی کۆمۆنیستی کەوتە گەڵ لایەنگرانی سۆڤیەتی. لە ئاریلی 1977 کۆدەتایەکی کۆمۆنیستی لە ئەفغانستاندا کرا، کە داگیر کرانی ئەفغانستان لە دیسێمبەری 1979دا لە راستیدا بە مەبەستی پاراستنی دەسکەوتەکانی کۆدەتای ساڵی 1978 و پێشگرتن لە چەواشەبوونی بە لای راستدا بوو. لە ژووئەنی 1978دا حکوومەتێکی لایەنگری سۆڤیەتی لە یەمەنی باشووری، جڵەوی دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت. لە ژانویەی 1979دا کامبۆجیا کەوتە دەست هێزەکانی ڤێتنام و لە راستیدا کەوتە سەر پێگەڕی سۆڤیەتی. لە مارسی 1979 حکوومەتێکی چەپی لە دوورگەی گرانادای هەڵکەوتوو لە دەریای کاراییبدا هاتە سەر کارو هەروەها هەر لە ژووئیەی ئەو ساڵەدا دەوڵەتی لایەنگری خۆرئاوای نیکاراگۆیە، بە شوێن راپەڕینێکی چەکدارانەدا، کە لە لایەن کوباوە پشتیوانی دەکرا رووخێنرا و حکوومەتێکی لایەنگری سۆڤیەتی جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت.

3 ـ دووەمین قۆناغی شەڕی سارد: قۆناغی دووەم ی شەڕی سارد لە کۆتایی ساڵی 1979 وە دەستی پێکرد و هەتا دووەمین خولی سەرۆك کۆماریی رەیگان و سەرەتای حکوومەتی گورباچۆڤ لەساڵی 1985دا درێژەی کێشا و لەوێ کۆتاییدا. پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتی لە تەواوی ساڵانی 1980دا لەوپەڕی گرژی و ئاڵۆزیدا بوو و جەنگی دەروونی و پروپاگەندەیی نێوان هەر دوو وڵات وەبیر هێنەرەوەی خراپترین و رەشترین ساڵانی قۆناغی شەڕی سارد بوو. پاش شکستی کارتەر لە هەڵبژاردنەکانی نۆڤەمبەری 1980ی ئەمریکا و هەڵبژاردنی رەیگاندا بۆ سەرۆك کۆماریی ئەو وڵاتە قەیرانی پێوەندییەکانی نێوان

ئەمریکا و سۆڤیەتی هەردانەمرکایەوە، چونکی رەیگان، کە خۆی یەکێك بوو لە دوژمنە تۆخەکانی کۆمۆنیزم هەوڵی دەدا شکستەکانی کارتەر لە بەرامبەر سیاسەتەکانی سۆڤیەتیدا قەرەبوو بکاتەوە و وەزیری دەرەوەی ئەو واتە ژەنەراڵ "ئالکساندر هیگ" یش، کە پێشتر فەرماندەریی هێزەکانی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری "ناتۆ"ی لە ئەستۆ بوو سیاسەتێکی توند و تیژ و نەگونجاوی لە بەرامبەر سۆڤیەتیدا گرتبووە بەر. زیادکردنی بێوێنەی گوژمە و بودجەی سەربازیی ئەمریکا و گەلاڵەی دانانی پشتێندێکی بەرگریی دژە مووشەکی بە دەوری ئەمریکادا (کە بە شەڕی ئەستێرەکان) ناوی دەرکرد و هەروەها دامەزراندنی مووشەکە ناوکییەکانی ئەمریکا لە ئەورووپادا لە ساڵانی کۆتایی حکوومەتی بێرژنێڤ و قۆناغی کورتی جێنشینەکانی ئەو(ئاندرۆپۆف و چرێنێنکۆ)دا قەیرانەکانی نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتی قووڵترکردنەوە و لە تەواوی ئەو ماوەیەدا بوارێك بۆ چاوپێکەوتن و دانوستان لە نێوان رێبەرانی ئەمریکا و سۆڤیەتیدا نەرەخسا. ئەمریکییەکان لەداماویی سۆڤیەتی لە پۆلۆنیادا کەساڵی 1980 دامەزرانی حکوومەتێکی سەربازیی لێکەوتەوە ئەوپەڕی کەڵکی پروپاگەندەییان دژی ئەو وڵاتە لێوەرگرت و سۆڤیەتیش لە بەرامبەردا لە کێشە و گرفتەکانی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناڤین و ئێراندا کەڵك و سوودی خۆی وەرگرت.

یەکێك لە هۆکارەکانیداکشانی پێوەندییەکانی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا لەو ساڵانەدا ناسەقامگیریی رەوشی سۆڤیەتی و بێ مەیلیی خۆرئاوا بوو بۆ دانوستان لەگەڵ سەرکردەگەلێك، کە زۆر لە مانەوە و بەردەوامییان دڵنیا نەبوون. بێرژنێڤ لە دوایین ساڵانی حکوومەتەکەیدا نەخۆش و زۆربەی کات هەر دیار نەبوو و جارنە جارێك هەواڵی مەرگی وی لە نێوخۆ و دەرەوەی وڵاتدا بڵاو دەبۆوە. پاش مەرگی بێرژنێڤ لە مانگی نۆڤەمبەری 1982 شدا، ئاندرۆپۆفی جێنشینی هێشتا باش جێ نەکەوتبوو، کە بە جاوبان کەوت و نیوەی حکوومەتە چواردەمانگەکەی کەس نەی دی. چرێنێنکۆ، کە پاش مەرگی ئاندرۆپۆف لە فێبرییەی ساڵی 1984دا ببووە سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی هەر لە سەر تاوە نەخۆش بوو و هەڵبژێرانی ئەو بۆ جێنشینیی ئاندرۆپۆف بە رێگەچارەیەکی کاتی بۆ دیاریکردنی مەسەلەی رێبەریی داهاتووی سۆڤیەتی لە قەڵەم دەدرا.

بە هەڵبژاردنی گەنجترین ئەندامی دەفتەری سیاسی بۆ جێنشینیی چرێنێنکۆ لە مانگی مارسی 1985دا ئیتر گومانێك نەما لەودا، کە سۆڤیەتی پێی ناوەتە قۆناغێکی نوێوە. رێبەری نوێی سۆڤیەتی گورباچۆڤ لە یەکەمین مانگەکانی دەسەڵاتدارێتیی خۆیدا وێڕای

ئۆتوریتە نواندنێك لە نێوخۆی وڵاتدا، لە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەتییشدا جووڵە و بزووتنێكی نوێی وەڕێخست و بە پێشكەشكردنی چەند وتارووتووێژێك لە گەڵ بڵاڤۆكە خۆرئاواییەكان و هەروەها سەفەر بۆ فەرەنساو دیمانە لەگەڵ رەیگان لە یەكەمین ساڵی رێبەریی خۆیدا كۆتایی بە دووەمین قۆناغی شەڕی سارد هێنا.

# 3

لە كۆمەڵە بەرهەمەكانی لینینی بنیاتنەری حكوومەتی سۆڤیەتیدا دەخوێنینەوە كە:" ئیمپریالیزم بە هیچ شێوەیەك و لە هیچ هەلومەرجێكدا ناتوانێ لە تەنیشت یەكێتیی سۆڤیەتییەوە بێت... كێشەو هەڵایسانی شەڕ لە نێوان ئەو دوانەدا مسۆگەرە... مەسەلەی گرینگی مێژوویی ئێمە وەڕێخستنی شۆڕشێكی جیهانی و گواستنەوەی ئەو شۆڕشەیە لە كەوشەنی تەنگ و بەرتەسكی نیشتیمانییەوە بۆ سەرانسەری جیهان....".

، بەڵام گورباچۆڤ رێبەری تازەی سۆڤیەتی رۆژی بیستەمی فێبریەی 1986 لە پشت تریبوونی بیست و حەوتەمین كۆنگرەی حیزبی كۆمۆنیستی سۆڤیەتییەوە بە زمانێكی دیكە قسەی كرد. زیاتر لە چوار لە پێنجی ئاخافتنی پێنج كاتژمێر و نیویی گورباچۆڤ لەو كۆنگرەیەدا بۆ مەسەلە و پرسی نێوخۆیی سۆڤیەتی و شیكردنەوەی كەمایەسی و كەموكورتییەكان و پێویستبوونی بەربەرەكانێ لەگەڵ گەندەڵی تەرخانی كرابوو و لە كاتژمێرێك قسەكردنیدا لە سەر پرسی پێوەندیدار بە سیاسەتی درەوەی سۆڤیەتی تەنیا جارێك ئاماژەی بە بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەكانی جیهان كرد و رێبەری سۆڤیەتی بە راشكاوی وتی " هاندان و بەهێزكردنی شۆڕش و راپەڕینەكانی وڵاتانی دیكە كارێكی ناڕەوا و پووچ و پاساو هەڵنەگرە".

گورباچۆڤ لە مانگی ژووئیەی 1987 یشدا لە ئاخافتنێكدا لە كرنگرەیەكی جیهانیدا بۆ ئاشتی وتی "هەر نەتەوەیەك كۆمەڵێك بەرژەوەندیی تایبەت بە خۆی هەیە و ئێمە دەبێ‌دان بەو راستییەدا بنێین. نكوڵیكردن لەو راستییە بە مانای نكوڵیكردنە لە ئازادیی نەتەوەكان لە دیاریكردنی چارەنووسی خۆیاندا".

ئەو گۆڕانە 180 دەرەجەیە لە سیاسەتی مۆسكۆدا هەر لە سەرەتای حكوومەتی سۆڤیەتییەوە هەتا ئێستا چۆن لێك دەدرێتەوە؟ ئاخۆ گورباچۆڤ وەك سكرتێری گشتیی حیزبی

کۆمۆنیست بەرهەمەکانی لینینی نەخوێندبوونەوە؟ ئاخۆ ئەو باوەڕی بەو شتانە هەبوو، کە گوتنی؟ ئاخۆ وەکی سیاسەتوانانی ڕەشبین و بێ متمانەی خۆرئاوایی "زاین بەرگەر" وەزیری بەرگریی پێشووی ئەمریکا وتوویانە ئەوە گۆڕانێکی تاکتیکی لە سیاسەتی سۆڤیەتیدا بووە و دەوڵەتی سۆڤیەتی ستراتژیی گشتیی خۆی، کە زاڵبوونە بەسەر هەموو جیهاندا نەگۆڕیبوو؟!

دەکرێ بەو شێوەیە ئەنگیزەکانی ئەو سیاسەت گۆڕینەی سۆڤیەتی یا وەك ڕەشبینەکان دەڵێن گۆڕینی تاکتیکەی سۆڤیەتی لێك بدەینەوە: دەوڵەتی سۆڤیەتی بۆ شکاندنی ئەو بنبەست و گەمارۆ ئابووریەی تێیکەوتبوو پێویستیی بە قۆناغێکی هێمنی لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا هەبوو. لەوانەیە گورباچۆڤ ڕاستگۆیانە ویستبێتی بەشێك لە گوژمەی سەربازیی خۆی بۆ کاروباری دیکە یا بەرهەمهێنانی کاڵای مەسرەفی تەرخان بکا، بەڵام لە هەمان کاتدا دەیویست لەوە دڵنیا بێ، کە کەمکردنەوەی گوژمەی سەربازیی سۆڤیەتی باڵانسی هێزی هەر دوو زلهێزەکە بە زیانی سۆڤیەتی تێك نادا. بەو پێیە ئەگەر باوەڕ بە ڕاستگۆیی ڕێبەرانی سۆڤیەتی بکەین لەو پێشنیارانەدا، کە دواییهێنان بە کێبڕکێی خۆپڕ چەککردن و کۆکردنەوەی مووشەکە ناوکییەکان دەیان خستنە ڕوو، ئامانج و مەبەست لەو پێشنیارانە ناچارکردنی ئەمریکا و خۆرئاوا بوو بۆ کەمکردنەوەی گوژمە سەربازییەکانیان لە بەرامبەر کەمکردنەوەی گوژمەی سەربازیی سۆڤیەتیدا، کە مەبەست و هانەی سەرەکی لەو کارە چارەسەریی کێشە ئابوورییەکانی سۆڤیەتی بوو.

هاوکات لەگەڵ گۆڕانی سیاسەتی سۆڤیەتی لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی خۆرئاواییدا، دەوڵەتی سۆڤیەتی شێوازێکی نوێی لەگەڵ هاوپەیمانەکانی خۆی لە ڕێکخراوی پەیمانی وەرشۆ و وڵاتانی دیکەی بلۆکی کۆمۆنیستیدا گرتە پێش و وردە وردە قورسایی قەول و بەڵێنەکانی لە بەرامبەر ئەو وڵاتانەدا لە سەر خۆی سووککردن. سیاسەتی نوێی سۆڤیەتی لە بەرامبەر وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی و وڵاتە کۆمۆنیستەکانی دیکەدا وەکو گۆڕینی سیاسەتی ئەو وڵاتە لە بەرامبەر خۆرئاوادا زیاتر لایەن و مەبەستی ئابووریی هەبوو و دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتە کۆمۆنیستەکانی دیکەدا هەر تووشی زەرەر دەبوو دەیویست وردە وردە قورسایی ئەو وادە وبەڵێنانە لە ئەستۆی خۆی داڕنێ، کە دەربەست بوو نەوت و گاز بە نرخی هەرزان بە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی بدا یا یارمەتیی بێ بەرامبەر بە وڵاتانی وەك کوبا و ڤیتنام بکا.

گورباچۆڤ بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە نوییە سەرەتا هەوڵیدا پرۆسترۆیکا و سیاسەتی کەشی کراوەی سیاسیی خۆی بگەیەنێتە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەلاتی و ئامادەکاری کرد بۆ

کۆمەڵێك گۆڕانکاری لە ڕێبەریی سیاسی و سیاسەتە ئابوورییەکانی ئەو وڵاتانەدا. گورباچۆڤ بەو ڕادەیەی، کە لە پێگەی سیاسیی خۆی لە نێو سۆڤیەتیدا دڵنیا بوو ئەوەندەش هیوادار بوو بە سەرکەوتنی ئەو سیاسەتە لە وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتیدا و پێی وابوو، کە ڕێبەرانی ئەو وڵاتانە دەتوانن بە نەرمو نیانکردنەوەی شێوازە توند ڕەق وتەقەکانی ڕابردوو و ئینتما بەرەو ئابووریی ئازاد کێشەکانیان چارەسەر بکەن و پێویستییەکیان بە سۆڤیەتی نەبێ، بەڵام هەروەکی ئەزموونی ڕابردووی ئەو وڵاتانەی، کە لە قۆناغی تێپەڕین لە دیکتاتۆریی بەرەو دیموکراسیدان (تەنانەت لە ئاستێکی بەرتەسکیشدا) دەریٚ خستووە، وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی لە سۆڤیەتییش زیاتر لە قۆناغیدا تووشی بشێوی و ئاڵۆزی بوون و سیستەمە زاڵەکان بەسەر ئەو وڵاتەدا، کە لە نێو خەڵکدا هیچ پێگەیەکیان نەبوو یەك لە دوای یەك هەرەسیان هێنا.

هەنگاریا یەکەمین وڵاتی ئەورووپای خۆرهەڵاتی بوو، کە پێشوازیی لە سیاسەتی کراوەی کەشی سیاسیی گورباچۆڤ گرت و پەرلمانی ئەو وڵاتە لە ژانوییەی 1989دا چالاکیی تەواوی دەستەو گرووپ و حیزبە سیاسییەکانی لە هەنگاریادا ئازاد ڕاگەیاند. دەوڵەتی پۆلۆنیاش لە مانگی ئاپریلی 1989دا چالاکیی گرووپی سیاسییەکان و یەك لەوان ڕێکخراوی یەکگرتوویی و یەکێتییە کرێکارییە سەربەخۆکانی ئازاد ڕاگەیاند و لە یەکەمین هەڵبژاردنە ئازادەکانی ئەو وڵاتە لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی کۆمۆنیستەکاندا، کە ڕۆژی چوارەمی ژووئەنی 1989 بەڕێوە چوو ڕێکخراویی یەکگرتوو بە زۆرینەی دەنگ سەرکەوت.

لە مانگی ئووتی 1989دا بۆ یەکەمین جار لە ئەورووپای خۆرهەڵاتی و لە پۆلۆنیادا حکوومەتێك دامەزرا، کە کۆمۆنیست نەبوو، بەڵام مازۆڤیسکی سەرۆك وەزیری پۆلۆنیا، کە یەکێك بوو لە ڕێبەرانی ڕێکخراوی یەکگرتوو، چەند پۆستی گرینگی کابینەکەی خۆی بە کۆمۆنیستەکان سپارد بۆ ئەوەی پێش بە ئەگەری دژکردەوەی سۆڤیەتی لە بەرامبەر ئەو گۆڕانەدا بگرێ . لە هەنگاریا بە دوای ئازادبوونی چالاکیی حیزبە سیاسییەکاندا "کادار" ڕێبەری کۆمۆنیستی ئەو وڵاتە پاش 33 ساڵ حکوومەت بەسەر هەنگاریادا لە سەر کار لابرا و کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست هەوڵی ئابڕووکڕینەوەی "ناگی" سەرۆك وەزیرانی هەنگاریای ساڵی 1965 ی دا، کە بە دوای دەستێوەردانی سەربازیی سۆڤیەتی لە سەر کار لابرابوو و ئیعدام کرابوو. دەوڵەتی هەنگاریا لە سپتامبری 1989دا گرێبەستی بیست ساڵەی خۆی لەگەڵ ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی، کە بە پێی ئەو گرێبەستە هاووڵاتیانی ئەڵمانی خۆرهەڵاتی بۆیان

نەبوو لە ڕێگەی هەنگاریاوە بچنە وڵاتانی خۆرئاوایی، هەڵپەسارد و 57000 کەسی خەڵکی ئەڵمانیای خۆراهەڵاتی، کە وەك گەشتیار چووبوونە نەمسا بوونە پەنابەری ئەڵمانیای خۆرئاوایی.

گۆڕانەکانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی 1989دا خێراتر بوو: ڕۆژی حەوتەمی ئۆکتۆبەر حیزبی کۆمۆنیستی هەنگاریا ناوی خۆی کردە حیزبی سۆسیالیست، لە ڕۆژەکانی حەوتەم و هەشتەمی ئۆکتۆبەردا بارودۆخی ئەڵمانیای خۆرهەڵاتی تەواو شڵەژا و شێوا و لە شارەکانی بەرلینی خۆرهەڵاتی و لایپزیك و درسدێن کۆمەڵێك خۆپێشاندانی بەربڵاو دژی ڕێبەرانی کۆمۆنیست وەڕێکەوتن. ڕۆژی هەژدەی ئۆکتۆبەر هۆنکەر ڕێبەری بە بڕشتی کۆمۆنسیتی ئەڵمانیای خۆرهەڵات پاش هەژدە ساڵ دەسەڵاتداریێتیی بەسەر ئەو وڵاتەدا لە سەر کار لابردرا و بە تۆمەتی گەندەڵی کەڵکی خراپ وەرگرتن لە سامانی دەوڵەتی لێپێچینەوەی لێکرا. ڕۆژی بیست و سێی ئۆکتۆبەر دەوڵەتی هەنگاریا ناوی ئەو وڵاتەی لە "کۆماری دیموکراتیکی گەل" ـەوە، کە ناوی فەرمیی ڕژێمە کۆمۆنیستییە کردە هەنگاریا و هێمای کۆمۆنیستی لە ئاڵای سێ ڕەنگی نەتەوەیی ئەو وڵاتە سڕایەوە. ڕۆژی بیست و پێنجەمی ئۆکتۆبەر گورباچۆڤ لە کۆنفرانسی تەناهی و هاوکاریی ئەورووپادا لە هیلسینکی ڕایگەیاند، کە دۆکترینی بێرژنێڤ مردووە و بەو شێوەیە ترسی هەر چەشنە دەستێوەردانێکی سۆڤیەتی بۆ پێشگرتن لە بەرەوپێش چوونی ڕەوتی ئازادی لە ئەورووپای خۆرهەڵاتیدا ڕەوییەوە.

لە دوو مانگی کۆتایی ساڵی 1989دا هاوکات لەگەڵ گۆڕانی خێرای پۆلۆنیا و هەگاریا و ئەڵمانیای خۆرهەڵات بەرەو دیموکراسی، چیکۆسلۆڤاکیاش بوو بە گۆڕەپانی خۆپێشاندانێکی بەربڵاو، کە دەست لەکار کێشانەوەی گوستاڤ هۆزاك سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتەی پاش بیست و یەك ساڵ دەسەڵاتداریێتی بەسەر چیکۆسلۆڤاکیادا لێکەوتەوە. جێنشینی هۆزاك لە پۆستی سەرۆك کۆماریدا ڤاسلاڤ هاڤێلی شانۆنامەنووس و خەباتگێڕی تۆخی دژە کۆمۆنیزم بوو، کە لە مانگەکانی نۆڤەمبەر و دیسێمبەردا ڕێبەرایەتیی خۆپێشاندان و ڕاپەڕینە دژە کۆمۆنیستییەکانی دەکرد. لە جەنگەی ئەو گۆڕانانەدا دۆبچێك ڕێبەری پێشووی چیکۆسلۆڤاکیاش، کە ساڵی 1968 دوا دەستدرێژیی هێزەکانی پەیمانی وەرشۆ بۆ سەر خاکی چیکۆسلۆڤاکیا لە سەر کار لابردرا و دوور خرابۆوە، هاتەوە مەیدان و سەرۆکایەتیی پەرلمانی ئەو وڵاتەی وە ئەستۆ گرت.

بەر لە کۆتایی ساڵی 1989 دوو ڕژێمی کۆمۆنیستیی دیکە لە ئەورووپای خۆرهەڵاتیش، کە بەر لەوانی دیکە لە بەرامبەر شەپۆلی گۆڕانەکان لە جیهانی کۆمۆنیزمدا ڕاوەستابوون و دژایەتییان دەکرد گۆڕانیان بەسەر داهات. لە بولغارستان "ئیۆدۆر ژیکۆف"، کە یەکێك بوو لە

کۆنترین ڕێبەرانی کۆمۆنیستی ئەورووپای خۆرهەڵات لە سەر کار لابردرا و جێنشینەکانی ناوی حیزبی کۆمۆنسیتی بولغارستانیان کردە حیزبی سۆسیالیست و ئازادیی چالاکیی حیزب و گرووپەسیاسییەکانی دیکەیان ڕاگەیاند، بەڵام نیکۆلا چائۆشسکۆ دیکتاتۆری ڕۆمانی، کە پاش 22 ساڵ حکوومەت بەسەر ئەو وڵاتەدا لە هەمووان پتر دژی شەپۆلی گۆڕانەکان ڕادەوەستا دواجار بە ڕاپەڕینێکی خوێناوی تەختی دەسەڵاتی لێ وەرگەڕا و لە شەوی کریسمەسی 1989دا لەگەڵ هاوسەرەکەی لە دادگایەکی شۆڕشدا دادگایی کران و تیرەباران کران.

گۆڕانەکانی وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی لە ساڵی 1990 یشدا بە هێورییەکی زیاترەوە درێژەی کێشا و پێکهاتەی دەسەڵاتی ئەو وڵاتانە وردە وردە و بە هێمنی گۆڕان. گرینگترین و قووڵترین گۆڕان لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتدا کرا. پاش یەکەمین هەڵبژاردنە ئازادەکان لەو وڵاتەدا، کە بووە هۆی شکست و لە دەسەڵات کەوتنی حیزبی کۆمۆنیست، پەرلمانی نوێی ئەڵمانیای خۆرهەڵات بە زۆرینەی دەنگ دەنگی بە یەککرتنەوە لەگەڵ ئەڵمانیای خۆرئاوادا و دەوڵەتی سۆڤیەتیش بە بێ بەرەنگاربوونەوەیەکی ئەوتۆ ملی بۆ ئەم بڕیارە ڕاکێشا. گورباچۆڤ لە سەرەتادا پێداگربوو لە سەر ئەوەی کە ئەڵمانیای خۆرئاوایی بەر لە وەدی هاتنی یەککرتنەوەی هەر دوو ئەڵمانیا لە پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری "ناتۆ" بچێتە دەراو ئەڵمانیای یەکگرتوو بێ لایەنیی خۆی ڕاگەیەنێ، بەڵام بە سووربوونی و پێداگریی ئەڵمانیای خۆرئاوایی لە سەر درێژەی ئەندامەتیی ئەو وڵاتە لە ناتۆدا دەستی لە بەربەرەکانێ هەڵگرت و ئەڵمانیای یەکگرتوو بوو بە ئەندامی ناتۆ.

لە یەکەمین هەڵبژاردنە ئازادەکانی پەرلمان لە چیکۆسلۆڤاکیا و هەنگاریاشدا کۆمۆنیستەکان لە بەرامبەر حیزبە ناسیۆنالیستەکاندا شکستیان خوارد و لە هەر دوو وڵاتدا دەوڵەتی ناکۆمۆنیست دامەزران. لە پۆلۆنیاش ژەنەراڵ یارۆزێلسکی سەرۆك کۆماری کۆمۆنیستی ئەو وڵاتە دەستی لە پۆستەکەی خۆی کێشایەوە و مازۆڤیسکی یەکەمین سەرۆك وەزیری ناکۆمۆنیستی ئەورووپای خۆرهەڵاتی وەزیرە کۆمۆنیستەکانی لە کابینەکەی خۆی دەرکردن.

# بەشی سێزدەهەم

## هەرەسهێنان

ڕێبەریی یەکێتیی سۆڤیەتی هەر وەکی لە بەشی پێشوودا باسی کرا، لە کۆتایی دەیەی 1980دا جڵەوی وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی، کە پێشتر سەر بە سۆڤیەتی بوون لەدەست دەرچوون، بەڵام یەکێتیی سۆڤیەتی لە سەرەتای ساڵی 1990دا هەر وا لە سەر پێی خۆی بوو. ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە لایەن سێ کۆماریی بالتیك (لیتوانی و ستۆنی و لیتۆنی) یەوە یەکەمین کەلێنێك بوو، کە لە یەکێتییە پازدە کۆمارییەکەی سۆڤیەتی لە مارسی 1990دا دەرکەوت. هەر وەکی لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێ کرد یاسای بنەڕەتیی یەکێتیی سۆڤیەتی هەموو کۆمارییەکانی سۆڤیەتیی سەربەست کردبوو لەوەدا، کە هەرکات حەزیان لێ بوو سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیەنن، مافێك، کە بە کۆنترۆڵی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بەسەر ناوەندەکانی بەڕێوەبەریی و یاسا دانانی هەر کام لە کۆمارییەکاندا، هیچ کات کەڵکی لێ وەرنەگیردرا، بەڵام بە دەسپێکردنی هەرەسی ئیمپراتۆریی سۆڤیەتی لە ساڵانی کۆتایی دەیەی 1980دا هەستی نەتەوەخوازی لە کۆمارییەکانی بالتیکدا، کە بە زۆرەملی و بە پێچەوانەی ویستی خۆیان دوای شەڕی دووەم ی جیهانی خرابوونە سەر یەکێتیی سۆڤیەتی، بووژایەوە و پەرەی گرت و لە مانگی مارسی 1990دا پەرلمانەکانی هەر سێك کۆمارەکە دەنگیان بە سەربەخۆیی خۆیاندا.

یەکێتیی سۆڤیەتی پاش جیابوونەوەی ئەو سێ کۆمارە گچکەیەی لێوار دەریای بالتیکیش دەیتوانی لە سەر پێ ڕاوەستێ، بەڵام کەلێنی گەورە لە بنەمای یەکێتیی سۆڤیەتیدا، کە هەرەسیهێنانی وی لێکەوتەوە لە گۆڕانەکانی گەورەترین کۆماریی ئەو یەکێتییە واتە ڕوسیاوە

دەستی پێکرد و یەکێك لە هاوڕێیان و هەڤاڵانی هەڵبژاردەی پێشووی گورباچۆڤ واتە بوریس یەلتسین دەستپێکەروورەڕێخەری ئەو بزووتنەوەیە بوو.

بەر لە باسکردن لەو رووداوگەلەی، کە بوونە هۆی هەرەسهێنانی سۆڤیەتی، کورتە باسێك لە بوریس یەلتسین، کە بە فاکتەری سەرەکیی هەرەسهێنانی سۆڤیەتی دەژمێردرێ پێویستە. بوریس یەلتسین ساڵی 1931 لە بنەماڵەیەکی هەژار لە شاری سڤێردلۆڤسك لە ناوچەی ئۆرال دا لە دایك بوو. باوکی کابرایەکی کرێکار بوو و شەش ئەندامی بنەماڵەکەیان لە ئاپارتمانێکی بچووکی یەك ژوور دا دەنووستن. یەلتسین لە تەمەنی یازدە ساڵیدا بە هۆی تەقینەوەی نارنجۆکێك، کە لە یەکێك لە عەمبارێکی دزی بوو دوو قامکی دەستیی پەڕین. پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی چووە هونەرستانی تەکنیکیی(قوتابخانەی تەکنیکی) سڤێردلۆڤسك و پاش وەرگرتنی دیپلۆمی ئەندازیاری چووە گەڵ حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی. سەرکەوتنی ئەو لە حیزبی کۆمۆنیستدا هێور و بە لە سەر ەخۆییەوە بوو، چونکی زۆر حەزی لە کاروباری حیزبی نەبوو و لە راستیدا باوەڕێکی پتەوی بە کۆمۆنیزم نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆتایی دەیەی 1970دا و لە سەردەمی حکوومەتی بێرژنێڤدا بۆ سکرتێری گشتیی سڤێردلۆڤسك هەڵبژێردرا و هەتا هاتنەسەرکاری گورباچۆڤ لە ساڵی 1985دا ئەو پۆستەی پاراست.

یەلتسین لە یەکەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا، کە لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی گورباچۆڤدا گیردرا، وتارێکی پڕ کەفوکوڵی بۆ لایەنگریی لە پرۆسترۆیکا و بەرنامە ریفۆرمییەکانی گورباچۆڤ پێشکەش کرد و گورباچۆڤ، کە بە تەمای کۆمەڵە گۆڕانێك لە ئاستی باڵای رێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستدا بوو پۆستی سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیستی مۆسکۆی پێدا، کە لە رێکخراوی حیزبی کۆمۆنیستدا پۆستێکی گرینگ و هەستیار بوو. یەلتسین لەو پۆستەدا لێوەشاوەیی و پێداگرییەکی زۆری نواند و بە سەردانی فرۆشگەکان و سواربوونی سەیارەی گشتیی هاتوچۆ و پێڕاگەیشتن بە سکاڵای خەڵکی ناوبانگ و خۆشەویستییەکی زۆری لە نێو خەڵکی مۆسکۆدا بەدەست هێنا. یەلتسین بە پشتیوانیی گورباچۆڤ بۆ ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیست، کە بەرزترین پۆستی حیزبی لە سۆڤیەتیدا بوو هەڵبژێردرا و کەوتە بەربەرەکانێ لەگەڵ مۆرە کۆن و کۆنەپارێزەکانی حیزب. توندرەویی ئەو لەو بەربەرەکانییەدا بووە هۆی دژکردەوەی کۆنەرێبەرانی حیزب، کە هێشتا خاوەنی دسەڵاتێکی بەهێز بوون و گورباچۆڤ لە کۆتایی ساڵی 1987دا ئەندامەتیی دەفتەری سیاسیی حیزب و رێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنسیتی مۆسکۆی لێ ئەستاندەوە.

یەلتسین لە بیۆگرافییەکەی خۆیدا بانگەشەی ئەوە دەکا، کە هۆکاری لە سەر کار لابرانی ئەو زیاتر لەبەر ئەوە بوو، کە گورباچۆڤ لە خۆشەویستتربوونی ئەو لە نێو خەڵکیدا ترسی رێ نیشتبوو و ئەوی بە خەنیمی خۆی دەزانی. یەلتسین هەروەها دەنووسێ: رەخنەکانی من لە هێوریی و لە سەر ەخۆیی پرۆسترۆیکا و پێداگریم لە سەر خێرایی بەڕێوەچوونی، نەك هەر بۆ کۆنەپارێزانی حیزبی بەڵکۆ بە دڵی خودی گۆرباچۆڤیش نەبوو.

یەلتسین لە ساڵی 1988دا بە کردەوە گۆڕەپانی سیاسەتی سۆڤیەتیی بە جێهێشت، بەڵام لە ساڵی 1989دا بە کەڵك وەرگرتن لەو کەشە کراوە سیاسییەی، کە لە سۆڤیەتیدا پێکهاتبوو هاتەوە نێو گۆڕەپانی سیاسەت و بە رەخنەی توند لە کردەوەی حیزب و دەوڵەت لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی 1989ی سۆڤیەتیدا، کە لە مێژووی ئەو وڵاتەدا یەکەمین هەڵبژاردنی ئازاد بوون بە دەنگی زیاتر لە پێنج ملیۆن کەسی مۆسکۆ بۆ نوێنەرایەتیی کۆنگرەی گەل هەڵبژێردرا. بە پەسندبوونی پێشنیارەکەی یەلتسین بۆ هەڵبژێرانی راستەوخۆی سەرۆك کۆماری فدراسیۆنی روسیا لە لایەن خەڵکەوە، بۆریس یەلتسین لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریی روسیا لە مانگی ئوتی 1990دا بە زۆرینەی دەنگ بۆ سەرۆك کۆماری فدراسیۆنی روسیا هەڵبژێردرا و دوای دوو مانگ بە دەست کێشانەوە لە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، بە فەرمی لە بەرامبەر گورباچۆڤ و حیزبی کۆمۆنیستدا راوەستا. یەلتسین دواتر وەك سەرۆك کۆماری روسیا چووە ئەمریکا و وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوایی و بە نووسینی کتێبێك لە مەڕ سەربردە و ژیان و باوەڕەکانی خۆی، کە لە ژمارەیەکی بەرچاودا بە زمانگەلی فەڕەنسی و بریتانی بڵاو بۆوە پێگەی نێودەوڵەتیی خۆی پتەوتر کرد.

## 2

لە سەرەتای ساڵی 1991دا حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە کردەوە جڵەوی دەسەڵات و کاروباری فدراسیۆنی روسیا، یا "کۆماری دایك" یەکێتیی سۆڤیەتیی لەدەست دەرچووبوو و یەلتسین لە بەڕێوەبردنی کاروباری روسیادا نەدەچووە ژێر فەرمانی گورباچۆڤ، کە بێجگە لەوەی سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیست بوو پۆستی سەرۆك کۆماریی سۆڤیەتییشی بەدەستەوە بوو. لەگەڵ ئەوەشدا پێکهاتەی یەکێتیی سۆڤیەتی هەروا لە سەر پێی خۆی بوو و دەسەڵات و

هێزی سوپا بەهێزەکەی سۆڤیەتی، کە هێشتا لە ژێر فەرمانی ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنسیتدا بوو، بە سەرەکیترین فاکتەری یەکگرتووی سۆڤیەتی لەقەڵەم دەدرا. ڕێبەرایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی سەربەخۆیی و جوێ بوونەوەی کۆمارییەکانی لێواری دەریای بالتیکیشی، سەرەڕای ئەوەی کە لە لایەن کۆمەڵگەی جیهانییەوە بە فەرمی ناسرابوون بە فەرمی نەناسیبوون و بە هەبوونی لەشکری سوور لەو ولاٌتانەدا سەربەخۆیی ئەوان هیچ مانایەکی نەبوو.

لە ئاپریلی ساڵی 1991دا ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی گورجستان و دەستپێکردنی بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازەکان لە کۆمارییەکانی دیکەی سۆڤیەتیی پێشوو لە قەفقاز و ئاسیای نێوەڕاستدا، ڕێبەرانی سیاسی و سەربازیی سۆڤیەتی ئەوەندەی دیکە لە ڕەوتی گۆڕانەکانی ولاٌتەکەیان نێگەران بوون. کۆنە ڕێبەرانی حیزب و فەرماندەرانی لەشکری سوور، کە سیاسەتەکانی گورباچۆڤ و دژکردەوەی لاواز و شێوازە پاسیڤەکەی ئەویان لە بەرامبەر زێدەڕۆییەکانی یەلتسیندا بە فاکتەری سەرەکیی گەشەکردن و پەرەگرتنی بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازییەکان لە کۆمارییەکانی دیکەی سۆڤیەتیدا دەزانی، دواجار بڕیاریان دا گورباچۆڤ لە سەر کار لابەرن و بە بەڕێوەبردنی سیاسەتی "مستی ئاسنین" پێش بە درێژەکێشانی ئەو بزووتنەوانە بگرن، کە دەبوونە هۆی هەرەسهێنان و لێکبلاٌوبوونی سۆڤیەتی، بەلاٌم هەڵەشەیی و کاڵ وکرچیی ئەو گرووپەی ئەم بزووتنەوەیەیان ڕێکخستبوو و لەوەش گرینگتر بێ بەرنامەیی و نەبوونی توانا و هێز لە بەرەوروو بوونەوە لەگەڵ ڕووداوگەلێك، کە چاوەڕوانکراو بوون بووە هۆی شکستی ئەو بزووتنەوەیەو خێرایی بەخشین بە لێکهەڵوەشانەوەی سۆڤیەتی. ئەو گۆڕانە سەرسووڕ هێنەرانەی، کە دوو ڕۆژی نەخایاند بوونە هۆی لێکهەڵوەشانەوە و هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤیەتی لە بەرەبەیانیی ڕۆژی نۆزدەی ئوتی 1991 ـەوە دەستیان پێکرد. لە یەکەم ساتەکانی بەرەبەیانیی ئەو ڕۆژەدا هەواڵگرییەکانی دەرەوە لە مۆسکۆ وە ڕایانگەیاند، کە گورباچۆڤ دەستی لە پۆستی سەرۆك کۆماریی سۆڤیەتی کێشاوەتەوە و ئەنجوومەنێکی سەرکردایەتی یا "کۆمیتەیەکی نائاسایی" بە سەرۆکایەتیی جێگری سەرۆك کۆمار"یانایۆڤ" جڵەوی کاروباری ولاٌتی گرتۆتە دەست. سەبارەت بە هۆکاری دەست لە کار کێشانەوەی گورباچۆڤ گوتیان، نەخۆشە و ناتوانا وەك سەرۆك کۆمارێك ئەرك و بەرپرسیارەتییەکانی خۆی بەجێ بگەیەنێ. لە حاڵێکدا هەتا پێش ئەوە، هیچ هەواڵێك سەبارەت بە نەخۆشینی گورباچۆڤ

بڵاو نەبێوە و گورباچۆڤ چەند رۆژ پێش لەوە بەو پەڕی لەش ساخییەوە لەگەڵ خێزانەکەی بۆ پشوودان چووبووە لێوارەکانی کرێمە لە دەریای رەش.

لە کۆمیتەی نایاساییدا، کە لە جێگەی سەرۆك کۆمار جڵەوی کاروباری وڵاتی بەدەستەوە گرتبوو، جگە لە یانابۆڤ جێگری سەرۆك کۆمار، کە بە رواڵەت سەرۆکی ئەو کۆمیتەیە بوو، مارشال یازۆڤ وەزیری بەرگری کریۆچکۆڤ سەرۆکی رێکخراوی کا.گا.ب یا پۆلیسی تەناهیی سۆڤیەتی و بوریس پۆکۆ وەزیری ناوخۆش ئەندامی بوون. پێکهاتەی کۆمیتەکە وای دەنواند، کە دەیەوێ لە هەڵمەتێکی سەربازی حیزبیدا حکوومەت بگرێتە دەست خۆی و بێدەنگیی سەرکردایەتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی لە بەرامبەر ئەو هەڵمەتەدا و پشتیوانیی بە لاوەی رۆژنامەی ئۆرگانی حیزب "پراڤیدا" ش لێی دەرێ دەخست، کە کۆمیتەی رێبەریی حیزب لانیکەم باڵێکی بە هێزی حیزبی پشتیوانێتی.

کۆمیتەی رێبەریی نوێ، بە راگەیاندنێکی رەوشی نایاسایی لە سەرانسەری وڵاتدا و داخستنی بڵاڤۆکگەلی ناحیزبی و راگرتنی چالاکیی گرووپە ئازادەکان و بە گشتی هەڵوەشاندنەوەی هەمووی ئەو ئازادییانەی لە سەردەمی رێبەریی گورباچۆڤدا بە خەڵکی سۆڤیەتی درابوون، کاروبارەکانی خۆی دەست پێکرد، بەڵام خەڵکی سۆڤیەتی پاش سەرسووڕماوی لە بەرامبەر ئەو گۆڕانە کتوپڕ و لە نەکاوانەدا، راوەستان. یەکەمین کەسێك، کە ئەو بزووتنەوە نوییەی وەکو کۆدەتایەك مەحکووم کرد و لە سەر کار لابرانی گورباچۆڤی بە نایاسایی زانی، بوریس یەلتسینی سەرۆك کۆماری فدراسیۆنی روسیا و خەنیمی تۆخی گورباچۆڤ بوو. یەلتسین گوتی، کە پاش راگەیاندنی دەست لە کار کێشانەوەی گورباچۆڤ هەولێداوە پێوەندیی لەگەڵ بگرێ ، بەڵام سەرنەکەوتووە پێوەندییەکەی بگرێ و دەست لە کار کێشانەوەکەی بە شتێکی ساختەیی دەزانێ. یەلتسین داوای لە هێزە سەربازییەکان و رێکخراوەکانی تری سۆڤیەتی کرد، کە وەڵامی بڕیارەکانی کۆمیتەی نایاسایی نەدەنەوە و داوای لە خەڵکیش کرد بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو پیلانەی، کە بۆ سڕینەوەی ئازادییەکانیاندارێژراوە بێنە نێو شەقامەکانەوە. هەزاران کەسی خەڵکی مۆسکۆ بە دەم بانگەوازەکەی یەلتسینەوە بەرەو بینای پەرلمانی فدراسیۆنی روسیا، کە یەلتسین و ئەندامانی دەوڵەت و نوێنەرانی پەرلمانی روسیای تێدا کۆببوونەوە جمین و گەمارۆیاندا. هێزەکانی گوێ بە فەرمانی کۆمیتەی کۆدەتا، کە راسپێرابوون دەسبەسەر بینای پەرلمانی روسیادا بگرن و یەلتسینیش قۆڵبەست بکەن لە بەرامبەر ئەو حەشیمەتەی، کە دەوری بیناکەیان گرتبوو ناچار بوون بووەستن. فەرماندەرانی ئەو هێزانە خۆیان لەوە بوارد، کە فەرمانی تەقەکردن لە خەڵك دەرکەن و دەستەیەکیان رەگەڵ خەڵکەکە کەوتن.

نیشـانەکانی شکسـتی کودیتـا، لـە 24 کاتـژمێر دواتـرەوە دەرکـەوت و سەرپێچـی و خۆپێشاندان دژی کۆمیتەی کودیتا لە مۆسـکۆوە تـەواوی شـارەگەورەکانی دیکـەی روسـیا و کۆمارییە جۆراوجۆرەکـانی سـۆڤیەتیی تەنییـەوە. لـە رۆژی دووشـەممەوە 19ی ئـووت هـەتا چوارشەممە 21ی ئووت، کە پیلانی کودیتا تەواو پووچەڵ بۆوە هەشت کۆماری لە کۆی پـازدە کۆمارییەکە سەربەخۆییان راگەیاند و بە دەست لە کار کێشـانەوەی مارشـال یـازۆف وەزیـری بەرگریی سۆڤیەتی لە ئەندامەتیی کۆمیتەی کۆدەتا و سەرپێچیی ئەفسەرەکانی کا.گـا.ب لـە بەڕێوەبردنی فەرمان و بڕیارەکانی بەرپرسەکانیان رێبـەرانی کۆدەتـا ئـیتر لـە کـۆنترۆلکردن و بەدەستەوە گـرتنی دەسـەلآت هیـوابڕاو بـوون. رۆژی چوارشـەممە 21 ی ئـووت وەڤـدێك لـە مۆسکۆوە بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ گورباچۆڤ چووە کرێمە و گورباچۆڤ رۆژی پێنج شەممە گەڕایەوە مۆسکۆ. گورباچۆڤ لە دیمانەیەکی تەلەڤزیۆنیدا گوتی، کە سەرەڕای هەڕەشەکانی بەڕێوەبـەرانی کۆدەتا ملی بۆ دەست لە کار کێشانەوە رانەکێشاوە و لە ماوەی ئەو سێ رۆژەدا، کە بە کردەوە دەسبەسەر بووە پێوەندیی تەلەفۆنیی ئەویان لەگەڵ دەرەوەدا بە تەواوی بڕیوە.

# 3

بەر لـەوەی بچـینە سـەر ئاکـام و دەرەنجامـەکانی کۆدەتاکـەی 19ی ئـووتی 1991 ی سـۆڤیەتی پێویسـتە بـە کـورتی باسـی هۆکارەکـانی شکسـتی ئـەو کۆدەتایـە بکـەین. لـە لێکدانـەوەکانی بلآڤـۆك و هەواڵگرییـەکانی جیهانـدا، بەربـەرەکانێی خـەڵکی سـۆڤیەتی لـە بەرامبەر کۆدەتادا و دژایەتیی بیر و رای گشتیی جیهان لەگەڵ کۆدەتاچییەکان و بـە تایبـەتی راگەیاندنی ئەوە لە لایەن ئەمریکا و چەند دەوڵەتی خۆرئاوایی دیکەوە، کە حکوومەتی کۆدەتا بە فەرمی ناناسن و بەرنامەی یارمەتییە ئابوورییەکانیان بە سـۆڤیەتی رادەگـرن، بـە گشـتی ئەوانەیان بە هۆکارە سەرەکییەکانی شکستی کۆدەتا ناو بردووە، بەڵام دەکرێ ئەو هۆکارانە بـە فاکتەرە پلە دووەم ەکانی شکستی کۆدەتاکـە بـزانین. هۆکـاری سـەرەکیی کۆدەتاکـە بـە رای نووسەر ئەوەیە، کە ئەو کۆدەتایە هەر لە سەرەتاوە نیوەچڵ و مەحکووم بە تێکشکان بوو. ئەو لێکۆڵینە وانەی، کە پاش گیرانی ئەندامانی کۆمیتەی کۆدەتا و ئەوانەی دیکەی، کە دەسـتیان لە پیلانەدا هەبووە, دەرێ دەخا، کە داڕێژەری سەرەکیی پیلانەکە ڤیلادمیر کریۆچکۆڤ سەرۆکی

ڕێکخراوی کا.گا.ب بووە و ئەو گەڵاڵەیەی پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی مارشال یازۆڤ وەزیری بەرگری و دڵنیایی لە پشتیوانیی سوپا و لۆکیانۆڤ سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵا یا پەرلمانی سۆڤیەتی و یانایۆڤ جێگری سەرۆك کۆمار پاڤلۆڤ سەرۆکی وەزیران پۆگۆ وەزیری نێوخۆ و بسمەرتنیخ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتییش خستە بواری جێبەجێکردنەوە و هاوکاریی ئەو گرووپەی بۆ بەڕێوەبردنی گەڵاڵەکەی خۆی بە بەس زانی، چونکی باڵێکی بە هێزیش لە ڕێبەرانی حیزبی کۆمۆنیست و بەرپرسانی دەوڵەتیی سۆڤیەتییش بە لایەنگریی ئەو گرووپە پشتیوانیی‌یان لە کۆدەتا دەکرد. گەڵاڵەی کۆدەتاکە بە پەلەپەل و بە بێ ئامادەکاری و کاردروستایی پێویست و بە کەڵك وەرگرتن لە بۆشایی نەبوونی گورباچۆڤ لە مۆسکۆدا خرایە بواری جێبەجێکردنەوە و کۆدەتاچییەکان گوێیان بە دژکردەوەی ناوەندی سەرەکیی بەرگریکردن لە بەردەم بزووتنەوەکەیاندا نەدا. دژایەتیی یەلتسین سەرۆك کۆماری فدراسیۆنی روسیا لە بەرامبەر بزاوتێکدا، کە پێشەکییەك بوو بۆ گەڕانەوە بۆ سەردەمی دیکتاتۆریی رابردوو، شێلگیرانە و پێداگرانە دیار بوو و ئەگەر کۆدەتاچییەکان هاوکات لەگەڵ هەڵمەتەکەی خۆیاندا یەلتسین و دژبەرەکانی دیکەی خۆیانیان لە سەر ڕێگە لابردبایە و پەرلمانی روسیایان داخستبایە شانسێکی زیاتریان بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات دەبوو. هۆکاری دیکەی شکستی کۆدەتا نەبوونی ڕێبەرییەکی لێبڕاو و پێداگر و هەبوونی دڕدۆنگی و گومانی کەسانێك بوو، کە خۆیان دەستیان لەگەل ئەو پیلانەدا بوو. لۆکیانۆڤ سەرۆکی پەرلمانی سۆڤیەتی پاڤلۆڤ سەرۆکی وەزیران و بسمەرتنیخ وەزیری دەرەوە وێڕای هاوکاری لەگەڵ کۆدەتاچییەکان ئامادە نەبوون ببنە ئەندامی کۆمیتەی نائاسایی و یازۆڤ وەزیری بەرگریی سۆڤیەتی، کە یەکێك لە ئەندامانی ئەم کۆمیتەیە بوو ئامادە نەبوو، کە بۆ سەرکوتی دژبەرانی کۆدەتاکە کەڵك لە هێزی سوپا وەرگرێ . کریۆچکۆڤ داڕێژەری سەرەکیی کۆدەتاکە ناچار هانای بۆ هێزەکانی ژێر فەرمانی خۆی لە کا.گا.ب دا برد، بەڵام ژەنەراڵ و جێگرەکانی ئەو، کە هیچ هیوایەکان بە سەرکەوتنی خۆیان لە بەرامبەر خەڵکدا نەبوو بە قسەیان نەکرد و فەرمانیان بەڕێوە نەبرد.

هەڵبەت ئەگەر کۆدەتاکەش سەری گرتبایە ئەستەم بوو حکوومەتی کۆدەتا خۆ لەبەر ئەو بەربەرەکانێ بەربڵاوەی دژبەرەکانی رابگرێ ، کە لە نێو خۆ و دەرەوەڕا لەگەڵی بەرەوڕوو بوو. وایدانێین بەڕێوبەرانی کۆدەتا توانیبایان هێزە سەربازییەکان بە تەواوی رەگەڵ خۆیان بخەن بۆ پتەوکردنی پێگەی خۆیان ناچار بوون بە توندی راپەڕینی خەڵکی کۆمارییەکانی سۆڤیەتی سەرکوت بکەن و بە توند و تیژییەوە بەرەوڕووی ببنەوە، کە دژ کردەوەی سرووشتی لە

بەرامبەریدا ئەوە دەبوو، کە هەموو جۆرە یارمەتییەکی ئابووری و ناردنی خواردەمەنی بۆسۆڤیەتی لە درەوەڕا رادەگیرا. گوشاری ئابووری دەرنگ یا زوو حکوومەتی کۆدەتای دەڕووخاند و هەر چەشنە گێچەڵێکی سەربازییش بۆ کەمکردنەوەی ئەم گوشارە جیا لە شکست و لێکترازانی سۆڤیەتی بە تەواوی بەرهەمێکی دیکەی لێ نەدەکەوتەوە.

# 4

گورباچۆڤ بە پێگەیەکی لاوازتر لە جارانەوە گەڕایەوە مۆسکۆ و شەپۆلی سەربەخۆیی خوازی لە کۆمارییەکانی سۆڤیەتییشدا بە تێکشکانی کۆدەتا هەر بەرەو پێش چوو. بوریس یەلتسین سەرۆك کۆماری روسیا، کە رۆڵی سەرەکیی لە پووچەڵکردنەوەی کۆدەتاکەدا گێڕابوو بەهێزتر بوو و گورباچۆڤ کەوتە ژێر رکێفییەوە. گورباچۆڤ ناچار بوو تەواوی ئەندامانی دەوڵەتی سۆڤیەتیی، کە خۆیان لە دژایەتیکردنی کۆدەتا بواردبوو لە ئەندامەتی بخات و بۆ دیاریکردنی بەرپرسانی نوێ بە تایبەتی وەزیری بەرگری و بەرپرسانی سەربازیی نوێ و سەرۆکی تازەی رێکخراوی کا.گا.ب لە پێشدا رەزامەندیی یەلتسین وەرگرێ . ئەڵام گرینگترین بڕیاری ئەو، کە لە ژێر گوشاری یەلتسیندا ملی بۆ راکێشا دەست کێشانەوە بوو لە سکرتێریی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و هەڵپەیاردنی تەواوی چالاکییەکانی ئەو حیزبە. یەلتسین بەر لە راگەیاندنی دەست لە کار کێشانەوەی گورباچۆڤ لە سکرتێریی گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە کەڵك وەگرتن لە دەسەڵاتی خۆی لە سەرۆك کۆماریدا، چالاکیی حیزبی کۆمۆنیستی لە رێکخراوە دەوڵەتییەکاندا قەدەغە کرد و بینا و ناوەندەکانی حیزبی داخستن و رۆژنامەی پراڤیدای ئۆرگانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی و چەند رۆژنامەی حیزبیی دیکەشی داخست بوو. یەلتسین، کە رێبەرانی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی بە فەرمی بەوە تاوانبار کرد، کە بەشداریی کۆدەتایان کردووە و هەوڵیان داوە دیسان دیکتاتۆری لە سۆڤیەتیدا دامەزرێننەوە دیار بوو بە مەرجێك بەڵێنی هاوکاریی بە گورباچۆڤدا بوو، کە ئەو وێڕای دەست هەڵگرتن لە سکرتێریی گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بە فەرمی هەڵوەشاندنەوەی ئەو حیزبە راگەیەنێ. گورباچۆڤ رۆژی 24 ی ئوت وازی لە سکرتێرایەتی هێنا و داوای لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی کرد، کە بە داننان بەوەدا، کە لە بەرامبەر

کۆدەتادا کەمتەر خەمی‌یان نواندووە هەڵوەشانەوەی خۆی ڕاگەیەنێ. گورباچۆڤ هەروەها گوتیشی، کە حیزبە کۆمۆنیستەکانی هەرکام لە کۆمارییەکانی سۆڤیەتی دەتوانن لە سەر چارەنووسی خۆیان بڕیاری خۆیان بدەن.

لەگەڵ ئەوەدا، کە گورباچۆڤ خۆی لەوە بوارد، کە هەڵوەشاندنەوەی حیزبی کۆمۆنیست ڕاگەیەنێ بڕیاری ئەوەی دایە دەستی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، یەلتسین بە کردەوە لە سەرانسەری ڕوسیادا چالاکییەکانی ئەو حیزبەی بە هەڵپەسێردراو ڕاگەیاند و بە دەست گرتن بەسەر بینا و داراییەکانی حیزب لە بانکەکاندا پێشی بە چالاکبوونەوەی ئۆرگانە حیزبییەکان گرت.

ڕێکخستنەکانی حیزبی کۆمۆیست لە کۆمارییەکانی دیکەشدا لێك هەڵوەشانەوە، بەڵام ڕێبەرانی هێندێ لە کۆمارییەکان، کە خۆیان سکرتێری گشتیی حیزبیش بوون پاراستنی ئۆرگانە حیزبییەکانیان بۆ مانەوەی خۆیان بە پێویست زانی و هەڵیان نەوەشاندنەوە.

حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی، کە پاش شۆڕشی بۆلشەڤیکیی 1917 جێگەی ڕێکخراوی پێشووی حیزبی بۆلشەڤیکیی گرتەوە هەتا ساڵی1990 زیاتر لە پازدە ملیۆن ئەندامی هەبوو و ڕێکوپێکی و بەربڵاویی ئۆرگانەکانی ئەو حیزبە لە پازدە کۆمارییەکەی سۆڤیەتیدا یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی یەکگرتوویی و یەکڕیزیی یەکێتیی سۆڤیەتی بوو. هێز و دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندی لە وڵاتێکی پان و بەرینی وەك سۆڤیەتیدا، هەتا پێش ئەو گۆڕانانەی دوایی، لەو حیزبەوەی سەرچاوە دەگرت، چونکی تەواوی بەرپرسانی دەوڵەتی لە هەرکام لە کۆمارییەکاندا لە لایەن حیزبی کۆمۆنیستەوە دیاری دەکران و پێملی برپرسانی حیزبی بوون. بە هەڵپەساردنی چالاکییەکانی ڕێکخراوی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی ئەو تاقمەش لە حیزبە کۆمۆنیستەکانی کۆمارییەکانی دیکەش، کە مابوونەوە ئیتر لە بن دەستی ئۆرگانێکی ڕێبەریی دیاریکراودا نەبوون و زۆربەی ئەندامانی حیزبیش، کە مابوونەوە نەك لە بەر ئایدۆلۆژیاو کۆمەڵە ئارمانجێك، کە ئیتر مانای خۆیان لەدەستدا بوو بەڵکو بۆ پاراستنی پێگەو بەرژەوەندییەکانیان لە حیزبدا مانەوە.

گورباچۆڤ و یەلتسین لە نێوەڕاستی خەرمانانی 1991دا لە دیمانەیەکی تەلەڤزیۆنیی هاوبەشدا بە ئاشکرادانیان بە شکستی ئەزموونی حەفتا ساڵەی کۆمۆنیزم لە سۆڤیەتیدا هێنا. گورباچۆڤ لەو وتووێژە تەلەڤزیۆنییەدا گوتی:" من دەتوانم ڕاشکاوانە بڵێم، کە ئەزموونی کۆمۆنیزم لە وڵاتی ئێمەدا تووشی شکان و شکست هاتووە و ئەوەش نەك هەر بۆ خەڵکەکەی ئێمە بەڵکو بۆ هەموو گەلان دەبێتە دەرسێك". یەلتسین لەو وتووێژەدا بە لەبزێکی توندتر

قسەی کرد و زیاتر لە حەفتا ساڵ حکوومەتی کۆمۆنیستیی لە روسیا و باقی کۆمارییەکانی دیکەی سۆڤیەتیدا بە تراژێدیایەك بۆ نەتەوەی روس و باقی گەلانی بن دەستی کۆمۆنیزم ناو برد. یەلتسین، کە خۆی هەتا کۆتاییەکانی دەیەی 1980 یەکێك بووە لە ئەندامانی باڵای حیزبی کۆمۆنیست و گەیشتە بەرزترین پۆستی حیزبی بۆ پاکانەی ئەندامەتی و چالاکییەکانی خۆی لە حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیدا وتی:"دیارە ئارمانجی کۆمۆنیستی ئارمانجگەلێکی جوانن، بەڵام خۆزگە ئەو ئارمانجە جوانانە لە پێشدا لە وڵاتێکی گچکەدا بە تاقی کرابانەوە بۆ ئەوەی روون ببایەتەوە، کە چەندە خەیاڵی و ناکردەنین..."

گورباچۆڤ و یەلتسین لەو وتووێژەدا لە سەر پێوەندییەکانی خۆیان و هەروەها ئەوەی کە چۆناوچۆن پاش ئەو ناکۆکییە قووڵەی، کە پێکەوە هەیانبووە ئامادە بوونە هاوکاریی یەکتری بکەن قسەیان کرد. هەر دووکیاندانیان بەوەدا نا، کە بەر لەم رووداوانە پێکەوە زۆر ناکۆك بوون، بەڵام ئێستا لە دڵەوە هاوکاریی یەکتریی دەکەن. گورباچۆڤ نەزیلەیەکی روسیی هێناوە و گوتی:" ئەو پردە زۆری ئاو بە بندا رۆیوە و هەموو شتێکی تێکداوە". و یەلتسین بە ئاماژە بەو بابەتە کەگورباچۆڤ پاش ئەو کۆدەتا ناتەواوەی پێشوو زۆر گۆڕاوە. " گوتی، کە هەردووکیان لە پاراستنی یەکێتیی کۆمارییەکانی سۆڤیەتیدا لە چوارچێوەی یەکێتییەکی سیاسی و ئابووریی نویدا کۆك و هاوڕان.

***

یەکێتیی سۆڤیەتی لە یەکەمین رۆژەکانی پاش شکستی پیلانی کۆدەتادا چیواى نەمابوو تەواو لێك بترازێ و بێجگە لە کۆمارییەکانی بالتیك و گورجستان، کە بەر لە کۆدەتا سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندبوو حەوت لە کۆمارییەکانی تریش سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند. راگەیاندنی سەربەخۆیی لە لایەن ئەم کۆمارییانەوە زیاتر لە لەو ترسەوە سەری هەڵدا بوو، کە بە دەسەڵات گەیشتنی یەلتسین خستبوویە نێو دڵی رێبەرانی کۆمارییەکانی دیکەی سۆڤیەتییەوە. قسەکانی یەلتسین لە سەر مەسەلەی کەمایەتییەکانی روس لە کۆمارییەکانی سۆڤیەتیدا و پێداچوونەوە بە سنوورەکانی روسیادا لەگەڵ ئەو کۆمارییانەی خوازیاری جوێ بوونەوەن لە یەکێتیی سۆڤیەتی، هەروەها پێویستبوونی راگواستنی کەرەسە و پێداویستیی چەکوچۆڵ ە ناوکییەکان لە کۆمارییەکانی دیکەوە بۆ روسیا مەترسیی بووژانەوە و سەرهەڵدانەوەی ئیمپریالیزمی لە زەینی خەڵکیدا زیندوو کردەوە. لە لایەکی دیکەوە ئەو توند

و تیژی و دوژمنایەتییەی، کـە یەلتسـین لـە خـەبات دژی حیزبـی کۆمۆنیسـتی سـۆڤیەتی و کۆمۆنیستەکانی روسیا نواندی رێبەران و ئەندامگەلی پەرلمانە کۆمارییەکانی، کە زۆربەیان لە چالاکانی حیزبی کۆمۆنیست بوونە، تۆقاند، و راگەیاندنی سـەربەخۆیی بەپەلـەی هێنـدێ لـەو کۆمارییانە زیـاتر تـەگبیر و رێگەچـارەیەکی بەرگریکارانـە بـوو بـۆ پێشـگرتن لـە ئەگـەری دەستێوەردانی یەلتسین لە کاروباری نێوخۆییان.

گورباچۆڤ بە تێگەیشتن لە بەرپرسیارەتیی خۆی لەوەی، کە زلهێزێکـی جیهـانیی کردووەتـە ولاتێکی شێواو و قەیران لێدراو، لە چوار مانگی کۆتایی سـالّی 1991دا هەولّیـدا بـوار بـۆ پێکهاتنی یەکێتییەکی تازە لە نێوان کۆمارییەکانی پێشووی سۆڤیەتیدا پێك بێنێ و یەکێتیی ولات لە شێوەی کۆمارێکی فیدرالدا بپارێزێ، بـەلام هەولّەکـەی ئـەو چـی لـێ شـین نـەبۆوە. ئاخرییەکەی دە کۆمـاری لـە پـازدە کۆمارییەکـەی پێشـوو (روسـیا، ئـۆکراین، بیلوروسـی، ئازەربایجـان، ئەرمەنسـتان، قەزاقسـتان، ئۆزبەکسـتان، تاجیکسـتان، تورکەمەنسـتان و قیرقیزستان) بە پاراستنی سەربەخۆیی خۆیان بە تەواوی یەکێتییـەکیان بـە نـاوی "کۆمەلّـەی ولاتانی سەربەخۆی هاوبەرژەوەند" پێك هێنا، کە تێیدا حکوومەتێکی ناوەندی هیچ واتایـەکی نەبوو و گورباچۆڤ لە شەوی کریسمەسی سالّی 1991دا دەستی لە سەرۆك کۆمـاریی ولاتێـك کێشایەوە، کە ئیتر هیچبوونیکی وەك واقیع نەمابوو.

# بەشی چواردەهەم

## لە یەلتسینەوە هەتا پوتین

روسیا گەورەترین کۆماریی بەرماوی یەکێتیی سۆڤیەتیی پێشوو هێشتا دەیتوانی وەك زلهێزێکی جیهانی هێشتا لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا دەیتوانی رۆڵێکی بەرچاوی هەبێ. روسیا، کە بێجگە لە بەشە ئەوروپاییەکەی خاکی بەرینی سیبریای هەتا لێوارەکانی ئۆقیانووسی ئارام بەدەستەوە بوو، هێشتا بە بەرینترین و هەراوترین وڵاتی جیهان دەژمێردرا. بەشی مەزنی هێزی سەربازیی سۆڤیەتیی پێشوو، 90 لەسەدی سەرچاوە نەوتییەکان، 75 لە سەدی سەرچاوەکانی گاز، 70 لەسەدی سەرچاوەکانی خەڵووزەبەرد، 60 لەسەدی پیشەسازیی پۆڵا و زیاتر لە 50 لەسەدی بەرووبووی کشتوکاڵی سۆڤیەتیی پێشوو بەدەست روسیاوە بوون. چەند وڵاتێکی ئەندامی تازەی "وڵاتانی سەربەخۆی هاوبەرژەوەند" ی وەکو ئۆکراین و بیلووروسی و قەزاقستان، کە بەشێك لە تەقەمەنی و چەکوچۆڵ ی سۆڤیەتیی پێشوو لە خاکی ئەواندا دامەزرێنرا بوو بەڵێنیاندا بوو، کە مووشەك و کڵاوکە ناوکییەکان لە خاکی خۆیانەوە بگەڕێننەوە بۆ روسیا و و رێبەرانی روسیا بە دەستڕاگەیشتن بە هەزاران مووشەکی وشکارۆپێو، کە کڵاوکی ناوکییان لە سەر بوو دەیانتوانی لە پێگەی دەسەڵات و بە ئۆتوریتەوە لەگەڵ ئەمریکا و وڵاتانی پیشەیی خۆرئاوا بکەونە ساتوسەودا. لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆڕوکۆمەڵە نێو دەوڵەتییەکانیشدا روسیا جێگەی سۆڤیەتیی پێشووی گرتبۆوە و ببووە یەکێك لەو پێنج وڵاتەی، کە لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکاندا خاوەنی مافی ڤیتۆ بوو.

بوریس یەلتسین سەرۆك کۆماری روسیا، بە لێوەشاوەیی و زیرەکی و رێککەوتن لەگەڵ کۆمارییەکانی پێشووی روسیا، کە لە کۆمەڵەی وڵاتانی سەربەخۆی هاوبەرژەوەندا ببوونە هاوپەیمانی روسیا، هێشتا لە رووی سیاسی و ئابوورییەوە بە روسیاوە بەستراببوونەوە و چاویان لە دەستی روسیا بوو دەیتوانی لە هاوکێشەی نێودەوڵەتیدا پێگەی روسیا وەکو زلهێزێك

بپارێزێ.بەڵام حکوومەتەکەی وی هەر لە سەرەتاوە بە بڕیـاری هەڵـەی ئـابووری و هەڵـەکردنی سیاسی و ناکۆکی و تێکهەڵچوون لەگەڵ کۆمارییەکانی پێشووی سۆڤیەتی، پێگـە و متمانـەی نێودەوڵەتیی خۆی لاواز کرد. نەمانی سیستەمی ناوەندێتیی پێشـووی حیزبـی و دەوڵـەتی بـە تایبەتی لە بواری ئابووریـدا هـەلی بـۆ کەسـانی مشـەخۆر و هەلپەرسـت خولّقانـد، کـە بـە کەڵکوەرگرتنی چەوت لە پێگەی خۆیان بە بەرتیل خۆری دەسبەسەر ئەو کارخانە و دامـەزراوە پیشەییانەدا بگرن، کە دەوڵەت داینابوون بیانفرۆشێ. باندە مافیاییەکان بە خێرایی لە روسیادا پەرەیان گرت و گەندەڵی و بەرتیلخۆری تـەواوی دامودەزگـا دەوڵەتییـەکانی تەنییـەوە. ئـەو ئالۆزییە بەرۆکی سوپای روسیاشی گرتەوە و سـوپایەکی، کـە هـەتا دوایـین سـاڵەکانی ژیـانی یـەکێتیی سـۆڤیەتی گـەورەترین هێـزی سـەبازیی جیهـان بـوو، لـە یەکـەمین سـاڵەکانی دەسەڵاتدارێتیی یەلتسیندا نیوەی توانای سەربازیی خۆی لە دەستدا بوو.

پەرلمانی روسیا، کە لە سەردەمی سۆڤیەتیی پێشوودا هەڵبژێرابوو و هێشتاش کۆمۆنیستەکان تێیدا زۆرینە بوون لە کۆتایی سـاڵی 1992دا دژایـەتیی سیاسـەتەکانی یەلتسـینی کـرد. لـە ئاپریلی 1993دا یەلتسین بۆ پووچەڵکردنەوەی بڕیارەکانی پەرلمان، بەرنامـەکانی خـۆی خسـتە ریفراندۆمەوە. زۆربەی خەڵکی روسـیا دەنگیـان بـەو بەرنامـە فریـودەر و نـاکردەنییانـەدا. لـە سەرەتای سیپتامبری ساڵی 1993 ـەوە پەرلمان دەستی کردەوە بە دژایەتیکردنی سیاسەتەمانی یەلتسین و یەلتسین بە ناوی ئەوەی کە پەرلمان دژی ویست وداخوازیی خەڵك دەجووڵێتەوە فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلمانی دەرکرد. پەرلمان گـوێی بـە فەرمانەکـەی یەلتسـین نـەدا و یـەکێك لـە دژبەرەکانی یەلتسین بە ناوی راتسکۆی کردە سەرۆك کۆمـاری روسـیا. یەلتسـینیش دیسـان لـە بەرامبەردا بڕیارەکانی پەرلمانی هەڵوەشێنراوەی بە نایاسایی ناو برد و رۆژی سێیەمی ئۆکتۆبـەری ساڵی 1993 بینای پاڵمانی روسیایان وەبەر تۆپ دا.

لە ساڵی 1994دا قەیرانێکی نـوێ بـەرۆکی یەلتسـینی گـرت. کۆمـاری خودموختـاری چێچێن لە باکووری قەفقاز سەربەخۆیی خۆی راگەیانـد و یەلتسـین، کـە لـەوە تۆقیبـوو، کـە بزووتنەوە سەربەخۆیی خوازەکـان تەشـەنە بکەنـە نێـو کۆمارییـە خودموختارەکـانی دیکـەی فدراسیۆنی روسیا ئامادە نەبوودان بـە سـەربەخۆیی چێچـێندا بنـێ. لـە دیسـێمبەری سـاڵی 1994دا هێزە سەربازییەکانی روسیا بۆ سەرکوتی سەربەخۆیی خوازانی چێچێنی وەڕێکـەوتن و لەگەڵ بەربەرەکانێی توندی هێزە سەربەخۆیی خوازەکان ی چێچێن بەرەوڕوو بوونەوە. شـەڕی نێوان هێزەکانی روسیا و سەربەخۆیی خوازانی چێچێنی دەساڵی خایاند و لاوازیی سوپای روسیا

له سەر كوتی ئەو بزووتنەوەیەدا دەرێ خست، كە بەهێزترین سوپای جیهان لە نیـوەی دووەم ی سەدەی بیستەمدا شتێكی وای لێ نەماوەتەوە، هەرەچەندە لاوازیی لەشكری سوور لـە سـالانی كۆتایی حكوومەتی بێرژنێڤ و لە شەڕی گەڵ ئەفغانستانیشدا سەلمێنرابوو.

یەلتسین سەرەڕای ئەوەی توانایی چارەسەركردنی كێشـە و گرفتـە ئابوورییـەكانی رۆسـیای نەبىوو هێشتا لە هەڵبژاردەنەكانی سەرۆككۆمـاریی سـالّی 1996 ی روسـیادا خەنیمـەكانی خۆی شكست دا و سەركەوت. هۆكـاری سـەركەوتنی یەلتسـین لـەو هەڵبژاردنانـەدا نـەبوونی خەنیمێكی بەهێز لە بەرامبەریدا و هەروەها هەڵكشان وداكشانی دەنگی دژبەران بوو. یـەكێك لە ناودێر دراوان بۆ سەرۆك كۆماریی روسیا لە بەرامبەر یەلتسیندا گورباچـۆڤ بـوو، كـە پێـی وابوو بەرپرسیارەتیی یەلتسین لە هەرەسهێنانی سۆڤیەتیداو سەركەوتوونەبوونی لە بەڕێوەبەریی ولاتدا یارمەتیدەری ئەو دەبن، كە لەو هەڵبژاردنانەدا سـەركەوێ، بـەلام گورباچـۆڤ لـە نێـوان ئەوانەدا، كە دژی یەلتسین بوون كەمترین دەنگی هێنایەوە، چونكی بـە پێچـەوانەی بۆچـوونی گورباچۆڤ، خەلكی روسیا ئەویان بە هەڵوەشێنەرەوەی سەرەكیی روسیا و بە خەتاباری شـێوانی ئەو ولاتە دەزانی. هەڵبژاردنەكانی پـەرلمانیی روسـیاش ئاكـامێكی سەیروسـەمەرەی هـەبوو. حیزبی كۆمۆنیستی نوێی روسیا زیاترین دەنگی لەو هەڵبژاردنەدا بەدەسـت هێنـا و ئەگەرچـی زۆرینـەی كورسـییەكانی پـەرلمان بـەو حیزبـە نـەبڕا سـەركەوتنی حیزبـی كۆمۆنیسـت لـە هەڵبژاردنەكاندا نیشانەیەكی ئاشكرا بوو لـەوەی، كـە زۆرینـەی خـەلكی روسـیا لـە رەوشـی هەنووكەییان ناقایلن و بە ئاواتی گەڕانەوەن بۆ سیستەمی رابردوو.

## 2

یەلتسین خولی دووەم ی سەرۆك كۆماریی خۆی بە پشتیوانیی هاوپەیمانـەكانی گرووپـەكانی لایەنگری خۆی دەست پێكرد و لە سالانی كۆتـایی دەسـەلاتدارێتیی خۆیـدا زۆر لـە یەكـەمین سـالەكانی سـەرەتایی ناسـەركەوتووتر بـوو. شـەڕی چێچـێن لـە سـالّی 1997دا بـە رێككەوتننامەیەكی زۆر ناسك كۆتایی پێهات، بەلام پاش دوو سـالّ هەڵگیرسـایەوە. قـەیرانی ئابووری لە روسیادا هەر بە بەرییەوە چـوو و رۆبلـی روسـی، كـە لـە سـەردەمی حكوومـەتی سۆڤیەتیدا لە بەرامبەر دراوی دەرەكیدا شانی دەدا لە شـانی دۆلاری ئـەمریكی ئێسـتا پێـنج

هەزاری بە دۆلارێك بوو. گرووپە مافیاییەکان ئاسایشی روسیایان خستبووە مەترسییەوە و کوشتن و جینایەت و راووڕووت پەرەیان دەگرت. گەندەڵی لە دامودەزگا دەوڵەتییەکاندا رمێنی بوو و تەنانەت بنەماڵە و خزم و کەسەکانی یەلتسینیش گومانی بەرتیل خۆری و گەندەڵی و بە تالآن بردنی سامانی گشتییان لە سەر بوو.

یەلتسین، کە تازە بە دەسەڵات گەیشتبوو لە نێو خەڵکدا زۆر خۆشەویست بوو لە ساڵانی کۆتایی حکوومەتیدا ئەو رێز و خۆشەویستییەی جارانی لە نێو خەڵکدا نەمابوو و بوو بە کابرایەکی بێ توانا و هەمیشە مەست. بێ هەڵوێستی و لاوازیی ئەو لە بەڕێوەبەریی کاروباری روسیادا لە دوو ساڵی کۆتایی دەسەڵاتدارێتییەکەیدا جار لەگەڵ جار پتر روون بۆوە. یەلتسین ساڵی 1998 بۆ ئەوەی خۆی وتەنی سیستەمی ئیداریی گەندەل و ناکارامەی روسیای راتڵەکاندبا و تەکانێکی لێدابێ سەرۆك وەزیرەکەی خۆی "چێرنۆمێردین" و تەواوی ئەندامانی کابینەکەی لە سەر کار لابردن و وەزیری پێشووی وزەی روسیا "سێرگی کیرێنکۆڤ"ی لە جێگەی ئەو دانا. یلتسین هێندەی پێنەچوو لەو کارەی، کە کردبووی پەشیمان بۆوە دیسان چێرنۆمێردینی کردەوە سەرۆکی وەزیران، بەڵام ئەمجارەیان دۆما یان پەرلمانی روسیا دژایەتیی کرد و دیپلۆماتی خاوەن پێشینە و وەزری پێشوی دەرەوە"لۆگنی پریماکۆڤ"ی کردە سەرۆکی وەزیران. قۆناغی سەرۆك وەزیریی پریماکۆڤ بە هۆی ناکۆکبوونی لەگەڵ یەلتسیندا زیاتر لە چەند مانگێکی نەخایاند و بە دەست کێشانەوەی وی لەم پۆستە یەلتسین وەزیری نێوخۆییەکەی "سێرگی ستێپاشین" ی بۆ سەرۆکی وەزیران دانا. لە مانگی ئووتی ساڵی 1999 یەلتسین لە هەوڵێکی چاوەڕواننەکراوی تردا ستێپاشینی لە سەرۆك وەزیری خست و "ڤلادیمیر پوتین"ی سەرۆکی رێکخراوی ئاسایشی روسیای، کە جێگەی رێکخراوە سامناکەکەی K.G.Bی گرتبۆوە کردە سەرۆکی وەزیران.

دوو مانگ دوای دانانی ڤلادیمیر پوتین لە پۆستی سەرۆك وەزیراندا یەلتسین، کە زیاتر نەخۆش و کەنفت بوو و رایگەیاند، کە لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکی کۆماریی روسیا لە ساڵی 2000دا ئیتر خۆی بۆ ئەو پۆستە ناپاڵێوێتەوە. رۆژی 31ی دیسێمبەری 1999و شەوی ژانوییەی ساڵی 2000 یەلتسین لە هەنگاوێکی چاوەڕواننەکراوی دیکەدا، بەر لەوەی خولی سەرۆك کۆمارییەکەی کۆتایی بێ دەستی لەو پۆستە کێشایەوە و هەتا هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماری لەمانگی مارسی 2000دا پوتینی بە نوێنەرایەتی لە جێگەی خۆی دانا. یەلتسین لە ئاخافتنی رادیۆ و تەلەڤزیۆنییەکەیدا وێڕای دەست هەڵگرتن لە سەرۆك کۆماری بە پێداگرتنەوە

له سەر لێوەشاوەیی و کارامەیی پوتین بۆ وەرگرتنی ئەم پۆستە بە ئاماژە پاڵێوراویی ئەوی بۆ هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریی ساڵی 2000 راگەیاند.

ڤلادیمیر پوتین، کە لە ماوەی حەوت مانگ سەرۆك وەزیری و جێگریی سەرۆك کۆماردا، لێوەشاوەیی و لێهاتوویی خۆی لەم پۆستەدا سەلماندبوو لە هەڵبژاردنەکانی مانگی مارسی ساڵی 2000دا بەهێنانەوەی 53٪ دەنگەکان، بە ئاسانی بەسەر خەنیمەکانی خۆیدا سەرکەوت و لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریی 2004 یشدا بۆ دووەمین جار بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێردرایەوە، بەڵام بەر لەوەی بچینە سەر رووداوەکانی سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی ئەو، کە هەتا ساڵی 2008 دەکێشێ پێویستە بە کورتی باسێکی سەربردەی وی بکەین.

ڤلادیمیر پوتین لە ساڵی 1952دا لە لینین گراد( سەنپێترێزبۆرگی ئێستا) لە دایك بووە. باوکی ئەفسەرێکی هێزی دەریایی بوو و ڤلادیمیر قۆناغی منداڵی و خوێندنی خۆی لە هەژاری و نەداریدا تێپەڕاند. ڤلادیمیر قوتابییەکی زیرەك و وشیار بوو و پاش تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی توانیی لە کێبڕکێی چوونە نێو زانکۆی لینین گراد دەرچێ و خوێندنی باڵای خۆی لە بواری مافدا تەواو بکا. لەگەڵ ئەوەشدا پوتین لە ژیاننامەکەیدا دان بەوەدادەنێ، کە هەر لە منداڵییەوە بە هۆی سەیرکردنی فیلمی سیخوڕی هۆگری ئیشی سیخوڕی و کارکردن لە دامودەزگاکانی زانیاریدا، بووە و وێڕای خوێندن لە زانکۆدا فۆرمی داواکاریی دامەزرانی لە رێکخراوی زانیاری و سیخوڕیی سۆڤیەتیی پێشوو K.G.Bدا پڕ کردبۆوە. لە دوایین ساڵی زانکۆیدا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ یەکێك لە بەرپرسانی K.G.Bدا بۆ رێکدەخرێ و پوتین پاش تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ لە ساڵی 1975دا دەبێتە کارمەندی ئەو رێکخراوە.

ڤلادیمیر پوتین ساڵی 1983 لە کاتی راسپێردراوییەکدا لەگەڵ کچێك، کە خزمەتکاری نێو فڕۆکە بووە بە ناوی لۆدمیلا ئاشنا دەبێ و زەماوەندی لەگەڵ دەکا. لە ساڵی 1986دا پوتین بەرپرسیارەتیی خزمەتکردن لە ئەڵمانیای خۆرهەڵاتیی پێ دەسپێردرا و پێنج ساڵی کۆتایی خزمەتەکانی خۆی لە K.G.Bدا لەو وڵاتەدا دەباتە سەر. پوتین زۆر وەك رۆژانێکی تاڵ باسی مانگەکانی کۆتایی بەرپرسیارەتییەکەی لە ئەڵمانیادا دەکا، کە هاوکات بوو لەگەڵ رووخانی شوورەی بەرلین و هەرەسهێنانی رژێمی کۆمۆنیستیی ئەڵمانیای خۆرهەڵات و پاش گەڕانەوەی لەو بەرپرسیارەتییە، ساڵی 1991 واز لە K.G.B دێنا و و لە شارەوانیی لینین گرادا، کە ناوەکەی کرابووە سەنپێترێزبۆرگ خەریکی کارکردن دەبێ. پوتین لە دووەمین ساڵی کارکردنی لە شارەوانی سەنپێترێزبۆرگدا دەکرێتە جێگری شارەوانی و لە جەنگەی خەبات دژی گرووپە

مافیاییەکان لەو وڵاتەدا دیسان پێوەندی بە ڕێکخراوی نوێی تەناهیی روسیاوە بە ناوی F.S.B وە دەگرێ، کە جێگەی .K.G.B ی گرتبۆوە.

پوتین لە جەنگەی هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆك کۆمارییـدا سـەرۆکی بنکـەی بانگەشـەکاریی یەلتسین بوو لە سەنپێترێزبۆرگ، و ساڵی 1996 دەچێتە نێو ریزی کاربەدەستانی نووسینەکەی سەرۆك کۆمارییەوە. ساڵی 1998 یەلتسین بە سەرنجدان بـە پێشـینەی پـوتین لـە K.G.Bدا دەیکاتە سەرۆکی رێکخراوی نوێی تەناهیی روسـیا و هـاوینی سـاڵی 1999 لـە هـەوڵێکی چاوەڕواننەکراودا دەیکاتە سەرۆکی وەزیران.

پوتین لە ماوەی نزیك بە پێنج مانگ سەرۆك وەزیریی خۆیدا کۆمەڵێك هەنگاوی کاریگەری لە پێناوی خەبات دژی گەندەڵیی ئیـداری و سـەرکوتی گرووپـە مافیاییـەکان و سـەقامگیریی تەناهیی لە شارە گەورەکانی روسیادا هەڵگرتن و پاش دەست لە کـار کێشـانەوەی یەلتسـین و نوێنەرایەتیی ئەو لە پۆستی سەرۆك کۆماریـدا بـە هـۆی بەرپەرچـدانەوەی تونـد و سـەرکوتی سەرهەڵدانی چێچێنەکان، پێگەیەکی پتەوی لە نێـو هێـزە چـەکدارەکان و ناسیۆنالیسـتەکانی روسـیادا بەدەسـت هێنـا. لـە هەڵبژاردنـەکانی مـانگی مارسـی 2000دا بێجگـە لـە ناسیۆنالیستەکان و هێزەکانی سەربازی و خەڵکی ئاسـایی روسـیا، کـە خوازیـاری تـەناهی و خۆشبژیویی ئابووری بوون، ژمارەیەك لە کۆمۆنیستەکانی پێشووش بە سەرنجدان بە رابـردووی پووتین لە حیزبی کۆمۆنیست و رێکخراوی تەناهیی سۆڤیەتیدا دەنگیان پێدا.

پوتین پاش سەرکەوتن لـە هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆك کۆماریـدا حیزبێکـی سیاسـیی نـوێی دامەزراند و لایەنگرەکانی وی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلمانیی ساڵی 2003 ی روسـیا زۆربـەی کورسییەکانی دۆمای روسیایان بەدەست هێنا. لـە هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆك کۆمـاریی سـاڵی 2004 ی روسیاشدا پوتین بەهێنانەوەی زیاتر لە 70٪ ی دەنگـەکان بەسـەر خەنیمەکانیـدا سەرکەوت، ئەگەرچـی دژبـەرەکانی بـەوەیان تاوانبـار کـرد، کـە بـەر لـە بەڕێوەچـوونی ئـەو هەڵبژاردنانە کۆمـەڵێك کۆسـپی بـۆ چـالاکی خەنیمـەکانی خـۆی سـاز کردبـوو و یـەکێك لـە خەنیمەکانی خۆی بە بیانووی پڕوپووچ خستۆتە بەندیخانەوە.

ئەو کەسەی، کە وەك خەنیمی سەرەکیی پوتین لە هەڵبژاردنەکانی سـاڵی 2004دا باسـی دەکرێ میخاییل خۆدرۆڤسـکی بەڕێوەبـەر و خـاوەنی پێشـووی کۆمپانیـای مـەزنی نـەوتیی Yukos ـە، کە راگەیەنە ئەمریکییەکان لە ساڵی 2003دا بە شـەش میلیـار دۆلارەوە بـە شەشەمین گەورە دەوڵەمەندی جیهـان ناویـان هێنـا. وال سـتریت ژورنـال رۆژنامـەی متمانـە

پێکراوی ئەمریکی چەند مانگ بەر لە دەسبەسەر کرانی خۆردرۆڤیسکی لە ژێر ناوی گەندەڵیی ماڵی و گزەی ماڵیاتیدا نووسیی، کە خۆدرۆڤسکی ئێستا خاوەنی شەشەمین کۆمپانیای مەزنی نەوتیی جیهانە و هەر رۆژەی زیاتر لە دوومليۆن و شەش سەد هەزار یەرمیل نـەوت بەرهەمـە دێنێ. دەیڤید ساتر نووسەری کتێبی بە ناوبانگی "ئەنگوستەچاوی کـازیوە" ش، کـە مـاوەی چەند ساڵان لە مۆسکۆ هەواڵنێری والستریت ژورنال و نیۆیۆرك تایمز بووە بەشێك لـە کتێبەکـە بۆ خۆی تەرخان دەکا بۆ مەسەلەی چۆنێتیی دەوڵەمەندبوونی خۆدرۆڤسکی و دەنووسێ:" ئەو، کە لە جەنگەی هەرەسهێنانی سۆڤیەتیدا گەنجێکی سـی سـاڵان بـوو، بـە هـۆی ساتوسـەودای دراوی، سامانێکی سەرنج راکێشی بەدەست هێنا و بە دامەزراندنی بانکێکی تایبەتی دەسـتی کرد بەکاریهێنان و راگواسـتنی دراو و شـۆردنەوەی دراوی مافیـای ئـابووریی روسـیا. سـاڵی 1997، کە دەوڵەتی روسـیا ژمارەیـەك لـە کۆمپانیـا دەوڵەتییـەکانی بـۆ فرۆشـتن دانـان، خۆدرۆڤسکی کۆمپانیای نەوتیی Yukosی بە نرخی 159 ملیۆن دۆلار کڕی (دەیڤیـد سـاتر دەنووسێ، کە نرخی بنەمایی کۆمپانیاکە 150 ملیۆن دۆلار بوو، کە خۆدرۆڤسکی تەنیا بـە لێ زیادکردنی 9 ملیۆن دۆلار لە نرخـی بنەماییەکـەی، ئـەو کۆمپانیایـەی کـڕی و پێدەچـێ ساتوسەودایەك هەم لە سەر دیاریکردنی وەها نرخێکـی کـەم بـۆ کۆمپانیاکـە و هـەمیش بـۆ فرۆشتنەکەی لە گۆڕێ بووبێ.)

خۆدرۆڤسکی، کە بە هۆی زیادبوونی نرخی نەوت سامانێکی بـێ ئامـانی وەسـەریەك نابوو لەو کاتەدا، کە بـوو بـە کۆمپانیـای یۆکـوس و لـە جەنگـەی چـالاکییەکانی ئـەو کۆمپانیایەشدا هەتا ساڵی 2003 یەلتسین و پوتینی لە پشت بوون هەتا ئەوەی کـە لـە هاوینی ساڵی 2003دا، کە ئیتر ماڵ و سامان و ژیانی دەرەبەگانە خۆدرۆڤسکیی قایل نەدەکرد کەوتە داڵەدۆزەی دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی و داوا ئامانجی ئەویش لەو کارە گەیشتن بە پۆستی سەرۆك کۆماریی روسیا بوو. خۆدرۆڤسـکی بـەو سـامانە زۆرەی، کـە بەدەستییەوە بوو بۆ پوتین خەنیمێکی بە هێز و مەترسـیدار بـوو، بـەڵام پـوتین بـە هـۆی رابردوو و ئەزموونی دوورودرێژی لە رێکخراوی تەناهیی سـۆڤیەتی داوای لێهـاتبوو، کـە دەیزانی چۆناوچۆن فایل بۆ خەنیمەکانی خۆی ساز بکا لە ئۆکتۆبەری ساڵی 2003دا بـە بیانووی گزەی ماڵیاتی خۆدرۆڤسکیی گرت و لە بەندیخانەی توند کـرد و بـە ئاسـانی لـە هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆماریی ساڵی 2004دا سەر کەوت.

پاش هەڵبژاردنەکانی ساڵی 2004 ی روسیا خۆدرۆڤسکی دادگایی کرا و هەشت ساڵی زیندان بۆ بڕایەوە و کۆمپانیای نەوتیی یۆکوسیش بە هۆی داماوبوونی لە دانەوەی چەند ملیار دۆلار قەرز لە لایەن دەوڵەتەوە دەستی بەسەر داگیرا. هیچ گومانێك نییە لەوەدا، کە خۆدرۆڤسکی لە رێگەی چەوت و ناڕەواوە ببووە خاوەنی وەها سامانێك و گزەماڵیاتییەکەشی درۆ نەبوو، بەڵام ئەوەش جێگەی لێوردبوونەوەیە، کە بۆچی هەتا ئەو کاتەی خۆدرۆڤسکی بە تەمای پۆستی سەرۆك کۆماری و هەڤرکێ لە گەڵ پوتیندا نەبوو، باسێك لە فایلی گزەی ماڵی و ماڵیاتیی ئەو لە گۆڕێدا نەبوو.

# 3

ڤلادمیر پوتین سەرەڕای ئەو تۆمەتگەلەی، کە لە پێوەندی لەگەڵ ململانێی ناجوامێرانەی لە بەرامبەر خەنیمەمەکانیدا دەدەنە پاڵی لە سەردەمی دسەڵاتدارێتیی خۆیدا پتر لە پێشینیانی خۆی لێوەشاوەیی نواندووە و گرووپە مافیاییەکانی جڵەو کردووە و ئابووری شێواو و ئاڵۆزی روسیای سەردەمی یەلتسینی کۆنترۆل کردووە. بەرهەمی پوختە کراوی نیشتیمانیی روسیای لە ماوەی پێنج ساڵ دەسەڵاتدارێتیی خۆیدا (لە 2000 وە هەتا 2005 ) بە شێوەی نێونجی ساڵانە 7٪ گەشەی کردووە و داهاتی وڵات بە پێی کەس، لەبەراورد لەگەڵ بڕەوی دۆلار لەم وڵاتەدا لە ساڵی 2005دا خۆی لە دەهەزار دۆلار داوە.

دیارە رویا لەچاو وڵاتانی دیکەی ئەورووپای خۆرهەڵاتی وەکو کۆماری چێك و هەنگاریا و پۆلۆنیا رەوشێکی ئابووریی باشی نییە، بەڵام پێشبینی دەکرێ، کە بە زیادبوون و چوونەسەری نرخی نەوت و گاز، کە بەشێکن لە هەناردەی روسیا، و هەروەها بە سەرمایەگوزاری بۆ دۆزینەوە و هەڵێنجانی سەرچاوەی تازەی نەوت، ئابووریی خۆی پەرە پێ بدات.

پوتین لە سیاسەتی دەرەوەیی خۆیشیدا کەم و زۆر سەرکەوتوو بووە و چوونی روسیا بۆ نێو ریزی وڵاتانی پیشەیی گەورەی جیهان، بە هەنگاوێکی مەزن بۆ گەڕانەوەی بۆ نێو کۆڕی هێزە گەورەکانی جیهان لەقەڵەم دەدرێ. گرووپی وڵاتە پیشەییە گەورەکانی جیهان، کە پێشتر بە گرووپی 7 یا G7 بەناوبانگ بوو و ئەمریکا و بەریتانیا و فەڕەنساو 1ژاپۆن و ئەڵمانیا و ئیتالیا و کەنەدا تێیدا ئەندام بوون بە هاتنی روسیا بوون بە گرووپی هەشت یا G8 و سەرۆکی

بازنەیی ئەو گرووپە لە ساڵی 2006دا بە روسیا ئەسپێردرابوو. پێوەندییەکانی نێوان چین و روسیاش، کە بە یەکێك لە گەورەترین هێزە ئابووری و سەربازییەکانی جیهان لە قەڵەم دەدرێن، لە سەردەمی حکوومەتی پوتیندا بەرەو باشی چووە و مۆسکۆ و پەکەن لە پرسگەلی گرینگی جیهانیی وەك بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ قەیرانی ناوکیی ئێراندا سیاسەتێکی یەکگرتوویان لە بەرامبەر ئەمریکا و وڵاتانی گەورەی خۆرئاواییدا گرتە بەر.

پوتین رەوشی ئاڵۆز و بێ سەرەوبەرەی هێزە سەربازییەکانی روسیای سەردەمی یەلتسینیشی رێکوپێك کرد و سەر لە نوێ سوپای روسیای کردەوە بە یەکێك لە بە هێزترین و بە دسیپلینترین سوپاکانی جیهان. روسیا پاش ئەمریکا یەکێکە لە گەورەترین هێزە ناوکییەکانی جیهان و ژمارەی ئەو بۆمب و کڵاوکە ناوکییانەی، کە سواری مووشەکی وشکارۆ پێوی کردوون لە ساڵی 2005دا زیاتر لە هەشت بەرامبەر مەزەندە کراوە(ژمارەی بۆمب و کڵاوکە ناوکییەکانی ئەمریکاش هەر لەم ساڵەدا 10/600 و وڵاتانی دیکەی خاوەن وزەی ناوکی بە ریز بریتین لە:چین400، فەرنسا350، بەریتانیا200، ئیسراییل180، هیند90، و پاکستان 50دانە بەراورد کراوە).

ساڵی 2008، کە ساڵی هەڵبژاردنەکانی سەرۆك کۆمارییە لە روسیادا، ساڵێکی هەستیار و گرینگی بۆ خۆ تاقیکردنەوەی پوتین. بە پێی یاسای بنەڕەتیی روسیا، کە هەر کەسەی بۆی هەیە تەنیا دوو خولی هەشت سا لە سەرۆك کۆماری روسیا بێ پوتین ناتوانێ خۆی بۆ پۆستی سەرۆككۆماری بپاڵێوێتەوە هەرچەندە هەر ئێستاش ژمارەیەك لە لایەنگرەکانی ئەو باس لە گۆڕینی یاسای بنەڕەتی وکردنەوەی رێگەیەك بۆ سەر لە نوێ هەڵبژێرانەوەی پوتین بۆ پۆستی سەرۆك کۆماریی دەکەن.

وەها کارێك لەگەڵ ئەوەدا، کە بەرەورووی دژایەتی و بەربەرەکانێی حیزب و گرووپە سیاسییەکانی دیکەی روسیا بە تایبەتیی حیزبی کۆمۆنیست دەبێتەوە، زیان بە پێگەی نێودەوڵەتیی پوتینیش دەگەیەنێ. ژیرانەترین کار بۆ پوتین ئەوەیە، کە رێگە بۆ هەڵبژاردنی یەکێك لە دۆستان و هاوڕێیانی خۆی بۆ سەرۆك کۆماریی لە ساڵی 2008دا بکاتەوە و ئەگەر خۆیشی گەرەکیەتی بگەرێتەوە نێو بازنەی دەسەڵات، لە هەڵبژاردنەکەی دواییدا خۆی بۆ ئەم پۆستە بپاڵێوێتەوە و بۆ ماوەی هەشت ساڵی دیکە لە سەر تەختی دەسەڵات بمێنێتەوە.

# پاشکۆ

# کورتە مێژووی پێوەندییەکانی ئێران و روسیا

# و

# 70 ساڵەی ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتی

ئەو کاتەی حکوومەتی سۆڤیە لە ساڵی 1917دا لە روسیا دامەزرا نزیك بە سێسەد و پەنجا ساڵ بەسەر پێوەندییەکانی ئێران و روسدا تێدەپەڕی. بە پێی هێندێك لە بەڵگە مێژووییەکان یەکەمین پێوەندیی نێوان ئێران و روسیا لە سەردەمی پادشایەتیی ئیڤانی چوارەم ناسراو بە ئیڤانی (مخوف) لە روسیا و پادشایەتیی شا تەهماسبی سەفەوی لە ئێران، بەڵام لە ئارشیڤە رەسمییەکانی وەزارەتی دەررەوەدا هیچ پێشینەیەکی ئەو پێوەندییە دیار نییە. یەکەمین باڵوێزێك، کە لە لایەن پادشای ئێرانەوە چووەتە دەرباری روسیا و هێندێ پێشینە و بەڵگە لە سەر ئەرکی پێ ئەسپێردراوی ئەو لە دەست دایە ناوی " هادی بەگ" بووە، کە ساڵی 1586ی زایینی نامەیەك و کۆمەڵێك دیاری لە لایەن سوڵتان محەممەدی خودابەندەوە دەباتە روسیا و لە سەر تای ساڵی 1587دا واتە نزیك بە چوارسەد و بیست ساڵ بەر لە ئێستا دەگاتە مۆسکۆ و نامەکەی سوڵتان محەممەدی خودابەندە، کە پادشای سەفەوی تێیدا داوای لە تەزاری ئەوکاتی روسیا کردبوو ئەگەر روسەکان پێش بە دەستدرێژیی عوسمانییەکان بۆ سەر ئێران بگرن ئەوا ئێران دەربەند و باکۆ دەداتە روسەکان، گەیاندە دەرباری تەزار.

یەکەمین باڵوێزی ئێران لە دەرباری روسیا لە ساڵی 1588دا لەگەڵ نێردراوی رەسمیی روسیادا بە ناوی "ڤاسیل چیکۆڤ" بە نامەی تەزارەوە دەچێتە ئێران، هەردوو باڵوێز لە نیوەی

ڕێگە ئاگادار دەکرێنەوە، کە سوڵتان محەممەدی خودابەندە لە سەر کار لابردراوە و شاعەباسی یەکەم ناسراو بە شاعەباسی مەزن لە سەر تەختی پادشایەتییەکەی دانیشتووە. شا عەباس دیسان نامەیەك بە کۆمەڵێك دیارییەوە بە باڵوێزێکی دیکەدا بە ناوی "بوداغ بەگ" دەنێرێ بۆ مۆسکۆو داوا لە روسەکان دەکا لە شەڕی گەڵ عوسمانییەکاندا یارمەتیی بدەن، بەڵام وەڵامی ئەو نامەیە دوو ساڵ دواتر لە کاتێك دەگاتە دەست شا عەباس، کە ئێران عوسمانییەکان ڕێککەوتوون و مەسەلەی یارمەتیی روسەکان پووچەڵ بۆتەوە.

لەم ڕێکەوتەوە هەتا سەد ساڵ دواتر، کە پێتری مەزن لە روسیا هاتە سەر تەختی پادشایەتی رووداوێکی گرینگ لە روسیادا نەهاتەپێش، و پێوەندییەکانی نێوان دوو وڵات تەنیا لە بواری بازرگانیدا بەرتەسك ببۆوە. پادشایەتیی پێتری مەزن، کە یەکێك بوو لە بەدەسەڵاتترین پادشاکانی روسیا هاوکات بوو لەگەڵ پادشایەتیی لاوازترین پادشای سەفەوی و هێرشی ئەفغانەکان بۆ سەر ئێران و پێتری مەزن، کە بڕیاری دا بوو کەوشەنەکانی هەراوتر بکاتەوە بەسەر ئاوە گەرمەکاندا زاڵ بێ هاتە سەر ئەوەی کە هێرش بکاتە سەر ئێران و داگیری بکا. لە ساڵی 1724دا پاش ئەوەی روسییەکان گورجستانیان داگیر کرد و عوسمانییەکان بەرەوڕوویان بوونەوە، گرێبەستێك لە نێوان روسیا و عوسمانییەکاندا مۆر کرا، کە بە پێی ئەو گرێبەستە ئەیالەتەکانی لێوار دەریای خەزەر درانە دەست روسەکان و ئەیالەتەکانی باکووری خۆرئاوای ئێرانیش (ئازەربایجان و کوردستان و کرماشان و هەمەدان) درانە دەست عوسمانییەکان.

مەرگی پێتری مەزن لە ئاڵی 1725دا ئەو کێشە و مشتومڕەی، کە لە سەر جێنشینیی ئەو دەستی پێکرد نەیهێشت خەون و نەخشەکانی ئەو بۆ پێشڕەوی لە خاکی ئێراندا هەتا لێوارەکانی کەنداوی فارس وەدی بێن و بە دانیشتنی نادرشای ئەفشار لە سەر تەختی دەسەڵات روسەکان، کە سەرقاڵی شەڕ لەگەڵ عوسمانییەکان بوون تەواوی ئەو خاکەی، کە لە سەردەمی پێتری مەزندا لە ئێرانیان داگیر کردبوو دایانەوە بە ئێران. گرێبەستی گەڕاندنەوەی ئەو خاکە داگیرکراوانە بۆ ئێران لە دەی مارسی 1735دا لە شاری گەنجە مۆر کرا. لەو ڕێکەوتەوە هەتا سەردەمی پادشایەتیی کاترینی مەزن، کە دەیویست نەخشەکانی پێتری مەزن جێبەجێ بکا رووداوێکی گرنگ لە پێوەندییەکانی ئێران و روسیادا بەرچاو ناکەوێ. کاترینی مەزن ساڵی 1783 گورجستانی خستە سەر ئیمپراتۆریای روسیا و ئاغا محەممەدخانی قەجەر لە ساڵی 1795دا لەشکری بردە سەر گورجستان. هێرش و پەلاماری هێزەکانی ئاغا محەممەدخان

لەوپەڕی توند و تیژیدا بوو و بە تایبەتی لە جەنگەی گرتنی تفلیسی پایتەختی گورجستاندا هێزەکانی ئاغا محەممەد خان کوشتارێکی سامناکیان لێکردن و بێجگە لە کوشتن و تالأن و بڕۆی خەڵك، کە زۆربەیان مەسیحی بوون کلێسەکانی شاریشیان خاپوور کرد.

کاترینی مەزن لە تۆڵەی ئەو هێرشەی ئاغا محەممەدخاندا سوپایەکی گەورەی بۆ ئەستاندنەوەی گورجستان نارده سەر ئێران. هێزەکانی روس، کە بە شێست هەزار کەسیان مەزەندە کردوون، لە هاوینی 1796دا لە سەرانسەری قەفقازدا پێشڕەوییان کردە و پاش گرتنی گورجستان و دەربەند و باکۆ و لەنکەران، لە سەرەتای پاییزی هەر ئەم ساڵەدا لە رووباری ئاراس پەڕینەوە و لەدەشتی مۆغاندا دایانکوتا*. ئامانجی دواتری روسەکان گرتنی ئەیالەتەکانی باکووری ئێران و رۆیشتن بەرەو تاران بوو، کە پەیجوویەك(معجزە) رووی دا و بە هۆی مەرگی کاترینی مەزن لە 17ی نۆڤەمبەری 1796دا هێرش و پەلاماری روسەکان بۆ سەر ئێران راگیرا. ئاغا محەممەدخان ئەو هەلەی قۆزتەوە و لە ساڵی 1797دا بۆ ئەستاندنەوەی قەفقاز لەشکرکێشییەکی نوێی دەست پێکردەوە و لە جەنگەی ئەم لەشکرکێشییەدا بەدەستی دەوروبەرییەکانی خۆی کوژرا.

پاش ئاغا محەممەدخانی قەجەر لە سەردەمی جێنشینەکەی ئەودا فەتەلی شای قەجەر، کە هاوکات بوو لەگەڵ پادشایەتیی ئالکساندری یەکەم لە روسیادا شەڕەکانی نێوان روسیا و ئێران هەڵگیرسانەوە. لە سپتامبری 1802دا ئالکساندری یەکەم بە دەرکردنی بڕیارێك بە فەرمی گورجستانی خستەسەر ئیمپراتۆریای روسیا و ساڵێك دواتر هێزەکانی خۆی بۆ پەلامارێکی تازە بۆ سەر ئێران ئامادە کرد. هێزەکانی روس لە دیسێمبەری 1803دا گەنجەیان گرت و هێرشیان بردە سەر ئێرەڤان. فەتەلی شا کور و جێ نشینەکەی خۆی واتە عەباس میرزای راسپارد، کە بەرپەرچی هێزەکانی روس بداتەوە و عەباس میرزا توانیی لە ژانوییەی ساڵی 1804دا پاشەکشێ بە هێزەکانی روسییە بکا.

هەر لە فێبریی ئەو ساڵەدا روسەکان بە دوازدە پاپۆڕ هێرشیان بردە سەر بەندەری ئەنزەلی و هێزەکانیان لەو بەندەرەدا دابەزاند، بەلأم لە بەرامبەر وەلأم و بەربەرەکانێی ئێرانییەکاندا بە زیان وێکەوتوویەکی زۆرەوە ناچار بوون پاشەکشێ بکەن، بەلأم لە قۆناغی دووەم ی ئەو شەڕەدا، کە بە شەڕی دە ساڵە ناوی دەرکردووە سەرکەوتن و پێشکەوتن بە دەست روسەکان بوو. هێزەکانی روس لە

* دایانکوتا: واتە مانەوە. مانەوەی بە بێ پێخۆشبوونی خانەخوێ.

کۆتاییەکانی ساڵی 1806 پاش گەمارۆیەکی دوورودرێژ باکۆیان گرت و وێڕای ئـەوەی وردە وردە بەرەو باشوورو خۆرئاوای قەفقاز دەڕۆیشتن شەکی و دەربەندیشیان گرت.

شەڕەکانی فەڕەنسا و روس و هێری هێزەکانی ناپلیۆن بۆ سەر روسـیا لـە ژووئـەنی سـاڵی 1812دا روسەکانی لە درێژەدان بە هێرش و پەلامار لە قەفقازدا گێڕایەوە، بەڵام بە شکسـت و پاشەکشێی هێزەکانی ناپلیۆن لە روسیا دیسان روسەکان دەستیان کردەوە بە هێرش و پەلامار بـردن، و لـە ژانوییـەی سـاڵی 1813دا لـە قـەفقاز دەسـتیان بەسـەر لەنکـەران و تـەواوی لێوارەکانی دەریای خەزەردا گرت، و ئێرەڤانیان گەمارۆدا.

لەو کاتەدا بریتانییەکانیش، کە لە شـەڕی دژی ناپلیۆنـدا دەسـتیاندا بـووە دەسـتی روسـەکان، گوشاریان خستە سەر فەتەلی شا بۆ کۆتاییهێنان بـە دوژمنایـەتی و مـۆرکردنی گرێبەسـت لەگـەڵ روسیادا. و پەیماننامەی داسەپاوی "گولستان" لە رۆژی 21ی ئۆکتۆبەری 1813دا بە بەشـداریی نوێنەری بەریتانیا لە گوندی گولستانی هەڵکەوتوو لە قەرەباغی نێوان ئێران و روسیادا مۆر کرا. بـە پێی ئەو پیماننامەیە دەربەند و باکۆ و قەرەباغ و شـیروان و بەشـێك لـە تالـەش لـە خـاکی ئێـران لێکرایەوە و خرایە سەر خاکی روسیا و ئێران وازی لە داواکردنی گورجستان و داغستان هێنا. لەگەڵ ئەوەشدا هێڵ و سنووری نێوان ئەم دوو وڵاتە دیاری نەکرا و بە هۆی ئەو رۆڵەی، کە بریتانییەکان لـە بەستنی ئەو پەیماننامەیەدا هەیانبوو پێدەچێ، کە ئەو لێڵییە لە پەیماننامەی گولستاندا بە ئانقەسـت و بۆ ئەوە بووبێ، کە بوار بمێنێ بۆ ئەوەی هەر کات بەرژەوەندییـەکانی بـەریتانیا بخـوازێ شـەڕێکی دیکە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا هەڵگیرسێتەوە.

لە رێکەوتی مۆر کرانی گرێبەستی گولستانەوە هەتا دە ساڵی دیکە هیچ تێکهەڵچوونێکی دیکە لە نێوان ئێران و بەریتانیادا نەهاتە گۆڕێ هەتا ئەوەی کە لە ساڵی 1823دا روسـەکان شەڕی نێوان ئێران وعوسمانییان بە دەرفەت زانی بەشێك لە قەفقاز و باکووری ئێرانیـان خسـتە سەر خاکی خۆیان. دەوڵەتی ئێران لەبەرامبەر ئەم کردەیەدا نارەزایەتیی نواند، بەڵام روسـەکان گوێیان بە نارەزایەتیی ئێران نەبزووت. تەزار ئالکساندری یەکـەم رۆژی یەکـەمی دیسـێمبەری ساڵی 1825 مرد وجێنشینەکەی وی نیکۆلای یەکەم لە مانگی مارسـی 1826دا پـرێنس منچیکۆڤی وەك باڵوێز ناردە تاران. پرێنس منچـیکۆڤیش ئامـادە نـەبوو ویسـتەکانی ئێـران بەجێبگەیەنێ و ئەوەندە بە بێ شەرمی و توند لەگەڵ ئێرانییەکانـدا هەڵسـوکەوتی کـرد، کـە پردی هەر چەشنە هێوایەکی رێککەوتنی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی روسیادا پساند.

خولی دووەم ی شەڕەکانی نێوان ئێران و روسیا بە بێ راگەیاندنی پێشوو لە سەرەتای هاوینی ساڵی 1826دا دەستی پێکرد لە یەکەمین قۆناغی ئەو شەڕەدا، کە هەتا کۆتاییەکانی هاوینی خایاند ئێرانییەکان سەرکەوتوو بوون. هێزەکانی ئێران لەو ماوەیەدا بەشێکی زۆری ئەو ناوچانەیان ئەستاندەوە، کە بە پێی گرێبەستی گولستان درابوونە روسیا، و فەتەلی شا پاش ئەو سەرکەوتنانە ئامادەبوونی خۆی بۆ کۆتاییهێنان بە شەر و مۆرکردنی پەیمانی ئاشتی راگەیاند بە مەرجێك، کە ئەو خاکانەی، کە روسیا لە قەفقازەوە گرتوونی بیانداتەوە بە ئێران، بەڵام روسەکان، کە خۆیان بۆ شەڕ رێکدەخستەوە ئامادە نەبوون مل بۆ ئەو پێشنیارانەی شای قەجەر راکێشن و لە کۆتایی هاوینی ساڵی 1826دا بە هێزێکی پەنجا هەزار کەسییەوە هێرشیان کردەوە سەر ئێران. هێزە پەلامار دەرەکان بۆ جارێکی دیکەش لە سەرەتای ساڵی 1827دا لەبەر هێزەکانی عەباس میرزا بەزین، بەڵام هەر لە پایزی ئەو ساڵەدا بەهێنانی هێزی نوێ و حەساوەی روسی بۆ بەرەی شەر و خۆ خافڵاندنی براکانی عەباس میرزا بۆ گەیاندنی هێزی پشتیوان رەوشەکە بە قازانجی روسەکان شکایەوە و هێزەکانی روس لە نیوەی مانگی ئۆکتۆبەری 1827دا لە رووباری ئاراس پەڕینەوە و بەر لە هاتنی وەرزی زستان تەورێزیان گرت.

بە باوەڕی هێندێ لە مێژوو نووسەکان عەباس میرزا، کە لە خۆخافڵاندن و کارشکێنیی باوکی تووڕە ببوو بە ئانقەست لە بەرامبەر هێرشی پەلامارەدرانی روسدا بەرگریی نەکرد و ویستی لەگەڵیان رێککەوێ. فەتەلی شا پێی وابوو بە تەیارکردن و رێکخستنی هێزی حەساوە دەتوانێ روسەکان لە خاکی خۆی وەدەر بنێ هەر بۆیەش لە کۆتایی ساڵی 1827دا هەوڵی رێکخستنی هێزێکی نوێی دا و لە سەرەتای ساڵی 1828دا وەك فەرماندەی ئەو هێزانە بەرەو قەزوین وەرێکەوت. لەو ماوەیەدا هێزەکانی روسیش لە تەورێزەوە بەرەو خۆرهەڵات وەرێکەوتن و پاش گرتنی تالەش و ئەردەبیل گەیشتبوونە قافلانکۆ.

لەو کاتەدا بریتانییەکان بۆ جارێکی دیکەش خۆیان لە گۆڵمەزەکە هەڵقورتاند و بەر لەوەی تێکهەڵچوونێك لە نێوان هێزەکانی هەر دوو لایەندا بێتە ئاراوە "سێرجان مەك دۆنالد" وەزیری موختاری بەریتانیا چووە لای شای ئێران و ئەوی لە هێزی سەربازیی روسەکان و مەترسیی شەڕ لەگەڵ ئەواندا تۆقاند. فەتەلی شا، کە بە بیستنی قسەکانی وەزیری موختاری بەریتانیا ترسی رێنیشتبوو و تەخت و بەختی خۆی لە مەترسییدا دەبینی رایگەیاند، کە ئامادەیە کۆتایی بە شەڕ بێنێ‌و نێوبژیوانیی بەریتانیای بۆ چارەسەریی ئەو مەسەلەیە قەبوڵ کرد.

دانوستانەکانی ئاشتی لە نێوان ئێران و روسەکاندا لە حاڵێکدا، کە روسەکان بەشێکی هەراو و مەزنیان لە خاکی ئێران داگیر کردبوو لە هەلومەرجێکی نابەرامبەردا دەستی پێکرد. روسەکان تەنانەت گوێیان نەدایە داوای ئێرانییەکان بۆ ئەوەی دانوستانەکان لە تەوریز بکرێ و دانوستانەکان لە گوندی تورکەمەنچای، کە لە چل کیلۆمەتریی میانە و لە سەر سنووری ئەو بەشە هەڵکەوتبوو، کە روسەکان دەستیان بەسەر داگرتبوو دەستی پێکرد.

بە پێی پەیماننامەی تورکەمەنچای، کە لە رێکەوتی دەی فێبریوەی 1828دا مۆر کرا ئێران بێجگە لەو ئەیالەتانەی، کە بە پێی پەیمانی گولستان لە دەستیدا بوون تەواوی خاکی ئەودیوی رووباری ئاراس واتە نەخجەوان و ئیرەڤان و قەرەباغ و بەشێکی لە تالەشیش لە دەستداو رووباری ئاراس بە فەرمی بوو بە سنووری نێوان هەر دوو وڵات. هەر بە پێی ئەو پەیماننامەیە ئێران بۆی نەبوو لە دەریای خەزەردا کەشتی بگێڕی و دوورگەکانی نێو دەریای خەزەریش درانە روسیا. بە پێی یەکێك لە بڕگەکانی گرێبەستەکە ئێران گفتی لێ وەرگیردرا، کە بڕی دە کرۆر تمەن، کە دەی کردە بیست ملیۆن مەناتی روسی یا سێ ملیۆن ونیو لیرەی بریتانی وەکو غەرامەی شەڕ بدات بە روسیا، کە نیوەی بە نەغد و بە شێوەی سکەی ئاڵتوون یا زیو درا و ژەنەراڵ پاسکۆڤیچ فەرماندەی لەشکری روس پاش وەرگرتنی ئەو بڕە دراوە فەرمانی پاشەکشەی بە هێزەکانی خۆی دا.

بڕگەیەکی دیکەی گرێبەستەگە ئەوە بوو، کە بە شێوەی یاسایی عەباس میرزا بە جێ نشین و میراتگری تەخت و تاج ئێران بە فەرمی بناسرێ. بەو شێوەیە عەباس میرزا بە کردەوە خۆی خستە بەر دەستی روسەکان و بە گونجاندنی ئەو بڕگەیە لە گرێبەستەکەدا هەوڵی براکانی خۆی، کە کەوتبوونە دژایەتی لەگەڵی پووچەڵ کردەوە. لە بەشی دەی ئەو پەیماننامەیەدا و لەو پرۆتۆکۆلەشدا، کە وەك پاشکۆ لەگەڵییەتی ماف و پوانگەلێکی تایبەت بۆ نوێنەرانی سیاسی و بازرگانیی روسیا لە ئێراندا لەبەر چاو گیران، کە بنەمای کاپیتۆلاسیۆن یا مافی داوەریکردنی دەرەوەی سنووری بۆ پێڕاگەیشتن بە تاوانی هاووڵاتیان روسی لە ئێراندا جێ خست.

دە مانگ پاش واژۆی گرێبەستی تورکەمەنچای دەوڵەتی روسیا ئالکساندر گریبایدۆڤی وەك باڵوێزی تایبەتی ناردە تاران بۆ ئەوەی بەڵگەکانی ئەو گرێبەستە لەگەڵ ئێران بگۆڕێتەوە، بەڵام گریبایدۆڤ لەو ماوەیەدا، کە لە تاران مایەوە هێندێ ئاکاری نواندن، کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی گشتی و هێرشی خەڵك بۆ سەر باڵوێزخانەی روس و کوشتنی گریبایدۆڤ و سی وشەش کەس لە هاووڵاتیانی روسی. نیکۆلای یەکەم، کە لەو رووداوە ئاگار بۆوە باڵوێزێکی

نوێی بە ناوی دالگورگی ناردە تاران بۆ ئەوەی ڕووداوەکە تاوتوێ بکات و راپۆرتی ڕووداوەکەی بۆ بەرێتەوە. راپۆرتەکەی دالگورگی ئەوەی دەگەیاند، کە هەڵەکانی گریبایدۆڤ و هەروەها هێندێ دنەدان بووەتە هۆی ئەوەی ئەو ڕووداوە بقەومێ و لە هەمان کاتدا پێشنیاری بە دەرباری ئێران کرد، کە وەڤدێك بە سەرۆکایەتیی یەکێك لە شازادەکان بۆ داوای لێبوردن بنێرێتە دەرباری روسیا. ئەو پێشنیارە وەرگیردرا و بە ناردەنی وەڤدێك بە سەرۆکایەتیی خوسرەو میرزای کوڕی عەباس میرزا بۆ دەرباری روسیا کێشەکە چارەسەر کرا.

لەو ڕێکەوتە بە دواوە هێژمونیی روسیا لە دەرباری ئێراندا پەرەی گرت و دنەدانی روسەکان و هاندانەکانیان لە سەردەمی پادشایەتیی **محەممەد** شا و ناسرەدین شای قەجەردا بووە هۆی شەڕی گەورەی نێوان ئێران بەریتانیا، بەڵام هێژموونی و تەشەنەی بریتانییەکان لە ئێراندا لە کۆتایی پادشایەتیی ناسرەدین شا و سەرەتای موزەفەرەدین شادا پەرەی گرت و بریتانییەکان بەو ڕۆڵەی، کە لە شۆڕشی مەشرووتەدا گێڕایان پێگەیەکی بەهێزتریان بەدەست هێنا. لەگەڵ مەرگی موزەفەرەدین شا و دەستپێکی پادشایەتیی **محەممەد** عەلی میرزای کوڕی، کە بە ناوی **محەممەد** عەلی شادا پاڵی وەتەختی دەسەڵاتدا جارێکی دیکە پارسەنگی تەرازووی سیاسەتی ئێران بە قازانجی روسەکان شکایەوە، چونکی **محەممەد** عەلی شا بە تەواوەتی لە ژێر باری روسەکاندا بوو و دژی مەشرووتە خوازان هەموو ئەو پوانانە بوو، کە باوکیدا بووی بە مەشرووتە خوازەکان، بەڵام بەریتانیا و روسیا بە هۆی بەرژەوەندیی نێودەوڵەتیی خۆیان و قازانجی هاوبەشیان، کە لە بەرامبەر بە هێزبوونی ئەڵمانیا و یەك گرتنی لەگەڵ عوسمانییدا هەیانبوو، لێك نزیك ببوونەوە و کێشەکانی خۆیانیان لە سەر ئێران وەلا نابوو. دوو هێزی ئیستیعماری بە پێی ئەو گرێبەستەی، کە لە ڕۆژی 31ی ئوتی 1907دا لە سەنپێترێزبۆرگ واژۆیان کرد، ئێرانیان بەسەر خۆیاندا دابەش کرد. بە پێی ئەم گرێبەستە نیوەی باکووریی ئێران، کە ناوچە ئاوەدان پڕ حەشیمەتەکانی لە خۆ دەگرت لە سەرووی هێڵی گریمانەیی نێوان قەسری شیرن و ئیسفەهان و یەزد و سنووری ئەفغانستان، بوو بە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی روس و بەشی باشووری ئێران، کە لە باری سەربازییەوە گرینگیی هەبوو، لە هێڵی گریمانەیی نێوان بەندەرعەباس و کرمان و بیرجەند هەتا سنووری ئەفغانستان بە ناوچەی بن دەسەڵاتی بەریتانیا ناسرا. باقی خاکی ئێران بە ناوچەی بێ لایەن ناسرابوو، بەڵام بریتانییەکان، کە بە بەشی خۆیان لەم دابەش نامەیە قایل نەبوون پاش دەسپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی لە ساڵی 1915دا

گرێبەستێکی نهێنی‌یان لەگەڵ روسیادا بەست و قایلین کرد بەوەی، کە پاش تەواوبوونی شەڕ ناوچە بێلایەنەکان بخەنە سەر کەوشەنی دەسەڵاتی خۆیان.

بەڵام لە ماوەی نێوان ساڵانی 1907 هەتا 1915 کۆمەڵێك رووداوی دیکە لە ئێراندا هاتنە پێشێ، کە روسەکان لە هەمووواندا رۆڵی بەرچاویان هەبوو. لە ژوئەنی ساڵی 1908دا محەممەد عەلی شا بە دنەدانی روسەکان دژی مەشرووتەخوازەکان راپەڕی و بریگادی قەزاق بە فەرماندەرێتیی کۆلۆنێل لیاخۆفی روسی پەرلمانی وەبەر تۆپدا. لە ئاپریلی ساڵی 1909دا بە دوای بەرەو پێش چوونی عوسمانییەکان لە نێو خاکی ئێراندا روسەکانیش بە بیانووی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان هاتنە نێو ئازەربایجانەوە و هەتا تەورێز چوونە پێشەوە. محەممەدعەلی شا بە هۆی سەرهەڵدانی مەشرووتەخوازان لە 16ی ژووئیەی ساڵی 1909دا لە پادشایەتی خرا و پەنای بردە بەر روسیا، بەڵام روسەکان پاش دوو ساڵ بۆ گەڕاندنەوەی ئەو بۆ سەر تەختی دەسەڵات هەوڵێکی تازەیان دا و لە 18ی ژوئەنی 1911دا هێنایانەوە نێو ئێران، بەڵام ئەو هەوڵە بێ ئاکام بوو و هێزە ئازادیخوازەکان لە ماوەیەکی کورتدا هێزەکانی لایەنگری محەممەدعەلی شایان تێکشکاند و بۆ دووەمین جار لە ئێرانیان دەرپەڕاندەوە.

پاش شکستی دووبارە و هەڵاتنی محەممەدعەلی شا، یەکەمین کێبڕکی و ناکۆکییەکانی نێوان روسەکان و ئەمریکییەکان، کە تازە هاتبوونە نێو گۆڕەپانی سیاسەتی ئێرانەوە دەردەکەوێ. روسەکان، کە بە چالاکیی وەفدێکی راوێژکاریی ماڵیی ئەمریکی بە سەرۆکایەتیی مۆرگان شۆستەری ئەمریکی قەڵس بوون هەوڵی ئەویان بۆ دەسبەسەرکردنی دارایی و سامانی شعاع السلگنە ی برای محەممەدعەلی شا کردە بیانوو و لە ژێر ناوی ئەوەدا، کە ئەو قەرزی بانکی روسیای لە سەر ە و ماڵ و سامانەکەی بارمتەی بانکە، داوایان کرد، کە بڕیاری دەسبەسەر کرانی سامانەکەی هەڵوەشێندرێتەوە. شۆستەر ملی بۆ ئەم داوایە رانەکێشا و ئەمجارەیان روسەکان دوایین دەرفەتیان بۆ ئێران دیاری کرد و داویان کرد، کە شۆستەر لە ئێران وەدەر نێن. پەرلمان گوێی بەم ئۆلتیماتۆمە نەدا و روسەکان بۆ جارێکی دیکەش لە کۆتایی ساڵی 1911دا هێزەکانی خۆیان هێنایەوە نێو خاکی ئێران. تەورێز بۆ جارێکی دیکەش پاش بەربەرەکانییەکی قارەمانانە کەوتەوە دەست سەربازەکانی روسیا و هەشت کەس لە ئازادیخوازانی تەورێز، کە پقەالاسلام رێبەری ئایینی و خۆشەویستی گەل لە ریزی پێشەوەیان بوو، رۆژی یەکەمی ژانوییەی ساڵی 1912 بە دەستی سالداتەکانی روسیا لە سێدارە دران.

گوشاری روسەکان و هەڕەشەی داگیرکردنی تاران ئاخرییەکەی سەرۆك وەزیرانی ئەوکات صمصامالسلگنەی بەختیاریی بە چۆك داهێنا. پەرلمان هەلوەشێنرایەوە و شۆستەر لە ئێران وەدەر نرا، بەڵام روسەکان لەئێراندا دەستیان لە کردەوەی دڕندانەی خۆیان هەڵنەدەگرت. سێ مانگ پاش لە داردرانی پقەالاسلام و ئازادیخوازەکانی دیکەی تەوریز گومبەزی ئیمام رەزایان لە شاری مەشهەد وەبەر تۆپ دا و بوونە هۆی بێزاریی خەڵکی ئێران.

لە رێکەوتی سێی ئووتی ساڵی 1914دا، کە شەڕی یەکەمی جیهانی دەستی پێکرد ئێران تەنیا لە رواڵەتدا ولاتێکی سەربەخۆ بوو. ئەحمەد شای قەجەر، کە تازە تەمەنی گەیشتبووە هەژدە ساڵ و تاجی نابووە سەری دەسەڵاتێکی نەبوو و نزیك بە سی هەزار سەربازی روسی، کە لە ژێر ناوی جۆراوجۆردا لە ئەیالەتەکانی باکووریدا دەژیان، بە پێی گرێبەستی 1907ی روس و بەریتانیا کۆمەڵێك مافیان لە باکووری ئێران بە خۆوە رەوا دەبینی. بریتانییەکانیش لە باشووری ئێراندا حوکمڕانییان دەکردو بڕیاری دەوڵەتی ئێران تەنیا لەو ناوچانەدا برەوی هەبوو، کە پێیان دەگوترا ناوچەی بێ لایەن. لەگەڵ دەست پێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی روسەکان، کە لەگەڵ عوسمانییەکاندا دەستەویەخە بوون بۆ جارێکی دیکەش بە بێ ئەوەی گوێ بدەنە نارەزایەتیی ئێران هێزەکانی خۆیانیان هێنایەوە نێو خاکی ئێران و لە کۆتایی ساڵی 1914دا نزیك بە حەفتا هەزار سەربازی روسی ناوچەکانی باکووری رۆژاوای ئێرانیان بە درێژایی سنوورەکانی عوسمانی داگیر کرد. بریتانییەکانیش لە لای باشوورەوە هێزەکانی خۆیان هێنایە نێو خاکی خوزستانەوە و هێرشیان کردە سەر خاکی عوسمانی لە ناوچەی نێوان رووبار(بین-النهرین). لەگەڵ هێرشی هێزەکانی عوسمانی بۆ خاکی ئێران و بە دوای ئەو شەڕەدا، کە لە نزیك تەوریز لە نێوان هێزەکانی روس و عوسمانیدا هاتە ئاراوە روسەکان ناچار بوون ئەو شارە چۆڵ بکەن. شاری تەوریز لە سۆدرەی ئەم شەڕەدا سووتێنرا و زیانێکی لە رادەبەدەر وە خەڵك کەوت. هێزەکانی روس، کە هەتا ناوچەی جولفا پاشەکشێیان کردبوو هێزی پشتیوانیان لە روسیاوە بۆ هات و دەستیان کردەوە بە پەلاماردان و هێرشیان هێنایەوە و پاش تێکشکاندنی هێزەکانی عوسمانی لە باشووری جولفا رۆژی 30ی ژانوییە دیسان تەوریزیان گرتەوە. هێزەکانی روسیا ئەوجارە بەرەو لای خۆرئاوا رۆیشتن و لە بەهاری ساڵی 1915دا شاری ورمێیان لە هێزەکانی عوسمانی ئەستاندەوە و هەتا سنووری دەریاچەی وان چوونە پێشەوە.

دواین رادەی پێشرەویی روسەکان لە ئێراندا گرتنی هەمەدان و کرماشان بوو لە فێبرییەی ساڵی 1917دا، بەڵام لەم رێکەوتە بەملاوە بە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕش و راپەڕینەکان لە

روسیا و هەرەسهێنانی حکوومەتی تەزاری هێزەکانی روس لە ئێراندا سەریان لێ شێوا. ئەو سەر لێ شێواوییە بە هاتنە سەر کاری حکوومەتی بۆلشەڤیکی لە روسیادا بە لوتکە گەیشت و هێزەکانی روس ئالۆز و پەرش و بڵاو بوون. بە پێی گرێبەستی "برێستلیتۆڤسك"، کە رۆژی سێیەمی مارسی 1918 لە نێوان ئەڵمانیا و حکوومەتی بۆلشەڤیکیدا واژۆ کرا روسەکان دەربەست و بەرعۆدە کران، کە هێزەکانیان لە ئێران بکێشنەوە و پاشماوەی هێزە روسییەکانیش هەتا کۆتایی ئەم ساڵە ئێران چۆڵ بکەن.

## ئیعدامی یەکەمین باڵوێزی روس لە ئێران و گۆڕانەکانی دوایی لە پێوەندییەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا

ئێران یەکێك بوو لەو یەکەمین وڵاتانەی، کە حکوومەتی بۆلشەڤیکیی لە روسیادا بە فەرمی ناسی. ئەسەدوڵا بەهادوڕ باڵوێزی ئێران لە روسیا رۆژی 14 ی دیسێمبەری 1917 بڕیاری دەوڵەتی ئێرانی بۆ بە فەرمی ناسینی حکوومەتی بۆلشەڤیکی گەیاندە بەرپرسانی سۆڤیەتی و دەوڵەتی سۆڤیەتییش رۆژی چوارەمی فێبریی ساڵی 1918 بە فەرمی گرێبەستی 1907 و 1915ی بەریتانیا و روس و پوانەکانی دیاریکران و لەم گرێبەستانەیدا هەڵوەشاندەوە. دیارە حکوومەتی بۆلشەڤیکیی روسیا لەوە پتر نەچووە پێشو ئامادە نەبوو گرێبەستە داسەپاوەکانی گولستان و تورکەمەنچای هەڵوەشێنێتەوە.

یەکەمین نوێنەری سۆڤیەتی لە ئێراندا ناوی براڤین بوو، کە پێشتر لە شاری خۆی کۆنسولی روسیای تەزاری بوو و پاش ئەوەی رەگەڵ هێزە راپەڕیوە شۆڕشڤانەکان کەوتبوو وەك نوێنەری خاوەن دەسەڵاتی دەوڵەتی سۆڤیەتی ناردرابووە تاران، بەڵام لە بشێوییەکانی مانگەکانی سەرەتای شۆڕشدا نامەیەکی پشتگیری، کە نیشاندەری ئەوە بێ ئەو بە فەرمی نێردراوی سۆڤیەتییە بۆ ئێران بە دەستییەوە نەبوو وبراڤین بە پشتبەستن بەو هەواڵێنەی لە بڵاڤۆکەکانی سۆڤیەتیدا، کە ئەویان وەك نوێنەری فەرمی دەناساند دەیویست لەگەڵ ئێران بکەوێتە دانوستانەوە. دەوڵەتی ئێران ئامادە نەبوو لەگەڵ ئەم باڵوێزە بێ ناسنامە و پشتگیرییە دانوستان بکا هەتا ئەوەی کە دەوڵەتی سۆڤیەتی لە ژوئیەی ساڵی 1919دا باڵوێزێکی دیکەی بە ناوی " کۆلۆمیتسۆڤ" نارده تاران. کۆلۆمیتسۆڤ گەڵاڵەیەکی 16 بڕگەیی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، کە تێیدا پوانگەلێکی وەك کاپیتۆلاسیۆن و

ئەسپاردنی ڕێگە و دامەزراوەکان بە دەوڵەتی ئێران، کە حکوومەتی تەزاری پێیدا بوون، هەڵوەشاوە ڕاگەیاندبوو، بەڵام حکوومەتی "وسوقودەولە"، کە لایەنگری بەریتانیا بوو رووی بە نێردراوی دەوڵەتی سۆڤیەتی نەدا و تەنانەت داواکەشی لە سەر داخستنی نووسینگەی نوێنەرایەتیی روسییەی تەزاری لە تاران لێ قەبووڵ نەکرد.

وسوقودەولە لە مانگی ئوتی سالی 1919دا گرێبەستێکی لەگەڵ "سێرپێرسی کاکس" وەزیری خاوەن دەسەڵاتی بەریتانیا لە ئێراندا مۆر کرد، کە بە پێی ئەم گرێبەستە ئێران بە کردەوە دەچووە بن باڵی بەریتانیاوە و تەواوی ڕێکخستن و دامودەزگای ئابووری و سەربازیی ئێران دەچووە ژێر چاوەدێریی بریتانییەکانەوە. لە لایەکی دیکەوە هێزەکانی بەریتانیا لە ئێراندا بە راشکاوی هێزەکانی دژی حکوومەتی سۆڤیەتییان بە هێز دەکردن و یارمەتییان دەدان و بۆ دامەزراندنی کۆماری دژە کۆمۆنیستی لە قەفقازدا تێدەکۆشان. لەو نێوەدا کۆلۆمیتسۆڤ وەزیری خاوەن دەسەڵاتی(موختار) سۆڤیەتی لە تاران دەسبەسەر کرا و بە دەستی قەزاقە دژە بۆلشەڤیکییەکانی روسیا، کە لە خزمەتی دەوڵەتی ئێراندا بوون تیرەباران کرا. دەوڵەتی سۆڤیەتی لە ناڕەزایەتی بەم کردەوەیەدا لە سپتامبری سالی 1919دا باڵوێزخانەی ئێرانی لە مۆسکۆ (پایتەختی نوێی سۆڤیەتی) داخست و ئەسەد بەهادوڕ باڵوێزی ئێرانی دەسبەسەر کرد. ئەسەد بەهادوڕ پاش ماوەیەك دەسبەسەری لە سۆڤیەتی دەر کرا و پێوەندییەکانی نێوان هەر دوو وڵات بە تەواوی پسان.

پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتی هەتا کۆتایی سالی 1919 و سەرەتای 1920 هەر وا بە هەڵپەسێردراوی مابۆوە هەتا ئەوەی کە هێزەکانی سۆڤیەتی لە سەرەتای بەهاری 1920دا بە یارمەتیی بەریتانیا هێزەکانی ژەنەراڵە دژەشۆڕشەکانیان، کە دژی دەوڵەتی سۆڤیەتی شەڕیان دەکرد تێکشکاندن و لە ڕێگەی دەریای خەزەرەوە ناچاریانکردن پاشەکشەی بکەن. سۆڤیەتییەکان هەر بە راوەدوونانی ئەم هێزانە لە قەفقاز وازیان نەهێنا و بە دوایاندا لە مانگی مای 1920دا لە ڕێگەی دەریا و وشکاییەوە هاتنە نێو گیلانەوە و بەشێکی پان و بەرینی ئەو ئەیالەتەیان داگیر کرد. دەوڵەتی ئێران سکاڵای بردە بەر ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەوڵەتی سۆڤیەتی هێشتا لە لایەن زۆربەی وڵاتانی ئەندامی ئەم ڕێکخراوەوە بە فەرمی نەناسرابوو و ئەندامی ڕێکخراوی نێودەوڵەتی نەبوو سکاڵاکەی ئێران چی لێ شین نەبۆوە.

هاتنی هێزەکانی سۆڤیەتی بۆ نێو گیلان هاوکات بوو لەگەڵ بزووتنەوەی جەنگەڵ بە ڕێبەرایەتیی میرزا کوچك خان. میرزا کۆچك خان پیاوێکی ئیماندار و ناسیۆنالیست بوو و بیر و

باوەڕی ئەو لە هیچ بوارێکدا لەگەڵ ئارمانجی کۆمۆنیزم یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام یەکێك لە نزیکترین هاورێکانی وی واتە ئیحسانولڵاخان کۆمۆنیست بوو و روسەکان هیوایەکی زۆریان بە پێگەی ئەو لە نێو بزووتنەوەی جەنگەڵدا هەبوو. ئیحسانولڵاخان لە بیرەوەرییەکانیدا، کە پاش راکردنی لە ئێران لە گۆڤاری "نۆڤی وێستك"ی سۆڤیەتیدا بڵاوی کردەوە ئاماژەی بە کۆمەڵە خاڵێك کردووە، کە نیشاندەر و روونکەرەوەی بیر و باوەڕە ئایینییەکانی میرزاکۆچك خان و بێ باوەڕیی ئەو بە کۆمۆنیستەکان و لە هەمان کاتدا پێوەندیی خۆی ئیحسانولاخانیش بە روسەکانەوەیە.

**ئیحسانولڵاخان لە درێژەی بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ:**

"شەوی 17ی مای 1920 یەکێك لە هاورێیانی روسی هاتە جەنگەڵ و هەواڵی بۆ هێناین، کە بۆلشەڤیکەکان هەر لەم رۆژانەدا دێنە بەندەری ئەنزەلی..، چونکی پێشبینیمان دەکرد، کە بریتانییەکانیش لە کاتی پاشەکشەیاندا ناچار دەبن بە رێگەی ئاسایی ئەنزەلی و قەزوین دابڕۆن، کەوابوو بە میرزامان وت، کە هێزەکان بنێرێتە سیاچەم، کە لە کاتی پاشەکشێدا پەلاماریان بدەن، بەڵام کوچك خان گوێی بەم پێشنیارە نەدا، چونکی ئەو هێشتا نەیدەتوانی ساخ بێتەوە، کە هاوکاریی بۆلشەڤیکەکان بکات یا نا، و حەزیشی لێ بوو بەر لەوەی بچێتە نێو بەرەی بۆلشەڤیەکەکانەوە بزانێ ئەوان کێن و رێبازیان چییە.

سەرلە بەیانیی رۆژی دوایی 18ی مای پاپۆڕە جەنگییەکانی بۆلشەڤیکان هاتنە بەندەری ئەنزەلی و غازیانیان وەبەر رەهێڵەی تۆپدا. لەگەڵ کوچك خان، کە ئەو ماوەیە هەر بە یەکەوە بووین بە گرمەی تۆپ وەخەبەر هاتین و لە کوچك خانم پرسی ئاخۆ گوێی لە گرمەی تۆپی هاورێیانی ئێمە دەبێ؟ ئەو بەسەر وەڵامی "ئا"ی دامەوە و بۆ نوێژی بەیانی هەستا و داوای لێکردم لە بۆ شوکرانە بژێریی هاتنی هاورێیانمان دوو رەکات نوێژ بخوێنم، بەڵام من لە وەڵامی دا گوتم، کە لەژیانمدا نوێژم نەکردووە و پێشنیارتان پێ دەکەم ئەگەر دەتانەوێ لەگەڵ بۆلشەڤیکەکان هاوپەیمان بن دەبوو واز لە نوێژ و ئایین بێنن...

خێرا پێیان راگەیاندین، کە قەزاقەکان لە فومەن بوونە و جێگەی خۆیان گۆڕیوە و رۆیشتوون. بۆ بەیانی کۆمیتەی ئێمە لە فومەن کۆبوونەوەیەکی گۆت، حەشیمەتێکی زۆر لە بازاری فومەن کۆ ببوونەوە. من وام بە باش زانی لەوێ کۆبوونەوەیەکی بەرین ساز کەین و مزگێنیی هاتنی بۆلشەڤیکەکان بە خەڵك رابگەیەنم. گوندییەکان بە خۆشحاڵییەوە قسەکانیان وەرگرتم. پاش متینگەکە کۆبوونەوەی کۆمیتە لە باغێکدا گیرا و کاتێك نۆرەی قسەکردنی من

هات گوتم، که ئێمه دەبێ بە دڵ و گیان لەگەڵ بۆلشەڤیکەکان یەك بگرین و بە خێرایی تاران بە دەست بێنین... ئێمە نابێ هەموو هەوڵەکانمان لە سەر گیلان چڕ بکەینەوە, بەڵکو دەبێ بە پەلە خۆمان رێکخەین و پەلاماری تاران بدەین.

کوچك خان گوتی بەر لەوەی بچینە نێو هەر بەرەیەکەوە دەبێ لە نزیکەوە بۆلشەڤیکەکان بناسین و دوایی گرێبەستێکیان لەگەڵ مۆر بکەین. من دژایەتیی بەستنی گرێبەستم کرد و گوتم خۆ ئێمە دەوڵەت نین، کە پەیماننامە واژۆ بکەین. ئێمە شۆڕشگێڕین و دەبێ لە پێشدا تاران بگرین و دوایی پەیماننامە واژۆ بکەین..."

میرزا کوچك خان بەو شێوەیە ئاخرییەکەی کەوتە ژێر کاریگەریی ئەم لەگوێ خوێندنانەی ئیحسانولاخان و پاش گرتنی شاری رەشت لەگەڵ بولشەڤیکەکان کۆمیتەیەکی "شۆڕشی سوور" پێکدێنن و حکومەتی کۆماری سۆسیالیستیی گیلان رادەگەیەنن. پێکهاتەی کۆماری سۆسیالیستیی گیلانیش لە شێوەی حکوومەتی سۆڤیەتی و ناوی ئەندامەکانیشی "کۆمیسێر"ە. دەقی راگەیەندراوەکەی شۆڕشی سوور، کە رۆژی 18ی جۆزەردانی 1299 بڵاو بۆتەوە و تێیدا ناوی ئەندامانی حکوومەتی کۆماریی سۆسیالیستیی گیلان هاتووە بەم شێوەیەیە:

**راگەیەندراوی شۆڕشی سوور**

**تەواوی خەڵکی بەڕێز ئاگادار دەکەینەوە کۆمیتەی سوور پاش پێك هێنانی حکوومەتی نوێ و راگەیاندنی بە شێوەی فەرمی، ئەو کەسانەوەك ئەندام بۆ ئیدارەکانی وڵات دەکاتە کۆمیسێر و دەیانناسێنێ، کە بە گشتی لە کاروباری پێوەندیداردا بچنە لایان و لە هەر ئیدارەیەك پێچەوانەی یاساتان بینی بە بێ تێبینی رایگەیەنن:**

**کۆمیسێری نێوخۆ میر شەمسەدین، کۆمیسێری دەرەوە سەید جەعفەر، کۆمیسێری ماڵی میرزا محەممەد عەلی پیربازاری، کۆمیسێری داد مەحموود ئاغا، کۆمیسێری پۆستە و تەلەگراف نەسروڵا، کۆمیسێری رۆشنبیری حاجی محەممەد جەعفەر، کۆمیسێری داهات میرزا محەممەد عەلی خومامی، کۆمیسێری بازرگانی میرزا ئەبولقاسم فەخرایی**

**واژۆی سەرۆك کۆمیتە و کۆمیسێری جەنگ ـ میرزا کوچك‌خان**

هاوکات لەگەڵ دامەزرانی کۆمیتەی شۆڕشی سوور، حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانیش، کە سەر بە گرووپی ئیحسانولاخان و ئەندامانی تاقمی"عدالت" پێکدەهات بە فەرمی دەستی بە چالاکی کرد. تاقمی داد"عدالت" ناوی رێکخراوی کۆمۆنیستە ئێرانییەکان لە باکۆ بوو، کە

ژمارەیەك لە ئەندامەکانی بە دوای دابەزینی لەشکری سوور لە گیلان چوونە نێو ئەنزەلییەوە. میر جەعفەری جەوادزادە"پیشیەوەری و برایانی ئاغایۆڤ لە ریزی پێشەوەیان بوون. سەبارەت بە چۆنێتی دامەزرانی حیزبی کۆمۆنیستی ئێران و هۆکاری ناتەبایی و ناکۆکییان لەگەل بزووتنەوەی جەنگەڵدا مێژوو نووسانی روسی ئاوا دەنووسن:

حیزبی کۆمۆنیست ساڵی 1920 لە سەر بنەمای سۆسیال دیموکرات(عدالت) دامەزرا. لە 2224 ی ژووئەنی 1920 کۆنگرەی حیزبی عەدالەت لە ئەنزەلی گیرا و بڕیاری دا ناوی خۆی بکاتە حیزبی کۆمۆنیست. هەروەها بەرنامەی حیزبی لە ژێر دروشمی وەدیهاتنی هەرچی خێراتری بڕگە و داخوازەکانی بەو شێوەیەی خوارەوە پەسند کرد: وەدەر نانی ئیمپریالیستەکانی بەریتانیا و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی کۆیلەتی 1919 ی ئێران و بەریتانیا رووخانی بنەماڵەی قەجەر و دامەزرانی رژێمێکی گەلی لە ئێران، دامەزراندنی دەوڵەتێکی دیموکراتیك و سوپای نیشتیمانی، دامەزرانی پەرلمانی دامەزرێنەران لە سەر بنەمای هەڵبژاردنی راستەوخۆ و دەنگدانی شاراوەی خەڵك. کۆنگرە هەروەها کۆمیتەیەکی ناوەندیی هەڵبژارد و بڕیاری دا پشتیوانی لە کوچك خان بکا.

یەکە شۆڕشگێڕەکانی گیلان، ئەو ناوچەیەیان لە سوپای شا پاك کردەوە و لە مانگی ژوئیەدا مەنجیل و بەشێك لە پارێزگای مازەندەرانیان هەتا بارفرۆش(بابل) گرت، بەلاّم لە مانگی ژوئیەی 1920دا ئەو بەرە یەکگرتووە لە گیلان لێکترازا. ناکۆکی کەوتە نێوان کوچك خان و کۆمۆنیستە ئێرانییەکان، کە لەو کاتدا مۆرەی وردەبۆرژۆوایان تێدا بوو و شیاوی ئەوەش نەبوون، کە رێبەرایەتیی بزووتنەوەی ئازادیی نەتەوەیی بگرنە ئەستۆ... مۆرە چەپەکان لە چوارچێوەی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستدا لەگەڵ تاقمی ئیحسانولاّخان یەکیان گرت و پەسندی ئەوەیانی کرد، کە ئێران هەر ئێستا ولاّتێکی سەرمایەدارییە و دەبێ شۆڕشی سۆسیالیستی لەم ولاّتەدا بکرێ. ئەوانە چووونە رەشت و ئەنزەلی و شوێنەکانی دیکەی ئێران و دەستیان بەسەر مال و سامانی وردە مالیك و وردەبۆرژۆوا و سەنعەتکاران وتەنانەت جوتیارانیشدا گرت. لە وەها هەلومەرجێکدا دەستیان کرد بە بانگەشەی دژ بە ئایین و قورئان و پیاوانی ئایینی. ویستیان ژنان دەمودەست چارشێو و پەچە و رووبەند لە سەر لادەن و دەستیان لە هاریکاریکردنی کوچك خان و بۆرژۆوازیی نەتەوەیی هەڵگرت.

کوچك خان دژی پەرەگرتنی بزاڤی شۆڕشگێری و جێبەجێکرانی ریفۆرمی زەوی وزار بوو، کە لەوانەبوو جوتیاران وا لێ بکا بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەوەڕێخەن. ناسەقامگیریی سیاسی یەکێك

بوو لە تایبەتمەندییە سرووشتییەکانی وی. ئەو بە نهێنی دانوستانی لەگەڵ نوێنـەرانی دەوڵـەتی شـا کرد و کۆتایی بە کردەوەی سەربازی و چـەکداری دژی سـوپای شـا هێنـا. تـەواوی ئـەم ئـەنگیزە و گرۆپیانە هاوپەیمانەکانی گیلانی بەرەو تیداچوون برد... لە 19ی ژوئیەی 1920دا کوچك خان بـە گرووپەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە رەشتی بە جێهێشت و پـەنای بـردە بـەر لێڕەوارەکـانی ناوچـەی فومەن. ئەو تاقمە چەپەی، کە لە کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیست جیا بوونەوە لەگەڵ تـاقمی ئیحسانولاخان لە رەشت لە 31ی ژوئیەدا دەوڵەتێکی نوێیان پێك هێنا.

دیارە داوەریکردنی مێژوونووسانی روس لە سەر کوچـك خـان راسـت نییـە و خوێنـەر لـە دووتوێی نووسراوەکانیاندا هەست بە دژواز وێژی و لاوازیـی بەڵگاندنـەکانیان لـە سـەر مـیرزا کوچـك خـان و بزووتنـەوەی جەنگـەڵ دەکـا. راسـتییەکەی ئەوەیـە، کـە زێدەڕۆییـەکانی ئیحسانولاخان و هاورێ کۆمۆنیستەکانی ئەو، کـە لـە بـاکۆوە هاتبوونـەوە و مێژوونووسـانی روسی، کە خۆیشیان بە ناچاریدانیان بە هێندێك لەم زێدەڕۆییانەدا هێناوە میرزاکوچك خانیـان وەڕەز کردبوو و ئەوە ناسەقامگیری ئەو نەبوو، کـە بـووە هـۆی ناتـەبایی لـە هاوپەیمانـەکانی گیلاندا. مەسەلەی دانوستان لەگەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی شا ش، کە مێژوونوسانی روس ئاماژەی پێدەکەن پێوەندی گرتنی نوێنەرانی دەوڵەتی موشیرودەولە بە مـیرزا کوچـك خانـەوە بـوو. لـە راستیدا پاش رووخانی حکوومەتی وسوقودەولە گرێدەری پەیمانی 1919 و هاتنەسـەر کـاری موشیرودەولە، کە ئەو گرێبەستەی بە هەڵپەسـێراوی هێشـتەوە و دەیویسـت هەڵیوەشـێنێتەوە یەکێك لە ئامانجەکانی کوچك خان وەدی هاتبوو و میرزا، کە گەلێ جار رایگەیاندبوو مەبەست و ئامانجی ئـەم نەهێشـتنی دەسـەڵاتی بێگانانـە لـە سـەر ئێـران رای لـە سـەر حکوومـەتی موشیرودەولە باش بوو. لە سەر گۆڕانی شێوازی میرزاکوچك خان و دژکردەوەی کۆمۆنیستەکان لەبەرامبەریدا مورخ‌الدولەی سپێهر لە کتێبی "ئێرانی لە شەڕی مەزن"دا ئاوا دەنووسێ:

... موشیرودەو لە سەرۆکی وەزیران، سەرداری مەزنی، کە بە ئازادیخوازی بە نێوبانگ بـوو ناردە لای میرزا کوچك خان بۆ چاککردنی رەوشەکە، و میرزا، کە لە نـاخی دڵـەوە دژی بـیر و باوەڕی کۆمۆنیزم بوو وەفاداری و متمانەی خۆی بۆ کابینەی موشیرودەولە دەرخست و پێشی بە هاتنی 700 کەسی دیکەی خەڵکی بادکوبە گرت، کە بە پاپۆڕ بەرەو ئەنزەلی دەهاتن و لەبەر ئەوەی، کە ئیحسانولاخان ئامادە نەبوو لەگەڵ دەوڵەت رێککەوێ میرزا بەجێی هێشت و رووی کـردە جەنگـەڵ و لایەنگرەکانیشـی رەگـەڵی کـەوتن و رێکخراوێکـی دیکـەیان دامـەزرانـد. ئیحسانولاخان و خالۆ قوربانیش کۆمیتەیەکیان بە ناوی "لاوانی کۆمۆنیستی ئێران" دامەزراند

و خەڵکی ڕەشتیان هاندا، کە لە سەر سینگیان هێمایداس و چەکوچ هەڵکەنن. هەربۆیەش ژمارەیەکی زۆر لە مزگەوتەکاندا کۆبوونەوە و ڕایانگەیاند، کە حەزیان لییە ڕەگەڵ میرزا کەون. خالۆقوربان و فەرماندەکانی دیکە چەندین جار شەڕیان بە میرزا فرۆشت، بەڵام بە تێکشکاوی لە جەنگەڵەوە گەڕانەوە و ئەو ناکۆکییە هەر هەبوو هەتا حەیدەر عەموئۆغلی هاتە ئێران...

پاشدابڕانی میرزاکوچك خان لە ئیحسانولاخان و هاوڕێ کۆمۆنیستەکانی حکوومەتێکی شۆڕشگێڕیی نوێ لە ڕەشت بە سەرۆکایەتیی ئیحسانولاخان دامەزرا و میر جەعفەری جەوادزادە، کە دوایی بوو بە پیشەوەری لەو حکوومەتەدا بە پۆستی کۆمیسێری کاروباری نێوخۆییەوە ڕۆڵی یەکەمی دەگێڕا. یەکەمین ڕۆژنامە کۆمۆنیستەکانی ئێران بە ناوی "کامۆنیست" و "شۆڕشی سوور" و "حریت" "حقیقت" یش لە ئێران دەرچوون، کە ئەو یا بەڕێوەبەریان بوو یا بەسەریان ڕادەگەیشت. و ئاشکرایە، کە ڕوسەکان ئامێری چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم ڕۆژنامانەیان لەبەر دەستی نابوو. لە سەر کردەوەی ئەم حکوومەتانە لە کتێبی "سیاسەتی دەوڵەتی سۆڤیەتی لە ئێران"دا، کە مەنشوری گورگانی نووسیوێتی ئاوا هاتووە:

پاش جیا بوونەوەی میرزا پروپاگەندەی بۆلشەڤیکەکان گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. تەواوی خەڵکی ڕشتیان ناچار کرد، کە هێمایداس و چەکوچ لە سەر سینگیان هەڵکۆڵن. دەوڵەمەند و دەرەبەگ و دەمڕاستەکانیان بە ڕۆژ بە زۆرەملی دێنان و شەقامیان پێ دەماڵین. تەنیائیحسانولاخان و خالۆقوربان لە نێو بەرپرسە کۆمۆنیستەکاندا ئێرانی بوون، کە هەموو ڕۆژێ لە ڕێڕەوە گشتییەکاندا بە تین و تاو وتاریان دەدا و بە جەوهەری سوور ڕاگەیەندراویان چاپ دەکردن و بە دیوارەوەیان دەدان..، بەڵام بادکوبەییەکان، کە زمانی فارسییان نەدەزانی و بە تورکی قسەیان دەکرد و بە زۆری ناوی مەزدەکیان"وەك کەسێك، کە سیستەمی هاوبەشیی بۆ یەکەم جار لە ئێراندا کردە باو" لە سەر زار بوو و دەیانگوت"رحمتليك مزدك"(واتە خوالێخۆشبو مەزدەك" لە فلانە ڕێکەوتدا فەرمووبووی....

خەڵکیان لە تەمەنی 18 هەتا 45 ساڵی کۆکردەوە. بۆ سەرکەوتن لە کاروباری خۆیاندا بەو شێوەی، کە لە ڕوسیا باو بوو بژیویان لە دەستی خۆیاندا پاوان کرد و هەر کەس چووبایەتە سەربازی ڕۆژێ لاوێچێکیان برینج پێ دەدا. هەر کەس خۆی لە سەر بازی بواردبا بێ بەش دەبوو... فەرماندەریی هێز لە ئەستۆی کارژانۆڤی ڕوسی بوو. هێز بە گشتی پێکهاتبوو لە 200 کەسی گورجی و هەرمەنی و 1200 کرێکاری ئێرانیی بادکوبەیی. ئەو ژمارەیە لەو کەسانە پێکهاتبوون، کە میرزا جارێکی چەك کردبوون. بەو جۆرەش چەکیان بۆ پەیدا دەکردن،

که ئەو برینجەی، کە لە رەشت بە زۆرەملی و بە خۆڕایی لە خەڵکیان دەستاند بە ئەفسەرە روسییەکاندا دەیاننارده بادکوبه و دەیاندا بە چەك و هەر وەها خەڵکی روسیاشیان، کە خەریك بوون لە قاتی و قڕیدا تێدا بچن لە برسێتی رزگار دەکردن. هەر خاوەن مڵکێکیش بەربەرەکانێی کردبایە ئیعدامیان دەکرد لەو نێوەدا پزیشکێك، کە خاوەن مڵك بوو ئیعدام کرا...

لە سەر کار و کردەوەی حکوومەتە تەمەن کورتەکەی ئیحسانولڵاخان لە بەشێك لە گیلاندا هەر ئەم کتێبە لە زمان بیرەوەرییەکانی دوکتۆر لووسۆئۆری فەڕەنسییەوە، کە ئەو کات سەرۆکی قوتابخانەی تاران بووە ئاوا دەنووسێ:

... شێوازی بۆلشەڤیکەکان لەم وڵاتەدا لەگەڵ شێوازی ئەوان لەوڵاتانی دیکەدا جیاوازییەکی نییە. لیستەی کردەوەی ناشیرن و جینایەتەکانیان دوورودرێژە. ئەو زیانانەی، کە لە خەڵکیانداون تەنیا لە شاری رەشتدا لە بیست ملیۆن قڕان پترە. سەربازیی بە زۆر لە تەمەنی 18 هەتا 45 ساڵی، بەشکردنی بژیو (جیرە بەندی) و بڕینی ئەو بەشەش لە باقی خەڵك، کوشتنی دیلەکانی شەڕ لە لایەن ئیحسانولڵاخان و لاوە کۆمۆنیستەکانییەوە لە 19 ئوتدا و داسەپاندنی مەرگ بەسەر ئەفسەرانی قەزاقی لەشکری باکووریدا، کە لە کاتی هێرشی بۆلشەڤیکییەکاندا تیدامابوون و کوچك خان رزگاری کردبوون، بە تاڵان بردن و سووتاندنی بازار، کاولکردنی مزگەوتێك، پارە ئەستاندنی زۆرەملی لە دەوڵەمەندان و دزینی تەواوی برینجی گیلان و راگواستنی بۆ باکو لە سەرەتای سپتامبری 1920دا...

بەندەری ئەنزەلی و هەموو عەمبارەکانی خەڵکی بە تاڵان بردرابوون بۆلشەڤیکەکان لە پاش خۆیانەوە نە کەلوپەلی ماڵ و نە خواردەمەنی و نە هیچ شتێکی بە نرخیان بۆ کەس نەهێشتبۆوە و دەستیان رەهەمووشت خستبوو، وەك بڵێی ماڵ و سامانی خەڵکیان بە دەسکەوتی شەڕ زانیبێ. پەنابەرانی ئێرانی لەبەر ئاگر و ئاسنی شۆڕش رایان دەکرد. هێندێ بەرەو تاران و هێندێ بەرەو زەنجان و هەمەدان تێیان تەقاند. ئەو خەڵکە بە ناچاری ماوەی 500 کیلۆمەتریان بە پێیان و لە قرچەی گەرمای هاویندا بڕی و زۆربەشیان ژن و منداڵیان لەگەڵ بوو. ئێمە لە تاران دیتمانن کافر بەزەیی پێیانداهات. هەموو رووت وقووت و زۆربەیان چەند رۆژ بوو زەوادیان نەشکاندبوو. چیها لەم لێقەوماوانە لە برسان وشك هەڵاتن یا لە لێوار رێگە لە گەرمان مردن...

لە کۆنگرەی نەتەوەکانی خۆرهەڵاتدا، کە رۆژی یەکەم هەتا حەوتەمی سپتامبری 1920 بە سەرۆکایەتیی زینۆوێڤ سەرۆکی کۆمۆنیستی نێونەتەوەیی(کۆمین ترێن) لە باکۆ گیرا بڕیار

درا حکوومەتی بۆلشەڤیکیی گیلان بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر ئێراندا بە هێز بکەن. سەرۆکی ئەو وەڤدەی، کە بە ناوی نوێنەرانی کۆمۆنیستەکانی ئێرانەوە لەو کۆنگرەیەدا بەشداربوو حەیدەر عەموئۆغلی بوو، کە لە شۆڕشی ستارخاندا یەکێك بوو لە هاوسەنگەرەکانی وی، بەڵام پاش بەشداربوون لە چەندین کردەوەی تیرۆریستیدا وەك هاویشتنی بۆمب بەرەو پەیتوون و ترۆمبیلی محەممەدعەلی شا و تیرۆری ئایەتوڵا سەیدعەوبدوڵای بێهبەهانی هەڵاتبوو بۆ روسیا و رەگەڵ بۆلشەڤیکەکان کەوتبوو. حەیدەر عەموئۆغلی لە کۆنگرەی نەتەوەکانی خۆرهەڵاتدا، کە بە مەبەستی پەرە پێدان بە شۆڕشی کۆمۆنیستی لە ئاسیادا پێکهاتبوو، وای نواند، کە کۆسپی سەرەکیی بەردەم کۆمۆنیستەکان لە گیلاندا میرزاکوچك خانە و ئەگەر ئەم لە سەر رێگە لابردرێ، رێگە بۆ بڵاوبوونەوەی کۆمۆنیزم بە سەرانسەری ئێراندا خۆش دەبێ. زینۆویێڤ سەرۆکی کۆنگرە و نەریمانۆڤ سەرۆکی کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتی کەوتنە ژێر کارتێکەریی قسەکانی حەیدەرعەموئۆغلییەوە و پاش کۆتایی هاتنی کۆنگرەی نەتەوەکانی خۆرهەڵات ئەویان بە 500 کەسی چەکدارەوە بە کەشتی ناردەوە بۆ ئێران. مورخ‌الدولەی سپێهر سەبارەت بە کردەوەی سەربازیی حەیدەرعەمووئۆغلی لە گیلان و چارەنووسی ئەو لە کتێبی "ئێران لە شەڕی مەزن"دا دەنووسێ:

پاش کۆتایی هاتنی کۆنگرە حەیدەر عەموئۆغلی بە کۆمەڵێك چەکدارەوە هاتەوە گیلان و کەوتە گەڵ شۆڕشگێرەکان. ماوەیەك لەگەڵ هێزەکانی جەنگەڵدا شەڕی کرد و جارێکی هەتا سۆمعەسەرا چووە پێشێ. ئاخری هاتە سەر ئەوەی کە جەنگەڵییەکان و شۆڕشییەکان(کۆمۆنیستەکان) پێکەوە ئاشت بکاتەوە هەربۆیەش لە رێگەی دۆستایەتییەوە بۆ چوو و چووە لای میرزا و هەوڵیدا لەگەڵ خۆیدا بیباتە رەشت، بەڵام میرزا خۆی بوارد، لەبەر ئەوەی کە یەکەم لە کۆمۆنیستەکان دڕدۆنگ بوو و بڕوای پێیان نەبوو دووەم ئەوەی کە کەسانێك بە قازانجی خۆیان لێکیان تیژ دەکردن. ئاخرییەکەی ئاگری دژایەتیکردن و دوژمنایەتی وەها بڵێسەی کێشا، کە ئیحسانولاخان و حەیدەرعەموئۆغلی و زەڕڕە و حسابی بڕیاریان دا بچنە جەنگەڵ و میرزا تیرۆر بکەن، بەڵام میرزا بە پیلانەکەی زانین و دەستپێشخەریی کرد و فەرمانی دا حەیدەر خان و هاوڕێکانی لەو کۆمیتە هاوبەشەدا، کە بڕیار وابوو لە مەلاسەرا پێکبێ قۆڵبەست بکەن.دارودەستەکەی میرزا لە پێشدا ئەو خانوەیان سووتاند، کە کۆمیتەکەی تێدا پێکهاتبوو و ئیحسانوڵلا و خالۆقوربان لە

سوتمانەکەدا بۆی دەرچوون، بەڵام حەیدەرعەموئۆغڵی لەداو کەوت و بەر لەوەی بیبەنە لای میرزا بە شێوەیەکی سامناك کوشتیان.

هەر ئەو رۆژە بڕیار وابوو، کە سەرکردە کۆمۆنیستەکان لە هەموو جییەك بکوژرێن: محەممەدخانی کلوب لە ئەنزەلی و یارتانۆف لە لاهیجان کوژران و کەریمخان و یارمراد و خاڵۆمرادە بچکۆڵیش وەبەر هاتن و بریندار بوون. پاش ئەو تیرۆرانە میرزا شەڕێکی قورشی دژی کۆمۆنیستەکان دەست پێکرد و شاری رەشتی گرت، بەڵام، چونکی پێی ئیدارە نەدەکرا گەڕایەوە جەنگەل و کۆمۆنیستەکان دیسان هاتنەوە نێو رەشت.

## گرێبەستی 1921ی ئێران و سۆڤیەتی

مۆرکردنی گرێبەستی 1921ی ئێران وسۆڤیەتی، کە دەراوەکەی لە سەردەمی حکومەتی موشیرودەلەی سوپاسالاردا خۆش کرابوو بە خاڵێکی وەرسووڕانی مێژووی پێوەندییەکانی نێوان ئێران و روسیا دەژمێردرێ.

هەتا پێش واژۆکرانی ئەم گرێبەستە، سەرەڕای ئەوەی کە پێوەندیی نێوان ئێران و سۆڤیەتی هەر بەردەوام بوون و ئەو گفت و بەڵێنانەی، کە روسەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی پوانەکانی دەوڵەتی تەزاری لە ئێراندا بە ئێرانییەکانیاندا بوو، دیسانیش بە هۆی بوونی بریتانییەکان لە ئێراندا و هەروەها پشتیوانیی ئەوان لە دژبەرانی دەوڵەتی سۆڤیەتی، هێشتا پێوەندییەکان نێوان ئێران و روسیا نەگەڕابۆوە سەر دۆخی ئاسایی خۆی و لەم نێوەدا هەوڵەکانی روسییەکان بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی کۆمۆنیستی لە گیلاندا قەیرانەکانی نێوان ئەو دوو وڵاتەی قووڵتر کردەوە، بەڵام پاش هەرەسهێنانی حکوومەتی وسوقودەوله، کە روسەکان بە مۆرەی بەریتانیایان دەزانی بوارێکی لەبارتر بۆ دامەزراندنی پێوەندیی دۆستانەی نێوانیان خۆشتر بوو، و موشیرودەوله بە ناردنی عەلی-قولیخان(مشاورالممالك) بۆ مۆسکۆ هەوڵیدا بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان و واژۆکردنی گرێبەستێکی دۆستایەتیی لە نێوان هەردوو وڵاتدا. دانوستانەکانی مشاورالممالك لە مۆسکۆ بە ئاکام گەیشت و پێشەکیی گرێبەستی دۆستایەتی و چارەسەریی کێشە و ناکۆکییەکانی نێوان هەر دوو وڵات لە 26 بڕگەدا ئامادە کرابوو، کە رووخانی دەوڵەتی موشیرودەولەی بەسەر داهات و سپاسالاری مەزن رۆژی یەکەمی نۆڤەمبەری ساڵی 1920 بوو بە سەرۆکی وەزیران. مشاورالممالك ئاکامی دانوستانەکانی خۆی بە سپاسالاری مەزن راگەیاند و ئەویش پێی راگەیاندەوە، کە کۆکە لە سەر ئەو بنەمایانەی ئەوان لە سەر ی رێککەوتوون.

مشاورلمالك له ماوەی چەند کۆبوونەوەدا لەگەڵ چیچرین کۆمیسێری کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی و جێگرەکەی وی کاراخان ئاخرۆ لە سەر دوا دەقی گرێبەستەکە رێککەوتن، لەلاّم بەر لە واژۆکردنی گرێبەستەکە کۆدەتای 21ی فێبرییەی 1921 لە تاران کرا. سەید زیائۆدینی تەباتەبایی سەرۆکی کۆدەتاکە لەگەل ئەوەدا، کە بە لایەنگری بریتانییەکان ناوی زڕابوو و هەر بە یارمەتیی ئەوانیش بەدسەلاّت گەیشتبوو خۆی لە یەکەمین کەسانێك بوو، کە پاش شۆڕشی بۆلشەڤیکی چووبووە قەفقاز و پێویستیی دامەزراندنی پێوەندییەکی دۆستانەی لەگەل حکومەتی سۆڤیەتی بەوان راگەیاندبوو. هەربۆیەش بە بێ تێبینی لە سەر گرێبەستی دۆستایەتیی ئێران و سۆڤیەتی لەگەڵیان رێککەوت و رێورەسمی واژۆی گرێبەستەکە لە رۆژی 26ی فێبرییەی 1921دا واتە پێنج رۆژ پاش کۆدەتا لە جێگەی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سۆڤیەتی جێبەجێ کرا.

## گرێبەستی 1921ی ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتی

### یاسا

ئیزنی بەسترانی پەیمانی دۆستایەتیی نێوان هەر دوو دەوڵەتی ئێران و کۆماری سۆڤیەتیی روسیا پەسند کراوی 26ی فێبرییەی 1921.

برگەی یەکەم: پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی بە پشتبەستن بە نامەی نێردراوی ژمارە 1600 ی رێکەوتی 26ی فێبرییەی 1921، کە لە لایەن نوێنەری دەسەلاّت پێدراوی دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا بۆ وەزیری دەرەوەی ئێران نێردراوە، ئەو ئیزنە بە دەوڵەت دەدا، کە پەیمانی دۆستایەتی نێوان نوێنەرانی دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی کۆماریی سۆڤیەتیی روسیا، کە لە 26 برگە پێکهاتووە و خراوەتە سەر ئەم برگەیە، پەسند بکا.

### دەقی پەیماننامەکە

لەبەر ئەوەی کە دەوڵەتی ئێران لە لایەك و دەوڵەتی کۆماری یەکێتیی سۆڤیەتی تەواو لە سەر ئەوە کۆك بوون، کە لە داهاتوودا پێوەندیی دۆستایەتی و دراوسێیەتی لە نێوان هەر دوو گەلی ئێران و سۆڤیەتییدادابمەزرێ، هاتنە سەر ئەوەی کە لەم بارەوە دانوستان بکەن و بۆ ئەم مەبەستە ئەم کەسانەی خوارەوەیان کردووەتە نوێنەری خۆیان.

لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە عەلی قولی خانی مشاورلممالك لە لایەن دەوڵەتی کۆماریی یەکێتیی سۆڤیەتییشەوە گیۆرکی ڤاسیلیڤیچ چیچرێن و لۆمیخاییلۆڤیچ کاراخان.

ئەم نوێنەرە دەسەڵات پێدراوانە پاش خستنەڕووی متمانە نامەکان (اعتبار نامە) ی خۆیان، کە نوێنگەی ڕێسا و پرەنسیپی پێویستن و ئەوەی لە خوارەوە باسی دەکرێ ڕێککەوتن:

بەشی یەکەم: دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا بە پێی ڕاگەیەندراوەکانی خۆی لە پێوەندی لەگەڵ بنەماکانی سیاسەتی روسیا دەرهەق بە گەلی ئێران، کە لە نامە و بەڵگەنامە نێردراوەکانی ژمارە 14 یا شریتی 1918 و 26ی 1919دا هاتووە جارێکی دیکەش بە فەرمی ڕادەگەیەنێ، کە بە تەواوەتی چاوپۆشی لەو سیاسەتە ملهوڕانەیە دەکا، کە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی روسیا، کە بەدەستی کرێکاران و جوتیاران لە نێو چوون بەسەر ئێراندا سەپابوون.

بە پێی ئەوەی باسی کرا و بە هیوای ئەوەی کە گەلی ئێران سەربەست و بەختەوەر بێت و بتوانێ بەئازادی کەڵك لە ماڵ و سامانی خۆی وەرگرێ دەوڵەتی سۆڤیەتی هەموو پەیماننامە و بەڵێننامە و گرێبەستەکانەی، کە دەوڵەتی تەزاری لەگەڵ ئێرانی واژۆ کردوونە و مافی گەلی ئێرانی تێدا پێشێل دەکرا، پووچەڵ ڕادەگەیەنێ.

بەشی دووەم : دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا بێزاریی خۆی لە تەواوی ئەم سیاسەتانەی دەوڵەتی روسیای تەزاری ڕادەگەیەنێ، کە بە بێ ڕەزامەندیی گەلانی ئاسیایی و بە بیانووی دابینکردنی سەربەخۆیی ئەو گەلانە لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپی لە سەر حسێبی خەڵکی خۆرهەڵات پەیمانگەلێکی دەبەستن، کە لە ئاکامدا دەبووە داگیرکردن و کۆیلەکردن.

دەوڵەتی سۆڤیەتیی بە بێ هیچ مەرجێك نکوڵی لەو سیاسەتە جینایەتکارانەیە دەکا، کە نەك سەربەخۆیی وڵاتانی ئاسیایی زەوت دەکرد بەڵکو نەتەوە زیندووەکانی خۆرهەڵاتیشی دەکردە پارووی تاڵانچییە برسییە ئەورووپیەکان و دەستدرێژییە بەردەوامەکانیان.

بە پێی ئەوەی گوترا و بە پێی ئەو بنەمایانەی لە بەشی یەکەم و چوارەمی ئەو پەیمانەدا باس کران، دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا خۆی لە هەر چەشنە هەوڵێك دەبوێرێ، کە ببێتە هۆی لاوازبوون و نەمانی سەروەریی ئێران و تەواوی ئەو پەیمان و گرێبەستانە پووچەڵ ڕادەگەیەنێ، کە دەوڵەتی پێشووی روسیا لەگەڵ وڵاتێکی دیکەدا بە زیانی ئێران و لە سەر ئێرانی مۆر کردوون.

بەشی سێیەم: هەر دوو دەوڵەتی مەزنی پەیماندەر ڕەزامەندیی خۆیان دەردەبڕن، کە بە پێی کۆمیسیۆنی سنووریی 1881 سنوورەکانی نێوان ئێران و روسیا پەسند دەکەن و لەبەرچاوی

دەگرن و هەروەها لەبەر ئەوەی کە دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا نایەوێ کەڵك لە بەهرەی سیاسەتی داگیرکەرانەی دەوڵەتی تەزاریی پێشوو بێنێ چاوپۆشی لە کەڵك وەرگرتن لە دوورگەکانی عاشورادە و باقی دوورگەکانی بەستێنی ئەستەرئاباد(گورگان)ی ئێران دەکاو هەروەها گوندی فیروزە لەگەڵ زەوییەکانی دەوروبەریدا، کە بە پێی گرێبەستی 28ی مای 1893 لە لایەن ئێرانەوە خراونەتە سەر روسیا دەدرێنەوە بە ئێران.

دەوڵەتی ئێران لە لایەن خۆیەوە رەزامەندیی خۆی لەوە رادەگەیەنێ، کە شاری سەرەخس، کە بە سەرەخسی روس یا کۆنە سەرەخس ناسراوە بە زەوییەکانی دەوروپشتییەوە، کە دەچێتەوە سەر رووباری سەرەخس هەروا بەدەست روسیاوە بێ.

هەردوو لای گرێبەستەکە بە مافی وەك یەك کەڵك لە رووباری ئەترەك و باقی رووبارەکان و ئاوەکانی سنووری وەردەگرن و هەروەها بۆ دیاریکردنی یەکجارەکیی کەڵك وەرگرتن لە ئاوەکانی سنووری و بەمەبەستی چارەسەرکردنی تەواوی ئەو کێشانەی لە سەر سنوورەکان و لە سەر خاك هەیانە کۆمیسیۆنێك لە نوێنەرانی ئێران و روسیا پێکدا.

بەشی چوارەم: بە پشتڕاستکردنەوەی ئەوەی کە هەر کام لەو گەلانە مافی ئەوەیان هەیە چارەنووسی سیاسیی خۆیان بە بێ هیچ کۆسپێك و بە ئازادییەوە دیاری بکەن، هەر کام لەم دوو لایەنە سەرەڕای چاوپۆشی لە دەستێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی یەکتر بە شێوەی جیددی لەوەها شتێك خۆ دەبوێرن.

بەشی پێنجەم: هەر دوو لایەن کۆکن لە سەر ئەوە کە:

1ـ لە چوارچێوەی وڵاتی خۆیاندا ئیزنی پێکهاتنی هیچ تاقم و گرووپ و دەستە و رێکخستن و تەنانەت تاکەکەسێکیش نەدەن، کە دژی ئێران و روسیا و هەروەها وڵاتە هاوپەیمانەکانی گەڵ روسیا خۆ رێکخەن.

هەروەها لە خاکی خۆیاندا بەر بە وەرگرتنی سەرباز و کەلوپەلی سەربازی و چەکوچۆڵ یش بۆ هێزەکانی ئەم جۆرە رێکخراو و گرووپگەلە بگرن.

2ـ ئیزن نەدرێ بە هیچ وڵات و رێکخراوێك گرینگ نییە لە ژێر هەر ناو و نیشانێکدا، بە دژی دوو لایەنی ئەم گرێبەستە مەزنە شتێکی وا بێننە نێو چوارچێوەی یەکێك لەم دوو لایەنە، کە لەوانەیە دژی لاینەکەی دیکەی پەیمانەکە بێ.

3ـ دەبێ لە خاکی خۆیان و هاوپەیمانەکانی دیکەیاندا پێش بە مانەوەی هێزی سەربازی و لەشکریی وڵاتێکی دیکە بگیردرێ، کە لەوانەیە مانەوەیان ببێتە هۆی مەترسییەك بۆ سەر سنوورەکان یا بەرژەوەندی یا ئاسایشی لایەنەکەی دیکەی پەیمانە مەزنەکە.

بەشی شەشەم: هەر دوو لایەنی مەزنی پەیمانەکە، ڕێككەوتوون لە سەر ئەوەی کە هەرکات وڵاتێکی دووەم ی دیکە بیەوێ بە دەستێوەردانی سەربازی سیاسەتی داگیرکارانە لە خاکی ئێراندا بەڕێوەبەرێ یا خاکی ئێران بکاتە ناوەندێك بۆ هێرشە سەربازییەکانی خۆی دژی روسیا و هەر وەها ئەگەر مەترسییەك هەڕەشەیەك لە سنوورەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی و هاوپەیمانەکانی بکاو لەو کاتەدا حکوومەتی ئێران پاش ورياییدانی دەوڵەتی سۆڤیەتی خۆی نەتوانێ ئەو مەترسییە بڕەوێنێتەوە دەوڵەتی سۆڤیەتی مافی ئەوەی هەیە هێزی سەربازیی خۆی بێنێتە نێو وڵاتی ئێران بۆ ئەوەی بە مەبەستی بەرگری لە خۆی هەوڵی پێویست بدات.

دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا لە سەر یّتی، کە پاش رەواندنەوەی مەترسییەکە دەمودەست و بە بێ خۆخافلاندن هێزەکانی خۆی لە کەوشەنی ئێران بەرێتە دەرێ.

بەشی حەوتەم ـ بە پێی ئەوەی کە ئەو تێبینیانەی بەشی شەشەم دەتوانن ئاسایشی دەریای خەزەریش لەخۆ بگرن، هەر دوو لایەنی مەزنی پەیمانەکە کۆکن لە سەر ئەوەی ئەگەر مۆرەی دەوڵەتی دیکە(لایەنێکی جیا لەو دوو هاوپەیمانە) لە نێو کەسانی هێزی دەریایی ئێراندا هەبن، کە بەمەبەستی دوژمنکاریی روسیا لەویدا مابنەوە دەوڵەتی روسیا مافی ئەوەی هەیە، کە داوای دەرکردنیان لە دەوڵەتی ئێران بکا.

بەشی هەشتەم ـ دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا رادەگەیەنێ، کە لەو سیاسە ئابوورییانە بێ بەرییە، کە حکوومەتی تەزاری لە خۆرهەلاّتدا بەڕێوەی دەبردن و نەك بە مەبەستی پەرە پێدان و گەشەی ئابووری و پێشکەوتنی گەلی ئێران بەڵکو بەمەبەستی کۆیلەکردنیان لە رووی سیاسییەوە دراوی دەدانێ.

کەوابوو دەوڵەتی سۆڤیەتی چاوپۆشی دەکا لە هەرچەشنە مافێکی خۆی سەبارەت بەو قەرزوقۆڵەی، کە دەوڵەتی تەزاری بە ئێرانی داون و ئەو قەرزانە پووچەڵ رادەگەیەنێ و هەروەها دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا دەبوورێ لە هەموو ئەو بەهرەیەی، کە بە هۆی ئەم قەرزانەوە دەکەوتنە سەر ئێران.

بەشی نۆیەم ـ دەوڵەتی سۆڤیەتی تەواوی ئەو دراوە نەغدە و ئەو کەلوپەلە گرانبایی و قەرزی بانکیی "بانکی قەرز وەرگری ئێران" و هەروەها تەواوی ئەو سەرمایە و داراییە (منقول

و غیر منقول)ـەی بانکی گۆڕین، کە بە ئێرانی دراون دەکاتـە ملّـك و مـاڵی ئێـران و وەریـان ناگرێتەوە.

لە سەر ئەوەی، کە لەو شارانەدا، کە بڕیارە قونسوولگەریەکانی روسیادابمەزرێن و لەویـدا ناوەندگەلێك هەن، کە سەربە بانکی قەرزوەرگری ئێرانن هەر بە پێی ئەم بڕگەیە دەدرێنە ئێران و دەوڵەتی ئێران رەزامەندیی خۆی دەردەبڕێ، کە دەوڵەتی سۆڤیەتیی بە دڵخوازی خۆی یەکێك لەم خانووانە بە بێ بەرامبەر و بە خۆڕایی، بۆ جێگەی قونسوولگەریی خۆی هەڵبژێرێ.

بەشی دەهەم ـ دەوڵەتی سۆڤیەتییی روسیا هەوڵی سیاسەتی داگیرکەرانەی جیهان(دەوڵەتـە دەرەکییەکان)، کە لە سـازکردنی رێگـەوبان و کێشـانی هێڵـی تەلـەگراف لـەوڵاتانی دیکـەدا بەمەبەستی دابینکردنی ئۆتوریتەی سەربازیی خۆیان دەخەنە پێشەوەی گەشەکردنی گەلان، بـە شتێکی خراپ و چەوت دەزانێ و حەزی لییە، کە کەرەسەی پێوەندی گرتن و تەلەفۆن، کـە بـۆ سەربەخۆیی هەر گەلێك ئیجگار پێویستن، بدرێتە دەست گەلی ئێران و هـەروەها بـە گـوێرەی پێویست ئەو زیانانەی، کە هێزی سەربازیی دەوڵەتی تەزاری لە ئێرانی داون قەرەبوو بکرێنەوە، هەربۆیەش دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا ئەو دامەزراوگەلەی خوارەوە بە بێ بەرامبەر بە تەواوەتی دەداتە گەلی ئێران:

1ـ رێگەوبانە شۆستەکان لە ئەنزەلییەوە هەتا تاران و لە قەزوینەوە بۆ هەمەدان بە تەواوی زەوی و کەرەسە و کەلوپەلی پێوەندیدار بەو رێگەوبانانەوە.

2ـ هێڵەکانی شەمەندەفەر لە جولفاوە هەتا تەورێز و لە سوفیانەوە بۆ دەریاچەی ورمێ بە هەموو کەلوپەل و کەرەسە و ئامرازەکانی راگواستنەوە.

3ـ ئیسکلە و عەمبارەکانی ناوەندی بازرگانی و پاپۆڕە هەڵمییەکان و بەلەمەکان و تەواوی کەرەسە و ئامرازەکانی راگواستن لە دەریاچەی ورمێدا بە هەموو ئەوشتانەوە، کە لەگەڵییەتی.

بەشی یازدەهەم ـ بە سەرنجدا بەوەی کە بە پێـی ئـەو خاڵانـەی لـە بەشـی یەکـەمی ئـەم پەیماننامەیەدا ئاماژەیان پێ کراوە، گرێبەستی واژۆ کراوی رێکەوتی 10ی فێبرییەی 1828 ی نێوان ئێران و روسیا لە تورکەمەنچای، کە بەشی هەشتەمەکەی مافی دەریاوانی لە دەریـای خەزەردا لە ئێـران زەوت دەکـا، پووچـەڵ و بـێ ئیعتبـارە، لەگـەڵ ئـەوەدا لایـەنی پەیمانەکـە رەزامەندیی خۆیان دەردەبڕن لە سەر ئەوەی کە لە کاتی واژۆکرانی ئەم پەیماننامـەوە هـەر دوو لایەن مافی پاپۆڕەوانیی ئازادیان لە ژێر سێبەری ئالای خۆیاندا لە دەریای خەزەردا دەبێ.

بەشی دوازدەهەم ـ دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا پاش ئەوەی کە بە فەرمی وازی لەو قازانج و پوانانە هێناوە، کە لە سەر بنەمای باڵادەستیی سەربازی دامەزراون رادەگەیەنێ، کە جگە لەوانەی، کە بەشی 9 و 10 شدا باسیان کرا ئەو پوانانەی پێشووش، کە دەوڵەتی تەزاری بە زۆرەملی بۆ خۆی و هاووڵاتییەکانی خۆی لە دەوڵەتی ئێرانی ئەستاندبوون پووچەڵ رادەگەیەنێ.

دەوڵەتی سۆڤیەتییی روسیا لە کاتی واژۆ کرانی ئەم پەیماننامەوە تەواوی ئەو پوانگەلە باسکراوانە چ کەڵکیان لێ وەرگیرابێ و خرابنە بواری جێبەجێکردنەوە یان نا، و تەواوی ئەو خاك و زەوییەش، کە بە پێی ئەم پوانگەلە داگیر کراون دەداتەوە دەست دەوڵەتی ئێران، کە نوێنەری خەڵکی ئێرانە.

ئەو زەوی و ملکانەی، کە لە ئێراندا ملکی دەوڵەتی تەزاری پێشوو بوونە باڵوێزخانەی روسیا لە تاران و لە زەرگەندە، بە تەواوی ئەو کەلوپەل و کەرەسەری تێیاندایە و هەروەها شوێنەکان و کەلوپەلەکانی ژەنەراڵ قونسولگەرییەکان و ڤیس قونسولگەرییەکانی پێشووی روسیا لە ئێراندا هەروا لە ملکایەتیی روسیادا دەمێننەوە.

بەڵام با ئەوە بڵێین، کە دەوڵەتی سۆڤیەتییی روسیا چاوپۆشی دەکا لە مافی ئیدارەکردن و بەڕێوەبردنی گوندی زەرگەندە، کە پێشتر مافی دەوڵەتی پێشووی تەزاری بووە.

بەشی سێزدەهەم ـ دەوڵەتی ئێران لە لایەن خۆیەوە بەڵێن دەدا، کە ئەو پوان و ملك و ماڵەی، کە بە پێی ئەم پەیمانە دراونەتەوە بە ئێران بە هیچ دەوڵەت و لایەنێکی دیکەی نەسپێرا و تەواوی ئەم مافانە بۆ گەلانی ئێران بپارێزێ.

بەشی چواردەهەم ـ بە پشتڕاستکردنەوەی گرینگیی بەروبووی دەریایی لێوارەکانی خەزەر بۆ بژیوی خەڵکی روسیا، دەوڵەتی ئێران پاش هەڵوەشاندنەوەی ئیعتباری یاسایی ئەوەی ئێستا لە بەرامبەر ئەو بەرووبووەدا لە سەر یەتی ئامادەیە گرێبەستێك لەگەڵ ئیدارەی خۆراك و بژیو(ارزاق) لە سەر راوی ماسی بە مەرجگەلێك، کە هەتا ئەوکات روون دەبێتەوە، مۆر بکا.

هەروەها دەوڵەتی ئێران ئامادەیە، کە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا بکەوێتە دانوستانەوە و وای رێکبخا، کە ئێستاش هەتا ئەوکاتەی هەلومەرجی باسکراو دەرەخسێ، رێگەی گەیاندنی بەروبووە دەرياییەکانی خەزەر بۆ روسیا لە رێگەی ئیدارەکانی بژیو و خۆراکی کۆماری یەکێتیی روسیاوە دابینی بکا.

بەشی پازدەهەم ـ دەوڵەتی روسیا بە سەرنجدان بەو بنەمایانەی باسیکردن لەمەڕ ئازادیی بیرو باوەڕی ئایینییەوە پێی خۆشە کۆتایی بەو بانگەشە ئایینیانە بهێندرێ، کە مەبەستی

جەوهەرییەکەیان کاریگەریدانان لە سەر خەڵك و یارمەتیدان بە پیلانگەلی دڕندانەی دەوڵـەتی تەزاری لە وڵاتانی ئیسلامیدا بووە.

کەوابوو دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا رادەگەیـەنێ کەتـەواوی ئـەو وەفـد و گرووپانـەی، کـە دەوڵەتی تەزاری روسیا لە پیاوانی ئایینیی پێك هێنابوون هەڵوەشاوە رادەگەیەنێ‌و هەوڵ دەدا، کە لەمەودوا وەفدگەلی لەم جۆرە لە روسیاوە نەنێردرێنە ئێران.

دەوڵەتی سۆڤیەتیی روسیا تەواوی زەوی و مڵك و سامانی وەفـدی ئۆرتۆدۆکسـی، کـە لـە ورمییە و هەموو سامانی دامەزراوەکانی دیکەی وەفدی گۆرین بە بێ بەرامبەر و بۆ هەمیشە بە گەلی ئێران، کە دەوڵەتی ئێران نوێنەرێتی دەسپێرێ.

دەوڵەتی ئێران زەوی و مڵك و سـامانی وەفـدی گـۆرین بـۆ سـازکردنی قوتابخانـە و بـاقی دامەزراوگەلی رۆشنبیریی دیکە بەکار دێنێ.

بەشی شازدەهەم ـ بە سەرنجدان بە نامەی نێـردراوی دەوڵـەتی سـۆڤیەتیی لـە رێکـەوتی 25ی ئیـۆنی 1919دا سـەبارەت بـە پووچـەڵکردنەوەیدادوەریی قونسـوولی، هاووڵاتیـانی روسـیایی نیشتەجێ لە ئێران و هەروەها هاووڵاتیانی ئێرانیی نیشتەجێ لە روسیا لە رێکەوتی مـۆرکرانی ئـەم پەیمانەوە لەگەڵ خەڵکی خۆجێیی مافی وەك یەکیان دەبێ و پێ ملی یاسـای ئـەو وڵاتـە دەبـن، کـە تێیدا دەژین و تەواوی کاروباریدادوەرییان لە دادگا و مەحکەمە خۆجێ‌ییەکاندا جێ‌بەجێ دەکرێ.

بەشی حەڤدەهەم ـ هاووڵاتیانی ئێرانی لە روسیا و هەروەها هاووڵاتیـانی روسـیایی لـە ئێـران بـە سەرباز ناگیردرێن و هیچ چەشنە ماڵیاتێکی سەربازی یا خەسارەتێکی سەربازییان لە سەر نییە.

بەشی هەژدەهەم ـ هاووڵاتیانی ئێرانی لـە روسـیا و هـەروەها هاووڵاتیـانی روسـیایی لـە ئێراندا خاوەنی ئەو مافانەن، کە جگە لە دەوڵەتە هاوپەیمانـەکانی روسـیا بـەو دەوڵەتگەلـەش دەدرێن، کە تەواو لەگەڵیان دۆستن.

بەشـی نـۆزدە ـ هەردوولایـەنی مـەزنی بـەرعۆدە، لـە ماوەیـەکی کـەمی دوای واژۆی پەیماننامەکە پێوەندییە بازرگانییەکانیان توندوتۆڵ دەکەنەوە.

ئامرازەکانی رێکخستنی هـاوردە و هـەناردەی کـاڵای بازرگـانی ودانـی نـرخ و هـەروەها وەرگرتنی و رادەی ئەو گومرۆکەی، کە لە لایەن ئێرانەوە دەخرێتە سەر کاڵای روسـی بـە پێـی ئەو گرێبەستێك، کە لە لایەن کۆمیسیۆنێکی پێکهاتوو لە نوێنەرانی تایبەتیی هەر دوو لایەن، دیاری دەکرێ.

بەشی بیستەم ـ هەر دوو لایەنی مەزنی بەرعۆدە مافی ترانزیت بە یەکتر دەدەن، کە لە ڕێگەی ئێران یا روسیاوە کاڵا بۆ وڵاتانی دیکە راگوێزن هەروەها نابێ زیاتر لەو گومرۆکەی، کە لە کاڵای دەوڵەتانی دۆستی سۆڤیەتیی روسیا وەردەگیردرێ بخرێتەسەر ئەم کاڵایە.

بەشی بیست و یەکەم ـ هەردوو لایەنی مەزنی بەرعۆدە، لە کەمترین ماوی دوای واژۆکرانی ئەم پەیماننامەیەدا هەوڵی دامەزراندنی پێوەندیی تەلەگرافی لە نێوان ئێران و روسیادا دەدەن، و مەرجە پێویستەکانی پێوەندیی گۆرین لە ڕێگەی تایبەتیی پۆستەو تەلەگرافەوە جێبەجێ دەکرێ.

بەشی بیست و دووەم ـ بۆ سەقامگیریی پێوەندیی و دانوستانەکانی دراوسێیەتی و ئامادەکردنی فاکتەرەکانی نیازپاکی بۆ یەکتر، کە پاش واژۆکرانی ئەو پەیماننامەیە لە نێوان هەر دوو لایەندا پێکدێ، هەر کام لەودوو لایەنە مەزنەی پەیماننامەکە، لە پایتەختی لایەنی بەرامبەرکەی نوێنەری خاوەن دەسەڵاتیان دەبێ، کە چ لە ئێران و چ لە روسیا لە چاو نوێنەرانی سیاسی، بە پێی یاسا نێودەوڵەتییەکان و هەروەها بە پێی یاساگەلی نێو ئەو دوو وڵاتە، مافی پارێزراویی (مصونیت) ی دەرەوەی وڵات و باقی ئیمتیاز و پوانگەلی دیکەشیان دەبێ.

بەشی بیست و سێیەم ـ هەردوو لایەنی مەزنی بەرعۆدە بە نییەت و نیازی پەرە پێدانی پێوەندییەکانی دو لایەن لەو شوێنانەی، کە لە سەر ڕەزامەندیی هەر دوو لایەن دیاری دەکرێ قونسولگەرییەکانیان دەکەنەوە و ماف و دەسترۆیشتوویی قونسولگەرییەکان لە گرێبەستێکی تایبەتدا، کە بەبێ وەدواخستن پاش واژۆکرانی ئەم پەیماننامەیە دەبەسترێ و هەروەها بە پێی یاساو رێسا باوەکان لە هەر دوو وڵاتدا بۆ قونسوولگەرییەکان دیاری دەکرێ.

بەشی بیست و چوارەم ـ ئەم پەیماننامەیە دەبێ لە ماوەی چوار مانگدا پشتڕاست و پەسند بکرێت، گۆڕینەوەی بەڵگەنامەکانی پشتڕاستکردنەوە لە شاری تاران تا ئەو جێگەی بگونجێ لە ماوەیەکی کەمتردا جێبەجێ دەکرێ.

بەشی بیست و پێنجەم ـ ئەم پەیماننامەیە بە هەردوو زمانی ئێرانی و روسی و لە دوو بەرگی ئەسڵیدا نووسراوەتەوە و لە کاتی شیکردنەوەیدا هەردووکیان جێگەی متمانەن.

بەشی بیست و شەشەم ـ ئەم پەیماننامەیە لە پاش واژۆ کرانییەوە لەڕێوە جێگەی متمانە و ئیعتیبارە. بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەوەی گوترا ئەم کەسانەی خوارەوە پەیماننامەی گۆرینیان واژۆ و مۆر کردووە.

لە شاری مۆسکۆ لە 26ی فێبرییەی 1921دا نووسرا.

واژۆ: گێ ئێرگی چێچرین. ل.كاراخان. مشاورلممالك.

# سۆڤیەت و سەرکوتی بزووتنەوەی جەنگەڵ

یەکەمین دەرەنجامی گرێبەستی 1921 گۆڕانی سیاسەتی سۆڤیەتی لە سەر مەسەلەی گیلان بوو و روتشتین وەزیری دەسەلات پێدراوی نوێی سۆڤیەتی، کە پاش واژۆی ئەم پەیماننامەیە هاتبووە تاران چ لە کاتی پێشکەشکردنی نامەی خۆ ناساندنی بە ئەحمەدشا لە مانگی مای 1921 (8ی بانەمەڕی 1300 ی هەتاوی)داو چ لە جێژنی تاج لە سەر نانی ئەحمەد شادا، کە 16ی بانەمەڕ بەڕێوەچوو بەڵێنیدا، کە بۆ خێرایی بەخشین بە کشاندنەوەی هێزەکانی روسیا لە گیلان هەوڵی پێویست دەدەن. لەگەڵ ئەوەشدا هەتا پێش ئەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی گیلان چۆڵ بکەن کۆمۆنیستەکان هەروا بەسەر بەشێکی گرینگی خاکی گیلان بۆ وێنە رەشت و ئەنزەلیدا زاڵ بوون.

یەکێك لە مەرجەکانی سۆڤیەتی بۆ چوڵکردنی ئێران ئەوە بوو، کە هێزەکانی بەریتانیا لە ئێران بچنە دەرەوە. هێزەکانی بەریتانیا، کە بریتی بوون لە 2300 بریتانی و 9300 سەربازی هیندی لە مانگی مای 1921 (10ی بانەمەڕی 1300) قەزوینیان چۆڵ کرد و بەرەو هەمەدان وەڕێکەوتن، بەڵام روسەکان تەنیا بەشێك لە هێزەکانی خۆیانیان بردە دەرەوە و ئەوی دیکەیان هەتا مانگی ژوئیە لە بەشی لێواریی گیلاندا راگرتن و هێرشی هێزەکانی دەوڵەتی بۆ سەرکوتی کۆمۆنیستەکان لە رۆژی 30 ی پووشپەڕ واتە لە مانگی سەرەتاکانی ئوتی 1921دا دەستی پێکرد. لە یەکەمین قۆناغی ئەم هێرشەدا، کە بە فەرماندەیی رەزاخان وەزیری جەنگ کرا، هێزەکانی ئیحسانولاخان لە دەوروبەری تۆنیکابۆن زەبری توندیان وێکەوت و پیس تێ شکان و هێزەکانی دەوڵەت هەتا هەدە کلیۆمەتریی خاکی رەشت چوونە پێشەوە.

لە جەنگەی کردەوە و هەڵمەتە سەربازییەکان لە لاپەڕەکانی گیلان و مازەندەراندا، دەوڵەتی قوامالسلگنە لە تاران لەگەڵ بەرپرسانی سۆڤیەتی خەریکی دانوستان بوو بۆ ئەوەی ئامادەکاری بکرێ بۆ کۆتاییهێنان بە ئاژاوەکە و بەردەستکردنی کۆمۆنیستەکان بەبێ هیچ تێکهەڵچوونێك. روسەکان بۆ هاوکاری ئامادە بوون و کلانترۆڤ مۆرەی سەربازیی سۆڤیەتی خۆی بۆ

ڕێکوپێککردنی کاروبارەکان چووە لای ڕەزاخان. نووسەری کتێبی "سەرداری جەنگەڵ"، کە خۆی بەشداری مێژووی پڕ لە هەوراز و نشێوی شۆڕشی جەنگەڵ بووە هاوکاریی کلانترۆڤ لەگەڵ ڕەزاخاندا بە خاڵێکی وەرسووڕان لە مێژووی شۆڕشی جەنگەڵدا دەزانێ و دەنووسێ:

بوونی (ئاتاشە)ی سەربازیی سۆڤیەتی لە نێو قەزاقانی سوپادا و هاوکاریی ئەو لەگەڵ دەوڵەت هیچ شك و گومانێکی ئەگەر هەتا ئەو کاتە هەشبووبێ نەهێشتەوە و سیاسەتی نوێی سۆڤیەتیی لە هێمای ئەو حاڵەتەی، کە لەدامرکاندنەوەی شۆڕشی جەنگەڵدا گرتبوویە پێش، خۆی ئاشکرا کرد.

کلانترۆڤ پێوەندیی بە ئیحسانولاخان و خالۆقوربانەوە گرت و داوای لێکردن دەست لە بەربەرەکانێ هەڵگرن، بەڵام ئیحسانولاخان ملی نەدەدا. ئاخرییەکەی لە ڕۆژی 22 ی ڕەزبەری 1300 (ئۆکتۆبەری1921) ڕەزاخان فەرمانی دا بەرەو ڕەشت وەڕێکەون. باقی ڕووداوەکە لە کتێبی "سیاسەتی سۆڤیەتی لە ئێراندا " دەخوێنینەوە:

لە مانگی ئۆکتۆبەردا لە جەمشیدئاباد پێکیاندادا و هێزەکانی دەوڵەت شاری ڕەشتیان گرتەوە. ڕەزاخان وەزیری جەنگ پاش گرتنەوەی شاری ڕەشت ڕاگەیەندراوێکی دوورودرێژی دەرکرد و سەرەتا باسی کردەوەی تێکدەرانەی سەربزێو و یاخییەکانی کرد و دواییدانی بەوەدانا، کە لە ساڵی ڕابردوودا لەبەر ئەوەی کە یاخییەکان دەستیاندا بووە دەست بیانییەکان، هێزەکانی دەوڵەت بە زیان و خەساری زۆرەوە ناچار بوون پاشەکشێ بکەن. لە کۆتایی ئەم ڕاگەیەندراوەدا پاش شیکردنەوەی ئەو زیانانەی وە خەڵکی ڕەشت کەوتوون بەڵێنیان پێدرابوو، کە " پاش ئەم کەندوکۆسپانە هەڵتاندەستێنینەوە و دەوڵەت لە ژێر تیریژی شمشێری مندا تەناهی ئێوەی دابین کردووە."

بە کورتی لە کۆمۆنیستەکان خالۆ قوربان و هاوڕێیانی هاتن و خۆیان ڕادەستی هێزە سەربازییەکانی دەوڵەت کرد و پلە و پایەی سەربازییان وەرگرت. ئیحسانولاخان بە تەنیا مایەوە. هێزەکانی دەوڵەت لە لێواری ئەنزەلی مابوونەوە، کە ڕێکخستنی کۆمۆنیستیی ئەنزەلیش لێك هەڵوەشایەوە و ئەوەی دەبوایە بەرەو ڕوسیا وەڕێکەوێ باروبنەی پێچایەوە.

ڕۆژی شەشەمی خەزەڵوەری 1300 (نۆڤەمبەری 1921) چەند پاپۆڕ لە بەندەری ئەنزەلییەوە بەرەو بادکوبە وەڕێکەوتن. تەنیا ئیحسانولاخان و پەنجاو چەند کەسێك لە چەکدارەکانی وی هەتا دوانیوەڕۆی سبەینێ لە بەندەری ئەنزەلی مانەوە و نەیاندەزانی چ بکەن و بیریان لە چارەنووسی داهاتووی خۆیان دەکردەوە. هێزەکانی دەوڵەتی چیتر چاوەڕوان نەمانەوە و بە تەقەکردن لە غازیانەوە بەرەوپێشەوە دەڕۆیشتن. ئیحسانولاخان خۆی گەیاندە دوایین

پاپۆڕێك، كە مـابۆوە لـە لێـوار بەندەرەكـە بـەو خەڵكـەی لـەوێ سـەیریان دەكـرد گـوتی " هاونیشتیمانەكانم، ئێمە هاتبووین رزگار و ئازادتان بكەین و ئێستا، كە خەیانەتی سەردارەكان پێشی بە وەدیهاتنی خەونەكانمان گرت ئەو ئەركە گەورەیە بۆ كاتێكی دیكە هەڵدەگرین..."

هێزەكانی دەوڵەت گەیشتنێ و چەند تفەنگێكیان بە پاپۆڕەكەوە نا، بەڵام نەیان ئەنگاوت و كەشتییەكە دوور كەوتەوە...

رۆتشتین وەزیری دەسەڵات پێدراوی سۆڤیەتی لە ئێراندا هاوكـات لەگـەڵ ئـەم رووداوانـەدا كلانترۆڤ كاربەدەستی سەربازیی سۆڤیەتیی راسپارد، كە پێوەندی بە میرزا كوچك خانەوە بگرێ و لەگەڵی دانیشێ و نامەیەكیش لە رێگەی ئەوەوە بـۆ مـیرزا دەنێـرێ، كـە لـە سـەر چـاوەی جۆراوجۆردا دەقەكەی بڵاو بۆتەوە. وەزیری دەسەڵات پێدراوی سـۆڤیەتی لـەم نامەیـەدا داوای رێككەوتن لەگەڵ دەوڵەت لە میرزا كوچك خان دەكا و لە كۆتاییدا پاش ئاماژە بەم بابەتە، كە میرزا دەتوانێ چەند كەسێك بۆ پاراستنی خۆی نەك بۆ حكوومەت لای خۆی بێڵێتەوە:

دڵنیاتان دەكەمەوە، كە برە پارەیەكتان بۆ دیاری دەكەین، كە بتوانن لەگەڵ هاوڕێكان پێی بژین. هاوڕێی خۆشەویستم لەوە ئاگادار دەكەمەوە، كە ئەمە دوایین جارە، كە من نێوبژیوانیی پێوەندییەكانی نێوان ئێوە و دەوڵەتی ئێران دەكەم. من تكات لێ دەكەم، كـە نێوبژیوانییەكـەم رەت مەكەوە و بـڕوات هـەبێ كـەمن وەك دۆسـتێك تـەنیا دەمـەوێ لـەم كاتـە ئەسـتەمەدا یارمەتییەكی ئێرانم دابا و ئەگەر تۆ خۆت پێشنیارەكەی من وەرگری و بەو راسپاردەیەدا، كـە دێتە لاتان وەڵامەكەم بۆ بنێریتەوە دڵنیان قەت پەژیوان نابیتەوە، بـەڵام ئەگـەر پێشـنیارەكەم وەرنەگری من ناچارم دەست لە هەوڵەكانی خۆم هەڵگرم و بە كەسەرەوە خۆم ناچار بكەم سەیری شەڕێكی براكوژی بكەم، كە زیانێكی گەورە لە ئازادیی گەلی ئێران دەدا...

میرزا كوچك خانیش لە وەڵامی باڵوێزی سۆڤیەتیدا بە پێداگرتنەوە لە سەر ئەم مەسـەلەیە، كـە " مەبەستی من و هاوڕێیانم پاراستنی سـەربەخۆیی وڵات و ریفـۆرم و بـەهێزكردنی ناوەنـد بـووە و جیاكردنەوەی گیلانیشمان، كە دەستپێكی پاشاگەردانی و لاوازكردنی ئێرانە بە خەیانەتێكی راشكاو زانیوە و دەزانم "و هیوادار بوون بەوەی كە حكوومـەتی سـاڤت (سـۆڤیەتی) بەڵێنـە نووسـراوەكانی خۆی بە جێ بگەیەنێ" ژمارەیەكی زۆر لە هاوڕێیـانی خـۆی ئیـزن دەدا و خـۆی پـەنا دەباتـە بـەر قووڵایی جەنگەڵ. لە كتێبی "ئێران لە جەنگی مەزن"دا چارەنووسەكەی دەخوێنینەوە:

... سـەرەڕای ئـەم نامەگۆڕینـەوە و بەڵێنـە جۆراوجۆرانـە ئاخرییەكـەی دەوڵـەت بـەهیچ شێوەیەك لەگەڵ میرزا رێكنەكەوت. میرزاكۆچك خان نە پێی خـۆش بـوو خـۆی بداتـە دەسـت

ڕژێمی ئێرانەوە، کە هیچ متمانەیەکی پێی نەبوو نە دەشی ویست پەنا بەرێتەبەر سۆڤیەتی و نە شەڕیشی پێدەکرا، چونکی یەکەم ئەوەی کە هاوڕێکانی بە جێیان هێشتبوو دووەم لەبەر ئەوەی بەو نامەی دڵدانەوەیەی ڕۆتشین بەشێکی زۆری دەروبەرییەکانی بەڕێ کردبوونەوە و هێزەکانی دەوڵەتیش بەردەوام بە شوێنییەوە بوون و ئەویش تەنیا مابۆوە. ئەو هەتا لە توانایدا بوو بەربەرەکانێی کردو ئاخرییەکەی پاشەکشێی لێ کردو ڕۆیشت... دواجار لە شوێنێکی دوورەدەستی جەنگەل و لێرەوارەکاندا لە نێو سەرماوسۆڵە و بەفرو بۆراندا ڕەق هەڵات. کەسێکی خەڵکی تالیش، کە دەڵێن ناوی "سەعات" بووە سەری لێدەکاتەوە و بۆ وەرگرتنی خەڵات دەیداتە هێزەکانی دەوڵەت و هەر لەوێ سەری بە خاك دەسپێردرێ. خالۆ قوربان ڕایدەگەیەنێ، کە ئامادەیە سەلکە سەرەکە بەرێتە تاران و کەس نازانێ ئاخرییەکەی چۆن سەرەکەیان لە حەسەناوا بە خاك سپارد. بە کورتی پاش ڕووداوەکانی سپتامبری 1921 لایەنگرانی بزووتنەوەی جەنگەڵ توانییان بەو شێوەیەی، کە میرزا پێشتر وەسییەتی کردبوو سەر و لەشی لە سلێمانداراب بە خاك بسپێرن...

بەڵام دیرۆك نووسانی ڕوسی تەواوی ڕووداوەکەی جەنگەڵ بەو شێوەیە چەواشە دەکەن و دەیگێڕنەوە، کە گۆیا میرزاکوچك خان لە ترسی کۆمۆنیستان لەگەڵ "ئیمپریالیست و کۆنەپەرستە ئێرانییەکان" ڕێککەوتووە و بووەتە شۆڕشی جەنگەڵی بەرەو هەڵدێر بردووە. مێژوونووسانی ڕوسی بە بێ ئەوەی بچوکترین ئاماژەیەك بە ڕۆڵی وەزیری دەسەڵاتپێدراوی سۆڤیەتی ڕۆتشین و جێگر و کاربەدەستی کاروباری سەربازیی ئەو واتە کلانترۆڤ لەم ڕووداوەدا بکەن بەو شێوەیە مەسەلەکە دێننە بەرباس:

... کوچك خان لە پەرە گرتنی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان لە ئێراندا تۆقیبوو. ئیمپریالیست و کۆنەپەرستە ئێرانییەکان ئەو ترسەیان خەستتر دەکردەوە و تاوای لێهات ڕێگەی خەیانەت بە شۆڕشی جەنگەڵی گرتەبەر. لە 29ی سپتامبری 1921دا لە کاتی پێکهاتنی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی لە شارەدێی پەسیان لە نزیکیی ڕەشتدا، هێرشێکی خەیانەتکارانە کرایە سەر حەیدەریان و باقی ڕێبەرانی بزووتنەوەی پەیکار بۆ بزووتنەوەی ئازادیی نیشتیمانی. ئەوان بە دەستی کوچکخانییەکان کوژران. هەر لەو کاتەدا یەکە چەکدارەکانی ژێر فەرمانی کوچکخان بەربوونە سەرکوتی ڕێکخراوە کۆمۆنیستییەکان لە ڕەشت و ئەنزەلی. تەنانەت تێکهەڵچوونێکی نێوخۆییش لە نێوان تاقمەکانی کوچك خان و

چریکەکانی بەردەستی خالۆ قوربانیش رویدا. هێندەی پێنەچوو، کە خالۆقوربان و گرووپەکەی رەگەڵ سوپای شا کەوتن.

دەوڵەتی قەوام لە حاڵێکدا، کە کەڵکی لە پەرش وبڵاویی یەکە شۆڕشگێڕییەکانی گیلان وەرگرت، لە پایزی 1921دا چەند یەکەیەکی هێزی قەزاقی ئێرانیی بە سەرکردایەتیی رەزاخان نارده گیلان. ئەوانە یەکەکانی جەنگەڵیان لە نێو برد و دەستیان بە سەر تەواوی گیلاندا گرت. لە کۆتایی نۆڤەمبەری 1921دا کوچك خانیشیان لە کێوەکانی تالیش گرت و سەریان بڕی. بەشدارانی بزووتنەوەی ئازادیی نیشتیمانی بە تایبەتیی کۆمۆنیستەکان بێ بەزەییانە سەرکوت کران...

## ئەو مشتومڕەی، کە لە سەر گرێبەستی 1921 کرا

پاش بڵاوبوونەوەی دەقی گرێبەستەکەی 1921 ی ئێران وسۆڤیەتی لە سەر ئەوەی کە ئەو گرێبەستە هەتا چ رادەیەك بەرژەوەندیەکانی ئێران دابین دەکا و بە تایبەتی لە سەر بەشی شەشەمی گرێبەستەکە کۆمەڵێك مشتومڕی لێکەوتنەوە و لە رۆژنامەی "کاوە"دا، کە بە بەڕێوەبەرایەتیی سەیدحوسێنی تەقیزادە لە بەرلین بڵاودەبۆوە و بەو وتارگەلەی، کە لە سەری بڵاوبوونەوە سەرنجی نوێنەرانی پەرلمانی بۆ لای کۆمەڵێك خاڵی هەستیار لەو گرێبەستەدا راکێشا. گرینگترین وتار لەم بوارەدا لە ژمارەی رێکەوتی ئوتی 1921 ی کاوە چاپ و بڵاو بۆتەوە و تێیدا هاتوە:

... سەرەڕای ئەو لایەنە باشانەی، کە لەم گرێبەستەی ئەم دواییەی نێوان ئێران و روسیادا هەیە نابێ زۆریشی دڵ پێ خۆش بکرێ و بە زامنی ئازادیی ئێران بزانرێ.

پەیماننامە نوییەکە... 26 بەشی لە خۆ گرتووە، زۆربەی بەشەکانی تەواو لە بەرژەوەندیی ئێراندان و لە راستیدا ئەگەر بە کردەوەش نیازپاکیی تێدا بکرێ و درێژخایەن بێ یەکێك لە ئاواتە نیشتیمانی و سیاسییە لە مێژینەکانی ئێران وەدی هاتووە. لەگەڵ ئەوەشدا، کە لێ ورد دەبیتەوە بێ کەم و کورتی نییە. بۆ وێنە بە رای ئێمە ناوەڕۆکی بەشی شەشەم جێگەی مەترسییە و تەفسیری خراپ هەڵدەگرێ، چونکی بڕگەکانی ئەم بەشە ئەوەیە " ئەگەر دەوڵەتێکی دیکە بیەوێ دەستێوەردانی سەربازی لە ئێراندا بکات یا ئەوەی کە لە خاکی ئێرانەوە هێرش بکاتە سەر روسیا، دەوڵەتی روسیا بۆی هەیە سوپای خۆی بێنێتە نێو خاکی

ئێرانەوە... و دەست بکا بە کردەوەی سەربازی"و بە هیچ جۆرێك نەگوتراوە، کە کییە دیاری دەکا مەترسییەك بۆ سەر روسیا لە گۆرێدایە و یا دەوڵەتێکی دیکە گەرەکیەتی دەستتدرێژی بکات و بڕیاردان لە سەربوونی وەها مەترسییەك، کە لە رستەی "ئەگەر بخوازن"دا هاتووە بە دەست کام لایەنە لە حاڵێکدا هەزاران کێشەی شاراوە لێرەدایە...

کاوە کۆمەڵێك رەخنەی لە سەر هێندێ بەشی دیکەی گرێبەستەکەش هەیە و بۆ وێنە دەنووسێ " بەشی چوارەم دەسەڵاتێکی نارەوای بە روس داوە، لەبەر ئەوەی کە دەوڵەتی ئێران خۆی بەرعۆدە کردووە، کە لە سەر بەرهەمی ماسیی لێوارەکانی ئێران لە دەریای خەزەردا گرێبەستێك مۆر بکا. ئاخۆ ئەگەر دەوڵەتی ئێران داوای لە دەوڵەتی روسیا کردبایە، کە بەشێکیش لە بەرهەمەکانی وێلگا بۆ ئێران ببرنەوە! دەوڵەتی روسیا ئەوەی قبوولْ دەکرد؟"، بەڵام کاوە زیاتر لە سەر بەشی شەشەمی گرێبەستەکە پێدادەگرێتەوە و لەم بارەیەوە بۆ ئەوەی بە هەر بر و بیانوویەك ئێران دەستدرێژیی نەکرێتە سەری پێشنیار دەکا"بڕیاردان لە سەر ئەو مەسەلەیە واتەبوونی مەترسییەك بۆ سەر روسیا بە دادگایەکی نێودەوڵەتی بسپێردرێ".

لە کاتی گەڵاڵەکردنی گرێبەستی 1921دا لە پارلەمانیشدا هێندێ لە نوێنەران رەخنە و تێبینییان لە سەر بەشەکانی 5 و 6و 13 و 20 هەبوو. دواجار لە سەر داوای کۆمیسیۆنی دەرەوەی پەرلمان، لە لایەن وەزیری کاروباری دەرەوەرا نامەیەك بە ناوی وەزیری دەسەڵات پێدراوی سۆڤیەتی نارد و پەسند کرانی گرێبەستەکە خرایە پاش ئەوەی روونکردنەوەی پێویست لە سەر ئەم بەشانە بدرێ. روتشین هەر ئەو رۆژەی نامەی وەزارەتی دەرەوەی ئێرانی بەدەست گەیشت وەڵامی نامەکەی وەزارەتی دەرەوەیدایەوە، کە لەبەر گرینگییەکەی لە شیکردنەوەی گرێبەستی 1921دا دەقاودەق دادەنرێ. وەزیری موختاری سۆڤیەتی لەم نامەیەدا راشکاوانە نووسیوێتی، کە مەبەست لە بەشی 6و5 ی گرێبەستەکە تەنیا ئەو کاتانەیە، کە "لایەنگرانی رژێمی هەرەسهێناوی پێشوو یا دۆستەکانیان لە نێو دەوڵەتانی دەرەوەدا" دەست بکەن بە کردەوەی سەربازی و چەکداری دژی سۆڤیەتی لە ئێرانەوە. ئەوە دەقی نامەکەیە:

**بەڕێز وەزیری کاروباری دەرەوە**

لە وەڵامی نامەی بەڕێزتاندا، کە زەحمەتتان کێشاوە روونی دەکەینەوەکە مەبەست لە بەشەکانی 6و5 ی گرێبەستەکە تەنیا ئەو کاتانەیە، کە لەلایەن لایەنگران یا دۆستانی رژێمی رووخاوی پێشۆوە لە نێو دەوڵەتە دەرەکییەکاندا، هێرشی چەکداری و سەربازی بکرێتە سەر

روسیا و کۆمارییەکانی سۆڤیەتیی هاوپەیمانی وی... ئەو لایەنانەی، کە جگە لە یارمەتیدان بە دوژمنانی کۆمارییەکانی کرێکاران و جوتیارانی سۆڤیەتی دەتوانن بە بیانووی جۆراوجۆر یا بە زۆرەملی دەسبەسەر خاکی ئێراندابگرن و لەوێ جێگەیەك بۆ هێرشە راستەوخۆکانی خۆیان پێکبێنن یا لە رێگەی هێزگەلی دژە شۆڕشەوە هێرش بکەنە سەر کۆمارییەکانی سۆڤیەتی یا روسیا خۆی... لەمەڕ ئەو بابەتەوە بە هیچ شێوەیەك خەباتی زارەکی و ئەدەبی لەگەڵ رژێمی سۆڤیەتی لە لایەن تاقمگەلی ئێرانی و گرووپگەلی راکردوانی روسیاییەوە هەتا ئەو کاتەی بە گشتی لە نێوان هەر دوو دوڵەتدا ئیزنی پێدەدرێ، لەبەر چاو نەگیراوە، بەڵام لەمەڕ بەشەکانی 13و 20 و هەروەها گرێبەستی 1881 برێك هەڵەی تێدا کراوە. من بە بێ دڕدۆنگی، هەروەکی لەمەوبەریش وتوومە بەوپەڕی هەستی دۆستایەتی و خۆشەویستیمەوە بۆ گەلی ئێران هیچ کات بە پێویستم نەزانیوە لەمپەرێکی ناپێویست لە بەردەم گەشە و پێشڤەچوونی ئێران هەبێ و... بەوپەڕی حەزمەوە بە مەرجی پارێزراوبوونی پێوەندییە دۆستایەتییەکانی نێوان هەر دوو لا، ئامادەم لە دانوستانەکانی پێوەندیدار بە گۆڕینی ئەو شتانەی باسیان کرا و بەشگەلی دیکەی، کە ئێران گەرەکیەتی دەستیان تێوەردرا و بە پێی بەرژەوەندی روسیا بە گوێرەی پێویست هاوکاریتان بکەم. پاش ئەم دەربڕینە خۆشەویستتان چاوەڕوانە، کە دەوڵەتی بەرێز و پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی لە نزیکترین کاتدا بەو شێوەی بەڵێنی دراوە گرێبەستەکە پەسند بکەن.

**بەوپەڕی رێزەوە: نوێنەری موختاری دەوڵەتی کۆماری سۆڤیەتیی روسیا لە ئێراندا روتشین**

به ناردنی ئەم نامەیە و بەو روونکردنەوانەی، کە لە لایەن وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەو کاتدا درایە پەرلمان، ئاخرییەکەی گرێبەستی 1921 لە لایەن پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانییەوە پەسند کرا بەڵام دانوستانەکان بۆ پێداچوونەوە بەو گرێبەستەدا هەتا کۆتایی ساڵی 1935 درێژەی کێشا و دەوڵەتی سۆڤیەتییش رایگەیاندبوو، کە قایلە بە هەڵوەشاندنەوەی مادەی شەشەمی گرێبەستەکە، کەچی پێوەندییەکانی نێوانیان چەتی تێکەوت و واژۆی رێککەوتننامەی پێوەندیدار بە لابردنی ئەم مادەیەش پووچەڵ کرایەوە. باقری کازمی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتی ئێران لە ژانوییەی ساڵی 1958دا لە نامەیەکدا بۆ عەلی-ئەسغەری‌حیکمەت وەزیری دەرەوەی ئێران لەو کاتدا بەسەر هاتی تەواوی ئەو رووداوە بەو شێوەیە دەگێڕێتەوە:

... لە ئاکامی ئەو موتالاّ و بەدواداچوونە وردانەی، کە لە ساڵی 1921دا لە وەزارەتی دەرەوەدا کران و منیش، کە ئەو کات سەرۆکی کابینەی وەزارەتی دەرەوە بووم و بەشداری بووم و رۆڵیشم تێیدا هەبوو، دەقی گرێبەستی 1921، کە ئەو کات نەگەیشتبووە تاران و لە مۆسکۆ لە لایەن خوالێخۆشبوو مشاورلممالکەوە واژۆ کرابوو بەو رێوشوێن و بڕیارگەلەی، کە مشاورلممالك تێیدا خستبوونییە روو و بە پێشینە و نامەگۆڕینەوە و تەلەگرافی پێوەندیداری دیکە بەراورد و کۆنترۆل کرا و دەرکەوت، کە مادەی شەشەمی گرێبەستی 1921 بەبێ ئاگاداریی ئێران و بە بێ ئیزن و رەزامەندیی دەوڵەتی ئێران و بە پێشنیار و پێداگریی سۆڤییەتییەکان لە گرێبەستەکەدا گونجێندراوە و ئاگاداربوونەوە لەم مەسەلەیە بووە هۆی نیگەرانی و جموجۆڵ لە پەرلمان و دەوڵەتدا و ئاخرییەکەی باڵوێزخانەی سۆڤیەتی ناچار کرا روونکردنەوەی لە سەر بدات و پەرلمان پەسندی بکا.

... ساڵی 1933، کە لە کابینەی فروغیدا شانازیی وەزارەتی دەرەوەم پێ بڕا لە سەر ئیزنی جەنابی شا و رەزامەندیی سەرۆکی وەزیران دەستم کرد بە زنجیرە هەوڵێك و هەر ئەوەندەی دەوڵەتی سۆڤیەتی لە رێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکاندا بە ئەندام وەرگیرا و لە کاتی گیرانی کۆبوونەوەکانی کۆڕی گشتیی نەتەوە یەککگرتووەکان لە ژنێڤ لەگەڵ لیتوینۆڤ وەزیر دەرەوەی سۆڤیەتیدا کۆمەڵێك دانوستانی شێلگیر و جیددیم بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم مادەیە پێك هێنا و پاش ساڵێك دانوستان و مشتومڕ توانیم رەزامەندیی ئەو وەرگرم و یادداشتێکی پوختو تێروتەسەل، کە هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی ئەو مادەیەو پێویستیی لابردنی مادەی شەشەمی لەخۆ گرتبوو و خۆمدامە دەستی، کە لە مۆسکۆ بیداتە دەستی بەرپرسانی باڵای سۆڤیەتی و هەوڵ بدا جێبەجێی بکات.

لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی 1935دا، کە لە ژنێڤەوە چوومە مۆسکۆ راستەوخۆ لەگەڵ مۆلۆتۆڤ سەرۆکی وەزیرانی ئەو کاتی و لەگەڵ کوستینسکی نوێنەری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتیدا بە دوای دانوستانەکاندا چووم و رەزامەندیی ئەوانم وەرگرت و بەڵێنیاندا، کە بابەتەکە لای بەرپرسانی باڵای سۆڤیەتی بێننە گۆڕی و بە زووترین کات ئاکامەکەمان پێ رابگەیەننەوە.

... لە مانگی نۆڤەمبەری 1935دا کارتاشێڤ کاربەدەستی باڵوێزخانەی سۆڤیەتی بە فەرمی رایگەیاند، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی رەزامەندیی لە سەر ە، کە مادەی شەشەمی

گرێبەستی 1921 هەڵوەشێندرێتەوە و پرۆژەی ئـەم هەڵوەشـاندنەوەیە بـە چـێرنیخ بـاڵوێزی مەزنی سۆڤیەتیدا، کە هەتا مانگێکی دیکە دێتە تاران دەنێرن.

لە مانگی ژانویەی 1935دا چێرنیخ باڵوێزی مەزن، هاتــە تـاران و پـرۆژەی بەڵێنـدراوی دایە دەست من و لە وەزارەتی دەرەوە و لە ئەنجوومەنی وەزیراندا بە وردی موتاڵا کرا و تەواوی بە دڵی ئێمە رێکوپێك کرابوو و تێیدا مادەی شەشەم بەبێ هیچ مەرجێك بە تەواوی لابردرابوو و ئەو ئاماژەیەش، کە لە مادەیەکی دیکەدا بە مادەی شەش کرابوو چاك دەکـرا و بــە گشـتی کات بۆ واژۆی فەرمیش دیاری کرا و رۆژی 29ی خاکەلێوەی 1314 واتە مـانگی ئـاپریلی 1935 بۆ واژۆکرانی فەرمی دیاری کرا، بەڵام رۆژێك پێشتر کۆتاییان بـە خزمــەتی مــن لــە وەزارەتی دەروەدا هێنا و دیارەواژۆی فەرمیش لە کاتی دیاریکراودا نەکرا.

دیارە دەبێ تەواوی ئەم پێشینە و وردەکارییانە لە دەفتەر و فایلـەکانی وەزارەتـی دەرەوە و باڵوێزخانە مەزنەکانی ئێران لە مۆسکۆدا هەبن.

هەرکات بـە پێویسـت زانـرا و ویسـترا، کـە لـە پێنـا و بەرژەوەنـدیی وڵاتـدا کـەڵك لـە ئامادەبوونی سۆڤیەتییەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی مادەی شەشەمی گرێبەسـتی 1921 بێـنن، کە بەداخەوە خۆشمان قـەت وەدوای نەکەوتووینـەوە ئـەوە گـەورەترین پاداشـت و خـەڵات بـۆ زەحمەتەکانی من و بە جێگەیاندنی ئەرکەکانمە لەو رێگەیەدا....

# سۆڤیەت و حکوومەتی رەزاخان

پێوەندیی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەگەڵ رەزاشادا چ ئەو کاتەی وەزیری جەنگ بوو چ لە سەرەتای پادشایەتییەکەیدا زۆر باش بووە و سۆڤیەتییەکان لەگەڵ ئەوەدا، کە بە جوانی ئاگاداری رۆڵی بریتانییەکان لە کۆدەتاکەی ساڵی 1920ی ئێراندا، بوون پێیان وابوو، کە ناکۆکییەکانی رەزاخان لەگەڵ سەیدزیائەدین و هەوڵەکانی ئەو بۆ لێخستنی قەجەرییەکان لە پادشایەتی، پێوەندیی بریتانییەکانی لەگەڵ ئەودا ئاڵۆز کردووە و ئەم ناکۆکییەش هەنووکە لە بەرژەوەندیی ئەواندایە. تاوتوێکردنی بابەتەکانی رۆژنامەکانی سۆڤیەتی و ئەو هەواڵانەی، کە لە مەودای نێوان ساڵانی 1921 هەتا 1925 (1300 هەتا 1304ی هەتاوی) لە سەر ئێران بڵاویان دەکردنەوە تەواو ئەم رەوگەیە نیشان دەدەن، کە چەنددانەیەکیان وەك نموونە دەخەینە روو:

بە پێی ئەو زانیارییانەی، کە لە شوێنە جیاجیاکانی ئێرانەوە بە دەستمان دەگەن ئەوە نیشان دەدەن، کە بریتانییەکان هەوڵ دەدەن رەزاخان هۆکاری سەرەکیی بزاڤی نیشتیمانیی ئێران لە گۆڕەپانی سیاسەت وەدەر نێن. نەخشە و پیلانەکانی پیاوانی بەریتانیا بەردەوام دەردەکەون... لە ئێراندا بە یارمەتیی پیاوانی بەریتانیا بە تایبەتیی ملکدارەکان و خاوەنی پلەو پایە دەوڵەتییەکان بانگەشەی دژە کۆماری دەکرێ پیاوانی ئایینی پێوەندییان بەم مۆرە و دەستوپێوەندانەوە گرتووە و بە توندی هێرش دەکەنە سەر رەزاخان...

رەزاخان پاش ئەوەی لە رێگەی دامەزراندنی رژێمی کۆمارییەوە نەیتوانی دەسەڵاتی رەها بەدەستەوە بگرێ کەوتە بیری پادشایەتی و بۆ گەیشتن بە ئامانج لە پێشدا هەوڵیدا ئەحمەدخان لە پادشایەتی بخا. کاتێك خەریکی پێك هێنانی پەرلمان بۆ لێخستنی قەجەرییەکان بوون، مۆسکۆ دوو رۆژ پێش گیرانی کۆبوونەوەی لێخستنی قەجەرییەکان، هەواڵێکی بەم نێوەرۆکە بڵاوکردەوە:

مۆسکۆ ـ لەم ڕۆژانەدا بڵاڤۆکی خۆرئاوایی هەواڵگەلێك بڵاودەکەنەوە و دەڵێن دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتی ڕای خراپی لە سەر حکوومەتی نیشتیمانیی ئێران هەیە، کە ڕەزاخان سەرۆکایەتیی دەکا و گۆیا دەوڵەتی سۆڤیەتی بە ڕواڵەت پشتیوانی لە شای ئێران(ئەحمەدشای قەجەر) دەکا، کە ئێستا لە ئەورووپا دەژی. بڵاڤۆکی ئەورووپی بە ڕواڵەت گەرەکیانە دەوڵەتی سۆڤیەتی... بە لایەنگری شا لە قەڵەم بدەن و دوژمنایەتی بخەنە نێوان دەوڵەتی سۆڤیەتی و حکوومەتی نیشتیمانیی ئێرانەوە و بەو شێوەیە ڕێگە بۆ سیاسەتی ئیمپریالیستی لە ئێراندا خۆش بکەن. گێچەڵی خوازیارانی پادشایەتی، کە ماوەیەك لەمەوپێش بە دنەدانی مۆرە کۆنەپەرستەکانی ئێران هاتە گۆڕێ هەر ئەو مەبەستەی لە پشت بوو.

ڕایەڵەی تەلەگرافیی یەکێتیی سۆڤیەتی بۆ ئەوەی تەواوی ئەو هەواڵە بێ واتا و نێوەرۆکانە لە مێشکی خەڵك بێنێتە دەرێ ڕادەگەیەنێ، کە دەوڵەتی یەکێتی سۆڤیەتی هەر وەکو پێشوو پرەنسیپی دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوخۆیی ئێران ڕەچاو دەکا و لەگەڵ حکوومەتی نیشتیمانیی ئێراندا، کە ڕەزاخان سەرۆکایەتیی وەزیرانی ئەو حکووومەتەی لە ئەستۆیە پێوەندییەکی تەواو دۆستانەی هەیە...

ڕەزاخان لە سەرەتاکانی دەسەڵاتی پادشایەتییەکەشیدا پێوەندییەکی نزیك و دۆستانەی لەگەڵ سۆڤیەتییەکان هەبوو و بڵاڤۆکەکانی سۆڤیەتی لە ماوەی ساڵانی 1925 و 1930دا سەرەڕای باس و مشتومڕ لە سەر پرسی ئێران زۆر بە خەستی لایەنگرییان لە ڕەزاشا دەکرد. تەنانەت مێژوونووسانی ئێستای سۆڤیەتییش، کە گەرەکیانە ڕاستییەکانی پێوەندیدار بە پێوەندییەکانی ڕابردووی نێوان سۆڤیەتی و حکوومەتی پەهلەوی بشارنەوە نکوڵی لەم بابەتە ناکەن و لە مێژووی ئێراندا، کە دیرۆکنووسانی ڕوسی نووسیویانە هاتووە:

لە ساڵانی سەرەتای حکوومەتی بنەماڵەی پەهلەویدا کۆمەڵە هەوڵێك بە مەبەستی سەقامگیربوونی سەربەخۆیی ئێران، دران... لە ماوەی ئەم ساڵانەدا ئێران سیاسەتی دامەزراندنی پێوەندیی ئاسایی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتیدا، کە بە قازانجی گەلی ئێران بوو بەڕێوە برد. لە هەمانکاتدا لە سەرەتای ئۆکتۆبەری 1927دا لە مۆسکۆ گرێبەستێك لە نێوان سۆڤیەتی و ئێران داواژۆ کرا، کە تێیدا هەر دوو بە ئاشکرایی ئاماژە بە بێ لایەنیی هەر دوو دەوڵەت بە نیسبەت پرسە سیاسییەکانەوە کرا و گرێبەستی ساڵی 1921 دیسان پێی لە سەر داگیرایەوە. لەم گرێبەستەدا گەرەنتیی ئەوەش درا، کە هیچ کام لە لایەنەکانی پەیمانەکە لە یەکێتی و گرێبەستەکانی دەوڵەتی دژبەری وڵاتەکەی تردا بەشداری نەکەن و بێلایەن بن. لە

سەرەتای ئۆکتۆبەری 1927دا گرێبەستێکی دیکە لە سەر بنەمای سودوەرگرتن لە ماسیگرتنی لێوارەکانی باشووری دەریای خەزەردا لە رێگەی کۆمپانیایەکی هاوبەشی ئێران ـ سۆڤیەتی لەنێوان هەر دوو دەوڵەتەکەدا مۆر کرا و لە سەر بەستنی گرێبەستی بازرگانی و گومرۆکی لە سەر بنەمای نیازپاکیی دوولایەنە، رێککەوتن...

بڵاوبوونەوەی بیرەوەرییەکانی ئاقابەگۆڤ سیخوڕی سۆڤیەتی لە ئێراندا لە ماوەی ساڵانی 1926 و 1928دا پاش راکردنی بەرەو فەرنسا لە پێشدا لە ژمارەکانی رێکەوتی 26 هەتا 30ی ئۆکتۆبەری 1930 رۆژنامەی لۆماتین ی پاریس و دواتر بە شێوەی کتێب بڵاو بۆوە خاڵێکی وەرسووڕان بوو لە پێوەندییەکانی حکوومەتی رەزاشا لەگەڵ سۆڤیەتیدا. ئاقابەگۆڤ، کە ئەرك و راسپاردە سیخوڕییەکانی لە ژێر ناوی " چاوەدێری گشتیی بازرگانیی سۆڤیەتی لە ئێراندا" و دواتر بەناوی "کارەبەدەستی باڵوێزخانەی سۆڤیەتی لە تاران" بەڕێوە دەبرد، لەم کتێبەدا ناوی ژمارەیەکی زۆر لە سیخۆڕەکانی سۆڤیەتیی لە ئێراندا لە قاودان و بە دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەدا زیاتر لە چوارسەد کەس بە تۆمەتی سیخوڕی بۆ سۆڤیەتی یا پێوەندیگرتن بە سیخوڕەکانی سۆڤیەتی لە تاران و خۆراسان وئازەربایجاندا دەستبەسەر کران. زۆربەی دەستبەسەر کراوان پاش لێکۆڵینەوەی سەرەتایی بەردران. و لە 32 کەسی دادگایی کراو چوار کەسیان بڕیاری ئیعدامیان لە سەر درا و ئەوانیتر زیندانیان بۆ بڕایەوە. یاسای " سزای ئەوکەسانەی، کە دژی تەناهیی سەربەخۆیی وڵات دەستپێشخەری دەکەن"، کە زیاتر بۆ ئەو کەسانە بوو، کە " بیر و باوەڕ یا هەڵسوکەوتیان دژی پادشایەتیی مەشرووتەی ئێران" بوو یا ئەوەی کە خاوەنی بیر و باوەڕی هاوبەشی (سۆسیالیستی) بن، چەند مانگ پاش بڵاوبوونەوەی بیرەوەرییەکانی ئاقابەگۆڤ و گیرانی سیخوڕەکانی سۆڤیەتی لە ئێراندا، پەسند کرا.

بەڵام ئەوەی، کە بنەمای پێوەندییەکانی رەزاشای لەگەڵ سۆڤیەتییەکاندا لەرزۆك کرد لەقاودرانی پێوەندیی تەیموورتاش وەزیری دەرباری رەزاشا لەگەڵ سۆڤیەتی بوو. ئەو رووداوە لەو کاتدا و تەنانەت پاش گیرانی تەیموورتاش و مردنی لە بەندیخانەدا (کە هیچ وێنەدەچوو سروشتی بێ لە قاونەدرا، چونکی ئاشکرابوونی سیخوڕیی وەزیری دەرباری شا بۆ سۆڤیەتییەکان زیانێکی گورچووبڕی لە پێگەی رژێم دەدا. حاجی موخبیروسەلتەنەی هیدایەت سەرۆك وەزیری ئەوکات لە "بیرەوەرییەکان و مەترسییەکان"ی خۆیدا بە لێڵی ئاماژەیەك بەم رووداوە دەکا و بە شێوەیەك باسی پێداگریی کاراخان جێگری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتیی بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ تەیموورتاش لە بەندیخانەدا کردووە، کە بە روونی پێوەندیی تایبەتیی سۆڤیەتییەکان لەگەڵ

تەیموورتاشدا دەردەخا، بەڵام تەواوی ئەم رووداوە و شێوەی پێوەندیی تەیموورتاش لەگەڵ سۆڤیەتی لە ساڵی 1983دا وێڕای بیرەوەرییەکانی "بوریس باژانێڤ" سەرۆکی سکرتاریای سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتیی سەردەمی ستالیندا لە قاودراوە و بەو پییە تەیموورتاش راستەوخۆ لەگەڵ پۆلیتبۆرۆ یا دەفتەری سیاسیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی پێوەندیی هەبووە و لە رادەبەدەر لە لایەن رێبەرانی سۆڤیەتییەوە گرینگیی پێدراوە.

پاش رووداوی تەیموورتاش ئاشکرابوونی چالاکیی تۆڕێکی چالاکیی کۆمۆنیستی لە ئێران، کە پێوەندیی لەگەڵ "کۆمین ترێن" یا رێکخراوی نێودەوڵەتیی سێیەم لە مۆسکۆدا، هەبوو پێوەندییەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەتیی ئاڵۆزتر کرد. ئەنوەری خامەیی، کە خۆی یەکێك لەو کەسانە بووە و دواتر لە گەڵ گرووپی "53 کەس" گیرا و لە زیندان کرا، لە کتێبەکەیدا بەناوی "پەنجاکەس و سێ کەس" دەنووسێ : دوکتۆر تەقیی ئەرانی رێبەری رێکخراوی نوێی کۆمۆنیستیی ئێران کاتێك هاتە سەر ئەوەی کە حیزبی کۆمۆنیستی نوێی ئێراندامەزرێنێ بۆ وەرگرتنی رەزامەنیی کۆمینترێن چووە مۆسکۆ. خامەیی دەنووسێ: دوکتۆر ئەرانی لە هاوینی 1314 (1935)دا لە کاتی گیرانی حەوتەمین کۆنگرەی کۆمینترێن لە مۆسکۆ بە ناوی سەردان بۆ بەریتانیا لە رێگەی سۆڤیەتییەوە چووە ئەو وڵاتە "چونکی لەو کاتدا ئەوێ تاقە رێگەی چوون بۆ ئەوروپا بوو، هێشتا رایەڵە ئاسمانییەکان وەگەڕ نەکەوتبوون و سەفەرکردن بە پاسیش نەببووە باو. تەنیا ئامرازی سەفەرکردن کەشتی و شەمەندەفەر بوو، کە ئەویش لە رێگەی سۆڤیەتییەوە هەبوون... باقی رووداوەکە دیارە. دوکتۆر ئەرانی لە بری چەند سەعات چەند رۆژ یا پتر لە مۆسکۆ دەمێنێتەوە... لە ئاکامدا دوکتۆر ئەرانی توانیی داوای دامەزراندنی حیزبی نوێی کۆمۆنیست لە ئێراندا لە کۆمینترێن وەرگرێ ..."

مێژوونووسانی روسی لە سەر مەسەلەی ئێران و سۆڤیەتی لە نیوەی دووەم ی پادشایەتیی رەزاشادا ئاوا دەنووسن:

رەزاشا لە ساڵانی 30دا لە سیاسەتی پێوەندیی دراوسێیەتیی باش لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتیدا خۆی بوارد. لە ساڵی 1937دا دەوڵەتی ئێران پەیمانی سەعدابادی مۆر کرد، بە پێی ئەو پەیمانە ئێران وەکو یەکێك لە ئاڵقە گرینگەکانی زنجیری سیاسەتی بریتانییەکان و وڵاتانی دیکەی ئیمپریالیستی چاوی لێ دەکرا، کە لە هەمان کاتدا بەمەبەستی گەمارۆی یەکێتیی سۆڤیەتی و تەریك خستنەوەی لە پێوەندی لەگەڵ گەلانی دیکەدا کەڵکی لێوەردەگیردرا.

لـه سـالّی 1938دا رەزاشـا واژۆکردنـی گرێبەسـتی نـوێی بازرگـانیی لەگـەڵ دەوڵـەتی سۆڤیەتیی رەت کردەوە و ئەو مەسەلەیە بووە هۆی داکشانی لەرادەبەدەری پێوەندیی بازرگانیی نێوان ئێران و سۆڤیەتی... بە تایبەتی لە دوایین ساڵی پێش شەڕی دووەم ی جیهانی سیاسـەتی دوژمنکارانەی رەزاشا لە بەرامبەر دەوڵـەتی سـۆڤیەتیدا خەسـتتـر بـۆوە. لـەو کاتـەدا شـا پێوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ئەڵمانیای هیتلەریدا هەبوو، کە رۆژبەرۆژ پتر تەشەنەی دەکردە نێو ئێرانەوە، مەبەستی ئەڵمانیا ئەوە بووکە لە ئێران وەك پێگەیەکی ستراتژیکی بەمەبەسـتی راپەڕاندنی نەخشەو پلانە دەستدرێژیکەریەکانی دژی یەکێتیی سۆڤیەتی کەڵك وەرگرێ ...

دیارە مێژوونووسانی روسی هیچ بە پێویستی نازانن، کە ئاماژە بە پێوەندیی چـڕی نێـوان ئەڵمانیای هیتلەری و یەکێتیی سۆڤیەتی لە ماوەی ئەم ساڵانەدا بکەن: لە سـاڵانی 1939 و 1940دا، کە لوتکەی چالاکیی ئەڵمانییەکان لە ئێراندا بـوو سـتالین پـەیمانی دۆسـتایەتی و یەکێتیی لەگەڵ هیتلەر بەست و بە دوای ئەودا لـە داگیرکردنـی پۆلۆنیـادا دەسـتیدایە دەسـت هێزەکانی هیتلەری. سێ وڵاتی لێواری دەریای بالتیك (لیتوانی، لیتۆنی و ستۆنی)ش بـە پێـی رێککەوتنی نهێنیی نێوان سۆڤیەتی و ئەڵمانیا لە لایەن لەشکری سوورەوە داگیر کرا و بە پێـی ئەو بەڵگە حاشاهەڵنەگرانەی، کە پاش شەڕی دووەم ی جیهانی بڵاو بوونەوە سۆڤیەتییەکان لـە ماوەی ساڵانی 1940 و 1941دا بۆ دابەشینی جیهان لەگەڵ ئەڵمانیادا، کە دەستەبەرکەری پێشڕەویی هێزەکانی سۆڤیەتی هـەتا لێوارەکـانی کەنـداوی فـارس بـوو لەگـەڵ هیتلـەردا لـە گەنگەشەدا بوون.

هێرشی لە نەکاوی هێزەکانی هیتلەر بۆ سەر سۆڤیەتی لە22ی ژووئەنی 1941دا پلان و نەخشەکانی ستالینی بۆ دابەشینی جیهان لەگەڵ هیتلەردا کردە بڵقی سەر ئاو و ئـەم جارەیـان ستالین بۆ رزگارکردنی خۆی پاڵی وە دۆستی دێرینەی خۆی واتە بەریتانیادا. یەکەمین بەرهەمی ئەم یەکێتییە دەستدرێژیی هاوکاتی هێزەکانی بەریتانیا و سۆڤیەتی بۆ سەر خـاکی ئێـران لـە رۆژی 25ی ئوتی 1941دا بوو واتە دوو مانگ پاش دەستپێکی هێرشی هێزەکـانی هیتلـەر بۆ سەر خاکی سۆڤیەتی بوو. سۆڤیەتییەکان بەشـی بـاکووریی ئێرانیـان داگـیر کـرد و بەشـی باشووریش کەوتە دەستی هێزەکانی بەریتانیا و لە تارانیش چەند یەکەیەکی سەربازیی هـەردوو لا، دامەزران.

هاوکات لەگەڵ داگیرکرانی ئێران بـەریتانیا و سـۆڤیەتی لـە سـەر لێخسـتنی رەزاشـا لـە پادشایەتی رێککەوتن. دەوڵەتی سۆڤیەتی سەرەتا پێی لە سـەر ئەوەدادەگرتـەوە، کـە رژێمـی

پادشایەتی لە ئێراندا تێکەوەپێچراو بۆ پۆستی سەرۆك کۆماریی ئێرانیش محەممەدی ساعد باڵوێزی ئەوکاتی ئێران لە مۆسکۆیان لەبەر چاو گرتبوو. بریتانییەکانیش سەرەتا بە کۆکردنەوەی رژێمی پادشایەتی لە ئێراندا قایل بوون، بەڵام کاندیدای ئەوان بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری محەممەدعەلی فروغی دواین سەرۆك وەزیری رەزاشا بوو. فروغی ملی نەدا و دامەزرانی سیستەمی کۆماریی لە ئێرانی ئەوکاتدا بە شتێکی مەترسیدار زانی و لە ئاکامدا هەروەکی دنیس رایت باڵوێزی پێشووی بەریتانیا لە دواین کتێبی خۆیدا بە ناوی "ئێرانییەکان لە نێوان بریتانییەکاندا" دەنووسێ: بریتانییەکان کەوتنە بیری گەڕاندنەوەی بنەماڵەی قەجەری بۆ سەر تەختی پادشایەتی و حەمیدمیرزای کوڕی حەمەحەسەن میرزا دواین جێگرەوەی(ولیعهد)ی قەجەریان بۆ پادشایەتیی ئێران لەبەرچاو گرت، کە ئەو کات هاووڵاتیی بەریتانیا بوو و یەك تاقە وشەی فارسیی نەدەزانی، بەڵام ئەو پلانەش هیچی لێ شین نەبۆوە و "هەربۆیەش بریتانییەکان هاتنە سەر ئەوەی کە ئەو دەرفەتە بدەن بە وەلیعهدی گەنجی ئێران حەمەرەزای پەهلەوی، کە توانایی خۆی بسەلمێنێ. ئەگەر ئەو پێچەوانەی چاوەڕوانییەکان دەرکەوتبایە دەکرا بۆ هەمیشە لە کۆڵ بکرێتەوە". دنیس رایت لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێ:

کەوابوو کاتێك لە رۆژی 16 ی سپتامبردا رەزاشا لە ژێر تەوژمی رووداوەکاندا بە قازانجی کوڕە گەورەکەی خۆی وازی لە پادشایەتی هێنا دەوڵەتی بەریتانیا پاش راوێژ بە مۆسکۆ کوڕی بیست و یەك ساڵەی ئەو واتە حەمەرەزای پەهلەویی وەك شای ئێران بە فەرمی ناسی... وا وێدەچوو، کە ئەگەر ئەو وەکو پادشایەکی مەرجدار(مشروتە) پادشایەتی بکا و لەبەرامبەر ریفۆرمگەلێکدا خۆی بەرعۆدە بزانێ، دەتوانێ رەزامەندیی ئێمە دابین بکا و قایلمان بکا، باڵوێزی سۆڤیەتییش لە تاران هەر ئەم رایەی هەبوو و پێی وابوو، کە دەبێ دەرفەتی پێ بدرێ بۆ ئەوەی توانایی خۆی بسەلمێنێ"...

# سۆڤیەت و حکوومەتی حەمەرەزا شا

دەکرێ گۆڕانەکانی پێوەندیی نێوان ئێران و سۆڤیەت لە سەردەمی پادشایەتیی 37 ساڵەی حەمەرەزاشادا بکەینە دوو بەشی دیاری پێش رووداوەکانی ئازەربایجان و پاش ئەو رووداوانە.

یەکەمین رووداوی گرینگ لە پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتدا لە ماوەی ساڵانی داگیرکراویی ئێران لە شەڕی دووەم ی جیهانیدا، بەستنی پەیمانی سێ قۆڵیی نێوان بەریتانیا و ئێران و سۆڤیەتی لە سەر بنەمای هاوکاریی ئێران لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکان و بەڵێن و پەیمانی دوولایەنەی ئەوان لە سەر کشانەوەیان لە ئێران، لە ماوەی شەش مانگی پاش تەواوبوونی شەڕ، بوو. ئەو گرێبەستە رۆژی 29ی ژانویەی 1942 واتە پێنج مانگ و شەش رۆژ پاش داگیرکرانی ئێران لە لایەن هێزە دەرەکییەکانەوە واژۆ کرا و ئێران هەرچی هەیبوو بە تایبەتی رێگەی شەمەندەفەری سەرانسەری بۆ راگواستنی چەك و چۆل و تەقەمەنی و بژیو و خۆراك بۆ سۆڤیەت، خستە بەردەستی وڵاتانی هاوپەیمان(متفقین) و هەر بەم بۆنەشەوە بوو، کە (نیشانی پردی سەرکەوتنی) پێ درا. رۆژی نۆیەمی سپتامبری ساڵی 1943 دەوڵەتی ئێران بۆ سەلماندنی نیازپاکیی خۆی بەرامبەر بە یەکێتیی سێ قۆڵی، شەڕی دژ بە ئەڵمانیای راگەیاندو هەربۆیەش کاتێك رێبەرانی سێ وڵاتی یەکگرتوو (ئەمریکا و سۆڤیەتی و بەریتانیا) لە کۆتایی مانگی نۆڤەمبەری 1943دا کۆنفرانسێکیان لە تاران گرت راگەیەندراوێکیان لە سەر گەرەنتی و دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی و پاراستنی یەکێتیی خاکی ئێران واژۆ کرد. بە پێی ئەم راگەیەندراوە، کە لە رێکەوتی یەکەمی دیسێمبەری 1943دا لەلایەن ستالین و رۆزڤێلت و چەرچیلەوە دەرکرا و هاوکاریەکانی ئێران لەشەڕدا و ئەو گیروگرفتە ئابوورییانەی، کە بەسەر ئێراندا سەپاون پشتڕاست کرانەوە و کۆمەڵێك بەڵێنیان پێدان، کە لە داهاتوودا بۆیان قەرەبوو دەکرێتەوە، بەڵام گرینگترین بەشی راگەیەندراوەکە لە روانگەی ئێرانەوە دەستەبەر و گەرەنتیکردنی "سەربەخۆیی و دەسەڵات و یەکێتیی خاکی ئێران" بوو، کە لە کۆتاییدا هاتبوو.

له جەنگەی کۆنفرانسی رێبەرانی سێ دەوڵەتەکە لە تاران، شا بۆ پتەوکردنی پێگەی خۆی لە باڵوێزخانەکانی سۆڤیەت و بەریتانیادا چووە سەردانیان. رۆزڤێلت، کە لە باڵوێزخانەی سۆڤیەتدا میوانداریی لە رەزاشا کرد ماوەیەك لە دیوی چاوەڕوانیدا ماتڵی کرد و چەرچیلیش بۆ سەردانی حەمەرەزاشا نەچووە کۆشکی پادشایەتی. لە رێبەرانی ئەو سێ وڵاتە تەنیا ستالین بوو، کە بۆ سەردانی حەمەرەزاشا چووە کۆشکی پادشایەتی و بەم کردەیەی خۆی کاریگەریی زۆری لە سەر ئەو دانا، بەڵام شا لەو کاتدا هیچ دەسەڵاتێکی لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا نەبوو دەوڵەت و پەرلەمان زیاتر بەدەست بەرپرسانی دەوڵەتی و سیاسەتوانانی سەر بە بەریتانیا یا ئەمریکاوە بوون. هەڵبژاردەنەکانی خولی چواردەی پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی، کە لە کاتی داگیرکرانی ئێراندا لە لایەن سێ وڵاتی یەکگرتۆوە بەڕێوە چوو دەرفتێك بوو بۆ خۆدەرخستنی حیزبی توودە(شیوعی)، بەڵام توودەییەکان نەیانتوانی لە ناوچەباکوورییەکان لە حەوت نوێنەر زیاتر بنێرنە پەرلمان و نوێنەری هەشتەم بە شێوەی سرووشتی لە ئیسفەهان هەڵبژێردرا.

شێوازی سۆڤیەتی لە پێوەندی لەگەڵ حیزبی توودەشدا کۆمەڵێك خاڵی وای تیدایە، کە لە سەر پێوەندییەکانی ئێران سۆڤیەتی شیاوی تێڕامان و لێوردبوونەوە بن. ئەنوەری خامەیی لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ، کە یەکەمین گرووپی بەندییە سیاسییەکان (پەنجاو سێ کەس) پاش ئازادبوونیان لە زیندان کەوتنە بیری دامەزراندنی حیزبی کۆمۆنیستی نوێی ئێران و سێ کەس لەوانە (ئیرەجی ئەسکەندەری و عەبدول حوسێنی نوشین و رەزا روستا) بۆ وەرگرتنی رەزامەندیی بەرپرسانی سۆڤیەت بۆ دامەزراندنی ئەم حیزبە چوونە سۆڤیەت، بەڵام بەرپرسانی سۆڤیەت پاش پرس و را بە مۆسکۆ، ئەوان رازی نەبوون بەوەی کە حیزبێك بە ناوی کۆمۆنیستەوە لە ئێراندا دابمەزرێ. ئەنوەری خامەیی ئەوجار دەنووسێ، کە سۆڤیەتییەکان بەو مەرجانەی خوارەوە بە دامەزرانی حیزبێك لە ژێر ناوی حیزبی توودە لە ئێراندا رازی بوون:

1ـ دەبێ حیزبێکی فەرمی و یاسایی بێت، واتە نەك هەر یاساکانی وڵاتی قبووڵ بێت و لەگەڵیاندا کۆك بێ بەڵکو لە کردەوە و ئاکاریشدا هیچ شتێکی وای لێ نەبینرێ، کە بۆنی دژایەتیی یاسای بنەڕەتی و پادشایەتیی مەشرووتەی لێوەبێ.

2ـ بە تەواوی لە ئایدۆلۆژیای مارکسیزم و لینینیزم بێبەری بێ و هیچ بیرۆکە و کردەوەیەکی وای لێ دەرنەکەوێ، کە نیشانەی بەستراوەیی بەم ئایدۆلۆژیایەوە بێ.

3ـ لە سیاسەتی جیهانیدا لایەنگرێکی تۆخی هاوپەیمانەکان(متفقین) بێ...

4ـ ئەوەندەی بۆیان دەلوێ هەوڵ بدەن کەسایەتییە نیشتیمانییەکان بکەنە ئەندامی حیزب. مەبەست لە کەسایەتییە نیشتیمانییەکان ئەوانە بوون، کە پێشینەی کۆمۆنیستییان نەبووە و لە دامودەزگای دەسەڵاتیشدا خاوەن پێگە بن... بەرپرسانی سۆڤیەتیی لە سەر ئەم خاڵە سوور و پێداگر بوون و دەیانویست بەم شێوەیە دزە بکەنە نێو دەزگای دەسەڵاتەوە...

5ـ چالاکییەکانی حیزب نابێ زیانێکی بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکانی بەریتانیا و ئەمریکا و سۆڤیەتی لە ئێراندا بە تایبەتی بۆ هەڵمەت و کردەوە جەنگییەکانیان هەبێ. بۆ وێنە پیشەسازیی نەوتی باشوور و چەکوچۆڵ أسازی و یەکێتیی کرێکاریدامەزرێنێ و بۆ وەدیهاتنی ویست وداخوازی کرێکاران پشتیوانیی لە مانگرتنەکانیان بکا.

بە پێی ئەم رێنوێنی‌یانە حیزبی توودە دەبوایە حیزبێکی بە تەواومانا لیبراڵ بێت واتە بە کۆکردنەوەی کەسانێك لە تەواوی چین وتوێژەکانی کۆمەڵگە لەرێگەی ریفۆرمیزم و پەرلمانتاریزمەوە جێگە و پێگەیەك لە نێو دامودەزگای دەسەڵاتدا بۆخۆی بکاتەوە و لەم رێگەوە هەوڵ بدات ببێتە پردێك بۆ تەشەنەکردن و پنجداکوتانی سیاسەتی سۆڤیەتی لە ئێراندا...

لەگەڵ ئەوەشدا حیزبی توورده هەر لە سەرەتاوە بەو شێوازەی، کە لە پشتیوانیکردن لە سیاسەتی سۆڤیەتی لە ئێراندا رەچاوی کرد ماهیەت و چییەتیی خۆی دەرخست و خۆپێشاندانە ئاشکراکانی ئەم حیزبە بە مەبەستی لایەنگری لە درانی ئیمیتازی نەوتی باکوور بە سۆڤیەتی، هیچ جێگەیەکی بۆ شك و گومان لە پێوەندیی ئەو حیزبە بە مۆسکۆوە نەهێشتەوە. ئەم خۆپێشاندانانە پاش رەتکردنەوەی ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێران لە لایەن سۆڤیەتییەکانەوە وتووێژی "کاڤتارادزێ" ی جێگری وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەتی، کە بۆ دانوستان لە سەر ئەم ئیمتیازە هاتبووە تاران لە تەنیشت سەربازانی لەشکری سوورەوە بەرێوە چوو و، چونکی سەرەڕای تەواوی ئەم هاندان و دنەدانانەش دەوڵەتی ئێران ملی بۆ ئەوە رانەکێشا، کە ئیمتیازی نەوتی باکوور بداتە سۆڤیەتی و پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانییش یاسایەکی لەمەڕ قەدەغەکردنیدانی نەوت بە دەوڵەتە دەرەکییەکان پەسند کرد جێگری وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی پاش هەشتا رۆژ مانەوەی لە تاران لە سەرەتای مانگی دیسێمبەری 1944دا دەست لە گونان درێژتر گەڕایەوە مۆسکۆ.

حیزبی توورده پاش خۆ پێشاندانەکانی مانگی نۆڤەمبەری 1945 بە لایەنگری لەدانی ئیمتیازی نەوت بە سۆڤیەتی راشکاوانەتر و بێ ترستر لە جاران پشتیوانیی لە هەڵوێستە سیاسییەکانی سۆڤیەتی لە ئێراندا کرد و ئیحسانی تەبەری، کە یەکێك بوو لە رێبەرانی حیزبی

توورده هەر لەو ڕۆژانەدا وتارێکی لە چاپەمەنییەکانی حیزبی توورده‌دا نووسی "بۆ یەکەمین و دوایین جار دەبێ لەو ڕاستی‌یە تێ بگەین، کە ناوچە باکورییەکانی ئێران بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی وەك هەرێمێکی منییەتی (تەناهی) وان" و هەر لەم وتارەدا پێی لە سەر ئەوەداگرتەوە، کە " بۆ چارەسەریی زۆربەی کێشە هەنووکییەکانی یەك ولاتی تێشکاوی وەك ولاتی ئێستای ئێمە خۆ بواردن لەدانی ئیمتیازی نەوت بە خوازیارانی، کردەیەکی هەڵەیە، کە مەبەست لێی یا ڕەچاوکردنی پلانگەلێکی هەڵەیە یا گەمژەیی... هەر بەم شێوەیەش، کە ئێمە بەرژەوەندیی بەریتانیامان لە ئێراندا لەبەر چاوە و هیچ قسەی لە دژی ناکەین دەبێ‌دان بەوەدا بنێین، کە دەوڵەتی سۆڤیەتییش لە ڕووی ئاسایشی خۆیەوە لە ئێراندا کۆمەڵە بەرژەوەندییەکی جیدیی هەیە..."

پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتی پاش ڕەتکردنەوەی ئیمتیازی نەوتی باکوور بەرەو ئالۆزی چوو. لە سەر ئەم قۆناغە هەستیارەی مێژووی پێوەندییەکانی ئەم دوو ولاتە، کە بووە هۆی دامەزراندنی حکوومەتگەلی سەر بە سۆڤیەتی لە ئازەربایجان و کوردستاندا پرۆفیسۆر باری ڕۆبین پسپۆڕی ناسراوی کاروباری خۆرهەڵاتی ناڤین دەنووسێ:

لە سەرەتای ساڵی 1945 ـەوە ڕەوشی ئێران مانگ بە مانگ خراپتر دەبوو. لەگەڵ نزیك بوونەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان لە بەرلین شەڕ بەرەو کۆتایی دەچوو و ئەم پرسیارە دەهاتە پێشێ، کە ئاخۆ بڕگەکانی ڕاگەیەندراوی تاران جێبەجێ دەکرا و هێزە دەرەکییەکان خاکی ئێران بە جێ دێڵن؟ سۆڤیەتییەکان خۆیان لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەبوارد و کاتێك ئەڵمانیا خۆی بەدەستەوەدا مۆسکۆ بە بیانووی ئەوەی، کە شەڕ لەگەڵ ژاپۆندا هێشتا کۆتایی نەهاتووە جێبەجێکردنی بەڵێن و پەیمانەکانی خۆی وەدوا خستن. لەئوتی ساڵی 1945دا ژاپۆنیش دەستی بەردایەوە و ئیتر بیانوویەك بۆ خۆ بواردن لە جێبەجێکردنی بەڵێنی کشانەوە لە ئێران لە گۆڕێ نەما.

ستالین لە وەڵامی داوای بەڕێوەچوونی ئەو بەڵێنانەی، کە لە ڕاگەیەندراوی تاراندا ئاماژەیان پێکرابوو دژکردەوەیەکی خێرای نواند. لە ئوتی ساڵی 1945دا ڕادیۆ و چاپەمەنییەکانی سۆڤیەتی وەکو یەکەیەکی تۆپخانە، کە هاوکات دەست بکەن بە تۆپباران دەستیان کرد بە هێرشی توند و بێ وێنە بۆ سەر دەوڵەتی ئێران. ئەو پلانە نوییەی، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی دەیەویست بەڕێوەی بەرێ دامەزراندنی حکوومەتێکی جودایی خواز* و سەر بە سۆڤیەتی لە بەشی بەرینی باکووری خۆرئاوای ئێران واتە ئازەربایجاندا بوو. بزووتنەوەیەکی دیکەش لە کوردستان خەریکی بیچم گرتن بوو سۆڤیەتییەکان لە پێناوی بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا یارمەتیی ئەویشیان دەداو بەهێزیان دەکرد. لەو ڕۆژانەدا کۆمەڵە ڕاپۆرتێك دەگەیشتنە

واشنگتۆن، کە باسی پەرە گرتنی شـەپۆلی تـیرۆر و تونـد و تیـژیی کاربەدەسـتانی یـەکێتیی سۆڤیەتی و مۆرەکانیانی، لە باکووری ئێراندا دەکرد.

ئـەو دنـەدان و هانـدان و بـوار خۆشـکردنانە لـە کۆتـایی سـاڵی 1945دا دامـەزرانی حکوومەتی خودموختاری ئازەربایجانیان لێکەوتەوە. روسەکان رێبەرایەتیی ئەم حکوومەتـەیان بە کۆنە کۆمۆنیستێك بە ناوی جەعفەری پیشەوەری سپارد، بـەڵام کـارگێڕان و بەڕێوەبـەرانی راستەقینەی ئەو حکوومەتە دوو کاربەدەسـتی روسـی بـە ناوەکـانی "ئارکـادی ـ کراسـنیخ" کۆنسوولی سۆڤیەتی لە تەورێز و "مـیرزا برایمـۆڤ" جێگـری سـەرۆکی وەزیرانـی ئازەربایجـانی سۆڤیەتی بوون. بە سەدان کاربەدەستی روسیی خەڵکی ئازەربایجانی سۆڤیەتی، کە لە رواڵەتـدا جیاوازییەکیان لەگەڵ ئازەربایجانییەکانی ئێراندا نەبوو بۆ بەهێزکردنی مۆرە خۆجێییەکان هاتنە نێو ئێرانەوە و یەکێك لە ئەندامانی پۆلیسی نیهێنیی سۆڤیەتییش راسپێردرا، کە رێکخراوێکی نهێنی بۆ رژێمەکەی سەر بە سۆڤیەتی دامەزرێنێ. ئەم چەکوچۆڵ ەی، کە بۆ دامەزراندن و پێك هێنانی هێزێکی سەربەخۆ لە بەرامبەر سوپای ئێراندا بە جودایی خوازان دران لە هەمان جۆری چەکە ئەمریکاییەکان بوون، کە لە سەردەمی شەڕدا بە سۆڤیەتییەکان درابـوون بـۆ ئـەوەی وا بنوێندرێ، کە سۆڤیەتی هیچ رۆڵێکی لە دامەزراندنی ئەو حکوومەتەدا نەبووە.

چەند حەوتوو پـاش دامەزرانـدنی حکوومــەتی سـەربەخۆیان لـە ئازەربایجانـدا وەڤـدێکی پێکهاتوو لە سەرۆك خێل و عەشیرەکان کورد لە بـاکۆ چـاویان بـە جەعفـەر بـاقرۆڤی سـەرۆك وەزیرانی ئازەربایجانی سۆڤیەتی کەوت. باقرۆف هانیدان، کە حکوومەتێکی خودموختـاری لـە گوێن حکوومەتەکەی ئازەربایجان لە کوردستاندا دامەزرێنن و لە وتارێکدا پێی وتن " هەتا ئەو کاتەی، کە یەکێتیی سۆڤیەتی هەیە پشتیوانی لە سەر بەخۆیی کوردستان دەکات".

باقرۆف هەروەها بەڵێنی یارمەتیی سەربازی و ئابووریی بە کوردەکاندا و رێبەرانی کورد لە حاڵێكدا هەرکام قابێکی وێنەی رەنگیی ستالینیان بە دیاری وەرگرتبوو گەڕانـەوە بـۆ ئێـران. کوردەکان بە گشتی گومانیان لە نیاز و ویسـتی روسـەکان هـەبوو، بـەڵام بـە هـۆی هەسـتی ناسیۆنالیستی و لە پێناوی وەدیهێنانی ئارەزووی دێرینی پێك هێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ کۆمەگ و هاوکارییەکانی ئەوانیان قبووڵکردن.

هاوکـات لەگـەڵ ئـەم چـالاکییانەدا مۆسـکۆ تـۆڕێکی سـیخوڕیی بـەربڵاوی لـە ئێرانـدا دامەزراندبوو و کاربەدەستانی روسی بە کەڵك وەرگرتن لە سنووره بێ لەمپەر و ئاوەڵاکانی ئەو دوو وڵاتە بە ئازادی هاموشۆی ئێرانیان دەکرد. باڵوێزی سۆڤیەتی لـە تـاران، کـە چـاوەدێریی

بەسەر چالاکییەکانی حیزبی توودە لە ئێراندا دەکرد لە ڕێگەی بانکەکانی ئێران و سۆڤیەتییەوە لە ئێراندا، لە بواری ئابوورییەوە یارمەتیی ئەو حیزبەی دەکرد. دامەزراوگەلی دیکەی روسی لە ئێراندا ڕێکخراوێکی بازرگانی ئەنجوومەنێکی فەرهەنگی و هەروەها نەخۆشخانەیەکی سۆڤیەتی لە ئێراندا پەردەیەك بوون بۆ چالاکیی سیاسی و بانگەشەیی و دابینکردنی گوژمەی پێویست بۆکڕینی دەستوپێوەند و مۆرەی سیاسی و پرۆپاگەندەیی لە ئێراندا. تەواوی ئەو مۆرەگەلە بەبوونی یەکەکانی لەشکری سوور لە باکووری ئێران دەستیاندا بووە دەستی یەکتر و مەترسییەکی جیدییان بۆ داهاتووی ئێران ساز کردبوو. ئاخۆ ئامانجی سۆڤیەتی تەنیا ئەوە بوو، کە ئازەربایجانی ئێران بخاتەوە سەر ئیمپراتۆریای سۆڤیەتی یا ئەوەی کە زاڵ بوون بەسەر ئازەربایجاندا سەرەتا و دەراوخۆشکردنێك بوو بۆ دەستڕاگەیشتن بە سەرانسەری خاکی ئێراندا؟ وەلامی ئەم پرسیارە روون نەبوو، بەڵام پیاوانی حکوومیی ئەمریکا و دیپلۆماتەکانی ئەو وڵاتە لە سەر ئەم خاڵە هاودەنگ بوون، کە یەکێتیی سۆڤیەتی هەر کام لەو دوو ڕێگەیەی مەبەست بێت، دەبێ لەم قۆناغەدا پێشی بگیردرێ. ئێران، کە لە سەردەمی شەڕدا وەك گۆڕەپانی تاقیکاریی هەوڵی هاوبەش و هاوکاریی ئەمریکاو بەریتانیا و سۆڤیەتی لە سەردەمی دوای شەڕدا، باسی دەکرا، ئێستا ببووە گۆڕەپانی ململانێ و مشتومڕی ئەو شەڕە ساردەی، کە خەریك بوو هەڵدایسا و پێوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و ئێران، کە پێنج ساڵ لەمەوبەر و لە سەرەتای شەڕیشدا زۆر کاڵ و بەرتەسك دیار بوو ئێستا بە پێوەندییەکی زۆر هەستیار لە ناوەندی قەیرانی جیهانیدا لەقەڵەم دەدرا.

بە دوای دامەزرانی حکوومەتگەلی دەسنیشانکراوی سۆڤیەتی لە ئازەربایجان و کوردستانی ئێراندا لە پایزی 1945داو ڕێگرتنی لەشکری سوور لە هاتنی یەکە سەربازییەکانی ئێران بۆ سەرکوتی جودایی خوازان** دەوڵەتی ئێران سکاڵای بردە بەر ئەنجوومەنی تەناهیی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانی، کە تازە دەستی بە کاروباری خۆی کردبوو و مەسەلەی ئێران وەکو یەکەمین بابەتێك، کە سۆڤیەتی و هاوپەیمانەکانی سەردەمی شەڕی ئەو وڵاتەی خستوەتە ناکۆکییەوە لەم کۆڕە نێودەوڵەتییەدا هاتە گۆڕێ. سۆڤیەتییەکان، کە لەوە نیگەران بوون ئەو کێشەیە ببێتە شتێکی نێودەوڵەتی پێشوازییان لە پێشنیارەکەی ئەنجوومەنی تەناهی بۆ دانوستانی راستەوخۆ لەگەڵ ئێران بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکانیان کرد و قەواموسەلتەنە، کە لە زستانی 1945دا کرابوو بە سەرۆکی وەزیران هەر لەو مانگە وەك سەرۆکی وەفدێك بەرەو مۆسکۆ رۆیشت. قەواموسەلتەنە لە ماوەی مانەوەی خۆیدا لە مۆسکۆ

سێ جار چاوی بە ستالین کەوت و چەندین جاریش چاوی بە مۆلۆتۆڤ وەزیری دەرەوە کەوت، بەڵام هیچ شتێکی لەم چاوپێکەوتنانە دەست نەکەوت و ستالین بە ناوی ئەوەی کە هێزەکانی سۆڤیەتی بە پێی بەندی شەشەمی گرێبەستی 1921 لە ئێراندا ماونەتەوە پێ مل نەبوو، کە فەرمانی چوونەدەرەوەی لەشکری سوور لە ئێران لە کاتی بەڵێن دراودا، بدات.

لە ماوەی مانەوەی قەواموسەلتەنە و وەفدی هاوڕێیدا لە مۆسکۆ جگە لە دانوستانە راستەوخۆکان کۆمەڵێك یادداشتی نووسراویش لە نێوان وەفدی نوێنەرایەتیی ئێران و دەوڵەتی سۆڤیەتیدا ئاڵوگۆڕ کران، کە زیاتر لە هەر وتار و لێکدانەوەیەك مەبەستەکانی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەمەڕ ئێران دەردەخەن. دەقی ئەو یادداشتانە، کە سەرەتا لە راپۆرتی رێکەوتی ئۆکتۆبەری 1947ی قەواموسەلتەنەدا بۆ پەرلمانی پازدەهەم، ئاشکرا بوون بەو جۆرەیە:

دەقی یەکەمی ئاگادارکردنەوەی قەواموسەلتەنە بۆ دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە بە دوای یەکەمین چاوپێکەوتنەکانی وی لەگەڵ ستالین و مۆلۆتۆڤ لە رۆژی 24ی فێبریەی 1946دا نێردراوە:

"هەروەکی لە کاتی دانوستانەکانی رۆژی 23ی فێبرییەدا وەبیرم هێنانەوە و ئاماژەم پێکرد چارەسەریی ئەو کێشانەی ئێستاکە لە ئێراندا هاتوونەتە پێشێ و گرینگترینیان پێوەندیی بە هەڵبژاردنەکانی خولی پازدەی پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی و مەسەلەی رووداوەکانی ئازەربایجانەوە هەیە پێوەندیی تەواوی بە کشانەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی و لایەنەکانی دیکەی هاوپەیمانەکانەوە هەیە، چونکی بۆ جێبەجێکردنی هەرچەشنە ریفۆرمێك لە بواری پێوەندیی سیاسی وئابووریی نێوان ئەم دوو وڵاتە دەبێ گەڵاڵە پێوەندیدارەکان رێکخرین و ئامادە بکرێن و لە لایەن پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانییەوە پەسند بکرێن و هەتا ئەو کاتەی هێزەکانی هاوپەیمانەکان لە خاکی ئێران نەچنە دەرەوە بە پێی یاسای رێگرتن لە هەڵبژاردنەکان، کە لە پەرلمانی خولی چواردەی رابردوودا پەسند کراوە هەڵبژاردنەکانی پەرلمانی پازدەهەم بەڕێوە ناچن.

کەوابوو ئەگەر دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتی بە راستی حەزی لێ بێ، کە لە رێگەیەکی دۆستانەوە هاوکاریی لەگەڵ دەوڵەتی ئێستا هەبێت و لە رێگەی چارەسەریی کێشەو گرفتەکاندا یارمەتیدەرمان بێ و بە لەبەرچاو گرتنی یاسای بنەڕەتیی ئێران رێگە بۆ چاکسازیی لە پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتیدا خۆش بکات، ناچارە دەبێ بۆ چارەسەریی گرفتەکان یارمەتیی دەوڵەتەکەی من بدات و کێشانەوەی هێزەکانی لە خاکی ئێران رێگە بۆ بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنەکانی خولی پازدەی پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی خۆش بکات و لە وەدیهێنانی ئەو ئامانج گەلەدا کەمەبەستمانن کاردروستایی پێویست بکرێ. من لەوە دڵنیام، کە بەم

هەنگاوە دۆستانەیەی دەوڵەتی سۆڤیەتی دەراو بۆ قۆناغێکی نوێو درەوشاوە لە پێوەندییەکانی دوو لایەندا خۆش دەبێ، کە بە دڵنیاییەوە بە قازانجی هەر دوو وڵاتە.

2ـ مەسەلەی ئازەربایجان ـ ئازەربایجان هەر لە سەرەتای مێژۆوی ئێرانەوە واتە نزیك بە 25 سەدە لەوەپێشەوە تا ئێستا بەشێکی جیانەکراوەی ئێران بووە و لە رووی نیۆگرافیی ئایدۆلۆژییەوە( واتە رەگەز و بیر و باوەڕی سیاسی) و تەواوی داب ونەریتە نەتەوایەتییەکان لەو ماوەیەدا تەواو ئێرانی بووە و لە قۆناغە مێژوییەکانی رابردوودا و تەنانەت لە بڕگەیەکی کورتی مێژووی ئەم وڵاتەدا نەبینراوە، کە لەو ناوچەیە باسی نەتەوەیەکی تایبەتی کرابێ کە ئێرانی نەبن و لە رووی زمانیشەوە وێڕای ئەوەی کە ئێستا خەڵکەکەی بە زمای تورکی قسان دەکەن، بەڵام بە درێژایی ئەو 25 سەدەیە نووسین و زمانی ئەدەبی لەو ناوچانە هەر فارسی بووە و هیچ قۆناغێك شك نابەین، کە خەڵکەکەی بە زمانی تورکی شتێکیان نووسیبێ یا کتێبێکی دەرسی یا ئەدەبی یا مێژوویی شیاوی سەرنجیان نووسیبێ یا قوتابخانەیەك بۆ خوێندنی زمانی تورکی لەوێ بووبێ.

ئازەربایجان بە پێی پێشینەی مێژوویی و یاسای بنەڕەتی، بەشێکی جیانەبۆوەی خاکی ئێرانە و هیچ پسوولە و ئیزنێکی مێژوویی یا یاسایی بۆ ئەو بزاڤی خودموختاری و هەوڵە دژەیاساییانەی، کە لەوێ لە ئارادان و بوونەتە هۆی زیان وێکەوتن بە تەواوەت و یەکپارچەیی خاکی ئێران، لەگۆڕێدانییە.

ئەو کردەوەگەلەی، کە لە ماوەیەك لەوەپێشەوە بەملایە بە بێ بەرایی و بێ پێشینە لە ئازەربایجام کراون وەك نموونە: راگەیاندنی حکوومەتی خودموختاری و دامەزراندنی دەوڵەتی خۆجێیی بە پێچەوانەی دەقی ئاشکرای یاسای بنەڕەتییە و چەککردن و وەدەرنانی هێزە دەوڵەتییەکان و هێزەکانی ئاسایشی وەك، ژەندەرمە و پۆلیس، بانگەشەی نەتەوە و زمانی تایبەتیی نەتەوەیی بۆ ئازەربایجانییەکان وەرگرتنیماڵیات و سەربازگرتن و گرتنی زۆربەی شار و گوندەکانی ئازەربایجان دەست گرتن بەسەر ئیدارە دەوڵەتییەکان و بانکی نیشتیمانیدا و کۆمەڵێك کردەوەی دەستدرێژییانەی دیکەـ گۆڕین و دەرکردن یا قۆڵبەستکردنی کارمەندانی بەرپرس و شتی لەم جۆرە کردەوەگەلێکن تەواو پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی و هەموو رێساکانی وڵاتی ئێران و ئەگەر ئەو شێوازە درێژەی هەبێ وڵات بەرەو پارچە پارچەبوون دەچێ. روون و ئاشکرایە، کە وەها بزووتنەوەیەك لە هیچ لایەنێکەوە لەگەڵ سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خام و یاسای بنەڕەتیی ئێراندا یەکناگرنەوە.

3ـ لەوەها هەلومەرجێکـدا، کـە گیروگرفـت و کێشــەی گـەورە لــە هەرچـوار لاوە دەوری ئێرانیان تەنیوەتەوە نیشتیمانپەروەرانی ئێران، کە دۆستایەتیی نیازپاکانەیان لەگـەڵ سـۆڤیەتی بە یەکەمین مەرجی چارەسەریی کێشە سیاسییەکان ئێران دەزانی پێیان خـۆش بـوو، کـە مـن جڵەوی کاروباری وڵات بەدەستەوە بگرم و دەوڵەتێك بۆ وەدیهێنانی ئـەو ئامانجـە پێـكبێـنم و ئەوەی، کە من لە پێوەندی لەگەڵ نێردراوانی و کاربەدەستانی بەرێزی سۆڤیەتی و لە نیشـانە و خوێندنەوەکانی دیکەوە پێی گەیشتووم و بۆم روون بۆتەوە ئەوە بوو، کە دەکرێ رێگە چارەیەکی دۆستانە بۆ ئەو کێشە و مەسەلانە بدۆزرێتەوە.

هەربۆیەش بە هیوایەکی زۆرەوە هاتمە پایتەختی وڵاتـە مەزنەکـەتان و ئێسـتا جـارێکی دیکـەش راشـکاوانە دەڵـێم، کـە ئامـانجی مـن دابینکردنـی دۆسـتایەتییەکی بـەردەوام و پتەوکردنی پێوەندیی سیاسی و ئابووری و کولتووریی نێوان ئەم دوو وڵاتەیە، بـەڵام مـەرجی سەرەکی بۆ دەستەبەربوونی سەرکەوتنی تەواو لەو مەبەستەدا، کە ئەوپەڕی ئارەزووی خەڵکی ئێرانــە ئەوەیــە، کــە هێزەکــانی ســۆڤیەتی لــە خــاکی ئێــران بچــنە دەرەوە و مەســەلەی ئازەربایجانیش بە شێوەیەك، کـە بچـووکترین زیـان بـە مـافی دەسـەڵاتدارێتی و تـەواوەت و یەکپارچەیی خاکی ئێران نەگەیەنێ چارەسەر بکرێ. ئەوەنـدەی، کـە بـە زەیـنی مـن دەگـا مەسەلەی ئازەربایجان بـە لەبەرچـاو گـرتنی مـەرجی سـەرەکیی پێوەندیـدار بـە پاراسـتنی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خـاکی ئێـران، بـە جێبـەجێکردنی زنجیرەیـەك چاکسـازی، کـە ئاماژەیان پێ دەکەم چارەسەر دەکری:

1ـ راگەیاندنی لێبوردنی گشتی بۆ هەموو ئەوانــەی، کـە لــە بزوتنــەوەی خودموختـاریی ئەوێدا بەشداربوونە.

2ـ هەڵبژاردنی خێرای ئەنجوومەنی پارێزگاکان بەو دەسەڵاتانەی خوارەوە:

Aـ دانانی ماڵیاتی خۆجێیی بۆ بەکارهێنانی خۆجێیی وەك رێگەوبان سازکردن و کاروباری کولتووری و تەندروستی و...

B- مافی چاوەدێری بەسەر فرۆشتن و گۆڕانکاری و راگواستن و دەستاودەست پێکردنی مڵکە گشتییە دەوڵەتییەکان لە پارێزگای ئازەربایجان بە لەبەرچاوگرتنی یاسـا و رێسـای پێوەندیـدار بەو مەسەلەیەوە.

C ـ رادەبڕین لە سەر دانان و دیاریکردنی بەرپرسانی بەشێك لە ئیدارە دەوڵەتییەکانی وەك شارەداری و بەرپرسی رۆشنبیری و سەرۆکی شارەوانی و سەرۆکی ناوەندی تەندروستی و تەنانەت پارێزگاریش.

بە گشتی دەوڵەتی من هەوڵ دەدات پێداویستییە خۆجێییەکان و داوا رەوا یاساییەکانی ئەنجوومەنی پارێزگاکان بۆ هەرچەشنە چاکسازییەك لەبەرچاو بگرێ و دەمودەست جێبەجێی بکات.

بەهەر حاڵ ئەوەی لێرە پێموایە بۆ بە پراکتیککردنی زنجیرەیەك چاکسازیی بنەڕەتی لە وڵاتدا و رێگە خۆشکردن بۆ دۆستایەتییەکی ریالیستییانەی نێوان هەردوو دەوڵەت و گەشە پێدان و راپەڕاندنی کاروباری ئابووری، چوونەدەرەوە لە ئێران پێویستییەکی خێرایە و گەلی ئێران بە تەواوەتی لەگەڵ وەها سیاسەتێکدا کۆك و هاودەنگ دەبن".

بە دوای ئەم ئاگادارییەدا ئەم یادداشتەی خوارەوەش بۆ دەوڵەتی سۆڤیەتی ناردراو رووی لە وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی مۆلۆتۆڤە.

"وێرای دانوستانە زارەکییەکان و بە ئاگاهێنانەوەکانم بۆ ئەوەی هیچ جۆرە گومانێك لە راستی و دروستیی ئەو وتە و دەربڕینانەمدا نەمێنێتەوە، کە هەتا ئێستا پێم راگەیاندوون، سەرنجی بەرێزتان بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە رادەکێشم:

1ـ رەوشی ئێستای ئازەربایجان جگە لە بەدیهێنانی بشێوی و ئاژاوە و خۆشکردنی بوارێکی لەبار بۆ پێکهاتنی وەزعێکی لەو شێوەیە لە ناوچە و شوێنەکانی دیکەی ئێراندا ئاکامێکی تری نابێ و هیچ دەوڵەتێك لە توانایدا نابێ، کە دابینکردنی تەناهی و هێمنی وڵات لەوەها دۆخێکدا وەئەستۆ بگرێ . چەند رۆژ بەر لەوەی من بەرەو مۆسکۆ وەرێکەوم پیشەوەری وێڕای پێك هێنانی سوپای سەربازی لە خەڵکی ئاوەربایجان رایگەیاندووە، کە دەبێ خۆیان بۆ هێرش بۆ سەر تاران و رووخاندنی حکوومەتی ناوەندی ئامادە بکەن.

2ـ لەو کاتەدا، کە من لە مۆسکۆ لەگەڵ بەرپرسانی پایەبەرزی یەکێتیی سۆڤیەتیدا بەمەبەستی چاکسازی و پتەوکردنەوەی پێوەندییەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتەدا خەریکی لێدوان و وتووێژم، بە پێی تەلەگرافێك، کە بەم دواییانە بەدەستم گەیشتووە گرووپ و تاقمە چەکدارەکانی ئازەربایجان هێرش و پەلامارەکانیان بەرەو گیلان دەست پێکردووە و لە پێشدا گوندی هەشتپەریان گرتووە و بە دوو لۆری چەکدارەوە هێرشیان بردۆتە سەر گورگانڕود و ئەوێشیان گرتووە و، چونکی لە تەواوی گیلاندا لەبەر هەبوونی هێزەکانی سۆڤیەتیی لە دوو

فەوج پتر هێزی ژەندەرمەی لێ نییە و دیسانیش بە هۆیبوونی هێزەکانی سۆڤیەتی ئەو دوو فەوجەش ناتوانن ببزوون و دژکردەوە بنوێنن و بەرپرسانی خۆجێیی سۆڤیەتییش قایل نین بەوەی کە دەوڵەتی ناوەندی هێزی پشتیوانیان وەفریابخا، دەوڵەت هیچ شتێکی بۆ پێشگرتن لە هێرش و پەلامارەکانی یاخی بووان بەدەستەوە نییە و خەڵکی گیلان لەوپەڕی دڵەڕاوکێ و ترسدا دەژین.

ئەو مەسەلانەی سەرەوە بە بەڕێزتان رادەگەیەنم و داوادەکەم بفەرموون، کە بەرپرسانی سەربازیی سۆڤیەتی لە گیلان :

1ـ پێش بە دژکردەوەی ژەندەرمەکانی ئێران لە گیلاندا مەگرن.

2ـ رازی بن بەوەی، کە لە ناوەندەوە بە مەبەستی دابینکردنی ئاسایش و تەناهی هێزی پشتیوانی بنێردرێتە گیلان.

بۆ سبەی رۆژێ واتە لە رێکەوتی شەشەمی رەشەمەدا ئەم ئاگادارکردنەوەی خوارەوە بە واژۆی مۆلۆتۆڤ وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتییەوە بۆ وەفدی نوێنەرایەتیی ئێران نێردرا:

"لە پێوەندی لەگەڵ ئەو رەوشەی وا لە ئازەربایجان هاتۆتە پێشەوە ئەو پێشنیارانەی خوارەوە وەك لێتێگەیشتن و ئیمتیاز دەخرێنە روو:

1ـ لە پارێزگای ئازەربایجان حکوومەتی خودموختار دادەمەزرێ. ئەم حکوومەتە لەم پارێزگایەدا بریتی دەبێ لە ئەنجوومەنی ئەیالەتیی ئازەربایجان و دەوڵەتی ئەیالەتیی ئازەربایجان، کە لە لایەن ئەنجوومەنەوە هەڵدەبژێردرا و لە لە ناوچەکانی ئەنجوومەنی وەلایەتی و کۆمیتەی بەڕێوەبەرییەکانیاندا هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکان بە پێی رێساگەلێك بەڕێوە دەچن، کە هێشتا لە ئازەربایجاندا دانەنراون.

دەوڵەتی ئەیالەتیی ئازەربایجان پێکدێ لە سەرۆکی وەزیران و وەزارەتخانەکانی کشتوکاڵو پیشە و هونەرو بازرگانی " بە ژمارەیەکی دیاریکراوی هێزی نیشتیمانییەوە، کە بۆ پاراستنی ئاسایش و تەناهیی گشتی پێویست دەبن" وەزارەتی دارایی و کار و کولتوور و لەشساخی و هەروەها ئیدارەگەلیهێنان و راگواستن و شارەوانی و داد.

2ـ خەڵکی ئازەربایجان مافی ئەوەیان دەبێ لە کاروباری ئیدارە خۆجێییەکان و وانەگوتنەوە لە قوتابخانەکاندا و لە دادگاییکردن و ...دا لە زمانی ناوچەیی کەڵك وەرگرن.

3ـ سەرۆکی وەزیرانی دەوڵەتی ئەیالەتیی ئازەربایجان لە هەمان کاتدا پارێزگاری پارێزگای ئازەربایجانیش دەبێ، کە دەبێ بە پەسندی دەوڵەتی ئێران بێ.

فەرماندەی بنکەی سەربازیی ئەیالەتی ئازەربایجان لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە و بە قایلبوونی دەوڵەتی ئەیالەتیی ئازەربایجان دیاری دەکرێ. لە بەشی گرووپگەلی یەکە سەربازییەکاندا یاسا و پرەنسیپی گرووپە نیشتیمانی و ناوچەییەکان دیاری دەکرێن.

پێوەندییەکانی دەوڵەتی ئەیالەتیی ئازەربایجان لەگەڵ حکوومەتی ناوەندیدا بە زمانی فارسی دەبێ.

4ـ لە بابەت دیاریکردنی داهاتەماڵیاتییەکان و گوژمەی ئازەربایجانی ئێرانەوە، 70٪ داهاتی ئازەربایجان بۆ بودجەی دەوڵەتی ئەیالەتیی ئازەربایجان تەرخان دەکرێ.

دووەم : سەبارەت بە ئیمتیازی نەوت ـ دەوڵەتی سۆڤیەتی بە نیشانەی پێشوازیی نیازپاکانە لە حەزی دەوڵەتی ئێران ئامادەیە، کە چاوپۆشی لە ئەسپاردنی ئیمتیازی نەوتی ناوچەکانی باکووری ئێران بکات و لەبەرامبەردا پێشنیار دەکا، کە کومپانیایەکی تێکەڵیی ئێران و سۆڤیەتی بۆ دۆزینەوە و هەڵێنجانی ئەو بەروبوومەی، کە لە نەوت وەردەگیرێن، لە باکووری ئێران دامەزرا. بەوشێوەیە، کە 51٪ی بەرکەوتە (سهام) بە سۆڤیەتی و 49٪ی تەواو بە ئێران ببڕدرێ.

سێیەم ـ سەبارەت بە مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێراندا ـ دەوڵەتی سۆڤیەتی گەرەکیەتی لە رێکەوتی دووەم ی مارسەوە دەست بکات بە کشاندنەوەی هێزەکانی خۆی لە هێندێ ناوچەی ئێران، بەڵام لە پێوەندی لەگەڵ باقیی هێزەکانی سۆڤیەتی ئەو هێزانە بەشێوەی کاتی و بە پێی پەیماننامەی رێکەوتی 25ی فێبرییەی 1921ی ئێران و سۆڤیەتی لە ئێراندا دەمێننەوە و کاتێك بە تەواوەتی لە ئێران دەکشێنەوە، کە دەوڵەتی ئێران هەموو هەوڵ و کردەوە دوژمنکارییەکانی خۆی بەرامبەر بە دەوڵەتی سۆڤیەتی وەلابنێ و لە باکووری ئێران هێمنایەتی سەقامگیر بێ و سیاسەتێکی دۆستانە لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەتیدا رەچاو بکا."

لە وەڵامی ئەم ئاگادارییەدا رێکەوتی 7ی رەشەممە ئەم ئاگادارییەی خوارەوە بە ناوی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەتی ناردرا:

" پێشەکی پێویستە بەو پەڕی روونی و راستگۆیی و لە رووی باوەڕەوە ئەوە بڵێم، کە بە پێچەوانەی هێندێ دەنگۆ، بواری دۆستایەتیی ئێران وسۆڤیەتی لە تەواوی ئێراندا تەواو لەبارە و دەکرێ ئەم زەمینەیە بە هێندێ را و تەگبیر و بە نەهێشتنی هۆکارەکانی خراپ لێك تێگەیشتن بە خێرایی لە هەموو ئێراندا پەرە پێ بدەین بە پێچەوانەی شێوازەکانی دیکەی وەکو درێژەپێدان بە ماوەی مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی یا دامەزراندنی خودموختاری لە نێو ئێراندا

بە جیدی ئەو دۆستایەتی و خۆشەویستییەی، کە پێویستە لە دڵی خەڵکی ئێراندا جێگیر بکرێ سارد و کاڵ دەبێتەوە و لایەنگرەکانی هیوابڕاو و ناهومێد دەکا.

گومان لەوەدا نییە، کە زۆرینەی خەڵکی ئێران هەر ئەوەندەی لێی سوور بێ، کە هیچ مەترسی و هەڕەشەیەکی یەکێتیی سۆڤیەتی لە سەر یەکپارچەیی و سەربەخۆیی وڵاتەکەیان نییە بێ تێڕامان لەگەڵ گەلی سۆڤیەتیدا دەبێتە دۆست و هاوکار و دەوڵەتی من بەو مەرجەی هەلومەرجی لەبار بخولقێ لەوە دڵنیا و ئارخەیانتان دەکاتەوە.

لە سەر مەسەلەی ئازەربایجان بۆ جارێکی دیکەش بە تایبەتی سەرنجتان بۆ ئەم خاڵە رادەکێشم، کە راگەیاندنی خودموختاری و دامەزراندنی دەوڵەت لە ئازەربایجان، کە هەر لە کۆنەوە بەشێکی دانەبڕاو لە ئێران بووە بێجگە لەوەش، کە پێشتر باسم کرد لەگەڵ دەقی یاسای بنەڕەتیی ئێران دژایەتیی هەیە، گەلێك گیروگرفتی لێ دەکەوێتەوە، کە هیچ دەوڵەتێك لە ئێراندا پێی چارەسەر ناکرێ.

یاسای بنەڕەتیی ئێران بەرهەمی شۆڕش و خەبات و فیداکاریی گەلی ئێرانە و تاقانە بەڵگەنامەی نیشتیمانیی سەردەمی مەشرووتەی گەنجی گەلی ئێرانە و ئەگەر پێچەوانەکەی لە بەشێکی وڵاتدا خۆ بنوێنێ هیچ گەرەنتییەك نامێنێتەوە، کە لە ئەیالەت و ناوچەکانی دیکەدا بۆ وەرگرتنی وەها ئاکامگەلێك بزووتنەوەی دیکەش وەڕێ نەکەون.

دەبێ لە بیرمان بێ، کە هەرچەشنە گۆڕانێك لە یاسای بنەڕەتیدا هەر بە پێی یاسای گۆرین، دەبێ لە سەر بانگهێشتن و دامەزراندنی پەرلمانی دامەزرێنەران و پرس وڕا بە رای گشتیی خەڵکی ئێران بکرێ.

کەوابوو لەبەر ئەوەی کە دامەزراندنی دەوڵەتی ناوچەیی و دەسنیشانکردنی وەزیران، لەگەڵ دەقی ئاشکرای یاسای بنەڕەتیی ئێراندا دژایەتیی هەیەودەوڵەتی ناوندی دەتوانێ رازی بێ بەوەی، کە تەنیا سەرۆك و بەڕێوەبەری هێندێ لە ئیدارەکان و تەنانەت پارێزگاریش لە سەر رەزامەندیی ئەنجوومەنی ئەیالەتی دیاری بکرێن.

بەڵام سەبارەت بەماڵیات و کاروباری رۆشنبیری و... دیارە پاش پێکهاتنی ئەنجوومەنی ئەیالەتی بەو دەستڕۆیشتووییەی، کە ئەنجوومەن هەیەتی لە سەر رەزامەندیی ئەنجوومەن بە کاری پێویستی بۆ دەکرێ.

کەچی سەبارەت بە چۆڵکردنی ئێران ئەوەی کە هێشتا بەرپرسانی بەڕێزی سۆڤیەتی کۆك نین لە سەر ئەوەی، کە هەتا 2ی مارس هێزەکانیان بە تەواوەتی لە ئێران بەرنە درەوە جێگەی داخە.

من لە سەرەتای دانوستانەکاندا لەگەڵ ژەنەراڵ ستالین وەبیرم هێنایەوە، کە مەبەستی من چارەسەرکردنی کێشەکان لە رێگەی دۆستایەتی و قایلکردنی دەوڵەتی مەزنی سۆڤیەتی و راکێشانی سەرنجیان بە لای بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی ئێراندایە و پێموابوو، کە پێویست ناکا پەنا بەرینە بەر بڕگەکانی یاسا و پەیماننامەکان، بەڵام، چونکی بەو حاڵەشەوە لە یادداشتەکەی ئەم دواییەتاندا ئاماژەتان بە پەیماننامەی 26ی فێبریەی 1921 کردووە بە پێویستی دەزانم پێتان بڵێم، کە پەیماننامەی گۆرین تەنیا کاتێك ئەو مافە بە دەوڵەتی سۆڤیەتی دەدا، کە هێزەکانی خۆی بنێرێتە نێو خاکی ئێرانەوە، کە دەوڵەتێکی دیکە بیەوێ ئێران بکاتە بنکە و پێگەیەك بۆ هێرشکردنەسەر یەکێتیی سۆڤیەتی و بۆ ئەم مەبەستە کارێك بکا و دەوڵەتی ئێرانیش باشاری نەکا. لەگەڵ ئەوەشدا، کە واتای ئەم مادەیە ئاشکرا و روون بوو دەوڵەتی ئێران دیسانیش بۆ ئەوەی پەیماننامەی گۆرینتر لە لایەن پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانییەوە پەسند بکرێ و هیچ لێڵی و ناروونییەکی تێدا نەمێنێتەوە لە سەر ئەم بابەتە لەگەڵ بەرپرسانی سۆڤیەتی کەوتە دانوستانەوە و نوێنەری دەسەڵات پێدراوی یەکێتیی سۆڤیەتی لە تاران بە پێی ئەو نامە فەرمییەی، کە لە رێکەوتی 12ی دیسێمبەری 1921 ناردوویەتی و ژمارەی 1600ی بەسەرەوەیە و بەشێکی سەرەکیی پەیماننامەی 26ی فێبریەی 1921ـە بۆ جارێکی دیکەش پێی لە سەر ئەم مەسەلەیەدا گرتۆتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هیچ وێناچێ، کە ئەو مادەیە بتوانێ پاڵپشتێك بێ بۆ مانەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێراندا. لە کۆتاییدا ناچارم بڵێم، کە بۆ من ئەوپەڕی جێگەی داخە، کە وا پێدەچێ، بەڵێن و تەگبیر و بابەتەکانی من، کە بە حەق نوێنەری تەواوی نیشتیمان پەروەران و ئازادیخوازان و هەموو چین و توێژە بێلایەنەکانی ئێرانم، لە چاو بانگەشە و ئیدیعای ئەو چەند کەسەی وا بە پێچەوانەی یاسای بنەڕەتی، خوازیاری حکوومەتێکی نوێن لە ئازەربایجاندا، لە لایەن بەرپرسانی سۆڤیەتییەوە کەمتر متمانەی پێکراوە.

**بەڵام لە بابەت نەوت و پێك هێنانی کۆمپانیای ئێران و سۆڤیەتەوە**

---

[1] گۆرین: ناوبراو، باسکراو

هیوادارم لەگەڵ چارەسەریی کێشەی ئازەربایجان و کشانەوەی تەواوی هێزەکانی سۆڤیەتی لە رێوە ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەك، کە هەر دوو لایەن لـە سـەر ی رێککـەون و پێـی قایـل بـن جێبەجێ بکرێ.

لە کۆتاییدا پێشنیار دەکەم بە بڕیارێکی دانسقە، کە تایبەتیی سیاسـەتڤانانی دوارۆژبـینی سۆڤیەتییە رەزامەندیی خۆیان لە سەر کێشانەوەی بە تەواوەتیی هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێـران دەربڕن بۆ ئەوەی بنەماکانی رێککەوتن و هاوکاری لە سەر پێوەندییە ئابوورییەکان و مەسەلەی نەوت دیاری بکرێن.

گومان لەوەدا نییە، کە ئەگەر هێنـدێ هەسـتی نادۆسـتانە و دژایـەتیش لـە نێـو تـاقم و گرووپگەلێکدا بۆ یەکێتیی سۆڤیەتی هەبێ بە تەواوەتی دەڕەوێتەوە و دادپەرەوەی و متمانـەی تەواو جێگەی دەگرێتەوە.

پاش وەرگرتن رەزامەندیی ئێوە لەم بارەیەوە من دەگەڕێمـەوە بـۆ تـاران و پـاش بـیر و ڕا گۆڕینەوە لەگەڵ دەوڵەت دانوستانەکانم لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەتی لە تاران درێژە پێدەدەم و تەواو دڵنیاشم، کە ئاکامی بڕاوەی لێ وەردەگرم."

پاش ئەو یادداشتە لە رێکەوتی 9ی رەشەممەدا یادداشتێکی توندتر لە لایـەن مۆلۆتۆڤـەوە گەیشت بەو شێوەیە:

1ـ ئیمتیازی نەوت ـ لە سـاڵی 1944دا دەوڵـەتی یـەکێتیی سـۆڤیەتی پێشـنیاری بـە دەوڵەتی ئێران کرد، کە ئیمتیازی نەوتی ناوچە باکوورییەکانی ئێران بدات بە سۆڤیەتی. مـافی یەکێتیی سۆڤیەتی لە وەرگرتنی ئەم ئیمتیازەدا بە هیچ شێوەیەك بۆ مشتومڕ نابێ بە تایبەتی ئەگەر لەوە بڕوانین، کە لە باشووری ئێران زۆر لە مێژە ئیمتیازی نەوت بە بریتانییـەکان دراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێران گەلاڵەی سۆڤیەتیی رەت کردەوە.

دەوڵـەتی سـۆڤیەتی بـۆ پێشـوازیی نیازپاکانـەی خـۆی لـە لایـەنی ئێرانـی و بـە زیـانی بەرژەوەندەکانی خۆی لەرێکەوتی 25ی فێبریـیـەی ئـەو سـاڵە داوای پـێ بـاش بـوو لـە بـری پێشنیاری ئیمتیـازی نـەوت پێشـنیاری پێکهـاتنی کۆمپانیایـەکی هاوبەشـی نـەوتی ئێـران وسۆڤیەتی بێنێتە گۆڕێ بەو شێوەیە، کە 51٪ لە بەرکەوتی و پشکەکە بە سۆڤیەتی و 49٪ ی بە ئێران ببڕدرێ، بەڵام وەڤدی ئێرانی لە ئاگادارکردنـەوەی رێکـەوتی 26ی فێبرییـەدا بـەو پێشنیارە قایل نەبوو.

به لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئێستا دەردەکەوێ لایەنی ئێرانی حەزی لێ نییە بەرژەوەندی سۆڤیەتی لەم رووەوە لەبەرچاو بگرێ و بەو جۆرە بە راشکاوی لە بەرامبەر سۆڤیەتیدا فەرق و جیاوازی دەکا کۆمیسیێری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەتی بەو شێوەیە رادەگەیەنێ، کە پاش راگەیاندنی راپۆرتی پێوەندیدار بە جەنابی سەرۆکی وەزیران ستالین بڕیار دراوە پێشنیاری کۆمپرۆمیسی سۆڤیەتی وەربگیرێتەوە و هەر ئەو پێشنیارە فەرمییەی ساڵی 1944 بووژێنێتەوە، کە پێیدا هاتووە چۆن ئیمیتازی نەوتی باشوور بە بریتانییەکانی دراوە ئاوهاش دەبێ ئیمتیازی نەوتی باکوور بە سۆڤیەتی بدرێ.

2 ـ مەسەلەی ئازەربایجان ـ لایەنی سۆڤیەتیی وەك بابەتێکی نێوخۆیی سەیری مەسەلەی ئازەربایجان دەکا و دەزانی، کەچی بە سەرنجدان بە دانوستانی سەرۆك وەزیرانی ئێران لە سەر ئەوەی کە لایەنی سۆڤیەتیی ببێتە نێوبژیوان بۆ رێکخستنی مەرجەکانی رێککەوتنی هەردوو دەوڵەتی ئێران و ئازەربایجانی ئێراندا، لایەنی سۆڤیەتیی داواکەی ئێرانی وەرگرت و مەرجە پێووەندیدارەکانی پێشنیار کردن.

بەو شێوەی، کە لە ئاگادارکردنەوەکانی رێکەوتی 26ی فێبرییەی لایەنی ئێرانیدا دەردەکەوێ لایەنی ئێرانی مەرجە پێشنیار کراوەکان رەت دەکاتەوە و لە هەمان کاتدا بە پێی زانیارییە گەیشتووەکان، نوێنەرەکانی ئازەربایجانی ئێرانیش پێشنیارەکانیان وەرنەگرتووە و پێی قایل نەبوونە. کەوابوو نێوبژیوانیی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەم بارەیەوە پووچەڵ دەبێتەوە.

3ـ هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێراندا ـ رای دەوڵەتی سۆڤیەتی ئەوەیە، کە لە نێو کۆڕ و کۆبوونەوەکانی دەسەڵاتدارانی ئێراندا کۆمەڵێك پیاوی پایەبەرزی دەوڵەتی هەن، کە سیاسەتەکانی خۆیان لە سەر بنەمای هەوڵدان بۆ کێشەخولقاندن لە نێوان یەکێتیی سۆڤیەتی و دەوڵەتە مەزنەکەی دیکە داناوە بۆ ئەوەی لە ناتەباییەکانی نێوانیان کەڵکی خۆیان وەرگرن و دەسبەسەر ئازەربایجانی سۆڤیەتی و بادکوبە و تورکەمەنستاندا بگرن.

هەر وەکی ساڵی 1919 لە کۆنفرانسی پاریسدا یادداشتێك لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بە دەسەڵاتداری سەمساموسەلتەنە و بە واژۆی مشاورلمالك وەزیری کاروباری دەروەی ئەو کات پێشکەش کرا و تێیدا داوا کرابوو، کە ئازەربایجانی سۆڤیەتی و شاری بادکوبە و تورکەمەنستانی سۆڤیەتی لەگەڵ شارەکانی عیشق ئاباد و مەرو و بەشێك لە ئەمەنستان و شاری ئێرەڤان و... بدرێنە ئێران. لەگەڵ ئەم سیاسەتە داگیرکارانەی ئێراندا، دەوڵەتی سۆڤیەتی لە سەرەتای دامەزرانییەوە بەردەوام هەڵسوکەوتی دۆستانەی خۆی لە بەرامبەر ئێراندا

دەخستە روو و لە مانگی فێبرییەی ساڵی 1921 پەیماننامەیەکی مۆر کرد، کە بە پێی ئەم پەیماننامەیە بۆ نیشاندانی دۆستایەتی ڕێگەی شەمەندەفەڕی روسیا و ڕێگە چەورێژکراوەکان و ئیسکلە و بەندەرەکان و کەشتییەکان و بانك و هێڵەکانی تەلەگراف و تەلەفۆن و ئەو دوورگانەی، کە ملکی روسیا بوون هەر هەمووی بە دڵە و بەبێ بەرامبەر دایە ئێران.

دەوڵەتی سۆڤیەتی چاوەڕانیی ئەوەی بوو، کە کۆر و کۆمەڵەی دەسەڵاتداریێتیی ئێران بایەخ و ڕێزی ئەم هەڵسوکەوتە دۆستانەیەی ئێران بزانێ، کە لە مێژووی پێوەندییەکانی نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا وێنەی نەبووە .

بەڵام چەند مانگ پاش بەستنی ئەم پەیمانە دەوڵەت هەر لەو ساڵەدا ئیمتیازی نەوتی باکووری ئێرانی لە نزیکترین خاڵی سنووریی سۆڤیەتی دایە کۆمپانیایەکی دەرەکی بە ناوی ستاندارد ئۆیل بۆ ئەوەی لەم ڕێگەوە زیانێك بە بەرژەوەندەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی بگەیەنێ.

لە ساڵی 1937دا دەوڵەتی ئێران دیسان ئیمتیازی نەوتی ناوچەکانی هەڵکەوتووی سنووری یەکێتیی سۆڤیەتیی لای خۆرهەڵاتی دەریای خەزەری دا بە کۆمپانیایەکی نەوتی ئەمریکی ئەمجارەش بەو خەیاڵپڵاوەی، کە لەم ڕێگەوە زیانێك بە بەرژەوەندەکانی سۆڤیەتی بگەیەنێ و یەکێتیی سۆڤیەتی و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تێك بەردا. ئەم گرێبەستەش ساڵێك دواتر بە هۆی نارەزایەتیی دەربڕینی یەکێتیی سۆڤیەتی هەڵوەشایەوە.

پێویستە ئەوەش وەبیر بێنینەوە، کە دەوڵەتی ئێران، کە ئەو ئیمتیازانەی سەرەوەی دەدایە دەوڵەتانی تر بەردەوام خۆی لەوە بواردووە و دەبوێرێ، کە مافی ئیمتیاز لە باکووری ئێران بە یەکێتیی سۆڤیەتی بدات.

هەمووی ئەم شتانە ئەوە دەردەخەن، کە کۆڕوکۆمەڵی دەسەڵاتداری ئێران نیازی چەوتیان بەرامبەر بە یەکێتیی سۆڤیەتی هەیە و لە دەرفەتێك دەگەڕێن، کە زیان و زەرەر بە بەرژەوەندەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی بگەیەنن و ناوچە نەوتییەکانی ئازەربایجانی سۆڤیەتی و تورکەمەنستانی سۆڤیەتی بخەنە بەر هەڕەشە و مەترسییەوە.

ناکرێ ئەمە بە شتێکی ڕێکەوت بزانین، کە هەر لەم دواییانەشدا لە ساڵی 1945دا کۆڕوکۆمەڵی دەسەڵاتداری ئێرانی ئاغای حەکیمی‌یان، کە هەستی دوژمنایەتیی ئەو بەرامبەر بە یەکێتیی سۆڤیەتی لەکەس شاراوە نییە کردە سەرۆکوەزیرانی ئێران و ناوبراو هەر ئەو کەسەیە، کە لە کابینەی سەسامۆسەڵتەنەدا یادداشتە داگیرکارانەکەی سەبارەت بە ئیدیعا و

داوای ئێران بۆ بادکوبە و ئازەربایجانی سۆڤیەتی و تورکەمەنستانی سۆڤیەتیی پێشکەش بە کۆنفرانسی پاریس کردبوو و یەکێك بوو لە وەزیرە پایەبەرز و ناودارەکان.

هەرەوەکی هەمووان دەزانن، کە دەوڵەتەکەی حەکیمی نەگەیشتە مانگی فێبرییەی 1946 و بە کردەوەکانی خۆی کەشی پێوەندییەکانی ئێران سۆڤیەتیی تێکدا.

بە پێی ئەم لێکدانەوانە، یەکێتیی سۆڤیەتی ناچارە لەبەرامبەر دەسەڵاتدارانی ئێرانیدا بە پارێز بی و هەر بۆیەش ناچارە کێشانەوەی هێزەکانی خۆی لە باکووری ئێران وەدرەنگی بخا."

**لە وەڵامی ئەم یادداشتەی سەرەوەدا ئاگادارکردنەوەی خوارەوە ناردرا:**

"بۆ جارێکی دیکەش بە پێویستی دەزانم ئەوە بڵێمەوە، کە ئامانجی دەوڵەتی من لەو پەڕی دڵسۆزیدا پتەوکردنی پێوەندیی دۆستایەتیی نێوان یەکێتیی سۆڤیەتی و ئێرانە و هەتا ئێستاش لەم پێناوەدا هەوڵم داوە و لە داهاتووشدا هەر هەوڵ دەدەم.

گومان لەوەدا نییە، کە ئەگەر یەکێتیی سۆڤیەتی لەم بابەتەوە یارمەتیم بدات لە مەبەستی سەرەکیمدا، کە پێك هێنانی دۆستایەتییەکی پتەو و نەبڕاوەیە، سەردەکەوم.

1ـ سەبارەت بە نەوت ـ لە پێوەندی لەگەڵ دامەزراندنی کۆمپانیایەکی تێکەڵیی نەوتی ئێران و سۆڤیەتی، کە پێتان وایە ڕەزامەندییان دەرنەبڕیوە، وا نییە و دەبێ بە تایبەتی وەبیر بێنمەوە، کە هەرەوەکی لەوەپێشیش باسی کراوە، ئەگەر لە کێشانەوەی خێرای هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێران و چارەسەریی مەسەلەی ئازەربایجاندا یارمەتیم بدەن دەرفەتێکی لەبار دەبێ، بۆ ئەوەی پاش گەڕانەوە بۆ تاران و ڕێککەوتن لە سەر مەرجەکانی کۆمپانیای تێکەڵی، گەڵاڵەی پێویست بدرێتە پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانیی ئێران و ئەو مەسەلەیە دەبێ بەو شێوەیەی، کە هەر دوو لایەن لە سەر ی ڕێك بکەون، چارەسەر بکرێ.

مەبەست ئەوەیە، کە دامەزراندنی ئەم جۆرە کۆمپانیایانە تەنانەت ئەگەر لە لایەن هاووڵاتیانی ئێرانیشەوە بن، بە پێی یاسای بنەڕەتیی ئێران دەبێ پەرلمانەوە پەسندیان بکا. با ئەوەش وەبیر بێنمەوە، کە دانی پوان و ئیمتیاز لە لایەن ئێرانەوە پێوەندیی بە مافی دەسەڵاتدارێتی و سەربەخۆیی وڵاتەوە هەیە، کە دەبێ پەرلمان پەسندی بکات و ئەگەر لە نیو سەدەی پێشوودا واتە بەر لە سەردەمی مەشروتەی ئێران بە پێی هەلومەرجی ئەو کات ئیمتیازگەلێك درابێن ناکرێ ئێستا ئەوە بە جیاوازی خستنێك بەرامبەر بە دەوڵەتی سۆڤیەتی لەقەڵەم بدرێ.

2ـ مەسەلەی ئازەربایجان ـ هەروەکی لەوەپێشیش وتوومە ئەو رەوش و وەزعەی ئێستا لـە ئازەربایجاندا لە ئارا دایە دژایـەتیی ئاشـکرای لەگـەڵ دەقـی یاسـای بنـەڕەتیی وڵات و مـافی حوکمڕانی و سەربەخۆیی ئێراندا هەیە، کە دەوڵەتی یەکێتیی سۆڤیەتی هەر لە شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبەری 1917 ـەوە هەتا گرێبەستی سێ قۆڵی و کـۆنفرانس و راگەیەندراوەکـەی تـاران، بەردەوام رێزی لێگرتووە.

بەڵام سەبارەت بە کاروباری نێوخۆیی ئەو دەڤەرە من بەو پـەڕی نیازپاکیمـەوە بـە تـەمام هەرچەشنە چاکسازییەکی، کە خەڵکی ئەوێ ئارەزوویان بێ هەتا ئەو جێگەیـەی، کـە یاسـای بنەڕەتیی ئەم وڵاتە ئیزن بدات جێبەجێی بکەم و مەبەست ئەوەیە، کە بە یارمەتیی مەعنەویی دەوڵەتی سۆڤیەتی ئەو چاکسازییانە لە کەش و هەوایـەکی هـێمن و بـێ کێشـەی نێوخۆییـدا بەڕێوە بچێ.

3ـ سەبارەت بە هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی لەئێراندا ـ لەمەڕ چوونەدەرەوەی هێزەکـانی هاوپەیمانەکان لە خاکی ئێران دەبێ ئەوە بڵێم، کە بە پێی ئەسڵی (106)ی یاسـای بنـەڕەتیی ئێران مانەوە و رابردنی هێزی دەرەکی بە خاکی ئێراندا دەبـێ لـە سـەر ئیزنـی پـەرلمان بـێ و گرێبەستە سێ قۆڵییەکەش، کە ئیزنیدا هێزەکـانی هاوپەیمانـەکانی لـە سـەردەمی شـەڕدا لـە ئێراندا بمێننەوە لە لایەن پەرلمانەوە پەسند کراوە و، چونکی بە پێی مادەی 5ی ئەم گرێبەسـتە ئەم هێزانە هەتا 2 ی مارسی 2006 دەبێ خـاکی ئێـران بـە جـێبێڵن و لـە راگەیەنـدراوی تارانیشدا، کە جەنابی ستالینیش واژۆی کردووە و هەروەها بە پێی ئـەو شـتانەی بەرپرسـانی دەسەڵاتداری سۆڤیەتی لە کۆڕوکۆبوونەوەی نێودەوڵەتیدا لە سەر ئێرانیـان دەربڕیـون بـەردەوام بەڵێنی ئەوەیان داوە، کە بە پێی بەڵێنی راشکاوانەی خۆیان هەموو هێزەکەیان لە خاکی ئێرانێ بەرنە دەرەوە، درێژەدان بە مانەوە پاش رێکەوتی گۆرین بە پێچەوانەی بەڵێن و گفتەکانیانـە و بە پێچەوانەی ئەسڵی 106ی یاسای بنەڕەتیی ئێرانیشە و ئەوەش، کە ئاماژەتان بـە هێنـدێ لێدوان لە کابینەی سەمساموسەلتەنە و یادداشتێك لە لایـەن مشـاورلمالکەوە کـردووە ئـەوە روون و ئاشکرایە، کە قسە و لێدوان یا یادداشتی هێندێ لە دەسەڵاتدارانی ئێرانی لە 27 ساڵ لەمەوبەردا، کە لە ئاکامی زوڵم و زۆریی دەوڵـەتی تـەزاریی روسـیا و لـە جەنگـەی شۆڕشـی ئۆکتۆبەری 1917دا و بەر لە گرێبەستی دۆسـتایەتی لەگـەڵ دەوڵـەتی سـۆڤیەتیدا هاتۆتـە پێشێ، نابێتە فاکتەرێکی قایلکەر بۆ ئەوەی دەوڵەتی سۆڤیەتی بەو ناو و بیانوانەوە خۆ ببوێرێ لە تەواوی ئەو گفت و بەڵێنە ئاشکرایانەی، کە بـە پێـی پەیمانـە سـێ قۆڵییەکـەی رێکـەوتی

ژانویەی 1942 لە سەر مەسەلەی چوونەدەرەوەی تەواوی هێزەکانی لە خاکی ئێراندا بەرعۆدەیانە."

بە دوای ئەم ئاگادارکردنەوەیەدا دەوڵەتی سۆڤیەتی رایگەیاند، کە هەوڵی بە جێهێشتنی بەشێك لە خاکی ئێران لە رێکەوتی 2ی مارسی 1946 ـەوە دەست پێدەکا. قەواموسەڵتەنە دیسان ئەم یادداشتەی بۆ ناردن:

جەنابی کۆمیسێری نیشتیمانی

لە رۆژنامەی ئیزۆستیای ژمارەی 53/8969 ی رێکەوتی 2ی مارسی 1946دا رایەڵەی تاس راگەیەندراوێکی بڵاو کردۆتەوە لە سەر ئەوەی، کە دەوڵەتی سۆڤیەتی بڕیاری داوە لە رێکەوتی 2ی مارسی 1946ـەوە دەست بکا بە کێشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ناوچەکانی خۆراسان و شاهروود و سیمنان. هەروەها باسی ئەوەی کردووە، کە هێزەکانی سۆڤیەتی لە باقی ناوچەکانی دیکەی ئێراندا دەمێننەوە هەتا ئەو کاتەی، کە رەوشەکە لایەکی بە لایەکیدا دەکەوێ.

**بە پشتبەستن بەو هەواڵە، بە پێویستی دەزانم، کە پێتان رابگەیەنم:**

بە پێی گرێبەستە سێقۆڵییەکەی تاران، کە لە رێکەوتی 29ی ژانوییەی 1942 لە نێوان ئێران و یەکێتیی سۆسیالیستی و بەریتانیای مەزندا بەسترا هێزەکانی هاوپەیمانەکان بێ ئەملاوئەولا دەبێ لە رێکەوتی 2ی مارسی 1946دا لە خاکی ئێران بچنە دەرەوە و ئەوە هیچ قسەی لە سەر نییە، هەروەکی هێزەکانی هاوپەیمانەکان لە رێکەوتی گۆریندا بە تەواوی ئێرانیان بەجێهێشت مانەوەی هێزەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ پەیمانی گۆریندا ناگونجێ و پێچەوانەی لێدوانە بەردەوامەکانی دەوڵەتی سۆڤیەتییە لە سەر ئەوەی کە دەڵێ دەوڵەتی سۆڤیەتی بە تەواوەتی پێبەندی رێوشوێنەکانی ئەو پەیمانەیە. جگە لەوەش بڕیاری ئەم دواییانەی دەوڵەتی سۆڤیەتی لەگەڵ یاسای بنەڕەتیی ئێران و لەگەڵ گرێبەستەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەتیشدا یەك ناگرێ تەوە و دژایەتیی هەیە.

بە پێی ئەو شتانەی باسیان کرا ناچارم بە ناوی دەوڵەتی ئێرانەوە بەوپەڕیداخەوە بەرامبەر بەم بڕیارەی یەکێتیی سۆڤیەتی ناڕەزایەتی دەربڕم و داوا بکەم بڕیاری لێبڕاوانە بدەن، کە بە

زووترین کات هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێران وەدەر کەون، داواکارم ڕێز و حورمەتی من بەرامبەر بە خۆتان وەربگرن".

پاش گەڕانەوەی قەواموسەڵتەنە بۆ ئێران، گوشارە نێودەوڵەتییەکان دەوڵەتی سۆڤیەتی‌یان ناچار کرد بەرامبەر بە ئێران بەخۆیدا بچێتەوە، بەڵام چوونەدەرەوەی هێزەکانی سۆڤیەتی لە ئێران هەروا بە دانی ئێمتیازی نەوتی باکوورەوە گرێ درابۆوە. ئەگەر پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی پێشی بە دانی ئیمتیازی نەوت گرتبایە تەنیا ڕێگەی چارەسەر ڕێککەوتن بوو لە سەر دامەزراندنی کۆمپانیاییەکی تێکەڵی نەوتی ئێران و سۆڤیەتی، کە 51٪ی بەرکەوتەکەی بۆ سۆڤیەت و 49٪ی بەرکەوتیشی بۆ دەوڵەتی ئێران بایە، بەڵام جێبەجێبوونی ئەم ڕێککەوتننامەیەش بە پەرلمانی ئەنجوومەنی نیشتیمانی ئەسپێردرا، کە پەسندی بکا، کە ئەویش بەمەرجێك هەڵبژاردنەکانی بەڕێوەدەچوو، کە هێزە دەرەکییەکان بە تەواوەتی ئێرانیان بەجێهێشتبایە.

ئاخری پاش ڕێککەوتن لە سەر بنەماکانی دامەزراندنی کۆمپانیای تێکەڵی نەوتی ئێران و سۆڤیەتی ئەم ڕاگەیەندراوەی خوارەوە لە سەر چۆنێتیی چوونەدەرەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران و جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکە و مەسەلەی ئازەربایجان بڵاو بۆوە.

1ـ بەشەکانی لەشکری سوور لە ڕێکەوتی 24ی مارسی 1946دا لە ماوەی مانگ و نیوێکدا بە تەواوەتی لە ئێران دەچنە دەرەوە.

2ـ گرێبەستی دامەزراندنی کۆمپانیای تێکەڵی نەوتی ئێران و سۆڤیەتی و مەرجەکانی لە ڕێکەوتی 24ی مارسەوە هەتا بەسەرچوونی ماوەی حەوت مانگ بۆ پەسندکردن دەدرێتە پەرلمانی پازدە.

3ـ لە سەر مەسەلەی ئازەربایجان ـ لەبەر ئەوەی کە مەسەلەیەکی نێوخۆیی ئێرانە دەوڵەت ڕێگەی ئاشتیخوازانە بۆ چاکسازی بە پێی یاسای پێوەندیدار و بە نیازی قازانج پێگەیاندن بە خەڵکی ئازەربایجان، لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەدا دەگرێتە بەر.

بە دوای ئەم ڕێککەوتنەدا قەواموسەلتەنە بۆ ڕاکێشانی سەرنج و متمانەی ڕوسەکان سێ وەزیری توودەیی هێنایە نێو کابینەکەی خۆیەوە و پیشەوەریی سەرۆکی حکوومەتی ئازەربایجانی بۆ دانوستان بانگ کردە تاران، بەڵام لە سەر مەرجەکانی خودموختاریی ئازەربایجان بە هیچ نەگەیشتن و وەزیرە توودەییەکانیش لە چەند مانگێك پتر لە کابینەکەی قەوامدا خۆیان ڕانەگرت.

له مانگی سەرماوەزی ساڵی 1325(1946)دا هێزەکانی سوپا بەرەو ئازەربایجان وەڕێکەوتن و هێزەکانی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان و (پێشمەرگەی) کوردستان بە بێ هیچ بەرەبەرەکانییەك سەنگەرەکانیان بۆ چۆڵکردن. دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە بە رواڵەت، بە دوای وریایی (ئۆلتیماتیۆمی) ترۆمەن سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئەمریکادا خۆی لە پشتیوانیکردن لە حکوومەتەکانی سەربەخۆی لە ئازەربایجان و کوردستاندا بواردبوو، هیواردار بوو، کە لانیکەم بە دامەزراندنی کۆمپانیایەکی تێکەڵی نەوتی ئێران و سۆڤیەتی شوێن پێیەك لە ئێراندا بۆخۆی بکاتەوە، بەڵام ئەو هیوایەشی لێ پووچەڵ بۆوە و پەرلمانی پازدە رۆژی 30ی رەزبەری 1326 (ئۆکتۆبەری 1947) بە کۆی دەنگ پێشنیاری دامەزرانی کۆمپانیای تێکەڵی نەوتی ئێران و سۆڤیەتی رەت کردەوە.

ئەو مەسەلەیە لە رۆژی 13ی خەزەڵوەری 1326دا(نۆڤەمبەری 1947) لە نامەیەکدا بە یەکێتیی سۆڤیەتی راگەیەندرا و سادچیکۆڤ باڵوێزی سۆڤیەتی لە ئێران لە نامەیەکدا بە لەبزێکی توند و تیژ بۆ سەرۆکی وەزیرانی ئێران، ئەم هەوڵەی دەوڵەتی ئێرانی بە پەیمانشکێنی و دوژمنکارانە ناو برد و دەوڵەتی ئێرانی لە دەرهاویشتە و ئاکامەکانی ئەو بڕیارە بە بەرپرسیار زانی. قەواموسەلتەنەوەڵامی ئەم نامەیەی دایەوە و شادچیکۆڤ دیسان لە یادداشتێکدا لە رێکەوتی یەکەمی دیسێمبەری 1947دا وێڕای پشتڕاستکردنەوەی بڕگەکانی نامەکەی پێشووی خۆی نووسیی:" هەوڵی بەخۆڕایی دەوڵەتی ئێران بۆ ئەوەیە، کە پەیمانشکێنییەکەی دەوڵەت وەك کردەیەکی رەوا بخاتەڕوو."

رووداوەکانی ئازەربایجان و گوشاری سۆڤیەتی بۆ سەر ئێران بۆ وەرگرتنی ئیمتیازی نەوت لە ئێران بووە هۆی ئەوەی کە ئەم ولاتە رۆژ لەگەڵ رۆژ بە لای ئەمریکادا بشکێتەوە و پاش هەوڵی بێ ئاکامی تیرۆری شا لە رێبەندانی 1948دا، کە بەسەر حیزبی توودەیاندا هێنا و، هەڵوەشاندنەوەی ئەم حیزبە و گیرانی سەرکردەکانی حیزبی لێکەوتەوە پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتی رۆژبەرۆژ ئاڵۆزتر و لێڵ تر بوونەوە. لە جەنگەی بە نیشتیمانیکردنی نەوت و قۆناغی حکوومەتی موسەدیقدا حیزبی توودە، کە لە ژێر هێندێ ناوی دیکەی وەك کۆمەڵەی خەبات دژی ئیستیعمار، لایەنگرانی ئاشتی و لاوانی دیموکراتدا دەستی کردەوە بە چالاکی، بەڵام لەگەڵ رووداوەکانی 28ی گەلاوێژی 1332 (سپتامبری 1953) و هەرەسهێنانی موسەدیقدا، ئەم رێکخراوەیەش پەرش و بلاو بوو و رۆڵی ئەمریکا لەهێنانەوە سەرکاری شادا، ئەم ولاتەی (ئەمریکا) کردەوە یاریزانی سەرەکیی گۆڕەپانی سیاسەتی ئێران. سۆڤیەتییەکان، کە

یارییەکەیان دۆڕاندبوو ئەمجارەیان لە ڕێگەی دۆستایەتی و ئاشتیخوازانەوە هاتنە پێشێ و هاوکات لەگەڵ ئاشکرابوونی تۆڕی ڕێکخراوەیی حیزبی توودە و تیربارانکرانی ئەفسەرانی توودەیی، یازدە تەن ئاڵتوونی ئێرانیان، کە لە سەردەمی شەڕەوە زەوتیان کردبوو بە نیشانەی نیازپاکی دایەوە بە ئێران. لەرۆژی 25ی ژوئەنەوە هەتا 13ی ژووئیەی 1956 شا لە سەر بانگهێشتی فەرمیی دەوڵەتی سۆڤیەتی سەردانی ئەو وڵاتەی کرد و لەم ڕێکەوتەوە هەتا مانگی مارسی 1959، کە ئێران و ئەمریکا گرێبەستێکی هاوکاری و یەکێتییان پێکەوە واژۆ کرد، پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتی تارادەیەك باش بوو. لەو ماوەیەدا چەند گرێبەستێك لە نێوان ئێران و سۆڤیەتیدا بۆ زیادکردن و گەشە پێدانی ئاڵوگۆڕی کاڵا و رابوردنی ترانزینیی کاڵا و کەڵکوەرگرتنی هاوبەش لە رووبارە سنوورییەکانی ئاراس و ئەترەك واژۆ کران.

گرێبەستی دوو لایەنەی نێوان ئەمریکاو ئێران و گەشە پێدانی چالاکیی راوێژکارانی سەربازیی ئەمریکا لە ئێراندا بە سەرەتاو دەسپێکی قۆناغێکی قەیراناویی نوێی پێوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەتی بوو. بڵاوبوونەوەی قسەکانی خرۆشۆف ڕێبەری سۆڤیەتی، کە وتی" ئێران سێوێکی رزیوە، کە خۆی لە دارێ دەبێتەوە" شەڕێکی بانگەشەیی و پروپاگەندەیی چڕی لە نێوان تاران و مۆسکۆدا هەڵایساند، کە هەتا ساڵی 1962ی خایاند. روسەکان شێوازێکی دوژمنکارانەیان لە بەرامبەر ئێراندا گرتە بەر و بۆ جارێکی دیکەش بە ناوی ئەوەی، کە ئێران دەیەوێ بنکەی سەربازی بۆ ئەمریکا بکاتەوە هەڕەشەی بووژاندنەوەی بڕگەی شەشەمی گرێبەستی 1921 یان لە ئێران کردەوە. شا، کە لە حکوومەتی نوێی کێنێدی لە ئەمریکا نیگەران بوو ئەمجارەیان لە بەرامبەر روسەکاندا نەرمیی نواند و رۆژی 15ی سپتامبری 1962 بە ناردنی یادداشتێك لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بۆ سۆڤیەتی لەمەڕ ئەوەی کە ئیزن بە هیچ وڵاتێکی دەرەکی نادەن، کە بنکەی مووشەکی لە ئێراندا دامەزرێنێ، پێوەندیی ئێران و روسیا ئاسایی بۆوە و شەڕی پرۆپاگەندەیی نێوان ئێران و سۆڤیەتی کۆتایی پێهات.

لەم ڕێکەوتە بە دواوە دەوڵەتی سۆڤیەتی بە پشتیوانیکردن لە (شۆڕشی سپی) ی شا هەوڵیدا خۆی لای وی شیرین بکات و بە سەردانی فەرمیی بێرژنێڤ بۆ تاران (کاتێك، کە تەنیا پۆستی سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕێبەرایەتیی ئەنجوومەنی باڵای یەکێتیی سۆڤیەت یا سەرۆك کۆماریی ئەو وڵاتەی لە ئەستۆ بوو) و دووەمین سەفەری فەرمیی شا بۆ سۆڤیەت لە ژوئەنی 1965دا ئەستوونەکانی پێوەندیی نێوان ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتی پتەوتر کران. لە ماوەی ئەم ساڵانەدا کۆمەڵە گرێبەستێکی نوێ لە بوارەکانی تەکنیکی و ئابووری لە نێوان ئێران و

سۆڤیەتدا واژۆ کران و ئێران بۆ یەکەمین جار کۆمەڵێك کەرەسەی سەربازیی لە دەوڵەتی سۆڤیەتی کڕی. لە ساڵی 1966دا کۆمەڵە گرێبەستێك سەبارەت بە سازکردنی کارخانەی ئاسن تواندنەوە لە نزیکیی ئیسفەهان و کارخانەی ترۆمبێل سازی لە ئەراك لە نێوان ئێران و سۆڤیەتدا واژۆ کران و، بە دوای ئەوەدا گرێبەستێك لە سەر کێشانی لوولە(بۆڕی)ی گازی ئێران بۆ سۆڤیەت لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا بەسترا.

دەکرێ ساڵانی 1966 هەتا 1978 بە باشترین ساڵی پێوەندییەکانی نێوان ئێران یەکێتیی سۆڤیەتی لە سەردەمی شادا لەقەڵەم بدەین، چونکی شا لەم ساڵانەدا زۆربەی ئیمتیاز و پوانە نەوتییەکانی خستە بەر دەستی سۆڤیەت و وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتی و پاش تەواوبوونی هێڵی لوولەی گاز، کە گازی ئێرانی بە هەرزانبایی ترین نرخ بە یەکێتیی سۆڤیەتی دەدا، هێڵی دووەمی راگواستنی گازیش دەستی پێکرا. بە هەزاران پسپۆڕی روسی بۆ جێبەجێکردنی گەڵاڵە و پرۆژەکانی دامەزراندن و سازکردن و گەشە پێدانی کارخانەی ئاسن تواندنەوەی ئیسفەهان و ماشێن سازیی ئەراك و بینای سایلۆ (عەمباری گەنم و دانەوێڵە) و گەلێك پرۆژەی هاوبەشی دیکەی ئابووری هاتنە ئێران و دەوڵەتی سۆڤیەتی تەنانەت حیزبی توودەشی ناچار کرد، کە لە بڵاڤۆك و چاپەمەنییەکانی خۆیدا لە دەرەوەی وڵات، پشتیوانی لە بەرنامە ریفۆرمیستییەکانی شا بکا. دەوڵەتی سۆڤیەتی لە جێژنەکانی تاج لە سەر نان و دووهەزار و پێنسەد ساڵەی پادشایەتیش‌دا بەشداریی کرد و پادگۆرنی سەرۆك کۆماری سۆڤیەتی بۆ بەشداری لە جێژنەکانی دووهەزار و پێنسەد ساڵەی پادشایەتیدا هاتە ئێران، لە حاڵێکدا مەلیکەی بەریتانیا و سەرۆك کۆماری ئەمریکا و فەرەنسا بۆ بەشداربوون لەم رێوڕەسمەدا بەدەم بانگهێشتنی "شا"وە نەچوون.

# دەوڵەتی سۆڤیەت و کۆماری ئیسلامیی ئێران

پەرەگرتن و بە لوتکە گەیشتنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە ئێران لە ماوەی ساڵی 1978دا سۆڤیەتییەکانیشی وەکو خۆرئاواییەکان تووشی سەرسوڕمان کرد و دەوڵەتی سۆڤیەتی، کە لە ڕەنگ و بۆنی ئایینیی ئەم شۆڕشە و ئاکام و دەرکەوتەکانی نیگەران بوو هەتا ئەو کاتەی هەرەسهێنانی شا مسۆگەر نەببوو لە پشتڕاستکردنەوەی شۆڕش خۆی دەبوارد. وریایی دانی بێرژنێڤ بە ئەمریکا لە سەر خۆبواردن لە دەستێوەردان لە کاروباری ئێراندا، کە لە ڕێکەوتی 19ی نۆڤەمبەری 1978دا بڵاو بۆوە یەکەمین هەنگاو بوو لە ئاقاری پشتڕاستکردنەوەی شۆڕشی ئێران و لە سیاسەتی ئێران و سۆڤیەتدا بە خاڵێکی وەرچەرخان لە قەڵەم دەدرێ. رادیۆی مۆسکۆ و چاپەمەنییەکانی سۆڤیەتیش پاش دەرچوونی ئەو ئاگادارییە بێدەنگیی خۆیان لە سەر ئێران شکاند و کۆمەڵە هەواڵ و وتارێکیان بەمەبەستی ڕەخنەگرتن لە حکوومەتی شا و پشتڕاستکردنەوەی شۆڕشی ئێران بڵاو کردنەوە. شان بە شانی ئەم گۆڕانی سیاسەتە، ئەندامانی حیزبی توودە و مۆرە و لایەنگرەکانی دیکەی سۆڤیەتیش لە دەرەوەی وڵات ڕاسپێردران، کە بەرەو ئێران وەڕێ کەون و لە بەرهەم و ئاکامەکانی شۆڕش بەش و پشکی خۆیان بپچڕن و بە هەزاران کەسی دیکەش لە سنوورەکانی باکووری وڵاتەوە، کە ئیتر کۆنترۆڵ نەدەکران گەڕانەوە نێو ئێران.

ڕەوتی گۆڕانەکانی پێوەندییەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت پاش ڕووخانی ڕژێمی ڕابردوو و چۆنێتیی چالاکییەکانی حیزبی توودە لە یەکەمین ساڵەکانی دوای سەرکەوتنی شۆڕشدا، هەتا گیرانی سەرکردەکانی ئەم حیزبە و دانپیانانەکانیان لە سەر پێوەندیی لەگەڵ سۆڤیەتییەکاندا تاڕادەیەك لە هەمووان ڕوونە و پێویست ناکا لێرەدا دووپاتەیان بکەینەوە، بەڵام بۆ تێگەیشتن لە ڕاوبۆچوونی لایەنەکانی دیکە لە سەر پێوەندییەکانی ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتی لە ساڵانی

دوای شۆڕشدا، خراپ نییە بەشێك لە قسەكانی یەكێك لە پسـپۆڕە ناودارەكـانی رووداوەكـانی ئێران، كە لە سەرەتاكانی ساڵی 1987دا بڵاو بۆتەوە لێرەدا بخەینە روو.

گاری سیك نووسەری ئەم وتارە، كـە ژمـارەی رێكـەوتی بـەهاری 1987 ی وەرزنامـەی خاوەن پێگەی "فۆرین ئافـەیرز" یـا "كاروبـاری دەرەوە" ی ئـەمریكادا بـڵاو بۆتـەوە وێـڕای روونكردنەوەی رەوشی ئێستای ئێران و پێوەندییەكانی ئەو وڵاتە لەگەڵ زلهێزەكاندا دەنووسێ:

شۆڕشی ئێران بۆ سۆڤیەتییەكانیش وەك ئەمریكییەكان رووداوێكی لە نـەكاو بـوو. لەگـەڵ ئەوەشدا ئەوان لەم شۆڕشەدا هیچ شتێكیان لەدەست نەدەدا و داڕشتنی سـتراتژییەكی نـوێ لـە پێوەندیی لەگەڵ ئێراندا پاش رووخانی رژێمی شا بۆ سـۆڤیەتییەكان لـە چـاو ئەمریكییـەكان، ئاسانتر بوو.

سەركردەكانی حیزبی توودەی لایەنگری سۆڤیەت لە ماوەی سـاڵانی 1978 و 1979دا لە تاراوگەی سۆڤیەت و وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵاتییەوە گەڕانەوە ئێران و دەسـتیان كـردەوە بە رێكخستنەوەی حیزب. حیزبـی تـوودە بـە پشتڕاسـتكردنەوە و پشـتیوانیی سـۆڤیەتییەكان سیاسەتێكی لە ئاقاری پشتیوانیكردن لە رژێمی نوێی ئێراندا رەچاو كرد، بەڵام تاكتیكی حیزب لە سەر بنەمای خەبات دژی مۆرە راستگەراكان و بانگەشە بۆ بیرۆكەی پێك هێنانی بەرەیەكی یەكگرتووی "خەڵكی" بوو بۆ ئـەوەی بـەڵكو لـەم رێگـەوە لـە حكوومـەتی نوێـدا بپشـكێك وەربگرێ . حیزبی توودە لە یەكەمین ساڵەكانی پاش سەركەوتنی شۆڕشی ئێرانـدا بـە ئـازادی خەریكی چالاكی بـوو، بـەڵام چـالاكییەكانی ئـەودیو پـەردەی (چـالاكییە نهێنییـەكانی) لـە ئاراستەی دزەكردنە نێو دامودەزگا دەوڵەتی و ناوەنـدەكانی شۆڕشـدا، كۆمـەڵێك دژكـردەوەی لێكەوتەوە و یەكێك لە رۆژنامە ئیسلامییەكان(كۆماری ئیسلامی؟) نووسیی، كە توودەییەكان مشكێكیان خستۆتە هەنبانـەی شۆڕشـەوە و ئێسـتا دەڵـێن "حـاجی انـا شـریك" لـە سـاڵی 1980دا مـۆرە و راسـپێردراوە حیزبوڵاهییـەكان لـە تـاران دەسـتیان بەسـەر ناوەنـدی چالاكییەكانی حیزبی توودە داگرت و بەو شێوەیە چالاكیی ئاشكرای حیزبـی تـوودە بەرتەسـك كرایەوە.

لە سەر تاكانی ساڵی 1982دا ئەو كاتەی هێزەكانی ئێران خاكە داگیركراوەكانی ئێرانیان لە هێزەكانی عێراق ئەستاندەوە و پاشەكشەیان پێكردن و گەیشتنە نزیك سـنوورەكانی عێـراق دەوڵەتی سۆڤیەتی هەوڵیدا بەمەبەستی دانوستان نێوبژیوانی لە نێوان ئێران و عێراقدا بكا و لە رێگەی ئاشتی خوازانەوە كۆتایی بە ناكۆكییەكانی نێوانیان بێنـێ، بـەڵام ئێـران، كـە بـراوە و

پێگەی بەهێزتر بوو ئامادە نەبوو دوژمنایەتییەکە وەلابنێ. سۆڤیەتییەکان وریاییان بە ئێران دا، کە ئەگەر هێزەکانی ئێران بچنە نێو خاکی عێراقەوە ئەوان ناچارن چەکوچۆڵ ی زیاتر بە عێراق بدەن. ئێران بە بێ گوێ پێدان بە وریاییدانەکەی سۆڤیەت هێرشێکی بۆ نێو خاکی عێراق دەست پێکرد. دەوڵەتی سۆڤیەتی چەکوچۆڵ ی نوێتری دایە عێراق و لە کۆتاییەکانی ساڵی 1982دا یەکەمین فڕۆکەکانی دەستکردی سۆڤیەت هاتنە سەر دیزفول و شارەکانی دیکەی ئێران لە نزیك سنوورەکانی عێراق.

لە مانگەکانی کۆتایی ساڵی 1982دا ڤلادیمیر کوزیچکین راسپێردراوی باڵای زانیاریی سۆڤیەت، کە لە بە ناوی جێگری کونسولی دەوڵەتی سۆڤیەتی لە تاراندا چالاکیی دەنواند رای کردە بەریتانیا و کۆمەڵێك زانیاریی گرینگی لە سەر چالاکییەکانی دزەکردنی سۆڤیەت و حیزبی توودە، خستە بەر دەستی رێکخراوەکانی تەناهی و پاراستنی بەریتانیا. ئەو زانیارییان خرانە بەردەستی بەرپرسانی ئێرانی و بە دوای ئەوەدا هەوڵێکی بەربڵاو دژی رێکخستنی حیزبی توودە لە ئێراندا دەستی پێکرد و لە فێبریەی ساڵی 1983دا تەواوی رێبەرانی حیزبی توودە دەستبەسەر کران و هەژدە دیپلۆماتی روسیش لە پێوەندی لەگەڵ چالاکیی نایاساییدا لە ئێران وەدەرنران. لە ماوەی چەند مانگێکدا بەشی هەرەزۆری ئەو رێکخستنە نهێنییەی، کە روسەکان بە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر لە ئێراندا پێکیانهێنابوو پەرش و بڵاو بوو.

****

پێوەندییەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت پاش ماوەیەکی زۆر لەو ساردوسڕییەی، کە پاش پەرش و بڵاوبوونی حیزبی توودە و وەدەرنانی دیپلۆماتە روسییەکان لە ئێران تێی کەوتبوو پاش هاتنە سەرکاری گورباچۆڤ گەرموگوڕتر بۆوە. گورباچۆڤ وەزیری دەرەوەی خۆی "شیڤاردنادزێ"ی ناردە تاران و شواردنادزێ لە چاوپێکەوتن لەگەڵ خومەینیدا پەیامی دۆستانەی گورباچۆڤی گەیاندە دامەزرێنەری کۆماری ئیلامیی ئێران و بە دوای ئەم دیدارەدا خومەینی پەیامێکی گرینگی بۆ رێبەری سۆڤیەت نارد، کە ئایەتوڵا جەوادی ئامولی لە مۆسکۆ گەیاندییە دەستی. خومەینی لەم پەیامەدا پێی لە سەر کەموکوڕییەکانی سیستەمی سۆسیالیستیداگرتبۆوە و بە ئاماژە باسی ئەگەری هەرەسهێنانی یەکێتیی سۆڤیەتیی بە مەرجی بەردەوامبوونی ئەم رەوتە خستبۆ روو.

دوایین ڕووداوی گرینگی پێوەندییەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت سەفەری ڕەفسەنجانی سەرۆك کۆماری ئەوکاتی ئێران لە ساڵی 1989دا بۆ سۆڤیەت بوو، کە ڕێگەی بۆ گەشە و پەرە پێدانی پێوەندییەبازرگانییەکان و هاوکاریی تەکنیکیی نێوان ئێران و سۆڤیەت خۆش کرد.

ڕەفسەنجانیش هەروەها گورباچۆڤی بانگهێشت کرد، کە سەردانی تاران بکا، کە بە هۆی گۆڕانەکانی ساڵانی 1990 و 1991 و هەرەسهێنانی سۆڤیەت جێبەجێ نەبوو.

***

پاش هەرەسهێنانی سۆڤیەت، ئێران پێوەندییەکی دۆستانە و نزیکی لەگەڵ کۆمارییەکانی پێشووی سۆڤیەتیشدا دامەزراند و پێوەندیی ئێران و ڕوسیا بە تایبەتی لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی پوتینەوە زیاتر پەرەی گرتووە. گرینگترین گرێبەستێك، کە لە نێوان ئێران و ڕوسیادا واژۆ کراوە گرێبەستی تەواوکردنی ناوەندی وزەی ناوکیی بووشێهرە و لەم قەیرانە ناوکییەی ئەم دواییانەشدا ڕوسیا دژی هەرچەشنە گەمارۆیەك و هەرجۆرە هەڕەشەی دەستێوەردانی سەربازی لە ئێراندا بووە و سەرەڕای دژایەتیی ئەمریکاش، ئەوا گرێبەستێکی نوێی بۆ سازکردن و دامەزراندنی سیستەمێکی بەرگریی مووشەکی لە دامەزراوە ناوکییەکانی ئێراندا، بەستووە.

**ڕوونکردنەوە**

*جودایی خواز: ئەم دەستەواژە چەواشەکارانەیە کۆنترین دەستەواژەیەکە، کە لە لایەن دەسەڵاتداران و داگیرکەرانی کوردستانەوە بەردەوام دراونە پاڵ بزووتنەوەی ڕزگاری خوازیی نەتەوەی کورد و بووەتە بیانوویەك بۆداپڵۆسین و پێشێلکردنی مافەڕەواکانی ئەم نەتەوەیە(وەرگێڕ).